# زەردەشت و ئاڤێستا
# و
# فەلسەفەی یەکتاپەرستی

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: فەرهاد عەبدولحەمید (پەهلەوان)





**توێژینەوەی: فەرهاد پەهلەوان**

## پێشەکی

مەبەست لە کۆکردنەوەو نووسینی ئەم باسە ئەوەیە کە، نەوەی نوێی نەتەوەکەمان زانیارییەکی پۆختەو دروستیان هەبێت دەربارەی گرنگترین‌و دێرینترین کەلەپوری نەتەوایەتیمان.

سەربەرزی‌و پێشکەوتنی هەر نەتەوەیەك، دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕ بە خۆکردنی تاکتاکی ئەندامانی ئەو نەتەوەیە. کاتێك ئەو باوەڕە زێتر دەبێت کە خەڵکی ئاگاداری رابوردووی پڕ لە شانازی، ئازایەتی، زانستی، هونەرو مێژووی دێرینی خۆیان بن.

ئەم ئاگاداری‌و زانینە، پاڵ بەو کەسانەوە دەنێت کە هەستی نەتەوایەتیان پتر بێت‌و هەوڵ‌و کۆشش بدەن بۆ پێشخستنی نەتەوەکەیان بۆئەوەی بۆ هەموو جیهانی بیسەلمێنن کە ئەمانە رۆڵەی شایستەو لێهاتووی باوك‌و باپیرانیانن، هەروەها هانیان بدات بۆئەوەی سوود لە ئەزموونی شارستانییەتی رابردووی پێشینانیان وەربگرن‌و پەند لەو نشیۆیانە وەربگرن کە رۆژگارو خودی خۆیان بونەتە هۆی. ئەو ئەزموونانە خۆیان لەخۆیاندا دەبنە رۆشنکەرەوەی رێگەی تاریك‌و شەوە زەنگی نەتەوەکەمان بۆ گەیشتنە کاروانی شارستانیەتی نوێ کە چەندین سەدەیە بەهۆی نەزانین‌و دەست درێژی بێگانەو ژێردەستیدا لێیوە دوورخراوین. بێگومان ئەو زانست‌و فەلسەفە دێرینەی باپیرانمان، باشترین‌و بەهێزترین ژێرخان‌و کۆڵەکەن بۆ چارەنوسی دیوەخانی کۆمەڵگای نەتەوەکەمان. چەندە ئەو بناغەیە بەهێزترو پتەوتر بکەین، پاشەرۆژمان رۆشەنترو گەشتر دەبێت.

خوالێخۆشبوو (ئیحسان نوری پاشا) لە پێشەکی کتێبە بەنرخەکەیدا (تاریخ ریشە نژادی کرد) ل -2 دەبێژی:

(بێ ئاگایی لە رابردوو، دەبێتە هۆی بایەخ نەدان بە داهاتوو. دەبێژن شانازی بە بەردی سەرگۆڕەکان ناکرێت. وەلی، لەنێوان سەرهەڵدان‌و بەهێزکردنی هەستی پاراستنی ئازادی لەنێو میللەتاندا، لەتەك زانینی هەڵسوکەوت‌و کرداری پڕ لەشانازی باوباپیرانمان پەیوەندییەکی بەهێز هەیە.

دەبێ لێرەدا ئەوە بگوترێت کە ئەو شانازیانە چراو رێنمای رێگەی مەزنایەتی میللەتانە).

دەربارەی زەردەشت‌و پەیام‌و ئاینەکەی، کتێب‌و نووسینی جۆراوجۆر بە گەلێ لە زمانە زیندووەکانی جیهان نوسراونەتەوە. هەریەکە لەو نووسەرانە پاڵیان داوەتە بەر برێ بەڵگە بۆئەوەی ڕاستی قسەو بۆچونی خۆیان بسەلمێنن. مەخابن، زۆر لەو نووسەرانە، دەمارگیرێتی کارێکی وای کردۆتە سەر نووسینەکانیان کەوتونەتە نێو گێژاوێکی‌وا کە بەهیچ کلۆجێك

نەیانتوانیوە خۆیانی لێ قوتار بکەن، بەتایبەتی نووسەرە موسلمانەکان کە کەوتونەتە نێو باسێکی نازانستانە دەربارەی زەردەشتو باوەڕو ئاینەکەی،

لەلایەکەوە تاوانباری دەکەن بە ئاگرپەرستو لەلایەکی دیکەوە دەبێژن کە زەردەشت باوەری بە بوونی پتر لەیەک خودا بووە. هەروەها لەبارەی ڕەچەڵەکو نەژادی ئەم پەیامبەرە مەزنە دووبارە کەوتونەتە هەڵەوە، بۆ وێنە (ابو جعفر محمد جریر طبری 224-310 هیجری) بەهۆی دەمارگیری ئاینیەوە دەیەوێت بە زۆرەملە بیسەلمێنێ کە زەردەشت عەرەب بووەو لە بیت المقدس هاتۆتە ئیراقو لەوێشەوە بەرەو (بەلێخ) رۆیشتووە...

برێکی دیکەیان نووسینی پیاوە ئاینیەکانی پاش زەردەشتیان لەتەک ئەفسانەکانی سامییەکاندا ئاوێتە کردووەو تەنانەت زەردەشتیان لەتەک هەندێ لە پەیامبەرەکانی بەنی ئیسرائیل بەیەك زانیوەو لە بیرو خەیاڵی کرچوکاڵی خۆیاندا داستانیان بۆ دارِشتووە.

لێرە دا ئەوەندەی لە تواناو ووزەمدا بێتو ئاگاداری بمو خوێندبێتمەوە برێ بەڵگەو زانیاری بۆ خوێندەوارانی هێژا دەهێنمەوە دەربارەی یەکتاپەرستی ئەم ئاینە پیرۆزەو هەروەها دەربارەی نەژادو نەتەوەو شوێنی لەدایکبوونی ئەم پەیامبەرە نەمرە کە ئەم هەسارەیە کە نێوی زەوییە. بەدەگمەن گەورە پیاوی وەك ئەوی دیوە.

لە قورئانی پیرۆزدا (سورە فرقان..ئایەتی -40) خوا دەفەرموێت. (وعادا و ثمود و اصحاب الرس[1] و قرونا بین ذلك کثیرا) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە لەلایەن خواوە بۆ پەیامبەری ئیسلام محمد (د.خ) ئەوە بوو کە عەرەبەکان دەیانویست دژی پەیامبەرو ئاینەکەی بوەستن، بۆیە خوای گەورە دڵخۆشی دەداتەوەو دەرفەموێت، ئەی پەیامبەر هیچ غەمگین مەبەو نیگەران مەبە چونکو لە پێش تۆشدا میللەتی نوحو خەڵکی پمودو رەس پەیامبەرەکانیان بە درۆزن ناودەبرد، بەڵام هەموویان بەسزای کرداری خۆیان گەیشتن.

هەروەها لە (سورە ق – ئایەتی 12) دەفەرموێت:

(کذبت قبلهم قوم نوح و اصحاب الرس و ثمود) ئەم وشەی (رس)ە کە لە قورئانی پیرۆزدا نێوی لێبراوە بەگوێرەی بۆچونی برێ لە راڤەوانانی ئایەتەکانی قورئان هەمان رووباری ئاراسەو (اصحاب الرس) بە مانای خەڵکی ناوچەی ئاراسەو ئەو شوێنەیە کە پەیامبەری نەمر، زەردەشتی تێدا لەدایکبووە.

لە کتێبی (مجمع البحرین) (معانی الاخبار) دەربارەی وشەی (رس) دەبێژی: [خەڵکی (رس) نەتەوەیەك بوون کە لە دەوروپشتی روبارێك بە هەمان ناوەوە دەژیانو ئەم روبارە کەوتۆتە ڕۆژهەڵات زەمین] لە کتێبی (جغرافیای تاریخی: شهر بزرگ هگمتانوێنشان) نووسینی جواد صدقی – ل 3 دەبێژی:

له چوار کلیۆمەتری رۆژئاوای شاری رچائیە (ورمێ) گوندێکی دێرین هەیە بە نێوی ئارواج – ئاریاویج.. هەمان ناوچەیە کە لە ئاوێستادا باسي لێکراوە، سنوری ئەم گوندە بەم شێوەیەیە لە باشوورەوە روباری ئارواج، لە باکوورەوە بناری کێوی جودلر، لە رۆژئاواوە بەزەویەکانی دێی خنیە (خنرس) و لە ڕۆژهەڵاتەوە زەویەکانی گوندی سەنگەری (فرامرزخان)ە دەربارەی گوندی خنیە (خنرس) دەبێژی:

[هەر لەسەرەتای پاشایەتی هۆشەنگ شای پێشدادی یەوە تا کۆتایی پاشایەتی فەرەیدون شا، سەرزەمینی ئێران بە نێوی حەوت دەڤەر (کیشوەر) ناودەبراو بەنێوبانگترینی ئەو حەوت دەڤەرە خنرس (خنیە)ی ناوبووە، بەگوێرەی نوسینەکانی پەهلەوی ئاینی زەردەشت لەو ناوچەیەدا پەیدا بووەو لە ئایەتی 40 سورەی فرقانو ئایەتی 12ی سورە ق لە قورئانی پیرۆزدا بە نێوی اصحاب الرس (خنرس) نێوی لێنراوە..]

خوالێخۆشبوو پورداود لە کتێبێ یەشتەکاندا بەرگی یەکەم پەراوێزی لاپەرەی 433 دەبێژی: [لە ئاوێستادا دەربارەیوولاتی خونیرەس (خنرس) زێتر لەووڵاتو دەڤەرەکانی دیکە ناوی لێبراوە چونکە ئەمووڵاتە پیرۆزترین بەشی سەر زەوی ئاریاییەکانە[2] و شەش نەژاد تیایدا ژیاون، ئەمووڵاتە (دەڤەرە) بە تەنیا بەرانبەر شەش دەڤەرەکەی دیکەیە، لەوانەیە مانای خونیرەس (خنرس) خاوەنی گەردونەی خاس بێت.

ئەو رۆژگارەی کە تیشتەر[3] لافاوی بەرپاکرد، نیوەی زەوی کەوتە ژێر ئاو لە زەویدا حەوت دەڤەر هاتە ئارا، ئەو دەڤەرەی لە ناوەراستدایە پێی دبێژرێ خونیرس (خنرس) و خۆی بە تەنیایی بە ئەندازەی شەش دەڤەرەکەی دیکەیە،

بەشیك لە زەریای فراخکرت دەوروبەری (خونیرس)ی گرتووە خونیرس لە هەموو دەڤەرەکان جوانترو خاسترە ئەهریمەن لەم دەڤەرەدا زەرەرو زیانێکی یەکجار زۆری گەیاندووە، چونکە دیتی کە لەم ناوچەیەدا (کەیانیەکان) و پیاوە دڵرو ئازاکان دەرکەوتوون، ئاینی پاکی خواپەرستی لێرەوە دەرکەوتو بەرەو دەڤەرەکانی دیکە تەشەنەی کردو لە ئاکامدا رزگارکەری جیهان (سوشیانس) هەر لەم ناوچەیەدا دەردەکەوێو خراپە (ئەهریمەن) لە ناودەبێ..]

شایانی باسە کەیخەسرەو کوری سیاوەش کوڕی کەیکاووس کوڕی کەیقوباد، کە (شا) یا (شالیاری) دەڤەری خونرەس بووە، بەگوێرەی نووسینەکانی پەهلەوی لە پاکیو پیرۆزیدا وەك پەیامبەروابووە.

گرنگترین کارەکانی بریتی بووە لە:

1. خاپورو وێرانکردنی هەموو بتخانەکانی دەوروبەری گۆلی چێچست (ورمێ)
2. کوشتنی ئەفراسیاوی تۆرانی

دەربارەی ئاریاویج یا (ایرانویج) موبد فیروز ئازەر گوشەسب لەکتێبی (بخشی از فرهنگ اوستا تطبیق ان با فارسیو کردی) لاپەرەی 5 دا وشەی (ائیرینە وەئجە Airyane Vaeja)ی بەم شێوەیە لێکداوەتەوە:

(ایرانویج – وولاتو نیشتەجێی ئاریایەکانە، لە ئاوێستادا فرە بەرێزەوە باسیلێکراوەو درودو سڵاوی بۆ نێردراوە، ئیرانویج، نێوی ناوچەیەکە ئاریاییە ئیرانیەکان پاش ئەوەی لە برا هیندیەکانیان جیابونەوە، تیایدا نیشتەجێ بوونو ئەم ناوچەیەیان کردە نیشتەجێیووڵاتی خۆیان، هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان لەوباوەرەدان کە ناوچەی ئازەربایجان هەمان ناوچەی ئیرانویج بووەو زەردەشتی پەیامبەری ئیرانی دێرین لە نزیك [ گۆلی دەرمجە] کە هەر ئەم (گۆلیورمێ یە) یە لەدایك بووە).

هەروەها خوا لە سورەی حەج – ئایەتی 17ی قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

[أن الذين امنوا و الذين هادوا و الصابئين و النصارى و المجوس و الذين اشركواأن الله يفصل بينهم يوم القيمة . أن الله علي كل شيئ شهيد]..

ئەگەر خاس بڕوانینە ئەم ئایەتە.. دەبینین سێ کۆمەڵ لە یەکتری جیاکراونەتەوە، کۆمەڵی یەکەم، بریتیە لەوانەی باوەریان بە ئیسلام هێناوەواتە موسلێمانەکان، کۆمەڵی دووهەم بریتین لە یەهودی (جولەکە) و صابئیو فەلەو مەجوس (زەردەشتیەکان)، کۆمەڵی سێهەمیش بریتین لەوانەی مشرکن، ئەگەر خاس سەرنج بدەینە ئەو سێ کۆمەڵەی کە لە ئایەتی ناوبراودا لە یەکتر جیاکراونەتەوە، دەبینین هەریەکەیان بەوشەی (الذين) کە بریتیە لە (اسم الموصول) لەیەکتر جیاکراونەتەوە، ئەو چوار دەستەیەی کە لە کۆمەڵی دووهەمدان بەپیتی (و) بەیەکترلکاون (واتە بە حرف الوصل).

کەوایە ئەوەی لەو ئایەتەدا ئاشکرایە ئەوەیە کە لە قورئاندا، موسلمانەکان لەلایەکەوەو یەهودو فەلەو صابئیو زەردەشتی لەلایەکی دیکەو (مشرك)ە کانیش بە جیا لەلایەکی دیکەوە دانراون ئەم سێ کۆمەڵە بەوشەی (الذين) لە یەکتر جیاکراونەتەوەواتە مجوس (زەردەشتیەکان) لە ئاستی ئاینە خاوەن کتێبەکان دانراون.

لە ئاینی ئیسلامدا پاش قورئانی پیرۆز کەوتەی خوایە:وتەکانی پەیامبەر موحەمەد (د.خ) و پیاوە گەورە ئاینیەکان جێی متمانەو باوەرن بۆیە لێرەدا بۆ بەڵگە بڕێ لەو گوتارانە دەخەینە بەرچاو:..

لە کتێبی (فجر الاسلام) نوسینی احمد امین لاپەرەی 101 نووسەر دەبێژێ:

[وقد عاملهم المسلمون في الفتح معامله اهل الكتاب، وعدوا كتابهم كانه كتاب منزل، وجرى (عمر) على ژلك لما روى له الحديپ سنوێ بهم سنه اهل الكتاب –واته رەفتارەتان لەتەکیاندا هەروەك رەفتارتان لەتەک خاوەن کتێبەکان بێت (واتە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان)

هەروەها لە کتێبی (بحار الانوار – ج 5 – ل –(379) هاتووە:..

قال علي علي المنبر:

[سلونى قبل ان تفقدونى . فقام الية الاشعث بن قيس فقال يا امير المؤمنين كيف تؤخذ من المجوس الجزية و لم ينزل عليهم كتاب ولم يبعث اليهم نبي ؟ فقال : بلى يا اشعث قد انزل الله عليهم كتابا و بعث اليهم نبيا.) واتە..

عەلی لەسەر مینبەر گووتی:..

[ تا زیندوم هەر پرسیارێکتان هەیە لێم بپرسن، ئەشعەس کوڕی قەیس هەڵسایە سەر پێو گووتی: ئەی میری موسڵێمانان، چلۆن جزیە لە مەجوسەکان وەردەگرێت لەکاتێکدا نە کتێبێکیان لە ئاسمانەوە بۆ هاتووەو نە پەیامبەرێکیان بۆ نێردراوە؟

وەڵامی دایەوەو فەرمووی: بۆچی نا، ئەی ئەشعەس، خوا کتێبی ئاسمانی بۆ ناردونو پەیامبەریشی بوێو ڕەوانە کرد بون..]

لە هەمان کتێبدا (بحار الانوێر) دەبێژی:

[سئل ابو عبدا لله (ع) عن المجوس أكان لهم نبي ؟ فقال نعم ، أما بلغك كتاب رسول الله الى اهل مكة ان اسلموا و الا نابذتكم بحرب فكتبوا الى النبي (ص) ان خذ منا الجزية و دعنا على عبادة الاوثان ، فكتب اليهم النبي (ص) اني لست اخذ الجزية الا من اهل الكتاب . فكتبوا اليه يريدون بذلك تكذيبه زعمت انك لا تأخذ الجزية الا من اهل الكتاب ثم اخذت الجزية من مجوس هجر ، فكتب اليهم النبي (ص) ان المجوس كان لهم نبي فقتلوه و كتاب احرقوه اتاهم نبيهم بكتاب في اثنى عشر الف جلد ثور... ]

واتە : دەربارەی (مجوس) پرسیاریان لە ابو عبدالله (ع) کرد کە ئایا پەیامبەریان هەبووە؟

گووتی: ئەرێ، ئایا دەربارەی نامەی پەیامبەری خوا بۆ خەڵکی مەکە هیچت پێرانەگەیەنراوە کە بۆی نوسیبوون کە خۆتان بە دەستەوە بدەنو باوەر بە ئیسلام بێنن، دەنا دەبێ شەرمان لەتەکا بکەن، وەڵامیان بۆ نووسی کەوازمان لێبێنەو جزیەمان لێوەربگرەو با هەر لەسەر ئاینی بت پەرستی خۆمان بین. پەیامبەر (د.خ) بوێی نوسین کە ئەز تەنیا لە پەیرەوانی کتێبە ئاسمانییەکان جزیە وەردەگرم، ئەوانیش وەڵامیان بۆ نوسییەوەو دەیانویست بەدرۆی بخەنەوە:

دەبێژێت گوێیا جزیە لە کەس وەرناگریت مەگەر ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانیان هەبێت، بەڵام دەبینین کە جزیەت لە مەجوسەکانی هەجر (هەجر یەکێکە لە شارەکانی یەمەنو لەسەردەمی ساسانییەکاندا زۆریان بووبونە زەردەشتی) وەرگرتووە، دووبارە پەیامبەر (د.خ) نامەی بۆ نوسینەوەو تیایدا دەبیژی: مەجوسەکان پەیامبەریان هەبوو کوشتیانو کتێبی ئاسمانیان هەبووو سووتاندیان پەیامبەرەکەیان کتێبی ئاسمانی بۆ هاوردونو لەسەر پێستی دوانزە هەزار (گا) نوسرابوو....

سەبارەت بە نەژادو نەتەوەی زەردەشت زوربەی زۆری مێژوو نوسەکانو شارەزایانی ئاوێستا لەو باوەرەدان کە زەردەشت لەنەژادی ئارییەو لە ناوچەی ورمێ لەدایکبووە.

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە مێژووو جوگرافیای نەتەوە کورد لە دێر زەمانەوە، واتە لەسەردەمی پێش مادەکانیشەوە [4] (گوتی، کوسی، خالدی، نایری، سوباری..) بۆمان دەردەکەویت کەورمێو دەوروپشتی هەمووی زێدو زەوی باوكو باپیرانی نەتەوەی کورد بووە.

داریوش شای هەخامەنشی یەکان لەسەر بەردە نوسراوەکانی بێستوناندا دەربارەی شاری (رەی) نزیكورمێ کە بە شوێنی لەدایك بوونی زەردەشت دادەنرێت دەبێژی:

(رەگا یەکێکە لە شارەکانی ماد)، رەگا بە مانای رەی گەورەیە.

مشیر الدوله حسن پیرنیا لە کتێبی (تاریخ ایران) – لاپەرەی 58 دەبێژي:

[زەردەشت خەڵکی ناوچەی مادەکان بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی نەیتوانی لەو دەڤەرەدا ئاینی یەکتاپەرستی بڵاوبکاتەوە، ناچاربوو بەرەو ڕۆژهەڵات کۆچ بکات]

دکتۆر منوچهر – منوچهر پور لە کتێبی (بدانیمو سربلند باشیم) کە بریتیە لە کورتەیەك دەربارەی ئاینی زەردەشتی لە ل- 25دا دەبێژی:

[زەردەشتیەکان باوەریان بەوەیە کە زەردەشت لە رۆژئاوای ئیران (ئازەربایجانی رۆژئاوای ئێستا) لەدایکبووەو لەوێراوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئیران (بەلخ) کە پایتەختی گوشتاسەب شا بووە کۆچی کردووە بەڵام برێ لە زانایان دەبێژن کە زەردەشت لە دەڤەری خۆراسان ڕۆژهەڵاتی ئیران) لەدایکبووە]

رۆژهەلاتناسی بەناوبانگی فەرەنسی دارمستتەر دەبێژی / کە ئاڤیستا کتێبی پیرۆزی زەردەشت بە زمانی مادەکان نوسراوەتەوەو دەبێژی: ئەگەر رۆژی لە رۆژان نوسراوەکانی مادەکان بدۆزرێنەوە، راستی ئەم باوەرەم ئاشکرا دەبێت. هەروەها دەبێژی کە زمانی کوردیو زمانی پشتۆیی ئەفغانەکان،هەمان زمانی مادەکانەو گۆرانکاری بەسەر هاتووە (ل – 77 کتێبی تاریج

ریشه نژاد کرد – ئیحسان نوری) وه (تاریخ مردوخ ل 41 کتێبی (تاریخ دو هزارو پانصد ساله ایران – بەرگی یەکەم لاپەره 38 نوسینی دکتور عباس پرویز. سیسیل جی ئەدمۆنز دەبێژی:

بەبۆچوونی خۆم، بەگوێرەی هەموو لایەنەکانی جوغرافیاییو زمانەوانی دەتوانین بێژین که کوردەکانی ئەورۆ نوێنەرانی مادەکانن که سێهەمین ئیمپراتۆریەتی گەورەی ڕۆژهەڵاتی بون (کتێبی کردها، ترك ها، عرب ها، ل 13

هەروەها له هەمان کتێبدا ل 13 ئەدمۆنز دەبێژی:

[ مینۆرسکی، لەوباوەرەدایه ئەو زاراوانەی ئێستا له زمانی کوردیدا هەیە، گشتیان دەچنەوە سەر ڕەچەڵەکێکو لەسەرچاوەو پایەیەکی بەهێزو کۆنەوە هەڵیدەقولێێن که ئەویش زمانی مادەکانە ]

بارتلومه دەبێژی: زەردەشت بۆ یەکەم جار ئاینو باوەرەکەی لەنێو کەسو کاری خۆیدا لەسەر زەمینی ماد بڵاوکردەوە،

سایکس له کتێبی (التاریخ العام للمؤرخین ج 2) دەبێژی:..

(مادەکان، هۆزێکی کورد بون کەوا له ڕۆژهەڵاتی ئاسوریەکاندا دەژیانو سنوری دەسەڵاتیان دەگەیشته خواروی دەریای قەزوین، زوربەی ئەم میللەته لەلایەن زمانەوە له میللەتانی هیند – ئەوروپی بوونو لەلایەن رەگەزو خوێنەوە له نەژادی ئارياییەکان بوون)

سیر ولسن له کتێبی (مێزوپۆتامی 1917- 1920، ل -127) دەبێژی:

[ مادەکان باپیرەگەورەی کوردەکانن]

خوالێخۆشبوو ئیحسان نوری له ل – 30-78-82 کتێبەکەیدا (تاریخ ریشه نەژادی کرد) دەبێژێ:

((لەبەر رۆشنایی نوسینەکانی ئاوێستاوا دەردەکەوێت که ناوی سەرۆك، شاو گەوره پیاوەکانی ئەو سەردەمەی که ڕووداوەکانی تێدا ڕوویداوەو هەروەها ناوی زوربەی شوێنەکانیش بریتین لەو ناوانەی که لەسەردەمی پێش مادەکاندا له ناوچەی رۆژئاواو سەروی ئێراندا باو بووه. زوربەی ناوچەی رووداوەکان له دەوروبەری گۆلی چیچیست (ورمێ) و گۆلی هیئوسرەوە (وان) بوون، واته شوێنی لەدایك بوونی حەزرەتی زەردەشت پەیامبەری ئارياییەکانه.. هەروەها دەبێژێ: زەردەشت ئەو پیاوه زانا مەزنه پەیامبەری ئاریو خەڵکی مادو لەخێڵی ماد بووه. چینی رۆحانییەتی زەردەشتی که (موغ) یا (ماگوس) یان پێدەبێژرێ. لەنێو خێڵی

زەردەشتەوە وەرگیراوە، موگ (MOGE) مۆگ یەکێکە لەو شەش خێڵانەی کە بەقسەی هیرۆدوت، مادەکانی لێ پێکهاتوە))

دیاکۆنوف پاش ئەوەی باسی سەرزەمینی ماد دەکاتو باسی ئەو دوانزە دەڤەرە جوگرافیایە دەکات کە مادەکانی تێدا جێگیر بون، دەبێژێ کە ئەو دوو دەڤەرە ناوەندییەی سەرزەمینی مادەکان بریتین لەسەراسەری ئەو ناوچەیەی کە لە گۆلیورمێ تا باکوری رووباری دیالە واتە شارەکانی (میان دوو ئاو – بانە – سلێمانی – زەهاوو سنە (سنندج) تاوەکو باکوری روباری دیالە، ئەم دەڤەرە وەکو سێ چوکلەی شارەکانی ئێستا (سلێمانی – زەهاو – سنە) لێ پێکهاتووە. (کتێبی تاریخ ماد ل 87- ا.م . دیاکونوف)

احمد امین لە کتێبی فجر الاسلام ل 99 دەبێژێ:

(.. وقد ألف الاستاد جاكسن (JACKSON) كتابا قيما في حياته اسمه

(LIFE OF ZOROSSTER) كان له اثر كبير في ترجيح كفه المثبتين لوجوده، وقد وصل في بحثه الى أن زردشت شخص تاريخي لا خرافي، وانهكان من قبيله ميديا ((في الجزو الشمالي الغربي من فارس)) وانه ظهر امره نحو منتصف القرن السابع قبل الميلاد و مات نحو سنه (583 ق. م) بعد ان عمر 77 سنه وان موطنه كان آذربايجان، ولكن اول نجاح ناله كان في بلخ وعلى اثر دخول الملك گشتاسب في دينه...)

واتە..

مامۆستا جاکسۆن لە ژیانیدا کتێبێکی بەنرخی نوسیوە بەناوی (ژیانی زەردەشت) کە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە زەردەشت مرۆیەکی مێژوویی بووەو داستانو ئەفسانە نەبووە. و لەخێڵی مادەکان بووە (لە بەشی باکوری رۆژئاوای فارسدا) و لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پ.ز خۆی ناساندووەو لە ساڵی 583 پ.ز کۆچی دوایی کردووە، پاش ئەوەی 77 ساڵ ژیاوە، شوێنی لەدایکبوونی ناوچەی ئازەربایجان بووە، بەڵام یەکەمین سەرکەوتنی لە (بەلخ) بە دەست هێناوە پاش ئەوەی شا بشتاسەب (گوشتاسەب) ئاینەکەی پەسەند کردووە.

کاتێك زەردەشت لەدایك بوو، دەمێك بوو جەوروستەم باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو.. کاتێك بوو کە دزی، جەردەیی، درۆزنی، ناپاکی، ناتەبایی، خراپەکاریو نەزانین بڵاوبوبۆوە. خەڵك گیرۆدەی ئەم دەردانە بوبونو پابەندی ئەفسانەی جۆراو جۆربونو بە هیچ کلۆجێك نەیاندەتوانی خۆیان رزگار بکەن، ئەم دەردانە لەلایەكو لەلایەکی دیکە، دەردی ئەو کەسانەی خۆیان بە پێشەوایانی ئایینی دەزانی، ژیانی خەڵکی کلێۆڵیان زێتر تالێو ئالێۆز کردبوو.

لەو سەردەمەدا بۆ هەموو شتێك خوایەكیان داتاشیبوو، خوای ئاسمان، خوای زەوی، خوای با، خوای باران، خوای ئاو، خوای ئاگر،.. هتد خەڵك ناچار بوون بۆئەوەی دڵی ئەم هەموو خوایانە ڕابگرنو خۆیان لەقینو سزایان بپارێزن، قوربانیان بۆ بكەن، ئەم پێشەوا ئاینییانە وایان لەخەڵک گەیاندبوو كە ئەمان نوێنەری خواكانو خەڵكی بەهۆی ئەمانەوە دەتوانن دەنگیان بگەیەننە خواكانو بۆ وەدیهێنانی ئەوكارە گرنگە، پێویستە قوربانی بدەنو خوێنی ئاژەڵ بڕێژنو كوپەڵەی مەی نایابو دیاری بەنرخ پێشكەش پێشەوایانی ئاینی بكەن.

بەڵێ هەزارەها ساڵ لەمەوبەر ئەم پەیامبەرە نەمرە لە بارودۆخێكی كۆمەلایەتی وەهادا پێی ناوەتە ئەم جیهانە بۆئەوەی شەوەزەنگی ژیانی مرۆڤ ڕووناك بكاتەوەو ئەفسانەو بیرو كرداری خراپ لە كۆمەڵگا ڕامالێیت.

كاتێك تەمەنی گەیشتە ئەوەی بیر بكاتەوە راپەرینێكی وەها ڕاپەڕی كە هەتاهەتایە لە یادی ئادەمێزادی ژیرو دانا دەرناچێت.

زەردەشت داوا لەخەڵک دەكات كە دور بكەونەوە لەو جۆرە كردارانەو تاوێك تێبفكرنو بیربكەنەوەو ڕێگای ڕاستو دروست هەلێبژێرنو واز لە پەرستنی چەند خوایەكی جیاوز بهێنن، و تەنێ خوای تاكو تەنیا بپەرستن.

بەلام خەڵكی هەروەك چلۆن پاش هەزاران ساڵ بتپەرستە عەرەبەكان بەرپەچی پەیامبەری ئیسلامیان دایەوە، ئەوانیش هەروا وەڵامی زەردەشتیان دایەوەو دەیانگوت: باوباپیرانی ئێمە گشتیان لەسەر ئەم ئاینە بوون، و ئێمەش لەسەر ئەم ئایینەینو باوەڕمان پێیەتیو تۆش دەبێ وەك ئێمە بیت.

زەردەشت زێتر بیردەكاتەوەو دەچێتە شوێنێكی تەنیاییو چۆلێو خەلێوەت بۆئەوەی فرەتر جڵەو بۆ بیری خۆی بەرەڵا بكات.. دەستدەكا بە پرسیار كردن:

- كێ ئەم خۆرو هەسارانە دەچەرخێنێ؟
- بەهۆی كێ یە هەمیشە مانگ كزدەبێو دەگەشێتەوە؟
- كێ ڕاگری زەویو ئاسمانەكانە؟
- ئافەریدەی ئاوو درەخت كێ یە؟
- كێ (با) و هەور دەجولێێنێ؟
- كێ یە بە دی هێنەری ڕووناكیو تاریكی؟

- کێ خەوو هوشیاری بە ئادەمیزاد بە خشیوە؟

- کێ بەیانیو نیوەڕۆژو شەوی دروستکردووە؟

زەردەشت هێشتا پرسیارەکانی دەربارەی یاسای سروشت تەواو نەکردبوو کە دێتە سەر پرسیارکردن سەبارەت بە باری کۆمەڵایەتیو پرسیار دەکات:

چ شتێکە وا لە فەرزەند دەکات پەیڕەوی لە باوکی بکاتو خۆشەویستی فەرزەندی خستۆتە دڵی دایكو باب؟

چ هێزێکە خەڵکی یەك خێزانی پێکەوە بەستووە؟

کام توانایە ڕێگا پێشانی خەڵک دەدات تا خێزان پێکەوەنێن گوند دروست بکەنو شار ئاوەدان بکەنو بۆ خۆیان کیشوەرێکی بەرین پێکەوەنێن؟

چارەنوسی ئەو کەسانەی پاڵیشتی ڕاستین چییە؟

پاشە ڕۆژی ئەو کەسانەی درۆو خراپەیان کردۆتە پیشە چییە؟

لەم جیهانەدا چ روو دەداتو رۆژی پەسلان چ دەبێت؟

زەردەشت بەچاوی خۆی دەبینێ، ئەو کەسانەی خراپەکاری دەکەنو درۆو کرداری خراپ بڵاودەکەنەوە، ژیانێکی خۆشیان هەیە، خواردنی باش دەخۆن، جلو بەرگی جوان لەبەردەکەنو خۆشگوزەرانی دەکەنو دەپرسێت:

کام رێگە لەم دوو رێیە خاسترە، رێگەی ئەو کەسانە کە خراپە بۆ خەڵک دەخوازن، یاخود رێگەی ئەو کەسانە کە کرداری چاک دەکەن؟

چلۆن ئەو کەسانەی کە جیهانیان پڕ لە جەوروستەم کردووە دەبنە مرۆڤی خاسو پێشەوایانی چاک؟

کێیە وەدیهێنەری ڕاستی؟

کێیە  وەدیهێنەری بیری خاس؟

بۆئەوەی وەڵامی ئەم هەموو پرسیارانەی بۆ رۆشەن بێتەوەو بگاتە ئەنجامی پرسیارەکانی، تێدەفکرێو بیر دەکاتەوە بۆئەوەی ئەم نهێنیە گەورەیەی بۆ رونو ئاشکرا بێت.. دەڕوانێو دەبینێ ئەم جیهانە بەهۆی یاسایەکی نەگۆڕو بێ خەوش دەسورێت، ئەم یاسایە، یاسای راستیو

دروستیه كه سەرو سامانێكی بەم جیهانه داوه، زەردەشت بەمه دەبێژێ (ئاشا) واته ڕاستیو دروستی، بەڵام ئایا زەردەشت وەڵامی گشت پرسیارەكانی وەرگرتووه؟

تێدەفكرێتەوەو بیر دەكاتەوه بێگومان نا! دەپرسێت، باشه ئەم یاسایه لەكوێوه هاتووەو سەرچاوەكەی كێیەو كوێیه؟؟

دووباره بیر دەكاتەوه، ئەگەر هەموو كارێك لەم جیهانەدا لەڕوی ڕاستیەوه بێت، بێ هیچ چەندو چۆنێك دەبێ بیرێكی زانستیانه ئەم ڕاستییه ڕابەری بكات..

لێرەدا دەگاته (وەهومنه) واته بیری خاس كه وایه (ڕاستی) لەسەر چاوەی بیرێكی خاسەوه هەڵێدەقوڵێت، زەردەشت ئۆقره ناگرێتو تێدەفكرێتەوەو ئەم پرسیاره به بیریدا دێت:

كێ ڕاستی وەدیهێنا؟

كێ بیری چاكه (وەهومنه)ی هاورده ئارا؟

لێرەدا زەردەشت دەگاته پاكترینو بێ خەوشترین دوندی بیركردنەوه.. بەڵێ لێرەدا زەردەشت دەگاته ئەو ڕاستییەی كەوا تەنیا هێزێك كه بتوانێ وەڵامی ئەم هەموو پرسیارانەی بداتەوه، ئافەریدەگارێكی تەنیایه كه زۆر ژیرو داناو توانایه.. خوای ژیانو زانسته ئاهورامەزدایه. ئاهورامەزدا، بیری زەردەشتی ڕۆشەن كرد، ڕاستی نهێنیەكانی بۆ ئاشكراكرد، وەڵامی گشت پرسیارەكانی دایەوه، فێری كرد كه چلۆن دەتوانێ خۆیو هەموو خەڵك ڕزگار بكات بۆئەوەی پێش كۆتایی هاتنی ئەم جیهانه ڕێی ڕاستیو دروستی گەیشتنه مەبەست كه بریتیه له ژیانێكی پڕ له ڕاستیو پاكیو دوور له هەموو خراپەو درۆو ناپاكییەك پێشان گشت مرۆڤ بدات، پاش ئەوەی زەردەشت بەبیری پاكو دروستەوه خوای تاكو تەنیاو داناو میهرەبانی ناسیو وەڵامی هەموو پرسیارەكانی بۆ ئاشكرا بوو، ئەوسا داوا له ئاهورامەزدا دەكا كه هێزو توانای بیری خاسی بداتی بۆئەوەی بتوانێت ڕێنمایی خەڵك بكاتو له ڕێی خراپه وەدوریان بخاتەوەو بیانگەیەنێته ڕۆخی دەریای خۆشیو ئاسایش.. زەردەشت به بیرێكی پاكەوه پەیامی ئاسمانی دەگەیەنێته خەڵك پەیامی پەیامبەر، پێش هەموو شتێك ڕاگەیاندنه به خەڵك كه خوا یەكەو داناو توانایەو هەرگیز پێویستی به قوربانیو مەراسیمی جۆراو جۆر نیه. پەیامی زەردەشت یاسای ڕاستیەكه لەنێویدا هیچ شتێك یا ڕووداوێك نه نائاسایی یه، نه بێهودەیەو نه بێماناو نه ڕێكەوته، هەموو شتێك ڕێگەو ڕاستیەكی تایبەتی خۆی هەیه. له بچوكترین گەردیلەوه تاوەكو گەردەشی كەشكەڵان، پەیامی زەردەشت گرێ كوێرەی چاكەو خراپه وەها دەكاتەوه، كه تا ئەوكاته هیچ كەسێك نەیتوانیبو كاری وا بكات، ئەم پەیامه پیرۆزه، جێگەی ئەفسانەو جادو گەرێتیو پەرستنی خوایانی جۆراو جۆری تێدا نابێتەوەو دەرگای دوكانی بازاری داوا پوچەكانی بازرگانانی ئاینیو پێشەوا درۆزنەكان دادەخات.

ئەم پەیامبەرە نەمرە، نامە پیرۆزەکەی تەنێ دەربارەی ئاینی خواپەرستیو نیازو نیایشی خوای تاکو تەنیا نەبووە. بەڵکو دەربارەی هەموو بوارەکانی ژیان وەك رامیاری، ئابوری، یاسای ژیانو خوو رەوشتو.. بە بەرزترین شێوە باسکردووە، زەردەشت بیردەکاتەوە کە بۆ رزگاری کردنی کۆمەڵگا لەوبارە ناهەموارەو بۆ وەدیهێنانی ژیانێکی خاستر بۆ خەڵک، دەبێ هانیان بدات کارو کۆشش بکەن، و لە ژیانی نێو خێوەتو بیابانگەردیو کۆچەرێتی بەرەو نیشتەجێیو کشتوکێڵێ هەنگاو هەڵێبێننو برۆن.

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە کتێبی ئاینی زەردەشت (ئاوێستا) بەتایبەتی سروودەکانی زەردەشت خۆیو بە راستیو دروستی وەریانبگرین، دەبینین لە زۆر شوێندا ئەم ئامۆژگاریانەی پێراگەیاندوین:

پێویستە رِقو کینە لە دڵمان وەدەرکەین_

بەرامبەر جەوروستەم دەبێ بەرگێ بکەین_

پاش سەرکەوتنو بەهێزبوون پێویستە چەکەکانمان دابنێینو هەوڵدەین ژیانێکی پرِ لە خۆشیو ئاشتیو ئاسایش دابین بکەین_

پێویستە بە ئازادی بژینو لە بیرکردنەوەدا ئازادبین_

خوا بیرو هۆشی پاكو راستودروستی بە ئادەمیزاد بەخشیوە، ئادەمیزادی بیر چاك تەنیا رێگەی راستو چاك هەڵێدەبژێرێ نەك رێگەی چەوتو خراپ_

ئەوانەی خاوەنی بیرو کرداروتەی خاسن، خۆشەویستی خوان لە هەر شوێنێکی جیهاندابن_

یەك رێگە هەیە لە جییهاندا ئەویش رێگەی راستی یەو هەر کەسێك رێگەیەکی دیکە بگرێتە بەر گومرِێیە_

پەرستنوستایشت کردنی ئافەریدگار، تەنیا لەرێگەی بیرو کردارو وتەی چاکەوەیە_

ژیانی پرِ لە ئاسایشو تەباییو خۆشی لە رێگەی کارو کۆششەوە دێتە دی_

خوا روناکیو چاکی تەواو سەنگەو لەنێو هەموو مرۆڤێکدا بەشێك لەم سیفەتانە هەیە _

مرۆڤی خاس ئەوکەسەیە کە ئەم سیفەتانە پەروەردە بکاتو ڵیان دوورنەکەوێتەوە_

راستی باشترین چاکەیە، و چاکە هیچ شتێك نییە جگە لە راستی_

زەردەشت ئەم پەیامبەرە نەمرە، ئەم مرۆڤە بێوێنەیە، پەیامەکەی لەسەر سێ ینچینەی گرنگ دارشتووە:

بیری چاک (هومت)، وتەی چاک (هوخت)، کرداری چاک (هورشت).

فەرهاد

## بنەماڵەی زەردەشتو پەیرەوەکانی

لە شاری (رەگا) لە باوکێك بە نێوی (فراهیم رەوا) و دایکێك بەناوی (فەرنو) کیژۆلەیەك لەدایکبو نێویان نا (دوغدو[5])

ئەم دوێتە، هەر لەهەرەتی لاوێتیدا بەربەرەکانی لەتەک نەرێتی نا پەسەندی خەڵکی دەوروبەری خۆیو ململانێیی لەتەك هەڵسوکەوتو دەستبرینی پیاوە ئاییەنیەکان دەکرد، تا رادەیەك بووە هۆی مەترسی بۆیان برێ لەو پیاوە ئاینیانە بریاریاندا کە لە ناوییەرن، (فەرنو) ناچار بوو دەستی کچەکەی بگرێتو خێڵ بەجێهێڵێتو پەنا بەرێتە بەر خێزانی (پیترسب).

پاش ماوەیەك ئەم کیژە (دغدو) بووە هاوسەری یەکێ لە کورەکانی پیترسب بە نێوی (پوروشسب) و کورێکیان بوو نێویان نا زەردەشت[6] زەردەشت لە ئاوێستادا بە زەرەتوتشترە (Zaratoshtre) نوسراوەو لە کتێبەکانی پارسیدا بەم شێوانە نوسراوە:

زەردەهشت، زارهشت، زەراتشت، زەرادوشت، زەرتشت، زەردەشت، زەرەدشت، زارتهوشت، زەراهوشت، زەرەهوشت... بەزمانی یۆنانی (Zoroaster)ی پێدەبێژن:

ناوی باوکی زەردەشت پوروشسب یا پوروش ئەسپە (Purushasb). دایکی نێوی دوغدو (Doghdu) یا دوغدڤە (Doughdova) بووە، خێزانەکەی نێوی (هووی) (Hvovi) و لە بنەماڵەی (هوگرە) Hvoguoو کچی فرەوەشتر (فرەشەهوشتر) بووە.

زەردەشت سێ کورو سێ کیژی هەبووە،

* نێوی کورەکانی بریتی بوون لە:

ئیسودو ئەستێر (Isod- vaster)، ئوروەتدنرا (Orvatad- nar)، هورەچیترا (خورشیدچهرە) (Hvare – chitra).

* ناوی کچەکانی بریتی بوون لە:

فرەنی (Freni)، تریتی (thriti)، وە پوروچیستا (Puruchista) ئەم سێ ناوە لای زەردەشتیەکان بەفرین، تهرتو پوروچسپ ناودەبرێن. زەردەشت چوار برای هەبووە کە دوانیان لەخۆی گەورەترو دوانیان لەخۆی بچوکتربوون، گەورەکان ناویان ڕەتوشتەر (Ratushtar)، رەنگوشتەر (Rangushter) بووە، دوو برا بچوکەکەی نێویان نودەریگا (Nodariga) و تیڤیدیش (Nividish) بووە.




زەردەشت، پشتاوپشت دەگاتەوە سەر فەرەیدونی کوڕی ئابتین بەم شێوەیەی خوارەوە:

زەردەشت – پوروشەسب – پیتەرەسپ – ئەردوئەسب (ئەهوروەئەسب) – هیچە دەست (هەیئچە دەسپ) – چەخشنوش – پیتەرەسپ (پەئی تیراسپ) – هەردورەشن – هەردار (هارتار)- ئەسپیتمان (سپی تامان) –ویداشت (وەئیدیشتو) – هایزم (فریش) – رەجشەن، ئاریژ، ئەرج – دوران سرون (دوراسروب) - مەنوش چهر (منوچهر) – خورنەر – فریدون – ئابتین.

لە (گاتا)کاندا[7] کە سرودی خودی زەردەشتن، باسی میدوماە (میدیومانگهە – Maidyo – Maong – ha) کراوەو ناوی لێبراوە کە یەکێکە لە بنەماڵەی ئەسپیتمان. بە قسەی نوسەری (فروردین یشت) و نوسراوو داستانەکانی زەردەشتی یەکان، ئەم میدیوماهە ئامۆزای زەردەشت

بووەو بە یەکەمین کەسان دەژمێردرێت کە باوەڕی بە قسەو ئاینی زەردەشت هێناوە، پیتەرەسب، دوو کوڕی هەبووە، یەکێکیان پوروشەسبو ئەوی دیکەیان ئیراستی (ئاراستی) بووە، زەردەشت، کوڕی پوروشەسبەو میدیوماه کوڕی ئاراستی (لەوانەیە مدیو مانگهە لە دوووشەی مدیو بە مانای ماد، مانگهە بە مانای مانگ بیت کە ماناکەی بەسەریەکەوە دەبێتە (مانگی ماد) لە فەروەردین یشت بەندی 95 نوسراوە:

(.. سڵاو بۆ ڕەوانی پاکی میدیوماهی پیرۆز کوڕی ئاراستی کە یەکەمین کەس بوو باوەڕی بە ئاینی زەردەشت هێنا)

لەسەرەتادا ئەو کەسانەی باوەڕیان بە قسەکانی زەردەشت هێناو پەیڕەوییان لە ئاینەکەی کردو داکۆکیان لێکرد، کەمبون، هەروەك گوتمان، میدیوماه کە ئامۆزای زەردەشت بوو، یەکەمین کەسێك بووە کە باوەڕی بە ئاینی زەردەشت هێناوەو یەکێك بووە لەو کەسانەی لەتەک زەردەشتدا وڵاتو کەسو کاری خۆیان جێهێشتووەو بەرەو ڕۆژهەڵات کۆچیان کردووە.

پاش میدیوماه بە نێو بانگترین کەسێ کە ڕێگەی راستی هەلبژاردو هاتە سەر ئاینی زەردەشت، گوشتاسەب بوو کە پاشایەکی هاوچەرخی زەردەشت بووەو لە ئاوێستادا بە نێویویشتاسەب (Vistaspwea) ناوی لێبراوە کە بە مانای خاوەنی ئەسپی ڕەسەنە. لە گاتاکاندا باسی دوو کەسی دیکەش کراوە کە برابوون، بەنێوی جاماسپ (jamaspa) و فرەشوشتەر (Frashoshtra) کە لە بنەماڵەی هوگوێ (Hvogva) بوونو باسی ژیرێتیو چالاکیو زیرەکیان کراوە، جاماسپ کچی زەردەشت بە نێوی پوروچیستای مارەکرد، و زەردەشت کچی فرەشوشتەر بە نێوی هووی مارەکردووە، لە یەسناکاندا (کە یەکێکە لە پێنج بەشەکانی ئاڤیستاو لە پاشاندا باسی لێدەکەین) ناوی چەند کەسێکی دیکەش براوە کە هاتونەتە سەر ڕێی ڕاستو ئاینی یەکتاپەرستیان پەسەند کردووە وەکو:

ئەسموخوەنوەنت (Asmo xvanant

ئەشنوخوەنوەنت (Asno xvan vant

گەوەینە (Gavayana)

پەرشەت گاو (Persat Gao)

وەهوەستی (Vohvasti)

ئیسوەنت (Isvant)

لەوە دەچێت کە زەردەشت دوو یا سێ جاریش ژنی خواستبێت، یەکەمین ژنی کە پێش کۆچکردنی بۆ ڕۆژهەڵاتی ئیران زەمین بووە کە نەزانراوە ئایا لەتەکیا بووە یا نا، بەڵام زێتر لەوە دەچێت کە پێش کۆچکردنی مردبێت یاخود لەتەکیا نەڕۆیشتبێت چونکە هیچ باسێکی لێنەکراوە.

## ماناى وشەی زەردەشت

کەیخوسرەوی شاهرخ لە پەرتوکی (ائینە ائین مزداپرستی) ل – 8 دەبێژێ:

زەردەشت بە مانای داناو راستگۆیەو بە مانایەکی دیکەش خاوەنیووشتری زەردو پیرە، هەندێ لە ئاوێستاناسانی وەك پرۆفیسۆر بورنیفوشەی زەرتشتر (Zarathushtra) دەکەن بە دوو بەشەوە:

زەرەث zarath. بە مانای زەرد یاخود پیر

اشتر Ushtra. بە مانایووشتر

واتە مانای زەرتشتر دەبێتە وشتری زەرد یا خاوەنیووشتری زەرد یاخود وشتری پیر.

بڕێکی دیکە لە ئاوێستاناسانی وەکو تاراپوروالا، مانای زەرتشتر بەم شێوەیەی لای خوارەوە لێکدەدەنەوە:

Zaratha: مانای زێڕین

Ushtra: لە بنچینەی اش ushی دەزانن کە بە مانای درەخشانو رووناکییە، بەم شێوەیە مانای زەرتشتر دەبێـە رووناکی زێرین، ئەم لێکدانەوەیە کاڵای پڕ بە باڵای زەردەشتە چونکە ئەم پەیامبەرە مەزنترین پیاوە لە جیهاندا کە روناکییەکی وەهای خستۆتە نێو ئەم جیهانە کە هەتاهەتایە لە درەوشینەوەدایە.

توێژەرانێکی دیکەش هەن ناوی زەردەشت بەم شێوەیە لێکدەدەنەوە:

Zara بە مانای زێرین

Thastra بە مانای هەسارە (ئەستێرە)

ماناکەی بەسەر یەکەوە دەبێـە هەسارەی زێرین

خوالێخۆشبوو ئیحسان نوری لە کتێبی (تاریخ ریشە نژادی کرد) ل 78 دەبێژێ:

(زەرتوش راسپی تمە) بە زوانی کوردی مانای (دەستەیە تیشکی زێرینی خۆرە) و بەم شێوەیەی لای خوارەوە ماناکەی لێکداوەتەوە:

| مادی | کوردی | فارسی |
|---|---|---|
| زر | زەر (زێر) | زرد، گلائی |
| تش | تیش، تیشك | شید، شعاع |
| را | را، رِو، رۆژ، خۆر | افتاب |
| سپی | سپی | سفید |
| تمە | تم، تیم | دستە، تیم |

نووسەری ناوبراو دەبێژێ کە مانای ئەم وشەیە (ناو) نییە، بەڵکو بریتیە لە نازناو. حبیب الله نەوبەخت، کە کتێبی (تاج) ی جاحڤی گۆڕیوەتە سەر زمانی فارسی دەبێژێ:

(.... دەربارەی ناوی زەردەشت ئەوەی پتر لە راستی نزیکترە دەبێ (زاراتشترا) بێت ئەم وشەیە نە بە مانای خاوەنیووشتری زەرد یاسوورە کە برێ لە ئاوێستا ناسان باسیان کردووەو نە بەمانای پرشنگی ئاگرەو نە بە مانای هەسارەی زێرینە، بەڵکو بەگوێرەی ئەو چلو پێنج ساڵەی لێکۆڵینەوەم دەربارەی مێژووی زەردەشت هەبووەو بۆم رونبۆتەوە کە:

زەردەشت جگە لەوەی کە پەیامبەر بووە، یەکێ لە خۆنکارە مەزنەکان (ماد) بووەو ناوەکەشی بریتیە لە سێ بەش:

1. زارا
2. تەشت
3. را

زارا: بە مانای دەریایە لە کوردی دا زەریایە

تەشت: بە مانای دەشتە

رابە مانای خۆنکار یا (شا) یە

کەوایە مانای زاراتشترا دەبێتە خۆنکاری دەشتو دەریا کە بە زمانی عەرەبی دەبێتە (سلطان البرو البحر)

بێگومان مانای وشەی زەردەشت هەرچیەك بێت، گەر وشتری زەرد بێت یاووشتری پیر، هیچ شتێك لە مەزنایەتیو پایەبەرزێتی ئەم پەیامبەرە کە مناکاتەوە، بەتایبەتی کە بزانین ئەم ناوەی کە دایکو بابی بۆیان داناوە، لەو سەردەمەدا باوبووە فرە لە (شا) و پیاوەگەورەکانو پاڵەوانەکان، ئەو جۆرە ناوانەیان هەبووە وەکو:

جردگو (گای پیر) – جرداس (نۆکەری پیر) – جردوکش (درەختی پیر) – فرشوشتەر (ووشتری گەنج) – ئەواروشتر (بێچووەووشتر) – گەرشاسەپ (ئەسپی لەر) – گەرشیوز (بێ توانا) – گەرشانگ (لەرو بێ توانا)...

## کاتو سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت

بەر لەوەی دەستبکەین بە باسکردنی کاتو سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت دەبێ دان بەوەدا بنێین کەوا تا ئێستا مێژووی ڕاستو دروستی پەیدابوونی زەردەشت نادیارەو ناتوانین بە بەڵگەو شێوەیەکی دروستو تەواو بێژین کەوا پەیامبەر لەفلان ساڵ هاتۆتە دنیا، چونکە مێژوونوسەکان هەر لە مێژەوە تا ئێستا ئەوەندەی بۆچونو باوەڕی جیاوازیان هەیە بۆ ئەم مەسەلەیە کە دژوارە بتوانین مێژوویەکی تەواوەتی بۆ دابنێین.

گەلێ لە مێژوونوسان لەدایکبوونی زەردەشت بە سەدەی شەشەم یا حەوتەمی (پ.ز) دادەنێن، لەکاتێکدا هەندێکی دیکەیان ئەم مێژوە دەگەیەننە نزیکەی هەشت هەزار ساڵ (پ. ز)

ئاوێستا ناسەکانو ڕۆژهەڵات ناسەکانیش هەندێکیان پالێپشتی دەستەی یەکەمو برێکیان پالێپشتی دەستەی دووهەمن، و دەستەیەکی دیکەیان پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر باوەڕی هەردوو دەستەکە بە ڕاست نازانن‌و لەبەر ڕۆشنایی مێژوودا کاتی پەیدا بوونی زەردەشتیان داناوە، بەپێویستدەزانم کورتەیەك دەربارەی هەر سێ بۆچونەکان بخەمە بەرچاو:

## بیرۆکەو بۆچونی یەکەم:

زوربەی زۆری زەردەشتیەکانوفرە لە نووسەرە ئیسلامیەکان لەوباوەڕەدان کە مێژووی پەیدابوونی زەردەشت، دەگەرێتەوە بۆ دەوروبەری شەش سەد ساڵ (پ.ز)

1. زادسپرم، موبدی سیرکان (سیرجان) کە برای (منوچهر)ی گەورەی موبدان بووە لە شیرازو پارسو نووسەری کتێبی (داستان دینی) و (نامە های منوچهر)ولەسەردەمی مەئمونی خەلیفەی عەباسیدا ژیاوە، لەوباوەرەدا بووە کە ماوەی نێوان پەیدابوونی ئاینی زەردەشت تا

ڕوخاندنی دەوڵەتی پاشایەتی ئێران بە دەست ئەسکەندەری مەقدۆنیو کوشتنی داریوشی سێهەم (دارا) نزیکەی 300 ساڵ دەبێت.

2. لە بەشی یەکەمی کتێبی (ئەردایویراف نامە) نووسراوە:

((پاش ئەوەی زەردەشتی پاك ئاینی یەکتاپەرستی لە ئاهورامەزدا وەرگرت، و بەناو خەڵکدا بڵاوی کردەوە، ئەم ئاینە ماوەی 300 ساڵ بە پاکیو بێدەسکاری مایەوە، و خەڵکی هیچ جۆرە گومانو ڕاڕایی یەکیان لێ نەبوو، تاوەکو لە ئەنجامدا ئەهریمەنی ناپاك بۆئەوەی دوو دڵیو ڕاڕایی بخاتە نێودڵی خەڵکەوە ئەسکەندەری مەلعونی ڕۆمی هاندا کە هێرش بەرێتە سەر ناوچەی ئێرانوویرانی بکات، وە شای ئیران بکوژێتو پایتەختەکەی خاپور بکات..))

لەم داستانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ماوەی نێوان پەیدابوونی زەردەشتو هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران 300 ساڵ بووە.

3. نووسەری (بندهش) ماوەی نێوان کاتی پەیدابوونی زەردەشت تا وەکو مردنی ئەسکەندەر بە 272 ساڵ دادەنێتو دەبێژێ:

لەبەر ئەوەی ماوەی فەرمانڕەوایی ئەسکەندەر تەنیا 14 ساڵ بووە، دەبێ ماوەی پەیدا بوونی زەردەشت تا ڕوخاندنی دەوڵەتی هەخامەنشی ئیران بە دەست ئەسکەندەر 258 ساڵ بو بێت.

4. مەسعودی لە کتێبی (مروج الذهب الجزو الثاني، ص 230) دا دەبێژێ:

(وزعمت المجوس أن من وقت زرادشت بن اسبيمان نبيهم الى الاسكندر مائتين و ثمانين سنة ، و ملك الاسكندر الى ملك اردشير خمسمائة سنة و سبع عشرة سنة ، ومن ملك اردشير الى الهجرة خمسمائة سنة و اربع و ستون سنة)

بەگوێرەی نووسینەکانی مەجوسەکان (زەردەشتیەکان) لەسەردەمی زەردەشتی کوڕی ئەسپیتمانی پەیامبەریان، تاوەکو هێرشی ئەسکەندەر 280 ساڵ بووە.

بەڵام هەمان نووسەر (مەسعودی) لە کتێبێکی دیکەدا (التنبيهو الاشراق) دەڵێت کە ئەم ماوەیە 300 ساڵ بووە.

ئەبورەیحانی بیرونی کە نوسەرێکی دیکەی ئیسلامە ماوەی نێوان ئەم دوو ڕوداوە بە 258 ساڵ دادەنێت، لەبەر ئەوەی ئەسکەندەری مەکدۆنی لەساڵی 331 (پ.ز)دا هێرشی کردۆتە سەر ئێرانو داریوشی سێهەم کە دوا شای هەخامەنشی یەکانی بووە، لە ساڵی 330 پ.ز کوژراوە، هەروەها لەبەر ڕۆشنایی باوەڕی ئەو نووسەرانەی ناومان بردن دەبێ کاتی پەیدابوونی زەردەشت یا 630 ساڵ (330+300) یاخود 588 ساڵ پ.ز (330+258)بێت.

ئەمیانوس مارسلینوس(Ammianus Marcellinus)ی رۆمی کە لە 330 زاینی ژیاوە، پالێپشتی ئەم باوەرە بووەو دەبێژێ:

((ئاینی موغ زانیاریەکە کە زەردەشتی بەلخی لەسەردەمی فەرمانرەوایەتی گوشتاسەبی باوکی داریوشدا بڵاوی کردۆتەوە..))

کۆنترین نوسراوێك لەم بارەوە کە لە یۆنانیەکانەوە ماوەتەوە، بریتیە لە داستانی گفتۆگۆی پیتاگۆرس (پیتاگوراس Pitagoras) لەتەک زاراتاس Zaratasیا زابراتاس Zabratas کە لە بابلو شوش چاویان بەیەکتر کەوتووە. ئەم زاراتاسە یا زابراتاسە لەسەردەمی کەمبوجیە (522-529) و داریوش دا ژیانەوەو لەسەردەمی کەمبوجیەدا، بەهۆی ناکۆکی لەتەک موغەکاندا، لەووڵات دور خراوەتەوەو لەسەردەمی داریوشدا، لە بابلەوە گەڕاوەتەوە بۆ شوش، ئەگەر ئەم داستانە ڕاست بێت، و ئەم زاراتاسە هەمان زەردەشت بو بێت، سەدەی شەشەمی پ.ز بەسەردەمی لەدایکبوونی زەردەشت دەژمێرێت.

دیاکونوف لە کتێبی (تاریخ ماد) دەبێژێ:

بەبۆچوونی ئێمە ئەوەی کە پتر لە ڕاستی نزیکترە ئەوەیەکە مێژووی لەدایکبوونی زەردەشت دەگەڕێتەوە بۆ +_700 پ.ز.

لە ڕۆژهەڵاتناسانو ئاوێستا زانانی ئەم چەرخە، (جاکسۆن Jackson)ی ئەمریکیو (وست West)ی ئینگلیزیو (میلەر Meller)ی فەرەنسی لەتەک ئەم بۆچونەدانو دەبێژن کە زەردەشت لەسەردەمی گوشتاسەبی باوکی داریوشی گەورەی هەخامەنشی دەرکەوتووە.

ئەم باوەڕو بۆچونانە، هەر چەندە لایەنگیرانێکی زۆریان هەیە، بەڵام لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە، لەلایەن زوربەی زانایان بەرپەچ دراونەتەوە:

1- ڕاستە لە گاتەکاندا زەردەشت فەرموویەتی کە لەسەردەمی حوکمڕانێتـی گوشتاسەب، پەیامی ئاسمانی خۆی بڵاوکردۆتەوە، بەلام ئەو گوشتاسەبەئەو باسیدەکات جیاوازەو ئەو گوشتاسەبەی باوکی داریوش نیە، ئەم دوانە لەبەر ڕۆشنایی ئەم سێ خاڵەی لایخوارەوە دووکەسی جیاوازن:

أ – ئەو گوشتاسبەی لەسەردەمی زەردەشتدا فەرمانڕەوایەتی کردووە، هەروەك لە ئاوێستادا نوسراوە، کوڕی ئەرودئەسپ (ئورت ئەسپا)یە Aor vat aspaو لە شانامەی فردوسی بەنێوی لهراسب نێوی لێبراوە، ((کەی گوشتاسەب (کاوئوستاسپە) کوڕی لهراسب (ئورت ئەسپا) کوڕی کەیخوسرەو (کاوا هوسراوا) کوڕی کەیکاوس (کاوی ئوسا) کوڕی کەیقوباد (کاوی کواتا))) و لە (کەیانی)[8] یەکان بووە کە لە ئاوێستا بە نێوی

کەویشتاسەبKaviwshtaspa ناوبراوە یانی کەی گوشتاسەب. فردوسیو دەقیقی دوو شاعیری بەناوبانگی فارسن، پالپشتی ئەم باسەنو بە یەکێك لە (شا) کانی کەیانیان دادەنێن.

ب- لە کتێبی (تاریخ ادبیات ایران در عصر هخامنشی) نوسینی پرۆفیسۆر عباس مهرین، دەقی بەشێك لەو نووسینەی کە داریوش گەورەی هەخامەنشی لەسەر بەرد لە کێوەکانی بێستون هەڵیکۆڵیوە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە باس دەکات.

(ادم داریەواوش خشیەتیەو زرگە خشیەتیە، خشیەتیە نام خشیەتیە پارسائی خشیە تیە دهیو نامویشتاسپهیا پوترە ارشمهیاتیە) ماناکەی:

((منم داریوش شای گەورە، شای شایان، شای پارس، شای سەرزەمینی پورویشتاسەب (گوشتاسەب) کوڕەزای ئارشام))

گوشتاسەبی باوکی داریوش هەخامەنشیو لە بنەماڵەی هەخامەنشیە. داریوش دەبێژێ:

((باوکی منویشتاسبە باوکیویشتاسب ئەرشامە، باوکی ئەرشام ئەریەرمنە، باوکی ئەریەرمن چشەپشو باوکی چشەپش هەخامەنشە، بۆیە بە ئێمە دەبێژرێت هەخامەنشی))

ج- زەردەشت لە گاتاکاندا کە ناوی کەی گوشتاسەب دەبێت، بە (شا) نێوی دەبێو پێی دەبێژێ کەی گوشتاسەبو ئەم گوشتاسەبە (شا) یەکی بەهێزو توانابووە، لەکاتێکدا باوکی داریوش (شا) نەبووە بەڵکو فەرمانڕەوای تەنیا ناوچەی (پارپ) بووەو لە دەوروبەری سەدەی شەشەم پ.ز ژیاوە.




سەرچاوە: کتێبی (ایران باستان) بەشی یەکەم ل- 231 ، نوسینی حسن پیرنیا / ێبینی:لەبەرامبەر ئەو ناوانەی فەرمانرەوایەتی ناوچە بوون،ژمارە دانراوە

2- ئەگەر زەردەشت لەسەردەمی گوشتاسەبی باوکی داریوش پەیدا بو بێت دەبوایە شاگەورەکانی هەخامەنشی وەك کۆرشی گەورە کە سەر زنجیرەیان بووە، هەروەها کەمبوجیاو داریوش، لە کتێبی ئاوێستادا ناویان لێببرایە، بەڵام لە هەموو بەشەکانی کتێبی ئاوێستادا نە ناوێك لە شاکانی هەخامەنشیو مادەکان براوەو نەباسێکیش دەربارەی تەختی جەمشیدو هەمەدان (ئەکباتان) کە پایتەختی ئەو دوو دەوڵەتە گەورەیە بون کراوەوابزانم ئەمە

گەورەترین بەڵگە بێت بۆ سەلماندنی ئەوەی کە زەردەشت زۆر لە پێش گوشتاسەبی باوکی داریوش بووە.

3- هیرودتس Herodotus، مێژوونوسی بەناوبانگی یۆنانی کە لە ساڵی 484 پ.ز ژیاوەو گوێیا گەشتێکی بە نێو ئێراندا کردووە، لە کتێبێکدا باسی گەلێ لە شاکانی میدیای کردووە وەك، دیاکۆ، فرەوەرتی وەهو خەشترە، ئاستیاك، هەروەها باسی چوار لە شاکانی هەخامەنشی کردووە (کوروش، کەمبوجیا، داریوش، خەشایارشا) وە باسی چوێنیەتی ژیانی ئەو سەردەمەی ناوچەی ئیرانی کردووە، بەڵام لە کتێبەکەیدا بە هیچ جۆرێك باسێکی لە زەردەشت نەکردووەو ناوی نەبردووە.

ئاشکرایە ئەگەر زەردەشت وەکو دەبێژن لەو سەردەمەدا پەیدا بو بێت دەبوا ئەو مێژوونوسە بەناوبانگە پەنجەی بۆ ڕاکێشایە چونکە باسو ڕوداوێکی وەها گرنگ چون لە خامەیوا مێژوونوسێك دەکەوێت، وەیا لە یادی دەچێت باسێکی لێبکاتو چەندین لاپەرەی کتێبەکەی پێ نەڕازێنێتەوە.

## **بیرۆکەو بۆچونی دووهەم:**

بۆچونی دووهەم بریتیە لە بیروراِی زۆربەی نووسەرو مێژوونوسەکانی یۆنانی کە دەربارەی سەرزەمینی ئێرانو ئاینی زەردەشتی فرە شتیان لە کتێبەکانیاندا نوسیوە، ئەمانە مێژوی پەیدابوونی زەردەشت دەگێڕنەوە بۆ 8000 ساڵ لەمەوبەر، واتە 6000 ساڵ پ.ز.

1- یەکەمین کەسێك کە دەربارەی زەردەشت شتی نوسیوەتەوە ئەکزان توس (کسانتوس Xantus) بووە کە لە سەدەی پێنجەمی پ.ز لە شاری (سارد)ی پایتەختی لیدی ژیاوەو هاوچەرخی خەشایارشا (485 -464) چوارەمین شای هەخامەنشی بووە.

ئەو کتێبەی کسانتۆس نوسیوێتی ئێستا نەماوە، بەڵام دیوژنس لرتیوس ( Diogeues Leartius)ی یۆنانی کە لە ساڵانی 210 پاش لەدایکبوونی حەزرەتی عیسی ژیاوە، لە کتێبێکدا دەربارەی خستانوس، چەند شتێکی نوسیوەو لە زمان ئەوەوە دەبێژێ کە زەردەشت 6000 ساڵ پێش هێرشی خەشایارشا بۆ سەر یۆنان ژیاوە (ئەم هێرشە لە ساڵی 480 پ.ز رویداوە) لە بڕێ لە ژمارەکانی ئەو کتێبە لە بریتی 6000 ساڵ، 600 ساڵ نوسراوە. وە تا ئێستا ئاشکرا نەبووە کە کامیان راستترە، (لەو سێ نوسخەیەی کەلە کتێبی ناوبراو ماوەتەوە، یەکێکیان ساڵی 600و دوانەکەی دیکەیان ساڵی 6000 نوسراوە).

2- پلینوس Plinius نووسەری رۆمی (23-79ز) کتێبێکی گەورەی هەبووە بە نێوی Historia – Naturalis کە لەبەشی 30 سیهەمیدا نوسیوویێتی ئەرستۆو

ئەدكسوس Eudoxus کە هەردووکیان لە قوتابیانی ئەفلاتونی فەیلەسوفی بە نێو بانگی یۆنانین، مێژووی ژیانی زەردەشت بە 6000 ساڵ پێش مردنی مامۆستای خۆیان دەزانن.

پلینوس لە هەمان کتێبدا دەبێژی کە هرمیپوس (یەکێك لە زانا مەزنەکانی یۆنان بووەو لە ساڵانی 250 پ.ز دا ژیاوە ژیانی زەردەشتی بە 5000 ساڵ پێش شەڕی تەرواده (ترویا Troy) کە لە ساڵی 1184 پ.ز ڕویداوە، داناوە . پلینوس دووبارە دەبێژێت کە موسا چەند هەزار ساڵێك پاش زەردەشت هاتووە.

3- دیوژنس لرنیوس کە لە مەوبەر ناومان برد، لە کتێبێکدا دەربارەی یەکێکی دی لە شاگردەکانی ئەفلاتون دەدوێت بە نێوی هرمودوروسHermodorosو دەبێژێ کە ئەم هرمودوروسەش مێژوی ژیانی زەردەشتی بە 5000 ساڵ پێش شەڕی تەرواده داناوە.

4- پلوتارك مێژوونوسی یۆنانی (46-125ز) مێژوی ژیانی زەردەشت بە 5000 ساڵ پێش شەری تەرواده دادەنێت.

5- سوئیداس Suidas (970ز) کتێبێکی فەرهەنگی هەبووە کە تێیاد لەژێر وشەی زەردەشت نووسیویێتی کە ئەم پەیامبەرە لە 5000 ساڵ پێش شەڕی تەرواده لەدایکبووە.

6- زانای ئەڵێمانی بارۆن بون سن Baron Bunsen لە کتێبێکدا بەنێوی Egypts place in universal History سەردەمی ژیانی زەردەشت بە 6500 ساڵ پێش لەدایکبوونی عیسا دەژمێرێت.

7- ڤۆلتێر Volter ی فەرەنسی سەردەمی ژیانی زەردەشت بە 6000 ساڵ پێش کوروش دادەنێت.

لەبەر ڕۆشنایی باوەڕی ئەو نووسەرو مێژوونوسانەی ناومانبردن ئەم خاڵانەی خوارەوەمان وەدەستدەکەوێت:

أ- زوربەی نوسەرانی یۆنانو رۆمی، کاتو سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت بە 5000 ساڵ پێش شەڕی تەرواده دادەنێنو لەبەر ئەوەی ئەو شەڕە لە ساڵی 1184 پ.ز ڕوویداوە کەواتە دەتوانین بێژین مێژووی پەیدابوونی زەردەشت بە باوەڕی ئەو نووسەرانە دەبێتە 6184 ساڵ پ.ز (5000+1184).

ب – دوو کەس لە قوتابیانی ئەفلاتون (ئەرستۆو ئەدکسۆس)مێژووی پەیدابوونی زەردەشت بە 6000 ساڵ پێش مردنی مامۆستای گەورەی خۆیان دەزانن، ئەفلاتون لە ساڵی 347 پ.ز کۆچی دوای کردووە.

کەواتە بە قسەی ئەرستۆو ئەدکسۆس، دەبێ کاتو سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت ساڵی 6347 پ.ز بو بێت (6000+347).

ج – لەبەر ئەوەی هێرشی خەشایارشا بۆ سەر یۆنان لە ساڵی 480 پ.ز ڕوویداوە، بە قسەی خستانوس دەبێ کاتی پەیدابوونی زەردەشت ساڵی س6480 پ.ز بو بێت (6000+480).

ڕۆژهەڵاتناسانو ئاوێستا زانان بەرپەچی ئەو کەسانەی دەدەنەوە کە مێژووی 6000 ساڵ پ.ز بە کاتی پەیدابوونی زەردەشت دادەنێنو بەڵگەیان ئەوەیە کەوا مێژووی ئێران زەمین تەنیا لەسەردەمی مادەکانەوە ئاشکرابووەو ئەوانەی پێش ئەمان ژیاون، تا ئێستا مێژوویان ڕوون نەبۆتەوەو هیچ ئاسەوارێك لەشاکانی پێشدادیو کەیانییەکان کە لە ئاوێستاو شانامەی فیردەوسی، باسیان لێکراوە نییە، و زوربەی زۆریان ئەم شایانە بە داستانی ئەفسانەیی دادەنێن، بەڵام هیوادارین کە بەهۆی توێژینەوەی زانستی رۆژێك بێت کە ئاسەوارو خشتە نوسراوە شاراوەکان لەنێو جەرگەی خاکدا بدۆزرێتەوەو بە شێوەیەکی زانستانە دەربارەی مێژووی دێرینی میللەتانی ئاری بەتایبەتی نەتەوەی کوردو پەیامبەری مەزنو نەمرمان زەردەشت ئەو شتانەیونو نادیارن ئاشکرا بنو پەردە لەڕوی ئەم ڕازە گەورەیە ڕابماڵێرێت.

## <u>بیرۆکەو بۆچونی سێهەم:</u>

زۆربەی ئاوێستاناسانو ڕۆژهەڵاتناسانی ئەم چەرخانەی دوایی، کە دەربارەی مێژووی دێرینی ئێران، توێژینەوەیان بووەو دەربارەی کاتو سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت، لێکۆلێنەوەیەکی فرەیان بووەو گەیشتونەتە ئەو ڕاستییەی کەوا بۆچونی دووهەم پەسەند نەکەن، لەبەر ئەوەی ئەو مێژووەی دایاناوە، زۆر کۆنەو دەکەوێتە پێش زانیاریمان دەربارەی مێژوو، وە تا ئێستا هیچ شتێکی زانستی دەربارەی ئەوکاتە نەزانراوە، هەروەها بۆچونی یەکەمیش پەسەند ناکەن لەبەر ئەوەی مێژووەکەی زۆر لەوە نزیکترە کە ڕاستی پالپشتی بکات هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد.

بەپێویستدەزانم لێرەدا باوەڕو بۆچونی برێ لە زانایانی ئەم چەرخە بخەمە پێش چاو:

خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر پورداود کە یەکێکە لە هەرە بەناوبانگترین ئەو کەسانەی کە زوربەی ژیانی خۆی تەرخان کرد بوو بە لێکۆلێنەوە دەربارەی مێژووی ژیانی زەردەشتو ئاینی خواپەرستیو زمانی ئاوێستا، ناوبراو لە کتێبەکانی خۆیدا، پاش یاداشتکردنی باوەری زۆربەی نوسەرەکان گەیشتۆتە ئەو راستییەی کەوا مێژووی پەیدابوونی زەردەشت چەرخی هەشتەمی پ.زو زورتر بووە، و زێتر بە 1080 ساڵ پ.ز دادەنێت، شاپور شهبازی، کە

یەکێکە لە توێژەرە بەناوبانگەکانی سەردەم، سەبارەت بە داستانە مێژووییەکانو مێژووی خەوارەزموسیاوەش ساڵی 1080 پ.ز بە ساڵی لەدایکبوونی زەردەشت دەژمێرێو دەبێژێ:

(بە گوتەی – بیرونی – خوارەزمییەکان کاتی هاتنی سیاوەش کوڕی کەیکاووس بۆ خوارەزمو فەرمانڕەوایەتی ئاسیای ناوەندیان کردۆتە مێژووو ڕۆژی نەتەوەیی خۆیان، ئەم ڕووداوە لە 888 ساڵ پێش ئەسکەندەری مەکدوێنی. واتە 1200 ساڵ پ.ز بووە، بەگوێرەی ئەوەی کە لە شانامەدا هاتووە، فردەوسی چوار نەوە لەنێوان سیاوەشو زەردشت دەستنیشان دەکات، کەوایە، بەگوێرەی ئەم بۆچوونە ئاینی زەردەشتی دەبێ نزیکەی 1080 پ.ز بڵاو بووبێتەوە.

لەبەر ئەوەی بیرونی خۆی خەڵکی خەوارەزم بووەو خەوارەزمییەکان بە (کەلتورپەرستی) بەناوبانگبون دەشێ ئەم مێژووە ڕاستتر بێت لە مێژووەکانی ساسانییەکان)

ویلهام گیگری ئەڵێمانی، بارتلومە، ریخلت Reikhltو ئاندریا Andrea F.C. ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵێمانی تێل Tiele C.P.ی هۆلێندی کلیمن C.Clemenتوێژەری فەرەنسەیی، لە نوسینەکانی خۆیاندا، کاتو سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت، بە چەرخی نۆهەمی پ.ز دەزانن. دکتور دالا کاتی پەیدابوونی زەردەشت بە 1000 ساڵ پ.ز دادەنێت. ژبیح الله بهروز، پاش لێکۆلێنەوەیەکی یەکجار زۆرو بەهۆی ژمارەگەرییەکی ئەستێرە ناسینەوە گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە بە تەواوەتی کاتی لەدایکبوونی زەردەشت بە نەورۆزی ساڵی 1768 پ.ز دادەنێت.

پرۆفیسۆر میلز، زانای ئینگلیزیو مامۆستای زمانی ئاوێستاییو وەرگێری گاتاکان، کاتی پەیدابوونی زەردەشت بە زێتر لە 1500 ساڵ پ.ز دادەنێت، ئەم زانایە (میلز) دەبێژێ:

تا چەند ساڵێك لەمەوبەر، وامدەزانی کەنابێ کاتی پەیدابوونی زەردەشت زێتر لە 1500 ساڵ پ.ز بێت، بەڵام پاش لێکۆلێنەوەو خوێندنەوەی سەرچاوەکان، بۆم رونبۆوە کە هەر چەند کاتی پەیدابوونی زەردەشت لە 1500 ساڵ پ.ز، پێشترو مەنتیقی (لوێژیکی) ترە، چونکە هەر کاتێك زمانی گاتاکان بە پێش سەردەمی خۆرپەرستن بزانین، دەتوانین ئەم کتێبە ئاسمانیە بە کۆنترین کوێنوسی خەتی بزانین کەتا ئێستا گەیشتۆتە دەستمان، بەڵام بەگوێرەی هەموو ئەو ڕاستیانە بەتایبەتی مێژووی دێرینی ئێرانو ئەو هەموو گۆرانکاریانەی کە بەسەر زمانە ئارییەکان هاتووەو هەروەها نەبوونی ناوی (مهر) و (هوم) لەنێو گاتاکاندا (مەبەستمان لەو دوو ئیزەدەیە کە لە ئاوێستای نوێداو لە ڕێگـوید بە دورودرێژی باسیان لێکراوە)

ئەمانە هەموو وا پیشان دەدەن کە ماوەیەکی یەکجار زۆرو ساڵانی فرەی خایاندووە تاوەکو ئاینێك کە هیچ جۆرە ئەفسانەو دەمارگیرێتی تێدا نەبووە ئا بەم جوێرە تووشی نوشوست بێت،بێگومان ئەو ئیزەدە هاوبەشانەی کە لە (یەشت)ە کانو ڕێگـوید باسیان لێکراوە، فرە کۆنن، کەوایە ئەگەر کاتو سەردەمی گاتاکان بە پێش پەرستنی ئەم ئیزەدانە بزانین (چونکە لە

گاتاکاندا بە هیچ جورێك باسی ئەمانە نەکراوە). ناتوانین مێژوویەکی دیاریکراو بۆ دێرینێتی گاتاکان دابنێین.

فیروز ئازەر گوشەسب موبدی زەردشتیەکان، لەوباوەڕەدایە کەوا کاتی پەیدابونی زەردەشتی نەمرو پاك، دەگەرێتەوە تا 3000 ساڵ پ.زو بەرەو ژورتریش.

پرۆفیسۆر رامپیسی ئەلێمانی لەروی بەراورد کردنوشەی ئاهورامەزدا کە لە گاتاکاندا، هەروەها لە کتێبو نوسینەکانی سەردەمی هەخامنشی یەکاندا باسکراوە، درکی بە دێرینی سەردەمی زەردەشت کردووە، ئەم زانایە دەبێژێ:

(لەسەرانسەری گاتاکاندا وێرای ئەوەی کە زێتر لە 200 جار ناوی ئاهورامەزدای تیا هێنراوە، وەلێ زوربەی زۆری بەشێوەی مەزدائاهورا، وەیاخود بە شێوەی جیاجیا وەك مەزدا، ئاهورا نێوبراوە، کەچی لەسەر بەردە نوسراوەکانی هەخامەنشی یەکانی هەمیشە ناوی خوا بە ئورمزد (هورمزد) ئاهورامەزدا براوە، ئەم باسە وادەگەیەنێت کەوا ماوەیەکی یەکجار زۆری خایاندووەو دەتوانین بێژێن هەزارەها ساڵی پێچووە بۆئەوەی ناوێکیوا کە رۆژانە چەندین جار، لەسەر زمانی خەڵک بووە، ئا بەم شێوەیە بگۆرێت یانی لە شێوەی مەزدائاهوراوە بگۆرێت بۆ ئاهورامەزداو ئورمزد، گۆرینی زمان بەم شێوەیە زۆر مەحاڵە لە ماوەیەکی کورتو کەمدا ڕوبدات، مەگەر ئەوەی چەند سەدەیەکی بەسەردا تێپەرێت)، بەگوێرەی ئەو قسانەی رامپیس دەبێ کاتی پەیدابوونی زەردەشت دەوروبەری 3500 ساڵ پ.ز بێت.

قازی صاعد الاندلوسی (420-462 ە.ق) لە کتێبی (التعریف بگبقات الامم) ل. 161 -162، دەربارەی خونکارانی ئێرانو ئاینی دێرینی ئەو ناوچەیەو گوشتاسەب شاو باوەرو کاتی پەیدابوونی زەردەشت باس دەکاتو دەبێژێ:

کە زەردەشت 1300 ساڵ پێش کوشتنی یەزدەگوردی سێهەم (دواشای ساسانیەکان) پەیدابووە.

ئەدورا مایر دەبێژێ:

سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت دەگەرێتەوە بۆ 1000 ساڵ پ.ز ناوبراو ئاماژە بۆ ئەو نوسینانە دەکا کە لە خوێنکارەکانی ئاسوری لە چەرخی هەشتەمی پ.ز بەجێماوەو تیایدا ناوی مەزدکۆ Mazdako کە یەکێك بووە لە شازادەکانی ماد، براوە ناوبراو دەبێژێ کە ئەم ناوە، لە مەزداپەرستی یەوە وەرگیراوە کە لەنێو مادەکاندا لایەنگیرانێکی فرەی هەبووە، مایر، دەبێژێ کە مەزداپەرستی پێش چەرخی هەشتەمی پ.ز لەنێو مادەکاندا بووەو پاشان بەرەو (پارس) رۆشتووە.

گولدنەر، سەرەتا مێژووی لەدایکبوونی زەردەشتی وەك بۆچونی یەکەم زانیوە، پاشان باوەڕی بەوە هێناوە کە زەردەشت لە 1000 ساڵ پ.ز لەنێو مادەکاندا هاتوتە جیهان‌و ئاینی مەزداپەرەستی بڵاوکردۆتەوە.

بارتلومە لەدایکبوونی زەردەشت بە 900 ساڵ پ.ز دادەنێت، ویسن دونك wesen donck، لەدایکبوونی زەردەشت بە 900 تا 1000 ساڵ پ.ز دادەنێت.

مولتون، لەدایکبوونی زەردەشت بە 900 تا 1800 ساڵ پ.ز دادەنێ، پرۆفیسۆر هومل Hummelی ئەڵێمانی سودی لە خشتە نوسراوەکانی ئاسوریەکان وەرگرتووە کەلە 1000 ساڵ پ.ز نوسراوەو تیایدا ناوی ئاسورا – مازا Assors – Mazza بە مانای ئاهورامەزدا لێکداوەتەوەو دەبێژی کە سەردەمی پەیدابوونی زەردەشت دەگەڕێتەوە بۆ پێش هەزارەی یەکەمی پ.ز.

پرۆفیسۆر هیپل Hippel پسپۆری زمانەوانی ئەڵێمانی بەهۆی زانستی زمانەوانی نوێ وە لەوباوەڕەدایە کە زەردەشت بە لایەنی کەمەوە 1000 ساڵ پ.ز لەدایکبووە.

پرۆفیریۆس Prophyrius نوسەرێکی یۆنانی بووەو لە سەدەی سێهەمدا ژیاوە ئەم نوسەرە پیتاگۆرسی زانای بەناوبانگی یۆنانی (497 – 582 پ.ز) بە قوتابی زەردەشت دەزانێت‌و لەوباوەڕەدا بووە کە فیپاغوێرس زۆر نهێنی لە موغەکانەوە فێربووە. ئەم نوسەرە لە زمان فیپاغۆرسەوە دەبێژێ:

کە موغەکان دەربارەی خوایەك بەناوی (ئەرومازسی) دواون کە لەشی لە روناکیەکی (بێ خەوش – خالص) پێکهاتووە، ڕۆحی ئەم خوایە تەنیا باوەری بە راستی هەیەو دژی درۆو خراپەیە.

سن سیلوس‌و پانودوروس، دوو نوسەری رۆمی بون‌و مێژوی زەردەشت بە 1200 ساڵ پ.ز دەزانن.

هەخامەنش، دامەزرێنەری بنەماڵەی هەخامەنشی، سەرەتا لەژێر چاودێری مادەکان‌و ئیلامی یەکاندا، دەوڵەتێکی دامەزراند، لە پاشاندا کورەکەی چیش پیش (640-675 پ.ز) خۆی لە دەست ئیلامیەکان رزگار کردو ناوچەی (پارساو ئەنشان)ی خستە سەرووڵاتەکەی، پاش ئەمەووڵاتەکەی لەنێوان دوو کورەکانی دابەشکرد، ئاریارامش Ariaramaes (640-590) و کورشی یەکەم (600-640) شایانی باسە، سینی یەکی زێرین لە ئاریارامش بە جێماوە کە دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی حەوتەمی پ.ز لەم سینی یەدا نوسراوە:

((ئەمە خوای مەزن هورمزدە کە ئەم‌ووڵاتەو ئەم خونکارییەتیەی بە من بەخشیوە..))

ئەم نوسینەوادەگەیەنێت کە لە چەرخی حەوتەمی پ.ز دا ئاینی زەردەشتی لەوناوچەیەدا رەخنەی کرد بو، کەوایە دەتوانین بێژین کە پەیدابوونی زەردەشت فرە پێش هەخامەنشی یەکان بووە.

دکتور جیهانگیر ئۆشیدەری (موبدی موبدان) بە بۆنەی ساڵیادی شەهادەتی زەردەشت لە (هۆڵی بەهمەن) ی ئەنجومەنی زەردەشتییەکانی تاران، لە ئاخافتنێکدا کە لە رۆژنامەی (صبح امروز) ژمارە 299 رۆژی دووشەممە 27 دیسەمبەری 1999 (6ی دەی مانگی 1378) دەبێژێ:

(.... زەردەشت لە تەمەنی سی ساڵیدا، پاش ئەوەی دە ساڵ لەخەلێوەتدا بووە، و بیری لە چۆێنیەتی باری ژیانو هەلێسوراندنی کردۆتەوە، کتێبی ئاوێستای پێ ئیلهام کراوەو بە پەیامبەریتی هەلێبژێردراوە، هەنۆکە 3737 ساڵ بەسەر ئەو رووداوە تێپەر دەبێ، ناوبراو درێژە بە قسەکانی دەداو دەبێژێ، زەردەشت لە تەمەنی 77 ساڵیداواتە 1691 ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح لەتەک 72 کەس لە پەیڕەوەکانیدا شەهید دەبن...)

ئەوە بوو کورتەیەك دەربارەی باوەری هەندێ لە زانایان سەبارەت بە کاتو سەردەمی پەیدابوونی ئەم پەیامبەرە نەمرە، لێرەدا دەمانەوێ بێژین، هەر چەندە هەمووومان دەخوازینو پێمان خۆشە، رۆژی لەدایکبوونو شوێنو کاتو هەموو شتێك دەربارەی ژیانی پەیامبەرەکان بە گشتی بزانین.

بەتایبەتی گەورەترین شانازی نەتەوەکەمان، زەردەشت، کە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئادەمیزاد بانگی پەرستنی خوای تاکو تەنیای داوە، بەڵام دەبێ باوەرمان بەو راستی یە هەبێت کە نەزانینی ئەم زانیاریانە هیچ لە گرنگیو پلەو پایەی ئەم ئاینە کەم ناکاتەوە، وە هیچ گەردێك ناخاتە سەر گەورەییو پێرۆزیو پێویستی ئەم پەیامە، هەروەك چلۆن دەزانینو بۆمان ئاشکرایە کە (خۆر)، هەموو رۆژێك لە ڕۆژهەڵاتەوە هەلێدێت، و بە تیشکی بە تینو زێرینی خۆی زەوی رووناك دەکاتەوەو گەرمایی پێدەبەخشێو مایەو هۆی ژیانێتی، روناهیو گەرمایی بە شێوەیەکی وەها یەکسان بڵاودەکاتەوە کە لە گشت لایەکەوە سوودی لێوەربگیرێت..

ئەم زانیاریانەو سەدانی دیکەش دەربارەی ئەم خۆرە بزانین، بەڵام تەنێ یەك شتی لێ نەزانین ئەویش ئەوە بێت، کە کەیو چلۆن پەیدا بووە، وە کەی لەنێو دەچێت یا نەزانین ئەم هەموو تیشكو گەرماییە لەکوێوە دەهێنێتو بە چ شێوەو رژێمێك (سیستەمیك) ئاوەها بە یەکسانی دابەشیان دەکات... ئایا ئەم نەزانینەمان دەربارەی خۆر هیچ شتێك لە روناکیو گەرماییەکەی کەم دەکاتەوە؟ یاخود لە نیازو پێویستیمان بۆی کەمدەکاتەوە؟ بێگومان نا لەبەر ئەوە فرە گرنگ نیە بزانین یا نەزانین فڵان پەیامبەر کەیو لەکوێ لەدایکبووە، بەڵکو ئەوەی گرنگە زانینی بنچینەی ئەو ئاینەیە کە بزانین لەسەر چ راستی یەك بناغەی دارێژراوە، و ئایا پەیامی ئەو ئاینە رێگەی خۆشیو بەختەوەریو پێشکەوتنی ئادەمیزادی تێدا دیاری کراوە؟

دەتوانین هۆی نەزانینی سەردەمی لەدایکبوونی زەردەشت بە کورتی لە چەند خالێکدا باس بکەین:

**یەکەم هۆ**: دەگەڕێتەوە بۆ دێرینێتی سەردەمی لەدایکبوونی زەردەشت، هەر وەکو گوتمان، مێژوو نوسەکانی یۆنانیو رۆمی، ئەو مێژووە دەگەڕێننەوە بۆ 8000 ساڵ لەمەوبەر، هەروەها ڕۆژهەڵاتناسەکانو ئاوێستا ناسانی ئەم چەرخانەی دوایش، کاتی پەیدا بوونی زەردەشت بە لە پێش دروستبونی ئیمپراتۆریەتی ماد دادەنێن، کە ئەویش دەکاتە نزیکەی 3000 سال لەمەوبەر، ئەم دێرینێتی یەی مێژووو نەبوونی هیچ بەڵگەیەکی زانستی دەربارەی ئەو سەردەمە، وایکردووە کەبە تەواوی نەزانرێت کەی زەردەشت لەدایکبووە، تەنانەت سەبارەت بە شوێنی لەدایکبونیشی بیرو ڕای جیاوزا هەبێت.

**دووهەمین هۆ:** بە ئەم گرفتە دەتوانین بێژین دەگەرێتەوە بۆ ئەو هەموو کارەساتە دڵتەزێنانە کە بەسەر ئەم ناوچەیەدا هاتووە، گرنگترینیان هێرشەکانی ئەسکەندەری مەقدونیو عەرەبە موسوڵمانەکان بووە کە بوونەتە هۆی سووتانو لە ناوچوونی هەموو ئەو کتێبو زانیاریانەی دەربارەی زەردەشتو ئاینەکەی نوسرابوون، یەکێ لەو کتێبانەی لەو هێرشانەدا سوتاوە نێوی (سپندنسك) بووە، کە بەشێك بووە لە بیستویەك بەشی کتێبی ئاوێستاو تیایدا باسی ژیانی زەردەشتو کاتو شوێنی لەدایکبوونی کرابوو.

**سێهەمین هۆ:** دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی چاپوچاپەمەنی... هەروەکو دەزانین لەو سەردەمانەدا گەر بیانویستایە شتێك بنوسنەوە، یا لەسەر پێستی ئاژەڵ یا لەسەر گەڵای درەختو ئێسکی ئاژەڵو لە پاشان لەسەر خشت دەیاننوسی، کە بێگومان ئەوە خۆی لە خۆیدا ئەرکێکی فرە گەورە بوو، ئەگەر بویسترایە دەقێکی دیکە لە باسێك بنوسرێتەوە،ئەوا ئەو کەسەی دەینوسییەوە، بە ئارەزوو بۆچونی خۆی، شتی دەخستە سەر یا لێ لادەبرد.

گرنگی، پیرۆزیو سوودبەخشینی ئەم ئاینە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە ئەندازەیەکە کە زوربەی ئەو زانایانەی خەریکی توێژینەوە سەبارەت بەم ئاینە بوونو بە شێوەیەك ئەوینی ئەوپەیامبەرە پیرۆزە لە دڵیان چەسپیوە کە خۆیان باوەریان بە هەر ئاینێکی دیکە بو بێت، باسی مەزنێتیو پیرۆزی ئاینی زەردەشتیان کردووە بۆوێنە:

ویتنی Whitney زانای ئەمریکی لە کتێبیLife and teaching of Zoroaster دەبێژێت :

((بەڵام بەش بە حاڵی عیسا چلۆن دەتوانێ بەرانبەر ئاینێك کە زەردەشت فرە لە پێش ئەودا چەندین جار باسی بیر، وتەو کرداری چاکی کردووە، ئاینێکی خاستر روبەروو بکاتەوە؟ ئایا ئەم سێوشەیە بنچینەی هەموو کارێکی باش بۆ گشت ئاینەکان نیە؟ ئایا هیچ پەیامبەرێك دەتوانێ بۆ هەموو بوارەکانی ژیان شتێکی زێتری بخاتە سەر؟لەوانەیە کەسگەلێك بێژن، ئەرێ، ئەویش

ئەوینی عیسایە کە دەتوانین بیخەینە سەر ئەم ڕەچەڵەکانە ! وەلێ کەسێك کە بیری چاکـو پاك بێت، نەك تەنیا عیسا، بەڵکو هەموو جیهانو ئافەریدەی جیهانیشی خۆشدەوێت، کەسێك کە بیری چاکـو پاکی هەبێت، بێگومان دڵپاکیشە هەمیشە بیری چاک بنچینەی ڕاستیوتەی خاسو کرداری چاکە.))

رابندرانات تاگور، هەستیارو فەیلەسوفی بە نێو بانگی هیند دەبێژێ:

((زەردەشت مەزنترین پەیامبەرە کە لە مێژووی دێرینی ئادەمیزادا پەیدابووە، و بەهۆی فەلسەفەو بنەرەتەکانی ئاینەکەی ئادەمیزادی لە بارودۆخێکی فرە نالەبارو دژوار ڕزگار کردووە.))

سامۆئل لنگ زانای گەورەی ئینگلیسی لە کتێبی Amodern Zorostrian لە بەشی سیانزەهەمدا دەربارەی ئاینی زەردەشت دەبێژێ:

((ئەز لەم باسەدا گەرەکمە بیسەلمێنم کە راستی ئاینی زەردەشت لە پاش چەند سەدەیەکی یەکجار زۆر، گەر بمانەوێت لەتەک زانستی ئیمرِۆدا بەراوردی بکەین، دەبینین چونیەکن، وە زۆر نوێ دەنوێنێ، گشت ئەو جیاوازیو ناکۆکیانەی لەنێوان ئاینەکانو زانستدا هەن، تێکرا لادەبێت.))

هەروەها دەبێژێت:

((لەتەک ئەوەی لە مێژەوە زەردەشت پەیامی خۆی راگەیاندووە بەڵام هەنۆکەش دەتوانێت پێویستیەکانی مادیو مەعنەوی ئیمرۆی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی وەدیهێنێت.))

پرۆفیسۆر جیمزدارمستتەر دەربارەی ئاینی زەردەشت دەبێژێ:

((ئاینی زەردەشت بە مانایەکی فراوان بریتیە لە ئاینی ژیان، ئەم ئاینە دوو شتی بۆ مرۆڤ بە خەڵات هێناوە:

یەکەمیان ئاکارو دووهەمیان هیوایە، هەر کەسێك بەم دوو چەکە چەکدار بێت، دەتوانێت بە ئارامی برِوانێتە ژیانو چارەنووس، و بەسەر گشت کێشەو گرفتەکانی ژیاندا سەر بکەوێت.))

پرۆفیسۆر جان راچر دەبێژێ:

((زەردەشت بایەخێکی زۆری بە ئازادی دەربرِینیویستو باوەرِ دەدا لە روانگەی ئەوەوە، مرۆڤ ئازادە رێگەی راستی (ئاشا) هەلێبژێرێت یاخود رێگەی درۆ بگرێتە بەر. مرۆڤ لێپرسراوی بەختەوەری خۆیەتی.))

چترجی دەبێژێ:

((ئاین‌وشەریعەتی زەردەشت، نیشاندەری دوندی فەرهەنگی ئاکاری ئارياييه، له يەك ئاندا بەهرەبردن له ژیان‌و دنیا پەرست نەبوونە، له مەیدانی جەنگدا دلاوەر بوون‌و له هەمان کاتدا دژی شەڕوشۆڕو هەراوهوریا بونه.))

پرۆفیسۆر میلز دەبێژێ:

((دەربارەی تایبەتکارییەکانی ئەم مامۆستای مرۆڤایەتیه، دەتوانین بێژین کە ئامۆژگاریه بەنرخەکانی که له گاتاکاندا باسیکردووه، له هیچ کات‌و چەرخێکداو له هیچ شوێنێکی جیهاندا، ئەوەی تا ئێستا بیستراوه، بێژراوه، وه بینراوه، کەسێك نەبووه که بەم شێوەیه ژیرو دانا بێت، هەر چەندە ئیمرۆکه برێ لەو بیرووتە بەنرخانە وەك فەلسەفەیەکی ئاینی‌و ئاکاری جێی خۆی له کۆمەڵگا کردۆتەوه، بەڵام لەو کاتێنەداو لەو رۆژانەدا هیچ کەس لەم جۆره قسانەی نەکردبوو، و ئەو بیره فره نوێ بوو بۆ ئەو رۆژگارانه.))

## <u>زێدی لەدایکبوون‌و کورتەیەك له ژیانی زەردەشت</u>

لەبەر رۆشنایی نوسراوو داستانی زەردەشتیەکان، پەیامبەر له یەکێ له رۆژانی وەرزی بەهار لەدایکبووه، ئەو رۆژەش، رۆژی شەشی خاکە لێوە (نەورۆز) بووە کە دەکاتە 26ی مارت، لەو رۆژانەدا (لوهراسەب) ی کورەزای کەی قوباد، خونکاری ئەو ناوچەیه بووه.

کتێبی (دینکرد)[9] و کتێبه ئایینیەکانی دیکەی زەردەشتیەکان دەبێژن:

لەکاتێکدا زەردەشت لەدایك بووه، به پێچەوانەی هەموو منداڵێك کە بەدەم گریانەوه دێنه دنیا، ئەم منداڵه به پێکەنینەوه[10] چاوهەڵێدێنێ، بەگوێرەی نووسینەکانی زەردەشتیەکان، وادەردەکەوێت، زەردەشت لەشوێنێك بەناوی (رەگا) رەغا Ragha یا رغه لەدایکبوێت، ئەموشەی (رەغە)یە ئیمرۆ پێی دەبێژن (رەی)، فره له مێژوونوسان‌و ئەوانەی زمانی پەهلەوییان به زمانی فارسی وەرگێراوه لەوباوەڕەدان کەوا شاری رەغه، هەمان شاری رەی ئازەربایجانە هەندێکی دیکەیان دەبێژن که شاری رەی نزیك تارانی ئێستایه... به کورتی، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لەو سەردەمەدا، دوو شار هەبوون به نێوی (رەی) یەکێکیان له ناوچەی ئازەربایجان بووه (نزیك شاری ورمێ) و ئەوەی دیکەیان ئەم (رەی)ه یه که کەلاوه کۆنەکانی نزیکی شاری تارانه، لەسەر بەردە نوسراوەکانی بێستون که له داریوشی گەورەی هەخامەنشی به جێماوه، تیایدا باسی شاری (رەگا) دەکات‌و تیایدا دەبێژێ که ئەم شاره یەکێکه له شارەکانی ماد.

عبيد الله بن خردابه کەوا له دەوروبەری ساڵانی 200 هیجریدا ژیاوه له کتێبی (الممالك والمسالك)، ل – 119، که باسی شارەکانی ئازەربایجان دەکات، شاری ورمێ بەشوێنی

لەدایكبوونی زەردەشت دادەنێت، هەروەها زۆری دیكەش لە نوسەرانی ئیسلام وەك مەسعودی كە لە ساڵی 345 هیجری كۆچی دوایی كردووە، هەمزەی ئیسفەهانی (270-350 یا 360 هیجری) یاقوتی حەمەوی (575-626 هیجری) بلادەری (ساڵی 279 هیجری كۆچی دوایی كردووە) ابن فقیە، قەزوینی، ابو النداو.. گشتیان لە باسی زەردەشتدا دەبێژن كە خەڵكی ناوچەی ئازەربایجانەو لە دەوروبەری گۆلیورمی لەدایكبووە. بەڵام (ئەمین ئەحمەد رازی) لە كتێبەكەیدا بە نێوی _حەوت هەرێم) دەبێژێ:

((... شیز[11] شارێكە لەنێوان مەراغە وزنجان، ئاتەشكەدەی ئازەر گوشەسب لەوێدا بووە. ئەم ئاتەشكەدەیە لای ئێرانیەكان فرە پیرۆز بووە، بەتایبەتی خونكارەكان رِێزێكی تایبەتیان هەبووە بۆی. زەردەشت لەو شارە لەدایكبووەو لەوێوە بەرەو كێوی سەبەلان رۆیشتووەو لەوێرادا كتێبی ئاوێستای نوسیوەو بردویەتی بۆ لای گوشتاسەب شا)) هەندی لە نووسەرو مێژوونوسانی وەك شەهرستانی، بۆئەوەی لەنێوان ئەم دوو بۆچونە، باوەری خۆیان دەربرین، دەبێژن كە باوكی زەردەشت خەڵكی ئازەربایجان بووەو دایكی خەڵكی (رەی) بووە، ئەوەی ئیمرۆ زوربەی زانایانو ئاوێستا ناسان باوەریان پێیەتیو دەیسەلمێنن، ئەوەیە كە زەردەشت لە كوردستان لە ناوچەیورمێ لەدایكبووە، بەڵام دەربارەی ناوی ئەو شارەی تیایدا لەدایكبووە رِاو بۆچونی جیاوازو جۆراجۆر هەیە، هەروەكو گوتمان برێكیان شاری شیز یا گنجك بە شوێنی لەدایكبوونی دادەنێنو هەندێكی دیكەیان شاری ورمێو چەند كەسێكی دی شاری مراغەو دەبێژن مەراغە لە دوووشە پێكهاتووە (مە +راغە) كە بنچینەكەی مەرغە بووەو ماناكەی رەغەی گەورەیە یاخود رەی گەورە.

لە بەشی یەشتەكاندا كە كۆنترین بەشی ئاوێستای تازەیە دەبێژێ كە زەردەشت لەسەرزەمینی ئێران ویج Ariya vaejaو لە كەناری رووباری دائیتی[12]ستایشی خوای دەكرد.

خوالێخۆشبوو گیومركریانی لە (ل -12)ی گیونامەدا دەبێژی ێ:

زەردەشت كوری پوروشەسبە، ناوی دایكیشی دغدوە 562 ساڵ پێش لەدایكبوونی مەسیح لە شاری سەردەشت دا هاتۆتە جیهان..

موبد فەیروزی ئازەرگوشەسب لە كتێبی (بخشی از فرهنگ اوستا.ل.44) دەبێرەی رِاڤەی وشەی چچست Chechast دەبێژێ:

(چچست ناوی ئاوێستایی گۆلیورمێ یە كە لە رۆخی ئەم گۆلەدا زەردەشتی پاك پەیامبەری ئاریایەكان لەدایك بووە، ئەم وشەیە لە شانامەی فردەوسیدا بەخنەخست ناوبراوە)

تا ئێستا دەربارەی ژیانی منداڵی زەردەشت زانیاریەكی پوختو تەواومان نییە، تەنێ، ئەو نوسراوەمان لەبەر دەستدایە كە دەربارەی چونیەتی لەدایكبوونو باسی ژیانی سەردەمی منداڵی

زەردەشتو موعجیزەکانی (پەرجۆکانی) دەکات ئەویش کتێبی (زراتشت نامە)یە کە زەرتشت بەهرام بژدو[13] لە ساڵی 1278 ز دا بە 1575 چامە نوسیوێتی، لەو کتێبەدا نووسەر دەبێژی کتێبێکی لابووە بە زمانی پەهلەوی نوسراوەتەوەو تیایدا باسی سەر گوزشتەی جیهانو چۆنیەتی دروسبوونی هەواڵی پێشینیان، باسی گەورە پیاوانو هەروەها باسی ئاوێستاو زەندی تیا بووە، لەتەک باسی ژیانی زەردەشت، هەروەها دەبێژێ بۆئەوەی خەڵک زێتر لەم باسانە ئاگاداربن، ئەم نوسینەی بە چامە گۆریوەتە سەر زمانی فارسی...

**نووسەر دەبێژێ :**

لەسەردەمێکدا کە جیهان پڕبوو لە خراپەو پیاوخرایان، کۆمەڵگا نوقمی دەریایی نەزانینو دواکەوتویی بوو، هیچ کەس نەبوو رێبەرێتی خەڵک بکاتو بەرەو رۆخی دەریایی ئاسودەییو چاکیو ئاسایش بەرێت، خەڵک سەر لێشێواوو گومرێ بوونو دورکەوتبوون لە ڕاستیو دروستی بەمە، دڵی ئەهریمەنی سەرۆکی دێوان خۆشوەش بو خوای گەورە فەرمانی دەرکرد. دغدو دووگیان بێت لە پوروشەسب گوڕی پیترسب، کە لە نەژادی پاکی فەرەیدون کوڕی ئابتینە.

دغدو دوگیانی پێنج مانگە بووە بە کوڕەکەی، شەوێك خەوێکی فرە ترسناك دەبێنێت، لە خەویدا پەڵە هەورێکی چڵکن وەك دوو باڵی دالێک، هەموو ئاسمانی خانوەکەیانی بە چەشنێکیواگرتەوە ڕوی خۆری لێگرتوونو رۆژی رووناکیان لێ بووە بەشەوەزەنگ، لەنێو ئەو پەڵە هەورەدا، دەعبای جۆراو جۆر وەك باران دەبێری، هەموویان بەددانو چنگی تیژەوە، دەهاتنە سەربانی خانوەکەیان، یەکێ لە هەرە ترسناکترینو ناشرینترینو تیژدانترینیان بە پرتاو هاتو سکی دغدوی هەلێدڕیو منداڵەکەی ڕفاند... دغدو دەبێژێ، لەم ئازارەدابومو لە ترسانا هاوارم دەکرد، لە پڕ مناڵەکە هاتۆتە قسەو بە دایکی گوتووە، کەخەفەت نەخواو نەترسێتو ئارام بگرێت، چونکە ئەمانە بە هیچ کلۆجێك تواناى ئازار پێگەیاندنیان نییەو توانایان بەسەریدا نییە، یەزدان پالێپشتو چاودێرێتی..

دغدو دەبێژێت: لە پڕ چاوم بە فریشتەیەك کەوت لە شێوەی لاوێکی شۆخوشەنگ وەك مانگی چواردە، بە دەستێکیەوە لقە دارێکی رۆشەنی پێبوو، وەنامەیەکی ئاسمانی بە دەستەکەی دیکەیەوە بوو، ئەم فریشتەیە هەڵیکوتایە سەر دەعباکان، گشتیان بە پرتاو خانوەکەیان بە جێهێشتو رایانکرد، تەنیا سیانیان نەبێ، فریشتەکە هاتە خوارەوە بۆیانو بە پرشنگی رووناکی لقە دارەکە هەر سێ جانەوەرەکەی سوتاند، ئەمجا منداڵەکەی هەڵیگرتو خستیەوە شوێنی خۆیو بە دایکی گوت. هەرگیز ترسی ئەم دوژمنانە نەچێتە دڵیەوە چونکو گیانی ئەم منداڵە پیرۆزە هەمیشە رزگاری دەبێ لە خراپەو مژدەی پێدا کە دڵشادو بەختیار بێت بەمنداڵەکەی کە لە پاشە رۆژدا دەبێتە پەیامبەری یەزدان. دادو خۆشیو ڕاستی لەنێو جیهاندا بڵاو دەکاتەوەو ئادەمیزاد ڕزگار دەکات.

دغدو دەبێژێ پاش ئەوەی فریشتەکە ئەم قسانەی کرد ئیدی لەبەر چاوم نەماو لە خەو راچڵەکیم...)

گەر بێتو بەووردی چاوێك بخشێنین بەسەر لاپەرەکانی مێژوودا دەبینین، گشت وەیا زوربەی زۆری پەیامبەرانو پیاوچاکانو قارەمانانی داستانە ئەفسانەییەکان، چۆنیەتی لەدایکبونیان هاو جوت بووە لەتەک برێ رووداوی سروشتیو یاناسروشتی کە بە پەر جۆ (معجزە) دەژمێرێتو هەمووی دەبەستنەوە بەهێزێکی ئاسمانی . زەردەشتیش لەم دیاردەیە وەدەرنیە.

لەبەر ئەمە، چ پێش لەدایکبوونیو چ لە کاتی ژیانیدا برێ پەرجۆو ئەفسانەی خراوەتە پالێ.

لەنێو بەشێك لەلاپەرەکانی ئاوێستادا، باسی برێ رووداو کراوەو بێژراوە کە لە کاتی لەدایکبوونی پەیامبەر سروشتیش، هاو جوت لەتەک مرۆڤدا، خۆشیو شادی خۆی دەربریوە. گشت درەختو رووبارەکان. زەویو ئاسمانەکان، هەمویان شادو خۆشحالێ بوون.تەنێ ئەهریمەنو دارو دەستەکەیەتی کە لە ترسا دەچنە ناخی زەویەوەو خۆیان حەشاردەدەن. بەڵام ئەوەی سەرنج رِادەکێشێ ئەوەیە، لە گاتاکاندا کە نوسینی زەردەشت خۆیەتی، بە هیچ جۆرێك باسی پەرجۆی تێدا نەکراوە، نوسەری کتێبی، زراتشت نامە)، باسی چەند پەرجۆیەك دەکات کە لەسەردەمی کۆرپەییو میر منداڵی زەدەشت روویداوە، نوسەر لە کتێبەکەیدا دەبێژێ:

((... پاش لەدایکبوونی زەردەشت یەکەمین پەرجۆی ئەم پەیامبەرە ئەوە بوو، کە وەك گشت منداڵێکی ئاسایی بەدەم گریانەوە لەدایك نەبووە، بەڵکو کاتێك هاتۆتە دنیا دەم بە پێکەنینەوە بووە، پێکەنینەکەی بە شێوەیەك بوو کە گشت دانیشتوانی ماڵەکە کە لەوێرادا بوون، هەستیان پێکردووە.))

**پەرجۆی دوهەم:**

(لەسەردەمی لەدایکبوونی زەردەشتدا (دوران سرون) ناوێك گەورەو میری ناوچەکە بووە، ئەم پیاوە، فرە بێویژدانو ستەمکار بوو، هەر کە دەنگوباسی لەدایکبوونی زەردەشت دەبیستێو بۆی رِوندەبێتەوە کە ئەم منداڵە دەبێتە پیاوێکی بلیمەتو مەزن، جادوو درۆو دەلەسەی هەموویان پۆچ دەکاتەوە، برِیارە دەدات کە هەرچی زووتر بیکوژێ، بە پەلە خۆی دەگەیەنێتە ماڵی پورو شەسب، و دەچێتە سەر (لانکەی) زەردەشتو هەڵیدەگرێت، خەنجەرەکەی لەکێلان رِادەکێشێ بۆی، بەڵام هەر کەدەستی بەرزدەکاتەوە، بەفەرمانی ئاهورامەزدای توانا، دەستی سرِدەبێو لە کار دەکەوێ، بەمجۆرە ناتوانێ مەرامی گڵاوی خۆی ئەنجام بداتو ئەم کۆرپە پیرۆزە بکوژێت، ناچار دەبێ زەردەشت دادەنێتەوە شوێنی خۆی)

**پەرجۆی سێهەم:**

پاش ئەوەی جادوکەران ئەم رووداوەیان بەچاوی خۆیان دی، هەراسان بوونو کەوتنە جموجۆلێو بیری خۆیان خستە گەڕ بۆ دۆزینەوەی پێلانێك بۆ لە ناوبردنی ئەو منداڵە، ئەمجارە بریار دەدەن زەردەشت بڕفێنن، دەیڕفێننو دەیبەنە چۆڵانییەكو لەوێرا دارو چیلکەیەکی زۆریان خڕکردەوەو ئاگریان تێبەردا، زەردەشتیان خستە نێو ئاگرەکە، ئەمجارەش بەفەرمانی ئاهورامەزدا زەردەشت ڕزگاریی بوو لە سووتاندن، گڕی بەتینی ئەو ئاگرە بووە فێنکایی بۆ ئەو منداڵە پیرۆزە، ئەوجا جادوکەرەکان شێتو هەراسان بوون، گشتیان هەڵاتنو بە هەڵەداوان گەڕانەوە بۆ لای دوران سرون، هەر لەم کاتەدا دایکی زەردەشت هەست بە ڕفاندنی منداڵەکەی دەکاتو خێرا بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات، زەردەشت دەبینێت هەروەك مانگی چواردە گەشاوەتەوە دەیگرێتە ئامێزیو دەیباتەوە ماڵەوە.

## پەرجۆی چوارەم:

پاش ئەوەی دوران سرون لە پیلانی سێهەمیشدا شکستی خواردو سەرنەکەوت، فەرمانی دا بە جادوکەرەکانی کەوا ئەم جارەش زەردەشت بڕفێننو بیبەنە سەر ڕێگەی گاگەلێك کە زۆر باریكو تەنگ بوو، بۆئەوەی لەژێر پێو سمی گاکاندا بپلیشێتەوە، کاتێك گارانەکە بەرەو ئەو دێن، یەکێ لە گاکان کەوتە پێش هەموویانەوەو هەر کە گەیشتە ئاست زەردەشت، ڕاوێستاو کارێکیوایکرد کە منداڵەکە لەنێوان هەر چوار پەلی خۆیدا جێگیر بێتو بوو بە پەرژێن بۆی، بەم شێوەیە، نەیهێشت گاکانی دیکە پێشێلی بکەن، بەمجۆرە دووبارە زەردەشت لە دەست پیاو خراپانو جادوگەران ڕزگاری بوو.

## پەرجۆی پێنجەم:

ئەمجارەیان، بڕیاریاندا زەردەشت بخەنە سەر ڕێگەیەکی فرە باریکتر لە جاری پێشوو کە سەرەڕێی ئەسپگەلی ئەو ناوچەیە بوو، ئەم جارەش هەروەك جاری پێشوو ڕزگاری دەبێت..

## پەرجۆی شەشەم:

پاش ئەوەی هەموو ئەو پیلانانە بۆ کوشتنی زەردەشت شکستیان خوارد، دووبارە ئەم بێ وێژدانانە کەوتنە ڕاوێژو بیرکردنەوە لەنێو خۆیاندا بۆ دۆزینەوەی پیلانێکی کاریگەرترو باشتر بۆ کوشتنی، دوران سرون پێی گوتن، بگەڕێن بە شوێن دەڵە گورکێك کە تازە بێچوی بو بێت، لەکاتێکدا کە دایکە کە لە کولانەکەی نییە، بێچووەکان بکوژنو زەردەشت بخەنە جێگەیان... هیچ گومانی تێدا نییە کە گورگەکە دەگەڕێتەوەو دیمەنی کوشتنی بێچوەکانی دەبینێ، پەلاماری ئەم منداڵە دەداوو نجڕو نجڕی دەکات...

کاتێك دەڵە گورگەکە گەڕایەوەو ئەو دیمەنە دڵتەزێنە دی کە بێچووەکانی کوژراونو ئەو کۆرپەیە لە جێگەیاندا بە جێماوەو دەگریو پەلە قاژێ دەکا، دانە تیژەکانی جیر کردو بە دڵکی

پڕ لەقین‌و تورەییەوە ویستی پەلاماری بدات‌و پارچە پارچەی بکات، بەڵام ئاهورامەزدای داناو ژیرو میهرەبان، بە جۆرێك دڵی ئەم جانەوەرە دڕندەیەی نەرم کرد کە زۆر بە هێمن‌و ئارامییەوە هاتە سەر منداڵەکەو دەستی کرد بە لێستنەوەی‌و شیر پێدانی.

و تاماوەیەك هەروەك بێچوەکانی خۆی ڕەفتاری لەتەکا کرد. هەر لەم کاتەدا دایکی زەردەشت دەم بە گریان‌و هاوارەوە، دەشتوکێوی خستبووە ژێرپێ‌و بە شوێن کۆرپەکەیدا دەگەڕا، لە پڕ لە دورەوە چاوی دەڵە گورگەکەی وەدیکرد، و چووە پێشەوە لێ‌وایدەزانی کە ئەم گورگە منداڵەکەی خواردووەو گەرەکی بوو بیکوژێت.. بەڵام هەرکە چاوی بەو دیمەنە کەوت، سوپاس‌و ستایشی خوای کرد بەوەی کە ئەم جارەش جگەر سۆزەکەی ڕزگار کردووە.

## پەرجۆی حەوتەم:

زەردەشت لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، تووشی نەخۆشییەك دەبێت، ئەم هەواڵە زۆر بە زوویی دەگاتە گوێی جادوگەران، ئەوانیش بە پەلە دەکەونە خۆیان‌و بریار دەدەن کە ژەهر بکەنە نێو ئاو بەناوی دەرمانەوە، دەرخواردی زەردەشتی بدەن، وەلێ خوای میهرەبان، نهێنی ئەم پیلانە بۆ زەردەشت ئاشکرا دەکات‌و ئەویش دەرمانەکە دەرێژێت‌و سەرزەنشتی جادوگەرەکان دەکات‌و پێیان دەبێژێ کە بە فەرمانی ئاهورامەزدا، هیچ جۆرە جادوو دەرمانی ئێوەی بێفەر کارناکاتە سەر من‌و خوای تاکو تەنیاو دانا، ئەز لەم نەخۆشییە ڕزگار دەکات، هەروەکو لە مەوبەر باسمان کرد، بەهۆی دەسڵاتی فراوانی جادوگەران لەو رۆژانەدا گشت خەڵکی گیرۆدەی جادوگەرێتی بوبوون.

یەکێ لەوانە، باوکی زەردەشت بوو کە ئەویش هەروەك خەڵکی دیکە ئەفسونی جادوگەران بوبو.. رۆژی لە رۆژان، جادوگەرە گەورەکان بانگ دەکات بۆ ماڵی خۆیان بۆ نانخواردن، دوای نانخواردن‌و پشودان، داوایان لێدەکا برێ جادوگەرێتی‌و چاوبەستی بۆ بکەن، بەتایبەتی بۆئەوەی زەردەشت بە چاوی خۆی ببینێت، پاش تەواو بوونی ئەو نەمایشە باوکی زەردەشت فرە ئافەرینی گەورەی جادوگەرەکان دەکات‌و پێی دەڵێت کە باشترین‌و زیرەکترین‌و بە تواناترین کەسە، لەم کاتەدا زەردەشت دەستدەکا بە ئاخاوتن لەتەک باوکێداو پێی دەبێژێ کە ئەو رێگەیەی ئەوو جادوگەران گرتویانەتە بەر، راست نییەو دەیانگەیەنێتە دۆزەخ‌و داوای لێدەکا کە ئەو کردارانە بخاتە لاوەووازیان لێبێنیت‌و رێگەی راست‌و هەق کە رێگەی خوای تاکو تەنیایە بگرنە بەر.

جادوگەرەکان دەکەونە دەمەتەقێ لەتەک زەردەشتدا بەڵام زەردەشت بەرپەچی درۆودەلەسەی گشتیان دەداتەوە ئیدی، جادوگەرەکان بەسەرشۆڕی‌و سەرسورمێوی لە ژیری‌و دانایی ئەو منداڵەو بە دڵشکاوی‌و عاجزی‌و بێ توانایی‌و شەرمەزاری خۆیان ماڵەکە بە جێدێڵێن، زەردەشت کە گەیشتۆتە تەمەنی پانزە ساڵی، ئیش‌و کارو هەڵسوکەوتی پیاوانەی لێوەشاوەتەوەو هەمیشە یارمەتی بێدەرامەت‌و دەستکورت‌و بێدەسەڵاتانی داوە، لە چاکە بەولاوە هیچ کارێکی دیکەی

نەكردووە، هەمیشە بە فریای ئەو كەسانە كەوتووە كە پێویستیان بە یارمەتی هەبووەو دەستی یارمەتی بۆ درێژ كردون.

داستانەكانوێ دەگێرنەوە كە زەردەشت لەنێوان تەمەنی حەوت ساڵی تا پانزە ساڵیدا لەژێر چاودێری پیاوێكی زاناو ژیر بە نێوی بەرزین كورس پەروەردە بووەو فێری ئوسولی ئاینیو كشتوكێڵیو چارەسەركردنی نەخۆشی بووە، بەهۆی ژیریو دانایی یەوە، هەر لەو تەمەنەدا چووەتە ڕێزی پیاوە گەورەكانی ئەو سەردەمەو لە ناو كۆمەڵگادا پێگەیەكی تایبەتی بۆ خۆی كردۆتەوە.

هەر لەو كاتێنەدا بووە كە تورانییەكان، هێرشیان بردۆتە سەر ناوچەكەیانو زەردەشتیش وەك هەموو لاوێكی ئەو ڕۆژگارە چەكی هەڵێگرتووەو چۆتە نێو گۆڕەپانی شەڕ بۆ بەرگری لە ناوچەكەی دژی سوپای هێرشكەر، ئەو جەنگو بگرەو بكوژە، ماوەیەكی زۆری خایاندووە، لەو كاتەدا زۆر شتی نالەبار سەرنجی ڕاكیشاوە وەك كوشتاروو ئازاری بریندارەكانی درۆزنیو پیلانگێرانو سك هەڵێدرینی یەكدی... و لەو دیمەنانە فرە ڕەنجاوەو بڕیاری داوە كەوا دەست بكات بە یارمەتیدانی زامارەكانو مەلهەمكردنو تیمار كردنی بریندارەكان بۆئەوەی ئێشو ئازارەكانیان كەم كاتەوە... شەڕ كۆتایی دێت، بەڵام شوێن پەنجەو ئاسەوارە خراپەكانی هەروا دەمێننەوە وێرانیو سووتانی زەویوزارو كشتوكێڵیو بڵاوبونەوەی هەمە جۆرە نەخۆشییەك باڵیان بەسەر ناوچەكەدا كێشاوە... برسێتیو ماڵوێرانی، خەڵكی بە تەنگ هێنابوو، زەردەشت بە هەموو توانایەكیەوە دەست دەكا بە هەوڵو كۆشش بۆ یارمەتیدانی خەڵك، ژیانی خۆی تەرخان دەكا بۆ سارێژكردنی برینەكانی كۆمەڵگا، هێدی هێدی ئاسەواری شەڕ كەمتر دەبێتەوە، زەردەشت دەگەرێتەوە ماڵی باوكی بەڵام هەمیشە بیری لەوە كردۆتەوە كە چلۆن بتوانێت ڕێگەو ڕەوشێك بدۆزێتەوە بۆ ڕزگاركردنی خەڵك لەوبارودۆخە ئاڵۆزو نالەبارە باوكی، هەست بەم گۆرینكارییو تێفكرینەی كوڕەكەی دەكاو ئامۆژگاری دەكاتو هانیدەدا كە خەرێكی كشتوكێڵێ بێتو بیر لە پێكەوەنانی خێزان بۆ خۆی بكاتو سەرو سامانێك بگرێت.

زەردەشت، گوێرایەڵی ئامۆژگاری باوكی دەبێتو هاوسەر بۆ خۆی هەڵدەبژێرێو ژیانێكی ئارام پێكەوە دەنێ، بەڵام هەستو بیری لای كێشەیەكی فرە بەرزترو پیرۆزترە، بەرەبەرە هەست بەوە دەكات كە خوا بۆ ئەنجامی كارێكی دیكە دروستی كردووە، نەك بۆ ژیانێكیوا ئاسایی. بیر لەوە دەكاتەوە چلۆن ڕێگەیەك بدۆزێتەوە كە ئازاری خەڵكی پێكەم بكاتەوە، ئەم حەشاماتە لە بیریوێران كردنو خراپە وەرگێرێو بیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاستیو دروستیو چاك بیركردنەوەو ئاوەدانی.

زەردەشت لە تەمەنی سی ساڵیدا بەرەو كێوی ئوشی دەرنە Oshidarena دەڕوات (بڕێ لە زانایانو مێژوونوسان وەك ئیمام زەكریا بن محمود قەزوینی، نوسەری كتێبی (آثار البلادو اخبار العباد) ئەو كێوە بە كێوی سبلان دەزاننو هەندێكی دیكە كێوی ئۆشی دەرنە بە كێوی ئاویەر[14] دەزانن كە دەكەوێتە خوارووی شاری سنەی ڕۆژهەڵاتی كوردستان دەبێژن كە

لەوێراوە بەرەو (بەلێخە)ی ناوچەی هەورامان ڕوێیشتووە بوێ ئەوەی لەباروودوێخێکی ئارامو دوور لەقڕەو جەنجاڵی خەڵکیەوە،بکەوێتە بیرکردنەوەو تێفکرین لە نهێنیەکانی سروشت دەیویست بنەمای چاکەو خراپە بزانێت دەربارەی سروشتی ئادەمیزاد بزانێت بۆچی بڕێ جار باشنو هەندێ جار خراپ، ئاگادار بێت لە ڕازو نهێنی (بوون) (سرالوجود) و فەلسەفەکەی... رێگەی راستی ژیان بزانێتو تێبگات کە چلۆن مرۆڤ دەتوانێت ئەو رێگەیە بگرێتە بەر بۆئەوەی هەمیشە دوربێت لە خراپە... بە کورتی گەرەکی بوو هەموو شتێك دەربارەی باری کۆمەڵایەتی بزانێت. ماوەی ئەم بیرکردنەوەو تێفکرینە، بەگوێرەی نوسینی پەرتووکە ئاینزاکان دە ساڵی خایاندووە (هەندێ دەبێژن حەوت ساڵی خایاندووە). بەلێێ، دە ساڵێك زەردەشت بە تەنیایی لەنێو ئەشکەوتەکاندا خەریکی بیرکردنەوە بوو، بەڵام هێشتا ئەو شتەی عەوداڵی بوو پێی نەگەیشتبوو.

هێندەی نەمابوو وەڕسبێتو بەدبینی بەسەریدا زاڵبێتو بگەرێتەوە بۆ نێو ژیانی ئاسایی، ئێوارەیەکیان، لەکاتێکدا بەسەر دوندی کێوەکەوە دەیڕوانییە دواتیرۆژی خۆر لە کاتی ئاوابوندا، لەپڕ پرشنگی راستیەکی فرە مەزنو بەشکۆ، هەموو بیرو هۆشی گرتەوەو گەیشتە ئەو راستییەی کە عەوداڵی بو. بۆیدەرکەوت هەر وەکو چلۆن کات (زمان) پێکهاتووە لە شەوو رۆژ، تاریکیو روناکی، و هەرگیز شەوو رۆژ کۆتاییان پێنایەت، هەروەها لە جیهانیشدا، ناحەزیو ناشرینی هەیەو جوانیش هەیە، خراپە هەیەو چاکەش هەیە. کەوتە بیرکردنەوە لەوەی کەوا هەر بەو شێوەیەی کە لەرۆژدا هەمیشە رووناکی هەیەو تاریکی ناتوانێت زەفەری پێببەرێت، شەویش هەمیشە تاریکەو رووناکی سروشتی دەستی پێناگات، چاکە هەمیشە چاکەو خراپەش هەر خراپەیە..

بەم شێوەیە، زەردەشت بۆی دەرکەوت کە خراپەکارانو رەوشت نزمان ناتوانن لە رێگەی خوای گەورەوە کە دیاردەی چاکەیە، خراپە بڵاوکەنەوە یاخود دەسبەدامێنی ئەهریمەن بن بۆ چاکە کردن، زەردەشت بۆی دەرکەوت کە دوو هێزی دژبەیەکتر، ئەم جیهانە دەچەرخێنن، یەکێکیان (ئەرێنی) چاکەو خێرەو ئەوی دیکەیان (نەرێنی) خراپەو شەڕە.

یەکەمیانی نێونا سپەنتامینو Spenta Mainyu واتە بیرو رەوشتی خاسو پیرۆزو دووهەمیان ئەنگرەمینو Angra Mainyu یانی بیرو رەوشتی خراپ کە دواتر بە ئەهریمەن ناونرا.

ئەمە، قۆناغو پلەی یەکەمی ئەو راستیە بوو کە هەمیشە عەوداڵی بوو، بۆ گەیشتنە ئەنجامی بیرکردنەوەکانی، کەوتە بیرکردنەوە لەوەی کە بۆچی ئەم دوو هێزە هاتونەتە گۆڕێو خەڵک دەبێ چ بکەن بۆئەوەی رزگاریان بێت لەم ئێشو ئازارو ژیانە نالەبارەی هەیانەو رێگەی رزگاری کامەیەو چلۆن وە دەست دێت؟ ماوەیەکی زۆری دیکەش هەر لە تێفکرینو بیرکردنەوەدا بوو، و زۆرشتی دیکەشی بۆ روونو ئاشکرا بوو.

بەگوێرەی گوتەی نووسەری (دینکرد) لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا زەردەشت حەوت جار لەتەک ئاهورامەزدا گفتوگۆی کردووەو زۆر شتی ئالێوزی بۆ روون بۆتەوە، دەبێژێ: دواچرکەکانی گۆشەگیریو تێفکرینو بیرکردنەوە هێدی هێدی، بەرەو کۆتایی دەچوو.

زەردەشت، لە دەرونیدا، هەستی بە گۆرانکارییەکی نائاسایی کرد، هەروەك گێانێکی نوێ چوبێتە نێو قالێبی لە شیەوە. نەیدەزانی چی روویداوە، بەرەو رووباری دائی تندەکەوێتە رێ. لەوێرا گشت بنەماو پێکهاتەکانی سروشت، لە گژوگیا، با، ئاوی ڕوبار پێکەوە جوانترین دیمەنی سروشتیان وەدیهێنابوو. هەر کە ئاسۆ دەرکەوت، باڵێندەکان کەوتنە جریوەو چریکاندنو زێتر دیمەنی سروشتیان دڵرفێنکرد. ئالەم کاتەدا فریشتە (وەهومەن)ی چاوپێکەوت کە داردەستێکی زێرینی وەدەستەوە بو. و بەرەو روویەوە دەهات. وەهومەن لٌی نزیك بۆوە، بەرێزیکەوە کە شایانی ئەو زاتە بەرێزو مەزنە بێت، داوای لێکرد کە لەقالێبی لەشی ئادەمیزادییەوە بێتەدەر، پاشان وەهومەنی فریشتەی بارەگای خوای تاکو تەنیا رۆحی ئەو گەوهەرە[15] رۆشەنو بێ هاوتایەی لەتەک خۆیدا بردە بارەگای ئاهورمەزدای هەمیشە زیندوو.

لەوێرادا، زەردەشت لە خزمەت ئاهورامەزداو فریشتەکانیدا ڕادەوێستێتو کڕنۆش بۆ ئاهورامەزدا دەبێت.

نووسەری کتێبی (زرادشت نامە) دەربارەی ئەو رووداوە دەبێژێ: (... لەکاتێکدا کە زەردەشت لە کەناری دەریایی دائی تی راوێستابوو تارماییەك دەبینێت کە سەرتاپای بریتی یە لە رووناکی، تارماییەکە لە زەردەشت نزیك دەبێتەوەو پێی دەبێژێت: ئەز فریشتە وەهومەنم. داوای لێ دەکات کە بۆ چڕکەیەك چاوی دابخات. زەردەشت دەڵێت، هەر کە چاوم قونجاند رۆحم وەك باڵێندەیەك سوك بوو لەلەشم جیا بۆوەو لەتەک ئەم فریشتە پاکەدا، بەرەو ئاسمان کشام. کاتێك چاوم هەڵێبری، روانیم لای ئەنجومەنێك راوێستاوم. ئەوەندە بریسکەیان لێدەهات چاوم رێشکەوپێشکەی دەکرد. تەنی نزیکەی بیستو چوار هەنگاوێك لٌیان وەدووربووم. یەکەیەکە فریشتەکان دەهاتنو بەرو خۆشییەوە تەماشایان دەکردم، ئەمجا زەردەشت باسی ئەوە دەکات کە چلۆنووتوێژی لەتەک ئاهورامەزدا کردووەو پرسیاری لێکردووەو وەڵامەکانی وەرگرتووە.

یەکەمین پرسیاری زەردەشت لە ئاهورامەزدا، ئەوە بووە کە خاسترین کەس لەم جیهاندا کێیە؟

خوای داناو ژیر، وەڵامی زەردەشت دەداتەوەو دەفەریوێت: باشترین کەس لە جیهاندا، ئەو کەسەیە کە ڕاستگۆبێتو هەرگیز راستی نەشارێتەوەو راستیو دروستی پیشەی هەمیشەیی بێتو هەرگیزو بەهیچ کلۆجێك دژی راستی نەبێتو دڵی میهرەبان بێت.

ئەوسا، ئاهورامەزدا، دەست دەکات بە باس کردنی بنەمای چاکەو خراپەو باسی ئەهریمەن بۆ زەردەشت دەکات. هەروەها دەربارەی چونیەتی هەڵیسوڕاندنی زەویو ئاسمانەکان، رۆژو

هەسارەکان، زانیاری تەواوەتی پێدەدات. پرسیاری دیکەی زەردەشت، دەربارەی چونیەتی پەرستنی ئاهورامەزداو بە جێهێنانی نوێژو قیبلەو... یە.

ئاهورامەزدا لە وەڵامدا دەفەرموێ: لەکوێرا رووناکیتان دی، بەرەو ئەو شوێنە دەتوانن ڕاوێستن‌و نوێژو ستایشت بکەن. دەفەرموێ، لە شوێنی رووناکیدا، خراپە هەرگیز خۆی ڕاناگرێت‌و ئەز، گشت شتێکم لە رووانکی‌و چاکە دروست کردووە.

ئاهورامەزدا، دەستورو فەرمانەکانی خۆی بە زەردەشت ڕادەگەیەنێت، زەردەشت، پەیامی ئاسمانی وەردەگرێت‌و دەبێتە پەیامبەری خوا، ئاهورامەزدا رۆحی زەردەشت مەرەخەس دەکا کە بگەرێتەوە سەر زەوی. پاش وەرگرتنی پەیامی ئاسمانی، ئەمجا یەکەیەکە، فریشتە نزیکەکانی بارەگای ئاهورامەزدا دێنە لای زەردەشت . هەریەکەیان پەندو ئامۆژگاری‌و راسپاردەکانی خۆیان بە پەیامبەر ڕادەسپێرن. لەپێش هەمواندا فریشتە (وەهومەن) دێتە خزمەتی حەزرەتی زەردەشت . فەرمانەکانی ئاهورامەوزدا، کە پەیوەندی بەوەوە هەیە، دەربارەی ئاژەڵ‌و چۆنیەتی ماڵیکردنیان‌و بە خێوکردنیانی پێرادەگەیەنێت. وەهومەن دەبێژێ لە ئێستا بەدواوە، هەرچی ئاژەڵی سوودمەند هەیە لەژێر چاودێری تۆدایە. پێویستە بە خەڵکی رابگەیەنێت کەوا بە چاکی‌و باشی چاودێری لە ئاژەڵ بکەن، بەتایبەتی (مەڕ). چونکو هەموو جیهان سوودو قازانج لەم گیانلەبەرە وەردەگرن‌و داوایان لێبکە کە هەرگیز بەرخ‌و مەڕی دوو گیان سەر نەبڕن، هەرگیز زێدە لە پێویست ئەم ئاژەڵانە نە کوژن.

پاشان فریشتە (ئاشاوەهیشتا)، دێتە خزمەت پەیامبەرو دەبێژێ کەوا، پێویستە ستایشی ئاگر بکرێت‌و رێزی لێبگیرێت، چونکە مەڵبەندو سەرچاوەی رووناکی‌و پاکی یە، پێویستە لە هەر شوێنێك خوا پەرستی تێدا بێت، ئاتەشکەدە دروست بکرێت بۆ پاراستنی ئاگری پیرۆز کە نیشانەی رووناکی‌و نوری ئاهورامەزدایە. ئەمجا باسی سوودەکانی ئاگر دەکات بۆ گشت ئادەمیزاد. پاش ئەم، فریشتە (خشترەوەئیریە) دێتە خزمەتی، و باسی کانەکان‌و نهێنیەکانی‌و سودی هەمە جۆرە بەردێك بۆ پەیامبەر دەکات.

ئەوسا نۆرە دێتە سەر فریشتە (سپەندارمت)و دەبێژێ، بە فەرمانی ئاهورامەزدا، پێویستە زەوی بە پاکی‌و خاوێنە رابگیرێت، و نابێ هەرگیز خوێن‌و پیسایی‌و لاشەی مردوو تێکەڵی بە خاك بێت. هەروەها دەبێژێ، ئەو شوێنانەی کشتی تێداناکرێت، پێویستە ئاوی بگەیەنرێتێ‌و ئەو شوێنانە زیندوو بکرێنەوەو کشتوکێڵیان تێدا بکرێت، چونکو لەسەرزەوی ئاوەدان، خەڵک سودوبەهرە دەبینن.

پاشان فریشتە (هەئورتات) دێتە خزمەتی‌و هەرچی ئاوی سەرڕوی زەوی‌و ژێرزەوی هەیە، گشتی دەسپێرێتە پەیامبەرو دەبێژێ: ئاوی کانی‌و کارێزو رووبارو دەریاکان هەمووی پێویستە بە خاوێنی رابگیرێت‌و هەرگیز پیسایی تێدا فڕێ نەدرێت‌و لیخن نەکرێن، چونکە بەهۆی ئاوەوە،

ژیان بەردەوام دەبێت. ئەمجا دەست دەکات بە ژماردنی سودەکانی ئاوو داوا لە زەردەشت دەکات کە بە هەموو خەڵکی رابگەیەنێت کە چاودێریو ئاگاداری لە ئاو بکەن.

لە کۆتایدا فریشتە (ئامرتات) دێتو دەربارەی گژوگیاو درەختەکانو کێڵێگەکان دەدوێتو باسی سودەکانیان دەکات، چ بۆ ئادەمێزادو چ بۆ ئاژەڵ بە تێکرِاییو داوا لە زەردەشت دەکات کە بەخەڵکی رِابگەیەنێت بە بێهودە ئەمانە لەناو نەبەن.) حاجی میرزا عبدالمحمد خان نووسەری کتێبی (زردشت باستانیو فلسفه او) کە لە ساڵی 1933 لە میسر لە چاپدراوە لەلاپەرە 69 دا دەبێژێ:

((پێویستە ئەوە بزانین کە ئەم چاوپێکەوتنانەی پەیامبەر لەتەک فریشتەکاندا، لەیەك کاتو یەك شوێندا رِوینەداوە، بەڵکو لە ماوەی دوانزە ساڵو لە شوێنی جیاجیا رویداوە، ئەوەی کە ئێستا ئاشکرابووە، ئەوەیە کە زوربەی ئەم چاوپێکەوتنانە لە ناوچەی ئازەربایجان (کوردستان) و دوانیان لە رۆخی گۆلیورمێ روویداوە.))

پەیامبەر، پاش ئەوەی فەرمانەکانی ئاهورامەزدا وەردەگرێت پێی رِادەگەیەنرێت کە بچێتە نێو خەڵکیەوەو رێگەی راستیو دروستی ئاینی خواپەرستی یان پێشان بدات.

زەردەشت، لە تەمەنی چل ساڵیداو لە رۆژی شەشی خاکە لێوەدا (نەورۆز) کە دەکاتە 26ی مارت، لەکێوی (ئەشیدەرنە)، بەفەرمانی ئاهورامەزدا دێتە خوارەوەو دەچێتە نێو خەڵکیەوەو ئامۆژگاریان دەکات کە رێگەی رِاستی بگرنە بەر. بانگیان دەکات کە ئاینی خواپەرستی هەڵبێژێرن.

نووسینو داستانەکانی زەردەشتیەکان، وارِادەگەیەنن کە لە رۆژانی یەکەمی بانگەوازەکەیدا خەڵکێکی فرە کەم، لە دەوری کۆدەبنەوە. زوربەی زۆری خەڵک هیچ گوێ نادەنە ئامۆژگاریوتەی پیرۆزەکانی، ئەوانەی لە دەوریدا کۆدەبنەوە، گوێیە بە پەنجەی دەست دەژمێرێن. بەڵام لە راستیدا، دەبێ بەو جۆرە نەبوبێت، چونکو ناتوانین باوەرِبکەین کە لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی وەك ئەوکاتە، هەروەکو لە مەوبەر باسمان لێکرد، زۆرو ستەمو خراپە، باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو، خەڵکی چاوەرێی ئەوەیان دەکرد کە یەکێك بێتو لەو بارە ئالێۆزە رزگاریان بکات، ئێستا ئەو کەسە هاتبێتو ئەو هەموو پەندو ئامۆژگارییانە بڵاوبکاتەوەو هەموو لایەك دڵنیا بکا کە رِزگاریان دەکا لە خراپە، کە چی بە گوێی نەکەن. دەتوانین بێژن، کە دەبێ سەرەتا خەلکێکی فرە، بەتایبەتی لە چینی هەژارو کەم دەرامەتەکان دوای ئەم ئاینە کەوتبنو باوەرِیان بەوتە پیرۆزەکانی پەیامبەر هاورد بێت، بەڵام پێشەوا ئاینییە درۆزنەکانو فەرمان رِەوا گەورەکانو جادوکەرەکان کە هێزو دەسەڵاتو توانایەکی زۆریان هەبووە، هەست بەوە دەکەن کە ئەستێرەیان بەهۆی ئەم ئاینە تازەیەوە خەریکە بەرەو ئاوا بوون دەروات، بە زۆرو هەرِەشەوا لە خەڵکی هەژارو بێ دەسەڵات دەکەن کەواز لەم رێگەیە بێننو بگەرێنەوە سەر ئاینی باوكو باپیرانیانو پشتی زەردەشت بەربدەن.

سێ چوار ساڵك بەم شێوەیە، زەردەشت خەریكی بڵاوكردنەوەی دەستورەكانی ئاهورامەزدا دەبێت، بەڵام بە داخەوە - بزماری پۆڵایی بەرد كون ناكاتو هەموو هەوڵو كۆششەكانی تا ئەندازەیەك بە فیرۆ دەچێ. یەكەمین كەسێك كە لەوماوەیەدا بەدڵو بەگیان، باوەر بەئاینی نوێو پەیامەكەی زەردەشت دێنێ، ئامۆزاكەی خۆیەتی بەنێوی (میدیوماه) كوڕی ئاراستی..

هەروەكو گوتمان پیاوە ئاینیە درۆزنەكانو خاوەن دەسەڵاتەكانو دەوڵەمەندەكانی ناوچەكە، ئاڵای دژایەتی بەرامبەر پەیامبەر هەڵێدەكەن، بە شێوەیەك دژایەتیو ململانێی لەتەكا دەكەن، كە ناچار دەبێ نیشتمانی جێهێڵێتو بەرەو ڕۆژهەڵات كۆچ بكات، ماوەیەك ئاوارەو سەرگەردان دەبێت لەتەک دایكو باوكو منداڵەكانیو ئامۆزاكەیو ژمارەیەكی كەم لەوانەی بڕوایان پێهێنابوو بێگۆمان ئەم كارەساتەی بەسەر زەردەشت هاتووە، یەكەمینو دواجار نەبووە لەمێژوودا فرە لە پەیامبەرەكان هەمان كارەساتیان بەسەر هاتووە، بۆ وێنە پەیامبەری ئیسلام (د.خ) ئەویش كەسو كاری خۆی پاش ئەوەی دژایەتیان كردو ئازارو ئەشكەنجەیان دا ناچاریان كرد كە نیشتمانی خۆی جێهێڵێتو كوچ بكات بۆ شوێنێكی دیكە، خوای گەورەو میهرەبان لە قورئانی پیرۆزدا وورەی پەیمابەر بەرز دەكاتەوەو دڵنیای دەكاو داوای لێدەكات كە ئارام بێت، چونكە لەمەوبەریش زوربەی زۆری پەیامبەران، بەرهەڵێستیان لێكراوەو دوژمنو نەیاریان هەبووەو دەفەرموێ:

((وكذلك جعلنا لكل نبي عدوا من المجرمينو كفى بربك هادياو نصيرا))

سورەتی فرقان – ئایەتی 30

پاش چوار ساڵیك زەحمەتو رەنجكێشان ئیدی بۆی ئاشكرا دەبێ كە ئەمانە نایەنە سەر ڕێی راستو دەبێ هەروەها بە گومرایی بمێننەوە بۆیە، ڕوودەكاتە لای سەردارانو خونكارانی تۆران، بەڵام ئەوانیش لە دەستەی یەكەم باشتر نابنو بەڵگەو نیشانەكانی ئەو پەیامبەرە پایەبەرزە، دڵی ئەو ستەمكارانەش نەرم ناكاتو پەیڕەوی لێناكەن.

بەڵی، زەردەشت لەیەكەمین تاقیكردنەوەیدا كە ڕووبەڕو لەتەک خەڵكدایە، سەركەوتوو نابێت ئەو باسی چاكەو خراپە دەكات، دەربارەی ئازادی دەربرینی بیرو ڕا، ئازادی لە هەڵبژاردن دەكات، بانگەوازی خەڵک دەكا بۆ هاتنە سەر ڕێی راست، پەیڕەوی لە بیرووتەو كرداری چاكـو... بەڵام كۆمەڵگا، كۆمەڵگایەكی دواكەوتووە، ئەموتەو باوەرانە ئەزم ناكا چونكو بابەتێكی تازەیە، زەردەشت لەكاتێكدا باسی خوای تاكو تەنیا دەكا كە ئەوان خوایانی جۆراوجۆر دەپەرستن، لەكاتێكدا باسی ئازادایو هەڵبژاردن دەكات، كە ئەوان لەژێر باری ستەمی پێشەوا درۆزنو جادوكەرەكانداوزەی بیركردنەوەیان لێبراوە، كاتێك باسی نیشتەجێیو دروست كردنی گوندو شارو كشتوكێڵو ئاوەدانی دەكا كە خەڵكی خوویان بە كۆچەرێتیو خێوەت نشینی گرتبوو. زۆرداران، لە گەورە پیاوانی ئەوكاتە هەست بەوە دەكەن كە ئەم بیرو باوەرە تازەیەی كە زەردەشت هاوردویەتی پلەو پایەو جێگەیان پێ لێژدەكات، بۆیە دەكەنەوە ئازاردانی خۆی

و ئەو خەڵکەی باوەریان پێهێنابوو، خەڵکی لێ تەردەدەکەن‌و ناچاری دەکەن رەو بکات‌و ناوچەکەیان بۆ بەجێ بهێڵێت. زەردەشتی پاك‌و نەمر ئەم ماوەیەی ژیانی لە گاتاکاندا بەدەم سکاڵاوە باس دەکات‌و دەبێژێ

((روو لە کام سەرزەمین بکەم؟

و بۆ کوێ کۆچ بکەم؟

لە کەس‌و کارو یارەکانم دوورم دەکەنەوە،

دڵخۆشییەکم نە لە هاوکارەکانم هەیە،

نە لە شالیارەکان کە پەیرەوی درۆو خراپەن،

ئەی مەزدا ئاهورا،

چلۆن دەتوانم رەزامەندی تۆ وەدەست بێنم؟)) یەسنا 46 بەندی 1

پاش ماوەیەك دەربەدەری‌و ئاوارەیی‌و سەرگەردانی بە فەرمانی ئاهورامەزدا بەرەو شاری (بەلێخ) لە ڕۆژهەڵاتی ئیران کە پایتەختی گوشتاسەب شای کەیانی بووە، دەکەوێتە ڕێ. میهردادمهرین نووسەری کتێبی (دین بهی – فلسفه دین زردشت) ل- 17 دەبێژێ: ((... زەردەشت ناچار دەبێت لە هاولاتییەکانی خۆی لە ئەتروپاتگان، رەشبین بێت‌و بەرەو شاری (بەلخ) دەروات. ئەوەی ئاشکرا بووە شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت لەشوێنێکی نزیك گۆلی‌ورمێ بەناوی (گزن) بووە))

هەر لەیەکەم چاوپێکەوتندا، زەردەشت بەهۆی‌وتە جوان‌و راستەکانی دڵی گوشتاسەب شا وەدەست دێنێت، شا فەرمان دەدات کەوا کۆرێك لە پیاوە زاناو داناو ژیرەکان پێکەونێن‌و هەر چی پرسیارێکیان هەیە لە زەردەشتی بکەن.

لەیەکەمین کۆردا هەرچی پرسیارێکیان بوو لە زەردەشتیان کرد. دەربارەی ژیانی رابردوو ژیانی پاش مردن (پەسڵان)، نهێنیەکانی بوون، حیکمەت‌و فەلسەفەو....

زەردەشت وەڵامی گشت پرسیارەکانیانی داوەتەوە. ئەو رۆژە، شا فرە دڵشاد دەبێت. بەڵام پیاوەکانی بارەگەکەی لەدڵەوە یەکجار زۆر مات‌و مەلول‌و کەسەر دەبن، چونکە لەبەردەم شادا شەرمەزاربوون. ئەوەی ئەم پەیامبەرە باسی لێدەکرد، هەرگیز ئەمان نەیانزانیبو وە نەیانبیستبوو تاوەکو باسی لێوە بکەن.داوایانکرد کە بۆ رۆژی دوایی کۆرێکی دیکە بگرن.

زەردەشت سوپاسی ئاهورامەزدای کرد کە ئەو توانایەی پێبەخشی کە بەسەر ئەمانەدا زاڵێ بێت..

بۆ رۆژی دوایی، دووبارە زەردەشت لە کۆڕەکەدا وەڵامی گشت پرسیارەکانی دایەوە کەڵی کرابوو. بەشێوەیەك وەڵامی دانەوە، کە هەموو زاناکانی حەپەساندبوو نەیاندەزانی دەبێ چیبکەن !

زەردەشت بە گوشتاسەب شا دەبێژێ کە دەیەوێت بۆ رۆژی داهاتوو هەر چی زاناو داناو پیاوە گەورەکانو سەردارانی سوپا هەیە، گشتیان لە کۆرێکدا ئامادەبن چونکە گەرەکێتی راستیەکیان بۆ باسبکات کەتا ئەوکاتە باسی نەکردووە.

گەورە پیاوانی بارەگای شاو زاناکان هەموو کەوتنە خۆیانو چونە ناخی بیرکردنەوە یەکی قولێ. زۆریان پێ ناخۆش بوو کە کەسێکیوا هیچ کەس نایناسێتو بێگانەیەکی وەها کە نازانن لەکوێوە هاتووە، جێگەیان پێ لێژ بکات، لەبەر ئەوە هەموویان بڕیاریان دا کە برۆنەوە ماڵەکانیانو بیربکەنەوەو بۆ رۆژی داهاتوو هەموویان پێکەوە بەرەنگاری ئەم بێگانەیە بن.

بۆ رۆژی دیاریکراو گشت پیاوە ژیرەکانو سەردارانی سوپا لەبارەگای شا ئامادەبوون. زەردەشت هاتو دەستکرا بە گفتوگۆ، ئەم جارەش وەك رۆژانی پێشوو، زەردەشت سەرکەوتو هەموویانی بەزاندو وەڵامی پرسیارەکانی دانەوە، ئیدی هیچ پرسیارێك بێ وەڵام نەمایەوە.

گوشتاسەب شا، زەردەشتی هاوردە لای خۆیەوەو لە ژوور گشت پیاوەکانی بارەگا داینا، ئەوسا زەدەشت رویکردە گوشاسەبو گوتی / ئەز پەیامبەری ئاهورامەزدا خوای تاكو تەنیام، ئەو خوایەی کەوا لە هەمووان مەزنترە، زاناتر، داناو ژیرترینە، ئەو خوایەی کەوا حەوت ئاسمانو زەوی دروستکردووەو تۆی خستۆتە سەر تەختی پاشایەتی، ئەو خوایەی تۆی لە هیچ ئافراندووەو بە فەرمانوویستی ئەو گەیشتویتە ئەم شوێنە، ئەو خوایەی رۆحو لەشی هەموو زیندەوەرێکی دروستکردووە، ئەو خوایەی هەموو شتێك لەوەو بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە...

ئەمجا زەردەشت ئاوێستا بۆ (شا) دەخوێنێتـەوەو دەبێژێ ئەمە پەیامی خوایە کە بەهۆی منەوە بۆ گشت ئادەمیزادی ناردووە.

پاش ئەوەی پەیامبەر، قسەکانی تەواو بوو، گوشتاسەب داوای لە زەردەشت کرد بۆ سەلماندنی راستی قسەکانی بەڵگە بهێنێتەوە. پەیامبەر لە وەڵامدا دەبێژێ کە باشترینو راسترین بەڵگە بۆ قسەکانی پەیامی ئاوێستایە کە نهێنیو رازی هەردوو جیهانی تێدایە، کە تا ئەوسا هیچ کەسێك پێی نەزانیوەو زانیارییەکیان دەربارەی نەبووە. لەبەر ئەوەی گوشتاسەب شا نەیتوانی لەیەکەمجاردا ناوەرۆکی ئەو پەیامە پیرۆزە ئەزم بکاتو خاس لێی تێبگات، چونکە فەلسەفەکەی لەوە قولێترو بەرزتربو کە بە یەکجار خوێندنەوە هەمووی ئەزم بکرێت، بۆیە بە زەردەشتی

گوت که ناتوانێت بریاری تەواوەتی خۆی بداتو ڕای دەربرێت بەرامبەر ئامۆژگاریەکانی پەیامبەر، ئایا پەیڕەوی لەو ئاینە تازەیە دەکا یا نا. گوشتاسەب شا داوا لە زەردەشت دەکا کە ئاوێستای لا دابنێت بۆئەوەی هەر ڕۆژەی چەند بەشێکی لێبخوێنێتـەوە. پێی دەبێژێ تۆ گرۆژێ وەرە بۆ ئیرە بۆئەوەی سوود لە قسەو ئامۆژگارییەکانت وەربگرین. بەڵام ئایا پیاوەکانی بارەگای شا، زاناکانی ئەو سەردەمەو گەورە جادوکەرەکان، کە بە چاوی خۆیان دەبینن، بێگانەیەك هاتووەو بەزیرەکیودانایيو لێهاتوویی خۆیەوە، خەریکە جێگەیان پێ لێژدەکا، هەروا چوار مشقی دادەنیشنو دەست بە ئەژنۆی خۆیانەوە دەگرن؟

بێگومان نا، بۆیە لەنێو خۆیاندا کۆبونەوەیەك ڕێکدەخەنو بڕیار دەدەن کە زەردەشت بکوژنو لە ناوی بەرن وەلێ دوانیان کە لە هەموو ئەوانی دیکە ژیر تر بوون، بەم پیلانە قایل نابنو دەبێژن کە نابێ ئەم کارە بکەن. بەڵکو پێویستە بیر لە پیلانێکی خاستر بکەنەوە کە بێـە هۆی ئەوەی لە ناوچەکە دەربکرێت یاخود بخرێتە زیندان.

پاش بیرکردنەوەیەکی ئەهریمەنانە پیلانێکی نوێ دادەڕێژن و دێن لەتەک قاپیەوانی ئەو ماڵەی کە بۆ حەسانەوەی زەردەشت تەرخان کرابوو، ڕێکدەکەونو کلیلی خانوەکەی لێدەستێنن. ئەوجا، برێ پیسایی ئاژەڵ، خوێن، موو، لاشەی ئاژەڵی تۆپیوو کەللەسەری سەگـو سەلکە پشلیەو ئێسقانی مردوو.... دەخەنە نێو سەرینو تورەکەو لە ژوورەکەی زەردەشتدا دەیشارنەوە. ئەو جا پێکەوە دەچنە بارەگای شا، لەوێرا شاو زەردەشت دانیشتبون گوشتاسەب خەریکی خوێندنەوەی ئاوێستا بوو، لەوکاتەدا چوبووە ناخی دەریایی پڕ لە زانیاری ئەو پەیامە پیرۆزە . ئەو تاقمە پیلانگێرە پاش کرنوش بردن بۆ (شا) دەبێژن کە زۆر خۆی بەو کتێبە هیلاكو ماندوو نەکات. چونکە هەمووی بریتیە لە جادوو جادوگەرێتیو ئەو پیاوەی کە خۆی بە پەیامبەر دەزانیتو کەسیش نایناسێت، کەس نییە جگە لە جادوگەرێك، کە بە قسەی زلو بریقەدار دڵی (شا)ی نەرم کردووە، بۆئەوەی بە مەرامی تایبەتی خۆی بگات. گوشتاسەب، فەرمانی پشکنینی ماڵەکەی زەردەشت دەردەکات. پاسەوانەکان هەر چی ئەو شتانەی پیلانگێرەکان دایاننابوو دەیهێننە بارەگای شا.

گوشتاسەب بە بینینی ئەو شتە پیسانە چاوی دەپەرێتە تەوقی سەریەوەودەست دەکا بەسەرزەنشتکردنی زەردەشتو قسە پێگوتنیو پێی دەبێژێ:

ئەتۆش جگە لە جادوگەرێکی پیسو چەپەڵێ، هیچی دیکە نیت، هەر چەندە زەردەشت داکۆکی لە خۆی دەکا، بەڵام بێسسودبووە، چونکە ئەو کەلو پەلانەیان لە نیو ژورەکەیدا دۆزیبۆوە.

(شا) فەرمانی دا کە زەردەشت ببەنو بیخەنە زیندان. زەردەشت ماوەی هەفتەیەك لە زیندان دەبێت. گوشتاسەب شا ئەسپێکی ڕەشی فرە جوانو ڕەسەنی هەبووە کە یەکجار زۆر خۆشیویستووە، ڕۆژێك بەیانی زوو مەیتەرەوانەکەی شا وەك هەمیشە دەچێتە نێو تەویلەی ئەسپەکان، ئەسپە ڕەشەکە وەك جاران سەرنجی ڕادەکێشێ بەڵام ئەمجارەیان بە شێوەیەکی

دیکە. ئەسپەکە، بە شێوەیەکی زۆر سەیرو نائاسایی بەسەر زەویدا کەوتووە، دەچیتە پێشەوەو لێی نزیك دەبێتەوە دیمەنێکی سەیر دەبینێت. لێوورد دەبێـەوە، تەماشای دەکا، چوار پەلی ئەسپەکە سر بووەو بەسکیەوە نوساوە. بە پرتاو بەرەو بارەگای شا دەچێت‌و کێشەکەی بۆ دەگێرێتەوە، (شا) دێت‌و ئەو دیمەنە دەبینێت، غەموپەژارە دادیدەگرێت‌و فەرمان دەدا کە هەرچی زاناو پزیشك‌و پسپۆرەکان لەو ناوچەیەدان کۆببنەوەو چارەسەرێکی ئەو دەردە بکەن. هەموو کۆدەبنەوە بەڵام هیچیان لە دەست نایەت‌و هەرچیەگ دەکەن بێسود دەبێ.

بەهۆی پاسەوانی زیندانەکەیەوە، زەردەشت ئەم هەواڵە سەیرە دەبیستێت، پێی دەبێژێ بچۆ بۆ خزمەت شاو پێی بێژە زەردەشت دەڵێ من دەتوانم ئەسپە ڕەشەکەی لەم نەخۆشییە رزگار بکەن.

بە بیستنی ئەم ڕاسپاردەیە، (شا) دەنێرێ زەردەشت لەزیندان دەهێنن‌و پێی دەبێژێ، تا ئێستا قسەی زۆرت بۆ کردوین، بەڵام هیچ شتێکی وەها نەنوێندووەو بە کردەوە هیچت پیشان نەداوین کە بڕوات پێ بکەین. ئەگەر راست دەکەیت‌و پەیامبەرو راسپاردەی ئاهورامزدایت، ئەمە ئەرزو ئەوە گەز، دەبێ بتوانیت ئەم ئەسپەم لەم نەخۆشییە بۆ رزگار بکەیت. زەرەدەشت بۆ چاککردنەوەی ئەسپەکە، چوار مەرج دادەنێت‌و بە شا دەبێژێ کە ئەگەر ئەم چوار مەرجە بە دي بهێنێـت، ئەوسا هەر چوار پەلی ئەسپەکە ڕەها دەکات‌و خاس دەبێـەوە.

(شا) دەڵێ، چیت گەرەکە بڵێ. زەردەشت دەبێژێ، یەکەمین مەرجم ئەوەیە کەوا بەدڵ‌و بەزمان باوەرم پێبکەیت کە ئەز پەیامبەری ئاهورامەزدام، پێویستە گوتنەکەت بە باوەڕەوە بێـت، دەنا هیچ سودێکی نابێت‌و بێهودە دەبێ. گوشتاسەب شا، بەڵێن دەدات. ئەمجا زەردەشت دەچێتە لای ئەسپەکەو دەست دەکا بە نیایشکدرنـی ئاهورامەزداو داوای یارمەتی لێدەکات کە فریای بکەوێت. کوت‌و پڕ دەستی راستی ئەسپەکە لە سکی جیا دەبێتـەوە. (شا) دڵخۆش دەبێ‌و خەندە دێـتە سەر لێوی.

دووهەمین مەرجی زەردەشت، ئەوەیە کە ئەسفەندیاری کوڕی شا لەبەردەمی هەمووواندا، بەڵێن بدات کەوا بە هەموو هێزو توانایەوە ئاینی یەکتا پەرستىبڵاوبکاتەوەو ببێتە پالێپشت‌و پشتیوانی زەردەشت. ئەسفەندیار بەڵێین دەدات کە بە هەموو هێزو توانایەکیەوە، پالێپشتی زەردەشت بێت‌و داکۆکی لە ئاینییەکتاپەرستی بکات‌و لە هەموو لایەکدا بڵاوی بکاتەوە، و هەر سێك دژی ئەم ئاینە بێت، دژایەتی بکات.

ئەمجا، زەردەشت دەست دەکات بەپاڕانەوە لە ئاهورامەزدا. قاچی راستی ئەسپەکە لە سکیەوە جیادەبێتەوە، هەموو ئەوانەی لەوێ ئامادەبوون ئافەرینی زەردەشت دەکەن.

سێهەمین مەرجی زەردەشت بریتی بووە لە وەی شابانو(ئاتوسا) دەبێ لە کانگەی دڵیەوە باوەڕ بە ئاینی یەکتاپەرستی بهێنێت. پاشان، زەردەشت دەچێتە دوی شابانوو قسەی بۆ دەکات. ئەوسا، ئەو ئافرەتە پاکەش ئاینی یەکتاپەرستی بە دڵەوە پەسەند دەکات‌و باوەڕ دەهێنێ.

زەردەشت دەگەڕێتەوە لای ئەسپەکە، وە دەست دەکاتەوە بە پاڕانەوە لە ئاهورامەزدا تاوەکو قاچی چەپی ئەسپەکە وەك جارانی لێدێتەوە. چوارەمین‌و دوامەرجی زەردەشت لە شا ئەوەیە کە فەرمان بدات قاپیەوانی ماڵەکەی بهێنن. شا دەستور دەدا قاپێوانەکە بێنن. زەردەشت داوای لە شا کرد کەوا پێشەکی لە قاپیەوانەکە ببورێت وە لێی خۆشبێت بە مەرجێك لە راستی بەولاوە هیچ نەبێژێت. ئەوسا لێی دەپرسێت کە ئەو هەموو کەل‌و پەلە پیسانە چلۆن گەیشتونەتەژوورەکەی. قاپیەوانەکە ناچار دەبێت کە ڕاستی بلێێت. ئەوسا زەردەشت دەستدەکات بە دوعا کردن تا دەستی چەپی ئەسپەکە لە سکیەوە جیادەبێـتەوە. ئەسپە ڕەشەکە، بە پرتاو هەلێدەستێتە سەر چوار لۆق. شا زۆر دڵخۆش دەبێت، هەلێدەستێ‌و ناوچەوانی زەردەشت ماچ دەکاو داوای لێبوردنی لێ دەکات بۆ هەڵسوکەوتی ئەو دواییەی. گوشتاسەب، فەرمان دەردەکات، چوار لەو کەسانەی بونەتە هۆی بە دي هێنانی ئەو کارەساتە هەلێواسن‌و سزای کرداری ناشرین‌و چەپەڵی خۆیان وەربگرن. ئەمجا، شا، شاژن وە ئەسفەندیار بەدڵ‌و بە گیان ئاینی یەکتا پەرستیان پەسەند کرد، وە باوەڕیان پێهێنا، وە هەموو هێزو توانای خۆیان‌و کیشوەرەکەیان خستەگەڕ بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم ئاینەو بونە باشترین پالێپشت بۆ زەردەشت‌و پەیامەکەی.

ئەوەی لێرەدا شایانی باس بێت، ئەوەیە کە بەگوێرەی باوەڕی نووسەری کتێبی (شش هزار ساڵ تاریخ) گوشتاسەب شا لە ساڵی 1725 پ.ز، دوو هەفتە پێش دەستپێکردنی وەرزی بەهار، ئەم ئاینەی پەسەند کردووە. بەگوێرەی ئەو نوسینە، ووتووێژی نێوان زەردەشت‌و گوشتاسەب شا نزیکەی دوو ساڵی خایاندووە.

پاش ئەوەی گوشتاسەب شا باوەڕی بە ئاینی خواپەرستی هاورد، داوای لە زەردەشت کرد کە چوار ئارەزووی هەیە دەیەوێت بێتەدی. لەبەرئەوە بە زەردەشتی گوت کە داوا لە ئاهورامەزدا بکات تا ئەم داوایانەی بۆ بێنێـتە دی.

داواکاریەکانی، یا داخوازییەکانی بریتی بوون لە:

**یەکەم /** بۆی ئاشکرا بێت پاشەرۆژی چلۆن دەبێ‌و لە پەسڵاندا شوێنی لەکوێ دەبێت.

**دووهەم /** بە هیچ جۆرێك تێغ لەشی نەبرێت، بەتایبەتی لە کاتی جەنگدا، بۆئەوەی زێتر بتوانێت تێبکۆشێت‌و هەوڵ بدات بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینیەکتاپەرستی.

**سێهەم /** دەربارەی غەیبەوە زانیاری تەواوی پێبدات.

**چوارەم /** داخوازیشی ئەوە بوو کە هەرگیز نەمرێت.

زەردەشت لە وەڵامی شادا پێ گوت، کە لەم چوارداخوازی‌و ئارەزوویەی تەنیا یەکێکیان هەلبێژێرێت، چونکە ئاهورامەزدا هەرگیز ئەم چوار بەهرەیە بەیەك کەس نادات. (شا) گوتی

گەرەکمە بزانم پاش مردنم شوێنم لەکوێ یە. پاشان زەردەشت لە ئاهورامەزدا دەپاڕێتەوە ئەم ئارەزووەی گوشتاسەب بە دي بهێنێت. بە فەرمانی ئاهورامەزدا، زەردەشت خواردنەوەیەکی تایبەتی دروست دەکاو دەیدا بە شا بیخواتەوە. پاش ئەوەی شا خواردنەوەکە دەخواتەوە، خەوی لێدەکەوێتو ڕەوانی لە لەشی جیا دەبێتەوەو بەرەو بەهەشتی بەرین دەڕوات وە لەوێرادا جێگەی خۆی دەبینێت. بەگوێرەی داستانەکانی زەردەشتییەکان، ئاهورامەزدا زەردەشتی ئاگادار کردۆتەوە لەو شتانەی کە لە پاشە ڕۆژدا روو دەدەن وە دێنە دی، بەتایبەتی ئەو کارەساتانەی کە بەسەر ئاینی یەکتاپەرەستیدا دێت، هەروەها دەربارەی پەیدابوونی پەیامبەرانی پاش خۆی، سەبارەت بە ئاوارە بوونو دەربەدەربوونی پەیڕەوانی ئاینەکەی لە دیارو نیشتمانی خۆیان. دەربارەی هێرشي ئەسکەندەري مەکدۆنيو خاپورکردني زەويو زارو لەناوبردني پەيرەواني ئايني ڕاستي، هەروەها دەربارەي دوبارە پەرەسەندنەوەو بلآوبونەوەي ئايني يەکتاپەرەستی لەسەردەمي ئەردەشێري ساسانيو هێرشي عەرەبەکانو ڕوخاندني ئاتەشکەدەو ئازارداني زەردەشتييەکان، زانياري تەواوي داوە بە پەيامبەرەکەي.

گوشتاسەب شاي کەيانيو شابانو ئاتوسا، ئەسفەنديارو پشوتن کوڕاني گوشتاسەبو گشت ئەنداماني خێزاني شا، جاماسبو فرەشوشتەر کە دوو براي داناو ژير بوونو لەوەزيراني گوشتاسەب بوون، لەتەک هەموو ئەو زاناو ژيرانەي کەلە کۆڕەکاندا ئامادە بوون، ئايني يەکتاپەرستيان بە دڵو بە زمان پەسەند کرد.

لەم کاتەدا تەمەني پەيامبەر 42 ساڵ بوو، پاش ئەمە، هەموو خەڵکي ناوچەکە، هاتنە سەر ئايني يەکتاپەرەستی. ئەم ئاينە، لە ناوچەش تێپەڕي کردو بەرەو ميللەتاني دراوسێش بلآوبۆوەو تەشەنەي کرد.

لەو کاتێنەدا، تۆرانييەکان هێزو توانايەکي يەکجار زۆريان هەبووە، کەيانييەکان باجيان دەدا بە تۆرانييەکان. ئەرجاسەب شاي تۆران، فرە لەوە زوير بوو کە گوشتاسەب دەستبەردار بووە لە ئايني دێريني بابوباپيراني، وەباوەڕي بەم ئاينە تازەيە هێناوە. نوێنەرێك دەنێرێتە سەريو دەستوري پێدەدا کەواز لەم کردارەي بێنێتو بگەڕێتەوە سەر ئايني خۆيان.

گوشتاسەب شا، پياوە گەورەکانو زاناکاني ناوچەکە کۆدەکاتەوەو دەربارەي ئەو هەڕەشەيەي تۆرانيەکان گفتوگۆيان لەتەکا دەکات....

زەردەشت، لەو کۆڕەدا ئامادە دەبێتو دەبێژێ کەوا سەرانەو خاوەو باج دانو قبولێکردني ستەم، کارێکي ناڕەواو ناشايستەو دەبێ دەستي ستەمکاريو بێدادي کورت بکرێتەوە، ئادەميزاد هەرگيز بەويستي خۆيو ئارەزوو ئازادي باجو سەرانە بەکەس نادات. مرۆڤ دەبێ ئازاد بژيو لەپێناوي ئازاديدا بجەنگێتو خۆي ڕێگەي ژياني خۆي دياري بکات.

هەموو زاناو پیاوەگەورەکان پشتگیریان لەوتەکانی زەردەشت کرد. گوشتاسەب شا، بەهۆي پەیامنێرەکەي ئەرجاسبەوە وەڵامي نامەکەي دەداتەوەو پێي ڕادەگەیەنێ:

".... ئەگەرچي گشت کوڕەکانم، براکانم، کەسوکارو پیاوە گەورەکانو هەروەها خێزانەکەم بکوژرێن، هێشتا من پەیڕەوي لەم ئاینە پاکە دەکەمو دەستبەرداري نابم. ئەو شتەي لە ئاهورامەزدا وەرمگرتووە لە دەستي نادەم. "

سوپا ئامادەي جەنگ دەبێت دژي ستەمکاران بۆ ئازادي وەدەسهێنان. شەڕ زۆر زۆري خایاندووە. هەمیشە سوپاي کەیانییەکان سەرکەوتو بوون، تا ڕۆژێ لە ڕۆژان، گوشتاسەب شا لەتەک زۆربەي زۆري سووپاکەي لە شار دەردەچن (گوێیە بەرەو ناوچەي سیستان دەچن).

ئەرجاسەبي تۆراني، ئەمەي بە هەلزانیوەو هێرشێکي کتوپڕ دەکاتە سەر بەلخو دەکەوێتە جەنگێکي خوێناوي لەتەک ئەو سوپا کەمەي کەلەوێدا مابونەوە.

زەردەشتي پاك، مەردانە سەرکردایەتي ئەو سوپا کەمە دەکات. بەلآم سوپاي دوژمن بێشومار بوون.

زەردەشت لەتەك هەندێ لەسەرداراني سوپاکەي بۆ دۆزینەوەي چارەسەرێکي ئەو بارو دۆخەي ئالێۆزە دەچنە نێو ئاتەشکەدەي شار. تۆرانیەکان هێرشدەکەنە سەر ئاتەشکەدەکەو ئەمانیش بەرەنگاریان دەبنەوە. یەکێ لەسەردارەکاني تۆرانییەکان بە ناوي توربراتور (براترکرش) هەلي لە پەیامبەري خوا هێناوەو توانیوێتي کە ئەو مرۆڤە پاکو دانایە کە بوبوە چرایەك بۆ ئەوەي تاریکە شەوي کۆمەڵگاکەيو هەموو جیهان ڕووناك بکاتەوە، شەهید بکات.

ئەو ڕۆژە شومە، ڕۆژي 5ي مانگي بەفرانباري ساڵي 583 پ.ز بووە. حەزرەتي زەردەشت لەو کاتەدا تەمەني 77 ساڵو 40 ڕۆژ بووە کەڕۆحي پیرۆزو نەمري بەرەو لاي ئەویني ڕاستەقینەي خۆي پەرواز دەکات.

لەم شەڕەدا، لوهراسەب (باوکي گوشتاسەب شا)، ئەویش شەهید دەبێت، (لوهراسەب، کاتي خۆي لە شایەتي کەنارەگیري کردبوو بۆ کوڕەکەي) کاتێك هەوالێ دەگاتە گوشتاسەب شا، بە پەلە خۆي دەگەیەنێتەوە (بەلخ). بەلآم کارلەکار ترازا بوو، شاروێرانو خاپور، ئاتەشکەدە سوتاوو ڕوخابوو... زەردەشت شەهید کرابوو....

گوشتاسەبو لەشکرەکەي بۆ تۆڵە سەندني زەردەشت، کارێکيوا بە تۆرانییەکان دەکەن کە هەتا هەتایە ئیدي نەوێرن بەرەو ئەو دەڤەرە هێرش بەرن، هەروەها دەگەرێت بەشوێن بکوژي پەیامبەرو لەناویدەبێت.

پاش شەهیدبوونی پەیامبەر، جاماسەب جێگەی دەگرێتەوەو دەبێتە جێنشینی پەیامبەر، زەردەشت، لە پاش خۆی کتێبەو پەندو ئامۆژگاریی‌وای بەجێهێشتووە، تا ئێستاش کە هەزاران ساڵی بەسەردا چووە، هێشتا زاناو داناکانی هەموو لایەکی جیهان سوودی لێوەردەگرن. ئەو سێ بنچینانەی ئەو دواینابوو بۆ بلاَوکردنەوەی ئاینەکەی، بیروکرداروتەی چاک، ئەوساو ئێستاو هەتا هەتایەو بۆ هەمیشە، باشترین‌و بەهێزترین کۆڵەکەن بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی بەختیاری جیهانی.

## ئارامگای زەردەشت

بێگومان لەشارێکی گەورەی وەك (بەلخ)ی ئەوسەردەمە، کەچەندین خونکاری گەورەی کەیانی وەك گوشتاسەب شای تێدا بووە، دەبێ گۆرِستانێکی تایبەت بۆ گەورەپیاوان بوبێت. هەروەکو گوتمان، پاش ئەوەی گوشتاسەب شا دەگەرِێتەوە بەلخو شار لە داگیرکەرەکان پاکدەکاتەوە، بێگومان دەبێ جەستەی زەدەشتو لوهراسەبو پیاوە گەورەکانی لەو گۆرستانەدا ناشتبێت.

کتێبی (فچائل بلخ) کەلەلایەن ابوبکر عبد الله بن داود البلخي لە ساڵی 610ی هیجریدا بە عەرەبی نوسراوە، وە لەلایەن عبد الله بن محمد بن قاسم الحسيني لە ساڵی 676ی هیجریدا وەرگێراوەتە سەر فارسی (ئەم کتێبە حەوت ساڵ پێش هێرشی جەنگیزخانی مەغۆل بۆ سەر شاری بەلخ نوسراوەتەوە) لەم کتێبەدا باسی شاری بەلخ دەکاتو تیایدا دەبێژێت کە ئەوکاتەی عەرەبەکان ئەم شارەیان داگیرکرد، ئارامگای شاکانی کەیانیو گەورە پیاوانی ئەو سەردەمە، بە تایبەتی گوشتاسەب شاو زەردەشتو جاماسەبو... جێ نزرگەی خەڵک بووە. بەلاَم پاشان بەهۆی دەمارگیری عەرەبەکان مەزاری ئەو پیاوە گەورانە، ناوەکانیان گۆرِا بۆ ئەیوب، هابیلو حەزرەتی ئادەمو... (لەوانەیە ئەو پیلانە، کاری ئێرانیەکان خۆیان بوبێت بۆئەوەی ئەو مەزارانە بپارێزنو لە دەستوێرانیو خاپورکردنیان رِزگاریان بکەن) ئارامگاکان تا کاتی هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر ناوچەکە، بەشکۆمەندی مابۆوەو جێی رِێزی خەڵک بووە، کە ئەویش وەك هەموو شوێنەکانی دیکە لە لایەن مەغۆلەکانەوە خاپور کرا.

ئەوەی شایانی باسە لەو کتێبەدا، ئەوەیە کە بە شاری بەلخ بێژراوە (مدينة الجبارين والمتكبرين). لەو کتێبەدا هاتووە کە عبد الله بن عمر گوتویەتی:

"بالمشرق مدينة يقال لها بلخ، وهي مدينة الجبارين والمتكبرين وهي ثانية مداين الدنيا. لم يكن قبلها مدينة الا مدينة بناها آدم علية السلام بارض الهند يقال لها (اوق). والثانية مدينة بلخ بناها قابيل قاتل هابيل. وقبره في ميدان يقال لها ميدان طشتاسب، لاتاهم العذاب قبلا، ولكن يدفع الله البلاء عن تلك المدينة بذلك القبر".

واتە:

"…. له دەڤەري ڕۆژهەڵآتدا، شارێك هەيە پێي دەبێژرێ بەلخ. ئەم شارە، شاري زۆردارو لوت بەرزەكانە. ئەم شارە دووەمين شاري جيهانە. پێش ئەم شارە هيچ شارێكي تر نەبووە جگە لەو شارەي حەزرەتي ئادەم (د.خ) لەسەرزەميني هيند دروستي كردووەو پێي دەبێژرێ (ئوق). دوهەمين شار، هەر ئەم شارەيە كە قابيل بكوژي هابيل دروستي كردووە. ئارامگاي هابيل لەم شارەدايەو لەگۆڕەپانێكدايە كە پێي دەگوترێت گۆڕەپاني گوشتاسەب، و ئەگەرەكو رێزوحورمەتو شكۆمەندي ئەم خاكە پيرۆزە نەبوايە، لە مێژەوە بوو دوچاري ئەشكەنجە بوبون. بەڵام خواي گەورە بەبۆنەي پيرۆزي ئەو ئارامگايە، بەلآ لەو شارە دوردەخاتەوە. "

هەروەها، لەزماني حەسەني بصري (21 – 110 هيجري) بێژراوە كە گوتويەتي، مەزاري حەزرەتي ئەيوب (زەردەشت) لە گۆڕستانێكە لە گۆڕەپاني (سەرتەل) لە شاري بەلخو لەتەك گوشتاسەب پێكەوەن.

ئەوەي پتر سەرنج ڕادەكێشيو شاياني باسە ئەوەيە كە، شاري بەلخو گۆڕەپاني مەزاري گەورە پياوەكاني جێ نزرگەو كەعبەي زەردەشتيەكان بووەو لەكاتە تايبەتيەكاندا وەك ڕۆژي شەشي خاكەلێوە (ڕۆژي لەدايكبوني زەردەشت)، بۆ زيارەت دەچونە ئەوێڕا. ئەم دەنگو باسانە تا سەدەي شەشەمي كۆچي، لەلايەن نوسەرو مێژوو نوسەكانەوە باسي لێدەكرا.

ابو عبد الرحمن عبد الله بن شوزب البلخي (156 هيجري) دەبێژێ:

" بەلخ لەلايەن عەجەمەكان وەك كەعبەوابووەونزرگەي مۆغەكان بوە، ولە ڕۆژي نەورۆزدا خەڵكێكي زۆر لە تخرستان، هند، تركستان، عراقوشام، پياوە گەورەكانو شازادەكان بۆ زيارەت بەرەو ئەو شارە دەچنو ماوەي حەوت ڕۆژان بەچەژنو خۆشي رادەبوێرن. "

دەبێژرێت كە حەزرەتي ئيبراهيم (دخ) چۆتە شاري بەلخو لەوێرادا لەسەر مەزاري زەردەشت نوێژي كردووە.

لەم بارەيەوە پيغەمبەر محمد (د.خ) دەفەرمێت:

وهو ما قال رسول الله (ص): (مر ابراهيم خليل الله صلوات الرحمن عليه بـ(بلخ) حتى صار بالاسبريس وهي ميدان مدينتها . فقال للملك الذي كان معه وهو الملك الموكل بالارض واسمه صلصائيل (وفي روايات اخرى صرصرمائيل) ما هذه البقعة؟ فقال ياخليل الله انزل فانها بقعة مباركة يكون فيها قبر نبي. فنزل ابراهيم عليه السلام من جناحيه وقت صلوة الفجر وصلى ركعتين. فلما سلم التفت الى بلخ فقال: اللهم اعزز، وفي راويه غرز أنهارها وأثمر أشجارها وبارك عليها واكثر فقهائها).

ئەوەي بۆ ئەم باسە، لەمڕوتەيەدا سەرنج ڕاكێشوگرنگە ئەوەيە كە ئەو مەزارە (كە بێگومان مەزاري زەردەشتە) زۆر لە پێش حەزرەتي ئيبراهيم بووە، خۆي لە خۆيدا بەرپەرچي ئەوانە دەداتەوە كە دەبێژن زەردەشتو ئيبراهيم يەك كەس بوون.

## بيرو سيماو ڕوخساري زەردەشت لەوتەكانيدا

كورتەيەك لە ژياني زەردەشت، سەرگوزشتەي چۆنيەتي لەدايكبونو بڕێ لەو داستانو ئەفسانانەي كە دەربارەي ئەو پەيامبەرە مەزنە نوسراوەتەوە، باسمان كرد.

زەردەشت، هەر لەسەرەتاوە كە خەريكي ڕاگەياندي پەيامەكەي بوو، ڕێبازو ئامانجێكي تايبەتي هەبوو، سروودەكاني هەمووي دەربارەي چۆنيەتي وەديهێناني ئەو ئامانجانە بووە. لە چونيەتي هاتنە ئاراي چاكەو خراپەوە دەستپێدەكاو بەهۆي هۆشوبيرو داناييوتێگەيشتني ئادەميزاد، ڕادەي ڕاستيو دروستي دامەزراندووە. خەڵكي هانداوە بە هۆي ئازادي هەڵبژاردنو ئيرادەوويستي خۆيانەوە، خەريكي كاري خاسو سازەندەبن.

هەروەها، داواى كردوە كە دژى بتپەرستىو ئەفسانەو دابونەريتى ڕوخێنەرو كۆنەپەرستى بن ئەمانە گشتيان بۆ ئەو ئامانجانەيە كە مرۆڤى ڕاست كردارو بير خاس لە كۆمەڵگادا سەركەوتوو بن. زەردەشت، مەبەستى لە پەرستنى ئافەريدەگارى تاكو تەنيا، هەرگيز ئەوە نەبووە كە بەو هۆيەوە ئاهورامەزدا ڕازىو خۆشحالێ بكات، چونكە دەزانيت كە ئەو نە پێويستى بە نوێژو نيايشو پارانەوەووێردى ئافەريدەكانى خۆى هەيەو نە پێويستى بەوە هەيە كە خەڵكبيناسن، مەبەستو ئامانجى ئاينى يەكتاپەرستى لاى زەردەشت، پەروەردەى ئادەميزادە، مرۆڤى كارا، هەڵيسوڕێنەر، سوودبەخشو...

زەردەشت، پتر لە سێ هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر، پڕ بەدەم هاوارى كرد،ئەى ئادەميزاد تۆ هۆشو هەستو بيرت هەيە، سوودو بەهرە لەم نيعمەتە معنوييە وەربگرە كە ئافەريدەگار پێى داويت، بگەرێرەوە سەر ڕەسەنێتى خۆتو مرۆيەكى فەرزانە بە، ويژدانى پاكو ڕۆشەنى خۆت بكەرە مەشخەڵى ڕێ ڕۆشەنكەرەوەتو ژيانت، دورەوپەرێز بە لە دابونەريتى نارەسەنو زيان بەخش. دڵنيابە كە بە كاروكردارى خاسو دروستكەر، لەرێگەى ڕاستىو ياسابەهەق، ئافەريدەگار لە خۆت ڕازىو خۆش وەش دەكەێت. پشت بە خۆت ببەستەو كارو پيشەت بكە بە ئامراز بو گەيشتنو نيزيكبونەوە لە ئافەريدەگار.بانگەوازێكى ديكەى زەردەشت ئەوەيە كە، پێويستە سودو بەهرە لە خۆشييەكانى ژيان وەربگرين، وە ئەم ژينەى بۆى تەرخان كردوين بە باشترين شێوە بەهرەى لێوەربگرين. هەروەها پێمان ڕادەگەيەنێت كە، تەنيا ئەنجامدانى كارى خاس بەس نييە، بەڵكو پێويستە ئەوانەى بە هەڵەدا چوونو ڕێى چەوتيان گرتوتە بەر بەپەندو ئامۆژگارى بخەينە سەر ڕێى ڕاستو دروست. زەردەشت كەسێيەتييەكى بە توانا بوو، پەيامبەرێك بوو كە وەحىو ئيلهامى بە بيردا دەهات كە بە شێوەي پەيامێك بەخەڵكى

رابگەیەنێت، کەسێیەتییەکی ئاکاری هەڵێکەوتوو بو، بە راستیو دروستی ئامۆژگاری دەکردو دژی درۆو فریوو قسە هەڵێبەستن بوو.

ئێستا کونێ، گەر عەوداڵی ئەوە بین کە باشترینو راستترین زانیاری دەربارەی کەسێیەتی ئەم پەیامبەرە بزانین،دەبێ فرە بەووردی لەووشە بەوشەی گاتەکان بکۆڵینەوەو هەستو باوەری ئەو پیاوە نەمرەی مێژوو لەنێو ئەو سروودانەدا بە دەستبێنین. لەیەکەمین سروودی گاتاکاندا،دەبینن کە زەردەشت پەنا دەبێتە بەر ئاهورامەزداو داوای یارمەتی لێدەکات کە یاریدەی بدات تا بە هەموو بیرو باوەرییەوە، خۆشیو ئارامی لەنێو خەڵکیدا بڵاوبکاتەوە. ئەوسا باسی ئامانجو مەرامەکانی خۆی دەکاو دەبێژێ:

...ئەز، ئەو کەسەم کە رادەپەرِم بۆ خزمەتکردنی تۆ ئەی ئاهورامەزدا...

زەردەشت لەبەرنامەکانیدا، بەگوێرەی بۆچونەکانی دەربارەی ئاکارییەکانەوە دەزانێ کە،رووداوە مادیو مەعنوییەکان هەردوو هاوجوت پێکەوە دەتوانن ئامانجەکانی بەدیبێنن. لەبەر ئەوە بە چاوی سوکایەتی ناروانێتە هیچ لایەنێکیان، دەزانێت هەردوو پێکەوە دەتوانن تەواوکەری گۆرینو شۆرشی کۆمەڵایەتی بن.

دەبێژێ..

...تاهێزو توانام هەبێت. وەووزەم تیامابێت خەڵکی هاندەدەمو فێریان دەکەم کە راستی بکەنە پیشەیانو راستگۆبن...

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم پەیامبەرە کە ئەویندارى مرۆڤایەتییە، کەمتەرخەمی ناکات بەرامبەر ئەو کەسانەی کە لە رێی راست لایانداوە بەڵکو هەوڵ دەدات کە هەمووان بخاتە سەر رێی راستو دروست.

دەبێژێ:

هیوادارم بەزمانی ئەقڵو بەهۆی ئەم ئاینەوە، گومرایانو خراپەکاران بەرەو ئەو کەسەی کە لە هەمووان مەزنترە رابکێشمو رێ نماییان بکەم،

هیواو گەشبینی بە پاشەرۆژ وە بڵاوکردنەوەی دادپەروەرێتیو چاکە بەسەر رۆحو رِەوانی زەرەدەشتدا زاڵە. هەر چەندە جارجار رِەش بینییەکی کاتبەسەریادێتو لە سروودەکانیا خۆی دەنوێنێ، بەڵام نابێتە هۆی ئەوەی باوەری بە پەیامەکەی کەمبێتەوە . هەر چەندە پەیرەوانو لایەنگرانی ئاینەکەی بە ژمارە کە من،وە هێزی بەرگریشیان لاوازە بەرامبەر بەهێزی چەتەو پیاو کوژو درۆزنەکان، بەڵام زەردەشتیووره بەرزو خاوەن باوەرو نەترس، دەست لەتێکوێشانو ململانێ هەڵێناگرێتو دەچێتە نێو خەڵکەوەو بە دەنگی بەرزو بێترس داوایان

لێدەكات بێنە سەر رێی راستو ئاهورامەزدای تاكوتەنیا بپەرستن. لەنێو سروودەكاندا، دووووتار هەیە كەوا پێشاندەدا زەردەشت لەنێو خەڵكدایەو قسەیان بۆ دەكات. راژەی ئەم دوو سرووده وەك دووووتار دەخەینە بەر چاو، وە لە پاشاندا لە باسی گاتاكاندا دەقی سروودەكان دەخەینە ڕوو:

**ووتاری یەكەم: یەسنا هات 30**

((...گەلۆ، ئێوە كە هاتونەتە ئێرەو كۆبونەتەوە بۆئەوەی گوێ لە قسەكانم بگرن، دەربارەی ئەو دوو شێوەی ژینە قسەتان بۆ دەكەم،گوێم بۆ رابگرن. ئەو كەسانەی گوێیان لێمە، بابیر لە قسەكانم بكەنەوەو هەڵیسەنگێنن. سوپاسو ستایشی ئاهورامەزدا دەكەم بۆ ئەو هەموو چاكیو راستیو رووناكییەی پێی بەخشیوین. گوێ بۆ قسەكانم شل بكەن. بە بیرێكی رۆشەن تێی بروانن، ژنو پیاو دەبێ بە بیری خۆیان راوێژ بكەنو رێگەی خۆیان هەڵبژێرن. ئەمەیە ئامۆژگارییەكانم:

لەتەک بوونی ئادەمیزادا، هەر لەو كاتەوە كە ژیانو بوون هاتە كایەو مانای پەیدا كرد، دوو گەوهەری هاوجووت لەتەكیا دەركەوتن. ئەو دوو گەوهەرە یەكێكیان خۆی لە بیروووتارو كرداری خاس نوێند، وەئەوی دیكەیان بیرووتەو كرداری خراپ بوو. لەنێو ئەو دوو گەوهەرەدا،خەڵك بەداوەرییەكی ژیرانە، دەبێ رێگەی چاك هەڵبژێرن، نە رێگەی خراپ. هەر كە ئەم دوو هێزە یەكیان گرت، ژیانو نەبوونیان بە دیهێنا. ئەم ململانێیە تا رۆژی پەسڵان بەردەوام دەبێ.لە پاشاندا ژیانی خۆشیو بەختەوەری لە هەردوو جیهاندا بۆ كەسانێك دەبێت كە خاسترین بیرو رێگەی راستیان هەڵبژاردووە. ئەوانەی كە رێگەی ناراستیان هەڵبژاردووەو درۆیان كردۆتە پیشەی خۆیان، دووچاری خراپترین چارەنوس دەبن. لەنێوان ئەو دوو گەوهەرە، درۆزنەكان خۆیان خزانە نێو رێگەی خراپو پیسو بونە هاورێی خراپەو كرداری خراپ. بەڵام لایەنگرانی رێگەی راستی، بیری چاكو كرداری خاسیان هەڵبژارد. لەنێو ئەم دووانەدا دێوپەرستان (بت پەرستان) ریگەی راستیان هەڵێنەبژارد وەعەوداڵی رێگەی درۆو فریو بوون، رێگەی رقو قینەیان هەڵبژارد بۆئەوەی ئازاری خەڵكی بدەن. ئێستا ئێمە كە عەوداڵیو شەیدای رێگەی راستین، هێزو توانای بیری چاك فریامان دەكەوێت. بەڵام درۆزنەكان لەئاكامدا دووچاری گرفتارییەكی خراپ دەبن، وە سزای گوناەو خراپەكانیان دەبینن، ئەوسا ئەی خوای گیانو هۆش، سزای خراپەكانیان بدەرەوە. بەم شێوەیە ئێمە لە تۆو بۆ تۆ دەبین، لەو كەسانە دەژمێرێین كە سوودمەندن بۆ ئەم بوونە مەزنە، دۆستو ئەویندارى ئاهورامەزدای بێهاوتا دەبینو لە جیهانی پاش مەرگدا، میوانی هەمیشەییو نەمری خانە خوێی مەزن دەبین. ئەوسا،لە پەسڵاندا ئەوانەی پەیرەوییان لە درۆ دەكرد، هەرزلێو دۆش داماو دەمێنن، ئەو سایەكە هاوبیرانو هاورییانی بیری چاك(وەهومەن) وە لایەنگرانی راستی (ئاشا) سەردەكەون. پاداشتی ئەو گشت چاكانەی كردوویانە وەردەگرنو دەچنە كۆشكی هەمیشەییو نەمری.

ئیدی خەلکینە، با خاس بڕوانینە ئەو ئاینەی ئافەریدەگاری گیانو هۆش بۆتانی ناردووە، خاس بیر بکەنەوە، دەستورو فەرمانەکانی بەجێبێنن، بڕوانە ڕەنجو خۆشی ئەم جیهانە. بە بیرێکیووردو قوڵەوە لە پاداشو سزای چاکەو خراپە بکۆڵینەوە، ئەو سایە کە ئەم ڕێگەیە هەلێدەبژێرن،ئەو ڕێگەیەی جووت یەکە لەتەک ژیانی نەمریو خۆشی، وە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەوێرا.))

ووتاری دووهەم: هات 45:

((...ئێوەگەل، ئەی ئەو کەسانەی لە ڕێی دوورونیزیکەوە هاتوون بۆئەوەی گوێ بۆ گوفتارەکانم رابگرن، وە گەرەکتانە ئاینی ڕاستیو دروستی هەلێبژێرن گوێم بۆ ڕابگرن، بە بیرێکی خاسو پاکەوە بڕواننە قوڵایی باسەکە، گەپی من ئاشکراو روونە، ئاهورامەزدا خوای گیانو هۆشە، خوای مەزنو بێهاوتایە، هەر کات بەهۆی هۆشو لە کانگەی دلْتانەوە تێبفکرن وە بیر بکەنەوە بۆتان دەردەکەوێتو تێدەگەن کە ئەو، لە هەموو شوێنێکدا هەیەو ئاشکرایە. خەڵکینە، ئاگاداربن نەوەکو ئەو پێشەوا درۆزنو فێلێبازانە، هەمیسان بەهۆی فێرکردنی خراپە لە ڕێ وەدەرتان بکەنو گومرێ بنو ژیانی راستەقینەتان لێ چەوتو چەواشە بکەنو توشی خراپەو گوناهتان بکەن.

ئێستا ئیدی گەرەکمە دەربارەی ئەو دوو گەوهەرە قسەتان بۆ بکەم کە بوونیان لەتەک بوونی ژیاندا هاوجوت بووە. ئەو دووگەوهەرەی کە یەکێکیان پاکو خاسە، ئەوی دیکەیان چەپەڵێو خراپە. گەوهەرە پاکەکە بەوی دیکەیانی گوت کە ئێمە هەرگیز پێکەوە نامانسازێت نە لە بیرکردنەوە، نە لە فێر بوون، نە لەویستو خواستو ئیرادە، نە لە ئاینو کردارو گوفتار. ئێستا، ئەو شتەی کە لە ئاینی یەکتاپەرستی هاتووە پێتان رادەگەیەنم، ئەم شتانەم بەهۆی ئەقڵو هۆشەوە لە ئاهورامەزدای داناوە وەرگرتووە. هەر کەسێك ئەمووتانە ببیستێتو گوێ رایەڵی نەبێتو وەهەڵسوکەوتی خۆی لەتەکیا یەکنەخات، لە پاشان پەشیمان دەبێو دووچاری سەرگەردانی. ئێستا گەرەکمە ئاگادارتان بکەم لە باشترین زانیارییەکانی ئاینی پاکو ڕاستو دروست. مەزدایە، کە جیهانی نەمرو هەمیشەیی دروستکردووە، هەر ئەوە کە ئەم زەوییە باردارە، هەروەك کیژۆڵەیەکی پاکی خۆیەتی، ئافراندووە مەزدا، هەروەك باوکێکی میهرەبانە بۆ جوتیاران، مەزدا ئاگاداری هەموو شتێکەو هەرگیز هیچ کەس ناتوانێت فریوی بدات.

دەمەوێ قسەتان بۆ بکەم، دەربارەی ئەو شتانەی کە لەو پاکترینو مەزنترینەوە فێر بووم، دەربارەی ئەو شتانەی کە بۆ خەڵک خاسترین زانیارین، وەئەمەم لە ئاهورامەزدا وەرگرتووە کە هەلێبژاردەی ئەوەو لێوەی فێربووم کە ئەوانەی پەیرەوی لە من دەکەن، ئەو کەسانەن کە ڕێگەی راستیو خاسئاهورامەزدایان هەلێبژاردووە، ئەو ڕێگەیەی کە بیرو کرداری باش لە مرۆڤدا دەبوژێنێ، دەبزوێنێو پەروەردەی دەکات.

بیرو کرداری خاس، مرۆڤ دەگەیەنێتە پایە بەرزێتیو نەمرێتی.

گەرەکمە قسەتان بۆ بکەم، دەربارەی ئەو کەسەی لە مەزنان مەزنترە، وە خاسترینە، ئەی ئاشا- ئەی راستی، دەربارەی ئەو ئاهورامەزدایەی کە بوونی لەتەک خاسیدا، هاوجوتەو چاکەی بۆ هەمووان دەوێت. مەزدا ئاهورا، بەهۆی ژیرێتیو دانایی‌و رەوانی پاکی خۆیەوە گوێی لە هەموو ئەو ستایشانەیە کە پیاو چاکان دەیکەن‌و لێیان دەبیسێت.

ئەز کە زەردەشتم، بەهۆی بیری خاسەوە، شێوەو چلۆنایەتی سوپاس‌و ستایشی ئەوم بۆ ئاشکراو روون بۆوە (کە بریتی یە لە پێشکەشکردنی بیرووتەو کرداری چاکە بۆ بارەگای ئەو). هەروەها ئەوە کە لە زانیاری بێ پایانی خۆی، خاسترینوێنەکانم پێ ئیلهام دەکات. ئەوە کە بەگوێرەی کرداری هەر کەس،سوودو زیانیان بۆ رەچاو دەکات. ئەمەیە ئەو شێوەیەی کە بۆ هەمووان بە کار دەگیرێت.

گشت ئەو کەسانەی بوون‌و هەن وە لە مەودوایش دەبن، ئەوانەی کە چاکی‌و راستی هەڵبژێرن، لەم جیهانەدا شادو بەختەوەرو لە پەسڵاندا کامیارو رزگار دەبن. ئەوانەی کە رێگەی درۆ هەڵێدەبژێرن دوچاری رەنج‌و بەڵایەکی زۆر دەبن‌و لە جیهانی پاش مەرگیشدا شادی‌و کامەرانی نابینن...ئەمەیەویستی ئاهورامەزاد.

پێویستە لەسەر هەمووان، بەهۆی بیرو کرداروتەی خاسەوە، ئاهورامەزدا لە خۆتان رازی‌و خۆشنود بکەن، چونکە ئەوە مایەی شادمانی‌و خۆشی هەمیشەیی،کردارە خاسەکانتانە کە دەتوانێ ئێوە بگەیەنێتە لای ئەو، وە بەهرە لەو ژینە خۆشە هەمیشەییە وەربگرن. لەسەر هەمووان پێویستە کە بیناسین‌و سوپاس‌و ستایشتی بکەین‌و عەودالی ئەو رێگە راستە بین کەمایەی رزگاریمانە. بەهۆی بیری خاسەوە، داوای لێبکەین کە یارمەتیمان بدات لە رێگەی کارو کۆشش‌و کشتوکێڵی‌و پەروەردەی ئاژەڵەوە ژیانێکی پڕ لە خۆشی‌و ئاسودەیمان پێ بەخشێت. هەمووان لەسەرمانە بێ فیزو خۆ بە زلزانین‌و بەهۆی سرودەکانەوە، باوەر بێنین بە مەزنێتی مەزدا ئاهورا، کە هەبووەو هەیەو نەمرە، چونکە لە تێرۆژە هەرە گرنگ‌و بەنرخەکانی خۆی کە بریتین لە وەهومنە- بیری چاک -و ئاشا –راستی- ئێمەی بەهرەمەند کردووەو مژدەی داوینەتێ کە لە جیهانی نەمری پاش نەبوونی مادیدا، لەنێو باوەشی روناهیەکانی خۆیدا جێگیرمان بکات.))

لێرەدا بۆئەوەی زێتر بتوانین لە روانگەی‌وتەکانی زەردەشت خۆیەوە- کە لە گاتاکاندا باسکراوە- سیماو روخسارو کەسێیەتی‌و بیرو باوەرو بۆچوونەکانی ئەم پەیامبەر مەزنە، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پێشان بدەین، زۆر بە کورتی پوختەی چل‌وتە لە گوفتارەکانی دەخەینە بەرچاو:

زەردەشت، هۆی هەڵبژاردنی بە پەیامبەرێتی دەگەڕێنێتەوە سەر دژە کرداری خۆرسکی کۆمەڵگا بەرامبەر بەو بارودۆخە ئاڵۆزەی کە هەیبووە لە رووی بواری رەوشتییەوە. هەروەها وەڵام دانەوەی یاسای ئافراندن، بە خواستوویستی خەلکی، بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیرو گرفتە:

((ئەی خوای مەزن، گیانی گیانداران سکاڵاو گلەیی خۆیت عەرز دەکات:

بۆ چی ئەمنت دروست کردو ئەم لەشە مادییەت بە من بەخشی؟

هەموو شوێنێك پڕ بووە لە دزێتیو جەردەیی،

دەستدرێژیو ستەم باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشاوە.

لە تۆ زێتر هیچ کەسێکم نییە،تەنێ تۆ پشتیوانمی،

کەوابو، کەسێك کە شیاوی ئەوە بێت،لەم بارە ئاڵۆزە رزگارم بکات پێم بناسێنە.))

یەسنای29بەندی1

-2-

زەردەشت، بەهۆی هێزی بیرو ئەقڵو هۆشی خۆیەوە دەگاتە ئەوەی ئاهورامەزدا (خوای گیانو هۆش) بناسێت:

((ئەی مەزدا، ئەوکاتەی کە بە ئەندێشەوە تۆمناسی،

بۆم رونبووە کە،

تۆ، سەرەتاو پاشێنەی هەموو بوونی،

وە تۆی سەرچاوەی بیری خاس،

وە ئەوکاتەی کە بە دیدی دڵەوە تۆم دی

زانیم کە تۆی ئافەریدەگاری راستەقینەی راستی،

وە تۆی داوەری کرداری هەموو خەڵک.))

یەسنا 31 بەندی 8



زەردەشت باوەری بەوە هەیە کەتەنیا ئاهورامەزدایە کە هەموو گیتی ئافراندووە،تەنیا ئەوە داهێنەری هەموو کەشکەڵان:

((ئەی مەزدائاهورا، پرسیارێکم هەیە، گەرەکمە بزانم:

کێ هێزی دڵفراوانیو میهرەبانی لەنێو خەڵکیدا ئافراند؟

کێ یە بەهۆی ئەقڵو زانیاری خۆیەوە، خۆشەویستی باوکی خستۆتە نێو

دڵ زارۆڵەکانیەوە؟

ئەی خوای ئەقڵو هوێش، بەهۆی بیری خاسو عەقلیو هۆشەوە،

ئەتویَ بە داهێنەری هەموو شتێك دەزانم.))

یەسنا44 بەندی 7

زەردەشت، خوا بە ڕووناکیەکی وەها دەژمێرێت کە، گشت کونو قوژبنی جیهانی بوونی رووناك کردوێتەوە. بەواتایەکی دیکە، ئاهورا مەزدای داهێنەر بەتەنیایی گیتی ئافراندوەو هیچ هاوکارێکی نەبووە.

((ئەو یەکەمین بیرەوەرێکە

کە لەسەرەتاوە،لە رووناهی خۆیەوە،

گشت کەشکەڵینو جیهانی بوونی رووناك کردۆتەوە.

و بەهۆی هۆشو ئەقلی خۆیەوە یاسای ڕاستی بەدی هێنا،

بۆئەوەی هەمیشە پاڵپشتو یاوەری بیر خاسان بێت.

ئەی مەزدا ئاهورا،کە هەمیشە نەگۆرو یەکسانی

بەهۆي رۆحی پیرۆزی خۆتەوە،

هێزی باوەر لە دڵماندا پتروپتەو بکە.))

یەسنای 31 بەندی 7

5- زەردەشت دەبێژێت: خوای ئەقڵو هۆش – ئاهورا مەزدا- هەموو جیهانی بەشێوەو یاسایەکی وەها نەگۆر دروستکردوە هەمیشە (بوون) لەژێر فەرمانی خۆیەتی.

ئاهورامەزدا بەو یاساووردبینو نەگۆرو هەمیشەییەی کە بەسەر گشت (بوون)دا فەرمانرِەوایە،دەبێژێ:

((ئەی مەزدا ئاهورا،

بە بیری خاسو دڵێکی رِۆشنەوە رِووت لێدەکەم،

لەژێر سایەی رِاستی یەوە،

پێمان ببخشە،

پاداشتی ژیانی مادیو مەعنەوی

ئەو پاداشتەی کە ئیماندارەکان بەختەوەر دەکات.))

یەسنا28 بەندی 2

6- لەروانگەی بیری زەردەشتەوە.ئافراندنی ئەم جیهانە-لەسەر بنچینەی یاسای رِاستیوبەوویستی ئاهورامەزدا- بەهۆی دوو هێزی هاوەل دوانەی (هاوزاد) دژبەیەکدی،وەدیهاتوە:

((ئیستا ئیدی،بۆ ئێوە،

ئەی عەوداڵانی زانیاری،قسەدەکەم،

وبۆ ئێوە ئەی مرۆ ژیرەکان

دەربارەی دوو گەوهەری(دیاردە)مەزن،

هەروەها شێوەی ستایشتی

ئاهوراوبیری خاس (وەهومەن)

و زانستی خاسوئاینی ڕاستی (ئاشا)

تالە ڕووناکی ڕاستە قینە تێبگەن،

وبگەنە پلەی پوختەییوبەختەوەری))

یەسنا30 بەندی 1

7- بەگوێرەی جیهانبینی زەرەشت، ئەو دوو گەوهەرە دژبەیەکەی لەبووندا هەیە، تەواوکەرەوەی یەکدین، هیچ کامێکیان بەتەنیایی بایەخی (خاس بوون) یان (خراپ بوون)یان نییە، واتە، خوای داناو ژیر (ئاهورامەزدا) بەشێوەیەکی تەواو سەنگ (چاکە)ی ئافراندووە، بەهیچ جۆرێك (خراپە)ی تێدا نییە. بەلام ئەو دژایەتیو دوبەرەکیو ململانێیەی لەبووندا هەیە، کاتێ کە لەبیری ئادەمیزادا خۆی بنوێنێ، ئەوسا (چاکە)و (خراپە) دێنە کایە. بەواتایەکی دیکە، (خێر)و (شەڕ) یا (چاکە)و (خراپە) لەبیری ئامیزاد خۆیەوە هەڵدەقوڵێت، واتە زایدەی خودی ئادەمیزادەو ئەم دوانە بەهۆی بیری ئادەمیزادەوە، بۆ کردارو گوفتار ڕێی خۆیان خۆشدەکەن. بەم شێوەیە کە، چاکەو خراپە لەنێو کۆمەلگای مرۆڤایەتیدا پەرەدەستێنێت:

((ئێستا،

ئەو دوو گەوهەرە هاوالێ دوانە دژبەیەکە کەهەر لەسەرەتاوە،

لەنێو بیرو خەیاڵی مرۆڤدا دەرکەوتن،و یەکێکیان چاکە دەنوێنێو ئەوی دیکەیان خراپە،

وە لەم دوانە،

مرۆڤی ژیرو دانا، ڕاستیو دروستی هەلێدەبژێرێتو

نەزانو بێهۆش خراپە هەلێدەبژێرێ.))

هات 30 بەندی 3

8- زەردەشت، باوەڕی بەوە هەیە کە، مرۆڤ ئازادە لە هەلبژاردنی ڕێگەی ڕاست یا ناڕاست (چەوت)، واتە بەویستی خۆی دەتوانێ ڕێگەی ڕاست یا چەوت هەلێبژێرێت. ئەم ئازادی هەلێبژاردنە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەرپرسیاربێت لە جۆری هەلێبژاردنەکەی:

((ئەی مەزدا ئاهورا،

بۆم ئاشکرابووو تێگەیشتم کە

ئارمەئیتیو پاکیش لە تۆوەیە

تۆی ئەو ئەقلو هۆشە مەعنەوی یەی جیهانت دروستکرد

تۆ، ئازادی هەلێبژاردنی ڕێگەت بە خەلك داوە

تا ڕابەری ڕاستەقینەی خۆیان هەلێبژێرن،

و لە رابەرە درۆزنەکان دوور بکەونەوە.))

یەسنای 31 بەندی 9

9- زەردەشت، ئادەمیزاد بەلێپرسراوی هەلبژاردەی خۆی دەزانێت (چاکە بێت یا خراپە)، و لەو بوارِەدایە کە ئەنجامی بیر، کرداروتەی هەر کەسێك کە ئاکامەکەی دەبێتە مایەی شادی یا بەد بەختی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسە خۆی:

((ئەو کەسەی ڕاستی هەلێدەبژێریٚو ڕوودەکاتە ڕاست بێژان،

جێگەو مەلێبەندی، کۆشکی ڕووناکی دەبێت.

وە ئەو کەسەی درۆزنو خراپەکارە،

تاماوەیەکی زۆر

دۆش داماو دەبیٚو شیوەنو زاری پیشەی دەبێتو

لە تاریکیدا دەژی.

دووچاری ئاکامێك دەبێت کە

بەهۆی دیدوووێژدانو خراپەکاریەکانی خۆیەوە پێی دەگاتەوە))

یەسنای 31 بەندی 20

10- بە بۆچوونو باوەڕی زەردەشت، بەهەشت بریتیە لە پاداشتی کارو کرداری خاسی ئادەمیزاد، دۆزەخ، سزای کارو کرداری خراپی مرۆڤ خۆیەتی کە لەم جیهانەدا پاداشت وەیا سزای خۆی دەبینێت، پاش مردنیش لەتەک رۆحیانەتیدا، هاوو جووت دەبێت. بەواتایەکی دیکە، بە باوەڕی زەردەشت، خوا بەهەشتو دۆزەخی بۆ ئادەمیزاد نەخولقاندووە، بەڵکو ئەمە ئادەمیزاد خۆیەتی کە لەم جیهانەدا بەدەستی خۆیو بۆ خۆی، بەهەشت یا دۆزەخ دەخولقێنێت، و پاش مردنیش لەتەك خۆیدا (لەتەك رۆحی خۆیدا) بۆ پەسڵانی دەبێت:

((ئەوسا،

کە لەسەرەتای ژیاندا،

ئەو دوو گەوهەرە، لەنێو بیردا گەیشتنە یەکدی،

ژیانو نەبوونیان هاوردە ئارا.

تا کۆتایی (بوون) هەربەم شێوەیە دەبێت کە:

خاسترین بیرو باشترین ژیان بۆ پەیڕەوانی ڕاستی،

خراپترین حالەتی دەروونی بۆ لایەنگرانی درۆ دەبێت.))

یەسنای 30 بەندی 4

11- زەردەشت، دۆزو مەبەست لە ئافراندنی ئادەمیزاد بە خەباتی بێووچان دژی درۆ (گشت خراپییەکان) دەزانێت. یەکەمین هەنگاوی ئەم خەباتە بریتیە لەوەی هەرکەسێك بۆ خۆی

هەوڵبداتواز لە درۆ بهێنێت، وە ڕاستی بکاتە پیشەی خۆی. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هێزو توانای چاکە یا (خێر) پتربێت، وەتوانای خراپە (شەڕ) بەرەو نەوی بڕوات:

((لەم دوو گەوهەرە،

لایەنگری درۆ، خراپترین کردارەکان هەڵدەبژێرێت،

وە ئەوەی پاکترین بیری هەیە،

وە بە تیشکی ڕوناهی هەمیشەیی ڕازاوەتەوە،

وە ئەوەی کە بە باوەڕی پتەوو کرداری دروستەوە،

مەزدا ئاهورا خۆشحالێ دەکات،

ڕاستی هەڵێدەبژێرێت.))

هات 30 بەندی 5

12- زەردەشت،تەنانەت هاریکاری لەتەک درۆزنان وە یا ئاشکرانەکردنیان بە هەڵەیەکی گەورەو لاوازکردنی بەرەی ڕاستیو بەهێزکردنی بەرەی درۆ دەزانێت:

((ئەی ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم:

سزای ئەو کەسەی کە خراپەکارو بەدکار بەهێزو پتەو دەکات

چي یە؟

وەکەسێك کە لە ژیانیدا

جگە لە ئازاردانی ڕابەری دروستکردار

وە دورخستنەوەی خەڵک لێ،کارێکی دیکەی نییە

چ سزایەکی بۆ ڕەچاوکراوە؟))

یەسنا31 بەندی 15

13- زەردەشت،دوا هەنگاوی خەباتو مل ملانێي مروێڤ دژي خراپەو چەوتی بە خەباتی ڕوبەڕوویيو مل ملانێ کردن لەتەك نەیاران دەزانێت:

((کەوایە نابێ هیچ کەسێك لە ئێوە،

گوێ بیستی

فەرمانو گوفتاری خراپەکارانو درۆزنان بێت،

چونکە بێگومان درۆزنان

مالێو گوندو شاروێران دەکەن.

کەوایە،بەرامبەر ئەم جۆرە کەسانە ڕاوێستن،و مل ملانێیان لەتەکابکەن.))

یەسنا 31 بەندی 18

14- زەردەشت، لەوخەباتە هەمیشەییەی مرۆڤدا مژدەی سەرکەوتنی چاکە بەسەر خراپەدا دەدات:

((ئەوکاتەی کە،

درۆو خراپە شکست دەخواو تێدەشکێ،

ئەو کەسانەی بەخۆشناوی تێکۆشاون،

و بەخاسی ناویان دەرکردوە،

لەکۆشکی پڕ لەخۆشی بیری خاسی مەزدایيو ڕاستیدا،

هیواو ئارەزویان،

دێتەدی)).

هات30 بەندی 10

15- زەردەشت، لەو باوەڕەدایە کە مرۆڤ لە خەباتیدا دژی خراپە، وە لەپێناوی بڵاوکردنەوەی ڕاستیدا، پاداشتەکەی بریتیە لە بەختەوەریوئارامی گیان کە بەهۆی کاروکرداری ئەو کەسە دێتەدی:

((خەڵکینە،

هەر کاتێك لەم یاسایەی مەزدا بڕیاری لەسەر داوە، تێبگەنو بزانن کە ڕەنجی درێژخایان سزای درۆزنانوبەدکارانە، وەخۆشیوبەختەوەری هەمیشەیی پاداشتی

پەیرەوانی ڕستیە، ئەوسا، بەهۆی ئەم یاسایەوە دەگەنە بەختەوەریو ڕزگاری ڕاستەقینە)).

هات 30 بەندی 11

16- بەگوێرەی باوەری زەردەشت، دوا پاداشتی پەیرەوانی ڕستی بریتیە لە پاداشتی هەموان پێکەوەو بەکۆمەڵ. ئەم پاداشتە بریتیە لە گەیشتنی گشت مرۆڤ بۆلای ئاهورامەزداو نزیك بونەوەیان لێی لەڕۆژی پەسڵاندا. (ڕۆژی پەسلان ئەوکاتەیە کە بەهۆی خەباتو تێکۆشانی گشت مرۆڤ پێکەوە، درۆواتە هەموو خراپەکان لە ژیانی ئادەمیزادا پاك دەبێتەوەو ڕاستیوخاسیو پاکی تەشەنە دەکاو هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە):

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم:

کەسێك کە بەدانایيوبیری خاسەوە،

تێدەکۆشێت بۆ،

بڵاوکردنەوەی ئاینی ڕاستیوئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگا.

کەیوچۆن دەتوانێت لێت نزیك بێتەوەو بگاتە لات؟))

هات 31 بەندی 16

17- لە ڕوانگەی بیری زەردەشتەوە، ئەهریمەن بریتی نییە لە بونەوەرێکی تایبەتی بەشێوەو ڕوخسارێکی دیاریکراو. ئەهریمەن بریتیە لە (بیری خراپەکاری) –وشەی ئەهریمەن لە زمانی ئاوێستاییدا بەشێوەی ئەنگرەمینو هاتووە، ئەنگرە، مانای ناشیرین، خراپ، پیس یان گومراکردنە. مینو بەمانای (بیر) هاتووە. کەواتە ئەنگرەمینو ماناکەی دەبێتە (بیری خراپوگومرا):

((لەنێوان ئەم دوانەدا،

بیر خراپوگومراکان، ڕاستی هەڵێنابژێرن،

چونکو لەکاتێکدا کە ڕاراو دوو دڵن،

تەفرە دەخۆن،

ودەچنە ڕیزی بیر خراپان،

وپەنا دەبەنەبەر،تورەیی‌و ڕق‌و قینە،

وە ژیانی خەڵک دەشێوێنن.))

هات 30 بەندی 6

18- بە باوەری زەردەشت، هیچ مرۆڤێك خۆی لەخۆیدا بەخراپی نایەتە دنیا، خراپە لە بیری کرچوکاڵی ئادەمیزاد خۆیەوە وەدیدێت، بەواتایەکی تر، خراپە، هەڵێقەڵاوی سەرچاوەی نەزانین‌و تێنەگەیشتنی مرۆڤە لەو یاسایەی کە بەسەر بووندا فەرمانرەوایە، واتە یاسای ڕاستی:

((لەنێوان مرۆڤی پاك‌وناپاکدا،

کامیان ڕێبازی دروستیان هەڵبژاردووە؟

مرۆڤی داناو ڕوناکبین دەبێ

خەڵک هۆشیار بکاتەوەو ڕێگەی ڕاستیان بۆ ڕۆشەن بکا،

بۆئەوەی ئەو بێ فەرە لادەرانە نەتوانن

خەڵک تەفرە بدەن‌وگومرایان بکەن،

ئەی مەزدا ئاهورا،

تۆ بۆ ئێمە

مامۆستاو ڕێنمای بیری خاس بە.))

هات 31 بەندی 17

19- زەردەشت، بەختەوەری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەبەستێتەوە بە زانیاری‌و هۆشیاری یەکەیەکەی ئەندامانی ئەو گۆمەلێگایە، بۆیەکا، هانی داناو زانایان دەدات، کە ئەو کەسانەی زانیاریان کەمە فێریان بکەن:

((خاسترین جۆری پاداشتەکان‌و بالاترین پلەی بەختەوەری،

بۆ ئەو دانایە دەبێت،

کە پەیامە ڕاستەقینەو ئامۆژگاریە پاکەکانم،

کە خەڵک بەرەو پوختەیی‌و نەمرێتی دەبێت،

بەهەموان ڕادەگەیەنێت.

مەزدا ئاهورا،

بەهۆی بیری خاسەوە

هێزو توانای ئەو کەسانە پتر دەکات.))

هات 31 بەندی 6

20- بەبۆچونی زەردەشت، لەبەر ئەوەي خراپە، هەڵێقوڵاوی بیری کرچوکاڵی ئادەمیزاد خۆیەتی، کەوابو، گشت لادراوان لە ڕێی ڕاستو خراپەکاران، دەکرێ پەروەردەو فێری ڕاستی بکرێن.

((وە ئەوکاتەی کە،

گومراکان سزای خۆیان دەبینن،

ئەوسا، ئەی ئاهورامەزدا،

شالیاریت، بەهۆی بیری خاسەوە (وەهومەن)،

بۆیان ئاشکرا دەبێت،

وە تێدەگەن کە،

چلۆنوێز لە ڕێی چەوت بێننو ڕێبازی ڕاستی بگرنە بەر.))

هات 30 بەندی 8

21- زەردەشت، بیرو هۆشی ئادەمیزاد، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بەبێشترین پێوانە دادەنێت بۆ هەڵیسەنگاندنو هەڵبژاردن. تەنیا دانایانو مرۆڤانی ژیرن کەبەهۆی بیری پوختەو هۆشی خۆیان، یاسای ڕاستی بەدروستی تێدەگەن، وبە هاوئاهەنگکردنی بیروکرداروووتە لەتەك (ڕاستیدا)، وتێگەیاندنو هۆشیارکردنی خەڵک، کۆمەڵکای مرۆڤایەتی دەگەیەننە بەختەوەری ڕاستەقینە.

((ئەی مەزدا،

ئەو بەختەوەرییەی کەلەژێر سایەی رووناکی مەعنەوی،

وە بەهۆی پەیرەوی لە ڕاستیو پاکی یەوە،

مژدەیت بە هەردوو دەستە داوە (داناو نادان)،

وە ئەو بڕیارەی کە بۆ مرۆی ژیرو دانا، داوە

بەهۆی ئامۆژگارییەکانتەوە،

بۆ ئاگاداریمان، بۆمان ئاشکرابکە،

بۆئەوەی هەموو خەڵک بەرەو ئاینی ڕاستی داوەتبکەین.))

هات 31 بەندی 3

22- بە باوەڕی زەردەشت، بیرو هۆشی مرۆڤ، بایەخوپلەو پایەیەکی فرە بەرزو تایبەتی هەیە. لەبەر ئەوە، پێویستە هەموو کەسێك ئازاد بێت تا پاش ئەوەی هەمە جۆرە ڕێگەیەکی هەڵیسەنگاند، بەبیرێکی ڕۆشەنو هۆشێکی دروستەوە، ڕێگەی خۆی بە ئازادی هەڵبژێرێت:

((کەواتە،

گوێڕایەڵی خاسترینوتەکان بن،

وە بەبیرێکی ڕۆشنەوە هەڵیسەنگێنن،

وە هەریەکە لەئێوە بۆخۆی،

لەم دوو ڕێبازە، یەکێکیان هەڵبژێرن،

پێش ئەوەی ڕوداوی مەزن ڕووبدات (ڕۆژی پەسڵان)،

هەر یەکەتان بەدروستی ئاگاداربن،

لەم ئاینە تێبگەنو بڵاوی بکەنەوە.))

هات 30 بەندی 2

23- زەردەشت، ئازادی دەربڕینی باوەڕ، بەمافی ڕەواو سروشتی هەموو مرۆڤێك دەزانێت. هەر کەسێك دەبێ بتوانێ بەشێوەیەکی ئازاد باوەڕی خۆی دەربڕێ تا بتوانێ ڕاستیو دروستی هەڵیسەنگێنێو هەڵبژێرێت:

((بەم شێوەیە، هەر کەسێك،

چ ڕاست بێژ بێت یان درۆزن،

چ زانا بێت یان نەزان،

ئەوەی لە بیرو مێشکیدایە

بەشێوەیەکی ئازادانە ئاشکرای دەکاو دەیبێژێ،

و هەر کاتێك کە

ئەندێشە گیرۆدەی دوودڵیو ڕارایی بوو،

وە لەنێوان ئەم دوو باوەڕەدا حەپەساو قەتیس ما،

ئەوسا، ئارمەئێتی (بیری چاکوپوختە) بەدەم هاواریانەوە دێتو

ڕێنماییان دەکات.))

هات 31 بەندی 12

24- زەردەشت، لەوباوەڕەدایە کە مرۆڤ دەبێت ئەوەندە ئازاد بێت لە هەڵبژاردنی ڕێبازی ژیانی خۆی، تەنانەت ئاینی خۆشی بەشێوەیەکی ئازادانە هەڵبژێرێت، واتە هیچ زۆرە ملێ یەك لەهەڵبژاردنی ئایندا نەبێت:

((ئەی مەزدا،

هەر لەوساتەوەو لەسەرەتاوە کە،

بە بیرو هۆشی خۆتەوە،

ژیانوویژدانوهۆشت بۆ دروستکردین،

وە ڕۆحت کردە نێو لەشمان،

و ەتوانایی گفتوگۆو کارکردنت پێ بەخشین،

هەر لەوکاتەوەویستت کە ئێمە بە شێوەیەکی ئازاد،

باوەڕو ڕێو ڕەوشی ئاینی خۆمان هەڵبژێرین.))

هات 31 بەندی 11

25- زەردەشت، بۆ ڕێنمایی کردنی درۆزنانو لەڕێی لادەرانو خستنیانە سەر ڕێی ڕاست، سوود، لەهێزی ڕەوانبێژیو دەم پاراوی وەردەگرێت. تەنێ چەکی دەستی پەیامبەر بۆ بەرهەڵێستیو دژایەتی کردنی درۆو ناراستی، قسە ڕەوانەکانیوشێوەی دەربڕینیانە:

((ئەی دیاردەی راستیوپاکی (ئاشا)،

کەی بەدیدارت شاد دەبم؟

ئەی دیاردەی بیری خاس (وەهومەن)

کەی بەهۆی داناییوهۆشەوە دەتوانم بتناسم؟

وە ئەی ئاهورای توانا، کەی ڕێگەی گەیشتنە لای تۆ دەدۆزمەوە؟

وەکەی زایەڵەی دەرونی مەزدایی دەبیستم؟

هیوادارم کە

بە یاریدەیوتەی پیرۆز (سروودی پیرۆز) وە هێزی دەم پاراوی،

ڕێنمایی گومراکان بکەم

وە بیانخەمە سەر خاسترین ڕێگە کە

ڕێی راستیو یەکتاپەرستی یە))

هات 28 بەندی 5

26- زەردەشت، دژی جەنگو هەراو هوریاو خوێن ڕێژییەو ڵیان وەڕسەو بێزارە. لەوباوەڕەدایە کە پەیامبەرانو چاکسازانی ڕاستی، دەتوانن بەهۆی میهرەبانیو دلۆڤانیەوە، برایەتیو دۆستایەتیو یەکیەتی لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا وەدیبێنن:

((ڕاستی-ئاشا- وەڵامی ئاهورامەزدای دایەوە:

لەنێو ئەم خەڵکەی جیهاندا کەسی‌وا ناناسم

کە بتوانێت ئەم ئازارە لە کۆڵیان بکاتەوە،

و یاریدەی پیاوچاکان بدات دژی خراپەکاران.

لەنێو ئەم خەڵکەدا،

ئەو کەسە، دەبێ لە هەموان، بەهێزترو تواناتر بێت،

تا هەر کاتێك داوای یارمەتی کرد

فریای بکەون‌و یاریدەی بدەن.))

هات 28 بەندی 3

27- زەردەشت، دژی کۆنەپەرستییە، مرۆڤێکی پێشکەوتوخوازە، باوەری بەوەیە کەبیروهۆشی مرۆڤ، لەشو گیانی ئادەمیزاد، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، ژینگە، وە بەواتایەکی دیکە شارستانیەت، فەرهەنگ‌وئاکاری مرۆڤ، دەبێ هەمیشە بەرەو پێشەوەو خاسترو بەرزتر بگۆڕدرێت:

((ئەی مەزدائاهورا،

هیوادارم کە،

خزمەتگوزاری تۆ بین،

وە لەو کەسانە بین کەهەموو جیهان وە ژیان نۆژەن دەکەنەوە.

با:

کاتێك بیرو هۆش گیرۆدەی سستی‌و خۆڕانەگرتن دەبێ،

ڕاستی (ئاشا) یارمەتیمان بدات،

وە بیرمان لە یەکدی نزیك بکاتەوە.))

هات 30 بەندی 9

28- زەردەشت، باوەری بە پەرجۆ (معجزە) نییە، گەورەترین پەرجۆی خۆی لەپاراوی‌وتەکانی کە دەچێتە نێو ناخی دەرونی خەڵکەوەو بیروباوەڕیان دەبزوێنێ، دەزانێت، کە بەهۆی بیری خاسەوە توانیویەتی بگاتە ئەو ڕادەیە:

((ئەی مەزدائاهورا،

وە ئەی راِستی (ئاشا) و ئەی بیری خاس (وەهومەن):

ئەز، سروودی وەهاتان بۆ دەهۆنمەوە

کە تائێستا کەس نەیبێژاوە.

هیوادارم توانایی مەعنەوی‌وپاکی (خشە ترا)

لەدەرونمدا پتر بێت، وبەسەر زاتما زالێ بم.

تکاو ئارەزومان بەدیبهێنن،

وە بەختەوەری‌و شادیمان پێببەخشن.))

هات 28 بەندی 3

29- زەردەشت، ژینگەو پارێزگاری‌و چاودێری کردنی، بەیەکێك لە ئاکامەکانی بیری خاس دەژمێردرێت. بە پێچەوانەوە، چاودێری نەکردنی بە (ناراستی) و گومرایی‌و کارێکی خراپ هەژمار دەکات:

((بەڕاستی ڕابەرە بەدو بیر خراپەکان،

کە گووتارە ئاینییەکان چەواشەو ئاڵۆزدەکەن،

وە بەچاوی ڕێزەوە ڕوانینە زەوی‌و خۆر

بەکارێکی فرە نارەواو گوناه دەزانن.

بیر خاسان بەرەو گومرایی دەبەن،

وە زەویوزاروكێلێگەكانوێران دەكەن،

وە دژی بیرخاسان چەك بەكار دێنن.))

هات 32 بەندی 10

30- زەردەشت، قوربانی كردنی ئاژەڵ، بەكارێكی ناپەسەندو ئەفسانەیی دەزانێت. بەنیشانەی نەزانینو دواكەوتوییو گومرایی دەژمێرێ:

((زۆر لە مێژە،

(گرەهما[16]) بەهاوكاري لەتەك (كاوی[17])ەكاندا،

هێزوتواناو بیری خۆیان،

وەگەرخستووە،

بۆئەوەی پەیامبەرەكەت وەرِس بكەنو بیخەنە داوەوە.

ئەوانە،

هێزو توانای خۆیان لە درۆزنانو گومرایان،

وەدەست دێننو دەبێژن،

دەبێ هەموو جیهان تێكبدەنو گیرۆدەی خراپەی بكەن،

تا (هوم[18]) ی نەمر بگا بەدەم هاواریانەوە.))

هات 32 بەندی 14

31- ڕوانگەو دیدی زەردەشت، کۆمەڵگای مرۆڤایەتیە. ئەو هەمیشەو لەهەموو کاتو شوێنێکدا ئارەزوی ئەوەیە کە گشت خەڵک بەختیاروخۆشبەخت بن. هەرلەبەر ئەوەیە داوا لە هەمووان دەکات کە بەهەموو توانایەکیانەوە، هەوڵبدەن یەکدی بەختەوەر بکەن:

((مەزدائاهورای فرە توانا

بڕیاری داوە کە،

کەسێك بەختیارە

کە خەلکی دیکە بەختەوەر بکات.

ئەی ئافەریدەگار،

ئەز بۆ جێگیر کردنو پەرەسەندنی ئاینی ڕاستی،

داوای هێزو توانای لەشوگیان دەکەم.

ئەی ئارمەئێتی، ئەی دیاردەی خۆشەویستیوباوەڕ،

ئەو تیشکە یەزدانییەی کە،

پاداشتی ژیانی پڕلەبیرخاسی یە،

پێم ببەخشە.))

هات 43 بەندی 1

32- لە ڕوانگەی بیری زەردەشتەوە، ئاهورامەزدا، هەموو مرۆڤێك – بەتایبەتی ئەگەر پەیرەوی ڕێی ڕاست بێت- بەچاوی دۆست تەماشا دەکات:

((مەزدا ئاهورا،

بەهۆی عەقلیو هۆشی تەواو سەنگی خۆیەوە،

پوختەییونەمرێتی،

ڕاستیو توانایی مەعنەویو بیری خاس

بەکەسێك خەڵات دەکاو دەبەخشێت

کە لەڕوی بیروکردارەوە، دڵی پێببەستن))

هات 31 بەندی 21

33- زەردەشت، باوەڕی بەوە هەیە کە، بۆ گەیشتنە دروشمی (ڕاستی)، مرۆڤ دەبێ لەخۆبوردو بێتوگیانی خۆی لەو ڕێیەدا بەخت بکات:

((ئێستا ئیدی زەردەشت،

هەموو لەشوگیان،

وە هەڵبژاردەیەك لەبیری خاسی خۆی،

پێشکەش بە مەزدا دەکات،

وە خاسترین کرداووتەوفەرمانبەری لەدەستورەکانی ئاهورایی،

وە هەموو هێزو توانای مەعنەوی خۆی،

پێشکەش بە ڕاستی (ئاشا) دەکات.))

هات 33 بەندی 14

34- زەردەشت، مافی یەکسان بۆ هەموو کەس –بە ژنو پاوەوە- ڕەوا دەبینێ. یەکەمین کەس بوو کەمافی ئازادی هەڵبژاردنی هاوسەری بۆ کچان دا. بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر، تەنیا دوو مەرجی بنەڕەتی دانا: (ئەوینی پاك) وە (زانیاری تەواوو باش). لێرەدا ڕوودەکاتە کچەکەی خۆی (پوروچیستا) وە پێی دەبێژێ:

((ئەی پوروچیستای ئەسپەنتمان هیچدسپ

ئەی جوانکەترین کیژۆڵەکانی زەردەشت،

مەزدا ئاهورا،

مرۆیەکی بۆ هاوسەرێتی تۆ هەڵبژاردووە کە،

پابەندی بیری خاس،

وە پاکیو ڕاستي یە،

کەواتە، لەتەك بیری خۆتدا ڕاوێژ بکە،

وە بەپاکیو بەزانیارییەکی خاسەوە ڕەفتار بکە.))

هات 53 بەندی 3

35- زەردەشت، بەختەوەری خێزانو ژیانی ژنو مێردایەتی لەوەدا دەبینێت کە هەریەکەیان هەوڵو کۆشش بدات بۆ پەیرەوی لە ڕاستیو بیرووتەو کرداری خاس:

((ئەم گوفتارانە ئاڕاستەی ئێوە دەکەم،

ئەی تازە بووكوزاوایان،

بەبیرێکی خاس، گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانم ڕابگرن،

وە بەهۆیویژدانی خۆتان هەڵیسەنگێننو بەکاری بێنن:

هەمیشە بەبیری خاسوخۆشەویستیەوە بژین.

وە هەریەکەتان لە ڕاستیدا پێشبرکێی لە یەکتری بکەن،

تا ژیانێكوخێزانێکی خاس پێکەوە بنێن))

هات 53 بەندی 5

36- زەردەشت، بۆ بەرزێتی خوورەوشتو پوختە بونی هۆشی مرۆڤ،کە ئاکامەکەی پتەوتر بونی هێزی (ڕاستی) و لاوازبونی هێزی (درۆ) یە لەجیهاندا،پتەوبونی لەشوخۆشیوشادی ژیانیش بە پێویست دەزانێت.

زەردەشت، باسی مردن ناکات، هەمیشە بیر لەژیان دەکاتەوە:

((ئەی مەزدا،

ئاسایشو خۆشییەکانی ژیان کە ئێستا بووەو هەیەو دەمێنێ

وەگشتیان لەتۆوەیە،

بە میهرەبانی خۆت، ئەمانەمان پێ ببەخشە،

وە لەژێر سایەی بیری خاسوهێزی مەعنەویوڕاستی،

تەندروستیو بەختەوەریمان پتر بکە))

هات 33 بەندی 10

37- زەردەشت، کارو کۆشش لەژیاندا بەیەکێك لەهەرە گرنگترینو کاریگەرترین هۆکانی ئاوەدانیو پێشکەوتنو شادومانیو بەختەوەری مرۆڤو کۆمەڵگا دەژمێرێ. ئەو، کارو کوشش، هاوئاهەنگ لەتەك (یاسای ڕاستی) وە هەڵێقوڵاو لە (دانایی) و (بیری خاس) دەزانێت:

((بەبیری خاسەوە،

مەزدا ئاهورا، خۆش وەش دەکەین،

ئەو کە بەویستی خۆی،

شادیو کاری بۆ ئافراندوین.

هیوادارین، مەزدا ئاهورا،

بەتوانایی خۆیەوە

هێزی کارکردنمان پێ ببەخشێت،

تابتوانین، بەهۆی بیری خاسو ڕاستیو زانستی ڕاستەقینەوە،

تێبکۆشین بۆ پێشخستنی خەڵکو کۆمەڵگا.))

هات 45 بەندی 9

38- زەردەشت، ڕاستیو دروستی کردار، بەتەنیا هۆیەك بۆ بلێندیو پلەبەرزێتی مرۆڤ دەزانێت، گەندەلیو درۆزنان ئەگەرچی خاوەنی تواناو دراویش بن، بەبێ بایەخو هیچوپوچ دەزانێت.

ئەوانەی پەیڕەوی ڕاستین، ئەگەر بێ دەسەڵاتو هەژاریش بن، بەشیاوی ڕێزگرتن دەزانێت:

((ئەی مەزدا،

درۆزنوخراپەکارانێك کە

ڕوو لەبیری خاس وەردەگێرن،

تووشی ڕەنجو ئازارو ئەشکەنجە دەبن.

خاسانوڕاستکردەوەکان، کە ئەم کارە ناکەن، گیرۆدە نابن.

ڕاستکردەوە، هەرچەندە هەژاریش بێتو هێزوتواناشی کەم بێت،

لای ڕاست کردەوەکان، بەڕێزە.

درۆزنو خراپەکار، ئەگەر تواناو بەدەسەڵاتیش بێت،

بێ بایەخو بێ نرخە))

هات 47 بەندی 4

39- زەردەشت، لەو باوەڕەدایە کەچارەنوسی هەرکەسێك بەدەست خۆیەتی:

((ئەی مەزدا،

بەم سرووده ستایشگەرانە،

وەلەڕێی ڕاستی

وە بەهۆی ئەو کارانەی کەلەبیری خاسەوە هەلێقەڵاوە،

بەرەو لای خۆت دەگەڕێمەوە

لەتەك ئەوەی کەدەزانم

ویستی خۆم بەسەر چارەنوسمدا زاڵەو فەرمانی پێدەدات

تا ئەوکاتەی بەلوتکەی ئامانجەکانم دەگەم

هەروا داواکاری زانستی خاسم لێت))

هات 50 بەندی 9

40- زەردەشت، خەڵک ئاگاداردەکاتەوە، دوربکەونەوە لەوکەسانەی پڕوپاگەندەی خراپ بڵاودەکەنەوەو خەڵکی گومڕا دەکەن. لەوباوەڕەدایە کە ئەو جۆرە کەسانە، بەهۆی ئەو قسانەی دەیکەن. بیری خەڵکو دروشمی ژیانیان، ئالێۆزو چەواشە دەکەن:

((پێشەوا بیر خراپەکان،

ئامۆژگارییە ئاینییەکان ئاوەژووو ئالێۆز دەکەنو

بەئامۆژگارییە هەڵەکانیانەوە،

ڕێی ڕاستومەبەستی سەرەکیو ڕاستەقینەی ژیان

لە خەڵک چەواشە دەکەن.

بەم شێوەیە،

والەخەڵک دەکەن کەدووره پەرێزبن

لەخاسترین سەرمایەی ژیان کەبریتیە لە

ڕاستیو دروستیوپاکی.

ئەی مەزداو ئەی ڕاستی (ئاشا)،

لەکانگەی دڵمەوە سکاڵای خۆمتان بۆ دەردەبڕم،

وە پەناتان بۆ دەبەم.))

هات 32 بەندي 9

---

لەنێو ئایینە کۆنەکاندا، وێنای ئەم ئاینو باوەڕە پاکە، کەمتر وەدیدەکەوێت. ئایینێك کە بە هیچ کلۆجێك باوەڕی بەئەفسانە، سیحروجادو، قوربانی کردنی ئاژەڵ، پەرستنی خوای جۆراو جۆر نەبووە.

زەردەشت ئەمکارانە هەمووی بەکاری خراپو بەد دەزانێت. زەردەشت هەڵسایە سەرپێو ڕاپەڕی بۆئەوەی ئەفسانەکانی نێو کۆمەڵ لەتەوێڵی مرۆڤایەتی پاك بکاتەوەو کۆتو زنجیری دیلێتی بپچڕێو لەمل خەڵکی بکاتەوە. لەنێو چارەسەرکردنی بارودۆخە کۆمەلایەتیەکانیدا، ڕۆحی جوامێریو بەرەنگاری لەڕووی ستەم دەردەکەوێ. هەروەها ڕێزگرتن لە یەکێتی خێزان، کارو کۆشش، بایەخدان بە ژیانی مادی، ئازادی دەر بڕینی بیرو باوەڕی مرۆڤ، یەکتا پەرستیو.. ئەمانە هەمووی بەشێوەیەکی فرە گەشبینیانە بەخەڵک ڕادەگەیەنێت. دەربارەی الاهیات زۆر نەدەچوە بنجوبناوانو قوڵایی باسەکەوە، بەشێوەیەکی تەواو سەنگ، باسی لێنە دەکرد . بەڵام زۆر بەڕاشکاوی بانگەوازی بۆ خەڵک دەردەکرد کە تەنها خوای تاکوتەنها (ئاهورامەزدا) بپەرستن.. هەوڵی داوە کێشەی کشتوکێلیو مولێکایەتی زەوی، ستەمی پیاوە ئاینیەکانی ئەو سەردەمەو ستەم کاران بۆ خەڵک باس بکاتو چارەسەری کێشەکانیان بکات. داوێن پاکیو خوا پەرستی لە چوار چێوەی ڕۆژو گرتنو دەروێشیو کونجی قەناعەت کردن، نەدەدی.

سوالێکردن، بێکاریو تەمەڵیو گۆشەگیری، لای زەردەشت کارێکی ناپەسەندە. لە فەلسەفەی زەردەشدا، (ویستی مرۆڤ) خۆیەتی کە دەیگەیەنێتە بەرزیو بلێندی، زۆرەکی (جبر) لە ئارادا نیە، زەردەشت مرۆڤ دۆست بوو، ئەو خوایەی زەردەشت باسی دەکات، لەتەک بیرو زانستی ئیمرۆی ئەم چەرخەشدا دەگونجێ.

زەردەشت، بەهۆی سروودە دڵرفێنەکانیەوە، داوا لەئاهورامەزدا دەکات کەرێگەی ڕاستو دروست پیشان خەلك بدات. ئیدی نە داوای خۆشی بەهەشت دەکاو نەداوا دەکا کەلە ئاگری

دۆزەخ بیانپارێزێ، بەڵکو تەنیا دەخوازێ ڕێگەی ڕاستوچاکەیان بۆ ڕووناك بکات. ئاینی خۆی لەسەر بنچینەی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵایەتیو ئاکاری خەڵک دادەمەزرێنێت.

ئەم بیرو باوەرو هەڵسوکەوتە تەنیا کەسێك دەتوانێ پێی هەڵسێتوبەئەنجامی بگەیەنێت کەخاوەنی بیرو هۆشێکی یەکجار بەرزو مەزن بێتوژیرو دانا بێت. پاشووردبونەوەو لێکۆڵینەوەی ئەو چلووتانەی زەردەشت کە کەسێیەتیو ڕوخساری بەئاشکرا بۆ هەموان ڕۆشەن بوو، لێرەدا بەپێویست دەزانرێت کە ئەم پەیامبەرە نەمرە، پتر خۆی بناسێنێ.

دەفەرموێت:

پاش چاوپێکەوتنێکی لەتەك فریشتە (وەهومەن) کە بریتییە لە (سیفەتی بیری چاکی مەزدا)،لێی دەپرسێ ئەی زەردەشت تۆ کێیتو ئەگەرە کو لێت بپرسن لە چ بنەماڵەیەکیو پلەو پایەت چییە،وەڵامت چ دەبێت؟

زەردەشت دەبێژێ، پێم گووت:پێش هەموو شتێك، ئەز زەردەشتم،تا ئەو شوێنەی توانام هەبێتو پێم بکرێت،دوژمنی سەرسەختی درۆو درۆزنانمو پالێپشتو هاوکارێکی بە توانا بۆ هاوەڵانی ڕاستیم-ئەوسا پێی دەبێژێ چیت گەرەکەو ئاواتت چی یە بێژە-

وەڵام دەداتەوە، پاش ئەوەی دەربارەی ئاینی یەکتا پەرەستی ئاگادار کرام، و پەیامم پێڕاگەیەندرا، هەرچەندە لەسەرەتاوە،بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەو چارەسەرکردنی کێشەکان،دوچاری مەینەتی بووم،کارەکە فرە دژوار بوو.بەڵام ڕێگەم نەدا ترس بەسەرمدا زالێ بێتوورەم بەر نەدا.هەنوکەش داوات لێدەکەم وەك هاوڕێو هاوبیرێك یارمەتیم بدەیتو ئەوەندە توانام پێ ببەخشیت کە بتوانم لە ئیشو کارو کۆششەکانم سەرکەوتووبم،و گۆڕینێکی تەواوەتیو بنچینەیی لە ساختاری یاسایی کۆمەڵایەتی ئەنجام بدەم.خراپەکارانو ئەوانەی ژیانی ماددی بەرەو خراپە ڕادەمالێن وە ئەفسانە پەرستەکان وە چەتەو ڕێگرەکان وە ستەمکاران لە کۆمەڵگادا بخەمە سەر ڕێی ڕاست.

ئەمەیە کەسێیەتی زەردەشت،ئەو کەڵە پیاوەی مێژوو، کە تەنیا ئارەزووی لە ژیان دا ئەوە بوو کە ڕێگەی ڕاستو دروست نیشانی خەڵک بدات.کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی پاکو دوور لە خراپە وە دی بهێنێت.

کاتێك کە ئیدی تەمەنی درێژ دەبێت، زەردەشت هەست بەوە دەکات کە ژیانی لەسەر ڕووی زەوی بەرەو کۆتایی دەڕوات... ئەوسا، بۆ جارێکی دیکە، سیماو ڕووخساری ڕاستی خۆی بەووردی پیشان دەدات، لە کانگای دڵییەوەو بە هەموو بیرو باوەڕی پاکییەوە، بە باوەڕێکی پاکو بێخەوش کە بە ئاهورە مەزدای هەیە، پاش ئەو هەموو کۆششەی کردوویەتی، پاش دیتنی

بەرزیو نەوییەکانی ژیان، ئیدی گەرەکێتی پشوو بدات بۆ هەمیشە، بۆیە ڕوودەکاتە ئەوینی ڕاستەقینەی خۆی، وەك هەمیشە پەنای بۆ دەبێت، دەبێژێ:

((ئایا پاش مردنم، ڕەوانم دەتوانێت هیوای بە کەسێك بێت پەنای بۆ بەرێت،دڵنیام ئەو کەسە جگە لە (ڕاستی) و (بیری چاک) و (تۆ) ئەي مەزدا،کە لەم جیهانەشدا وەڵامیوویستو خواستەکانم دەدەیتەوەو یارمەتی خۆمو لایەنگرانم دەدەیت، هیچ کەسێکی دیکە نییە.))

ئەگەر باش بیرو باوەری زەردەشت لێکبدەینەوە وە بچینە ناخی فەلسەفەی ئەم پیاوە مەزنەی مێژوو، دەبینین جگە لەوەی کە مامۆستایەکی ئێجگار گەورەی ئاکاری مرۆڤایەتی بووە، ویستو خواستی ئەو ئەوە بووە کە کۆمەڵگایەکی ئایدیایی پڕ لە ڕاستیو دروستیو ئاکاری بەرزو جوان دابمەزرێنێت. ئەرکی سەرشانی خۆی بەوە زانیوە کە دەبێ دژی ئەو سیستمە دواکەوتووە ڕاپەڕێت، وەك شۆرێشگێرکی نەترسو ئازا چاکی مەردایەتی لێ بکا بەلاداو یاسایەکی نوێ لەسەر بنچینەی بیروکردارو گوتەی خاسو ڕاستیودروستی لەم جیهانەدا دابمەزرێنێت. ئەم ڕاپەڕینەی زەردەشت بۆ ئەوە نەبووە کە تەنها سیستەمێکی کۆنەپەرستی وەك ئەو سەردەمە بگۆڕێت بە سیستەمێکی دیکە کە تەنێ دەموچاووەکان بگۆڕێن، بەڵکو دەیخواست کە بیرو کردارو گوتەی خاس فەرمانڕەوا بێت بەسەر کۆمەڵگادا.

ڕاستیو دروستی دروشمی ڕاستەقینەو خۆشەویستیو بەختەوەری هەموو خەڵکو دادی کۆمەلایەتی، ئاواتو ئامانج بێت. شکاندنی بتێكو داتاشینو دروستکردنی بتێکی دیکە نەبووە، بەڵکو ئامانجی لە ناوبردنی کردەی بت پەرستی بووە. بەکورتی دەتوانین بلێیین کە بزوتنەوەی زەردەشت شۆڕشێکی کوێرکوێرانە نەبووە، کوشتارو ئەشکەنجەو کۆکوژیو جەردەییودزیوخۆپەرستی نەبووە، شۆڕشێکی زانستیانەو ژیرانە بووە بۆ دروستکردنو دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی پڕ لەدادو خۆشەویستیو ئازادی..

کۆمەڵگای ئایدیایی لە ڕوانگەی گاتاکاندا بریتیە لەوەی کە گشت ئەندامانی ئەو گۆمەلێگایە پەیرەوی لە ڕاستی بکەنو دورە پەرێزو دژی درۆ بن. بۆ دابین کردنی یاسای ڕەوا، بەپاکیوخۆشەویستیویەك دڵیودلۆڤانی خزمەتی کۆمەڵگا بکەن، تێیکۆشن بۆ پێشخستنو بێ خەوشێتی خێزانوشاروولات. دەمارگیریەتیو رقوکینەونەفرەت لە خراپیەکانی درۆیە. هەر کۆمەڵگایەك خەڵکەکەی هاوڕێ بن لەتەك راستی(ئاشا)وەهاوبیر بن لەتەك بیری خاس (وەهومن) وبێ فیزو پاکیژەیی بکەنە پیشەی خۆیان، بێگومان ئەو کۆمەڵگایە لە دەمارگیریەتیو قینو نەفرەتو گەندەڵی وەدوور دەبێ. ئەم جوێرە کۆمەڵگایە ئایدیاییە، بەلام دەشێ ئەم بزوتنەوەیە دەست پێ بکرێت.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە ڕاو بۆچونی برێ لە زاناو مێژوو نووسەکانو ئەوانەی زۆر بەوردی گاتاکانیان خوێندوێتەوەو توێژینەوەی قوڵیان هەبووە دەربارەی کەسێیەتی زەردەشتو

بیرو باوەڕو پەیامەکەی نوسیویانە بەتایبەتی زیاتر کاتو دەوروبەری ئەو سەردەمەیان ڕەچاو کردووە بخەمە پێش چاو:

ئەدوارد مایەر دەبێژێ:

((تەنێ ئەو کەسێیەتیە راستەقینانەی کە لە ناوچەی خۆرهەڵاتی کۆن خۆیان ناساندووە بریتین لە پەیامبەرەکانو ئەوانەی پایەی ئاییانیان دامەزراندووە. زەردەشتو پەیامبەرانی ئیسرائیلیو هەروەها (چاکسازی) میسرِیو ئیخناتونیش لەو کەسانەن)).

زولتسر:

((زەردەشت پەیوەندی خۆی لەتەك خوای خۆیدا زیاتر لەسەر بنچینەی دۆستایەتیو هاوڕێیەتی دامەزراندووە. داوای یارمەتیو هاریکاری لە خوا دەکا هەروەك چۆن هاوڕێیەك داوای یارمەتی لە هاوڕێکەی خۆی دەکات بەڵام بەشێوەیەکی (بێفیزی) وڕێز بەشێوەیەك ئیتاعەتی دەکات کەخۆی بە ئافەریدەی ئەو دەزانێت)).

جاکسون:

((چلۆن ڕێز لە پلەوپایەی ئەو کەسانە دەگیرێ کە عەودالًی ڕووناکیو نوور بوون وەك بودا، کنفسیوسو سقرات، دەبێت هەر بەو شێوەیەش ڕەفتار لەگەڵێ زەردەشتدا بکرێت، تەنانەت دەتوانم بێژم بڕێ لەو بیرو بۆچونە مەزنانەی ئایینی مەسیحی لەوتەکانی زەردەشتدا دەبینرێ. زەردەشت کەسێیەتییەکی مێژوییەو یەکێکە لە هەرە مەزنترین مامۆستایانی ناوچەی خۆرهەڵات بە گشتی)).

داوسون:

((لە ئاینی زەردەشت، فرە بۆچونوشێوەو ڕێنمایی ئایینی دەبینرێت کە کاری کردوێتە سەر ئاینی مەسیحیەتو یەهودیەتوجێ پەنجەکانی تیایاندا بەدی دەکرێن. ئەم ئاسەوارانە چەندین سەدە پێش پەیدابوونی مەسیحیەتو یەهودیەت، زەردەشت جارِی بۆداوە لەڕاستیدا ئەمانە ئاسەواری پیرۆزوکۆنن، کە لەمانە بۆ ئایینوئاینزاکانی یۆنان، ڕۆم، ئەڵێمان..... بەکورتی بێژین بۆ گشت ناوچەکانی ئەوروپا، ئەمریکا، ئوستورالیاو شوێنانی دیکە، ڕۆیشتووەو سودیان لێ وەرگرتووە)).

(پروێفیسوێر س.ج.شاو)ی ئینگلیزی:

((زەردەشت فرە باوەڕی بە ئۆمانیزم (مەکتەبی رەسەنێتی ئادەمیزاد) هەبووەو کاڵا بەباڵای پەیامبەرێکی ڕاستەقینە بووە. لەپەیامەکەیدا مەزنێتی ئەم پیاوە زۆر بەئاشکرا دەردەکەوێ

هەرگیز خوا لەخۆی بەدوور نابینێت. ئەم پەیامبەرە ئێرانیە بەشێوەیەکی وەها باسی ڕاستیو دروستی دەکا دەڵێی لەتەك ئاهورامەزدا بەرامبەر بەیەکتر دانیشتوون)).

زهنر:

((زەردەشت پەیامبەرێك بوو کە لەلای خوای گەورەو داناوە نێردرابوو ڕاستیو دروستی ئامانجی بوو، دۆستی خوا بووە، پەیوەندی نێوان خۆیوخوای خۆی پەیوەندی نۆکەرایەتی نەبووە، بەڵکو هەمیشە وەك هاوڕێو دۆست باسی دەکاو داوای یارمەتی لێدەکات)).

تاگور (زانای بەناوبانگی هندی)

((زەردەشت گەورەترین پەیامبەرێکە کەلەسەرەتای مێژووی ئادەمیزاددا دەرکەوتووە، بەهۆی فەلسەفەکەیەوە، ئادەمیزادی لەو بارە قورسەی سەرشانی ڕزگار کرد، ئەو بارەی کە بریتیبوو لە مەراسیمی جۆراوجۆری ئایینیو قوربانی کردنو بادەنۆشیو... زەردەشت زۆر مەردانەوبێ ترس ململانێی کردووە بۆ لەناو بردنی ئەفسانەو بنچینەی ئایینوباوەڕی خۆی لەسەر ئامۆژگاریو خوڕەوشت دامەزراندووە... زەردەشت ڕاستییەکی وەهای بەشێوەیەکی سادەو سەرنج ڕاکێشەر ئاشکرا کرد کە دوندی پایەی فەلسەفەیوئاکارییە، لەکاتێکدا زەردەشت دەرکەوت کە ئادەمیزاد زانیاریەکی وەهایان نەبوو دەربارەی نهێنییەکانی سروشتو پلەوپایەی مەعنەوی ڕۆح، هیچ شتێکیان دەربارەی ئەم سەرچاوە مەعنەوییەو نووری مەزداییەی کە لەبونیاندایە نەدەزانی، وە پەیوەندی نێوان خۆیانو ڕاستییان نەدەناسی. لە کاتو سەردەمێکدا کەترسوئارەزوو بزوێنەری گشت هەستوباوەڕیان بوو، ئەمانە هەموویان پاڵیان پێوە دەنا کە دووچاری ئەفسانەوخەیاڵیوبیری پوچ ببن، ئالەم کاتەدا زەردەشت دەردەکەوێت وەلەنێو ئەم بیرو باوەڕانەدا ئامۆژگارییەکانی خۆی لەسەر بنچینەیەکی وەها مەزنوگرنگ دادەمەزرێنێت کە دوورە لەهەموو جۆرە ئەفسانەوبیری پوچوخەیاڵاوی، ئامۆژگارییەکانی دەتوانرێت بەخاسترین دەستوری چۆنیەتی ژیان بۆ ئادەمیزاد دابنرێ))

وتین ئەمریکایی:

((ستایشی ئامۆژگرییەکانی زەردەشت دەکات لەوباوەڕەدایە کە عیسا پەیڕەوی لەوکردووە دەبێژێ: ئەو سێ ڕستەیە (بیرو کرداروتەی خاس) بنچینەی گشت ئایینە گەورەوکانن، نە تەنها عیسی هیچ شتێکی زیادەی نەخستۆتە سەر ئەم سێ بنچینەیە بەڵکو هیچ پەیامبەرێکی دیکەش نەیتوانیوە لەمە زیاتر لە پەیامەکەیدا باس بکات)).

مێلێز:

((تایبەتکاریەکانی ئەم مامۆستا مەزنەی مرۆڤایەتی بریتیە لەو ئامۆژگاریانەی کە لە کتێبی گاتاکانداو لەنێو سرووده بێ هاوتاکانی ئەم پەیامبەرە داڕێژراوە. لە هیچ کاتو سەدەو لە هیچ

کونو قوژبنێکی ئەم جیهانەدا- تا ئەو شوێنەی بەڵگەو نیشانە هەبێ- کەسێیەتیەکی وەها نەبووە کە بەم شێوەیە هۆشمەندانەو زانستیانە ئاوەها قسە بکات، هەرچەندە تائێستا ئیدی برێ لەو بیرو باوەڕە بەرزانە شێوەی فەلسەفەو ئاینیو ئاکاری بەخۆوە گرتووە بەڵام لەو کاتو سەردەمە دا ئەم جۆرە باسو بیرکردنەوانە باو نەبووە وە ئەم جۆرە قسانە هیچ کەس نەی کردبوو. ئەگەر هەر وەك چوێن زۆر بەی زۆری ئێمە باوەرمان بەوە هەیە کە ڕۆحی ئادەمیزاد نەمرە، دەبێ ڕۆحی زەردەشت لەسەروو هەموو ڕۆحەکانی ئادەمیزادی پاش ئەو هەرچەندە فرەش بن بدرەوشێتەوە. ئەوەی فرە سەرنج ڕاکێشو سەر سورهێنەرە ئەوەیە کە لەو سەردەمە کۆنەدا وە لەو باری ژیانە سادەیە دا، کەسێك ئەموتانە ببێژێت.)).

مێلێز، لە شوێنێکي دیکە دەبێژێ:

((جگە لەسەرۆ (الهام) و (وحي) ئاسماني، کە لە بیرو ئەندێشەي قولێ کار دەکەنە سەر زەردەشت، لەنێو گاتاکاندا بە هیچ جۆرێك باسی پەرجۆو کەرامات نەکراوە.

کاراییو هەڵسوکەوتي ئادەمیزاد بە دەوري تێکوێشانو هەوڵو (غەریزەي سروشتی) بۆ ژیانو رەنج کێشان دەخولێتەوە. ئاوێستا زانێك گەر سەرەتا گاتاکان بخوێنێتەوە وە لێووردبێتەوەو ئەوسا یەشتەکانو ڤەنیداد بخوێنێتەوە، لە جیهانيواقعیەت پێ دەنێتە سەر زەمیني ئەفسانە کۆنەکاني ئەوساتە.

لەگاتاکاندا چاوي بە پەیامبەرێك دەکەوێت کە خەریکي هەولو تێکۆشانەوخۆراگرە بەرامبەر ئەشکەنجەو ناخۆشیەکاني ژیان، بەلآم لە یەشتەکاندا هەر ئەم کەڵە پیاوە بە شێوەیەکي نیوە خوایەکي ئەفسانەیي دەبینێت.))

هومباخ:

((ئایا ئەم بیرو باوەڕە پیرۆزو بەرزە کە زەردەشت دەخاتە ڕیزی یەکێ لە گەورەترینومەزنترین دامەزرێنەرانی ئایین لەجیهاندا چییە؟ بەڕاستی دەبێ بگوترێ کە ئەم باوەڕە بریتیە لەجاڕدان دەربارەی هاتنە گۆڕێی دەستپێکردنی دوا هەنگاوی ژیانی ئادەمیزاد کە لەم هەنگاوەدا چاکەو خراپە لە یەکتری جیا دەبنەوە.

زەردەشت خەڵکی فێری ئەوە کرد کە هەموو کەسێك ئەو هێزو توانایەی هەیەو دەتوانێ بەشداربێ لە لەناوبردنی خراپەو فریوو ڕیاکاریو قەڵەمرەوی یەزدانی بەرپا بکات کەتیایدا هەموو مرۆڤێك یەکسان بژیوبەهەشتی ڕاستەقینە لەسەر ڕووی زەوی بەدیبهێنێت.))

ویل دورانت:

((ئاینی زەردەشت، ئاینێکی بەشکۆ بووە وە کەمتر لە ئاینەکانی دیکە باوەڕی بە ئەفسانەو بت پەرستیو خوێنڕێژی بووە، ئەم ئاینە شایانی ئەوە نەبوو کە بەم جوێرە کزو لاواز بێت. هۆی سەرەکی ئەم لاوازییە بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد زێتر ڕوو لە شعرو خەیالێ دەکاتەوە تا (لوێژیك) و ناتوانن دوور لە ئەفسانە بژین.

زەردەشت دەستورێکی زێڕین دەداو دەبێژێ ئەو شتەی بۆخۆتت گەرەك نیە بۆ خەڵکیش بەرەوا مەبینە، ئەرکی سەرشانی ئادەمیزاد سێ شتە، ڕەفتارت لەتەك دوژمنان وەها بێت کە بەرەبەرە ببێتە دۆستت، مرۆڤی خراپ بەرەو ڕاستیودروستی ڕێنمایی بکە، نەزان زانا بکە))

ئلمستد:

((نەپێویستمان بە ئەفسانەی چۆنیەتی لەدایك بوونی زەردەشت هەیە کەبە نیشانە ئاسمانییەکان ڕازابێتەوەونە بەژیانێکی پڕ لە پەرجوێو نە بەمردنێکی سەربەرزانە بۆئەوەی گەورەییومەزنێتی بسەلمێنین. تەنێ لەوتەکانی خودی زەردەشت دەتوانین چۆنیەتی ژیانوبێ کەمایەتی بیروباوەڕی بنەخشێنین.

ئێمە هەستمان بە بەرزێتیوگەورەیی رۆحی زەردەشت کردووەوکارایی وەهایی لێ دەبینین کە هەرچی زیاتر لێوردبینەوە پتر خۆشمان دەوێوڕێزی لێدەگرینو مرۆڤایەتی زێتری تیا بەدی دەکەین)).

اشتینر (زاناو توێژەری ئەلێمانی)

((زەردەشت یەکێکە لەهەرە گەورەترین کەسێیەتییەکان کە ڕۆلێکی پێشڕەویان هەبووە لەگوێرینو پێشخستنی بیرو شارستانیەتی ئادەمیزاد، وەلەرِیزی ئەو کەسانەیە کە بەبیری خۆیان گەیشتوونەتە ڕاستیو حیکمەتێك کەفرە لە کاتوسەردەمی خۆیان پێشتربوون)).

سر پرسی سایکس:

((بەش بەحاڵی خۆم لەوباوەڕدام، دژوارە کەسێك بتوانێت ئامۆژگاری گرنگترو مەزنتر لە ئامۆژگارییەکانی زەردەشت بۆ ئادەمیزاد بهێنێت.)).

## فەلەسەفەی ئاینی زەردەشتی

هەرلەوساتەوە ئادەمیزاد پێی ناوەتە نێو جیهانی بیرو بیرکردنەوە، عەوداڵی ئەوەبووە کە بزانێت ژیان چییە؟، چاکەو خراپە چین؟، ڕێگەی ڕزگاریو سەرفرازی کامەیە؟

مرۆڤ، لەسەراسەری مێژووی ژیانیدا تێکۆشاوەو هەوڵیداوە بەهۆی بیرکردنەوەوە ئەم ڕازو نهێنییەی بۆ ئاشکرا بێت، کە سەرچاوەی بونو ژیان لەکوێراوە هەڵێقولآوە. لەم ڕێبازەدا، دوچاری ڕەنجو ئەشکەنجەو ناخۆشییەکی یەکجار زۆر بووە. پەیامبەرەکان، فەیلەسوفەکان، مامۆستایانی ئاکار، رابەرو پێشەوا ئایدیالیستەکان، زاناکان، نووسەران، هونەرمەندانو.... هەریەکە، بە شێوەیەك ئەم پرسیارانەیان لەبیری خۆیاندا هەڵیسەنگاندووە، وبەگوێرەی بۆچونی خۆیان وەڵامی تایبەتییان داوەتەوە. وەلـآ، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە، زەردەشت پتر لەهەموان، بەووردیو بەبیرێکی زانستانە، لەچوارچێوەیەکی فرە سادەو لەهەمان کاتدا فەلسەفی، وەڵامی داوەتەوە. ئەم وەڵامە جێگەو پلەو پایەیەکی تایبەتی هەیە کە لەنێو ئاوێستادا(گاتەکان)، هەزاران ساڵ لەمەوبەر، ئازایانەو ژیرانە، بۆ ئەوکاتەو ئێستاو پاشە ڕۆژیش، بۆتە خاسترین ڕێنما بۆ ئادەمیزاد.

زەردەشت، بۆ هەریەکـآ لەو پرسیارە گرنگـو بنەڕەتییانەی دەربارەی بوونو ژیان، چاکەو خراپەو رێگەی رزگاری کە ئادەمیزاد بیری لێدەکاتەوە، پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر، وەڵامی تایبەتی داوەتەوە. سەرەتا، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە کە (بوون) چییە؟ زەردەشت، سوودی لەدیاردەکانی سروشت وەرگرتووەو بە بیرێکی قوڵو زانستیانە هەڵیسەنگاندون، وبڕی پرسیاری لەم بارەوە لەخۆی کردووە، پاش توێژینەوە، وەڵامەکانی بۆ ڕونبۆتەوە.

دەتوانین بێژین بنچینەی فەلسەفەی ئاینی زەردەشتی، ئالێرەدا خۆیدەنوێنآ کە گشت ڕیو ڕەوشەکانی ئەم ئاینە لەقوڵایی بیری مرۆڤ خۆیەوە هەڵێقولآوە.

زەردەشت، پاش ئەوەی بەووردی سەرنجی ژینگەی خۆی دەدا، بیر لەدیاردەکانی سروشت دەکاتەوە، دەچێتە نێو قوڵایی کێشە کۆمەلآیەتییەکان، پاشان دەبێژێ:

((پرسیارت لێدەکەم ئەی ئاهورامەزدا، ئەم ڕاستییەم بۆ ڕوونو ئاشکرا بکە، کە لەسەرەتای دروستبونی ژیانەوە، داهێنەری (ڕاستی) کـآیە؟ کـآیە ئەو کەسەی چۆنیەتی سوراندنەوەو گەردەشی بە(خۆر)و هەسارەکان داوە؟ کـآیە ئەو کەسەی بەهۆی ئەوەوە (مانگ) بڕی جار گەشو هەندێ جاریش کزدەبێ؟

ئەی مەزدا، ئەمانەو هەندێ شتی دیکە هەیە دەمەوێت بیزانم. لەتۆ دەپرسم ئەی ئاهورا، بەڕاستی بۆم ڕوونو ئاشکرابکە، کآیە ئەو کەسەی چاودێری ئەم زەوییە دەکات کە لەشوێنی خۆی ڕاگیربێت؟وئاسمانی لەو سەرەوە ڕاگرتووەو ناهێلێێت بەرەو نەوی بکشێت؟ کـآ ئاوو گژوگیای ئافراند؟ کـآ هەورو(با) دەجولێنآ؟ ئەی مەزدا، کـآ بیری چاکی ئافراند؟ لەتۆ دەپرسم ئەی ئاهورا، بە ڕاستی ئاگادارم بکە، کـآیە بە بووهێنەری رووناکی سودمەندو تاریکی؟ کـآیە وەدیهێنەری(خەو)ی ئارامبەخشو هوشیاری؟ کـآیە کەبەرەبەیان، نیوەڕۆو شەوی وەدیهێنا؟ لەتۆ دەپرسم ئەی ئاهورا، بەراستی ئاگادارم بکە کـآیە کە بەهۆی ئەقڵو زانیاری خۆیەوە،

خۆشەویستیو ڕێزلێنانی باوکی خستۆتە نێودڵی زارۆلەکانییەوە؟ ئەی مەزدا، ئەز تێدەکۆشمو هەوڵدەدەم، بەهۆی بیری پیرۆزەوە، ئەتۆ بەئافەریدەی تەواوی هەموو بزانم.))

لەفەرهەنگی زەردەشتیدا، بۆ ناسینو تێگەیشتنی (ژیان)و (بوون)، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو هەموو پرسیارانەی بەبیری ئادەمیزادا دێت، بۆ جیاکردنی دروست لەنادروست (ڕاست لەچەوت)، پەنا نابرێتە بەر خەیالأو سۆزو مشتومڕ، بەڵکو، هەموو شتێك بە پێوانەیەکی زانستیانە دەپێورآو سوود لەسروشتو ژینگەو ئەو شتانەی بەچاو دەبینرێن وەردەگیرآو ئەزمونو بیرکردنەوە بەکاردەهێنرێت.

لەوتەکانی زەردەشت، کە لەگاتاکانەوە وەرگیراوە، تێدەگەین کە ئەو پیاوە مەزنە، بۆ گەیشتنە ئەو ڕاستییەی کە عەودالْی بووە، بۆ تێگەیشتنی ڕازی چۆنیەتی دروستبوونی کەشکەلآنو زیندەوەرەکان، تەنیا پەنا دەبێتەبەر سروشت، وئادەمیزاد بەرەو ئەو ڕووناکییە تەواوسەنگەو تاك تاکی ئەو دیاردانەی کە لەو ڕووناکییەوە وەدیهاتوون، دەبێت.

زەردەشت، بەهۆی ناسینو ستایشکردنی ئەم دیاردانەوا لەئادەمیزاد دەکات کە زێتر بچێتە ناخی چۆنیەتی دروستبوونیانو بیرکردنەوە لەدروستکەرو سەرچاوەی ئەم هەموو بوونە.

ئەمە خۆی لەخۆیدا شێوەو ڕەوشێکی ژیرانەو دروستە کە بەڕوانینو وەرگرتنو پێوانەو یەکاڵکردنەوە دەست پێدەکاو بە گەیشتنە زانینو تێگەیشتن کۆتایی دێت.

## ژیان چییە؟

ژیان چۆن پێکهاتووەو مەبەستو ئامانج لەژیان چییە؟

ئەمە دژوارترین پرسیارێکە کە هەمیشە لەنێو خەڵکیدا باسدەکرێتو هەر کەسێکیش لەخۆی دەپرسێت، بۆچی هاتۆتە ئەم جیهانەو مەبەست لەژیان چییە؟ لەم بارەوە، وەڵامی جۆراوجۆر دراوەتەوەو هەرکەسە بە بۆچونی خۆی لەڕوی ماکی (مادی)و مینۆکی (معنوی)یەوە بڕێ هۆی باسکردووە، بەلآم با بزانین زەردەشت چی دەبێژێ:

بە باوەڕی زەردەشت، لەجیهانی (بوون)دا هەموو کارو کاردانەوەیەكو بزوتنو جولانەوەو جموجۆلێو پێگەیاندنێك کە هەیە، پێی دەبێژرێ ژیان. بەگوێرەی ئەم باوەڕە، ژیان تەنیا بۆ ئاژەڵو ئادەمیزاد نییە، بەڵکو هەرشتێك کە بتوانێت کار بکاتە سەر شتێکی دیکەو بەرەو پێگەیاندنو مەزنایەتی بەرێت، بە زیندوو دەژمێرێت. لەبەرئەمە، بەگوێرەی بۆچونی زەردەشت، گشت دیاردەکانی بوون، وەك ڕووناکی، بنەماکان (عناصر)، گژوگیا، گیان لەبەرو...... هەمویان زیندونو لەڕوی ژیانەوە یەکسانن. لەوتەکانی زەردەشتدا کاتێك کە باسی (خۆر) و(مانگ) و (ئاو) و(گژوگیا)و هەموو دیاردەکانی سروشت دەکات، بە شێوەیەك باسیان دەکا، وەك ئەوەی کە هەموویان زیندونو گیانیان هەیە.

ژیانو زیندوویەتی تەنیا بریتی نییە لەخواردنو نوستنو بیرکردنەوە. ژیان مانای هاتنەبونو گەشەکردنو پشکوتنو لەدایکبونو مردنە. لەنێو ئەم جیهانی بوونەدا، هیچ شتێك نییە کە لەم تایبەتمەندیانە وەدەربێت، ئەو تاشە بەردەی کە بە ڕواڵەت بابەتێکی بێگیان دێتە بەرچاو، لەدەرونیدا پڕە لەجموجۆلأو نیشانەی ژیان. ئەگەر ئەو تاشە بەردە بشکێنرێتوووردوخاش بکرێتو ببێتە خۆلأ، وتێکەڵ بە خۆڵی دەوروبەری بکرێت، ئەوسا ئاوپژێن بکرێتو (تۆ)وی تێدا بوەشێنرێت، پاش ماوەیەك دەبینین(تۆ)وەکە دەرِوآو گەشەدەکاو دەپشکوآ، ئەمە هەموی ئەوە دەگەیەنێت کە هێزو توانایەك لەنێو دڵو دەرونی (بوون)دا شاراوەتەوە، هێزی دروستکردنو گەشەکردن

## زەردەشت دەبێژێ:

((ئەو یاساو بەرنامەیەی کە جیهانی بوون دەسورِێنآ، ژیانو سروشتی ئادەمیزادیشی بەدەستەوەیە. خاوەنی بیری خاس کە سێکە کە پەیڕەوی لەیاساو بەرنامەی جیهانی بوون بکات، وخاوەنی توانای راستودروست کەسێکە کەبەسەرویستو هەواو ئارەزووە نارِێکوپێکییەکانی خۆیدا زاڵ بێت. (ڕاستی)، یاسای جیهانی بوونە. (راستی) مایەی بەختەوەرییە.))

بەگوێرەی ئەووتانە، جیهانی بوون، بریتییە لەجیهانێك کە بە شێوەیەکی (سیستەماتیك)، وبەهۆی یاسایەکی دارِێژراو دەسورِآو هەموو هۆکارەکانی وەك ئەلێقەی زنجیر پێکەوە بەستراونو تەواوکەرەوەی یەکدین.

لەسیستەمی (بوون)دا، کە سیستەمێکی مەزنو بەشکۆو داهێنەرە، هەموو شتێك تیایدا لەحاڵەتی دروستبوونو لەناوچونو لەیەکپچراندنو پێکەوە بەستنە. لەم سیستەمەدا، نیشانەکانی (بوون)، بە شێوەی جۆراوجۆر خۆیان دەنوێنن. برِی جار لەشێوەی رووناکیو هەندێ جار لەشێوەیووزە، بنەما، گژوکیا، زیندەورو هەندێ جاریش بە شێوەی ئادەمیزاد. گشت ئەم نیشانانە، پەیوەندییان پێکەوە هەیەو کار دەکەنە سەر یەکدیو ئەو شتەی لەنێو هەموویاندا هاوبەشە، بریتیە لە (بوون)و هاتنە گۆڕآ (لەدایکبون)و پەرەسەندنو مردن. هەرچەندە هەموو نیشانەکان بە ڕواڵەت لەیەکتر جیاوازنو هەریەکە بۆخۆی قەوارەیەکی تایبەتی هەیە، بەلآم لەدەرونداو لەزاتدا گشتیان یەکن، وهەریەکە بۆخۆی ڕوناکییەکی هەیە کە بەشێکە لەرووناکی ئەو زاتەی کە خولقێنەری گشت(بوون)ە.

کەوایە، بەگوێرەی فەلسەفەی ئاینی زەردەشتی، ژیان مانای ئافراندن (خولقاندن)و جموجۆلأو پێگەیاندنە. مانای نیشاندانی ئەقلو هۆشی (بوون)ە، واتە نیشانەی ئاهورامەزدایە کە بریتییە لەگەوهەری (بوون). بە مانایەکی دیکە، بریتییە لەئەلێقەی زنجیری لەیەکنە پچرِاوی خولقێنەری توانای (بوون)ە کە لەرووناکییەوە دەستپێدەکات، ولەئاکامدا دەگاتەوە رووناکی.

## چاکەو خراپە، دیالەکتیکی ڕەوانو ئەندێشە لەباوەرِی زەردەشتدا

ئاینی زەردەشت بۆ وەڵامدانەوەو شیکردنەوەی ئەو پرسیارانەی دەربارەی ژیان دەکرێت، شێوەیەکی زانستانەو ڕەوشی دیالەکتیکی هەڵبژاردووە، وژیانی ئادەمیزادی لەسەر ئەم کۆڵەکەیە (دامەزراندووە) زەردەشت، کاتێك دەیەوێت دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئەم جیهانە بدوێت، دەبێژێ:

((هەرکە ئەم دوو گەوهەرە هاوال دوانە(هاوزاد) دژ بەیەکە بەیەکگەیشتن، بوونو نەبونیان هێنایە ئارا.))

هەروەکو لەمەوبەر گوتمان، یەکێ لەگرنگترین بنچینەکانی جیهانبینی زەردەشت، ئەوەیە کە باوەڕی بە دوو گەوهەری هاوال دوانەی دژ بە یەك هەیە لەم بوونەدا، دژایەتی ئەم دوو گەوهەرە هاوالأ دوانە، لەبیری ئازادی مرۆڤدا خۆی دەنوێنێ. زەردەشت لەگاتاکاندا (یەسنای 30 بەندی 1) دەبێژێ:

((ئێستا ئیدی بۆ ئەو کەسانەی ژیرنو دەیانەوێت بزاننو تێبگەن، دەربارەی دوو گەوهەری بوون کە ئافەریدەی ئاهورامەزدان دەدوێم. هەروەها لەمەڕ ستایشی ئاهورامەزداو (بیری خاس) و(زانستی چاک) کە لەسەرچاوەی ڕاستییەوە هەڵیقولاون قسە دەکەم، تا بە تێگەیشتنێکی ڕاستو دروست بەهرە لەڕووناکی بەختەوەری وەربگرن.)).

لەو سروودەی سەرەوە، ئەوەمان بۆ ئاشکرادەبێت کە: زەردەشت دەیەوێت دەربارەی چۆنیەتی دروستبونی ئەم جیهانەو گەوهەری (بوون)، بۆ خەڵک بدوێت. بەلآم پێش ئەوەی دەست بە ئاخافتن بکات، خۆی دەزانێتو گەرەکێتی بە خەڵک ڕابگەیەنێت کە بۆ تێگەیشتنو زانینی ئەم باسە، پێش هەموو شتێك دەبێ ئەو کەسە شەیداو عەودالأو ژیرو هۆشمەند بێت. زەردەشت، بۆ ئەم جۆرە کەسانە، سەبارەت بە دووگەوهەری(بوون) دەدوێت کە پایەو بنچینەی ئافراندنن. ئەم دوو دیاردە بنچینەییە، لەڕوی ساختارو هەڵسوکەوتدا، دژ بە یەکدین، ئەم دژایەتییە لەپاشاندا لەسروودەکانی دیکەی زەردەشت زێتر ئاشکرادەبن.

ئەوەی شایانی باس بێت ئەوەیە کە ئەم دوو گەوهەرە بنچینەییەی (بوون)، هەردووکیان ئافەریدەی مەزدان، واتە خوای ئەقڵو هۆش ئەم دوو دیاردەیەی پێکەوە ئافراندووە، یا بە شێوەیەکی دی بێژین کە: خوای تاکو تەنیا ئەم دوو گەوهەرە دژ بە یەکەی لەئەقڵو هۆشی باڵآی خۆیەوە ئافراندووەو ئەوسا گیتی لەسەر پایەی ئەم دوو گەوهەرە بنچینەییە دارێژراوەو شێوەی خۆی وەرگرتووەو بەرەو پێشکەوتن دەڕوات.

ئەم دوو گەوهەرە هاوجوتو دژ بەیەکە، لەزانستی ئیمرۆدا، لەبچوکترین گرێدەدا پێیان دەبێژرێ (پرۆتۆن)و (ئەلەکترۆن). ئەو هێزووزانەی کە لێیان دروست دەبێت ـ کە بەشێوەیەکی مخالف کاردەکەنە سەر یەکتر ــ پێیان دەبێژرێت (ئەرێنی)و (نەرێنی). ئەم دوو گەوهەرە لەگشت گرێدە بنچینەییەکانی جیهانی مادیو گشت دیاردەکانی (بوون)، لەگچکە تا گەورە، وماکیو مینۆکی،

هاوجوت پێکەوە ـ نە جیاواز لەیەکتر ـ کاردەکەن، وئەو هێزوزانەی کە لێیان دروست دەبن، لەسەراسەری جیهانی بووندا، لەکارو گەردشدان. ئەم دوو گەوهەرو هێزە بونەتە هۆی ئەوەی کە هەموو شتێك لەم جیهانەدا لەباری گەردەش‌و جولآنەوەو پێشکەوتندا بن ــ بە هەر شێوەو چۆنیەتی‌و چەندایەتی یەك بێت.

لێرەدا پێویستە ئەوە بخەینە بەرچاو کە کۆمەڵآ لەزاناو توێژەران، ئەم دوو گەوهەرەی (بوون) یان بە(چاکەو خراپە) یا (خێرو شەڕ) لێکداوەتەوە. ئەم بۆچونە هەڵەیە، چونکو ئەم دوو گەوهەرەی (بوون)، بەگوێرەی‌وتەی گاتەکان، ئافەریدەی مەزدان، وبەگوێرەی بۆچون‌و قسەکانی زەردەشت کە لەگاتاکاندا باسکراوە، وەدیهاتنی ئەم (بوون)ە لە ئەقڵ‌و هۆشی باڵآوبەرزی ئاهورامەزداو لەسەر بنچینەی (ڕاستی) تەواوسەنگ یەوە ئەنجام بووە. لەبەر ئەمە، کەموکوڕی‌و ناڕاستی تێدانییە، کەوایە، لەنێو ئافەریدەکانی مەزدادا، هیچ جۆرە خراپە یا شەڕێك نییە.

هەروەکو لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد، لەڕوانگەی بیری زەردەشتەوە، کە لەسەر بنچینەی (وحده الوجود) دارێژراوە، هەر لەسەرەتای دروستبونی ئەم جیهانە، دووگەوهەری ئاوال دوانەی دژ بەیەك لەئارادابوون، یەکێکیان ڕوخێنەرو ئەوی دیکەیان دروستکەرو ئاوەدانکەرەوە بووە،یەکێکیان هۆیە بوێ لەدایك بوون‌و پەرەسەندن‌و پەروەردەی بوونەکان، ئەوی دیکە هۆیە بوێ کەمکردن‌و شکست‌و لەناوبردنیان. یەکێ هۆیە بوێ ساغلەمی‌و تەندروستی‌و توانایی جەستەو بەختەوەری ژیان‌و تەمەن درێژی، ئەوی دیکەیان هۆیەکە بۆ دەردو ئازارو ئەشکەنجەو نەخۆشی‌و نەمان. بارودۆخی سروشتیش هەربەمجۆرەیە. ئاو،خاك، هەوا، ووزەو ڕوناهی خۆر، هۆن بۆ دروستکردن‌و گەشەپێدان، بڕێکی دیکە وەك قارچەکان، بەکتریاکان، میکرۆب‌و ڤایرۆسەکان، کەڕوو... هوێن بۆ لەناوبردن. جیهانی بوون هەمیشە لەحاڵەتی دروست کردن‌ووێران کردنە. توڕەیی‌و هەڵێچون‌و دژایەتی کردنی سروشتیش لەتەك ئەو هە موو جوانییەی هەیەتی‌و خۆشی‌و شادیمان پێ دەبەخشێت، هەرکە لێمان زیز دەبێت، دەبێتە بێ بەزەییترین‌و ترسناك ترین شت بۆمان، دەسووتێنێ، دەخنکێنێ، دەکوژێ‌ووێران‌و خاپور دەکات.

کارگەریەتی ئەم دوو فاکتەرەی (بوون) و (نەبوون) یا دووگەوهەرە هاوەڵێ دوانە دژ بەیەك ترە تەنیا لەسەر گوێی زەوی نییە، بەڵکو زەوی‌و هەموو هەسارەکان‌و کەشکەڵانەکانیش هەمیشە دووچاری ئەم گوێڕانکارییانەن، وەهەر یەکەیان پاش ماوەیەکی دیاری کراو دەتەقێنەوەو پارچەکانیان لەنێو بۆشایی ئاسمانی بێ سنووردا پە خش‌و بڵاو دەبنەوەو هەمیسانەوە بەهۆی‌ووزەی ڕاکێشەر(جاژب)، ئم پاچە سەرگەردانانە کوێ دەبنەوەو یەك دەگرنەوەو هەسارەی دیکە پێك دەهێنن. ئەم دوو گەوهەرەی باسمان کرد، هەریەکەیان ڕۆڵێ‌و کاراییەکی تایبەتیان هەیەو ناوی جیاجیایان هە یە وەك ڕاکێشە رو پاڵێنەر، ئەرێنی‌و نەرێنی، ماددەووزە، ماددەو ڕوێح، تێزو ئەنتی تێز وە...

هەریەك لەم دوو وزەیە بەشێوەیەكی بێ سنورو ڕەها، چاك یان خراپ نین، بەڵكو هەردووكیان تەواوكەرەوەو گرێدراوی یەكترن وە بنچینەو پایەو سورِانەوەو هەمیشەیی ئافراندن، لەسەر كوێڵەكەی ئە م دووانە دارِێژراوە.

هێزی ئاوەدانیو دروستكردن لەبیری (سپەنتامینو)دابووەو هێزیوێرانیو ڕوخێنەر لەبیری ئەنگرەمینو (ئەهریمەن)دایە ـ لەپاشاندا باسی ئەم دوانە دەكەین.

ئێستا ئیدی دەتوانین بە كورتی بێژین: ئەگەركو خاس لەوتەكانی زەردەشتووردبینەوەو لێبكۆڵینەوە، دەبینین كە دەتوانین تەنیا لەووشەیەكدا مانای (چاكە) لێكبدەینەوە، ئەویشوشەی (ڕاستی)یە، واتە چاكەو چاكێتی هیچ شتێك نیە جگە لە (راستی)، وخراپەو خراپی تەنیا(درۆ)یەو هیچی دی.

زەردەشت، بە ئەقڵو بیری خۆیو لەو روانگەیەوە، خوای ناسیوەو بە خەڵكی ناساندووە، ئەو خوایەی كە زەردەشت ناسیوێتی، بریتیە لە: ڕاستی، پاكی، بیری خاس، دانایی، ژیری، میهرەبانی، دادگەری، توانایی، ئاوەدانیو چاكی. بەهیچ جۆرێكو كلۆجێك: خراپە، فریو، تورِەیی، تێكدەری، ناپاكی، بآ هێزیو خراپە لەزاتی ئەودا نییە. كەواتە ئەم شتە خراپانە لەوەوە نییەو لەوێشەوە دەرناچێت. واتە، زۆر بە سادەیی بێژین كە (خراپە) ئافەریدەی مەزدا نییە. كەوایە، ئەو دوو گەوهەرە بنچینەییەی (بوون) كە مەزدا دروستی كردون، بریتی نین لەچاكەو خراپە یا خێروشەرِ، بەڵكو هەروەكو گوتمان مەبەست لەو دوو گەوهەرە، هەر ئەو دوو دیاردە دژ بەیەكەیە كە بنچینەو كۆڵەكەی ئافراندنن، وهەموو شتێك لەسەر ئەو دوانە دارێژراونو پێشكەوتونو ڕێگەیان بەرەو پوختەبون پێواوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كە، یەكآ لەتایبەتكارییەكانی پەیامە نەمرەكەی زەردەشت ئەوەیە كە فرە خۆی ناخزێنێتە نێو ئەو باسانەی پەیوەندییان بە میتافیزیكەوە هەیە، ئەگەر زۆر پێویست بكاتو ناچاربێت لەبەر برِێ هۆ ئاماژە بۆ هەندێ لەو باسانە بكات، پێش ئەوەی بیری خەڵك ئالێۆزبكاتو دوچاری پەرێشانی بیرو ڕارِایان بكات، زۆر ژیرانەو وەستایانە كێشەكە دەگەرِێنێتەوە سەر شەقامیواقعیەت.

پەیامی زەردەشت، پەیامێكە بۆ پەروەردەكردنی بیرو ئەقڵو هۆشی مرۆڤ، بۆ پێگەیاندنو بەرزێتی تایبەتكارییە چاكـو پەسەندەكانو ڕێكوپێك كردنی ئاكاری ئادەمیزاد. هەوڵوكۆششی زەردەشت بۆ ئەوەیە كە بەرِاگەیاندنی پەیامەكەی، بیرووتەو كرداری خەڵك بگەیەنێتە دوندی پوختەییو بآ كەمایەسی، كە بەم هۆیەوە جیهانێك بۆ مرۆڤ برِەخسێنآ كە ئادەمیزادی هوشیار، ئازاو ژیر بە پەیرِەو كردن لەیاسای رِلستیو دروستی تیایدا بژین، ڕقو قینەو تورەیی تێدا نەبێت. كەوایە پەیامی زەردەشت، پەیامی چاككردنی هەڵسوكەوتی مرۆڤـو پەیوەندییەكانی نێو ئادەمیزادە لەم جیهانەدا. لەم ڕووەوە، زەردەشت زۆر وەستایانەو ژیرانە، بآ ئەوەی بچێتە بنجو بناوانی میتافیزیكەوە، باسو گفتوگۆ دەربارەی ئەم دوو گەوهەرە دژ بەیەكە بە شێوەیەكی جوان

دەکێشێنێتە نێو بیری ئادەمیزاد، بە باسکردنی دژێتی بیرکردنەوە، چۆنیەتی وەدەیهاتنی(چاکە)و (خراپە) دەخاتە بەرچاو، ئەوسا، ئاکامی هەڵبژاردنی رێگەی (خاسی) یا(خراپی) ئادەمیزاد بەرۆشەنی باسدەکات.

بەم شێوەیە هانی مرۆڤ دەدات تا بەشێوەیەکی هوشیارانەو ئازادانە رێگەی (چاکی) هەڵبژێرن، ودژی (خراپە) ململانآ بکەن...

زەردەشت، بە باسکردنی بونی ئەم دوو گەوهەرە دژ بەیەکە لەجیهانی (بوون)دا، یەکسەر باسی پەیوەندی نێوان ئەم دوانە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکە کاردانەوەو بەهرە وەرگرتنیان لەبیری مرۆڤدا، دەکات.

بەمجۆرە، بە باسکردنی شوێنەوارو ئاکامەکانی ئەم باسە لەژیانی مرۆڤدا، بابەتەکە لەچوارچێوەی بیرکردنەوەدا دەبێتە نێو گۆڕەپانیواقعیەتو کارایی..

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد، وگشت پەیامبەرە ڕاستەقینەکان لەپاش زەردەشت، باوەڕیان بەوە هەبووەو سەلماندوویانە کە خوای داناو ژیر، تەنآ چاکە، ڕاستیو ئاوەدانی بۆ خەڵک ئافراندووە. واتە خراپە، درۆو ناراستی، لەزاتی خواوە نەخولێقاوە.

یانی: لەچوارچێوەی ئافراندنی خوای تاکو تەنیا، دیاردەیەك بەنێوی (خراپە) نییە، بەلام کە دەڕوانینە دەوروبەرمان دەبینین، لەنێو کۆمەڵگادا، بمانەوآ یا نەمانەوێت، ئەم دیاردەیە هەیە (دیاردەی خراپە)، بەچاو دەبینرێت، دەبیسترێتو هەستیان پێدەکرێت، درۆ، دوڕویی، فریو، ستەم، کوشتار، خیانەت، جەردەییو... ئەمانە هەمویان لەنێو کۆمەڵدا هەنو دەزانین کە خراپن، ئەی ئەم خراپیانە چینو لەکوێوە هاتونو چلۆن پەیدابون؟

دروستکەری ئەم جیهانە کە تاکو تەنیایە، وجگە لەو هیچ دروستکەرێکی دیکە نییە، ئەم دروستکەرەش، جگە لە (چاکە) هیچی دیکەی بۆ ئادەمیزاد نەئافراندووەو خراپیەکان لەوەوە نین، بەلآم هەن، ئەم خراپیانە بە شێوەیەك هەست بە بونیان دەکرێت کە بەهیچ کلوجێك ناکرێت بونیان بەرپەرچ بدرێتەوە یاخود لەبونیان دودلأو ڕاڕا بین.

هەر لەمێژە، باسو بوونی (خراپە) لەجیهاندا، سەرنجی زۆر لەزاناو فەیلەسوفە گەورەکانی ڕاکێشاوە، هەریەکە هەوڵی داوە بەگوێرەی بۆچونو بیری خۆی، ئەم دیاردەیە باس بکات.

((زەردەشت، هۆی بوونی ئەم خراپیانە لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی دیالەکتیکی هەڵدەسەنگێنێت، هەر لەو ڕوانگەیەوە بنەڕەتی چاکەو خراپە لەبیری ئادەمیزاددا دەپشکنآو بەم شێوەیە باسی دەکات: هەرکە ئەم دوو گەوهەرە هاوال دوانە دژ بەیەکە، لەبیری ئادەمیزادا دەرکەون، چاکەو خراپە دێنەئارا، ئەوسا، مرۆڤی ژیرودانا، چاکە هەڵێدەبژێرێت، نەزانو گەوج خراپە هەڵێدەبژێرێن...))

ـ یەسنا 30 بەندی 3ـ

بەبۆچونی زەردەشت، ئادەمیزاد بەگوێرەی یاسای ڕاستی (ئاشا) کە یاسای ئافراندنە، توانای هەڵبژاردنی هەیە، واتە، مرۆڤ، ئازاد خولێقاوە، کەواتە، ئازادە لەبیرکردنەوەو هەڵبژاردندا.

ئەم ئازادی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنە بەرپرسیاری دەکات بەرامبەر چۆنیەتی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنەکە. بەواتایەکی دی، بەگوێرەی یاسای دژە کردار ـ کە زەردەشت فرە جەختی لەسەر کردووە ـ ئاکامو هەڵیگەرانەوەی رەفتاری ئادەمیزاد، هەر بەو شێوەیەی کە هەیە بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە، چاکە بێت یا خراپە.

یاسای دژەکردارو گەڕانەوەی ئاکامی کاروکرداری مرۆڤ بۆ خۆی، کێشەی بەهەشتو دۆزەخ لەجیهانبینی زەردەشتدا، زۆر بەجوانی رۆشەن دەکاتەوە. لەپاشاندا دەربارەی دەدوێین.

زەردەشت، ئازادی مرۆڤ لەچلۆنایەتی بیرکردنەوەو هەڵبژاردن بەم شێوەیە بەیان دەکات:

((بۆم ئاشکرابووو تێگەیشتم کە بیری پێگەیشتوو بآخەوش لەتۆوەیە، ئەتۆی ئەو ئەقڵێو هۆشەی جیهانی دروست کرد، ئەی خوای ئەقڵێو گیان، ئەم دیاردەیەش لەتۆوەیە کە ئازادیت داوە بەخەڵکو ڕێگەت پێداون کە ئەگەر گەرەکیان بێت ڕێگەی ڕاستی هەڵبژێرنو یاخود بچنە سەر ڕێی چەوتو ناراست.)) یەسنای 31 ـ بەندی 9

لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕووندەبێ کە بە باوەڕی زەردەشت، ویستو ئیرادەی خوا یا (یاسای ئافراندن). وایداناوەو دایڕشتووە کە ئادەمیزاد هاوجوت لەتەك دیاردەی بیرکردنەوەدا ئافەریدەبێت. هەروەها ئەم بەهرەیەی پێبەخشیوە کە ئازادبێت بۆئەوەی بەئازادی بیربکاتەوەو هەڵبژێرێت. کەوایە مرۆڤ ئازادە، باش یاخراپ بیربکاتەوە. بەواتایەکی دیکە، بەگوێرەی یاسای نەگۆڕی (ڕاستی) ـ ئاشا ـ کەویستی خوایە، ئەو دوو گەوهەرە هاوالأ دوانە دژ بەیەکە کە لە(بوون)دا هەیە، لەبیری مرۆڤیشدا کارسازن، ئەم دژایەتییە کە بنچینەی ئافراندنن، لێرەدا، یانی لەبیری ئادەمیزادا، دەتوانآ زێتر خۆی بنوێنآو بایەخداربێتو چاکەو خراپە وەدیبهێنێت. دەتوانین بە شێوەیەکی سادەتر بێژین: لەهەر قوژبنێکی ئەم جیهانی بوونەدا، ئەگەرکو زیندەوەرێکی ژیرو ئاقڵی وەك ئادەمیزادی تێدانەبێت، بێگومان بایەخێك بەواتەی (چاکە) یا(خراپە)یش لەئارادا نابێت.

بیرکردنەوە لەم ڕاستیە فرە سادەیە، چونکو ئەگەر لەسەر ڕوی گۆی ئەم زەوییە ئادەمیزاد نەبوایە، یاخود هەبوایە بەلآم وەك ئاژەڵەکانی دیکە بوایەو بەم شێوەیەی ئێستای، توانای بیرکردنەوەی نەبوایە، بێگومان (چاکە)و (خراپە)یەکیش لەئارادا نەدەبوو. ئەو گیان لەبەرانەی توانای بیرکردنەوەیان نییە، تەنیا بەهۆی غەریزەوە ڕەفتاردەکەن، و لەو ژیانە تۆبزیو غەریزەییەدا، هیچ شتێك بایەخدار نییە، گشت هەڵسوکەوتو ڕەفتارەکان، بە شێوەیەکی ڕۆتین

دەروا. هیچ شتێك یا ڕەفتارێك خراپ نییە، چونكو (خراپە) لەئارادا نییە. كەواتە (چاكە)ش بآمانایە، لەبەرئەمە لەجیهانێكدا كە ئادەمیزاد بەم شێوەیەی ئێستای تێدا نەبێت، هەموو شتێك تەواو كەرەوەی یەكدین (لازمو ملزوم)و هیچ بایەخێكی (چاك) یا(خراپ) لەئارادا نابێت.

(چاكە)و (خراپە) لەلایەن بیری ئادەمیزادەوە دێتە ئارا، پاش بیركردنەوە، ئەوسا ئەم (چاكە) یا(خراپە)یە لەوتەو كرداریدا خۆی دەنوێنآ. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە كە زەردەشت پلەوپایە بایەخێكی تایبەتی بۆ بیركردنەوە داناوە. بەم شێوەیە چاكەو خراپە، لەنێو كۆمەڵگادا خۆی پێشاندەدات. بەبۆچونی زەردەشت، ئادەمیزاد لەم قۆناخەدا، كە قۆناخی هەڵبژاردنە، دەبنە دوو دەستە، دەستەیەكیان كە زانیاری، ئەقڵێو هۆشو توانای بیركردنەوەی پێویستیان هەیە، ئەمانە (چاكە) هەڵێدەبژێرن، بەشی دوهەمیان، بەهەر هۆیەك بێت لەو تایبەتكارییانە بآ بەهەرەنو فریودەخۆنو ڕوودەكەنە خراپەو لەئاكامدا پاش ئەوەی پەیڕەوی لەخراپە دەكەنو خۆیان دەخەنە نێو باوەشی دیاردەكانی یەوە، ئەوسا هەموو ژیانیان بەرەو خراپەكاری ڕاپێچ دەكرێت.

زەردەشت لەو باوەڕەدایە كە هەڵبژاردنی ڕێی ڕاست یا چەوت، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە چلۆنایەتیو چەندایەتی بیرو هۆشی ئادەمیزادەوە هەیە. مرۆڤی ژیرودانا، بە شێوەیەكی ئاگایانە ڕێگەی ڕاست هەڵێدەبژێرێت، ومرۆڤی نەزان، نەزانانە دەكشێتە سەر ڕێگەی چەوتو ناراست. ئالێرەدایە كە ئەم پەیامبەرە مەزنە پێویستی سەرشانی ئادەمیزاد لەگۆڕەپانی ئەم ململانێ بآوچانەی نێوان (چاكە)و (خراپە) كە خۆی ئافراندویەتی، دیاری كردووە. ئەركی سەرشانی هەر كەسێك بریتییە لەخەباتو تێكۆشانی بێوچان دژی خراپە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كە، پەیوەندی لەنێوان ئازادی هەڵبژاردن لای ئادەمیزاد، لەتەك هێزو توانای تەواوسەنگو بآ ڕادەی ئافەریدەگار، هەمیشە یەكآ لەگەورەترین گرفتەكان بووە لەنێو هەموو ئایینو ئاینزاكانی جیهان بەدرێژایی مێژێوو، هەریەكە لەمانە بە شێوەیەكی تایبەتی خۆیان، بەرەنگاری ئەم گرفتە بونەتەوە. برێ لەم ئاینانە، چارەنوسی مرۆڤیان بآ چەندو چۆن بەدەستو ئیرادەی خوا داناوەو دەڵێن كە خوا خۆی خۆشی یا ناخۆشی بە مرۆڤ دەبەخشێت، هەندێكیان دەخاتە سەر ڕێگەی ڕاستو برێكیان گومڕا دەكات. بۆ بەختەوەربون لەجیهانی پاش مردندا (پەسلان)، دەبێ لّی بپارێینەوەو ستایشو نوێژی بۆ بكەینو قوربانی پێشكەش بكەین تا لەكردەوەمان ڕازی بێت، هەروەها دەبێ ڕێز لەنوێنەرو دەلآڵەكان بگرین. بێگومان ئەم بۆچونانە لەتەك ئازادی هەڵبژاردندا دژ بە یەكدین. لەپەیامی زەردەشتدا، ماناو دیاریكردنی خێروشەڕ پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆی لەتەك (شعور)و دانایی مرۆڤدا هەیە.

بەبۆچونی برێكی زۆر لەتوێژەرانی جیهان، زەردەشت یەكەمین پەیامبەرێك بووە كە ڕآو ڕەوشێكی فرە سەرنج ڕاكێشەری بۆ ئەو گیرو گرفتەی باسمان كرد، داناوە. زەردەشت لەهات 30 وەڵامی برِی لەم گرفتانەی بە شێوەیەكی وەستایانە داوەتەوەو چەندین مەسەلەی بنچینەیی خستۆتەڕوو باسیكردووەو ئامادەی كردونو لەپاشاندا هەریەكە لەوانەی گەیاندۆتە ڕادەی تێگەیشتن.

1- خێروشەڕ، دوو فاکتەری بیرو ئەندێشەنو پەیوەندییان بە بیری ئادەمیزادەوەیە.

2- ڕادەی زانیاریو تێگەیشتنی مرۆڤ، جیاکەرەوەی چاکە لەخراپەیە.

3- بآ ئیرادەو ئازادی هەلبژاردن، خێروشەڕ بآ مانایە.

4- مرۆڤی داناو هۆشیارو بەویژدان کە لەتەك (ئاشا)دا (واتە ڕاستیو یاسای هەقو یاسای سروشت)، هاوئاهەنگە، ڕێگەی ڕاستو دروست هەڵدەبژێریو خۆی لەتەك یاسای سروشتدا هاوجوت دەکاتو لەدرۆو فریو دوور دەخاتەوە. مرۆی نەزانو تێنەگەیشتو لەڕێی ڕاست دوردەکەوآ.

5- ستایشی ئاهورامەزدا هاوئاهەنگ لەتەك بیری چاك (وەهومەن)و ڕاستیو دروستی (ئاشا)یە کە ئادەمیزاد بەرەو بارەگای روناکی هیدایەت دەکات.

6- (بوونو نەبوون)، بزوتنو نەجولآنەوە، بەهۆی لێکدانی خێروشەڕەوە دێنە ئارا. ژیانی گەشەدار لەژێرسایەی خێرو خاسیەوە دێتەدی، وشەڕو خراپە کە بەهۆی درۆو فریوو ڕیاوە دێتەدی، مایەی (نەبوون) یا (سکون) دەبێت.

7- لایەنگرانی ڕاستیو دروستی (ئاشا)، خاسترین بیرو ئەندێشەیان هەیە، ولایەنگرانی درۆ خراپترین بیرو ئەندێشەیان هەیە.

8- ئەم ئەسڵە تا دوا چرکەکانی ژیانی ئادەمیزاد بەردەوامە، ولێکدانی خێروشەڕ ڕێبازی ئادەمیزاد ڕوندەکاتەوە.

9- ڕەزامەندی خوا بەهۆی کرداری ڕاستو دروستی ئادەمیزاد ڕەچاودەکرێت.

10- مرۆڤی نەزان کە بەخراپترین جۆر بیردەکەنەوەو خۆیان گیرۆدەی ڕقو کینە دەکەن، دەبنە هۆی گومڕایی کردنی خەڵکیو لەڕآ وەدەرکردنیان.

11- بەهۆیویژدانێکی ئارامو ئاسودەوە، لێبوردنو بەخشین بەدەست دێت. ئەو کەسەی لەدەرونەوە چاکە، دەگاتە بەختیاری ڕاستەقینەو ئەو کەسەی لەدەرونەوە بآ ئۆقرەیەو خاوەنی بیری خراپو ڕەشبینە، هەرگیز ناگاتە بەختەوەری[19] ئەوە کە پتر لەم پەیامەی زەردەشتدا سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە (نەزانین)، هۆی سەرەکی ڕاکێشانی مرۆڤ بەرەو خراپەیە.

کەوایە، یەکەمین مەرجی ئەم خەباتە پیرۆزە ئەوەیە کە هەمیشە هەوڵو کۆشش بدرێت بۆ پترکردنی زانیاریو هۆشی ئادەمیزاد هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە زەردەشت لەیەسنای 31 بەندی

17 یەکەمینو گرنگترین ئەرکی سەرشانی ئادەمیزاد بە خەبات لەڕێی بلاّوکردنەوەی زانیاری، هۆشیارکردنەوەی خەڵک، خۆفێرکردنو فێرکردنی خەڵک دەزانێت.

گووتمان کە لەئایینو باوەڕی زەردەشتدا، ئادەمیزاد لەلایەنی خواوە، ئازاد خولێقاوەو دەتوانآ چاکە یا خراپە بەویستی خۆی هەڵبژێرێت. هەروەها ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کە لەیاسای ئافراندندا کە بە (یاسای ڕاستی) ناوی لێبرا، ئاهورامەزدا تەنیا (چاکە)ی ئافراندووەو ئەمە ئادەمیزاد خۆیەتی کە بەبیرێکی خراپەوە (خراپە)ی خولێقاندووە.

کەوایە، بەمجۆرە (خراپە) لەکرداری خوادا نییەو لەبیری چەوتی ئادەمیزاد خۆی هەڵێقولآوە. لەبەرئەوە لەبریتی ئەوەی بێژین (چاکە)و (خراپە) لەئارادایە، خاستروایە بێژین (باش بیرکردنەوە)و (خراپ بیرکردنەوە) لەئارادایە ـ ئەم دووشەیە لەئاوێستادا بە شێوەی سپەنتامینوو ئەنگرەمەینو، هاتووە ـ

{مەینو، بەواتەی (بیر)ە سپەنتا بەمانای (خاس)، (دروستکەر)و (زێترکردن)هاتووە. ئەنگرە، مانای (کەمکردن)، (تێکدەر) یاخود (خراپە)یە. کەواتە سپەنتامینو، دەبێتە (بیری خاسو دروستکەر)، ئەنگرەمینو، دەبێتە (بیری خراپو تێکدەر)

ووشەی ئەنگرەمینو، کەوشەیەکی ئاوێستاییە، بەدرێژایی رۆژگار گۆڕاوەو بۆتە (ئەهریمەن).

کەوایە، لەڕاستیدا، ئەهریمەن لەفەرهەنگی ئاوێستاییدا (بون)و شێوەیەکی تایبەتی نییە، بەڵکو بە مانای بیری (خراپو تێکدەر) هاتووە. لەوتەکانی زەردەشت، ئەوەی کە پتر سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە ئەم پەیامبەرە مەزنە، پێش هەموو شتێك دیالەکەتیك لە(بوون) و(ژیان)دا پێشان دەدات، پاشان بنچینەی بیرو بۆچونەکانی ئادەمیزاد لەسەر ئەم شێوەیە (دیالەکتیك) دادەمەزرێنی.

بەلآم بەداخەوە، بەدرێژایی مێژوو، بەتایبەتی لەسەردەمی دوایینەکانی دەوڵەتی ساسانییەکانو پاش ئەوان (دەتوانین بێژین تا ئێستاش)، دەربارەی بیری زەردەشت ـ هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد کە زێتر لەگاتاکاندا خۆی دەنوێنآ، زۆر بە چەواشەوە باسکراوەو ئەوەی کە لێ وەرگیراوە زۆربەی زۆری راست نین.

ئەو بۆچونە دیالەکتیکەی زەردەشت دەربارەی ئادەمیزادو ژیانو بوون لەو سەردەمەدا هەیبووە، زۆر ناژیرانە گۆڕاوەو شێوەی شەڕو هەراو نەبەردی هەمیشەیی لەنێوان ئاهورامەزداو ئەهریمەنی بەخۆیگرتووە، لەکاتێکا ئەگەر خاسووردبینەوە لەگاتاکان دەبینین ئەوەی باسی لێکراوە بریتیە لەنەبەرد لەنێوان سپەنتامینوو ئەنگرەمینو. واتە بەگوێرەی بیری زەردەشت، شەڕو نەبەرد لەنێوان بیری خاسو دروستکەرو پاك، لەتەك بیری ناپاكو خراپو روخێنەرە.

كەوایە زەردەشت هەرگیز باسی شەڕو نەبەرد لەنێوان ئاهورامەزداو ئەهریمەنی نەکردووە، یاخود بە هیچ جۆرێك باسی دوو خوایی نەکردووە کەبڕی کەس ئێستاش باسی لێدەکەن.

ئەڵێبەتە هەروەکو گووتمان، ئاکامی بیرکردنەوەی خاسی ئادەمیزاد، وتەی خاس‌و کرداری خاسە. بە پێچەوانەی پاشینەی بیرکردنەوەی خراپی ئادەمیزادیش، وتەی خراپ‌و کرداری خراپە. ئەمانە گشتی لەکۆمەڵگای مرۆڤدا خۆیان دەنوێنن. کەوایە، خاستروایە بێژین:

(مرۆڤی خاس)و (مرۆڤی خراپ)، واتە، لەراستیدا، (چاکە)و (خراپە) لەجیهاندا نییە، بەڵکو ئەمە (مرۆڤی خاس)و (مرۆڤی خراپ)ە کە لەم جیهانەدا پەیدادەبێت.

لێرەدا لەوانەیە بۆ هەموو کەسێك ئەم پرسیارە بێتە گۆڕآ کە بۆچی ئەندێشە، ڕەوشتی خراپ وەدیدەهێنێت، ئایا ئەندێشە ناتوانێت هەمیشە (چاکە) بێنێتە ئارا؟ لەوەڵامدا دەگوترآ کە لەڕاستیدا (خراپە) لە(بوون) دا نەبووە، لەبەر ئەمە دروستکەرێکیشی نییە، چونکو شتێك کە نەبێت، ناتوانێت دروستکەری هەبێت. (خراپە) بریتیە لەبەشی بۆشایی یا سالبی (چاکە)، بەواتەیەکی دیکە بە بۆشایی یا سێبەری چاکە لەئەندێشەدا دەگوترآ (خراپە).

ئەم نمونەیەی لای خوارەوە، ئەم باسە پتر رۆشەن دەکاتەوە:

ژوورێکی بآ دەرگاو پەنجەرە بێنە بەرچاو کە بەهۆی چرایەك ڕووناك بۆتەوە، تا ئەوکاتەی چراکە داگیرساوە، دەبێژین کە دروستکەرو پێکهێنەری ڕووناکی ژوورەکە چراکەیە. ئێستا چراکە بکوژێنەوە، دیارە ژوورەکە تاریك دەبێت، لێرەدا، ئایا دەتوانین بێژین کـآ دروستکەرو یا پێکهێنەری تاریکي یەکەیە؟ بێگومان هەرچی تێ بیفکرین ناتوانین. دروستکەر یا بەدیهێنەری تاریکییەکە بناسین (چونکە تاریکی لەئارادا نییە تا دروستکەریکی هەبێت)، تەنآ دەتوانین بێژین کە پاش ئەوەی رووناکییەکە نەما(چراکە کوژایەوە)، تاریکی جێگەی گرتەوە، واتە تاریکی بۆشایی نەبوونی رووناکی پڕکردەوە. ئێستا کونآ لەبریتی ڕووناکی، چاکە، (روناکی = چاکە) ولەبریتی تاریکی، خراپە (تاریکی = خراپە) ڕەچاوبکەین، لەم حاڵەتەدا، دەبێژین کە هەرچی شتێکی خاسە خوا دروستی کردووە، بەلآم خراپە هەروەکو تاریکی ناتوانێت خوایەکی هەبێت، بەڵکو بەهۆی نەبوونی چاکە، خراپە دێتە ئارا.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بهێنین‌و ێیبەبێش دەزانم زۆر بەکورتی بێژم:

بەگوێرەی گوتەی گاتاکان، خوا، ئادەمیزادی وەك زیندەورێکی هۆشمەندو ئاگاو خاوەن هەست (شعور) ئافراندوەو هێزو توانای تێگەیشتن‌و هەڵێبژاردنی پێبەخشیوە بۆئەوەی بە ئاسانی بتوانێت ڕێگەی ژیانی خۆی هەڵێبژێرێت‌و چارەنوسی خۆی دیاری بکات.

لەگاتاکاندا بە هیچ جۆرێك ئاماژە بۆ چۆنیەتی ئافراندن، سەرەتاو دواییەکەی، هەنگاوەکانیو... نەکراوە، خوا، وزەو هێزی بزوێنەری جیهانەو لەجیهان جیا نییە. کات (زەمان)و شوێن(مکان)، بە شێوەیەکی نادیار (مبهم) پێکەوە ئاوێتەبون کە بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت وەسفی بکرێت.

هەرچی شتێك لەگاتاکاندا باسی لێکراوە بریتیە لەژیانو بەس، باسی ئافراندن تەنیا بەشێوەیەکی لاوەکی ئاماژەی بۆ کراوە. ئاینی زەردەشت بریتییە لەیاسای شێوەی ژیان، وەکەمتر باسی سەرو سرووشت (ماوراو الگبیعە) کراوە، بەڵکو خۆی لەسەر ڕوی گۆی زەوی دەبیناو باسی ئادەمیزادو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دەکات.

زەردەشت بە زمانێکی پاراوو بە شێوەیەکی فرە سادەو شیرینویستویەتی بە خەڵک ڕابگەیەنێت، ئەگەرکو بە چاوێکی روناکبینانەو گوێی کراوە بڕوانینە راستیەکان، دەگەینە ڕاستییەکی فرە مەزن، ئەویش ئەوەیە کە چارەنوسی ئادەمیزاد بەدەست خۆیەتی، خێروشەڕ دروستکراوی بیری خۆیەتی، داناییو تێگەیشتن، گرنگترین هۆن بۆ جیاکردنەوەی چاکە لەخراپە. ئەو کەسەی داناو ژیرە، ڕێگەی راستو دروست هەڵێدەبژێرێتو ئەو کەسەی گەوجو نەزانە بەرەو ڕێگەی چەوتو خراپە دەڕوات. ئەوانەی کە بەرەو ڕقو کینە کە دیاردەی خۆپەرستی، توڕەیی، دەمارگیری، زەبروزەنگو کوشتار، دوڕوییو ناپاکییە، دەرۆن، کۆمەڵگا بەرەووێرانیو ئادەمیزاد بەرەو هەڵێدێر دەبەن. بەلام ئەوانەی کە ڕوودەکەنە راستیو دروستیو یاسای سروشتی، داوێن پاکیو کاری خاس، جیهان پڕ دەکەن لەخۆشیو بۆ کۆمەڵگاش بەختەوەریو شادی دەهێنن.

بەشێوەیەکی گشتی، فەلسەفەی زەردەشتو مەزد یەسنا (مەزداپەرستی _ خواپەرستی)، بریتیە لە تێکوێشانو ململانێکردنی توند دژی شەڕو خراپە. زەردەشت بەو ڕەوشەی گرتبویە بەرو خستبویە بەرچاو کە بریتیە لە ڕێکنەکەوتن لەتەك خراپەو ناڕاستی، ئەوەی ڕونکردوێتەوەو سەلماندویەتی کەهەرگیز لەتەك بیری ئەهریمەنی سازش ناکات.

لەئاینی زەردەشتیدا، هەرکارێكو هەوڵێك ببێتە هوێی ئەوەی ژینگەی گوێی زەوی ئاوزەدان ترو جوانترو چاکە بەهێزو خراپەو ناڕاستی لاوازتر بکات، بەسەرکەوتن هەژمار دەکرێت.

زەردەشت، باس لەپەیوەندی نێوان ئادەمیزاد لەتەك ئەم جیهانە پڕ لەنهێنیەو باسی ئەرکی سەرشانو پێویستیەکانیو چارەنوسو چلوێنایەتی سەرکەوتن بەسەر گرفتەکانی ژیان دەکات.

بەپێچەوانەی بڕێ لە فەیلەسوفەکان، زەردەشت سەبارەت بە خوێشبینی توندڕەوی ناکات، دەبێژێ ئەم جیهانە بێ خەوش نیە، بەڵکو بەرەو بێ خەوشیەتی دەڕوات، ئێمە کە خوێمان بەژیرترینووشیارترین ئافەریدە لەسەر ڕووی زەوی دەزانین، دەبێت بەردەوام تێبکوێشینو هەوڵ بدەین بوێ پێشخستنی کوێمەڵێگا تابگەینە بێ خەوشیەتی.

زەردەشت سەلماندویەتی کە ئەم جیهانە، جیهانی گەشەو پێگەیاندنە، وە ئادەمیزاد چارەنوسی خۆیی بەدەست خۆیەتی. بۆیە بەیەکەمین کەسێك دەژمێردرێت کە ئاینی پاك کردوێتەوە لەسیحرو جادوو ئەفسونو ئەنجامدانی ڕێو ڕەسمی هەڵەو باوەڕ بە ئەفسانەو بەرپەرچی هەموو ئەمانەی داوەتەوە، وە ئەوسا ئاینی لەسەر بنچینەی ئاکار دامەزراندووە.

موێلێتن، سەبارەت بەمە لە کتێبی Early Zoroastrianism دەبێژێ

((زەردەشت لەوبیرمەندە پێشرەوانەیە کە ئاینو پەیامەکەی خوێی لەسەر بنچینەی ئاکاری دامەزراندووە. ئەو عەودالْی ئاسمانێکی نوێو زەویەکی نوێ بوو کەلەسەرەتاو پاشێنەکەیدا، ڕاستیو دروستی فەرمان ڕەوا دەبێت.))

زەردەشت، ئاکارو خوورەوشتی بەرزی بەگرنگترینو بەنرخترین ئامانجی ژیان هەژمار کردووەو بەڕاشکاوی بە خەڵک دەبێژێ کەتەنیا بیرو کردارو گوفتاری خاسە کەدەتوانێت وەڵامی پێویستیەکانی ئاکاری بداتەوەو ژیانی مرۆڤ بەرەو پێشەوە بەرێتو گەشەی پێ بکات. ئەو بەهوێی بانگەشەی ئەم ڕاستییە کەسەختترین سزای خراپە کاران بریتییە لە نائارامیویژدان، ئەوەی پێشان داوە کەتا چ ئەندازەیەك چوێتە نێو قوڵایی ڕوێحو دەرونی ئادەمیزاد، وە ئاگایی لەنهێنییەکانی بووە.

## یەکتاپەرستیو ئاینی زەردەشتی

ئایین (دین)، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە بۆ ئاسودەیی ئادەمیزاد هاتۆتە ئارا، وپشتاوپشت لەوەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دیکە هاتۆتە خوار.

ووشەی (دین) لەووشەی ئاوێستایی (دەئنا)وە وەرگیراوە کە بەمانایویژدان یا توانایي ئادەمیزادە بۆ بیرکردنەوەو جیاکردنەوەی چاکە لەخراپە.

ئیمڕۆوشەی (دین) بەمانای ڕآو ڕەوش بەکاردێت، واتە ئایین یا (دین) ڕآو ڕەوش یاخود دەستورو یاسایە کە بۆ گەیشتنە ژیانێکی خاسترو بەختەوەرترو پێشکەوتوترو گەیشتنە دوندی مرۆڤایەتی لەگشت بوارەکانی ژیاندا. واتە ڕزگاربون لەهەموو ئەو بەرهەلێستانەی ڕێگە لەگەیشتنە رزگاری دەگرن. ئایین بریتیە لەکۆمەڵێك یاساو فەرمان کە لەسەرو گشت یاساو فەرمانە کۆمەڵایەتی، ڕامیاریو ئابوورییەکانە. بڕی لەزانایان دەبێژن کە ئەم تاریفە هەمیشەو لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بەم شێوەیەو چونیەك نین. دەبێژن مەرج نییە هەموو فەرمانە ئاینیەکان لەسەرو یاسا کۆمەڵایەتییەکاندا بن، بەڵکو:

ئەو فەرمانو یاسایانە لەسەرو یاسا کۆمەڵایەتییەکانن کە لەهەموو کاتو شوێنێکدا شایانی بەکارهێنانو جێگەی ڕەزامەندی خەڵک بن. ئەم تاریفە دەربارەی یاسا ڕەوشتییەکان دروستن، واتە ئەو یاسایانەی دەربارەی پەیوەندی نێوان تاکە کەس لەتەك کۆمەڵدا دەدوێن وەك: ڕاستی،

دروستی، میهرەبانی، فیداکاری.... بەڵام فەرمانو یاساکانی دیکە کە خۆیان دەقورتێنە نێو تایبەتکارییەکانی کەسی وەك: پەیوەندی ژنو مێردایەتی، دابەشکردنی میرات، کارە پیشەیی‌و بازرگانییەکان، یاساکانی سزاو تۆڵە.... لەم تاریفە بەدەرن‌و بەگوێرەی شوێن‌و کات‌و کۆمەڵگا دەگۆڕێن.

بۆ بەراوردکردنی ئاینەکان‌و هەڵێسەنگاندنیان، دەبێ بێژین کە:

لەکۆمەڵگای ئیمڕۆی مرۆڤایەتیدا، ئەو ئاینە زێتر پەسەندو پلەو بایەخێکی بەرزی بۆ دادەنرێت کە یاسا ڕەوشتییەکانی پتربێت. وکەمتر خۆی بەئیشوکارە تایبەتییەکانی ئادەمیزادەوە خەریك کردبێت. ئەو جۆرە ئاینانە هەمیشەو لەهەموو کاتو شوێنێکدا شایانی ئەوەن کە بە ئاینێکی ڕێنماو ڕاست پەسەند بکرێن.

لێرەدا پێویستە بێژین کە ئەگەرکو ئامانجی ئایین گەیشتنە بەهەشت‌و دورە پەرێزی لەدۆزەخ بێت، وئەنجامدانی ڕێ‌و رەسمی تایبەتی ئامرازێك بێت بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجە، ئەوسا دەبینین لەبریتی ئەوەی ئایین ڕێنماو هاندەری ئادەمیزادبێت بۆ گەیشتنە چاکەکارییەکانی مرۆڤایەتی بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆی مایەپوچی‌و دواکەوتن‌و ڕیایی‌و مەعامەلەکردن. ئامانجی ئاینی ڕاستی بریتیە لەپێشاندانی ڕێگەی ڕاست بۆ گەیشتنە بەختیاری‌و ئارامی‌ویژدان‌و بەهەشتی دەرونی کە هیچ پێویستیەکی بە دەڵاڵو ناو جیگەرو تکاکار نییە، بەڵکو تەنیا دەبی لەڕێگەی پتەوکردن‌و بەهێزکردنی ئەم چاکەکارییانە بین‌و هەوڵو کۆشش بدەین بۆ گەشەپێکردن‌و پەرەسەندنی کۆمەڵگا.

دەربارەی ئەم ئاینەی ئیمڕۆ بە نێوی ئاینی زەردەشتی دەیناسین، دەتوانین بێژین کە لەتەك ئەوەی لەهەموو ئاینە یەکتاپەرستییەکان کۆنترە، لەم ڕووەوە پتر لەزۆربەی ئاینەکانی دیکە شایانی سەرنجە چونکو تیایدا بە تەواوەتی دەربارەی ڕەوشت‌و گشت ئەو باسو مەسەلانەی کە لەیاسا نەگۆڕەکانن، لەهەموو کاتو شوێنێکدا باسی لێکراوە.

لەم ئاینەدا، بەدیدێکی زانستیانە هەموو پرسێکی تێدا ڕەچاوکراوەو گفتوگۆی لەسەر کراوەو هەڵێسەنگێردراوە، پاشان ئەوەی بەسوودی کۆمەڵگابوبێت، هاندراوە کە ئەنجام بدرێت‌و ئەوەی بە زیانی کۆمەڵ بوبێت دورەپەرێزی لێکراوە، بەڵام سزای تایبەتی بۆ دانەنراوە، چونکو سنوردانان‌و چۆنیەتی‌و چەندایەتی سزا لەو رستە یاسایانەن کە لەتەك گۆڕینی کاتوشوێندا دەگۆڕێن (زیاد یاخود کەم دەبن).

بۆ نمونە: زەردەشت دەبێژێ: دزی کردن کارێکی خراپ‌و ناپەسەندەو پێویستە هەموو کەسێك لێی وەدوربێت، بەڵام چۆنیەتی‌و چەندایەتییەکی تایبەتی بۆ سزادانی ئەم کارە خراپە دانەناوە. چونکو سەرەتا هەوڵی داوە ئەم کارە ئەنجام نەدرێت‌و هیچ کەس پێویستی بەوە نەبێت دزی

بکات، واته دزێتی بنبر بکرێت. بەڵام ئەگەر کەسێك دزی کرد، ئەوا شوێنو کاتو کۆمەڵگای ئەو سەردەمە بڕیار لەسەر شێوەی سزا دەدات.

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد، نەتەوە ئارییایەکان لەپێش زەردەشتدا فرەخوایی بون Polytheisme، واتە باوەڕیان بە چەندین خوا هەبووە کە بۆ هەریەکەیان بەجیا قوربانییان دەکرد، بۆئەوەی لەڕقو تورەییان کەم بکەنەوەو بۆ ئەم مەبەستە پێویستیان بە کەسانێك بو کە ببنە نوێنەریان، واتە لەنێوان خەڵکو خواکاندا دەلاڵی بکەنو لەتەك قوربانی کردندا خەریکیوێرد خوێندن بن. ئەم دەلاڵیەتەو دابونەریتە تایبەتییە کە پڕبوو لەئەفسانەی جۆراوجۆر، بە شێوەیەك کاری کردبووە سەر کۆمەڵگاو خەڵک، کە بەتەواوەتی لەکاری خستبونو توانای بیرکردنەوەیانی لـآ زەوت کردبوو، لەڕاستییەکانی ژیان وەدوری خستبونەوە، چارەنوسی خۆیان بەستبۆوە بەویستو ئارەزووی خواو هێزە سەرو سروشتییەکان، بۆ وەدیهێنانی ئارەزوەکانیان پەنایان دەبردە بەر ئەو تکاکارو دەلاڵانە، ئەوانیش بە ئارەزوی خۆیان خەڵکیان دادەدۆشیو هەوڵیان دەدا خەڵکی لەو بارەدا بهێڵێنەوە بۆئەوەی بیر لەهیچ شتێکی نوێ نەکەنەوە.

ململانێ کردنی زەردەشت لەتەك نەریتی فرەخواپەرستی، پتر لەوەدا خۆی نوێندوە کە بەڕاشکاوی گشت ئەو خوا جۆراوجۆرانەی پوچ کردەوەو بانگی بونی خوایەکی تاکو تەنیاو ژیری بە گوێی خەڵکاداو داوای لێکردن کە دەست لەو بیرە پوچانە هەلێگرنو پەنابەرنە بەر هۆشو ئەقڵی خۆیان بۆئەوەی ڕاستی یان بۆ ئاشکرا بێت.

ئیدی بەرەبەرە بازاڕی دەلاڵەکان کزبوو، خەڵک هوشیاربونو ڕاپەڕینو ڕێی ڕاستیان گرتەبەر.

لەڕوانگەی بیروباوەڕی زەردەشت، مرۆی خاوەن ئیمانی ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە کە پەیڕەوی لەڕاستی دەکاو ڕێبازی ڕاستیو دروستی دەگرێتەبەر، وهەڵسوکەوتی بەگوێرەی بیرو کردارو گوفتاری خاسە.

بە پێچەوانەوە، مرۆی بآ باوەڕ کە پێی دەبێژرێ (کافر)، ئەو کەسەیە کە پەنا دەبێتەبەر درۆو دەڵەسەو هەمو جۆرە خراپییەك.

زەردەشت، دژی ئەفسانەو دابونەریتی کۆنەپەرستی بو کە دژی کۆمەڵگابون. قوربانی کردنی ئاژەڵ بۆ هەر خوایەك بێت بەکارێکی ناڕەواو ناشیرینی دەزانێت.

لەبەر ئەوەی زەردەشت تەنیا بیری لەخۆشیو تەباییو پەرەسەندنی کۆمەڵگا دەکردەوە، ودەیویست مرۆڤ باش بیربکاتەوە، هەموو هێزو توانای خۆی لەم ڕێبازەدا بەکارهێنا، بۆیە

زۆر بەتوندی دژی هەموو ئەو دەلآلآنە (کاویو کەرپن)ەکان ڕاوێستاو ململانێیەکی یەکجار سەختی لەتەکا کردن.

خوالێخۆشبو پورداود لەم بارەوە دەبێژێ:

(زەردەشت بە ئاشکرا بانگیدا کە مەزدائاهورا پێویستی بەقوربانیو خوێنی (گا) و (پەز) نییە، تەنیا نیایشو پەرستنێك کە دەتوانآ بگاتە بارەگای خواو پەسەندی بکات، بریتییە لەڕاستیو بەس. هەرکەسێك زەوی بکێڵێو کشتوکاڵ بکاتو ئاژەڵی سودمەند بەخێوبکات، لەم جیهانەو رۆژی پەسلآن خوا لەخۆی ڕازی دەکات.)

جەلالەدینی ئاشتیانی، زۆر جوانی پێکاوە کە دەبێژێ:

((یەکآ لەهەرە گرنگترین شاکارەکانی زەردەشت ئەوەیە کە چەندین نێوانجی رەوشتیو معنوی لەنێوان ئادەمیزادو خوا هەڵێبژاردووە. بۆ نیزیك بونەوە لەخوا، لەبریتی ئەوەی دەست بە دامانی کاهنو کەشیشو ڕابەرانی ئاینزاکان بین، وڵیان بپارێینەوە، دەبێ خۆمان بەو ئاکارە (صفات) خواییانە برازێنینەوە وەك: راستی(ئاشا)، بیری خاس(وەهومەنە)، توانایی (خەشترا)، خۆشەویستی (ئارمەئیتی)و....

ئەمانە پردێکن لەنێوان ئادەمیزادو خوادا کە نە پەرستشگایەکیان هەیەو نە کاهنو کەشیشو نە ڕێوڕەسمێکی تایبەتی، تەنانەت هیچ شێوەو ڕوخسارێکی مادیشیان نییە، ئەمانە بریتین لەو فەزیلەتانە کە دەتوانین بەهۆیانەوە خوا بناسینو هەرکە پآ گەیشتین لەخوا نیزیك دەبینەوەو دەبینە ئاهورایی، چونکو ئەمانە خودی ئاهوران).

دەزانین، گشت ئایینە یەکتاپەرستییەکان باوەڕیان بەوە هەیە کە خوا هەموو شتێکی ئافراندووەو ئاگاداری گشت شتێکە. بەلآم لەتەك ئەمەشدا سوپایەکی بآشومار لەکەشیشو لاویو مەلاو... دروست بووە بەبەهانەی ئەوەی نێوانجی نێوان خواو خەڵکن، سواری سەری خەڵکی نەفامو بآ ئاگابونو کۆمەڵگایان بەرەو هەڵێدیر بردووە.

زەردەشت زۆر ئازایانەو هۆشیارانەو بآ پەروا، بەرەنگاری ئەو سوپا دژ بە مرۆڤایەتییەوێستاوەو جاڕی داوە کە ئەمانە درۆزننو دژ بە مرۆڤایەتینو هیچ جۆرە پەیوەندیەکیان لەتەك ڕاستیو خواپەرستیدا نییە.

لەمێژووی ئاینەکانی جیهاندا، دەبێ زەردەشت بەکەسێك دابنێین کە گەورەترین گۆڕانکاریی بەدیهێناوە کە بریتیە لەباوەڕ بە خوایەکی تاکو تەنیا کە تایبەت بەهیچ نەتەوەو تاقمو خێڵکی دیاریکراو نەبووە، لەهیچ شوێنێکی تایبەتی نەبووەو لەهەموو شوێنێکدا هەیە، بووەو هەمیشە دەبێت، ئافەریدەگاری گشت کەشکەلآنو بوونە.

زەردەشت، بە خەڵک ڕادەسپێرآ کە لەبریتی پەنابردنە بەر ئەو هەموو ئەفسانانەو خاوە دان بە پیاوە ئاینیە درۆزنەکان، لەبری گریانو لەخۆدانو دوعاو نزا کردن، دەبێ پشت ئەستور بەکارو کرداری خۆمان بین، وبۆ سەلماندنی پەرستنی ڕاستەقینەی خوا، پێویستە بەکردەوەو باوەڕ بەراستیو دروستی بیسەلمێنین. وەك مرۆیەکی ڕاستو ئازاد، لەڕێی ڕاستیدا هەنگاو هەڵێبێنین، مرۆڤی ئازاد پێویستی بە لغاوو پەنا نییە. پشتوپەنای ڕاستی ئەو جۆرە مرۆڤانە تەنیا کارو کردارو بیری خاسیانە.

تاگور لەم بارەوە دەبێژێ:

((زەردەشت خەڵکی فێری ئەوەکرد کەهیچ جۆرە دوعاو نزاو گریانێك جگە لەسوپاسو کرداری خاس، لەبارەگای ئاهورامەزدا پەسەند ناکرێت)).

ئەم جۆرە پەروەردەکردنە لەلایەن زەردەشتەوە، دوکانو بازاڕی دەستگاکانی پیاوە بەناو ئاینییەکانی ئەو سەردەمەی بآ مشتەری کرد، بۆیە زۆر بەتوندی بەرەنگاری زەردەشت بونەوە.

توێژەری بەنێوبانگی ئەلمانی، شدر، دەبێژێ:

((زەردەشت، تەنیا دامەزرێنەری ئاینێکی نوێ نییە، بەڵکو کەسێکە کە دژی ئایینو ڕەوشتی ئەو سەردەمەوێستاوە، شۆڕشگێڕێکە کە بۆ بەرژەوەندی هەژارانو بێدەرامەتان، دەنگی خۆی بەرز کردۆتەوە.))

ئەدولف راپ Rapp Adolf، ئێران ناسی ئەلەمانی، لەو باوەرەدایە کە دەستێوەردانی پیاوە ئاینییەکان (روحانیەت)و خۆتێهەڵێقورتاندنیان لە ئیشوکاری ڕامیاریدا، هەر لەکۆنەوە بۆتە هۆی ئەوەی ڕێگە لەپێشکەوتنی کۆمەڵگا بگیرێت، ئەم کارە لەئاینی زەردەشتیدا وەبەرچاو ناکەوێت.

گیگر، دەربارەی یەکتاپەرستی زەردەشتەوە، زۆر جوانی بێژاوە:

((.... پەیامی زەردەشت، مەسەلەی ئەو دوو هێزە کاریگەرە کە دیارگەی چاکەو خراپەی تەواوسەنگە، بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕوون لێکداوەتەوە. مەخابن لەپاش هێرشی عەرەبەکان بۆسەر زەمینی ئێرانو ڕەوکردنی زەردەشتیەکان بۆ خاکی هیندو سەرزەمینی چین، نەیارەکانی ئاینی زەردەشت ئەم دیارگەی چاکەو خراپەیەیان بە پەرستنو باوەڕ بە بوونی دوو خواکردو ئەهریمەنیان بەرامبەر بە ئاهورامەزدا دانا. ئەمە لەکاتێکدا کە دەبینین یەکتاپەرستیو ئاهوراپەرستی لەئاینی زەردەشتدا لەسەراسەری گاتاکاندا ئاشکرایەو هەر ئەم یەکتاپەرستیە وەك ئەستێرەیەکی گەش لەسەر تەوێڵی درەخشانی ئەم ئاینە دەدرەوشێتەوە.))

دکتور پوروالا دەبێژێ:

((... زەردەشت دەربارەی دوو گەوهەر ئاخافتووە، بەڵام فەلسەفەکەی بەهیچ جۆرێك مانای پەرستنی دوو خوایی نەبووە. ئەم دیاردەیە (پەرستنی دووخوا) لەقۆناغەکانی فرە دوایی دا کە ئەم ئاینە بڵاوبۆتەوە ئاوێتە بە ئاینی زەردەشت بووە، لەسەردەمی خودی زەردەشتدا، باوەڕ بەدوو خوا بەهیچ جۆرێك لەم ئاینەدا نییەو نابینرێت.))

دکتور پوروالا لە لێکدانەوەی گاتاکاندا (هات 30 بەندی 1و هات 41 بەندی 9) ئەمەی بۆ ڕووندەبێتەوە کە سپەنتەمینوو ئەنگرەمینو، هەردووکیان ئافەریدەی مەزدانو لەبەرئەوەی خۆیان ئافەریدەن، هەرگیز ناتوانن ئافەریدەگاربن. ئەمانە دوو ڕوی جیاوازی ئافراندنن کە بریتین لەژیانو مردن، ودوو قۆناخی کردەی توانایی خوان کە هەمیشە پێکەوەو دژ بە یەك، لەنێو خۆیاندا خەریکی ململانێن.

زەردەشت، هەموو جیهان بە گۆڕەپانێك دەزانێت کە تیایدا ململانێی هەمیشەیی لەنێوان دوو هێزی دژ بەیەك، واتە سپەنتامینوو ئەنگرەمینو بەردەوامە. دەبێژێ:

ئەم دوو هێزە هاوال دوانە دژ بەیەکە، لەهەمان کاتدا کە لەتەك یەکدیدا (مخالفن)و دژی یەکدین، تەواوکەرەوەی یەکترن. بونی ئەم دوانە پێکەوە (بوون) یان وەدەیهێناوە، بۆ نمونە وزەی (موجب)و (سالب)، لەهەمان کاتدا کە مخالفی یەکترن، بەڵام پێکەوە دەبنە هۆی دروستبونی کارەبا. وزەی (جاذبە) و(دافعە) دەبنە هۆی ئەوەی هەموو هەسارەکان لەکەشکەلآندا لەجێی خۆیاندابنو لەسەر هێلێێکی تایبەتی بسوڕێنەوە، ئەم یاسایە بەنەگۆڕی بمێنێتەوە.

چاکەو خراپە، جوانیو ناشیرینی، پەیوەندییان بە شێوەی بیرکردنەوەی خۆمانەوە هەیە. ئەوەی کە بەسوودمانە بەجوانی دەزانین، وئەوەی بەزیانمان بێت پێی دەبێژین خراپو ناشیرین.

لەروانگەی بیری زەردەشتەوە، هەرچی شتێك لەم جیهانە هەیە ئافەریدەی ئاهورامەزدایە، وخۆی لەخۆیدا خاسەو بۆ مەبەستێکی دیاریکراو دروستکراوە. بەڵام ئەوە ئێمەین کە خراپ بەکاری دێنین. بۆ نمونە، تریاك، مادەیەکە ئەگەر بەخاسی سوودی لێوەربگرین، لەزۆر لەدەرمانەکاندا بەکاردێت بۆ چارەسەرکدنی نەخۆشییەکان، بەڵام ئەگەر فرە بەکاربێت، ئەوا ژارێکی کوشەندەیە.

ئەنگرەمینو، لەسەردەمی ساسانیەکاندا بە شێوەی (ئەخرەمینو). و(ئەهرمنو)و لەپاشاندا (ئەهریمەن) ی لێهاتووە.

ئەم ئەنگرەمینویە ناتوانێت خراپەوێرانی دروست بکاتو بەرامبەر ئاهورامەزدا ڕابوێستێت. ئەهریمەن لەدەرونی مرۆڤدایەو بەهیچ جۆرێك بونێکی ئازادو سەربەخۆی نییە، بەڵکو پەیوەندی بە بیری خراپی بڕی کەسەوە هەیە. دەتوانین بێژین سپەنتامینوو ئەنگرەمینو بریتین لەخوی فریشتەییو سیفەتی ئەهریمەنی کە هەردووکیان لەنێو بیرو دەرونی ئادەمیزادەیە.

زەردەشت لە(هات 30 بەندی 3) دەبێژێ کە مرۆڤی نەزان دووچاری هەڵە دەبێتو دوی ئارەزوی مادی دەکەوێتو ڕێی ناراست دەگرێتەبەر. لەئاکامدا کاری خراپو دژ بە مرۆڤایەتی لێدەوەشێتەوە، وبەرەبەرە خوو رەفتاری نامرۆڤانە لەڕەوشتیا دەردەکەوێتو دەبێتە نمونەی ئەهریمەنێکی ترسناك لەلەشی ئادەمیزاددا. بەڵام مرۆڤی ژیرو دانا ڕێگەی راست هەلێدەبژێرێتو بەسەر ئارەزووە مادیەکانی خۆیدا زاڵ دەبێتو بەهۆی کردارە خاسەکانیەوە، خوو رەفتاری فریشتانەی دەبێت لەلەشی ئادەمیزاددا.

ئێستا ئیدی زۆربەی توێژەرانو زانایانی گەورەو بەنێوبانگی جیهان لەو باوەڕەدان کە بنچینەی ئاینی زەردەشت (لەروی ئیلاهیاتەوە) لەسەر بناغەی یەکتاپەرستی دارێژراوە.

بەڵام لەرۆژگارانی کۆندا بەهۆی باسی خێرو شەڕ، یا چاکەو خراپە. لەنێو ئەم ئاینەدا، وای لەتوێژەران کردبوو کە بکەونە هەڵەیەکی گەورە، وبێژن ئەم ئاینە باوەڕی بە دوو خوای جیاوازی دژ بەیەك بووە. یەکێ لەو هۆیانەی کە ئەو توێژەرانەی لەم بارەوە خستبووە هەڵەوە، دەتوانین بێژین کە بەداخەوە رەفتاری خودی پیاوە ئاینییەکانی ئەم ئاینەبون، بەتایبەتی لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکان کە ئەم ئاینە پیرۆزە سەردەمی نشوستی خۆی دەپێواو بەرەو نشێوی دەڕۆیشت.

پاشان نووسەرە ئیسلامییەکان بەگوێرەی ئەو بەڵگەناپەسەندانەی ساسانیەکان، پتر پروپاگەندەی ناجۆریان دەربارەی ئەم ئاینە بلاّو دەکردەوە کە گوێیا ئەم ئاینە باوەری بە زێتر لەخوایەك هەیە.

لەسەرەتای چەرخی ئاوێستا ناسیدا، رۆژ هەلآتناسەکانیش لەبەرئەوەی تازەکاربونو دەربارەی ئەم ئاینە زانیارییەکی تەواویان نەبووە، ئەوانیش گیرۆدەی هەڵەدەبوونوایان بلآوکردەوە. کەئاینی زەردەشتی، ئاینێکی دوو خواییە Dualisme ئەو سەردەمەش بەسەرچوو. لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیووردو قولاً بە شێوەیەکی زانستیانە دەستی پێکردو بەڵگەی زانیاریو ئەقل پەسەند سەلماندیان کە شێوە سەرەتاییەکەی ئاینی زەردەشت، باوەڕکردن بە خوایەکی تاکو تەنیابووە، زەردەشت یەکەمین کەسێك بووە کە بانگەوازی لەنێو خەڵکدا داوەو باسی یەکتاپەرستی کردووە.

## ئاهورامەزدا ـ (پەروەردگاری دانای مەزن)

خوای یەکتاو بێهاوتای ئاینی زەردەشت، ئاهورامەزدایە. ئەم نێوە لە(گاتا)کاندا بەم شێوانەیە: ئاهورامەزدا، مەزدا ئاهورا، ئەهورمەزد، مەزدا وە ئاهورا، بڕی جار کورت کراوەو بۆتە: ئورمزد. هورمزد. ئاهورا، مانای سەروەرو پەروەردەگارە. مەزدا پێك هاتووە لە (مەز + دا)، مەز بەمانای مەزنە،دا، مانادانایە. واتە (مەزدا) دەبێتە (دانای مەزن) یاخود (دانای تەواوسەنگ). کەواتە،وشەی ئاهورامەزدا، مانای (پەروەردگاری دانای مەزن)ە. گەر باش سەرنج بدەینە مانای ئەم وشەیە، دەبینین لەنێو هەموو ئەو ناوو سیفەتانەی بۆ خوا دانراوە، تەنیا

دوو سیفەت لەوانە بۆ ناوی خوا هەڵبژێراوە، شایانی باسە لەنێو گاتاکاندا ئەم دوو سیفەتە هەرگیز پێکەوە نەهاتوون، بەڵکو لەبەشەکانی دیکەی ئاوێستادا (ئاهورا)و (مەزدا) پێکەوە لکاون.

بەبۆچونی فرە لەزانا کۆمەڵایەتییەکان، سیفاتو تایبەتکارییەکانی خوای هەر نەتەوەیەك، نیشانەی بۆچونو بیروهۆشو زانیاری ئەو خەڵکەیە کە پەیامبەرەکانیان بە نوێنەرایەتییان لەچوارچێوەی فەلسەفەیەکی دارێژریچ بوونێك لەوێنەی نییە، هیچ شتێك جودا لەونییە، بەتەنیا وەدیهێنەری گشت بوونە، درەخشانترین ڕووناکییەکانە، دوندی گشت بلندییەکانە، کۆنتر لەهەموو کۆنەکانە، باشتر لەهەموو خاسەکانە، بێهاوتایە، بآ رەقیبو بەتواناترینو کامل ترینە، نەگۆڕە، بووەو هەیەو هەردەمێنآ، بزوێنەری هەموانە، شایانی ستایشتو پەرستنە، بەخشەندەی شادیو خۆشیو کامەرانییە، مەزنان مەزنترە، فەرمانڕەوایە، یاسادانەرە، داناترینە، ئاگاداری هەموو شتێکە لەئاشکراو نهێنی، مامۆستاو ڕابەرە، فریو ناخوا، بەدیهێنەری ڕاستیە، بیری خاسی هێناوەتەدی، لێبوردەیە، بەخشەندەی ڕۆشەنبیریو هۆشمەندی خاسە بۆئەوەی هەرکەس بە شێوەیەکی ئازاد ڕێگەی خۆی هەڵبژێرێت، میهرەبانە، بە ئەندازەیەك میهرەبانە کە هەموو کەس دەتوانآ خۆی بگەیەنێتیو بە باوكو براو دۆستی خۆی بزانێت، یارو یاوەری گشت کەسێکە، هەموو ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە خۆشیان گەرەکەو هەروەك هاوەڵێك بەدەم هاوارآکانییەوە دەچێت، هەرگیز لەئافەریدەکانی خۆی توڕەو زویر نابێتو خراپەو بەدبەختیو نەخۆشییان بۆ ناهێنێت، هەرگیز داوای کۆیلێتیو پەرستنی کوێر کوێرانە لەئافەریدەکانی خۆی ناکات، بێزارە لەقوربانی کردنو گۆشەگیری،(لەڕوانگەی ئاهورامەزداوە، گۆشەگیریو عیباداتی کوێرکوێرانە هەرگیز چاکە نابەخشن، بەڵکو پەرستن لای ئەو بریتییە لەپەیڕەوی کردن لەبیروکرداروتەی خاس).

ئاهورامەزدا، لەوزەی هۆشی خۆیەوە ئادەمیزادی فێری زانیاریو حیکمەت کرد بۆئەوەی نهێنییەکانی جیهانو چۆنیەتی ئافراندن بزانن. ئەوانە بڕی لەتایبەتکارییەکانی ئاهورامەزدان، ئەو خوایەی کەوا هەزاران ساڵە پەیڕەوەکانی لەم جیهانەدا تا ئێستاش نیشانەی میهرەبانی، دۆستی، راستیو دروستی، ئاشتیو تەبایيو برایەتی بونو هەن.

ئەم تایبەتکارییانەی ئاهورامەزدا، کە گشتی لەئاوێستادا باسیلێکراوە، بۆ ئەوەیە کە ئاهورامەزدا بە خەڵک بناسێنآ، بەلآم بەگوێرەی سروودی گاتاکان، پێویستە ئاهورامەزدا بە چاوی دڵەوە بناسین، چونکو ئەو شتەی کە لەڕادەبەدەرە، ناتوانرێت بەوشەو سیفاتی دیاریکراو باس بکرێتو ناوببرێت.

زەردەشت، ئاهورامەزدا بە دیاردەی زانستو هۆش، ڕاستیو تەکوزی هەقو سەرچاوەی ژیانو پێگەیاندن دەزانێت. سەرانسەری گاتاکان بخوێنینەوە، تەنیا بۆ یەکجاریش باسی توڕەبون، زیزبون، تۆڵەسەندنو ڕكو کینەی ئاهورامەزدای تێدا نابینین.

لەبانگەوازەکانی زەردەشتدا، کارو ئەرکەکان بە تۆبزیو تورەییو هەرەشەوە بەسەر خەڵکدا نەسەپێنراوە، بەڵکو هەمیشە لەسەرەتاوە بە دڵێکی فراوانەوە، باسەکە ئاشکرادەکاتو پاشان بۆ هەڵبژاردنی رێگەی راستو هاتنەسەر ئاینی خواپەرستی، خەڵکی بەئازادی دەهێڵێتەوە بۆ هەڵبژاردن. ئاهورامەزدا، چارەنوسی لەناوچەوانی کەسدا نەنوسیوە. کرداری ئادەمیزاد خۆی رێگەی ڕاست یا هەڵە هەڵێدەبژێرێت.... بۆیە زەردەشت فرە بە ڕاشکاویو ئاشکرا دەبێژی کە ئادەمیزاد چۆنیەتی هەڵیسوڕاندنی ژیانو بەرزێتیو سامانداریێتیو رێزو.... ی خۆی بەدەست خۆیەتی. لەم ڕووەوە دەتوانین بێژین کە نە تەنیا لەم بوارەدا زەردەشت فەلسەفەیەکی تازەی ئاشکرا کردووەو بەس، بەڵکو جێگەو پایەیەکی تایبەتی بۆ ئادەمیزاد داناوەو بەرزی کردۆتەوە.

مرۆڤ، بەلای زەردەشتەوە بایەخێکی تایبەتی هەیە. لەقوتابخانەی بیری زەردەشتدا، پەیوەندی نێوان ئاهورامەزداو مرۆڤ، پەیوەندییەکی فرە ناسكو دۆستانەیە. زەردەشت هەروەك هاورێیەکی دانا دەروانێتە ئاهورامەزدا نەك وەك ئەربابو ئاغایەکی ستەمکاو تورە. زەردەشت بەچاوی رێزەوە دەڕوانێتە ئاهورامەزداو کرنۆش بۆ مەزنایەتیو شکۆمەندی دەبێت، بآئەوەی خۆی سووكو بآ بایەخ بکاتو وەك مرۆڤێك کەسێیەتی خۆی پێشێل ناکات.

ئاهورامەزدا، نەستەمکارەو نە تورەیە، بەڵکو بریتیە لەڕووناکیو چاکەی تەواوسەنگ. زەردەشت، هەمیشە داوا لەئاهورامەزدا دەکات (ئەو خوایەی هەمیشە یەکسانو نەگۆڕە) کە: بەهۆی ڕووناکی پیرۆزییەوە هەناومان رۆشەن بکاتەوە.

ئەگەرکوخاس بڕوانینە ئەم داخوازییە، دەبینین گشت نهێنیەکانی ئافراندنی تێدا ڕەچاوکراوە، کلیلی پێگەیاندنی مرۆڤە، گەڕانەوە بۆ خۆو پەنابردنە بەر هەناوی مرۆڤایەتی خۆ، ڕووناکی ئاهورامەزدا هەمان سیفاتی پێگەیاندنی ڕاستییە. ئەگەر هەناوو بیرو هۆشی ئادەمیزاد بەم ڕووناکیو سیفەتانە رۆشەن بێتەوە، ئادەمیزاد دەبێتە خوامانەند.

زەردەشت، لەنێو گاتاکاندا هەر لەسەرەتاوە رێگەی یەکتاپەرستی (خواپەرستی) بۆ خەڵک ڕوونکردۆتەوە. تەنیا لەرێگەی ئەو کارانەی کە بەهۆی ڕاستیو دروستییەوە ئەنجام دەبێت دەتوانین رەزامەندی خوا وەدیبهێنین. بیری خاس، باشترین ئامرازە بۆ نیزیك بوونەوە لەخوا، تەنیا لەژێر سێبەری ڕاستیەوەیە کە خەڵک دەتوانن بگەنە بەختەوەری لەژیانداو پاداشی ئەم جیهانەو جیهانی پاش مەرگ وەربگرن.

زەردەشت هەر لەسەرەتاوە دژی گەندەڵی، بەرتیل، فدیەو خەلآتو برێ دابونەریتی کۆنەپەرستی ئاینی بە مەبەستی وەرگرتنی پاداشت لەخوا بووە. لەم بارەیەوە:

مولتون دەبێژێ: ((ئەم باوەڕە کە خواو ڕاستی، هەردووکیان یەکێکن، لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بۆ یەکەمین جار لەلایەن زەردەشتەوە، وەك راپەڕینێکی مەزن بلآوبۆوە....))

بارتلومه دەبێژێ:

((ئەو شتە نوێیەی کە زەردەشت لەپەیامی خۆیدا بۆ هەموو مرۆڤی هێناوە ئەوەیە کە لەبریتی ئەو هەموو خوا جۆراوجۆرانەی ئەو سەردەمە، تەنیا یەك خوای داناوژیر یا ئاهورامەزدای بە خەڵک ناساند.))

هرتسفلد، لەو باوەڕەدایە کە زەردەشت گشت ئەو خوا کۆنانەی وەك: میترا، وەهرام، ئاناهیتا، وارونەو... کە لەو سەردەمەدا دەپەرستران، هەموویانی پوچەڵ کردەوەو لەخانەی دێو دایناون.

رودولف، بۆ بەرپەرچ دانەوەی بڕی لەو زانایانەی گوتویانە کە خوای زەردەشت(ئاهورامەزدا)، هەر لەکۆنەوە، واتە لەپێش زەردەشتدا، لەنێو نەتەوە ئارییاییەکاندا دەپەرسترا، دەبێژێ: هیچ یەکێ لەو زانایانە کە خاوەنی ئەم بیرۆکەیەن بەڵگەیەکی زانستیانەیان نەبووە، لەبەر ئەمە دەتوانین بێژین کە ئەم خوایە (ئاهورامەزدا) خوای زەردەشتەو بۆ یەکەمین جار لەگاتاکاندا باسی لێکراوە.

(دوش گمین)، وتەکانی ناوادیا، توێژەری هیندی بەراست دەزانێتو دەبێژێ: (.... ئەگەرکو ئاهورامەزدا لەپێش پەیدابوونی زەردەشت، لەنێو ئارییاییەکاندا دەپەرسترا، دەبوایە وەك خواکانی دیکە بۆ یەکجاریش بوایە سرودێکیان پێدا هەڵبیەستایە، هەروەك چلۆن بۆ میترا، ئاناهیتا، تیشتریاو.... یان بێژابوو. لەبەرئەوەی هیچ سرودێكو باسێك لەو بارەیەدا نەبووە، کەوایە دەتوانین بێژین، هیچ خوایەك بەناوی ئاهورامەزدا یا ئاهورا یا مەزدا، لەپێش زەردەشتدا نەبووە......)).

پروفیسور گرەی (Gray)، توێژەری ئینگلیزی دەبێژێ:

ئاینی زەردەشت فرە دوورە لەدوو خواپەرستی Dualisme بەڵکو لەڕاستیدا ئاینێکی یەکتاپەرستیە Honotmeisme.

ئەشپیگڵوویندیشمن دەبێژن:

((ئەگەر بەووردی سەرنجی گاتاکان بدەین، ئەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرادەبێت کە ئاینی زەردەشت ئاینێکی یەکتاپەرستیەو مانانوشەی ئاهورامەزدا لەگاتاکاندا هاوجوتە لەتەك بەرزترینو مەزنترین بایەخەکان، وتەنێ خوای ئاینی زەردەشتیە، هەروەك چلۆن (یەهوە) لەتەورات‌و (الله) لەئاینی ئیسلامدا دیاردەی هێزو توانایی یەکتاپەرستیە.))

مارتین هاوگ M. Haug، رۆژهەلاتناسی ئەلێمانی دەبێژێ:

((زەردەشت ئاینێکی یەکتاپەرستی وەهای بڵاوکردەوە کە فرە لەیەکتاپەرستی عیبرانییەکان بآخەوشترە.))

هینتس، مانای ئاهورامەزدای بەسەروەری دانا لێکداوەتەوەو دەبێژێ:

((لەنێو گاتاکاندا، ئاهورامەزدا بەشێوەیەکی یەکجار مەزن‌و بآهاوتا باسکراوەو دەربارەی یەکتابونیدا لەگشت سروودەکانیدا خۆی دەنوێنآ. بەبۆچونی زەردەشت، ئاهورامەزدا فرە مەزن‌و ڕاستی‌و بآخەوشە، خوا لەئاینی زەردەشتدا (لەنێو گاتاکاندا) نیسبەت بە ئاینە گەورەو جیهانییەکانی دیکە کە باوەڕیان بە یەکتاپەرستییە، لەڕوی ڕۆحییەوە فرە دەوڵەمەندترە. تەنیا پیاوێکی‌وا مەزن توانیویەتی پەیامێکی‌وا مەزن بڵاوبکاتەوە.))

ئێستا بابزانین زەردەشت چلۆن ئاهورامەزدای ناسیوە، بەبێوەڕی ئەو زاناو ڕۆژهەڵآتناسانەی کە دەربارەی ئاوێستاو ئاینی زەردەشت توێژینەوەیان هەبووە، سروودی(44)ی گاتاکان، یەکآ لەشاکارەکانی ئاسەواری بیروهۆشی ئادەمیزاد بوە لەسەردەمی کۆندا، زەردەشت، لەو بەشە لەپەیامە نەمرەکەیدا هەوڵ‌وکۆششی داوە نهێنیەکانی ئافراندن بە شێوەیەك باس بکات کە هەموو خەڵک لێی تێبگەن.

ئەو پرسیارانەی کە لەوەدیهێنەری زەوی‌و ئاسمانەکان دەکات دەربارەی نهێنینەکانی ژیان‌و ئافراندن، سروشت، کۆمەڵآیەتی، زانستی‌و.... بە شێوەیەکی وەها زانستانەیە کە وەڵامەکانی لەخودی پرسیارەکاندا وەدەستدەکەوێت، وزۆر بە ڕاشکاوی دەبێژێ:

((ئەی دادگەری مەزن‌و داهێنەر، بە بیرێکی بآخەوشو پاکو بەهۆی هۆش‌و ئەقڵەوە، تۆ بە داهێنەری گشت دروستکراوەکان دەزانمو دەناسم.))

لەم سروودەدا بە شێوەیەکی تەواوسەنگ، ئاهورامەزدا بە داهێنەری گشت زەوی‌و ئاسمانەکان‌و هەرچییەکی تێدایەو هەرچی ڕوودەدات، دەزانێ. هەروەها لەم سروودەدا بە هیچ جۆرێك باسی یاریدەدەر یا هاوبەش (شريك) بۆ ئاهورامەزدا نەکراوە.

زەردەشت، دیسانەوە لەسروودی 31 بەندی 8 دا دەبێژێ:

((ئەی مەزدا،

ئەوکاتەی کە بەئەندێشەوە تۆم ناسی،

بۆم ڕوونبۆوە کە

تۆ، سەرەتاو پاشینەی هەموو ((بوون))ی،

وتۆی سەرچاوەی بیری خاس.

وئەوکاتەی کە بە دیدی دڵەوە تۆم دی،

زانیم کە تۆی ئافەریدەگاری ڕاستەقینەی ڕاستی

وتۆی دادوەری کرداری هەموو خەڵک...))

((ئەو (ئاهورامەزدا)، یەکەمین بیرکەرەوەیە کە ڕووناکییەکەی گشت ئاسمانەکانی گرتۆتەوەو بەهۆی هێزو توانای بیروهۆشیەوە یاسای هەمیشەیی ڕاستی ئافراندووە، بۆئەوەی ببێتە یارو یاوەری بیرخاسان. ئەی سەروەری دانا، کە هەمیشە یەکسانی. بەهۆی ئەو ڕووناکییە پیرۆزەتەوە، هەناومان ڕۆشەن بکە.))

لەو سروودەدا، زەردەشت، ئاهورامەزدا بەسەرەتاو ئاکامی بوون دەزانێت، ئەو بوونەی کەوا بەچاوی ئاسایی نابینرێت، بەڵکو بەهۆی بیروهۆشەوە هەستی پێدەکرێت. ئەگەرکو بەچاوی دڵو هەناو بروانین، یەکەمین بیرکەرەوەیەك دەبینین کە گشت ڕووناکیو پڕشنگەکانی ئاسمانەکان لەبیرو ڕووناکی ئەو پێکهاتووە. ئەو بەهۆی هێزوتواناووزەی خۆیەوە، یاسای سروشتو ژیان کە بریتیە لەراستی(ئاشا)و بیری خاس (وەهومەن)ی ئافراندووە. ئەمانەی کردۆتە ڕووناکی بۆ ڕۆشەنکردنەوەی ڕێگەی ئادەمیزاد.

ئاهورامەزدا، لەڕوانگەی زەردەشتەوە بریتیە لەدیاردەی چاکە، پاکی، ئەڤینو خۆشەویستی. هاوڕآ لەتەك ئەم سیفەتانەو سیفەتەکانی پێشوو کە ئاماژەمان بۆکردن، ئەوەمان زێتر بۆ ڕووندەبێتەوە کە ئەو شۆڕشە کۆمەلآیەتییەی زەردەشت لەو سەردەمەدا بەرپایکرد، وکۆتوزنجیری ئەفسانەکانی لەدەستوپێی خەڵک پچراندو مرۆڤی ئازادکرد، وسآ بنچینەو ڕەچەڵەکی نوێی بۆ ئاینەکەی دانا کە بریتی بوون لەبیری چاك، وتەی چاکو کرداری چاك کە هەرکەسێك بە تۆزێك لەخۆبوردنەوە ئەنجامیان بدات، دەبینین پەیوەندی نێوان ئادەمیزاد دەگاتە بەرزترینو باشترین پلەو، دەتوانین بگەینە کۆمەڵگایەکی پڕ لەخۆشیو ئاسایشو تەبایی، بێگومان بۆ بەرێوەبردنو ئەنجامدانی ئەم ئاینە تازەیە لەو سەردەمە کۆنەدا، دەبوا خوایەکی داناو بەتوانا سەرپەرشتی ئەم ئاینە تازەو شۆڕشگێڕانەی بکردایە. خوایەك کە شیاوی ئەم باوەڕە پیرۆزەبێت. بەم شێوەیە، بە بیرو هۆشی خۆی، ئاهورامەزدای سەروەرو داناو بەتوانا. بە دروستکەری هەموو کەشکەلآن دەناسێت. ئاهورامەزدا لەتەك گشت خواکانی پێشوو جیاواز بوو، ئاهورامەزدا، خوایەکە کە ئەم جیهانەی ئافراندووەو یاسایەکی تایبەتی بۆ هەڵێسوڕاندنی داناوە، کە لەتەك سروشتو سازگاریووزەکانی بەرقەرار ماوەو دەمێنآ.

ئاهورامەزدا، دەربارەی باسەکانی سەرو سروشت (ماوراو الگبیعە) وردەکارییەکانی کە دێنە گۆڕآ، هیچ جۆرە پلانو نەخشەیەكو پێش داوەرییەکی پێش ڕوداوی دانەناوە.

ئاهورامەزدا، توانای هەلێبژاردنی بە خەڵک داوە کە لەنێو ڕاستیو درۆ، چاکەو خراپە بەشێوەیەکی ئازادانەو بەهۆی هۆشو ژیریتی خۆیانەوە، یەکێکیان هەلێبژێرنو چارەنووسی خۆیانو هەڵسوکەوتیان بەدەست خۆیانەوەبێت، تەنیا کارێك کە پێی هەلێدەستێت ئەوەیە کە بەهۆی هەلێبژاردەی خۆی (زەردەشت) ڕێگەی ڕاستیو دروستی پێشانی خەڵک دەداتو ئیدی خۆیان ئازادن بۆ هەلێبژاردن. واتە، چارەنووسی هەرکەس وەدەست خۆیەتی چ دەکات.

ئالێرەدا، مەزنایەتی ئەم ئاینە دەردەکەوێت. دەست تێهەلێنەسوراندن لەئیشوکاری سروشت، قایل بون بە هەلێبژاردنو چارەنووسی هەرکەسێك بەدەست خۆیو باسنەکردنو نەچونە بنجوبناوانی چۆنیەتی ئافراندن، ئەمانە هەموی بۆتە هۆی ئەوەی بڕوبیانوو (چلۆن)و (بۆ)کان دەربارەی ئاهورامەزدا لەم ئاینەدا بنبڕبکات. ئاهورامەزدا ئەقلو هۆشی جیهانە، بەبوهێنەرێکە کە تەنیا چاکەی ئافراندووە، هەمیشە خەڵک هاندەدا ڕێگەی ڕاستیو دروستی هەلێبژێرنو خەریکی کارو کۆشش بن.

لەیەسنا (هات 31 بەندی 7) دەبێژێ:

((ئەو کەسەی هەر لەسەرتاوە بیری لەڕووناکیو دڕەوشانەوەی ئەم جیهانە کردوە، کەسێکە کە لەووزەو توانای هۆشی خۆیەوە (ڕاستی) دروستکرد.))

هەروەها لەیەسنا (هات 31 بەندی 11) دەبێژێ:

((ئەی مەزدا،

هەر لەو ساتەوەو لەسەرەتاوە کە،

بەبیرو هۆشی خۆتەوە.

ژیانوویژدانو هۆشت بۆ دروستکردین،

وگیانت کردە نێو لەشمان،

وتوانایی گفتوگۆو کارکردنت پێبەخشین،

هەر لەوکاتەوەویستت کە ئێمە بە شێوەیەکی ئازاد

باوەڕو ڕآو رەوشتی ئاینی خۆمان هەلێبژێرین.))

بڕی ڕوداوی سروشتیو کۆمەلایەتیو... بۆ زەردەشت جێگەی پرسیارە، بۆیە ڕوی دەمی دەکاتە ئاهورامەزداو ئەم پرسیارانەی لێدەکات کە تیایدا لەقالێبێکی فەلسەفی باسی کێشەکانی جیهانو چۆنیەتی ئافراندن دەکا:

ئەی مەزدا ئاهورا

پرسیارت لێدەکەم

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرابکە،

کێیە ئەو کەسەی،

لەخوارەوە زەوی، ولەسەرەوە ئاسمانی بە بآ نشێوی

ڕاگرتووە؟

چ کەسێکە

ئاوو گژوگیای ئافرندووە؟

کێیە ئەو کەسەی

تیژڕەوی بە (با) و(هەور) داوە؟

وئەی مەزدا، کێیە ئەو کەسەی

ئەندێشەی خاسی هێناوەتە ئارا؟

هات 44 بەندی 4)

ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرابکە،

چ کەسێك،

هێزوتوانای معنوی (خەشترا) لەتەك پاکیدا(ئارمەئیتی) ئافراند؟

چ کەسێك بە داناییەوە

خۆشەویستی منداڵی خستە دڵی بابەوە؟

ئەز، هەمیشە تێدەکۆشم، ئەی مەزدا،

بەم پرسیارانەو بە بیری پاکەوە،

تۆ، بەئافەریدەگاری هەموو (بوون) بزانم

(هات 44 بەندی 7)

هەرکە بۆی ڕووندەبێتەوە کە جگە لەئاهورامەزدا، خوای گەورەو دانا، هیچ کەسێکی دیکە نییە کە ئافەریدەی ئەم شتانە بن، بۆیەکا لەیەسنا (هات31 بەندی 8) دەبێژێ:

((ئەی مەزدا،

ئەوکاتەی کە بەئەندێشەوە تۆم ناسی،

بۆم ڕونبۆوە کە

تۆ سەرەتاو پاشینەی هەموو بوونی،

وتۆی سەرچاوەی بیری خاس.

وئەوکاتەی کە بەدیدی دڵەوە تۆم دی،

زانیم کە تۆی ئافەریدەگاری راستەقینەی ڕاستی،

وتۆی دادوەری کرداری هەموو خەڵک.))

ئەمەیە باوەڕی زەردەشت بە ئاهورامەوزدا، خوای تاکوتەنیا.

ئالێرەدا دەبێژین، ئەگەر ئەم باوەڕو بۆچونە، هاوارو بانگەوازی خواپەرستیو باوەڕ بە تەنیا خوایەك نەبێت دەبێ چی بێت؟!

بەڵی، زەردەشت لەڕوی ئەقڵو هۆشو بەهۆی ژیرێتیو هۆشیارییەوە گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە تەنیا ئاهورامەزدای داناو توانا دەتوانێت ئەم جیهانەی وەدیهێنابێت، وهیچ هێزێکی دیکە ناتوانآ هاوبەشی بێت یا ڕی لەکارەکانی بگرێت.

هەروەك لەمەوبەر ئاماژەمان بۆکرد زەردەشت بەهۆی ئەقڵو لەرێگەی هۆشەوە، خوا بە خەڵک دەناسێنێت. خراپە لەزاتی خوای زەردەشت (ئاهورامەزدا) نییە، ئاهورامەزدا دورە لەتووڕەبون، گرژبون، زیزبوون، تۆڵەسەندن، بوغزو کینە، زەبروزەنگو زۆرداری. ڕێگەی ڕاستیو دروستی پآ نیشانداوین، ئەوانەی کە ڕێی ڕاستی هەڵە دەکەن بەگوێرەی یاسای سروشتی دووچاری رەنجو کێشە دەبن، ئەمە تۆڵەی ئاهورامەزدا نییە، بەڵکو بەگوێرەی یاسای سروشت، میوەی کرمۆڵی دەسترەنجی خۆیان دەخۆنو وەبەرهێناوی بیری کرچو کاڵی خۆیانە.

لێرەدا پێویستە ئەوە دوپات بکەینەوە کە: باوەڕ بە بوونی دووخواو پەیڕەوکردن لەئاینێك یا باوەڕێکی وەها، دەبێ لایەنگرانی ئەم باوەڕە چلۆن رێز لەهێزی چاکە یا خێر دەگرنو نیایشو نزای بۆ دەکەن، هەروا بۆ هێزی شەڕ یا خراپەش، هەمان کاربکەن. بەلآم ئەگەر بێتو هەموو گاتەکان بخوێنینەوە، بۆ یەکجاریش ئەم شتەی تێدا نابینین. بە پێچەوانەوە، هەمیشە زەردەشت دژی خراپەو درۆ قسەی کردووەو خەڵکی هانداوە کە دژ بە درۆو خراپە راوەستن، لەڕاستیدا ئەو شۆڕشەی زەردەشت بەرپایکرد هەر بۆ ئەم مەبەستە بوو کە ڕەگوڕیشەی خراپەو درۆ لە لەشی کۆمەڵگا دەرکێشێت، ئیدی فرە ڕونو ئاشکرایە کە ئەم ئاینە ناتوانآ ئاینێکی دوو خواپەرستی بێت.

بەلآم بابزانین بۆچی ئەم باوەڕەوا بلآوبۆتەوە کە ئاینی زەردەشتی ئاینێکی دوو خوا پەرستیە Dualisme

ئەم بۆچونەی هەندێ لەنووسەرانو توێژەران لەوەدایە کە بەهەڵەواتێگەیشتون ئەهریمەن Ahrimam یا ئەنگرەمینو Angra Mainyu هێزێکە بەرامبەر ئاهورامەزداو بەربەرەکانیو ململانێی لەتەکا دەکات.

ئێستا ئیدی ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕوونبۆتەوە کە لەگاتاکاندا هەرگیز ئەهریمەن یا ئەنگرەمینو بەرامبەر بە ئاهورامەزدا دانەنراوە، بەڵکو، هەروەکو چۆن باسی چاکە کراوە، هەروا باسی خراپەش کراوە. لەگاتاکاندا سپەنتامینۆ بریتی بووە لەبیری خاسو پاكو پیرۆزو ئەنگرەمینو، بیری خراپو بەدە. ئەم دوانە لەتەك بوونی ئادەمیزادا، بونو هەن.

زەردەشت لەیەسنا (هات 45 بەندی 27) دەبێژێ:

ئێستا دەربارەی دوو گەوهەر دەئاخافم،

کە لەسەرەتای ژیاندا، بوون.

لەو دوانە، گەوهەری پاك بەوی دیکەی گووت:

لەنێوان هەردوکماندا،

نە ئەندێشەو نە ئامۆژگاری، نە هۆش‌و نە باوەڕ،

نە گوفتارو نە کردارو نەویژدان‌و نە ڕەوانمان،

پێکەوە هاوجوت‌و سازگار نین.))

هەروەها لەیەسنا (هات 39 بەندی 4) دەبێژێ:

((هەرکە ئەم دوو گەوهەرە گەیشتنە یەك، ژیان‌و نەبوونیان لێدروست دەبێت.))

واتە، لەتەك ئافراندنی زەوی‌و جیهان‌و ئادەمیزاد لەلایەن ئاهورامەزداوە، وپەیدابوونی ئەم دوو گەوهەرە، ژیانی مادی‌و جیهانی هاتە کایە(واتە خولقاوی جیهانی مادییە). هەمیشە لەنێویاندا ململانێ، بەردەوامە، چونکو فەلسەفەی ئاینی خواپەرستی (زەردەشتی) لەسەر گەشبینی دامەزراوە. لەبەرئەوە دەبینین باسی ئەم ململانێیەو هەراو هوریایە، بەسەرکەوتنی سپەنتامینو یا بیرو ئەقلی چاك بەسەر ئەنگرەمینو کۆتایي دێت‌و ئاهورامەزدا هەر لەشوێنی خۆیەتی وەك پەروەردەگارو ئەقلی گشتی‌و تەواوسەنگ.

ئاهورامەزدا کە دیاردەی چاکەو میهرەبانی‌و دلۆڤانییە، لەجێگەی خۆی دەمێنێو جودا لەم دوو هێزە دەرونییەیە، خراپە یا ئەهریمەن کە دژی چاکەیە لەکۆتاییدا دەشکآو هێزو توانای نامێنآ، ئەم دوو هێزە لەنێو گاتاکاندا تەنیا وەك دوو هێزی (غیر مادی)ن. واتە، هێزێکی دەرونین کە کاردەکەنە سەر بیری مرۆڤ.

زەردەشت ئەوەندە هۆشمەندانەو ژیرانە ئەم کێشەیەی هێناوە، لێ‌ووردبۆتەوە، لیکیداوەتەوەو شیکردۆتەوەو بە جۆرێکی وەها باسیکردووە کە ئۆباڵی خراپەکاری‌و درۆو دەلەسەی لەملی ئاهورامەزدا وەدوورخستۆتەوەو گشت ئەمانەی خستۆتە ئەستۆی ئادەمیزاد خۆی.

بە پێچەوانەی تیۆرییەکانی ئایینە ئیبراهیمیەکان کە (خوا) هەموو شتێکی لە (هیچ)و(نەبوون) دروستکردووە، لەئاینی زەردەشتیدا، ئاهورامەزدا لەزاتی خۆی‌و لەوەی کە هەیەتی ئافەریدەکانی دروستکردووە، لەبەر ئەوەیە کە بەگوێرەی فەلسەفەی ئەو ئاینە، (بوون) فرە کۆنەو هەمیشە لەتەك ئاهورامەزداو لەئاهورامەزداوەیە،

لەئاینی زەردشتیدا، ئاهورامۆزدا هەرگیز پێویستی بە قوربانیو دابونەریتی جۆراوجۆر نییە. مرۆڤی ڕاستو خواپەرست دەتوانێت بە بیروکردارووتەی چاکی خۆی، خوا دلخۆشو خۆشنودو ڕازی بکات، هەروەها لەم جیهانەو لەپەسلاندا خۆی خۆشەویست بکات، بۆیە لەگاتاکاندا بە هیچ شێوەیەك باسی قوربانی کردن نەکراوە.

ئاهورامەزدا، داوا لەئافەریدەکانی ناکات شەوو رۆژواز لەئیشوکار بێنن‌و خەریکی پەرستن‌و نزاو نیایش بن، چونکو چاکە بەمجۆرە کردەوانە نایەتەدی، بەڵکو بە بیروکردارووتەی چاک وەدەست دێـت. بێگومان کەسێك کە گۆشەگیریو دەرویشی بکاتە پیشەی خۆی، هەرگیز سوودو قازانج بە کۆمەڵگا ناگەیەنێـت، جا ئەم جۆرە هەڵسوکەوتو کردەوانە کە سوود لەخش نین، هەرگیز خوا پێی رازی نابێت بۆیە زەردەشتیش بە باشی نازانێتو هەمیشە دژێتی.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە (باسی ئاهورامەزدا) بێنین، بەپێویستدەزانم زۆر بەکورتی ئاماژە بۆ خوای ئایینە یەکتاپەرستیەکانی سامییەکان بکەین، واتە ئاینەکانی جولەکە، فەلەو ئیسلام، ورِۆڵی ئاینی زەردەشتی لەم ئاینانەدا.

ئەگەر چاوێك بە تەورات، ئینجیل‌و قورئاندا بخشێنین، دەبینین بنەماو کۆڵەکەی ژێرخانی هەرسآ ئاینە یەکتاپەرستییە سامییەکان بریتیە لەباوەڕ بەوەی ئافەریدەگارو سورێنەری هەموو کەشکەلآن، خوایەکی تاکوتەنیایە. ئەم خوایە لەتەوراتدا (یەهوە)و لەئینجیلدا (باوکی ئاسمانی)و لەقورئاندا (الله)ی ناوە. لەنێو هەرسآ ئەم کتێبە ئاسمانیانەدا هەموو (بوون)و دروستبونی یەکەمین مرۆڤ (ئادەم) لەلایەن ئەم خوایەدا وەك یەك باسکراوە. بەلآم کاتێك دێنەسەر باسی خواو هەڵسوکەوتی لەئاسمان‌و زەویدا، دەبینین بەشێوەیەك ڕەفتارو کرداری لەهەریەك لەئاینەکان جیاوازە، کە زۆر چەتونە باوەڕ بکرێت کە ئەم سآ خوایە لەڕاستیدا یەکێکن.

نیازم نییە لێرەدا یەکەیەکە ئەم ئاینانە شیبکەمەوەو ئەوباسانەی لەمەڕ خوا کردویانە بیخەمە بەرچاو. تەنیا شتێك کە لێرەدا پێویستە باسی بکەم ئەوەیە کە خوا لای ئەم ئاینانە بڕی جار بەترسناك، تۆڵەسێن، فێلێباز، رژد، گرژ، بآبەزەیی.... و هەندێ جاری دیکە میهرەبان، دادگەر، بەخشەندە، پاکدڵ.. باسکراوە.

گەلـآ جار، خوا خۆی لەشێوەو سیمای ئادەمیزاددا دەنوێنآو دێتەلای پەیامبەرەکانی‌و لەتەکیاندا خواردن دەخواو قسەدەکات، زۆرانبازی دەکاو بڕی دەستور دەدا کە باسکردنیشی چەتونە. بآ فەرمان‌و دەستوری خوا، خۆشی‌و ناخۆشی بە کەس ناگات، هەموو سەرکەوتنێك لەوەوەیەو گشت نەوییەکانیش لەلایەن ئەوەیە، هەرکەسێك ڕزگاری بێت، ئەو ڕزگاری کردووەو هەرکەسێکیش تووشی گیرۆدەبێتو گومڕا، ئەو کردوویەتی، هەرکەس باوەڕ بە بوونی خوا بێنێت، کاری ئەوەو هەرکەسێکیش بەکافرێتی بمێنێتەوەویستو خواستی ئەوە. لەبڕی شوێندا لەم ئاینانە نوسراوە کە مەرامو مەبەستی خوا لەم روداوانەی کە ڕوو دەدات (چاك یاخراپ)و خەڵک خۆیان هۆکەی نازانن، بریتیە لەئەزمونکردنی ئەندازەی باوەڕیان، لەکاتێکدا دەبێژن

باوەڕ یا بآ باوەڕی هەرکەسێك بەستراوە بەویستو ئارەزوی خودی خواو هیچ کەسێك بۆ خۆی ئیختیاری نییە. بەلاَم هەندێ جار دەبێژن کە چاکەو خراپە لەئاکامی کارو کرداری ئەو کەسە خۆیەتی یا(بۆ ئادەمیزاد جگە لەو شتانەی کە بەهۆی تێکۆشانی خۆی ئەنجامی داوە، بەر هەمێکی دیکە نییە(لیس للأنسان إلاّ ماسعی) لەئاینە سامییەکاندا، چارەنووسی ئادەمیزاد لەپێشەوە بۆی دیاری کراوە، وئەو هەڵبێژاردنەی کە ئادەمیزاد خۆی دەیکات، پێشەکی لەناوچەوانی نوسراوەو ئادەمیزاد خۆی هیچ توانایەکی بەسەریەوە نییە[20]. ئەم یاسایە یاسایەکی زۆرەکی تەواوسەنگە (بە پێچەوانەی ئاینی زەردەشتی کە تیایدا مرۆڤ کەسێکە کە لەتەك هێزو توانای بیرکردنەوەو ئەقلێدا خولقاوە. لەبەرئەوە توانای ئەوەی هەیە بیربکاتەوەو ئازادانە لەنێوان (خێرو شەڕ)و(ڕوناکیو تاریکی) بۆ ژیانی خۆی یەکێکیان هەڵبێژێرێت، هەروەها بە ئەندازەی ئەو ئازادییەی هەیەتی لێپرسراوی کرداری خۆیەتی. تەنیا شتێك کە ئافەریدەگار لٌی دەوآ ئەوەیە کە ڕێگەی ڕاستیو دروستی هەڵبێژێرێت.)

فریمن کلارك، کە توێژەرێکی بەنێوبانگی مێژووی ئایینەکانەو نووسەری کتێبی (مڑاهب بزرگ)ە دەربارەی ئەم سآ ئایینە سامییە، بەکورتی دەبێژێ:

((خوای موسا، هێزو توانایەکی ترسێنەری هەیەو هەمیشە لەنێو ئافەریدەکانی خۆیدا دەژیو هاوبەشی گشت کارە دروستو چەوتەکانیانە. خوای عیسا هەم لەسەرو ئادەمیزادەو هەم لەنێو دەرونیاندایە. خوای محمد تەنیا لەسەرو ئادەمیزادەوەیەو وەك فەرمانڕەوایەکی تەواوسەنگ قسە دەکاو هەرگیز لەعەرشی خوایی خۆی نایەتە خوارەوە.)

## کارتێکردنی ئاینی زەردەشتی لەسەر ئایینە یەکتاپەرستیەکانی دیکە

لەسەدەی نۆزدەهەمدا، بەهۆی ئەو هەڵەیەی کە توێژەران تێی کەوتبون، دەربارەی شوێنو کاتی لەدایکبونی زەردەشت، هەروەها دەربارەی دێرێنێتی تەورات، ئەم بیرۆکەیە زێتر لەبرەودا بوو کە گوٚییا ئاینە بابلییەکانو عبرییەکان کاریگەرێتیەکی تەواویان بووە لەپەیدابوونی ئاینی زەردەشتیدا، بەلاَم ئێستا ئیدی بە تەواوەتی ئەوە ڕوونبۆتەوە کە زەردەشت زۆر لەپێش جولەکەکان ئاینو پەیامی خۆی بلآوکردۆتەوە. یەکآ لەگرنگترین جیاوازییەکان لەنێوان بیروباوەڕِی زەردەشتو پەیامی تەورات باسی ئاهورامەزداو یەهوەی خوای زەردەشتو جولەکەیە. لەتەوراتدا یەهوە وەك کەسێیەتییەکی مرۆڤانەو ئەفسانەیی باسی لێدەکرێت کە زۆر تورە، رژد، چاوچنۆکو گرژو حەسودە، وتەنیا تایبەتی بنی ئیسرائیلە کە دەبێ قوربانی بۆ بکرێت ئەویش بەرێورەسمێکی[21] تایبەتی. بەلاَم هەروەکو لەمەوبەر گوتمان گاتەکان بەتەواوەتی دژی ئەو هەموو ئەفسانانەیە کە لەتەوراتدا هەیەو ئاهورامەزدا خوای هەموو جیهانەو تەنیا بۆ ناوچە یا گەلێکی تایبەتی نییە، وگشت خەڵک بە ئازادی لەدایکبوونو ڕێگەی خۆیان بە ئازادی هەلێدەبژێرن، وچارەنووسیان بەدەست خۆیانەو هەموو کردارو گوفتاریان، بەهەشت یا دۆزەخیان بۆ دابین دەکاویژدانی ئارام گەورەترین پاداشتەو دلٌڕەشیو بآقەراری بالآترین سزایە بۆ ئادەمیزاد. کەوایە، تائێرە دەتوانین بێژین کە لەنێوان پەیامی زەردەشتو

ئاینی جولەکە هیچ جۆرە نیزیکی یەك نابینین. بەلآم، بەگوێرەی ئەو توێژانەی لەسەدەی بیستەمدا بەووردی ئەنجام داوە، ئاشکرا بووە کە پەیامی زەردەشت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆو نا ڕاستەوخۆ کاریکردۆتە سەر ئاینەکانی دیکە.

لەساڵی 1866 دا، Alexander Kohut کە خۆی حاخامێکی جولەکە بووەو لەگەورەترین توێژەرانی مێژووی ئایینەکان بووە، لەکتێبی Über die jüdische Angelologie und Dämonologie in ihrer Abhängigkeit vom Parsismus دا ڕوونی کردۆتەوە کە هەموو ئەو بۆچونانەی تەورات کە دەربارەی فریشتەکانو ئەهریمەن باسکراوە، یادگاری ئەو سەردەمە بووە کە جولەکەکان لەلایەن بابلیەکانەوە شکستیان خواردووەو بە دیلێتی گیراونو براونەتە بابل، واتە سەردەمێك کە جولەکەکان لەتەك ئاینی زەردەشتدا لەبابل ئاشنایەتییان پەیداکردووەو لەنیزیکەوە ئەو ئاینە کاری کردۆتە سەربیرو باوەڕیان.

دەزانین پاش ئەوەی کورشی هەخامەنشی بابلی گرت، هەموو دیلەکانی ئازادکرد، لەوانەش جولەکەکان بوون کە فرەیان گەرانەوە بۆ ئورشەلیم (قدس). جولەکەکان، ئەو زانیاریانەو بیرو باوەڕانەی لەئاینی زەردەشتیدا فێربوبون، لەتەك خۆیاندا بردیانەولآتی خۆیان. هەروەها لەماوەی ئەو دوسەد ساڵەی کە ئیسرائیل بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ لەژێر ڕکێفی دەوڵەتی هەخامەنشی دابوو، جولەکەکان زێتر ئاشنایەتییان لەتەك بیروباوەڕی ئاینی زەردەشتیدا پەیداکرد، وزۆربەی زۆری ئەو زانیاریانەیان لەناو ئەو تەوراتانەی کە لەو سەردەمەدا نوسراوەتەوەو نوسیوە، وئەو زانیارییانە لەنێو کتێبە ئایینیەکانی دیکەی دوای تەوراتیش بەرچاودەکەوێت، بەتایبەتی ئەو باسانەی دەربارەی مانەوەی ڕۆح، جیهانی پاش مردن، هەڵیسەنگاندنی کاروکرداری ئادەمیزاد لەرۆژی پەسلآندا، بەهەشتو دۆزەخ، ئەهریمەنو فریشتەکانو... لەتەك بڕی گۆڕانکاری (زیادکردن یا کەمکردنەوە)، ئەمانە هەموی لەئایینو بیروباوەڕی زەردەشتیدا وەرگیراوە. بۆ نموونە:

ناوی شەیتان (ئەهریمەن) بۆ یەکەمین جار لەتەوراتدا لەکتێبی (ئەیوب) وەبەرچاو دەکەوێت کەلەسەدەی پێنجەمی پ. ز نوسراوەتەوە. ناوی جوبرەئیلو میکائیل بۆ یەکەمین جار لەکتێبی (دانیال) لەسەدەی سێهەمی پ. ز نوسراوە. ئاماژەی ئینجیل بوێ ئەو حەوت فریشتەیەی کە تەختی خوایان هەڵگرتووە(مکاشف یوحنا، باب الاول ـ 4)و هەروەها لەقورئاندا کە باسی هەشت فریشتە دەکات کە عەرشی خوایان بەسەر شانەوەیە (سورە الحافە ـ ایە 17)، ئەمانە لەووتارەکانی (وەندیداد) وەرگیراون کە یەکێکە لەپێنج کتێبەکانی ئاینی زەردەشتی، کە دەبێژێ(ئاهورامەزدا لەسەر تەختی زێرینی خۆی دانیشتووەو حەوت فریشتە (ئەمشاسپەند) دەوریان داوە). هەروەها لەمەڕ زیندووبونەوەی مردووانو رۆژی پەسلآن، یەکەمین جار لەتەوراتدا لەکتێبی ئەشعیا (باب 26) وکتێبی (مکابیان باب 7) نوسراوەتەوە کە هەردووکیان لەسەردەمی هەخامنشییەکاندا بووە کە ئاینی رەسمیان ئایینی زەردەشتی بووە.

لەم بارەوە، لەنووسینەکانی ئاوێستادا (پاش گاتاکان) هاتووە:

(لەو رۆژەداواتە رۆژی پەسلآن، کاروکرداری هەموو کەسێك ــ چاکـو خراپ ـ بە شێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵێدەسەنگێرێت. دینکرد فصلی 25، بندهش 30، داتستان دینیك باب 23 ــ وە تەرازوی ژمێریار بە ئەندازەی تۆزقالێك لەچاکە یا خراپەی کەسێك سەروژێر ناکات، نە بۆ خاسانو نەبۆ خراپەکاران، نە بۆ شاو نە بۆ گەدا(مینوك خرد ــ کتێبی دوهەم).

هەر لەم بارەوە، خوا لەقورئاندا دەفەرموێ: ((ولەو رۆژەدا کارو کرداری هەرکەسێك لەتەرازوودا دەپێورێت، تەرازوو بە ئەندازەی دانەیە هەرزن بەسوود یا زیانی کەسێك قورس نابێت ــ سورە ئەنبیا ئایەتی 47)).

(فون گال)، زانای رۆژهەلآتناسی بەناوبانگی ئەڵێمانی کە کتێبی تەوراتو ئاوێستای شیکردۆتەوە، لەکتێبی Basileia ton Theon، چاپی بۆن 1926 دەبێژێ:

(.... ئەگەر ئاینی جولەکە پاش ئەوەی لەدیلێتی ڕزگاریان بووو لەسەردەمی کورش گەڕانەوە ئۆرشەلیم، بڕی گۆڕانکاری باشی تێدا پەیدابوو، هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە سەر کارتێکردنی بیروباوەڕی زەردەشتی). لەڕوانگەی توێژینەوەی (فون گال)، جولەکەکان پێش دوورخستنەوە بۆ بابل، بەهیچ جۆرێك باوەڕیان بەوە نەبووە کە رزگارکەرێك یا(مەسیح)ێك دێـت، بەلآم ئەم باوەڕەیان لەزەردەشتی یەکان وەرگرت کە دەڵێن(سوشیانس) یا رزگارکەری جیهان دێتو جیهان پڕ لەتەبایی‌و ئاسایش دەکا. ئەم بیرۆکەیەیان بە شێوەیەکی وەها پەروەراند کە سەرئەنجام بووە هۆی دەرکەوتنی مەسیح. بەواتەیەکی دیکە، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، مەسیحییەتیش لەبیرۆکەی ئاینی زەردەشتییەوە وەرگیراوە.

کاردینال فرانتس کونیگ کە ئەسقەفی گەورەی کلێسای کاتولیك لەنەمسابووە، لەساڵی 1964 دا لەکتێبێکی خۆیدا کە توێژینەوەیەکیووردی لەم بارەیەوە ئەنجام داوە، پتر لەسەد بەڵگەو بۆچونی توێژەرانو زانایانو تەورات ناسانی جیهانی رۆژئاوای باسکردووە کە تیایدا باسی کارتێکردنی بنەڕەتی ئاینی زەردەشتی لەئاینەکانی جولەکە، فەلەو ئیسلام دەکات.

میلز، لەو باوەڕەدایە کە ئاینی زەردەشت کاریکردۆتەسەر ئاینی جولەکە بەتایبەتی لەکاتی دوورخستنەوەی جولەکەکان بۆ بابل، ناوبراو دەبێژێ کە (فریسی)یەکان چینێکی بەناوبانگی جولەکەکان بوون کە زێتر ئاینی ئێرانییەکان کاری کردبووە سەریان، وئەم ڕاستییە پتر دەتوانین لەبیروباوەڕیاندا ببینین، وهەر بەهۆی ئەم (فریسی)یانە وە ئاینی زەردەشتی چۆتە نێو ئاینی فەلەو کاریکردۆتە سەر.

گیمنو برێکی دیکە لەتوێژەران لەو باوەڕەدان کە (پردی چینوت) یا پردی پاداشتو سزا لەلایەن جولەکەکانەوە لەزەردەشتییەکان وەرگیراوە، ولەپاشاندا لەئاینی ئیسلامدا بۆتە پردی سیاط).

ویل دورانت، لەو باوەڕەدایە کە بیرۆکەی بەهەشتو دۆزەخو پاداشتو سزاو ململانێی نێوان چاکەو خراپەو سەرکەوتنی چاکە بەسەر خراپەدا، جولەکەکان لەزەردەشتی یەکانیان وەرگرتووە.

بڕی لەتوێژەران دەربارەی ئەو حەوت فریشتەیەی بارەگای یەهوە، کەپاش دوورخستنەوەی جولەکەکان بۆ بابل کەوتۆتە ناو ناوان لایان، واتە جوبرەئیل، میکائل، روفائیل، ئیسرافیل، ئیزرائیل، ئوهبلو ئوریل ڕەنگدانەوەی ئەمشاسپەندەکانی زەردەشتی یەکانە,وئەو چوار فریشتە نیزیکانەی بارەگا بە چوار دیاردە سەرەکیەکانی ئاینی زەردەشتی دەزانن، واتە: ئاشا، وەهەمەنە، خەشتراو ئارمەئیتی (لەپاشاندا بە دووڕودرێژی باسیان لێدەکەین).

دەربارەی پاداشو سزا لەرۆژی پەسلآندا باوەڕی زەردەشت کاری کردۆتە سەر ئاینی فەلە ئەوە نەبێتکە بەهەشتو دۆزەخێك کە لەئاینی فەلە باسی لێکراوە لەتەك ئەوەی گاتاکاندا جیاوازییان هەیە.

فیلسین شالە دەبێژێ: ((ئاینی زەردەشت تا ئێستاش کاری کردۆتە سەر ئاینی جین بودا، ئازادی هەلێبژاردن، دوورەپەرێزی کردن لەقوربانی کردن، رێزگرتن لەزیندوان، ئەم سآ باوەرە لەباوەڕی زەردەشتن)).

ویدن گرن: ((لەو باوەڕەدایە کە باوەری مەزداپەرستەکان (زەردەشتیەکان) دەربارەی رۆحو ژیانی پاش مردنو پاداشتو سزا لەرۆژی پەسلآندا کاری کردۆتە سەر ئاینی جولەکەو تێکەڵ بە تەورات بووە)).

داوسون: ((لیستێکی بلآوکردۆتەوە کە زێتر لەسەد(تەوەری)ی تێدا باسدەکات کە ئاینی زەردەشتی لەتەك ئاینی جولەکەو فەلە چونیەکەن. زۆربەی زۆری ئەمانە پاش هێرشی بابلیەکان بۆسەر ئۆرشەلیمو بەیەخسیرگرتنی جولەکەکانو هێنانیان بۆ بابلو پاشان گرتنی بابل لەلایەن کورشەوە، رویداوە. دوایی ئەم باوەڕانە هاتونەتە نێو ئاینی فەلە.

فرە لەتوێژەران وەك: ایزلر، ریتن اشتین، شدر، یگرو.. لەو باوەڕەدان کە بیروباوەڕی زەردەشت کارێکی زۆری کردۆتە سەر بیرەوەرە یۆنانییەکانو تەنانەت دەبێژن کە ئەفلاتون زۆربەی بۆچونەکانی خۆی لەزەردەشتیەکان وەرگرتووە.

هەروەها دەربارەی تیوری ململانێی دژەکان (نڤریە نزاع الاچداد) کە لەنێوان حەکیمەکانی یونان زۆر باوبووەو کەسانێکی وەك: اناکسیماندر، هراکلیت، فیپاغورموس، سقراگ، هزیودو... باوەڕیان پێآ بووە، لەبنەڕەتا بەکارتێکردنی ئاینی زەردەشتی دەزانن کە لەململانێی نێوان خێرو شەڕ یا چاکەو خراپەی زەردەشتەوە وەرگیراوە.

هەراكلیت باوەری بەوە بووە كە گەوهەری یاسای جیهان یا(نوموس ـ Nomos)و (لوكوس ـ Logos)بریتییە لەئاگر، لەبەرئەوەی لەئاویٚستادا ئاگر نیشانەی یاسای ئافراندنو ئاشا بووە، بێگومان ئەم باوەڕەی هراكلیت لەئاوێستاوە وەرگیراوە (دەربارەی ئاگرو پەیوەندیان لەتەك باوەڕی زەردەشتدا لەپاشاندا بەدووردرێژی باسی لێدەكەین). ئەوەی سەرنج رادەكێشآ ئەوەیە كە ئەم(بیرەوەرە) لەگەڵ ئەوەی لەو سەردەمەدا قوربانی كردن بۆ خواكان باوبوە، بەلآم ئەم دژی قوربانی كردنی ئاژەڵ بووەو دژی ئەوەش بووە كە مردو بەخاك بسپێرێت كە ئەمانە هەمویان لەتەك ئاینی زەردەشتدا چونیەك بووە.

## ئەمشاسپەندان (نەمرەپیروێزەكان)

هەر زیندەوەر یا گیاندارێك، توانایی‌و سیفاتی تایبەتی خۆی هەیە كە بەهۆی ئەوانەوە دەناسرێن‌و لەیەكدی جیادەكرێنەوە. دەتوانین ئەم سیفەتانە بە نیشانە یا تایبەتخۆی ئەو زیندەوەرە دابنێین. بۆ نمونە، باڵێندەكان بریتین لەگیانلەبەرانێك كە بەهۆی سیەكانیانەوە هەوا هەڵێدەمژن، لەشیان بە پەڕ داپۆشراوە، بۆ زاوزآ هێلكە دەكەن، پلەی گەرمایی لەشیان لەتەك گۆڕینی پلەی گەرمایی دەوروبەریاندا نەگۆڕە، لەبریتی دەست باڵیان هەیە، لەجێی لێوو دان‌و دەم دەنوكیان هەیەو.... كەواتە هەموو باڵێندەیەك ئەم سیفەتانە یا ئەم نیشانانەیان هەیە. یاخود دەتوانین بێژین هەر زیندەوەرێك هەموو ئەم سیفەتو نیشانانەی هەبێت، باڵێندەیە. بەلآم ئەگەر زیندەوەرێك بڕێ لەم سیفەتانەی تێدا بێت، مەرج نیە باڵێندە بێت. بۆ نمونە، ئەگەر زیندەوەرێك هێلكە بكات لەوانەیە باڵێندە نەبێت چونكو ماسیش هێلكە (گەرا) دەكات.

بڕی جار سیفەتێك یا چەندین سیفەت تایبەتە بۆ زیندەوەرێك‌و هیچ زیندەوەرێكی دیكە ئەو سیفەتە یا سیفەتانەی تێدا نیە. ئەم جۆرە سیفەتو تواناییە تایبەتین بۆ زیندەوەرێكی تایبەتی. بۆوێنە (جولآنەوەو بزوتن) بە مانا زانستی یەكەیەوە، یەكێكە لەتایبەتكارییەكانی زیندەوەر، چونكە هیچ بونێك كە زیندو نەبێت ئەم توانابیەی نییە (توانای جولآنەوەو بزوتن)، بەواتەیەكی دیكە دەتوانین بێژین، هەر زیندەوەرێكی زیندو دەجولێێتەوە یاخود هەر شتێك توانای جولآنەوەی هەبێت، زیندووە.

كەواتە هەر سیفەتێك، لەتایبەتیەكانی بونێك نەبێت، بە تەنیایی دەتوانێت بۆ ناسینی ئەو (بونە) بەس بێت بەلآم هەر سیفەتێك كە لەتایبەتییەكانی (بونێك)بێت،بەتەنیایی دەتوانێت بوێ ناسینی ئەو (بوونە) بەس بێت.

(رووناكی) لەتایبەتییەكانی (نور)ە، كەواتە (نور)، رووناكە، وە هەرچی شتێك رووناك بێت، (نور)ە. لەسەر روی زەوی (بیركردنەوە)، لەتایبەتییەكانی ئادەمیزادە، كەواتە ئادەمیزاد بیردەكاتەوە. وەهەر ئافەریدەیەك لەسەر روی زەوی بیربكاتەوە، ئادەمیزادە.

بەم شێوەیە، تایبەتییەکانی هەر (بونێك)، تایبەتین بۆ ئەو (بونە). ئافراندن، لەتایبەتکارییەکانی خوایە، کەواتە خوا خولقێنەرەو هەر شتێك بتوانێت بخولقێنآ، خوایە، لەبەر ئەوەی ئافراندن لەتوانا تایبەتییەکانی خوایە، کەواتە خوا لەم تایبەتکارییەدا، تەنیایەو هیچ شتێك یا کەسێکی دیکە ئەم تایبەتییەی نیە.

خوا، بآ ئەندازە سیفاتو توانایی جۆراوجۆری هەیە، کە هەریەکە لەمانە لەزاتی خوادا تەواو سەنگو ڕەهاو بآ بڕینەوەن وەك: ئافراندن، ڕاستی، بیری خاس، میهرەبانی، بەخشین، نەمرێتی،....

لە (گات)ە کاندا ــ سرودەکانی زەردەشت ــ، پەیامبەر بەهۆی (بیری خاس)وهۆشمەندی خۆیەوە، پەی بە بوونی ئاهورامەزدا دەبێو دەیناسێت.

یەکآ لەتایبەتکاریو تواناییەکانی زەردەشت ئەوەیە کە بەهۆی ئەقلأو هۆشو ژێریتی خۆیەوە، خوای ناسیوە. بۆیە هەوڵدەدات کە بەشێوەیەکی زۆر سادەو ئاسایی نیشانەکانی خوا بە خەڵکی بناسێنآ.

بڕی لەم نیشانانە، تایبەتی خوان، بەلآم هەندێکی دیکەیان هەرچەندە لەبوونی خوادا تەواو سەنگو بآ بڕینەوەن ــ لەم ڕوەوە لەتایبەتکارییەکانی خوان ــ وەلآ بەگوێرەی یاسای ئافراندن کە یاسای راستی (ئاشا)یەو ویستی خوایە، ئادەمیزادیش بە شێوەیەکی ڕاژەیی دەتوانێت ئەو توانایەتییەی هەبێت، ئەم تواناییە خۆی یەکێکە لەتایبەتکارییەکان کە بەویستی خواو بەگوێرەی یاسای ئافراندن هەر لەو کاتەوە کە ئادەمیزاد ئافەریدە بووە، ڕەچاوکراوە.

لەدیدی زەردەشتەوە، ئادەمیزاد نە تەنیا دەتوانآ ـ بەڵکو دەبێ بتوانێت ـ بڕی لەو سیفەتو تواناییانە بە شێوەیەکی ئاگایانە لەخۆیدا بەدی بهێنێتو هەمیشە بەهێزترو پتەوترو زێتریان بکات. زەردەشت لەو باوەرەدایە کە ئەگەر ئادەمیزاد بوونی خۆی بەم نیشانانەو ئەم سیفەتانە بڕیزێنێتەوەو هەوڵو کۆششی بآوچان بدات بۆ پەرەسەندنیان، مرۆڤایەتی گەشەدەکا، گەشەکردنی مرۆڤایەتی دەبێتە هۆو مایەی سەربەرزێتیو پەرەسەندنی خوو رەوەشتو چاکەو ڕاستیو دروستی لەجیهانداو دەرئەنجام ژیان لەسەر بنچینەی ئاینی ڕاستی پێشدەکەوێت، پێشکەوتنی بەردەوامو هەمیشەیی ژیان لەم جیهانەدا لەسەر بنچینەی ڕاستیو دروستی، ئارەزووو ئارمانی زەردەشتە.

زەردەشت، بۆ گەیشتنی ئادەمیزاد بەو ئارەزووە، باشترین ڕێگەی بە ڕازاندنەوەی ئادەمیزاد بەو سیفاتو نیشانانە داناوە کە بەشێوەیەکی تەوا سەنگو بآبڕینەوە لەزاتی ئاهورامەزدا هەیە، بڕی لەو سیفەتانە ــ وەك بیری خاس ــ بە بنەماو بنچینە بۆ ئادەمیزاد دەزانێ، بۆیە زێتر جەختیان لەسەر دەکات.

زەردەشت، شەش سیفەت لەسیفەتەکانی ئاهورامەزدا، بۆ گەشەکردنی مرۆڤایەتیو پێشکەوتنی ئادەمیزادو پەرەسەندنی ئاکاری تایبەتیو کۆمەڵایەتی بە پێویست دەزانێتو ئەم شەش سیفەتانە بریتین لە:

وەهومەن (بیری خاس)، (ئاشا) (راستی)، (خشەترا) (توانایی)، (ئەرمەئیتی) (خۆشەویستیو لەخۆبوردن)، (هەئور وەتات) (پوختەیی)، (تەندروستیو پێگەیشتویی)، (ئەمرتات) (نەمرێتی).

بەمجۆرە، بەبۆچونی زەردەشتو دەربڕینی ئەم ڕاستیە کە ئادەمیزاد دەتوانێت بڕی لەو سیفەتانەی خوا لەنێوخۆیدا پەروەردە بکات، پەیوەندییەکی پتەوو دۆستانە لەنێوان خواو ئادەمیزاد دروست بێت، بە ڕادەیەك ئەم پەیوەندییە بەهێزدەبێ کە ئادەمیزاد پلەوپایەی خۆی لەئافراندن دا ـ لەلایەن خواوە ـ فرە مەزنو باڵا دەبینآ، بە شێوەیەك ئیدی خوا بەستەمکارو کوشندەو.... نابینآ، بەڵکو هەست بەوە دەکات کە خوا دۆستێکی زۆر دڵسۆزو نزیك بەخۆیەتی، خۆی بە کۆیلەو بەندەی خوا نازانێت، خوا بە دۆستی خۆیو خۆی بەهاوەڵی خوا دەزانێت. ئەم نزیك بوونەوەو دۆستایەتیەوا لەمرۆڤ دەکات ئیدی بۆئەوەی نزیکتر بێتەوە لەخوا پێویست بە ئەنجامی ئەو هەموو مەراسیمە ئاینییانە نەکا، وە تەنیا هۆیەك بۆ پەیوەندی کردن لەتەك خوا هەر ئەو سیفەتو رەوشتانە بێـتو بەس.

لێرەدا پێویستە هەریەکە لەو سیفەتانە هەروەکو چۆن لەگاتەکاندا باسی لێوەکراوە، هەر بەو شێوەیەو بەکورتیو پوختەیی باس بکرێت:

- وەهومەن: vohumana یا سیفەتی بیرکردنەوەی خاس:

ئەم سیفەتە زێتر بە شێوەیوشەی (وەهومەتنگها)، وەهو = خاس، مەنتگها = بیر)و (وەنیگئوش مەنگهو)و (وەهومەنو)هاتوە کە مانای تێکرای هەمووی دەبێتە بیری خاس یا بیرکردنەوەی خاس، ئەم وشەیە لەبنچینەدا ئاڤێستاییە، بەرەبەرە لەفارسیدا بۆتە (وەهەمەن) وپاشانیش بووە بە (بەهمەن).

بیری خاس یەکێکە لەسیفەتەکانی زاتی خوا، ئەرکی سەرشانی ئادەمیزاد ئەوەیە لەسەراسەری ژیانیدا هەولأ بدات ئەم سیفەتە لەنێو خۆیدا پەروەردە بکاتو زیادی بکات. زەردەشت لەزۆربەی سرودەکاندا دەربارەی بیری خاسوتووێژی کردووەو نرخو بایەخێکی تایبەتی پێداوە.

هیچ جێگەی رارایيو گومانی تێدانیە کە بیری هەر کەسێك بنەماو بنچینەیوتەوو کرداری ئەو کەسەیە. دووپات کردنەوەی کردارو گوفتاری هەموو کەسێك بەرە بەرە دەبێتە خو(عادەت).

دەتوانین بێژین کە خوورەوشتی ئادەمیزاد لەچۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەو کەسە دێتەدی، بۆیە زەردەشت بیری خاس بەسەرچاوەی هەموو کارو کرداری خاسی مرۆڤ دەزانێت. بۆئەوەی

بزانین کە ئەم سیفەتە بەلای زەردەشت چەند گرنگ بووە، دەبێژین کە لەتێکرا 238 بەند لەسرودەکانیدا، 129 جار باسی گرنگێتیو بایەخی بیری خاسی کردووە.

- ئاشا، نیشانە یا سیفەتی راستی:

ئەم سیفەتە (ڕاستی)، لەنێو گاتەکاندا زێتر بەشێوەی ئەوشانە هاتووە (ئاشا، ئەشم، ئەشەهیا، ئاشاوەهیشتا(ئاشا بە مانای راستییە، وەهیشتا بەواتەی چاکترینە)ە، ئاشاوەهیشتا، دەبێتە چاکترین راستی.

(ئەم وشەیە لەزمانی فارسی نوێدا بۆتە اردیبهشت).

راستی یا چاکترین راستی لەزاتی خوادا بریتییە لەیاساو رێکوپێکی تەواو سەنگو توانایی دارِشتنی سیستەمێکی بێخەوش کە بە شێوەی یاسایەك فەرمانڕەوایەتی گشت (بون)و سروشتو کەشکەلآن دەکاتو خۆی لەچاکترین راستی دا دەنوێنآ.

ئەم نیشانەیە لەنێو ئادەمیزادیشدا بریتییە لەتوانایی بە تەکوزی دان بە کردار بەگوێرەی راستی، یاخود بێژین، بریتییە لەهاوئاهەنگ کردنی بیروکرداروووتار لەتەك یاسای راستیدا، پێویستە لەسەر هەموو کەسێك هەمیشە ئەم تواناییەی خۆی پەروەردەبکات کە کردارەکانی خۆی لەتەك راستیدا هاوئاهەنگ بکاتو هەرگیز لەرِێی راستیدا لانەدات، وهەمیشە باوەری بە یەسنای هات 72 بەندی 11 پتەوبێت کە دەبێژێ:

((تەنیا یەك رێگە هەیەو ئەویش راستییە))

- نیشانەی توانایی (خشەترا)

لەنێو گاتەکاندا زێتر بە شێوەی (خشەترا، خشەپیرم، خشەپرەهیا) هاتووە. ئەم وشەیە لەنێو ئاوێستای دواییدا بۆتە (خشەپرەوەئیریە)و لەفارسیدا بۆتە(شهریور).

توانايي بە شێوەیەکی تەواو سەنگ، بآ ڕادەو بآ بڕینەوە لەزاتی خوادا هەیە. توانایی وەدیهێنانو دروستکردن (ئافراندن) یەکێکە لەتواناییەکانی تایبەت بە خوا. توانایی خوا ـ خاس بیرکردن، راستی، دلۆڤانی، کەمالو نەمرێتیە، لەبەر ئەوە تواناییەکی دروستکەرە نەڕوخێنەر.

لەروانگەی پەیامی زەردەشتەوە، ئەگەرچی خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکآ، بەلآم ئەم توانایەی جگە لەرِێی ڕاستی، وەدیهێنانی شتی خاسو بەخشەندەیی بەکار ناهێنێت.

نیشانەی توانایی لەنێو ئادەمیزادا، لەراستیدا بریتیە لەبڕی لەتواناییەکانی زاتی خوا بە شێوەیەکی ڕادەدارو بڕینەوە (متناهی) کە ئادەمیزاد دەتوانآ ئەمانە لەنێو زاتی خۆیدا وەدی بهێنێتو

پەروەردەی بکاو پەرەی پآ بسێنێت، وەك: توانایی لێبوردن، میهرەبانی، کونترولیویستوخواستو ئارەزوو ورەفتاری خۆی بەهۆی هاوئاهەنگ کردنی نێوانویستو ئەقلأ، توانایی پەیڕەوی لەیاسای ڕاستی، توانایی بەرگری لەهەقو دژایەتیکردنی درۆ، توانایی ئازادبونو ئازاد بیرکردنەوە. بە کورتی بێژین، گشت تواناییەکانی رەوشتیو معنوی، هەرکەسێ، خۆی بە نیشانەی توانایی (خشەترا) ڕازانبێتەوە، وئەم ڕاستیە بزانێت کە تواناییەکانی بریتین لە پرشنگێك لەتواناییەکانی خوا، بێگومان ئەو تواناییانەی تەنیا لەرێگەی بەختەوەری مرۆڤ، ئاوەدانکردنی جیهانو پێشخستنی ژیان لەم جیهانەدا بەکاردێنێت.

- نیشانەی دلۆڤانی (میهرەبانی)و (خۆشەویستی)و لەخۆبوردن ــ ئەرمەئیتی

ئەم نیشانەیە لەگاتەکاندا زێتر بە شێوەی (ئەرەمەئیتی، ئەرەمەئی تیش) هاتووە، ئەموشە ئاوێستاییانە لەتەك سیفەتی (سپێنتا) لەفارسیدا بۆتە (سپندارمند) یا (ئەسفەند).

دلۆڤانی یەکێکی دیکە لەنیشانەکانی زاتی خوایە. خوا گشت دروستکراوەکانی خۆی بآ ئەندازە خۆش دەوآو میهرەبانە بۆیان. هەموو نیشانەکانی خوا، بآ بڕینەوەو بآ ڕادەن، کەواتە خۆشەویستی، میهرەبانیو لێبوردنو بەخشەندەگیش هەروا بآ ئەندازەن. کەوایە خۆی لەخۆیدا زۆرو ستەم لەکەس ناکات، لەکەس تورِەو زویر نابێتو نارەنجێت، کەس فریونادات، تۆڵە لەهیچ کەس ناسێنێت.

بە بۆچونی زەردەشت، ئادەمیزاد بەردەو کۆیلەی خوا نین، بەڵکو خوا هەموو ئادەمیزاد- بەتایبەتی ئەوانەی پەیڕەوی راستی بن ــ بە چاوی دۆست تەماشا دەکات،وئامادەی دۆستایەتییانە.

پەیوەندی نێوان ئادەمیزادو خوا بە بۆچونی زەردەشت، لەسەر بنەمای دۆستیو دلۆڤانی دامەزراوە نە بەهۆی ترسو هەراس. لەم روانگەیەوە ئادەمیزادیش دەبێ تێبکۆشێت تا هەمیشە نیشانەی خۆشەویستی لەخۆیدا پەروەردەبکاو گەشەی پێبدات. پرشنگەکانی نیشانەی دلۆڤانی لەئادەمیزاد بریتین لە: لێبوردن، میهرەبانی، خۆشەویستی، خەمخواری، بەخشندەیی، دادپەروەری، خۆشبینیو بآ فیزیو...

- نیشانەی پێگەیشتنو پوختەیی (کمال ــ بلوغ)

لەگاتەکاندا پتر بە شێوەوشەی (هەئورواتا، هەئوروەتو، هەئوروائوس) هاتووە، ئەم وشەیە لەفارسیدا بۆتە (خرداد) پوختەیی، لەو نیشانە بێهاوتاو تەواو سەنگانەی خوایە، بەلآم هەروەکو لەمەوبەر گوتمان، ئادەمیزاد دەتوانآ بە شێوەیەکی ڕاژەیی خۆی پآ بڕیزێنێتەوە. ئاشکرایە کە بۆ گەیشتن بە پوختەیی یاخود بێژین گەیشتن بە (ژیانێکی بێخەوش) دەشآ لەپێش هەموو شتێکدا مرۆڤ چەندین پلەو قۆناغی ببڕێت، واتە پێشەکی خۆی بە نیشانەکانی (بیری خاس) (راستی)،

(توانایی)، (دلۆڤانی) ڕازانبێتەوە. بەواتەیەکی سادەتر، (پێگەیشتنو پوختەییش) هاوری لەتەك گەشەپێکردن، نەشونماو پەرەسەندنی نیشانەکانی دیکە کە باسمان کردن لەئادەمیزادا بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ پەرە دەسێنێتو بەرەو مرۆڤی ئیدەئالو ئارمانی نزیك دەبێتەوە، هیچ گومانی تێدانییە کە مرۆڤی بێخەوشە کە دەتوانآ کۆمەڵگاو ژیانێکی بێخەوشو دەرئەنجام جیهانێکی ئیدەئالو ئارمانی دامەزرێنێت، واتە سەرچاوەی کۆمەڵگاو جیهانێکی ئیدەئالو ئارمانی مرۆڤی بێخەوشە.

- نیشانەی نەمرێتی

لەگاتەکاندا زێتر بە شێوەوشەی (ئەمیریتاتا، ئەمیریتاتەس چا، ئەمیریتەتاتم) هاتووە. ئەم وشەیە بە فارسی بۆتە (ئەمرداد، مرداد) بێگومانوشەی نەمر بە ماناوشەییەکەیەوە تەنیا تایبەتە بە خوا، بەڵام ئادەمزادیش بەگوێرەی ئەو یاسایەی کە بۆ بوونی ئەو ڕەچاوکراوە دەتوانێت بە شێوەیەکی دیکەو ڕاژەیی بگاتە ئەو نەمریتییە.

بە باوەڕی زەردەشت، ئادەمیزاد بەگوێرەی یاسای ئاشا(راستی) ـ کە یاسای ئاهورایی فەرمانڕەوایەتی هەموو بوونە ـ هاوجوت لەتەك هێزو توانای بیرکردنەوەدا خولێقاوە. لەم ڕووەوە ئەم هێزو توانای بیرکدنەوەیە کە پلەوپایەی ئادەمیزادی لەئاژەڵو زیندەوەرەکانی دیکە بەرزتر کردۆتەوە. بەواتایەکی دیکە مرۆڤایەتی ئادەمیزاد بەوەیە کە دەتوانێت بیربکاتەوە. کە دەبێژین فلآن مرۆ، مرۆیەکی خاسە، واتە خاس بیردەکاتەوە یا بیرکردنەوەی باشە، کاتێ دەبێژین مرۆیەك بەختەوەرە، مانای ئەوەیە کە لە بیریدا هەست بە ئارامیو ئاسایش، شادمانیو بەختەوەری دەکات. کەسێك راست دەبێژی چونکو راست بیردەکاتەوە، یا کەسێك یارمەتی کەسێکی دیکە دەدات، ئەوە بیری ئەو کەسەیە کە هانی دەدا بەم کارە هەڵسێت.

ئادەمیزاد بەدوو شێوە رەفتاردەکا، شێوەیەك لەرەفتارو کردارەکانی (سرشتی)ن ـ غریزی ـ، ئەم شێوەیە لەنێو ئادەمیزادو زیندەوەرەکانی دیکە چونیەکن، شێوەی دوهەم، ئەو کردارانەن کە تایبەتن بۆ ئادەمیزاد، ولەتوانای بیرکردنەوەیەوە هەڵێدەقولێیت، بۆیەکا دەتوانین بێژین کە ئادەمیزاد بەرابەرە لەتەك بیرکردنەوەو ئەندێشە.

لەم روانگەیەوە، کاتێك کە دەبێژین ئادەمیزاد دەگاتە پلەی بێخەوشێتی، ئەمە بە مانای ئەوەیە کە بیری ئادەمیزادە دەگاتە بێخەوشێتی.

یەکآ لەتایبەتکارییە هەرە زەقەکانی بیری بێخەوش بریتییە لەدروستکردنو ئاوەدانی. لەنێو بیری بێخەوشدا، هۆکانی کەمکردنو ڕوخاندنو ڕماندن ـ کە دژی زێدەکردنو دروستکردنو ئاوەدانییە ـ نابینرێتو نییە.

کەوایە، بیری بێخەوش هەمیشە لەگەشەکردنو پێشکەوتنو سەرفرازییە. ئەم جۆرە بیرانە دەبنە هۆی گەشەکردن، پێشکەوتنو سەرفرازی بیرەکانی دیکە.

بەرهەمی پێگەیشتنو بێخەوشێتی بیرەکان، بە شێوەیەکی زێدەو هەمەگیر بەردەوامو هەمیشەیی دەبن. بیرێك کە بتوانێت ببێتە هۆی گەشەپێکردنو پێشکەوتنی بیرەکانی دیکە، هەرگیز لەنێو ناچێتو هەمیشە نەمرە.

بەمجۆرە کارتێکردنی بیرە بێخەوشەکان لەسەر ژیانی ئادەمیزاد، هەمیشەییەو بەو دەمێنێتەوە. بەواتەیەکی دیکە، دەتوانین بێژین کە بیرە بآخەوشەکان، نەمرو هەمیشە زیندون، ونهێنی نەمرێتی ئادەمیزدایش ئا لەم ڕاستییە دایە.

بەگوێرەی ئەوەی تا ئێستا باسمان کرد، دەتوانین بێژین کە ئادەمیزاد لەدوندی بێخەوشێتی خۆیدا، دەگاتە نەمرێتی، وئا لەم ئاستی بینایی‌و عیرفانە کە بەراستی بۆی ڕوندەبێتەوە کە وەك خوای لێهاتوەو دەتوانآ پڕ بە دەم هاواربکاتو ئەم ڕاستییە بدرکێنآ کە (گەیشتومەتە پلەی خوایەتی) یان (وەك خوام لێهاتووە).

ئەوەی تا ئێستا لەم بارەوە باسمان کرد زۆر بەکورتی بریتییە لەوەی کە نیشانەکانی (خاس بیرکردنەوە)، (راستی)، (توانایی)، (دلۆڤانی)، (بێخەوشێتی)و (نەمری) بە شێوەیەکی تەواو سەنگ، بآ ڕادەو بآ بڕینەوە، لەزاتی خوادا هەیەو ئادەمیزاد دەتوانآ بە شێوەیەکی ڕاژەیی هەریەکآ لەمانە یاخود هەمویان وەربگریتو لەخۆیدا پەروەردەیان بکاتو گەشەیان پآ بدا. بۆ نمونە ئەگەر کەسێك تەنیا نیشانەی (خاس بیرکردنەوە) تا نیزیك بە (بآخەوشێتی) لەخۆیدا پەروەردەبکات، دەتوانین بێژین، ئەو کەسە لەروی خاس بیرکردنەوەدا، لەخوا نزیك بۆتەوە. یاخود بێژین لەروی خاس بیرکردنەوەدا وەك خوای لێهاتووە یا لەو ڕوەوە گەیشتۆتە خوایەتی. بەلآم ئەگەر کەسێك نیشانەکانی (خاس بیرکردنەوە)، (راستی)، (توانایی)، (دلۆڤانی) بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ لەخۆیدا پەروەردەبکاتو تەشەنەی پێبدات، بەرەبەرە دەگاتە (بآخەوشێتی)و (نەمری).

زەردەشت لەگاتەکاندا(یەسنا 45 بەندی 10) دەبێژێ:

((بە باوەڕێکی پاکەوە، ستایشی دەکەین‌و بە گەورەی دەزانین،

ئەو، کە هەمیشە، ئافەریدەگارو دانای مەزنە

بەهۆی(ئاشا)راستی‌و (وەهومەن) بیری خاس،

وبە شالیاری خۆیەوە

مژدەی پوختەیی‌و نەمرێتی بە خەڵک دەدات،

وتەندروستی‌و توانابیمان پآ دەبەخشێت.))

کەوایە دەتوانین بێژین: ئادەمیزاد لەقۆناغی (بآخەوشێتی)و (نەمری)دا، بە راستی لەخوا نزیك دەبێتەوە یا دەگاتە خوا یا وەك خوای لێدێت.

هەروەها زەردەشت دوبارە لەگاتەکاندا (یەسنا 44 بەندی 17) دەبێژێ:

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چلۆن، بەهۆی ڕێنمایی تۆوە؟

ئاواتم دێتەدی‌و دەگەمە خزمەتت؟

کەی‌وتەکانم جێگەی خۆیان لەنێو دڵی خەڵک دەکەنەوە،

تا بەو پەیامەی کە لەسەرچاوەی ڕاستیەوە هەڵێدەقولێێت،

خەڵک،

بەرەو پاکی‌و بآخەوشێتی‌و نەمرێتی ڕێنمایی بکەم.))

ئەوەشمان گوت کە خوا بڕی تایبەتکاری هەیە ــ کە کەم نین ـ کە ئادەمیزاد ناتوانآ ئەنجامی بدات وەك نیشانەی ئافراندن کە لەتایبەتکارییە هەرە تایبەتییەکانی خودی خوایەووهیچ زیندەوەرێکی دیکە یا هێزێکی دی ناتوانێت‌و توانای ئەوەی نییە کە ئەنجامی بدات. کەوایە هیچ بونێك ناتوانێت ببێتە خوای تەواو سەنگ. کەوایە باسی ئەوەی کە ئادەمیزاد ببێـە خوا باسێکی بآ ماناو خەیاڵاوییە.

بە بۆچوونی زەردەشت، ئادەمیزاد دەتوانآ بەهۆی پەروەردەکردنی ئەو شەش نیشانەیەی کە باسمان کرد، لەنێو خۆیدا، لەخوا نزیك بێتەوە یا وەك خوای لێبێت، بەڵآم هەرگیزاو هەرگیز

هیچ هێزێك یا كەسێك ناتوانێت ببێتە خوا یا بگاتە خوایی، تەنیا (خوا) خوایە، هیچ زیندەوەرێك تواناو شیاوی خوایەتی نییە.

زەردەشت، لەپەیامە نەمرەكەیدا، (گاتاكان) ـ پلەوپایەیەكی تایبەتی مادیو جیاوازی بۆ ئەو شەش نیشانانەی باسمان كرد، دانەناوە بەڵام كاتێك لەمانای سرودەكانیووردد دەبینەوە، دەبینین كە (خاس بیركردنەوە)ی بە بنەماو سەرەتای پێگەیشتنی معنوی ئادەمیزاد داناوە، وهەركەس بۆ گەیشتنە بەبآخەوشێتیو نەمرێتی دەبێ نیشانەكانی (راستی)، (توانایی) و(دلۆڤانیش) لەخۆیدا پەروەردە بكات. لەسرودەكانی زەردەشت بڕی جار باسی یەكآ یا دوو نیشانە بە تەنیا یا پێكەوە بەگوێرەی بابەت كراوە، هەندێ جاریش باسی هەر شەش نیشانەكانی پێكەوە كردووە.

بۆ نمونە لە یەسنا 34 بەندی 13 بە تەنآ باسی (خاس بیركردنەوە)ی كردووە، لە یەسنا 51 بەندی 8 باسی (ڕاستی) كردووە. لەیەسنای 28بەندی 10 نیشانەی (خاس بیركردنەوە) و(راستی) پێكەوە باسی كردووە، لەیەسنا 44 بەندی 9 باس (خاس بیركردنەوە)، (راستی)و(توانایی) پێكەوە كردووە، لەسآ سرودیشا باسی هەر شەش نیشانەكانی پێكەوە كردووە وەك لەیەسنا 47 بەندی1 دەبینین

((مەزدا ئاهورا،

بە شالیاریو دلۆڤانی خۆیەوە،

بە كەسێك، كە كردارو گوفتاری

بەهۆی ئەندێشەی خاسو باشترین بیر،

ولەسەر بنەمای راستیدا بێت

پوختەییو نەمرێتی دەبەخشێت.))

پاش زەردەشت، یەكآ لەشاگردەكانی هەوڵێكی فرەی داوە رێبازی مامۆستاكەی بگرێتەبەر، لەبەرئەوە بڕی لەبۆچونو ئەندێشەكانی زەردەشتی لەحەوت سرودا (راژە) كردووە. ئەم حەوت سرودە بریتین لە یەسناكانی 35، 36، 37، 38، 39، 40، 41 كە بە(هفت هات) یا (هفتن یشت) بەنێوبانگن. بۆ یەكەمین جار لەنێو ئەم سروودانەدا، هەریەكە لەو نیشانانەی كە باسمان كردن شێوەیەكی مادی بەخۆوە گرتووەو بۆ هەریەكەیان (ئەمشاسپەند) یكیان دارِشتووە كە دەبنە فریشتەكانی نیزیك بە بارەگای ئاهورمەزدا (لەپاشاندا لەباسی ئاوێستادا باسی ئەم حەوت سرودە دەكەین).

پاشان لەنێو ئاوێستای نوێدا، ئەم شەش نیشانەیە بە تەرتیبێكی تایبەتییەوە بەم شێوەیە رێكخراون:

خاس بیرکردنەوە ـ راستی ـ توانایی ـ دلۆڤانی (خۆشەویستی) ـ بآخەوشێتی ـ وەنەمری.

ئەم شێوازی تەرتیبە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئادەمیزاد بۆ گەیشتنە دوا پلەی بآخەوشێتی لەروی معنویەوە کە بریتیە لەبآخەوشێتیو نەمرێتی، پێویستە خۆی بە نیشانەکانی دیکەواتە (خاس بیرکردنەوە، راستی، توانایی، دلۆڤانی) بریزێنێتەوە، بەواتەیەکی دیکە، ئادەمیزاد پاش ئەوەی ئەو هەنگاوانە هەلێدێناو یەکە یەکە ئەو قۆناغانە دەبڕێ، ئەوسا دەبێتە مرۆیەکی بآخەوشو ئارمانیو بۆ گەیشتنە هەر پلەیەك پێویستە لەسەری پلەی پێشوی ببڕێت.

باسی ئەمشاپەسند (یاخود فریشتە) لەئاینی زەردەشتدا، باسێکی فرەووردو سەرنج راکێشەرە چونکو برێ کەس لەروی نەزانینەوە بونی ئەم ئەمشاسپەندانە لەتەنیشت ئاهورامەزدا بە نیشانەی شەریك دانان بۆ خوای تاکو تەنیا دەزانن، لەباسی ئاهورامەزدا دا باسمان کرد کە ئاینی خواپەرستی زەردەشتی لەسەر بنەمایەکێتی خوا دامەزراوە، ئیدی پێویست ناکات لەم بارەوە زێتر بدوێین.وشەی ئەمشاسپەندان لەسێ بەش پێکهاتووە: ئە ــ مشا ــ سپەنتە،

ئە: نیشانە (نا)یەواتە(نفی) (ئامرازی نەفیە)

مشا (مشە): بە مانای مردنە: کەواتە ئەمشا بە مانای(نەمر)ە

سپەنتە: مانای پاكو پیرۆز (مقدس)

ئەمشاسپەنت دەبێتـە نەمری پاك یا نەمری پیرۆز (مقدس)

ووشەی ئەمشاسپەندان لەهیچ یەکآ لەسرودەکانی زەردەشت لەنێو گاتەکاندا وەك بونێکی مادی ئاماژەی بۆ نەکراوەو باسی لێنەکراوە، بەڵکو هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد باسی نیشانەکانی ئاهورامەزدا کراوە. لەنێو ئاوێستای نوێدا کە مەخابن پرِبووە لەئەفسانە ئەم ئەمشاسپەندانە وەك فریشتە هاتونەتە گۆرآو بەرەبەرە هێزو توانایان بۆ دیاری کراوەو وەك نیوە خوایەکیان لێهاتووەو بە شێوەیەك گەورەکراون کە برِی جار لەتەك ئەوەی خۆیان دروستکراوی ئاهورامەزدان بەلآم دەیانگەیەننە رِادەیەك کە ئەمانیش دەبنە دروستکەرو ئافەریدەگار.

ئەوەی کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە دەبێ پێش ئەوەی باسی ئەمشاسپەندان ــ بەو شێوەیەی کە تازە خراونەتە نیو ئاوێستادا۔ بکەین، دەبێ بێژین کە ئەم ئەمشاسپەندانە بەهیچ جۆرێك مەبەستی زەردەشتو باوەرِی ئەو پیاوە مەزنە نەبووەو نییەو هەرگیز لەئەندێشەی ئەودا نەگونجاوە.

هەروەکو گوتمان لە(هفتن یشت)دا بۆ یەکەین جار ئەمشاسپەندان لەشێوەی رۆحانیو معنویو نیشانەکانی ئاهورامەزداوە گۆرِاونو شێوەی مادییان بەخۆوە گرتووەو بونەتە فریشتەکانی بارەگای ئاهورامەزدا، وبەرەبەرە لەتەك تێپەرِینی رۆژگاردا، هەرچەندە لەمردنی زەردەشت

دوردەکەوینەوە، لەبەشەکانی دیکەی ئاوێستادا ئەم باسە زێتر بەرەو ئەفسانە دەڕواو ئەمشاسپەندان بە کارگوزارانی ئاهورامەزدا دادەنرێن، بۆ هەر یەکێکیان سەرپەرشتی بەشێك لەئیشوکاری سەر زەوییان پآ سپێردراوە، یەکآ سەرپەرشتی ئاژەڵ، یەکێکی دی پارێزەری گژوگیایە، یەکێکی تر سەرپەرشتی ئاو دەکاو ئەوی دیکەیان ئاگاداری کانەکان دەکاتو..... لەنووسینەکانی (پهلوی)دا ئیدی بە تەواوەتی مەسەلەکەیان چەواشە کردووە چونکە ئەمشاسپەندەکانیان بە وەزیرانی ئاهورا داناوە کەوا لەچەپو راستیدا ڕاوێستاونو فەرمانەکانی جێبەجآ دەکەن. ئەم شێوە باسە کارێکی زۆری بە شێوەیەکی راستەوخۆ کردۆتە سەر ئاینە سامییەکان (جولەکە، فەلە، ئیسلام) وە بێگومان جوبرەئیل، میکائل، ئیزائیل، ئیسرائل، ئیسوافیلو..... کە بە فریشتە نزیکەکانی خوا دادەنرێن، لەئەمشاسپەندانی ئاینی زەردەشتی وەرگیراوە.

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد ئەمشاسپەندان لەبەشە ڕەسەنەکانی ئاوێستادا (ئاوێستای کۆن) تەنیا وەك نیشانەکانی (یا سیفەتەکانی) ئاهورامەزدا باسکراون، بەلآم بۆچی لەپاشاندا نەخشو رۆڵی مادی یان بۆ دیاریکراوەو لەشێوەی چاودێرکەرو بەرپرسیاریەتی(عناصری) سروشتی پێشان دراون، ئەمە خۆی لەخۆیدا هانمان دەدا کە بزانین ئەو شتانەی کە ئەم ئەمشاسپەندانە بونەتە چاوادێریکەریان چین؟ دەبینین ئەم شەش شتە فرە پیرۆزو سودمەندو گرنگن بۆ ژیانی ئادەمیزادو پێشکەوتنی شارستانییەت وەك: ئاژەڵ، ئاگر، کانەکان، ئاو، خاكو گژوگیا.

هەموو دەزانین کە لەدێرزەمانەوە تاوەکو ئێستاش هەرشتێك کە ڕەنگوبۆنی ئایینی یا ئایینزاییو معنوی پێوە بوبێت زێتر چۆتە نێو دڵی خەڵکو باشتر پەسندیان کردووەو هەر لەو روەوە بوە کە پێشەوا ئاینیەکان هەرکاتێك گەرەکیان بوایەو هەنوکەش کە بیانەوێت سەرنجی خەڵکی بۆ شتێك رابکێشن، رەنگوبۆنی ئایینی پێوە دەکەن بۆئەوەی خەڵک بآهیچ (چەندوچۆنێك). ئەو شتە پەسەند بکەن.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ساسانیەکاندا، بەهۆی ئەو بایەخو گرنگێتیەی ئاینی زەردەشت بویەتی دەربارەی ژیانو ژینگەی ئادەمیزاد، هەروەها گرنگێتی چاودێری کردنی سروشتو پاراستنی لەپیس کردن، خراپ کردنو تێکدانی، بیریان لەوە کردۆتەوە کە هەریەکە لەو هۆ سروشتییە گرنگانەی لەژیانی ئادەمیزادا کاران، بەهەر جۆرێك بێت ببیەستنەوە بە یەکێك لەو نیشانانەی کەناوی ئەمشاسپەندیان پێوە لکێنرابوو. بەم هۆیەوە توانییان سود لەباوەڕی خەڵکی وەربگرن بۆ پاراستنی سروشت،و یاسا مانەندێکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دابڕێژن.

ئەم کارە بوە هۆی ئەوەی پەیوەندیەکی معنوی پتەو لەنێوان ئادەمیزادو سروشت دا پێك بهێنرێت. ژمارەی ئەم ئەمشاسپەندانە شەشن، کە هەریەکەیان لەجیهانی روحانی دا رۆشنگەری یەکآ لەنیشانە یا سیفەتەکانی ئاهورامەزدان، بەلآم بۆ جیهانی مادی بۆ هەریەکەیان کەسێیەتییەکی تایبەتیان پەیاکردووەو لەگەشەپێکردنو هەلێسوڕاندنی جیهاندا رۆلێێکی تایبەتییان بۆ تەرخان کراوە.

برِی جار لەهەندێ لەنووسینەکانی زەردەشتیەکان ژمارەی ئەم شەش ئەمشاسپەندانە دەبنە حەوت ئەوەش بەهۆی ئەوەیە کەوا ئاهورامەزدا دەخەنە سەرو هەموویانەوەو هەندێ جاریش سپەنتەمینۆ دەخەنە سەرویانەوەو بەوەوە دەبنە حەوت ئەمشاسپەند، ئەوەش بۆیە دەکەن چونکو ئاهورامەزدان خۆی هۆی چاکەو باشیەو لەبەرئەوەی ئەم شەش ئەمشاسپەندانە سیفاتی ئاهورامەزدان بۆیە خۆی دەخەنە سەرو ئەم دەستەیە.

ئەم شەش ئەمشاسپەندە بریتین لە:

1ـ وەهومەن Vohumana

وەهو = خاس ـ چاک ـ مەنا = بیرکردنەوە

وەهومەنە یاخود بیری خاس، رۆشنگەری نیشانەو سیفەتی پیرۆزی. توانایی، ژیرێتیو هۆشمەندی،و یەکەمین ئافەریدەری ئاهورامەزدایە.

بۆ هەلێسورِاندنی ئیشوکاری مادی، ئەم ئەمشاسپەندە سەرپەرشتیو چاودێری گشت ئاژەڵە سودمەندەکانی سەر روی زەوی پآ سپێردراوە. گرنگێتی لێپرسراوێتی ئەم ئەمشاسپەندەمان کاتێك بۆ رۆشەن دەبێت کە گرنگێتی ئەو شۆرِشە کۆمەلآیەتیو ئابورییەی کە زەردەشت بەرپای کردبو بزانین. زەردەشت هەوڵی دا کەژیانی کۆچەریەتی بگۆرِێتو خەڵکی نیشتەجآ بکاتو هانیان بدات خەریکی کشتوکاڵو بەخێوکردنی ئاژەڵ بنو گوندو شار دروست بکەن. بەخێوکردنو چاودێری کردنی ئاژەڵە سودمەندەکان لەسەرچاوەی بیرێکی خاسەوە هەلێدەقولێێت، کەوایە گشت ئاژەڵە سودمەندەکان پەیوەندی راستەوخۆیان لەتەك نیشانەی (بیری خاس) دەبێت کە نوێنەرەکەی ئەمشاسپەند وەهومەنەیە. بەمجۆرە، ئەم کارە بوە هۆی سەرکەوتنی ئەو شۆرِشە پیرۆزەی کە زەردەشت بەرپاي کردبوو لەبواری کۆمەلآیەتی، ئابوریو ئاکارییەوە، بۆیە وەهومەنە کە لەبواری معنوی دا نیشانەی بیری خاسی ئاهورامەزدایە، لێپرسراوێتی ئەم کارەشی خراوەتە ئەستۆ.

بێگومان ئاگادارێتیو سەرپەرشتی مرۆڤیشی لەئەستۆیە. پلەی وەهومەنە لەئەمشاسپەندەکانی دیکە گرنگترو بەرزترە بەجۆرێك ئەوانەی کە ئەمشاسپەندان بەشالیارانی ئاهورامەزدا دەژمێرن پلەی وەهومەنە بەسەرەك شالیاریان دادەنێن.

ئاهورامەزدا، بەهۆی وەهومەنە ئەقلأو ژیرێتیو هۆش بە ئادەمیزاد دەبەخشێت، بەمجۆرە وەهومەنە ئادەمیزاد لەئاهورامەزدا نزیك یا دوور دەخاتەوە. یەکآ لەکارەکانی وەهومەنە ئەوەیە کە ئادەمیزاد فێریوتەی خاس دەکاتو دووری دەخاتەوە لەقسەی خراپو نالەبار. بەگوێرەی داستانی زەردەشتیەکان، وەهومەنە ئەو ئەمشاسپەندەیە کە رۆحی زەردەشتی گەیاندۆتە بارەگای پرِ شکۆی ئاهورامەزدا، لەم رِوەوە وەهومەنە وەك فریشتە جبرئیلوایە لەئاینی ئیسلامدا.

2ـ ئاشا وەهیشتا AŞa – VahiŞta

ئاشا، بە مانای ڕاستیو دروستی، پیرۆزی، یاساو پاکییە. ئەم وشەیە لەئاوێستادا فرە بەکارهاتووەو باسکراوە، بۆ نمونە تەنیا لەگاتاکاندا کە پتر لە 896 چەکامە نیە، 180 جاروشەی ئاشا بەکارهاتووە. وەهێشتا بە مانای باشترینە. کەواتە مانای ئاشاوەهیشتا دەبێتە باشترین ڕاستیو دروستی. لەجیهانی ڕۆحیو معنویدا ئاشاوەهیشتا نوێنەری نیشانە یا سیفەتی ڕاستی، پاکی، وپیرۆزی ئاهورامەزدایە. لەجیهانی مادیدا سەرپەرشتی هەموو ئاگرەکانی زەوی پێسپێردراوە. لەوانەیە ئەم ئەرکەی بۆیە پآ سپێرابێت چونکو ئاگر خۆی پلەوپایەو گرنگییەکی تایبەتی هەیەو نیشانەی پاکیو چاکیە.

هەر کەسێك پەیڕەوی ئاینی خواپەرستی زەردەشتیە پێی دەبێژن ئاشەوەن AŞavan و لەئاوێستادا بەزەردەشت دەبێژن ئاشوزەردەشتواتە زەردەشتی پاكو پیرۆز.

3ـ خشەترەوئیریە KhŞathra – Vairya

بەمانای شالیاریو توانایی فەرمانڕەوایەتیو حوکمڕانێتیو (وولآتی ئارەزوو) (المدینە الفاچلە) یاخودوولآتی نەمری ئاهورامەزدایە، ئەو سەر زەمینەی کە هەرگیز لەنێوناچێت، واتە بەهەشتی بەرینو فراوانە، ئەو شوێنەی کە جێگەی مەزنان مەزنترەواتە جێگەی ئاهورامەزدایە، ئادەمیزاد دەبێ ڕەفتارو کرداری لەژیاندا بە شێوەیەك بێت کە پاش مردنی شیاوی ژیان لەوولآتە نەمرە بێت.

خشەترەوەئیریە لەجیهانی معنوی دا نیشانەو سیفەتی هێزو توانای فەرمانڕەوایەتی ئاهورامەزدایە.

نەقشو ڕۆڵی کانەکان (فلزات) لەپێشخستنی ژیانی ئادەمیزادو شارستانیەتو پیشەسازیدا بۆ هەموان ئاشکرایە. لەلایەکەوە پشکنینو دەرهێنانی کانەکانو خاس بەکارهێنانیانو بەفیرۆنەدانیانو چاودێری کردنیان نیشانەیەکە لەنیشانەکانی توانایی بیرو زانیاری تەواوی ئادەمیزاد، لەلایەکی دیکەوە کان(فلز) نیشانەی توانایی، هێز، خۆڕاگرتنو بەرگرییە. لەبەرئەوە (کان) پەیوەندی تەواوەتی لەتەك نیشانەی تواناییدا هەیە بۆیە نوێنەرایەتی ئەم ئەرکەی خراوەتە پالأو لەجیهانی مادی دا بۆتە سەرپەرشتو چاودێری هەمە جۆر بەردو کانەکان لەروی زەویدا.

4ـ سپەنتەئارمەئیتی Spenta Armaiti

(سپەندامەند)، ئەسفەند

سپەنتە= پاك، ئارمەئیتی= ئەوینو دلۆڤانی

ئەم نیشانەیە(ئەمشاسپەند) لەجیهانی رۆحیدا دیاردەی خۆشەویستیو دلۆڤانیو دڵفراوانیو بآ فیزی ئاهورامەزدایە.

یەکآ لەهۆکانی بەردەوام بونی ژیانی ئادەمیزادو گشت زیندەوەرەکان لەسەر روی زەوی ئەوەیە کە خاکی زەوی بە پاکی بمێنێتەوەو کارێك بکرێت کە بەهیچ شتێك پیس نەکرێت بۆئەوەی بتوانێت وەك دایکێکی دڵسۆز بە میهرەبانییەوە بەرهەمەکانی خۆیمان پآ ببەخشێت، لەبەرئەوە دەتوانین بێژین کە زەوی نمونەی خۆشەویستیو لەخۆبوردنە بۆ هەموو زیندەوەرەکان، بۆیە پەیوەندییەکی تایبەتی هەیە لەتەك نیشانەو سیفەتی خۆشەویستی یەکی پاكو راست، لەبەرئەوەیە لەجیهانی مادیدا چاودێریوسەرپەرشتی زەوی پێ سپێردراوە کە بەئەرکی سەرشانی هەڵسێتو هەمیشە زەوی بە پاکیو بە پیتو بەرەکەت بهێلێیتەوەو چاودێریو سەرپەرشتی زەوی پآ سپێردراوە کە بەئەرکی سەرشانی هەڵسێتو یارمەتی ئەو کەسانە بدات کە خەریکی کشتوکاڵ کردن دەبن.

5ـ هەئورەتات Haurvatât

بە مانای بآخەوشێتیو پوختەییو تەندروستیە، لە رروی معنوی یەوە ئەم ئەمشاسپەندە هەمیشە خێرو خۆشیو شادیو ئاسایش بەرۆحی چاکان دەبەخشێت. چاودێری کردنی ئاو، پیس نەکردنیو سود وەرگرتن لێ، نیشانەی بآخەوشێتی بیرو هۆشی ئادەمیزادە، لەبەرئەمە پەیوەندی دەبێت لەتەك نیشانەی هەئورتات، بۆیە ئەم سیفەتە لەروی مادیەوە کراوە بەسەرپەرشتی ئاوو چاودێری گشت جۆرە ئاوەکانی سەر زەویو ژێر زەوی.

6ـ ئەمرتات Ameretât

بە مانای (نەمر)یە. نیشانەی هەمیشەییو نەمرێتی ئاهورامەزدایە. گژوگیا، دارودرەخت لەسەر زەوی نیشانەی بونی ژیانە، بە شێوەی ڕاستەخۆو ناڕاستەوخۆ مایەی بەردەوامبونی ژیانی ئادەمیزادو هەموو زیندەوەرێکە. لەناوچونی گژوگیا، مانای لەناوچونی ژیانی زیندەوەرانە لەسەر زەوی، پارێزگاری کردنیانو هەوڵدان بۆ گەشەپێکردنیان دەبێتە هۆی بەردەوام بونی ژیانی زیندەوەران. کەواتە گژوگیا پەیوندییەکی پتەوی لەتەك نەمرێتی دا هەیە، بۆیەکا ئەمشاسپەند ئەمرتات لەجیهانی مادیدا کراوە بەسەرپەرستی گژوگیاو درەختو کێڵێگەکان.

لەپەیامی زەردەشتدا، هەمیشە ئادەمیزاد هاندراوە کە لەژیانیدا تێبکۆشێت خووڕەوشتی راستیو دروستی ئاهورایی بکاتە پیشەی خۆی، وەها پاكو رێكوپێكو بیرخاس بێت کە بگاتە سیفەتی خاس بیرکردنەوە، خۆشەویستیو خۆ بەزل نەزانینو دڵفراوانی دەبێ بە تەنیا مایەی رزگاری خۆی دابنێت. کاتێ کەراستیو دروستی بووە ئارەزووی مرۆڤ، ویژدانو دەرونی پاكو بیری بێگەردبوو، دلۆڤانیو بآ فیزی کردە پیشەی خۆی، بێگومان ئەوسا دەگاتە ئەو دوو سیفەتانەی دیکەی ئاهورایی کە بریتین لەبێخەوشێتیو نەمرێتی. هەرکە ئەو سیفەتانەشی وەچنگ هێنا

ئیدی فەرمانڕەوایی‌و هێزو توانای ئاهورایی دەیخەنە ژێر رکێفی خۆیان‌و لەوولآتی نەمری‌و کیشوەری رۆحانی خوای داناو مەزن، لەبارەگای ئافەریدەگار بۆ هەمیشە پشوو دەدات.

بە کورتی بۆ زێتر رونکردنەوەی کارتێکردنی ئەم شەش سیفەتانە بۆ سەر ژیانی ئادەمیزاد، دەتوانین شەش قۆناغ ڕەچاوبکەین، کە لەهەریەکە لەم قۆناغانە، ئادەمیزاد دەبێ یەکآ لەو سیفەتانە بۆخۆی وەدەست بهێنێت‌و لەخۆیدا پەروەردەی بکات.

ئەم شەش قۆناغە بریتین لە:

- قۆناغی یەکەم: بیری خاس (وەهومەن)

بێگومان بۆئەوەی ژیانێکی خاس‌و بەختیارمان هەبێت، پێش هەموو شتێك پێویستیمان بە بیرێکی خاس‌و پاك هەیە. کەوایە دەبێ خاس بیربکەینەوە.

- قۆناغی دووەم: خاسترین ڕاستی‌و پاکی ((ئاشاوەهیشتا))

ئەم قۆناغە هەوڵدانە بۆ گەیشتنە پاکی‌و راستی، پاکی دەرون (واتە بیرکردنەوەی خاس)و پاکی رواڵەت (واتە پاکی لەش، جل‌وبەرگ، خواردن‌و ژینگە)

- قۆناغی سآیەم: توانایی فەرمانڕەوایەتی‌و حوکمڕانێتی

ئاشکرایە هەر کەسێك خاس بیربکاتەوەو لەڕوی دەرون‌و ڕواڵەتەوە پاك بێت، ئەوسا خەڵک قسەکانی پەسەند دەکەن‌و گوێی بۆ ڕادەگرن. لەتەك وەدیهێنانی دوو سیفەتی بیری خاس‌و راستی‌و پاکێتی‌و گەیاندنی ئەم دوو سیفەتە تا پلەی بآخەوشێتی، ئادەمیزاد دەگاتە سێهەمین سیفەت یا سێیەم قۆناغ کە بریتیە لەتوانایی کۆنترۆڵی دەرون‌و ئارەزووەکانی‌و بەم شێوەیەی کە دەخوازآ ژیان دەبێتە سەر.

- قۆناغی چوارەم: خۆشەویستی "دلۆڤانی" سپەنتەئارمەئیتی/

توانای خۆشەویستی کاتێك دەتوانآ جێگیرو هەمیشەیی بێت کە ئادەمیزاد بتوانێت بە باشترین شێو سود لەو یفەتەی پێشو بگرێت چونکو بیرێکی خاس دەتوانآوا لەمرۆڤ بکات کە بەراستی‌و میهرەبانی لەتەك خەڵکدا رەفتار بکات‌و هێزو توانایی دروست دەتوانآ ئادەمیزاد بەسەر دەرون‌و ئارەزووەکانی زاڵ بکات‌و هانی بدات بەختەوەری‌و ئاسایش بە خەڵکی خەلات بکات‌و خۆیشی سودی لێوەربگرێت‌و ئەویندار ی گشت خەڵکی جیهان بێت.

- قۆناغی پێنجەم: بآخەوشێتی (کەمال)، هەئورتات

لەم قۆناغەدا، ئیدی ئادەمیزاد لەهەموو ڕوویەکەوە بآخەوشە، واتە خاس بیردەکاتەوە، لەگشت رویەکەوە پاكو راستی کردۆتە پیشە، خەڵکی خۆشیان دەوآو ئەویش خەڵکی خۆش دەوێت، بە میهرەبانیو بآفیزییەوە سود لەم سیفەتانە وەردەگرێت بۆ پێشخستنی خۆیو کۆمەڵگا.

- قۆناغی شەشەم: نەمرێتی، ئەمرتات،

دەربارەی نەمرێتی گیان (ڕەوان)، زەردەشتیەکان باوەڕیانوێیە کە ڕەوان هەتاهەتایە دەمێنێو لەناوناچآو هەرکەسێك گەیشتە پلەی بآخەوشێتی ئیدی ناوونیشانی هەمیشە زیندوو نەمرەو پاش مردنیشی نێوی لەنێو خەڵکدا بە باشی دەمێنآ.

لێرەدا بەپێویستدەزانم باوەڕوبۆچونی بڕی لەتوێژەرانو زانایان دەربارەی ئەمشاسپەندان باس بکەم:

بارتلومە:

ئەم شەش نیشانەو سیفەتانە، وەك فریشتەکان لەئاینەکانی جولەکەو فەلە دادەنێتو لەو باوەڕەدایە کە چلۆن بونی ئەو فریشتانە لەو ئاینانەدا هیچ لەیەکتاپەرستێتی خوا کەم ناکاتەوە، ئاینی زەردەشتیش بە بوونی ئەمشاسپەندان لەیەکتاپەرستیەکەی کەم نابێـەوە چونکو لەگاتەکاندا ئەمە تەنیا ئاهورامەزدای دانایە کە هێزوتوانای هەیەو باوکو پارێزگەری گشت یاسای جیهانەو تەنیا ئافەریدەگارێکە.

بارتلومە دەبێژێ: ((ئەم نیشانەو سیفاتی خواییە کە لەپاشاندا ناوی لێنراوە ئەمشاسپەند، هیچ جۆرە کەسێیەتییەکی تایبەتییان نەبووە، ئەمانە نە شێوەیەکی تایبەتییان هەبووە، نە ڕەنگـو نە... بە پێچەوانەی ئەمانە، شکۆییو گەورەییو هێزو توانا لەخودا دایەو بەس، ئامۆژگارییەکانی زەردەشتیش تەنآ دەربارەی ئەو دەدوێت.))

میلز:

لەو باوەڕە دایە کە خوای زەردەشت، خوایەکی تەنیایەو دانایەو ئەمانە شەش نیشانەو سیفاتی ئاهورامەزدانو هەرگیز شێوازو ڕووخساری فیزێکی یان نیەو وەك فریشتەکانی ئایینەکانی دیکە نین کە روخساری ەفسانەییو هەریەکە چەندین باڵیان هەیەو...

مولتون، دەڵی:

((پێویست ناکات کاتی خۆمان بە فیرِۆ بدەینو خۆمان بەوە ماندووبکەین کە ئایا بیری ئەم حەوت یا شەش پیرۆزە نەمرە (ئەمشاسپەندان) لە (بابل)ەوە هاتۆتە ئێران یاخود لەحەوت ئاینە کۆنەکانی ئارياییەکانی ناوچەکە وەرگیراوە. بەڵکو پێویستە بگەڕێینەوە سەر خودی تیۆرییەکانی

زەردەشت خۆیو ئەو تیۆریانە لەو ئەفسانانەی کە پاش زەردەشت خراونەتە سەریان، پاك بکەینەوە. دەبێ ئەم ڕاستیە قەبول بکەین کە بەگوێرەی ئەو بەڵێگانەی بۆمان ماوەتەوە ناتوانین بیسەلمێنین کە زەردەشت ئەم شەش ئەمشاسپەندانەی بەو شێوەیە باسکردووە))

مولتون باوەڕی بەوە هەبووە کە ئەم شەش نیشانەو سیفەتانە نەجیایە لەخودی ئاهورامەزداو نە لەویش کەمترن، بەڵکو بەشێکن لەخودی خوا، ئەمانە سیفاتی خواپین کە بەشێك لەبوونی خۆییان پێ دەدات بۆئەوەی بینوێنن‌و دەریبخەن، بۆوێنە: وەهومەنە کە هەمیشە باسی لێدەکرێت دەتوانین بە بیری خوای دابنێین.

لومل:

ئەمشاسپەندان بە هۆشمەندانێکی هەمیشە زیندوو نەمر دەزانێت‌و لەو باوەڕەدایە کە ئەمانە نیشانەو سیفاتی خواپین، هەروەها دەبێژێ کە تەنانەت لەئاوێستای تازەشدا (یشت 13/81) ئاهورامەزدا بەم شێوەیە باس دەکرآ - ئاهورامەزدا شێوەی جۆراوجۆر بەخۆوە دەگرێت کە ئەمشاسپەندانی جوان‌و مەزنن ـ لەم باسەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوآ کە ئەم ئەمشاسپەندانە فرە نزیکن بە ئاهورامەزداو بەشێکن لەو، واتە لەو کەمترن (چونکو بەشێکن لەو)و سەربەخۆیی تەواویان نییە. لومل لەئاماژەکردنیدا بۆ بڕی لەسرودەکانی گاتەکان کە باسی وەهومنەو ئاشای تێدا کراوەوای بۆچووە کە ئەمانە گشتیان سیفاتی خواپین، بۆوێنە:

لە 28/3 دا هاتوە، زەردەشت داوا لەوەهومەنە دەکات کە یارمەتی بدات.

لە28/2 دا بەهۆی وەهومنە (بیری خاس)، زەردەشت لەخوا نزیك دەبێتەوە.

لە 29/10 دا هاتوە، زەردەشت داوا لەخوا دەکا کە هێزوتوانای وەهومنە بدا بە لایەنکرانی،

لە 31/8و 45/4 دا هاتوە، زەردەشت وەهومنەی لەبیرو ئەندێشەی خۆیدا هەیە کەزادەی مەزدایە

لە 44/3 دا هاتوە، ئەو کەسانەی کە گوێ بۆ ڕاوێژی وەهومنە ناگرن، زەردەشت لێیان دڵگیرە،

لە 45/10 دا هاتوە، خواوادەی داوە کە بآخەوشێتی‌و نەمرێتی بەهۆی وەهومنەوە بەدەست دێت،

لە 44/6و 33/12 دا هاتوە، ئەوانەی باوەڕیان بە مەزدا هەیە بەهۆی وەهومنە دەگەنە پلەوپایەو شکۆیی.

28/10 دا هاتوه، ئەوانەی رِێبازی وەهومنە دەگرنەبەرو بەکردەوەکانی رەفتار دەکەن، خوا پاداشتی راستیان پێدەدات.

34/14-12 دا هاتوه، خوا بەهۆی راستیەوه (ئاشا) رێگەی بیری رەسەنی (خاس بیرکردنەوه) وەهومەنەمان فێردەکات کەئەمە خۆی ئاینی رزگاربوانە.

30/10 دا هاتوه، رِاستی (ئاشا) لەنێو سەرای وەهومنە دا دەژی

34/9 دا هاتوه، ئەو کەسەی راستی (ئاشا) لەباوەش نەگرێت، وەهومنەی لـآ دورە.

34/9 دا هاتوه، راستی (ئاشا) لەو کەسانەی گویَ رِایەڵی وەهومنە نەبن، تەرەدەبێت.

29/10 دا هاتوه، خوا پشتوپەنای لایەنگرانی راستی (ئاشا)نوزەردەشت داوای یارمەتی لەخوا دەکا بۆیان.

31/8- 29/8 ـ 29/7 دا هاتوه، مەزدا بەهۆی داناییەوه، راستی (ئاشا)ی ئافراندو لەتەکیا هاوبیرە.

31/6 دا هاتوه، ئەو کەسەی ژیانی خۆی لەتەك رِاستیدا هاوجوت بکات وەك مەزدای لێدێت.

لومل، پاش ئەوەی ئەم بەندانە شیدەکاتەوه بە شێوەیەکی فرە سادە باسی دەکاو دەبێژێ.

((پاش ئەوەی خاس لەم سرودانەوورد دەبینەوه ئیدی دروست نییەو نابێ ئەمانە ببەستینەوه بە کێشەی سەرو سروشتیەوه (مافوق الگبیعە)، بەڵکو ئەم سرودانە گشتیان بە شێوەیەکی رِاستەوخۆ پەیوەندییان، لەتەك ژیانی ئادەمیزاد دا هەیە، بە هیچ کلۆجێكو لەهیچ یەك لەسرودەکانی نێو گاتاکاندا لەم بارەوه ئەم سیفەتانە وەك بونێکی سەربەخۆ یا مادی باسی لێنەکراوە، بەڵکو لەهەمویاندا مەبەست لەم نیشانەو سیفەتانە، سیفەتی خواین.))

ئالتیهم، دەبێژێ:

((زەردەشت هەرگیز نیشانەو سیفەتەکانی ئاهورامەزدای وەك بونێك یا کەسێیەتییەکی تایبەتی و مادی کە رِوخسارێکی تایبەتییان هەبوبێت، نێر یا مآ بن، پێشان نەداوە، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاکاریو رۆحانییان بووەو بە هیچ جۆرێك وەك ئاینی هیندۆکان یا ئاوێستای تازە نەبووە. ئەمانە تەنیا وەك بیرێکی ئاکاریو رۆحینو بەس.))

ویل دورانت، لەم بارەیەوە دەبێژێ:

((زەردەشت حەوت سیفەت یا چونیەتی بۆ ئاهورامەزدا رەچاو کردووە. رووناکی، بیری خاس، راستی، فەرمانڕەوایەتی، پاکێتی، خێرو نەمرێتی. بەڵام پاش خۆی (زەردەشت) چونکو لایەنگرەکانی (پەیڕەوانی) فێری فرەخوایی بوبون، ئەم چونیەتیەو سیفاتانەیان بە شێوەیەکی مادی دەرهێناو نێویان لێنان ئەمشاسپەندان یا (پیرۆزە نەمرەکان) کە بە دەستورو فەرمانی ئاهورامەزدا سەرپەرشتی هەموو بوونو جیهان دەکەن.

بەم شێوەیە ئەو یەکتاپەرستیە مەزنەی کەبەهۆی دامەزرێنەری ئەو ئاینە هاتبووە ئارا، هەروەك ئاینی فەلە دوچاری نوشوستیو فرەخوایی بوو.))

هینتس، دەبێژێ:

((... پاش زەردەشت بوو کە ئەمشاسپەندان بە نێوی (پیرۆزەنەمرەکان) نێویان لێنراو بە شێوەیەکی خوامانەند درانە قەڵەم کە لەتەك ئاهەرامەزدا دا گروپێکی حەوتانەی ئاسمانی هاتە ئارا. ئەم کارە ناپەسەندە لادانێکی فێلآویو خراپ بوو کە لەلایەن مۆغەکانەوە بەنێوی زەردەشتەوە لەسەردەمی ساسانیەکاندا بلآوبۆتەوە. لەگاتەکاندا، ئاهورامەزدا بە شێوەیەکی یەکجار گەورەو مەزنو یەکتا باسی لێکراوە. خوای تاکوتەنیاو بێهاوتا لەلایەن زەردەشتەوە زۆر گەورەو پاکە، مانای خوا لای زەردەشتو لەپەیامەکەیدا فرە مەزنترو شکۆمەنترە لەئاینەکانی دیکە)).

اشپینگل، ویندیشمان، کیگر، دەبێژن:

((ئەوەی لەنێو گاتاکاندا دەستمان دەکەوێت ئەوەیە کە ئاهورامەزدا، خوای تاکوتەنیای ئاینی زەردەشتە، هەروەکو چلۆن یەهوە لەتەوراتداو (الله) لەئاینی ئیسلامدا دیارگەی هێزی یەکتایین، راستی (ئاشا)و ئەمشاسپەندەکانی دیکە گشتیان هەریەکە سیفەتێکن لەسیفەتەکانی ئاهورمەزدا.))

ئازەرگوشەسب، دەبێژێ:

((مەبەستی زەردەشت لەوەی کەنێوی ئەمشاسپەندەکان لەگاتاکاندا دەبێتو داوای هاریکاریو یارمەتیان لێدەکات ئەوەیە کە گەرەکی بووە نیشانەکانی خوا بۆ باوەڕپێهێنراوەکانی بە مەزدا ئاشکرا بکاتو ئەم سیفەتانەیان بۆ پەروەردەبکات، هەروەکو چلۆن لە 34/11 دەبێژی: ((ئەی خوای مەزن، لەژێر سایەی هێزی ئیرادە، بیری خاس، راستیو پاکی، ئەوینو باوەڕ بەخوا، ژیانی نەمریو هێزی معنوی (خشترا، وەهومنە، ئاشا، ئارمەئیتی) زێتر دەبێت)). ئەو سیفەتانە لەنیشانەو سیفەتە تایبەتییەکانی، چوار ئەمشاسپەندە (وەهومەن، ئاشا، خەشتراو ئارمەئیتی).

**ئێزەدەکان**

پاش ئەوەی باسی ئاهورامەزداو ئەمشاسپەندانمان کرد، وەپێش ئەوەی باسی ئێزدەکان بکەین پێویستە هەمیسان ئەم ڕاستیە بخەینە پێش چاو کە هەرشتێك لەم جیهانەدا دژی خۆی هەیەو ئەم دژایەتیە لەتەك تێپەڕبونی ڕۆژگارو ساڵنی دووردرێژ، لەئاینی زەردەشتدا شێوازی ئاشکراو ڕۆشەنی بەخۆیەوە گرتووە. بەرامبەر هەر چاکییەك خراپیەك هەیە، هەردوو لایەنی (ئەرێتی) و(نەرێتی) لەجیهانی مادیو موعنەوی دا بەسەر ژیاندا زاڵین. لەئاینی زەردەشتیدا ئەمواقعیەتانە زۆر بە ڕاشکاویو جوانی باسکراوە. هەرچەن ئەمشاسپەندان بریتین لەرۆحی هەمیشە زیندوو نیشانەی بەختەوەریو خۆشیو شادین، هەروەها بەرامبەر ئەمانە ئەهریمەنانێك هەن کە نیشانەی رۆحی شەڕ خراپەو ناخۆشین.

لەئاینی زەردەشتیدا، باسی ئەم دوو هێزە کارایە زۆر بەووردیو جوانی شێکراوەتەوە. ئاهورامەزدا لەسەرو هەموو بوونێکە، لەجیهاندا دووهێزی چاکەو خراپە، ڕووناکیو تاریکی هەیە.

سپەنتەمنیۆ spenta mainyu لەسەرو هەموو ئەمشاسپەندانو ئێزدەکانو سیفاتە خاسەکانە، بەرامبەر بەو وەلەسەرو هەموو هێزە شەڕخوازو خراپەکان ئەنگرەمینۆ Angra manyu یە کە دژی سپەنتامینۆیە. هەر بەو شێوەیەی کە سپەنتامینو بۆ بەرەنگاری کردنی ئەهریمەن نیازی بە شەش فریشتەی رۆحی بوو، هەروەها ئەنگرەمینوش بۆ بەربەرەکانی کردنی سپەنتامینو شەش دێو یاخود رۆحی خراپەی هێنایەکایە. دۆستانو یارانی ئاهورایی، هاوکارو یاوەرانی بیری چاکـو پیرۆز یا سپەنتامینو، ناویان ئەمشاسپەندان یا فریشتەکانە، شەش دێو یاخود رۆحی خراپەو شەڕخواز کە بەهۆی ئەنگرەمینو هاتونەتە ئارا پێیان دەبێژرێت"کەماریکان Kamarikan " کە هەریەکەیان بەرامبەر یەکی لەئەمشاسپەندان دانراونو دژایەتی کارو کرداریان دەکەن بەم شێوەیەی خوارەوە.

1ـ ئاکامەنە AKamanah بەمانای بیری خراپ یا رۆحی خراپـو دژی وەهومنەیە.

2ـ ئیندرە Indra بە مانای رێ هەڵەکەرو دژی راستی (ئاشاوەهیشە)یە

3ـ سەئوروە Saurva سەردەستەی خراپەکارانو ستەمکارانەو دژی خەشترەوەئیرەیە.

4ـ ناوەنگ هەئیشیە Haithya Nawang نیشانەی سەرکێشیو نافەرمانیەو دژی سپنتەئارمەئیتییە.

5ـ تەرومەتی Taro mati یا تەئوروی Taurvi نیشانەی برسێتیو تینوێتی یەو دژی هەئورتاتە.

6ـ زەئیریش Zairis یا زەئیریچە Zairiça هاوکاری تەرومەتییەو دژی ئەمرتاتەواتە نیشانەی مەرگـو فەوتانە.

ئیزەد: هەمانوشەی (یەزەتە Yazata)ی ئاوێستاییەو لە(یەز)ەوە هاتووە Yaz کە مانای ستایش کردنە (نەك پەرستن). ئیزەد یا یەزەتە مانای (شیاوی ستایش)ە. و بە عناصرێکی رۆحانی دەبێژرێت کە کەمێك پلەوپایەیان لەئەمشاسپەندان نزمترەو بە یاریدەرانیان دەژمێرێن. ژمارەیان لەتەك ئەمشاسپەنداندا دەکاتە سی.

لەئاینی خواپەرستی زەردەشتیدا (پاش مردنی زەردەشت) هەر عنصرێکی خاسو سودمەندو جوان شیاوی ستایشکردنو رێزلێنانە

وەك: ئاگر، ئاو، باران، رۆژ، هەسارە، مانگ، خاك، با، وبرِێ دیاردەی سودمەندی دیکە وەکو تەندروستی، سامان، خۆشی، شادیو.....

لەسەردەمی پێش زەردەشتدا لەنێو ئاریاییەکاندا بۆ هەر یەکێك لەو عەناصرە خاسانە چاودێرکەرێکیان داناوەو تا رِادەی پەرستن رێزیان لێگیراوە، بەلاَم زەردەشت لەئاینی خواپەرستیداو لەپەیامە نەمرەکەی خۆیدا، ئاهورامەزدای تەنیا بەشیاوی پەرستن داناوەو لەنێو گاتاکاندا بەهیچ جۆرێك دەربارەی ئیزەدەکانو چاودێریکەرانی عناصری چاکە باسێك نەکراوە، گشت ئەو شتانەی پیاوە ئایینیە کۆنەکان پێی هەلێدەستان وەك قوربانی کردنو پەرستنی ئەو عناصرانە، هەموویانی قەدەغە کردووەو بەکارێکی نالەباری زانیوە. باشترین بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە هەریەکە لەئەمشاسپەندەکانو ئیزەدەکان تەنیا بریتین لەسیفەتێك لەسیفەتەکانی ئاهورامەزدا، وەهەرگیز لەریزی ئەودا دانەنراون ئەوەیە کە بۆ یەکجاریش بێت هیچ کامیان وەك ئافەریدەگار باسیان لێنەکراوە.

بەلاَم لەبەشەکانی دیکەی ئاوێستادا (جگە لەگاتاکان) وەپاش سەردەمی خودی زەردەشت، دوبارە ئەم ئیزەدەچاودێرکەرانە بە شێوەیەکی دەستکاری کراوەو وەستایانە جێگەو پلەی تایبەتییان بۆ دانرایەوە بەلاَم تەنیا بە یەك جیاوازی ئەویش ئەوەبوو کە نەدەپەرستران بەڵکو تەنآ بە عناصری چاکـو پیرۆزیان داناون کەوا شیاوی رێزو باسکردن بن.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە تا سەردەمی هەخامەنشییەکان بۆ هیچ یەکێك لەم ئەمشاسپەندو ئیزەدانە هەیکەل دانەرِێژرابوو بۆ یەکەمین جار لەسەردەمی ئەردەشیری هەخامەنشی هەیکەل بو ئاناهید دروست کراوە.

مانك جی نوشیروان جی دڤالا لەکتێبی (خداشناسی زردشت، از باستانی ترین زمان تاکنون) ل 138 دەبێژێ:

لەکتێبەکانی ئاوێستادا، ئیزەدەکان بەگوێرەی ئەرکی سەرشانیان بەدوو گروپ دابەش دەکرێن، یەکێکیان ئیزەدە رۆحانییەکان یان معنویەکانن، ئەوی دیکەیان ئیزەدە مادیەکان یا دنیاییەکانن:

ئەو ئیزەدانەی نوێنەر یا (بریکاری)ی یەکآ لەسیفەتە معنوی یەکانن بریتین لە:

| | |
|---|---|
| دین، چیستی، سروش | بریکاری زانیاری خوایي |
| مهر (میترا)، رەشن، ئەشتاد، ئەرد رسانستات | بریکاری ڕاستیو دروستی |
| وەرترغنە (بەهرام) | بریکاری سەرکەوتن بەسەر دوژمنان |
| رامن (رام) | برێکارێتی بەختەوەریو خۆشیو شادومانی |
| رەتە (رادی) | بریکاری دەستبلآویو بەخشین..... |
| ئاخشتی | بریکاری ئاشتیو ئاسایش |
| مانترەسپەند، دەهمەئافریتی | بریکاریوتەی پیرۆز، نزا..... |
| داموأش ئوپەمن، ئیریامن، هوم | بریکارتەندروستیو دەواودەرمان |
| ئەشیونگهوئی، پارەندی | بریکاری داراییو سامانو دەوڵەمەندی |
| درواسپ، گی ئوش ئورون | بریکاری مەروماڵآتو ڕەشەووڵاخ |

ئەو ئیزەدانەی کە نوێنەر یا بریکاری یەکآ لەکارەکانی جیهانین بریتین لە:

| | |
|---|---|
| خۆر، مانگ، ئاسمان، ئوشە | بریکاریەتی گشت هۆکانی رووناکیو |
| تشتر، وننت، ستەویس، هپتورنگ | هەسارەکانی ئاسمانین |
| وایو (با، هەوا) | بریکاری هەوایە |
| ئازەر (ئاگر)، نیروسنگ= | بریکاری ئاگرەکانن |

ئەردەویسورئەناهید، ئەپم نەپات، ئاهورانی = بریکاری ئاوەکان

رام بریکاری زەوییە

لەکتێبی (خردە ئاوێستا) کە یەکێکە لە پێنج بەشەکانی ئاوێستای نوێ، بەدووورودرێژی باسی هەر سی30 ئیزەدەکان دەکات. لێرەدا زۆر بەکورتی پوختەیەك لەهەریەکە لەئیزەدەکان باس دەکەین، ئیشوکاریانو ئەو نزاو نیانیشوویردانەی کە لەکاتی تایبەتیی دا بۆیان دەخوێننو....

ئیزەدی دەئنا (دین):

ئەم ئیزەدە زۆر کەمو بەدەگمەن لەئاوێستادا ناوی لێبراوە، بریکاریەتی ئایینو ئەحکامی خودایی پێ سپێردراوە. هەرچەندە ئەم ئیزەدە (یەشت)ێکی تایبەتی خۆی هەیە بەلاَم زێتر باسی ئیزەدی هاورێیواتا (چیستی) کە بریکاری زانستو زانیاریە، دەکات. لەهەموو شوێنێکی (دین یەشت) ناوی ئیزەدی (دین) هاوجووت لەتەك ئیزەدەی (چیستی) دایە.

ئیزدی چیستی (یا ئیزەدی زانست):

بە پێچەوانەی ناوی ئیزەدەی (دەئنا)، ئەم ئیزدە کە بریکاریەتی زانستو زانیاری پآ سپێردراوە، لەئاوێستادا فرە باسی لێکراوە.

لە(یەشت)ی تایبەت بە چیستی یا (دین)دەبێژێ:

<u>بەندی 1:</u>

ستایشی راستترین زانیاری ئافەریدەگاری پیرۆز دەکەین، کە رێگەی چاکیمان پیشان دەداتو بە رێگەی راستیمان دەبێتو رێبەرێتی ئادەمیزاد دەکا بۆ پەیڕەوکردن لەئاینی خاسی مەزدایی.

<u>بەندی 2:</u> زەردەشت بەم شێوەیە ستایشی (چیستی) کردووە:

((ئەی ڕاستترین زانیاری مەزدا ئافەریدەگاری پیرۆز، ئەگەرکو لەپێش منەوەیەت، چاوەڕێم بکە پێت بگەمو ئەگەر لەپاشمەوەیەت پێم بگە.))

<u>بەندی 3:</u>

((با بەهۆی تۆوە بەهرە لەئاشتیو ئاسایش وەربگرینو هەموو رێگاکان بمانگەیەننە ئامانجو لەنێو شاخو کێوەکاندا رێگەی باشو ئاسان دروست بکرێتو بتوانین لەنێو دارستانو بێشەکاندا بەبێشی تێپەڕینو لەو رووبارانەی کە کەشتی پیادا دەڕوات بتوانین بە ئاسانی تێپەڕبن.))

بەندی 13:

((لەو زانستەی کە مەزدا ئافراندویەتی، هێزی پآ، بیستنی گوێ، بینایی چاوو تەندروستی لەشو تەمەنی درێژ، زێدە بکرێت.))

**ئیزەدی سروش:**

سروش یەکێکە لەئیزەدە گەورەکانی ئاینی خواپەرستی زەردەشتی. ئەم ئیزەدە، ئیزەدی گوێ ڕایەڵیو فەرمانبەردارییەو لەگاتاکاندا پلەوپایەکی بەرزی بۆ دانراوە سروش نیشانەی گوێ ڕایەڵێتیو فەرمانبەرداری بآچونوچەرای ئاهورامەزدایەو خەڵکی فێری ئەم خووڕەوشتە دەکات. لەهەندێ شوێندا پلەوپایەی دەگاتە هاوشانو جوت یەك بوون لەتەك ئەمشاسپەندەکاندا. لەرۆژی پەسلآن دا رۆلێکی بالآی هەیە لەداوەری کردنی رۆحی مردواندا ـ سروش بەرەبەرە لەئاینی زەردەشتدا وەك فریشتەی (وەحی) رەچاوکراوەو هەروەك جوبرەئیل لەئاینی ئیسلامدا بەراورد دەکرێت. سروش ئیلهام بەخشی گاتاکان بووە بۆ زەردەشت.

- ئیزەدی میترا Mitra (مهر)

هەر لەکۆنەوە (واتە پێش زەردەشت)، میترا یەکآ بووە لەخوا گەورەکانی ئارییاییەکان (هیندو ئێرانییەکان). نووسینی سەر تاشەبەردێك کە دەگەرێتەوە بۆ 1400 ساڵ پ. ز و لە(کاپاتوکا) لە (ئاسیای بچکۆلە) دۆزراوەتەوە، بۆ یەکەمین جار باسی ئەم خوایە کراوە. لەئاینی زەردەشتیدا پلەوپایەی لەدەست داوە تا ئیزەد کەمکراوەتەوە.

میترا (مهر) ئیزەدی راستیو دڵریو دلاوەریو جەنگاوەریو پەیمانە، لایەنی سروشتیو رەوشت لەلایەنەکانی دیکە هەستی زێتر پێدەکرێت بۆیە زێتر سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاوە. بە فەرمانی ئاهورامەزدا میترا (مهر) پاداشو سزای خاسانو خراپەکاران هەر لەم جیهانی مادی یەدا، دەداتەوە. مهر لەئاوێستادا پارێزگارو پشتیوانی ئەو کەسانەیە کە پەیمانشکێن نینو درۆ ناکەن، لەڕوی مادیەوە ئیزەدی (مهر) سەرپەرشتی رووناکیە، ئاهورامەزدا ئافراندویەتی بۆئەوەی پاسەوانی خۆشیو بەختەوەری ئادەمیزاد بێت، لەبەرئەوە هەرگیز چاوی ناچێتە خەو و بێدارە. مهر ماناي دیکەشی هەیەئەویش پەیمان ڕاگرێتیو خۆشەویستیو پەیوەندی دۆستایەتیو مرۆڤ دۆستییە.

لە(مهریشت) بەندی 2 دا دەبێژێ:

((ئەی ئەسپەنتمان، بآبەلێێنو پەیمان شکێنی بەدکار هەموووڵآتوێرانو خاپوور دەکات. ئەو جۆرە کەسانە بە ئەندازەی، سەد کەسن کە بەگوناهی (کەیزە[22]) گیرۆدەدەبنو کردەیان وەك بکوژی مرۆیەکی پاك دینە.

ئەی ئەسپەنتمان، نەکەیت هەرگیز پەیمان بشکێنی، نە پەیمانێك کە لەتەك درۆزنێك بەستبێتت و نە پەیمانێك کە لەتەك ڕاستگۆیەکدا بەستبێتت، چونکە هەردووکی هەر پەیمانەو نابێ لێی پاشگەزبیتەوە.

هەروەها لە (مهریشت بەندی 48و 63): دەبێژێ:

((مهر هێز لەبازوی ئەو کەسانەی درۆدەکەنو پەیمان شکێنن، دەبڕێ، قاچیان سستو بێهێز دەکاتو هێزو توانای بیناییو بیستن لەچاوو گوێیان دەبڕێت.))

ئیزەدی (مهر) نیایشێکی تایبەتی هەیە کە لەلایەن زەردەشتییەکان لەشەو ڕۆژێکدا سێجار دەخوێنرێتەوە (سەرلەبەیانی، نیوەڕۆو کاتی ئێوارە). (مهر) دادوەرێکی ڕاستوووردبینە. بەگوێرەی باوەڕی زەردەشتیەکان کەسێك کە دەمرێت، سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارەمی پاش مردنی، ڕۆحی ئەوکەسە لەنیزیك پردی چینوت (صراط) بەرامبەر بە دادگایەك ئامادە دەبێت، یەکەمین دادوەری ئەو دادگایە ئیزەدی (مهر)ە کە پاش دادگایی کردنی ڕۆح، چارەنووسی ئاشکرا دەبێت.

دەقی ئاوێستایی نیایشی (مهر) بەمجۆرەیە:

((ستایشی (مهر) دەکەم کە دروستکراوی ئاهورامەزدایە، لەبۆ خۆش وەش کردنی ئاهورامەزدا، بە باشترین شێوەو خاسترین جۆری نوێژەکان ستایشی دەکەم، سەرکەوتنو سەرفرازیو ناوبانگی بۆ ئیزدەی (مهر) دەخوازم، ئەو ئیزەدەی کە (مینوی)یەو، وداوەری ڕۆژی پەسلانەو هەزار گوێو دەهەزار چاوی هەیەو خاوەنی دەشتودەری بەرینە {مەبەست لەهەزار گوێو دەهەزار چاو ئەوەیە کە زۆر دوربینەو گوێ سوکەو هیچ شتێك لەکرداروەتە لێی گوم نابێتو ئاگاداری هەموو شتێکە}. ستایش دەکەم ئیزەدی (مهر)، ستایش دەکەمو سڵاوو درود دەنێرم بۆ ئیزەدێك کە خاوەنی دەشتی بەرینە[23]، کە لەوەرگاو سەوزەڵانیەکانی لەسەررووی زەوی ئارام بەخشو ئاسایش بەخشە، ستایشم پێشکەش بەو ئیزەدەی کە پارێزگەری راستترینوتەکانە، خاسیەکانی لەژمارە بەدەرن، باڵآبەرزو پتەوە، بە هەزار چاوەوە دورترین جێگەی دور دەبینێت، هەمیشە بێدارەو بێخەوە، هەروەك نگیمێکی زێرین دەورەیوڵآتی داوە، پارێزگەری پەیمانەکانە، هەمیشەو لەهەموو شوێنکدا هەیە، لەبەرزیو نزمییەکانی نێوولاتو دەرەوەی دا، ستایش دەکەم ئیزەدی(مهر)و هەروەها ئەو ئاهورامەزنە بآهاوتایەی کە دروستکەرێتی، بە هەموو گیانم ستایش دەکەم ئەو ئیزەدەی کە شکۆمەندە، ستایش دەکەم ئەو ئیزەدەی کە خاوەنی دەشتو سەوزەڵانی بەرینە، کە ئاسایش بەخشو پارێزگەری سەر

زەویمانە. ئیزەدی (مهر) ستایش دەکەم کە بالآ بەرزو جوانو بەهێزەو هەرگیز فریو ناخوات. ستایش دەکەم ئەم بەخشینانەی ئاهورامەزدا بۆمان دەرەخسێنێت: ئازادیو تەندروستیو سەرکەوتنو پاکیو دادوەری کردن. بە هەموو هێزو تواناو دلۆ گیانمەوە ستایشی ئەو ئیزەدە دەکەم کە بەهێزترینو سودبەخشترینە، بە سرودی دڵگوشا کە لەکانگەی دڵەوە هەڵێقولآوەو ئاوێتەی باشترینوتەکانی ئاینی بووە، ئەمە گشتی بۆ ئیزەدی (مهر) کە خاوەنی دەشتی بەرینە. مەزدا ئاهورایە کە ئاگاداری هەموو کرداری راستینو ستایشگەرانەی خەڵکە، پاداشی ئاهورایی بۆ ئەو ژنو پیاونەی کە پارێزگاری لەشێوەو رەوشەکانی ئاینی دەکەنو ستایشیان بۆ ئیزەدی (مهر) بەراستیو دروستیو لەکانگەی دڵیانەوە بێت.))

- ئیزەدی رەشن یا رەشنو Rasnu

ئیزەدی دادگەرێتیە، لەئاوێستادا ئەم ئیزەدە لەتەك ئیزەدی (مهر)و (سروش) دا پێکەوە باسدەکرێنو لەرۆژی پەسلآندا هەرسێکیان بەیەکەوە داوەری رۆحی مردوان دەکەن. ئەم ئیزەدە دوژمنی سەرسەختی دزو جەردەکانە.

لە ((رەشن یەشت)دا بەندی 7و8 دەبێژێ:

((ئەی رەشن کە لەهەموان دوربین تری، ئەی رەشن کە لەهەموان زێتر وەڵامی ئەوانە دەدەیتەوە کە گلەیی یان هەیەو فریایان دەکەویت، ئەی رەشن کە لەهەموان پتر دزو جەردەکان تەفروتونا دەکەیت.... ئەگەر رِەنجاو نەبیت، خاستر ئاواتی مرۆڤ وەدی دەهێنیت، خاستر دەست دەوشێنیو دزو جەردە لەناو دەبەیت.)).

ئیزەدی رەشن لەهەموو شوێنکدا ئامادەیە، چاوی لەهەموو شتێکەو ئاگاداری گشت کارو کردارە، ئەمە مانای ئەوەیە کە دادو دادگەرێتی هەمیشەو لەهەموو شوێنێکدا هەیە.

- ئیزەدی ئەشتاد (ئەرشتات):

ئەم ئیزەدە بریکاری راستیە، لەتەك ئیزەدی (مهر) و(سروش)و (رەشن)دا پێکەوە داوەری رۆحی مردوان دەکەن. لەجیهانی مادی دا بەخشەندەی خۆشیو نیعمەتە.

- ئیزەدی ئەرت (ئەرد): Arta

لەئاینی خواپەرستی زەردەشتیدا، ئەم ئیزەدە، ئیزەدی دادگەری، بەخشین، سەروەت، نیعمەتو تواناییە. ئەرت خەڵک هاندەدات کە خەریکی کارو کۆشش بن بە شێوەیەکی راستو دروست بۆ بەدەستهێنانی سامانو سەروەت. هەروەها ئەم ئیزەدە پارێزەرو پالێپشتی ئەو جۆرە سامانو تواناییەیە کە لەرِێگەی راستو دروستەوە بەدەست هاتووە. کەوایە ئەرت بریتیە لەدادو سامانێك

کە بەهۆی ڕاستیو دروستیەوە وەدەست هاتبآ، لەراستیدا ستایشی ئەم ئیزەدە، ستایشی ڕاستیو دروستیەو ڕاستیو دروستیویستو خواستی ئاهورامەزدایە.

- ئیزەدی وەرترغنە (بەهرام): ئیزەدی سەرکەوتن بەسەر دوژمندا.

یەکآ لەئیزەدەکانی سەردەمی هیندو ئێرانیەکانی پێش زەردەشت بووە. ئەم ئیزەدە ئیزەدی سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا. لەبەرئەوەی لەسەردەمی کۆندا شەڕوشۆڕو جەنگ دژی خراپە، یەکێك لەگرنگترین ئەرکەکانی سەرشانی مرۆ بووە بۆیەکا ئەم ئیزەدە بایەخێکی زۆری پێدراوە. لەهەندێ لەبەشەکانی ئاوێستادا، ئەم ئیزەدە هاوپەیمانە لەتەك ئیزەدی (مهر)و(رەشەن). بەم شێوەیە خەڵکی فێری ئەوە دەکات کە (سەرکەوتن) دەبێ شان بەشانی (دادگەرێتی)و ڕێز لەپەیمانگرتن بێت بۆئەوەی لەئاکامدا بلآوکردنەوەو گەشەپێکردنی ئاکاری مرۆڤایەتی خۆی لەئاشتی، برایەتیو خۆشیو بەختەوەری کۆمەڵگادا، بنوێنی.

- ئیزەدی رامن (رام): ئیزەدی بەختیاری، شادیو ئارامییە.

ئیزەدی چالاکیو شادومانی ژیانە، ژیانی مادی نە ژیانی پاش مردن، ژیانێك کە لەسەر زەوی بێت وەك خانویەکی باش، لەوەرگای بە پیتو بەرەکەتو بەرهەمی چاك، باخی پڕ لەدرەختی بەردار.

- ئیزەدی رەتە (راد)، ئیزەدی بەخشینو ەست بلآوی

ئەم ئیزەدە هەر لەمێژەوە لەتەك سپەنتە ئەرمەئیتی یاخود (خۆشەویستی پاکو بآخەوش) بە جووت بریکاری دڵسۆزیو دلۆڤانیو بەخشینو یارمەتیدانی بآدەرەتانو داماوا هەژارانن، ستایش کراون.

لەیەسنای 68 بەندی 14 دەبێژێ:

((بە پێشکەشییەکی خاسو هەڵبژاردە لەئاهورامەزدا دەخوازین بۆ هەموو ژنانو پیاوانی خاسو پاك، شادیو ئارامی، لەوەرگاو مێرگی خاسو بەپیتوو بەرەکەت، تەندروستیو لەش ساغی)).

لەم یەسنایەدا، بەهۆی ئەم ئیزەدەوە لەئاهورامەزدا هەمە جۆرە بەخشینێکی مادیو معنوی داوا دەکرێت. ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە کە بەخشینو یارمەتی تەنآ بەهۆی پارەوە ئەنجام نادرێت، بەڵکو هەروەکو چەندین جار لەئاوێستادا باسکراوەو فەرماندراوە کە بەسآ ڕێگە یا رەوش دەتوانرێت ئەنجام بدرێتو دەبێژێ جوامێریو بەخشینو دڵری لەرێگەی بیرووتەو کرداروانە بەهۆی بیری خاس یا زمانی خۆشو ئامۆژگاریو پەندی خاس یاخود کرداری باش دەتوانرآ یاریدەی لێقەوماوانو هەژاران بدرێت.

- ئیزەدی ئاخشتی: بریکاری ئاشتیو هێمنایەتیو ئاسایش

ئاشتیو هێمنایەتی هەمیشە لەتەك خاس بیرکردنەوەو خێرخوازی دایە، بۆیە ئەم ئیزەدە، لە ئاوێستادا هەمیشە هاورِآ لەتەك وەهومەنەدایەو پێکەوە رِی خۆشکەرەوەی ئاشتیو ئاسایشن بۆ ئادەمیزاد.

لەیەسنای 60 بەندی 5 دا هەر خوا پەرستێك لەخوا داوا دەکات کە لەم ژیانەداو لەمولآتەدا، فەرمانبەری بەسەر نا فەرمانیو بەرِەلاییدا سەرکەوێت، ئاشتی بەسەر شەرِوشۆرِ، جوامێریو بەخشەندەیی بەسەر رژدیو چروکیو دەست قوچاوی، رۆح سوکی بەسەر رۆح زلێتیو لوت بەرزیتی زالێ بێت، راستی بەسەر درۆداو پاکی بەسەر ناپاکیدا سەرکەوێت ـ لەزۆر شوێندا لەئیزەدی (مهر)یش داوای ئاشتیو ئاسایشو هێمنایەتی کراوە.

- ئیزەدی مانترە سپەنتە

ووشەی مانترە سپەنتە، لەئاوێستادا زێتر بە مانایوتەی پیرۆز (کلام مقدس) هاتووە. مانترە بە تەنیایی بەمانای دوعاو نزاووێردە. هەر لەکۆنەوە باوەرِ بە دوعاو نزا لای خەڵکی فرە بەهێز بووەو تا ئێستاش زۆر کەس لەو باوەرِەدان گەر دوعاو نزا بە باوەرِێکی پتەوو بآ غەلوغەش بێت ئەوا زۆرچاک گیرادەبێو دەتوانآ هەموو بە لآیەك لەئادەمیزاد دوربخاتەوە.

لەنێو گاتەکاندا دەربارەی ئەم ئیزەدە زۆر باس نەکراوە، تەنیا وەك ئیزەدی، ((وتەی پیرۆز) ناسێنراوە کە دەتوانآ سەلامەتی لەشوگیان دابین بکات.

لەئاوێستای نوێدا، ئیزەدی مانترە سپەنتە ئەرکێکی دیکەی خراوەتە سەرشان کە بریتیە لەوەی بەهۆی دوعاو نزاووێردەوەو بەیاریدەی باوەرِو بیری خاسو ئاینی پاکەوە خەرێکی تیمارکردنی نەخۆشی لەشو گیانە. بیری خراپو زیانبەخشو سیحرو جادوو هۆکانی ئازارو نەخۆشی بەهۆی ئەم ئیزەدەوە لەناودەچێت.

لەکتێبیوندیداد بەشی 22 دەبێژێ:

((ئەیوتەی پیرۆز (مانترە سپەنتە)، تیمارم بکە، نەخۆشیم لێوەدوربخە، پێویستیەکانم وەدیبهێنە، هێزو تواناو تەندروستیم بدەرآ)).

- ئیزەدی داموئیش ئوپەمەنە، ئیریامەن (بریکاری تەندروستی)

مرۆیەکی پاکدینو خاس کردار ئەگەر توشی تەنگوچەڵەمە بێتو کەسێك بیەوێت ئازاری بدات یا بیکوژێت، ئەم ئیزەدە بەهاریکاری ئەمشاسپەند (مهر) دەگاتە فریایو یارمەتی دەدات.0.

ئەم ئیزەدە یەکێکە لەو ئیزەدە هاوبەشانەی نێوان هیندو ـ ئێران. لە (ودا)کاندا ئیزەدی دۆستیو هاودڵییە، لەئاوێستادا لەکاتی وەدیهێنانی ڕێو ڕەسمی ژن خواستن بانگەوازی لێدەکرێت. لەبڕێ لەنووسینەکاندا نیشانەی دەرمانبەخشی پێدراوە.

لەوەندیداد بەشی 22 بەندی 2تا 20 دەبێژێ:

ئاهورامەزدا ئەم جیهانەی زۆر جوانو خۆشو چاک دروست کرد.

بەڵام ئەنگرەمینو (بیری خراپ) نەوەدونۆ هەزارو نوسەدو نەوەدو نۆ جۆر دەردو بەڵاو ناخۆشیو وەدیهێنا، ئاهورامەزدا (ئێریامەن)ی ڕاسپارد کە ئادەمیزادو گشت زیندەورانی دیکە لەم بارە ناخۆشە رزگاربکاتو دەرمانی دەردیان بۆ ئامادەکاو سارێژی برینەکانیان بکات، ئەمیش زۆر بە پەلەو بەهۆی گژوگیای خروسکیو داودەرمانو بەهۆی پاکوتەمیزییەوەو دوعاو نزا کەوتە سارێژکردنی نەخۆشیوودەردەکانیان.

- ئیزەدی هوم

ئیزەدی هوم، ئیزەدی دورخەرەوەی مەرگە، ئیزەدی توانایی، کامرەوایی، زانایی، هونەرمەندی، جوانیو....

هوم، ئەم شتانە بە ئادەمیزاد دەبەخشێ: هۆشو زانیاری، زاتو ئازایەتی، تەندروستی، بەختیاری، خۆشبەختی، هێزو توانای لەش، فەرمانبەرێتی، سەرکەوتنو زاڵبون بەسەر ستەمکارانو خراپەکاران... هوم زانیاری دەبەخشێ بە عەوداڵانی زانست، هاوسەری خاس بۆ کیژانی پاك هەڵدەبژێرێ، منداڵانی بە ئەمەك بۆ ژنانی خاسو بەهشت ئامادە دەکات بۆ مرۆی ڕاستو دروست کردار.

یەسنای 9 بەندی 28 دەبێژێ:

((هوم هێزوتوانا لەدەستو پێی بەدکاران دەبڕێتو بیریان ئالۆزدەکات، توانایی بینایی لەچاویان دەبڕێ، مرۆی خاس کردار بەرامبەر کردارخراپان دەپارێزێ.))

- ئیزەدی ئەشیو نگهوئی: بریکاری داراییو سامانو دەوڵەمەندی

لەڕوی مادییەوە، ئەشیو نگهوئی بە پارێزەری سامانو دارایی دەژمێرێت. ئەم ئیزەدە ئەرکی سەرشانی ئەوەیە کە هەمبارەکان پڕ لەدانەوێڵە بکات، ڕەشەووڵاخو مەڕوماڵآت زیادبکات، ماڵێو گوندو شار ئاوەدان بکات.

- ئیزەدی پارەندی

ئەم ئیزەدی پاریدەدەرو هاوکاری ئیزەدی ئەشیو نگهوئیە کە بەخشەندەی سامانو داراییو هێزو توانای کارکردنە بەستایشگەرەکانی.

- ئیزەدی دراوسپ یا گیئوش Geus ((بریکاری ئاژەڵی بەسود))

ئەم ئیزەدە پارێزگەری ئاژەڵی سودمەندە، هەروەها پالێپشتی مرۆڤی خاسو پاڵەوانانو ئەو قارەمانانەیە کە لەڕێی خێرو خۆشی خەڵکدا تێدەکۆشن ((ستایش دەکەین(دراوسپ)ی توانا کە ئافەریدەی مەزدایە، کەسێك مەڕومالآتو ڕەشەووڵاخ بە تەندروستیو سەلامەتی راوڵاخدەگریێ. کەسێك کە تەندروستی بە دۆستان دەبەخشێ، کەسێك کە تەندروستی دەدات بە زارۆڵەکان...)).

ئەو ئیزەدانەی تا ئێستا باسمان لێکردن بریتین لەو ئیزەدانەی لەگروپی ئیزەدە (معنوی)یەکانن. گروپی دوهەم ئیزدە مادییەکانن کە بریتین لەمانە:

- ئیزەدی هۆرخشتیە (ئیزەدی خۆر)

لەنێو ئارياييەکانداو لەسەرانسەری جیهانیشدا هەر لەدێرزەمانەوە پلەوپایەکی تایبەتی هەبووە، لەئاوێستادا فرە بەرێزەوە تەماشای کراوەو ئەم سیفەتانەی لێنراوە: شکۆمەندو پایەبەرز، نەمر، پاك کەرەوەی هەموو شتێك، ئەسپی توندڕەو(بۆیە سیفەتی ئەسپی توندڕەوی لێنراوە چونکە لەو سەردەمەدا ئەسپ بەوە بەنێوبانگ بووە کە توندڕەو بووەو لەبەرئەوەی تیرۆژی خۆریش زۆر بە خێرایی ڕێگە دەبڕێ، ئەم سیفەتەی لێنراوە). لەنێو ئاریاییەکانی پێش سەردەمی زەردەشتدا، هەروەها لەنێو سامییەکانیشدا پەرستنی خۆر باوبووە. لەپاشاندا لەئاینی زەردەشتدا وەك ئیزەدێکی ئافەریدەی ئاهورامەزدا ڕێزی لێگیراوەو ستایشتێکی تایبەتی لێدەگیرآ، رۆژانە سێجار ستایشی خۆر دەگیرآ: کاتی هەڵێهاتنی خۆر، کاتێك کە دەگاتە نیوەی ئاسمان(نیوەڕۆ)و لەکاتی ئاوابونیدا.

لەئاوێستای نوێدا ئەوشتانەی کە بەپیرۆز دەژمێردرێن، ستایشیان لێکراوەو ڕێزیان لێدەگیرآ. لەکتێبی(خردە اوستا) کەبەشێکە لەپێنج بەشەکانی ئاوێستای نویێ ستایشت لە(خۆر، مانگ، مهر، ئاو، ئاگر) کراوەو بۆ هەریەکیان ئیزەدێکی تایبەتی دانراوە.

دەقی ستایشی خۆر لەئاوێستادا بەمجۆرەیە:

((پیرۆزو سەرکەوتوبێت خۆری درەخشان، خۆری نەمر، خۆری تیژڕەو، بە بیرووتەوکرداری خاسەوە ڕوودەکەمە خۆرو ستایشی دەکەم. ئەی ئاهورامەزدا، ستایشی خۆری درەوشە تیژڕەو دەکەم کە تۆ ئافراندوتە. ستایشی هەموو ئێوە دەکەم ئەی ئەمشامسپەندان کە هەر وەك خۆر مەزنو شکۆمەندن. ئەز پەیرەوی ڕێبازی ئاهورامەزدام کە دروەشینەوەی خۆر لەڕووناکی

ئەوەیە، ئەز تێکشکێنەرو رسواکەری ئەنگرەمینوم، ئەمەیە رێگەی خواپەرستان، ئەو رێگەیەی کە بیری خاس، وتەی خاس‌و کردەوەی خاس فێردەکات.

ئەمنم ستایشگەری بیری خاس، وتەی خاس‌و کردەوەی خاس بەهەموو گیان‌و رەوان‌و لەشم، ئەز، لەبیری خراپ، وتەی خراپ‌و کردەوەی خراپ بەهەموو گیان‌و رەوان‌و لەشم دووری دەکەم. ئێستا ئیدی سرودتان بۆ دەچرێنم‌و ستایشتان بۆ دەکەم بۆ ئێوە ئەی ئەمشاسپەندان‌و بیرووتەو کردەوەی خاستان پێشکەش دەکەم. ئاهورامەزدا دەپەرستم. ستایشت دەکەم ئەمشاسپەندان‌و ئیزەدی (مهر) کە خاوەنی دەشتودەری فراوانە، وخۆری تیژرەوی درەخشان‌و (کیومەرس) کە یەکەمین ئادەمیزادە ستایشت دەکەم، وەستایشتی من بوێرەوانی پاکی زەردەشت‌و بۆ گشت ئەو ئافەریدە خاس‌و پاکانەی کە بوون‌و هەن‌و لەپاشاندا دەبن. رێگەی راستیم هەلێبژاردووە، رێگەی بیری خاس، ئەو رێگە بەهێزوتوانایە، ئەی مەزدای مەزن، ئێستا لەبەر رۆشنایی ئەم هەلێبژاردنەمدا، ژیانێکی خاسم پێببەخشەو لەئاکامدا یارمەتیم بدە. ئێستا ئیدی هەردوو دەستم بەرەو رووی خۆر بەرزدەکەمەوە، ئەو خۆرەی لەهەموان دەرەخشانترەو بە چراندنی سروود ستایشی دەکەم، سرودی بۆ دەنێرم‌و دەبێژم:

ستایشی دەکەم خۆری نەمرو هەمیشە زیندوو تیژرەو کە خاوەنی دەشتودەری فراوانە، ستایشی خۆر دەکەم کە زێرین‌و درەخشانە، بەنێوبانگ‌و خاوەنهەزار گوێ‌و دەهەزار چاوە، بآخەوو هەمیشە بێدارە، شای گشت‌وولآتانە، چاو جوان‌و چاوتیژە، ئاهورامەزدا لەنێو هەموو ئیزەدەکاندا ئەوی لەهەموان درەخشانتر ئافراندووە. با یاریدەدەری ئێمەبن، ئاهورامەزداو ئەو تیرۆژە نەمرەی. ستایشت دەکەم (تیشتەر) ئەستێرەی باران، کە پێشاهەنگی خۆرە لەئاسماندا، کە چاوتیژو شکۆمەندو درەخشانە.

ستایشی(تیشتەر) دەکەم دەگەڵ ئەو هەسارانەی کەلەدەوروبەریدان‌و هەروەها ئەستێرەی(وەنەنیت) کەمەزدا ئافراندوویەتی.

ستایشگەری ئاسمانی بآپایانم، ستایشی پاکی دەکەم، ستایشی زانست دەکەم کە مەزدا پێی داوین، ستایشکەری ئاینی خواپەرستیم، ستایشی دەکەم گشت ئیزەدە معنوی‌و رۆحانییەکان‌و هەموو ئیزەدەکانی مادی ئەم جیهانە، رۆح‌و رەوانی خۆم ستایشت دەکەم دەگەڵ گشت رەوانە پاکەکان، ستایشت بۆ ئەو خۆرە نەمرە درەخشانە تیژرەوە. ستایشکەری ئەو خۆرە نەمرە تیژرەوەم، سەرلەبەیان ستایشی دەکەم، ئەوکاتەی تیرۆژە زێرینەکەی هەموو جیهان رۆشندەکاتەوە، ئیزەدە رۆحانییە پایەبەرزەکان، سەدان‌و هەزاران لەو ئیزەدانە، ئەو گەردیلە رۆشەن‌و درەخشانانەی کە لەسەرچاوەی خۆر هەلێدەقولێن، لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی، بۆ سەر ئەو زەوییەی کە ئاهورامەزدا ئافراندوویەتی. ئەو رووناکییەی کە لەسەرچاوەی خۆرەوە بەسەر باڵی ئیزەدەکانەوە، بۆسەر پانایی زەوی سەرەوخوار دەبێت، هەموو روی زەوی لەتاریکی‌و پیسی پاك دەکاتەوەو گژوگیاو رووەك لەنێو خاکدا بەهۆی ئەم روناکییەوە کە لەسەرچاوەی خۆرەوە هەڵدەقولێت وەك هەنگوین دەیخۆن‌و نەشونمای پێدەکەن. ئەم رووناکییە زێرینە، پاك

کەرەوەیە بەو جۆرەی کە ژیان بەخشە، ئاوی ڕەوانو ئاوی مەنگ پاك دەکاتەوە، ئاوی کارێزەکان، چالآوەکان، دەریاکان، جۆگەلەو زەلەکان.

ستایشت دەکەم ئەم خۆرە بال زێرینە تیژرەوە نەمرە، ئەگەرکو هەلێنەهاتایەو ئەو تاریکیە، ئەهریمنییەی کە باڵی بەسەر روی زەویدا کێشابوو، ڕانەمالیبایە، خراپەکاران هەموو ئەو شتانەی کە لەنیو حەوت هەرێمدا هەبوو گشتیان بەرەو خراپە دەبردو ئەوسا ئیدی ئیزەدە روحانیەکانیش توانای بەرگرییان لێنەدەوەشایەوەو نەیاندەتوانی رێیان لێبگرن. کەسێك کە ستایشی خۆردەکات. هاریکاری لەتەکا دەکاتو هێزوتوانای دوو بەرابەر دەکا بۆئەوەی دژبتاریکاییو خراپەکارانو دزو جەردە ڕاوەستێت. کەسێك کە ستایشی خۆر دەکات، مەرگ لەچوارچێوەی دەرگای ژیانی خۆی وەدووردەخات. ستایشی خۆر، سوپاس بۆ ئاهورامەزدایە، ستایشتی فریشتەکانەو ستایشتی رۆحیانەتی خۆیەتی، ئەو کەسەی ستایشتی خۆری نەمرو تیژڕەو دەکات، ستایشتی هەموو ئیزەدە رۆحانیەکانی ئاسمانو زەوی دەکات، ستایشگەری ئیزەدی (مهر)م، کە خاوەنی دەشتودەرێکی فراوانە، خاوەنی دەهەزار گوێو هەزار چاوەو چەکی دەستی گورزێکی دێوبەزێنە. بە هەموو گیانمەوە ستایشتی ئیزەدی(مهر)دەکەم، ودۆستیو یەکدلی، ئەو دۆستایەتی بآ ڕیاوو بێگەردە، کە هەروەك دۆستایەتی نێوان مانگو خۆروایە، ئەو خۆرە نەمرە تیژڕەوەی کە تیرۆژە زێرینەکەی هەموو جیهان دەگرێتەوە، ستایشتی دەکەم کە تاجی سەری هەموو جیهانە، کە سوودو بەهرەکانی بآپایانو لەڕادەبەدەرە، ستایشتی دەکەم بە بیرووتەو کرداری خاس.

ستایشت دەکەم ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی کە ڕآو رەوشتی ئاین بەبێشترین شێوە دەپارێزن. مەزدا ئاهورا ئاگادارە، لەهەموان خاسترە، ئاگادری باشترین ژنانو پیاوانی خاوەن ئایینە)).

- ئیزەدی مانگهە (مانگ)

لەکاتێکدا کە تاریکایی شەو بوار دەرەخسێنآ بۆ ئەهریمەن کە بەکرداری بەدو خراپی خۆی خراپەکاری، دزێتی، جەردەییو هەمەجۆرە کاری ناجوامێرانە بکات. لەبەر ئەوەی لەترسی تیرۆژەی خۆر، لەرۆژی رووناکدا ناتوانێت ئەم کارانە ئەنجام بدات، مانگ بەهۆی ئەو رووناکیەی لەخۆرەوە وەریدەگرێتو بە شێوەی تریفەی دەینێرێتە سەر زەویو رووناکی دەکاتەوەو تا ڕادەیەکی زۆر ئەو رەشایەتییە رۆشندەکاتەوەو پەیکەری خراپەکاران دەردەخاتو ئاشکرایان دەکاو رێگا لەخراپەکانیان ولاخدەگرێ.

مانگ لەئاوێستادا ماوەنگهە Mawangha ی پآ دەبێژرێت. لەکتێبی (خردە اوستا)دا بەشێکی تایبەتی هەیە بەنێوەی ستایشی مانگ، لەم بەشەدا سوپاسو ستایشی مانگ دەکرێتو تیایدا رێزی تایبەتی لێدەگیری. لەسی رۆژی مانگدا سێجار ئەم ستایشە ئەنجام دەبێت:

جاری یەکەم، لەکاتێکدا ئەنجام دەبێ کە مانگ لەشێوەی هیلال(مانگیلە) دایەو پێی دەبێژرێ ئەنترەری ماوەنگهە AnTare Mâwangh. جاری دووهەم لەکاتێکدایە کە مانگ پڕەو لەشێوەی خڕیدایەو پێی دەبێژرێ پەرنو ماونگهە Pereno Mawanghو جاری سێهەم لەکاتێکدایە کە دووبارە بەشێوەی هیلال(مانگیلە) دەردێتەوە.

ستایشی مانگ بەم شێوەیە دەبێژرێ:

((مانگ ستایش دەکەم کە ئافریدەی ئاهورامەزدایە. ستایشت بۆ ئەمشاسپەندانو ئیزەدەکان دەپەرستن تایبەت بۆ ئاهورامەزدایە. مانگ ستایش دەکەم لەنێو ئاسمانی بآ پایاندا لەکاتێکدا کە هەڵێدێت، مانگ ستایش دەکەم لەنێو ئاسمانی بآپایاندا لەکاتێکدا کە پڕوخرِە.

لەبۆ رەزامەندیو خۆش وەشی ئاهورامەزدا، باشترین سرودەکان دەچرێنم: پەیڕەوی ئاینی مەزدا پەرستیم، ئەو ئایینەی کە زەردەشت هاوردوویەتی، ئەو ئایینەی دژی خراپەکاریو دەجەنگێتو ململانێی لەتەکا دەکا، ئەو ئاینەی کە فێری ستایشو رێز لێگرتن لەهەموو ئاژەڵە بە کەلێکەکانمان دەکا. بەزوانی گیان دەچڕێنم سرودی پەرستنی ئاهورامەزداو سرودەکانی ستایشی ئەمشاسپەندانو ئیزەدەکان. ستایشی تایبەتیم بۆ مانگ بێت کە تۆوی چاروکان دەپارێزێ. سرودی بۆ دەبێژم لەکاتێکدا کە لەئاسماندا هەڵێدێتو دەردەکەوێت،، سرودی بۆ دەبێژم کە لەنێوەراستی ئاسماندا پڕوخرِدەبێت. کاتێك کە هەڵێدێت، کەمانێکی باریکە، چەند رۆژێك ئەو کەمانە نیوە پڕ دەبێ، پاشان هەردوو نیوەکە دەبنە یەكو ئەوسا دەبێتـە مانگی چواردە. پاش ئەوە بەرەبەرە کزدەبێو دەتوێتەوە، چەند رۆژێك تێپەڕدەبێ تا دووبارە هەروەك جاران دەگەڕێتەوە سەر شێوەی مانگیلە (مانگی یەك شەوە). ئەی ئاهورامەزدا، تەنها تۆ دەپەرستم، کە بەمجۆرەویستو ئارەزووت دەچەرخێت، جگە لەتۆ کآ دەتوانآ ئەم کارە ئەنجام بدات؟

ئەی ئاهورامەزدا، ستایش دەکەم ئەم مانگە پڕوخرِە کە ئافریدەی تۆیە، کە نیشانەی پاکیو جوانیە. دەروانینە رووناکییە سپی مانەندو میهرەبانیەکەی کە هەروەك فریشتەکان لەئاسمانی بەرینەوە بۆ سەر زەوی پەخشو بڵآودەکرێتەوە، بەزەوییەك کە ئافریدەی ئاهورایە. ئەم رووناکیە هەرکە دەگاتە سەر ڕووی زەوی، گژوگیاو رووەك دەڕوێنآو دەیبوژێنآو زەوی کراسێکی ئامالێ بە سەوز لەبەر دەکات.

ستایش دەکەم ئەم. (گۆ) رووناکەی ئاسمان لەبەر خاتری فەڕوشکۆمەندییەکەی لەبۆ جوانیو پیرۆزییەکەی، بەزوانی گیانو دڵآ سرودی تایبەتی ستایشت دەچڕێنم، لەسآ کاتدا، کاتێك کە هەروەك کەوانێك لەئاسماندا هەڵێدێتو دەردەکەوآ، ئەمجا لەکاتێکا کە ئەم کەمانە پڕدەبێت، ئەوسا، لەکاتێکدا کە پڕوخرِ لەئاسمانی بەریندا چاوم رووندەکاتەوە. دەچڕێنم ئاوازی تایبەتی ستایشت بەم شێوەیە:

ستایشکەری ئەو مانگە ڕووناکو پاکەم کە جوانیو تازەییو شادمانی بە هەموو شتێك دەبەخشێت، ڕووناهییەکەی، گژوگیاو درەختەکان دەڕوێنێتو گەشەیان پێدەکاتو شینیان دەکا، زانستو ئارەزوو زیاد دەکا، ڕووناکییەکەی، نەخۆشی لە لەشو گیان دووردەخاتەوە.

ستایشت بۆ مانگ، بۆ ئەو تواناو ڕووناکی دەرە، ئەو مانگەی کە ژیانی ئاژەڵە بە کەڵێکو سودمەندەکان زیاتر دەکات.

ستایشگەری مانگی بەکەڵێکو سودبەخشی ئافەریدەی ئاهورام. داواکارم کە تەندروستیو تەمەندرێژی، هێزو تواناو سەرکەوتنمان پێببەخشێت، هێزی خۆڕاگرتنمان بدەرآ، تۆ کەویستو دارایی دەبەخشیت، بەرەکەت بخەرە نێو ئاژەڵەکانمانو زێتری بکە بۆمان، کیژو کوڕی جوانو باڵابەرز لەنێو خێزانەکەماندا پتربکە، بۆئەوەی هێزو توانامان زێتربێتو لەململانێتی ژیاندا سەرکەوتوبینو زەبون نەبین، تۆ ئەی ئیزەدی پایەبەرزو ئێوە ئەی هەموو ئیزەدەکانی ئافەریدەی ئاهورا، ئاوازی ستایشمان کە دەیچڕێنیین ببیستن، ئەوانەی (چاکە) ستایشت دەکەن، سەرفرازو سەرکەوتوو بکەن. بەهەموو شێوەوشەکانی ئاینی ستایشت دەکەم ئیزەدی ڕووناهیدەر.

مەزدا ئاهورایە کە ئاگادارە لەگشت کردارە ڕاستینەکانی ستایشگەرانی خەڵک، پاداشتی ئاهورایی بۆ ئەو ژنو پیاوانەیە کە پارێزگەری ڕەوشەکانی ئایینەکەیانو ستایشی یان بۆ ئیزەدی مانگ بەراستیو لەکانگەی دڵیانەوەیە)).

- ئیزەدی تیشتریە ((ئیزەدی باران))

لەمێژەوە ژیانی ئارییاییەکان بەهۆی کشتوکاڵەوە دابین دەکرا، ئەو ساڵەی باران بە ئەندازەی پێویستو لەکاتی خۆیدا دەبێری، ئەوە ساڵێکی بە پیتوو بەرەکەت دەبوو بەختوەر دەبوون، لەبەرئەوە ڕێزو بایەخێکی تایبەتییان بۆ باران هەبوو، ئیزەدێکی تایبەتییان بۆ باران ڕەچاوکردبوو.

لە(یەشتی هەشتەم)ستایشی ئەم ئیزەدە کراوەو داوای لێکراوە کەباران بەخشینو کەرەمی خۆی لەئادەمیزاد کەم نەکات، بەهۆی میهرەبانیو بەخشەندەگی خۆیەوە ئاوو کانیاوەکانو ڕووبارەکانو دەریاکان زیادو پڕ ئاویان بکات چونکو گشت گژوگیاو ئاژەڵی گچکو گەورەو ئادەمیزادا چاوەڕێی لوتفو کەرەمی ئەون.

- ئیزەدی ئازەر (ئاگر)

زۆر لەمێژەوە ئاگر لای ئارییاییەکان ڕێزی لێگیراوەو ستایشتی کراوە، لەسەردەمی پێش زەردەشتدا، ئاگر پلەوپایەیەکی تایبەتی هەبووە.

بۆ یەکەمین جار لەئاوێستادا کەباسی ئاگر کراوەو ڕێزی لێگیراوە لەگاتاکاندا (یەسنا هات 43 بەندی 9) بووە کە بەنیشانەی ئاهورامەزدا ناوی لێبراوە، لەپاشاندا لەسەراسەری ئاوێستادا درودو ستایشتی لێکراوە، ئاگر بەسەروەری پەیڕەوانی ڕاستیو یارویاوەری سپەنتامینوو نەیاری بە ئەهریمەنو خراپەکان دانراوە.

لەگشت ئاتەشگاکاندا، لەشەوو ڕۆژێکدا پێنج جار لەلایەن موبدەکانەوە ستایشتی ئاگر دەخوێنرێتەوە، هەروەهالەنۆهەمین ڕۆژی هەموو مانگێکدا(کە نێوی ئاگری لێنراوە)و لەگشت جەژنەکاندا ستایشتی ئاگر دەخوێنرێتەوە. دەقی ستایشتی ئاگر بەمجۆرەیە:

((ئاگر ستایشت دەکەم کە ئافەریدەی ئاهورامەزدایە. ستایشتت دەکەم ئەی ئاگری پاك سروشت، ئەی مەزنترین خەڵاتی ئاهورامەزدا، ئەی ڕووناهی، کە شیاوی ستایشتی. ستایشتت دەکەم کە لەماڵی مندا داگیرساویت، ژێهاتوی ستایشتو کەباریت (مناجات). بەهەموو ڕێوڕەسمێکی ئاییننییەوە بەرامبەرت ڕادەوەستمو ستایشتت دەکەم، بەدەستێکەوە (بەرسەم) دەگرمو بەدەستەکەی دیکەمەوە دارێکیووشکی بۆنخۆش.

تۆ ئەی ئاگری ئاهورامەزدا، تۆ ئەی شیاوی زێدەترین ستایشت، بلێیسەت لەم ماڵەدا هەمیشە درەخشان بێت، ڕووناهیت لەتەك تیشکی سوورت بدرەوشێتەوە لەم ماڵە، هەمیشەو هەمیشە، هەتاهەتایە، تۆ، ئیزەدێکی لەهەموان بە ئاهورامەزدا نیزیکتری، ویستوخواستو ئارەزووکانمان بەدیبێنە، ئارامیو هێمنایەتیمان پێببەخشە، ژینێکی پڕ لەئاسایشو ئاسودەیی، بژێوی ڕۆژانەمان بدە، پاکیو خۆڕاگری، پاراوی زوبانو دەنگێکی خۆشو زانست، زانستێك کە بەرەو ژیانێکی خاسترو باشترمان بەرێت، پێمان ببەخشە خاسترین ڕەفتارو کردار بۆئەوەی بەهێزو تواناو دڵربین، بەفامو هۆش، لەبەر ڕۆشنایی تیشکی زانست هەنگاو هەلێبێنین، لەنێو خێزانەکانماندا وەچەی بەهێزو تواناو سوارچاکو جوامێرو قسەزانو تێکۆشەر لەڕآی ئاوەدانیوڵآتدا، هۆشمەندو زاناو خاوەنی بیروکرداروتەی خاسمان پێببەخشەکە ئاگاداری ماڵأو خێزانو گوندووڵآتمان بن. ئەی ئیزەدی مەزن، هەمیشە چاودێرو ئاگادارمان بە، پێمان ببەخشە هەرشتێك کە بەختەوەرو سەرکەتومان دەکات، هەرشتێك کە مایەی رزگاریمان دەبێتو ژیانێکی خاسترو ڕۆژگاری باشترمان بۆ برەخسێنآ، باشترینو بە پیتو بەرەکەتترین زەویەکانمان پآڕەوا ببینە کە بتوانین ژیانێکی پڕ لەئاسایشو ئارام پێکەوەبنیین. لەنێو باوەشی خێزاندا، لەئاگردانی ئاتەشگاکاندا، ئاگری تابانو درەخشانو گەرمابەخشی ئاهورایی بلێیسە وڵاخدەگرێ. ئاهورا پەرستەکان سرود دەخوێنن، ئا لەو کاتەدایە کە ستایشگەرەکان، بەگوێی دڵوگیانەوە گوێبیستی قرچە قرچی ئارام بەخشی ئاگر دەبن کە دەبێژێ:

((بەرخوردارو کامڕەوابن لەویستو داخوازیو ئارەزووەکانتان. زەویو زارتان پڕ لەگاڕانو مەڕومالآت بێت، هەروەکو چۆن تەڕچكو پڕ لەدارو درەختو گژوگیایە. بەرخوردارین لەبیری ڕووناكو هۆشیارو سەرفرازیو توانایيو دڵریو ئازادی، بەرخوردارین لەدەشتو

زەویو زاری پڕ بەرەکەتو ماڵی گەورەو خۆشیو پڕ لەئاسایش کە دەنگی منداڵانی ئازادو دڵری لا هەڵسێت، کە ئارام بەخشی خۆتانوولآتتان بێت.))

هەرکە ستایشکەران گوێیان لەمەبوو، بەدڵو بەگیان، بۆ دواجار ستایشتی ئیزەدی پایەبەرز دەکەنو وێڕای ئافەرین کردنی دەبێژن:

سڵاوو ستایشت بۆ تۆ ئەی ئاگری ئاهورامەزدا، ستایشت دەکەین ئەم رووناکیە پاكو درەخشانە، ئێستا کە ئاشکرایت بۆمان، هێزوتوانامان پێببەخشە تاباشترین بیرووتەو کردارمان بێت. یارمەتیمان بدە تا بتوانین بەرهەڵێستی خراپەو درۆو هەموو شتێکی ناڕەوا بکەین رۆحو ڕەوانمان پاكو خاوێن بکە لەخراپەو رێگەی بآئەنجام تا شیاوی پەرستنی ئاهورامەزدای مەزن بین.

بەگوێرەی دەستوری ئاوێستاو نەریتی کۆنی ئارياييەکان، داری تەڕ(کە دووکەڵ دەکات)و هەر شتێك کە بۆنی ناخۆشی لێوەدەرچێتو پیس بێت، نابێ بخرێتە ئاگرەوەو هەرکەسێك بەم کارە هەڵسایە بەگوناهبار دەژمێراو سزایەکی سەخت دەدرا.

دەربارەی ئاگرو جۆرەکانی ئاگرو بۆچی لەکاتیوێردو نزا خوێندن ڕووی تێدەکرێت، لەپاشاندا لەبەشێکی تایبەتی زێتر باسی لێدەکەین.

- ئیزەدی ئەریدویسور، ئاناهیتا ((ناهید)) ـ ئیزەدی ئاو ـ

ئاو، یەکێکە لەچوار عنصرە بنچینیەکانی ژیان (خاك، ئاو، ئاگر، هەوا)و هەمیشە رێزێکی تایبەتی هەبووەو هەوڵوکۆشش دراوە کە بە پاکیو خاوێنی ڕاگیرێتو لیخنو پیس نەکرێت.

ئاناهیتا، لەئاینی زەردەشتدا ئیزەدی ئاوە.

لە(ئابان یەشت) بەندی یەکەم ئاهورامەزدا بە زەردەشت دەفەرموێت:

((ئەی زەردەشت سپەنتمان، لەبۆمن (لەبەرخاتری من) ستایشتی ئەم ئەریدویسورە ئاناهیتایە بکەو رێزی لێبگرە، ئەو کەسەیە کە باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشاوە، چارەسازە، دوژمنی خراپەکارانەو دۆستی ئاینی ئاهورايیە، شايانی ئەوەیە کە لەجیهانی مادیدا ستایشتی بکرێتو ڕێزی لێبگیرێت، ئەو پیرۆزەیە کەمەڕو ماڵآتو سامان زیاد دەکات، وولآت دەبوژێنێتەوەو بەرفراوانو ئاوەدانی دەکات.))

هەروەها لە (ئابان یەشت) دا کە خۆی لەخۆیدا بریتییە لەستایشتی چاکەو کرداری خاس، هێزو توانا لەڕوی لێهاتوییەوەو داواکردنی نەوەیەکی بەهێزو تواناو پاك، ئاناهیتا بەو کەسانەی کە پاکیزەییوپاکدامەنی دەکەنە دروشمی ژیانیان، بەرەکەتو سامانو هێزیان پێدەبەخشێت.

دوژمنی سەرسەختی خراپیو چەپەڵی یەکانە، پاسەوانو چاودێری (نەوە)یە، بۆیە ئاوی پیاوو رەحمی ژنان پاکو خاوێن دەکات بۆئەوەی زارِۆڵەی پاکو ساغڵەم بێنن. لەکاتی منداڵێبوندا ژانی ژنان، کەمدەکاتەوەو شیریان زیاد دەکات. یارمەتی هەموو دلاوەرانو ئەو کەسانەی دەدات کە لەپێناوی راستیو دروستیدا دەجەنگنو سەرکەتنیان بۆ دەرەخسێنێت.

(ئاناهیت یەشت) یەکآ لەکۆنترین یەشتەکانە کە پێشکەشکراوە بە ئیزەدی ئاو ئەریدویسورە ئاناهیتا، ناوەرِۆکی ئەم ستایشتە لەبەندەکانی سەرەتای (ئابان یەشت)و برِی لەبەندەکانی (یەسنا هات 65) وەرگیراوە. ئەم ستایشتە لەئاوێستادا پێی دەبێژرێت ئابان یەشت یا ئابزوورنیایش یا ئابزورتن، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ئەم ستایشتە لەدوهەمین رۆژی هەموو مانگێك لەگوێ چەمو رِووبارو... دەخوێنرێتەوە، بەلآم نابێ بەشەو بخوێنرێتەوە. دەقی ئەم ستایشتە بریتیە لە:

{ستایشت دەکەم هەموو ئاوەکان کە ئافەریدەی ئاهورامەزدان، ستایشتت دەکەم ئەی ئەریدویسورە ئاناهیتا، تۆ ستایشت دەکەم کە نیشانەی هەموو ئاوێکی پاکو زولالی. بۆ رِەزامەندی ئاهورامەزدا کە تۆی ئافراندووە ستایشتت دەکەم. بپەرستین ئاهورامەزدای شکۆمەند، ستایشت بکەین گشت ئاوە پاکەکان کە ئافەریدەی ئاهورامەزدان. هەروەها ئەو ئیزەدە مەزنەی کە سەرپەرشتیو چاودێری ئەو ئاوانە دەکات کە ئاهورامەزدا پێی بەخشیوین. ستایشتی گشت ئەمشاسپەندەکان بکەین، هەروەها ئیزەدانی رۆحیو مادی، وە رۆحی ئەو مرۆ خاسانەی کە یەکەمین کەسانێك بون باوەرِیان بە ئاینی خواپەرستی هێنا، هەروەها زەردەشتو بنەماڵەکەی ستایشت دەکەین. ستایشکەری ئاوی پاکی بە سوودو ژیان بەخشم، ستایشگەری ئەریدوریسورە ئاناهیتام، ئەو پاسەوانە لێهاتووەی هەموو ئاوە پاکەکانی جیهان، وئەو ئاوەی سەر روی زەوی کە ژیان بەخشە، سەرچاوەی هێزو تواناو تەندروستیە، هەرکە دارێژی گشت خراپیەکان تەفرو تونا دەکات، کاتێك کە رِەوانو بەخورِ بێت هەرچی ناپاکیو چەپەڵیو پیسی هەیە رِادەماڵیو لەناوی دەبێت. ئێستاکآ، ئاناهیتا ستایشت بکەین، ئەو ئیزەدە شکۆمەندو پلەبەرزو لێهاتووە کە لەسەراسەری گیتی دایەو لەسەر رِوی زەوی هێزوتوانا دەبەخشێ بە لەشو گیان، ژیانو جموجۆلأ دەبەخشێ بە هەموو گیتی، گژوگیا دەروێنآ، مەرِومالآت زیاد دەکات، وولآت ئاوەدانو بەهێز دەکات.

ئاناهیتا ستایشت بکەین، کە چاودێریکەری ژنانەو لەخاسکردنو خاوێنی نەژاد کارسازە، هێزی بەدیهێنانی ژیان لەنیو دەرونی پیاودا پاکوخاوێن دەکات، شیاوی ئەوەی دەکا کە لەنێو دەرونی ژندا دووگیان بێت.

ستایشتی ئیزەدآ بکەین کەژانی ژنان لەکاتی منداڵێبوندا کەم دەکات، مەمکی ئەو ژنانەی کە زارۆڵەیان بووە پرِ شیر دەکات کە سەرچاوەی ژیانە بۆ نەوزادەکان، ستایشتمان بۆ ئەو ئیزەدەی کە فرە مەزنە، گەورەو پاکە.

ستایشت بکەین ئەو ئیزەدە بە توانایەی کە ئافەریدەی ئاهورامەزدایە، کە زۆر مەزنو بەشکۆیە، هەروەکو هەموو ئەو ئاوە پاکانەی کە لەهەورەکانەوە دەبێرێنو بەشێوەی ڕووبارو کانیاوو دەریاکانو زەریاکان لەسەر روی زەوی ئارامیان گرتووە، زەوی خاوێن دەکات، دەرونی ژنانو پیاوان پاکوخاوێن دەکاتەوە. سرودی پەرستن بۆ ئاهورامەزدا دەچڕێنین، ستایشت بکەین ئاوی ژیانبەخش لەچوارچێوەي ئیزەدێکی وەك ئاناهیتا کە ئاوەکان لەسەرچاوەکانیانەوە بۆ ناخی زەویو سەرزەوی ڕەوان دەکات، هەروەك ڕەگی پڕخوێنی ژنێکی لاو، ئەو ئاوانەی کە لەزستانو هاویندا ڕەوانن، با رۆحی پاکی خاسان، گشت ئەو مرۆ خاسانەی کە مردون، ئەوانەی کە لەدایکبونو زیندونو رۆحی ئەوانەی کە هێشتا نەهاتونەتە دنیاو لەپاشەرۆژدا دێن، کە بەهێزوتوانایەکی هەمیشەیی یارو یاوەرمان بن. ئاوی پاکی ئافەریدەی ئاهورامەزدا، بۆ بیرخراپانو بەد گوفتارانو بەد کرداران، کارساز نابێتو سوودو بەهرە بە نەیارانی پیاو چاکانو پەیڕەوانی رێی ڕاستی، ناگەیەنێت.

ئاو، ئەم خاسترین ئافەریدەیەی ئاهورامەزدا، چارەسازی گیروگرفتی ئەم جۆرە کەسانە نەبێت کە:

ئازار بە زیندەوەرە سودمەندەکان دەگەیەنن، ئەوانەی کە ڕژدنو پەلاماری خواستوویستی خەڵکی دیکە دەدەنو لەدەستیان دەرفێنن یا خەڵکی دەکوژن یا جادوگەرێتی دەکەن یا پەیمان شکێنن یا درۆزنن یا ستەمکارن یا دووڕوییو چاوچنۆکی دەکەن. ئاکامی خراپ بۆ هەموو ئەو کەسانە بێت کە بەم شێوەیەن.

سرودو ئاوازی دڵڕفێن دەچڕێنم بۆ ئاوە پاکەکانی ژیانبەخشن، سرودێك کە مانای سوپاسی ئافەریدەکان دەبەخشێ بۆ ئەو ئاهورا بێهاوتایەو ئەو زەردەشتە ئاکار گەوهەرییە کە ڕابەری کردین ستایشتی راستو دروست بکەین.

ئەی ئیزەدی پاك، ئەی ئاناهیتا، سرودت بۆ دەبێژم بۆتۆ کە دروستکراوی ئاهورایت. لێهاتوترین کردارەکانمت پێشکەش دەکەمو بەزمانی گیانو دڵمەوە ئەم سرودە دەچڕێنم. داواکاری گرنگترین شتم، تەندروستیو لەش ساغی، داوای ئەو شتانە دەکەم کە ئارامیو بەرزێتی بە ژیان دەبەخشێت، کە ئاژەڵو مەڕومالآتم زیاد دەکات، شادیو بەختەوەری بالأ بکێشێت بەسەر مالێوخێزانمدا، زارۆڵەی جوانو خاسو بەهێزو توانام هەبێت، ئەم هەموو شتانەم گەرەك نییە بۆ لەڕێی راست لادانو زیان گەیاندن بەخەڵکی، بەڵکو دەمەوێت بۆئەوەی ئەم ژیانە کە خاسترین خەلآتێکە کە ئاهورامۆزدا پێی بەخشیوین، بە خاسیو کامیابی بەرینە سەر. هەردوو دەستم لەبەردەممداو ڕوو بە ئاسمانی بەرینە، ئەی ئاهورای بێهاوتا، پێمان ببەخشە هەموو چاکەکانو ئارامیو بەهرەکان. ئەی فریشتەکانو ئیزەدەکانو ڕۆحیانەتەکان، خاسترین ئەو شتانەی ئاهورا پێی بەخشیوین، بخەنە سەر ڕێمان، لێمان قەبولأ بکەن ئەم سروودانەو تواناییمان پآ ببەخشن تا بتوانین پاسەوانی باشترین ئاینی راستو دروستی بین}.

- ئیزەدیوایو Vayu ((ئیزەدی هەوا))

ئەم ئیزەدە یەکآ لەئیزەدەکانی هندو ئێرانیە، سەرپەرشتی هەواو با دەکات. لە (رام یشت) زۆر بەووردی باسی ئەم ئیزەدە کراوە، هەروەها باسی هەوا (با) کراوەو کردویەتی بە دوو بەشەوە. بەشی یەکەم بریتیە لەهەوای سودبەخشو خاس (وای وە)، بەشی دووهەم بریتیە لە هەوای خراپو زیانبەخش (وای وەتر).

## ئاوێستاAvesta

ناوی کتێبی ئاینی زەردەشت، ئاوێستایە. تائێستا زانایانی ئاوێستا ناسو پسپۆرەکانی لەسەر مانای ئەم وشەیە رێکنەکەوتونو هۆی ئەمەش زێتر دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە لەئاوێستاو بەتایبەتی لەگاتاکاندا باسی لێنەکراوە.

زوربەی زۆری ئاوێستا ناسانو رۆژهەڵاتناسەکانیش لەو باوەرەدان کە مەبەست لەوشەی ئابەشتام Abashtam کەلەسەر بەردە داتاشراوەکانی کێوی بێستون هەلکەنراوە هەرئەم ئاوێستایە بێت بەگۆرینی چەند پیتێك. ئۆپەرت oppert، زانای ئەڵێمانی لەوباوەرەدایە کە ئەونوسینی سەربەردەی کەلە (داریوش) بەجێماوەو تیایدا دەبێژێ (ئەز بەگوێرەی دەستوری ئابەشتام حوکومرانیم کردوە)، مەبەستی هەمان ئاوێستایە.

برێکی دیکە لە ئاوێستا ناسان وەك پرۆفسیور گلدنرGeldnerو ئاندریاس Andreas دەبێژن کەبنچینەو ڕەچەڵەکی ئاوێستاو ئاوێستاك Avistak ی پەهلەوی لە ئوپەستا Upasta وەرگیراوە کە مانای بنچینەو بنەڕەتە. هەندێکی وەك (ئوپەرت) ی ئەڵێمانیوبارتلومەوویسباخ، ئاوێستا بەمانای پەناو یاوەر دەزانن.

دالا Dhalla کە یەکێکە لە ئاوێستاناسانی بەناوبانگی هیند، لەو باوەڕەدایە کە ئاوێستا لەبنچینەی (وید Vid)ی سانسکریتییەوە وەرگیراوە کە بەمانای زانست، هوشیاریو مژدەیە.

دکتور محمد مقدم دەبێژێ:

((ئاوێستا مژدەی رزگاری بە خەڵک دەگەیەنێت، ڕزگاری لەخراپەکاریو بیری خراپ، مژدەی نوشوستی درۆو خراپەو کەموکوڕی، مژدەی سەرکەوتنو لەئاکامدا فەرمانڕەوایی راستیو خاسی)).

لەکتێبی (دینکرد) Dinkard، کە یەکێکە لەگرنگترین نوسینەکانی پاش زەردەشت،وشەی (ئاپەستاك) بە مانای کۆڵەکەو بنچینە هاتووە.

بارتلومه Bartholmae، که کتێبی (ئاوێستاو فەرهەنگی ئاوێستا)ی گۆڕیوەتە سەر زمانی ئەڵەمانی، ویکاندر Wikander ئاوێستایان بە شێوەی ئوپستا وەك upastavakنوسیوەو دەبێژن لەبنچینەی ستاڤ (Stav)ەوە وەرگیراوە کە مانای ستایشکردنە.

لەزمانی پەهلەوی، ئاوێستا بەم شێوانە نوسراوەتەوە:

ئاپەستاك Apestak، ئاویستاك، ئاوێستا، ئاپەستا، هەنوکە، بەم شێوانە دەنووسرێت: وەستا، ئابەستا، ئاوێستا، ئاوێستا، ئیستا، ئیستاه، ئاوستاق، دەستا، بەستاق، بەستاه، ئابەستاق.

هەروەکو لەمەوبەر باسی کاتی پەیدابوونی زەردەشتی پەیامبەرمان کردو گوتمان کەوا چەندین پێش بینی جیاواز هەیە، وتائێستا مێژوونووسەکان ڕێکنەکەوتوون لەسەر دانانی کاتێك بۆ پەیدابوونی زەردەشت، دوبارە دەربارەی ئاوێستاش دەبێژن کە تائێستا مێژووو دێرینێتی ئەم کتێبە پیرۆزە بەداخەوە، دیاری نەکراوە، ئەو هەموو جیاوازیيانەی هەیە دەربارەی مێژووی کاتی پەیدابوونی زەردەشتو ئاوێستا، هەموی بەڵگەن بۆ دێرینێتی ئەم مێژووە کە بە لایەنی کەمەوە 1500 ساڵ پ. ز،و بەرەو دواوەیە.

لەبەر رۆشنایی ئەو سروودانەی کە لە (گاتا)کاندا هەیە (کە کۆنترین بەشی ئاوێستایەو لەوتە پیرۆزەکانی پەیامبەر خۆیەتی)، بۆمان دەردەکەوێت کەوا لە1300 تا 1500 ساڵ پ. ز کۆنترە، چونکو نیشانەیوای تێیدایە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمانە.

باسکردن دەربارەی دێرینێتی ئاوێستا، هەروەکو گوتمان، لەبەر ڕۆشنایی گاتاکاندا، ئیمرۆ ڕاستییەکی زانستیەو ئیدی تا ڕادەیەکی زۆر ڕێگەی ئەو هەموو باوەڕە جیاوازانەی بەستۆتەوەو بەتایبەتی بەرپەرچی ئەو باوەڕانە دەداتەوە کە سەدەی شەشەمی پ. ز بە چەرخی پەیدابوونی زەردەشت دەزانن. نابێ ئەم ڕاستییە لەبەرچاو نەگرین کە دێرینێتی ئەم ئاینەو ئەو هەموو کارەساتانەی بەسەر ئەم ناوچەیەدا هاتووە، وایکردووە لەم کتێبە پیرۆزە کە گیرۆدەی بڕی گۆڕینو دەستکاریکردنو کەمکردنو زیادە خستنە سەربێت، بەتایبەتی لەدوای نەمانی دەوڵەتی هەخامەنشیەکان، ئەم گۆڕینو دەستکارییە فرە زێتر بووە.

دەربارەی ئەو زمانەی کە ئاوێستای پآ نوسراوەتەوەو پێی بێژراوە هیچ جێگەی گومانی تێدا نەماوە کەزەردەشت بە زمانی مادی یاخود زمانی باوکو باپیرانمان قسەی کردووەو ئاوێستاش هەر بەو زمانە. بێژراوەوە نووسراوەتەوە. بەڵام بە درێژایی رۆژگار، ئەم زمانە لەناوچووەو وەکو زمانێکیووتووێژی نەماوە، بەڵکو تەنیا وەك زمانێکی ئاینی ماوەتەوە.

(راسموس راسك)ی دانیمارکی دەبێژێ کە زمانی ئاوێستا، زمانی مادەکانەو زەردەشت خۆی لەخێڵی ماد بووە. موبد ئازەرگوشەسب دەبێژێ کە زمانی ئاوێستا زمانی دانیشتوانی رۆژئاوای سەروی ئێرانە (ناوچەی مادەکان). دارمستر Durmesteter دەبێژێ:

(ئاوێستا لەسەردەمی مادەکاندا نوسراوەتەوە، زمانی مادەکان هەر ئەو زمانەیە کە ئاوێستای پێنوسراوەتەوەو دەتوانین بێژین زمانی کوردی ئێستا لەزمانی مادەکان ماوەتەوە.)

لێرەدا بڕێ لەووشانە دەخەمە بەرچاو کە زۆر بە ئاشکرا تیایدا بەدی دەکەین کەزمانی ئاوێستا چەندە لەزمانی کوردی نیزیکە (ئەمووشانەم لەکتێبی ـ بخشی از فرهنگ اوستاوتطبیق آن با فارسیو کردی ـ لەنوسینی موبد فیروز ئازەرگوشەسب) وکتێبە بەنرخەکەی مامۆستای خاولێخۆشبوو محمد ئەمین زەکی (مێژووی کوردو کوردستان) وەرگرتووە:

| ئاوێستایی | لاتین | فارسی | کوردی |
|---|---|---|---|
| ئائیرمە | airma | ارام | ئارام |
| ئائیوی سپارە | Aiwi - spara | سپردن | سپاردن |
| ئاپە، ئەپە، ئاڤ | Apa-âv | آب | ئاڤ، ئاو |
| ئاتر، ئاترش | Âtar- âtars | آتش | ئاتەر، ئاگر، ئاهیر |
| ئاخشتی | axşti | آشتی | ئاشتی |
| ئازاتە | azâta | شجاعونجیب | ئازا |
| ئازار، ئازرتا | Âzâra- âzârta | اژیت | ئازار |
| ئەزم | azem | من | ئەز، من، مە |
| ئازیانی | âziani | زیان، صدمە | زیان |
| ئاژی | azhi | اژدها | ئەژدیها |
| ئەسپە | aspa | اسپ | ئەسپ |
| ئەستر | | قاگر | ئێستر |
| ئاسمو، ئاسمان | Asmu. asman | آسمان | ئاسمان |
| ئاشکرە | aşkara | آشکار | ئاشکرا |
| ئافەرین | âfrina | آفرین | ئافەرین |
| مەهرکە | mahrka | مرگ | مەرگ |
| ئەنە | ana | این | ئەمە |
| ئەنگوشتە | Anguşta | انگشت | ئەنگوس، پەنجە |
| ئەورە | avra | ابر | هەور، ئەور |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئوروان | urvan | روان، روح | رەوان، رۆح |
| ئوشی | usi | هوش | هۆش |
| ئوشترا | uştra | اشتر، شتر | ئوشتر، وشتر، هوشتر |
| ئاهورامەزدا | Ahuramazda | | هورمز |
| ئیریشە | irisa | زخم شدن | رِێش، برین |
| ئازینە | | آینە | ئاوێنە |
| بازو | Bâzu | بازو | بازوو، باهو |
| باجە | Baja | باج‌وخراج | باج |
| بەختە | Baxta | بخت‌واقبال | بەخت |
| بەر | Bar | بردن | بردن |
| بەرزە | Bareza | بالا، بلند قامت | بەرز |
| برەوە،<br>برەوەت | Brava- Bravat | ابرو | برۆ |
| بوزە، بوز | Boza - Buze | بُز | بز، بزن |
| بندە | Banda | بندە، غلام | بەنە، بەندە |
| بەند | Band | بندکردن، وبستن | بەن، بەند |
| بوت | | باشد | بوێت، ببێت |
| بهلم | | بگزارم | بهێلێم |
| بەغ، بەگ | Bagha- Baga | خداوند | ئەم وشەیە بە مانای خوایەو لەکوردیدا (بەگ) بە مانای گەورەیە<br>بەغوداتەBaghdâta (بغداد)<br>بە مانای خواداد واتە دادەی خوا |
| پەئیتی یارە | Paitiyara | پتیارە | پەتیارە |
| پەئیرکە | Pairika | پری | پەری |
| پەئیسە | paessa | پیس | پیس |
| پاشنە | pâşna | پاشنەپا | پاشنە |
| پەتنە | pathna | پهن | پان |
| پەرە، پەرینە | Para - parena | پریدن | پەرین |
| پەرتو، پەرتا | peretu | پل | پرد، پرت |
| پەرسە | Paressa | پرسیدن | پرس |
| وەچە | Vâça | صحبت | واچە، قسە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ورازە | | خوك | وەر از، بەراز |
| تاشتە | Tâşta | تراشیدن | تاش (وەك دارتاش) |
| ترسە | Tarsa | ترس | ترس |
| تەشە | Taşa | تیشە | تەشو، تەشوآ |
| تەشتە | Taşta | گشت | تەشت |
| تەنور | Tanura | تنو | تەنور |
| توم | Tuam | تو | تۆ |
| تەوەن | Tavan | توانا | توانا |
| تیژی | Tizhi | تیز | تیژ |
| تیژی دانترە | Tizhi -dântra | تیزدندان | دان تیژ |
| جەنی، ژەنی | Jani | زن | ژن |
| چاتروگئوشە | Çatru gaosa | چهارگوش | چوارگۆشە |
| چەرە | Çara | چرپدن | چەرە |
| چەریما | Çaremâ | چرم | چەرم |
| چو | Çu | چونو جگور | چۆن |
| چی | Çee | چە | چی |
| خور، هور | Xvar | خورشید، افتاب | خۆر، هۆر |
| خورتە | Xvareta | خوراکی | خواردن |
| خوەسو | Xvasure | مادرزن | خەسو |
| خەوفتە | Xvafna | خواب | خەفتن، خەو |
| خسا | | سخن، حرف | قسە |
| خش | | خوب | خاس، چاک |
| دانە | Dâna | دانەوغلە | دان |
| دانو | Dânu | دانا | دانا، زانا |
| دەئوە | Daeva | دیو | دێو |
| درەفشە | Drafsa | درفش | درەوش |
| دژ | Dozh | بدوزشت | دژ |
| دەنتەن | Dantan | دندان | ددان |
| دوغدەرە، کونیکە | Dughdara | | کنیشك، دوت |
| دوت | Dot – Doonika | | دوت/ کچ |
| داتە | Dâtâ | دادو انصاف | داد |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕێوی | روباه | Raopi | ڕەئوپی |
| ڕاز | راز، سر | Râza | ڕازە |
| ڕەنج | رنج | Ranj | ڕەنج |
| زێڕین | زرین | Zaorina | زەئیرنە |
| زاوا، زاما | داماد. | Zâmâtar | زاماتر |
| زەر، زێڕ | زر، گلا | Zar | زەر |
| زانین | دانستن‌وشناختن | Zan | زان |
| زەریا | دریا | | زەرەیە |
| ئەژنو | زانو | | ژنو |
| سپی | سفید | Spita | سپیتە |
| هەسارە، ئەستێرە | ستارە | Stara | ستەرە |
| سارد | سرد | Saeta | سەرتە |
| سێو، سێڤ، سەو | سیب | | سەو |
| سو، سود | سودو منفعت | Sou | سو |
| سۆن | سن | Suan | سوەن |
| شەرم | شرم‌وحیا | Fşrma | فشەرمە |
| کات | کی | KaT | کەت |
| کەم | کم | Kama | کەمە |
| کورە، کوێر | کورونابینا | Koora | کورە |
| کوشتن | کشتن | Koosa | کوشە |
| کێو، کێف | کوه | Koofa | کوفە |
| گمێز | ادرارحیوان | Gaomaeza | گئومئیزە |
| گەرم | گرم | Garema | گەرمە |
| گیان | جان | Gaye | گیە |
| ماسی،ماسۆ | ماهی | Massu | ماسو |
| ماندن، مان | ماندن | Mâna | مانە |
| | | Mâha | ماهە، ماسە |
| مانگ | ماه | Masa | مائونگهە |
| مازن، گەورە، مەزن | بزرگ، سنگین | Maz | مەز، ماز |
| مێش | مگس‌و پشە | Maxsi | مەخشی |
| میرد | شوهر | | میرە |
| نێر | نر، مرد | Nairyu | نەئیریو |
| نەیزە | نیزە | Naeza | نەئیزە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| نەیمە | Naema | نیمە | نیوە، نیمە |
| نەزونە | | نمیدانم | نازانم |
| نەزینە | | نمیداند | نازانآ |
| وەرخا | | برە | بەرخ، وەرخ |
| وارە | VâRA | باران | واران، باران |
| وەفرە | Vafra | برف | وەفر، بەفر |
| واسی | | خواستن | وەسو، واشتن، ویستن |
| وەرس | | رسیمان | گوریس |
| هوشکە | huska | خشك | وشك |
| هونەرە | hunara | هنر | هونەر |
| هەشتم | | گزاشتم | هێشتم |
| یاتو | Yâtu | جادو | جادو |
| | | | |

## کورتەیەك لەسەرگوزەشتەو بەسەرهاتی ئاوێستا

پاش زەردەشت، ناوەرِۆكو رِەسەنێتی پەیامەکەی دوچاری نوشوستیو گۆرِانکارییەکی زۆر بووە. لەسەردەمی هەخامەنشی یەکاندا، باوەرِو ئاینە کۆنەکانی سەرزەمینی ئارییاییەکانی پێش زەردەشت بەهۆی برِێ هۆ کە لێرەدا مەودای باسکردنیان نییە کاریان کردەسەر ئاینی زەردەشت، ودوبارە خۆیان لەم ئایینەدا نواندو برِی داستانو ئەفسانەیان تێکەڵ بەم ئاینە کرد. هەر چەند لەسەردەمی ژیانی زەردەشت دوورتر دەکەوینەوە، ئەم ئاسەوارانە پتر وەبەرچاو دەکەون. بۆ نمونە، ئەو نوسینی سەر بەردو ئاسەوارانەی سەردەمی هەخامەنشییەکان ئەم نوشوستیو گەرِانەوە بۆ دواوەمان زێتر بۆ رِوون دەکەنەوە.

برِی لەنووسەرە یۆنانیەکان دەربارەی ئاوێستا دەبێژن کە بەچاوی خۆیان دیویانە ئەم کتێبە لەدوو میلیون پارچە چەکامە پێکهاتبوو.

نووسەری کتێبی (ایران در عهد باستان) دەبێژێ:

((کتێبی ئاوێستا، سەرەتا لەپێش هێرشەکەی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران کتێبێکی گەورەبووو پلینوس Pallinusی مێژوونووسی رۆم کە لەسەدەی یەکەمی زاینی دا ژیاوە دەڵی کە (Hermippos)ی مێژوونووسی یۆنانی کە لەسەدەی سێهەمی پ. ز ژیاوە، لەنووسینی باسی

باوەڕی زەردەشت، سوودی لەکتێبەکەی وەرگرتووە کە لەبیست (مجلد) نووسرابوووپێکهاتبو لەسەد هەزار چەکامەو خۆی ئەو کتێبەی خوێندۆتەوە.))

زۆر لەداستانە کۆنەکانو نووسینی مێژوونوسەکانی ئیسلام باسی گەورەیی ئەم کتێبەیان کردووەو گوتویانە کە بەئاوی زێر لەسەر پێستی دوانزە هەزار گا نوسراوەتەوە (مسعودی، گبری، پعالبي).

هەروەها ابو علی مسکویه الرازی لەکتێبی (تجارب الامم) ل - 30 دەبێژێ:

((وڨهر في ايامه (بشتاسف) زردشت وأراده على قبول دينه فامتنع من ذلك ثم صدقه وقبل ما دعاه اليه وأتاه به من كتاب يكتب في جلد اپنى عشر الف بقره حفراً في الجلود ونقشأ بالذهب وصير بشتاسف ذلك باصطخر و وكل به الهرابزه ومنع تعليمه العامه).

واتە: زەردەشت لەسەردەمی گوشتاسەب دەرکەوتوویستی کە گوشتاسەب ئاینەکەی پەسەند بکات، بەلآم لەپێشەوە قەبوڵی نەکردو پاشان ئاینەکەی قەبولأ کرد. زەردەشت کتێبێکی هاورد کە لەسەر دوانزە هەزار پێستی (گا) بە ئاوی زێر هەڵێکەندرابوو، گوشتاسەب ئەو کتێبەی ناردە (ئەستەخر)و هیربودەکانی ڕاسپارد چاودێری لێبکەنو خەڵکی رەشۆکی قەدەغە کرد لەفێربونی.))

هەروەها ابن بلخی لە (فارسنامە) دا دەبێژێ:

(... وە زەردەشتی حەکیم لەسەردەمیویشتاسەب دەرکەوتو ئاینی گەبری هاورد... وکتێبی زەندی هێنابووو هەموو حیکمەتەکانی لەسەر دوانزە هەزار پێستی (گا)ی دەبێغکراو، بەزێر نوسیبوو. ویشتاسەب ئەو نووسینەی پەسەند کردو ناردیە (ئەستەخر)ی پارس کە کێوێکی لێە پێی دەڵێن کێوی (نفشت)کە هەمە جۆرە نەخشو هەڵێکەندن لەسەر بەردی (خارا)ی تێدایەو ئاسەواری سەیری تێدایە. ئەم کتێبی زەندو پازەندەی لەوێرا دانابوو. گەبرەکان دەبێژن کە ئیدی کەس چاوی بەو کتێبە نەکەوت، هەروەهادەبێژن کە هەڵێکێشراوەتەوە بۆ ئاسمان.)

لەبەر رۆشنایی ئەو نووسینانەو برێ بەڵگەی مێژوویی دیکە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەر لەسەردەمی گوشتاسەب شادا دوو نوسخە لەئاوێستا نووسراوەتەوە، یەکێکیان لەکتێبخانەی گەورە (دژنپشتك) کە بە مانای (دەفتەرخانە) یا (قەلآی نووسراو)ە، ئەوی دیکەیان لە (گنج شیپیگان) یا (شیز) کە لە (تخت سلیمان)ی رۆژهەلآتی کوردستان (نیزیك شاری تیکاب) دانراوە. ئەم (شیز)ە لەسەردەمی دێریندا یەکآ لەپایتەختەکانی ئێران بووەو بەتایبەتی لەسەردەمی ساسانییەکاندا نیشتەجآو هاوینەهەواری خەسرەو پەروێز بووەو شوێنی ئاتەشکەدەی ئازەر گوشەسب بووە.

پاش هێرشەکەی ئەسکەندەری مەکدونی بۆ سەر ناوچەی ئێرانو ڕوخاندنی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی، لەتەك هەموو ئەوویرانیو تالآنیو خاپورکردنی کاخە بەنێوبانگەکانو خراپەکارییەکانی کردی، ئەو کتێبخانە گەورەیەشی سوتاندو نوسخەی ئاوێستاش کە لە (ئەستەخر) دەپارێزرا، سوتێنرا.

یۆنانییە داگیرکەرەکان، نوسخەی دوهەمی ئاوێستایان ڕاگوێستەوە بۆ یۆنان، ولەوێرادا باسە زانستییەکانییان دەربارەی پزیشکی، ئەستێرەناسین، فەلسەفە، وێژەوانی، ئوسوڵی ئاینی، یاسا، کۆمەلآیەتییەکانی ئەو سەردەمەو زانیاری دەربارەی گژوگیاو ئاژەڵداری، گۆرییە سەر زمانی خۆیانو بەناوی خۆیانەوە بلآویان کردەوەو کردیانە مولکی شارستانییەتی خۆ(التنبیەوالاشراف ـ مسعودی). بۆیە راتزنشیتن، ئەفلاتونی فەیلەسوفی بەنێوبانگی یۆنان زۆر بەقەرزاری زەردەشت دەزانێت.

نووسەری کتێبی (مجمل التواریخ والقصص) دەبێژێ:

((.... پاش ئەوەی ئەسکەندەری رۆمی، ئێرانی داگیرکرد، فرە حەسودی بە زاناو (موبدە)کان برد، گشت زاناکانی کۆکردەوەو هەرچی کتێبێك هەبوو هەموی خڕکردەوەو فەرمانی دا بیگۆڕنە سەر زمانی یۆنانی، وهەموو گۆڕینەکانی ناردە یۆنان بۆ لای ئەرستوتالیسو ئەسڵی کتێبەکانی سووتاند.))

هەمزەی ئیسفەهانیش لەم بارەوە دەبێژێ:

((وذلك ان الاسکندر لما استولی علی ارض بابل وقهر اهلها حسدهم علی ماکان اجتمع لهم من العلوم التي لم تجمع قط لامة مثلها، فأحرق کتبهم مانالته یده ثم قصد الی قتل الموابزه والهرابزه والعلماء والحکماء...))

واتە:

((پاش ئەوەی ئەسکدندەر سەرزەمینی بابلی گرت (مەبەستی ئێران بووە)و بەسەر خەڵکەکەیدا زاڵ بوو، حەسوودی بە هەموو ئەو زانستانە برد کە هەرگیز هیچ میللەتێك بە ئەندازەی ئەمان نەیانبووە، هەرچی کتێبێکیان وەبەردەست کەوت، سووتاندی، وئەوسا دەستی کرد بە کوشتنی (موبد)، (هیربد)، زاناو حەکیمەکان.)

فرە بەڵگەی مێژوویی لەم بارەوەمان هەیەو ئەوەی باسمان کرد نموونەیەکی یەکجار کەمە لەو بەڵگانە. بەلآم ئەوەی (پعالبی) لە کتێبی (غرر اخبار ملوك الفرس) دەربارەی زەردەشتو ئاوێستاوبڕی لەپەیامەکەی نوسیوە، بەپێویستندەزانم لێرەدا دەقی نووسینەکەی پێشکەشی خوێندەوارانی هێژای بکەم:

((وكان زردشت اتاه بكتاب ادعاه وحياً من الله عزّ اسمه فكتب في جلود اثنى عشرة الف بقرة حفراً من الجلود ونقشاً بالذهب وأمر به بشتاسف فخزن في القلعة باصطخر ووكل به الهرابذه. وذكر (ابن خردادبه) ان زردشت كان منوضهرى النسب وكان في موقان(مغان) من بلاد آذربايجان. وان الكتاب الذي جاء به في تسبيح الله وتمجيده وفي الاخبار الماضية والكائنة فيما بعد وفي الفرائض والأحكام....... وعظم امر النار قربةً الى الله عزّ ذكره لأنها من نوره ومن اعظم الاصطقسات وأجلها الدنيا وايضاً بتعظيم الماء الذي هو قوام الخلق وسبب عماره الدنيا وفرض تنزيهه وترك استعماله في اوالة النجاسات واما القذرات... وزعم ان ماخرج من باطن الانسان من اى منفذ كان فهو نجس ولذلك سن الزمزمه عند الاكل تحرزاً من بوادر الريق الذي ينجس الطعام. وفرض ثلاث صلوات يدورون فيها مع الشمس كيف ما دارت. احدها عند طلوع الشمس والثانية عند انتصاف النهار والثالثة عند غروب الشمس. وحرم الاكل والشرب في اوانى الخشب والخزف لانهما يقبلان النجاسات... وزعم ان اراوح الموتى تعود الى منازلهم في ايام الفوردجان (فرودكان) فأمر بتنظيف البيوت وبسط الفرش النظيفة ووضع الاطعمة الشهية فيها ثم اكلها كلها لتقوى ارواح الموتى بروائحها وقواها. وحرم ان يمس الميت وزعم ان من مسه وجب عليه الغسل لانه نجس بانتقال الروح الطاهره عنه. وأوجب الطهاره على الناس في اليوم والليلة مرة واحدة وهي عنده عن الوجه واليدين. وأوجب على الناس ان يخرجوا من اموالهم الثلث للفقراء والمساكين والمضطرين من اهل ملتهم وغيرهم وفي اصلاح القناطر وكنس الأنهار وعمارة الارضين. وقال لا طلاق الاّ بأحد ثلاثة: الزناء والسحر وترك الدين.وحرّم السكر والزنا والسرقه.))

واته:

(وه زەردەشت كتێبێكی هێناو دەیگوت كه لەلایەن خوای شكۆمەندەوه وەحی بوه بۆیو لەسەر پێستی دوانزه هەزار (گا) به زێرِ نوسرابو.

گوشتاسەب دەستوری دا كه ئەو كتێبه لەقەلآیەك لە(ئەستەخر) دابنێنو هیربودەكانی ڕاسپارد بۆ چاودێری كردنی.

(ابن خردادبه) دەبێژێ كه ڕەچەڵەكی زەردەشت دەگەڕێتەوه بۆ (مەنوچەهر) له موغەكانی ئازەربایجان بووه، و ئەو كتێبەی هێناویەتی دەربارەی ستایشتو پەرستنی خواو داستانی ڕابوردوو هەواڵی پاشەڕۆژو ئەو شتانەی دەبێ ئەنجام بدرێنو فەرمانه ئاینییەكانه.

وه بۆ نیزیكبونەوه لەخوای شكۆمەند، ئاگری به پیرۆز داناو به پرشنگێك لەنوری خوای داناوه، هەروەها فەرموی كه ڕێز لەئاو بگیرێت چونكو بنەمای ژیانەو هەرچی ئاوەدانی هەیه بەهۆی ئەوەوەیەو پێویسته به پاكی ڕابگیرێتو بۆ پاككردنەوەی پیسایی بەكاربهێنرێتو هەرگیز پیسو لیخن نەكرێت.....

دەیگوت هەرچی شتێك لەلەشی ئادەمیزاد بێتەدەر لەهەر شوێنێكو كونێك بێت پیسە، لەبەر ئەوەورەور(زمزمە) كردنی لەكاتی نانخواردندا بە سوننەت دانا بۆئەوەی ئاوو لیكی نێودەم خواردنەكە پیس نەكات. سێجار نوێژكردنی بە پێویست داناوە یەكێكیان سەر لەبەیانیو ئەوی دیكە لەنێوەڕۆو سێهەمیان لەكاتی رۆژئاوابوندا بوو. لەكاتی نوێژكردندا دەبێ ڕوو لەخۆر بكرێت لەهەر شوێنێكدا بێت. خواردنو خواردنەوەی لەنێو قاپوكاسەی لەدار دروستكراوو سوفالین بە حەرام دانابو چونكە پیسایی زوو وەرولاّخدەگرێ. هەروەها دەیگووت كە رۆحی مردوان لەرۆژانی (فەروەردگان) دەگەڕێنەوە بۆ نێو ماڵأو لای خاوو خێزانیان، لەبەر ئەوە فەرمانی دا كە لەو رۆژانەدا پێویستە خانوەكان پاكو تەمیز بكرێنو فەرشو ڕاخەرەكان بتەكێنرێنو خواردنی خۆشو بۆنخۆش دروستبكرآو بخورێت تا رۆحی ئەوانیش بە بۆنو بەرامەی خواردنەكان بەهێزو توانا بێت.

دەست لەجەستەی مردووانی بە حەرام داناو دەیگوت هەر كەسێك دەست لەجەستەی مردوو بدات، پێویستە لەسەری خۆی بشواتو پاك بكاتەوە چونكو، هەركە رۆحی پاك لەلەشی ئادەمیزاد جیابۆوە، جەستە پیس دەبێت. لەشەوو رۆژێكد پاك كردنی لەشی بۆ یەكجار بە پێویست داناوە كە لای ئەو شۆردنی دەستو دەموچاوە. لەسەر هەموو خەڵكی بە پێویست داناوە كە سآیەكی هەموو دارایی خۆیان بدەن بە هەژارو بێدەرامەتانو بێچارەكانی خۆیانو كەسانی دیكەو هەروەها لەپێناوی دروستكردنو چاككردنی پردو پاككردنەوەی جۆگەلەكانو ئاوەدانكردنەوەی زەویو بەكاربهێنن، دەبێژێ جیابوونەوەی ژنو مێرد لەیەكدی(ڕەهاكردن، طلاق) لەم سآ حالەتەدا نەبآ دروست نییە، زنا، جادوگەرێتیوواز لەئاین هێنان. هەروەها سەرخۆشی زناو دزێتی حەرام كردووە.)

دوا بەدوای ئەو كارەساتە سامناكەی ئەسكەندەر بەسەر ئەم ناوچەیەدا هێنای، ئەم ئاینە دوچاری پەرشوبلآوی بوو. ئاوێستا بە شێوەیەكی ناتەواوو پارچە پارچە لەبڕی ماڵەكاندا بەتایبەتی لای پیاوە ئاینییە گەورەكان مایەوە، ئەو گەورە پیاوانە كە زۆربەی ئاوێستایان لەبەربوو بەتایبەتی گاتاكان كە سروودەكانی خودی زەردەشت بوون وەك نەخشی سەربەرد لەسەر سنگی خۆیان هەڵێكەندبووو پشتاوپشت بە درێژایی تەمەنی مێژوو، باوك فەرزەندی خۆی فێردەكرد.

بەم شێوەیە، ئاوێستا تا ڕادەیەكی زۆر پارێزراو ماوەیەكی زۆری خایاند تا دوبارە بنوسرێتەوە.

بەگوێرەی ناوەڕۆكی داستانە كۆنەكان بەتایبەتی لەكتێبی سێهەمی دینكرد، یەكەمین كەسێك كە پاش ئەسكەندەری مەكدونی، ئاینی خواپەرستی نوێ كردەوەو فەرمانی كۆكردنەوەی ئاوێستای دەركرد، چ ئەوانەی بە نووسین مابونەوەو چ ئەوانەی لەبیری خەڵكدا مابۆوەو لەبەریانبوو، یەكآ لەشاكانی ئەشكانی بوو بەناویولخش Volakhsh كە پێی دەبێژن(بلاش)ی یەكەم (51–78ز). هەر لەو كاتەدایە كە پلینوس Plinius مێژوونوسی سەدەی یەكەمی زایینیو هاوچەرخی بلاش دەبێژێ: خۆم كتێبی زەردەشتم دیوە كە بە دوو میلیون پارچە چەكامە نوسراوەتەوە.

هەروەکو دەبێژن لەسەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی ساسانییەکان نیزیکەی حەفتا کۆڕو کۆمەڵ بە نێوی ئاینی زەردەشتیەوە لەناوچەی ئێراندا پەیدابوو کە مەخابن کەمتر ڕەسەنێتی پەیامی زەردەشت بەتایبەتی گاتاکان لەنێویاندا خۆی دەنوێند.

پاش ئەوەی ئەردشێری[24] بابەك کە یەکی لەمەزنترین شاکانی ساسانییەکانو لەبنەماڵەیەکی کوردی زەردەشتی بوو (224– 242ز)، هاتە سەرکار. ئەم پیاوە مەزنە، بۆئەوەی ئاینی زەردەشتی ببوژێنێتەوەو لەو بارە ئالێۆزە رزگاری بکات، بانگهێشتی بۆ هەموو (موبد)و پیاوە گەورە ئاینییەکانی زەردەشتی کردو دوستووری دا کە هەرچییەکیان لەتوانادا هەیە بەختی بکەن بۆئەوەی لەهەر شوێنێك نووسینی ئاوێستاو یا هەر کتێبێکی دیکەی ئاینی هەیە کۆبکەنەوە.

ئەم کارە پیرۆزە بە یارمەتی تەنسەر Tansar گەورەی موبدەکان دەستپێکردو دیسانەوە ئاوێستا لەسەردەمی ساسانییەکاندا لەسێ بەشی گەورەو بیستویەك نەسك (کتێب) نوسرایەوە. ئەردەشێر فەرمانی دەرکرد کە ئاینی رەسمی دەوڵەت، ئاینی زەردەشتیە.

پاش ئەردەشێر، کوڕەکەی، واتە شاپوری یەکەم (242 – 272ز) ڕێبازی باوکی گرتەبەرو فەرمانی دەرکرد کە موبدەکانو زاناکان، ئەو ئاوێستایەی هێشتا لەنێو خەڵکدا پەخشوبلاَوە بەتایبەتی بابەتەکانی کە دەربارەی پزیشکی، ئەستێرەناسین، جوغرافیاو فەلسەفەو بەشێکیش لەو ئاوێستایەی کە لەناوچەی هیندستانو یۆنان هەبون کۆکرایەوە. شایانی باسە کە(ابن ندیم) لەکتێبی (الفهرست)[25]دا لەزمان ابو سهیل بن نوبخت کە کتێبی (النهمگان)ی نوسیوە، ئەم ڕوداوانە بەدوورودرێژی باسدەکا کە زۆر لەتەك نوسینەکانی دینکرد) نیزیکە. پاشان، لەسەردەمی شاپوری دووهەم کوڕی هورمز (310– 379ز) هەوڵوکۆششێکی زێتردرا بۆ ئامادەکردنو دوبارە نوسینەوەی ئەم کتێبە پیرۆزە. لەو سەردەمەدا، وتوویژو ڕاراییو قسەیەکی زۆر هەبووە دەربارەی ڕەسەنێتی ئاوێستای ئەوکاتە. بۆیە شاپوری دوهەم فەرمانی داوە کە (ئازەربود مهراسپندان) کە یەکآ بووە لەهەرە گەورەترین زانا ئاینییەکانی ئەوکاتە، کە دەربارەی ئاوێستا کارێکیوابکات پاکیو ڕاستیو دروستی رۆژانی دێرینی خۆی وەدەست بێنێتەوە.

پاش ماوەیەك، ئەم زانایە ئەو کارە دەکا، وبۆئەوەی بیسەلمێنآ کەئەم کتێبە هیچ کەموکوڕییەکی تێدانییە، بەگوێرەی نەریتی ئەو سەردەمە، داوا دەکات کە مسی تواوە بکەنە سەر سنگیو ئەگەر هاتوو هیچی لێنەهات، ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو کتێبەی کۆیکردۆتەوە لەهەموو ڕویەکەوە تەواوە. پاش ئەوەی مسی تواوەیان کردە سەرسنگی، ئەم پیاوە ئاینییە هیچی لێنەهات. ئەمجارەش کتێبی ئاوێستا سەروسامانێکی بەخۆوە گرتەوە.

بەداخەوە، لەسەردەمی شایەتی خەسرەو پەروێز، چینی پیاوە ئاینییەکان بەرەو نوشوستی رۆشتونو رۆژبەرۆژ ئاینی پیرۆزی زەردەشتیان بەرەو هەڵێدێر بردووە. لە(مینوخرد) بەشی 59دا، باسی خراپەکارییەکانی پیاوە ئاینیەکانی ئەو سەردەمەو گەندەڵییەکان دەخاتە بەرچاو کە بڕێکی بریتین لە: چاوچنۆکی، بەرچاوتەنگی، بآ ئاگایی، خۆ خەریك کردن بەکاری بازرگانی،

دڵبەستن بە مادیات، باوەڕکزی بە مەسایلی ئاینی، دوورکەوتنەوە لەبنەماکانی پەیامە ڕەسەنەکەی زەردەشت، خۆ بەزل زانینوگوێ نەدانە خەڵک بۆیە خەسرەوپەروێز بڕیار دەدات کە چالاکترینو زاناترین (موبد)ەکانی ئەو سەردەمە دوبارە راژەیەك لەسەر ئاوێستا بنوسنەوە. ئەمە دوا پیاچونەوەو تازەکردنەوەی ئاوێستا بووە لەسەردەمی ساسانییەکاندا.

مەخابن بۆ جارێکی دیکەش ئاوێستا دوچاری کارەساتو سوتاندن بۆوە، ئەم جارەیان پاش هێرشی عەرەبەکان بۆ سەر کوردستانو ناوچەی ئێران بوو. زەردەشتیەکان زێتر تووشی ئەشکەنجەو ئازارو دەربەدەری بوونو بەگشتی کەوتنە بەر شاڵاوی کوشتارو ڕەشکوژی. کاتێك عەرەبەکان هێرشیان هێنایە سەر ناوچەی کوردستانو ئێران، زەردەشتیەکان بەرگریان لەئاینی خۆیان کرد، بەڵام پاش ئەوەی عەرەبەکان سەرکەوتنو بەهێزی شمشێر ناوچەکەیان داگیرکرد، دەستیان کرد بە کوشتنو لەناوبردنو ڕاونانی زەردەشتیەکان، وهەرچی ئاسەواری زانستو پێشکەوتنو شارستانیەت بوو هەمویان لەناوبردو سوتاند. کتێبی ئاوێستاش یەکێك بوو لەو قوربانیانە.

داستانی بەرگری زەردەشتیەکان لەئاینی خۆیان فرە بەر فراوانەو لێرەدا پێویست دەکات باسی چەکامەیەك بکەین کە لەدەوروبەری ساڵی 1909 بەهۆی ئەو پشکنینانەی لەدێی (هەزارمێرد)ی شاری سلێمانی ئەنجام دراوە. پێستە کۆنەیەك دۆزراوەتەوە کە چوار پارچە چەکامە بە زمانی کوردی. وبەخەتی پهلوی نوسرابوو. ئەم چەکامەیە کە نێوی (هورمزگان)ي لێنرا بیرەوەری ئەو هێرشەی عەرەبەکانە بۆ سەر خاکی کوردستانو ئەو رەشکوژییەو ماڵوێرانیەي کە تووشی بوون. بەگوێرەی بۆچونی زانایان، ئەم نوسراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەستپێکردنی هێرشی عەرەبەکان بۆسەر ناوچەکە. ئەم چەکامە ئاگراوییە کوردییە کە دڵو دەروون دێنێتە کوڵو دەبێتە هۆی غەمو پەژارە، وەك پەردەی سینەما روداوەکانی ئەو رۆژانەمان بە ڕوونی پێشان دەدات

چەکامەکە دەبێژێ:

هورمزگان ڕمان، ئاتران کوژان وێشان شاردەوە گەورە گەورەکان

زۆرکار ئارەب کردنە خاپور گنای پاڵە هەتا شارەزوور

ژنو کەنیکان وەدیل بشینا مێرد ئازا تەلیوە روی خوێنا

رەوشت زەردەشت مانەوە بآ کەس بەزەییکا ناکا هورمز وەهیچ کەس

واتە:

شوێن نزرگەکانوێران بون، وئاگرەکان کوژانەوە

گەورەپیاوان خۆیان شاردەوە

زۆرداری عەرەب کردیانویرانو خاپوور

گشت گوندەکان هەتا شارەزوور

بەدیلی گیران ژنانو کیژان

پیاوە ئازاکان لەخوێندا گەوزان

بێکەس مایەوە ئاینی زەردەشت

هورمز (ئاهورمەزدا) بەزەیی بەهیچ کەس نایەت

پاش ئەو هەموو ڕەشکوژیو ئەشکەنجەو ئازارەی باسمان کرد، بڕی لەزەردەشتییەکان ناچاربون ڕەوبکەن بۆ هیندستانو هەندێکی دیکەشیان چاوەڕوان بون تا هەلیان بۆ بڕەخسێتو خۆیان رزگاربکەن لەو میحنەتە، وبڕێکی دیکەشیان بەتایبەتی لەناوچەی کوردستان بە شێوەیەکی وەستایانەو زیرەکانەو هۆشیارانە لەژێر ناوی هەندێ ئایینو ئایینزا مانەوەو تاڕادەیەك دابونەریتی ئاینی خۆیان پاراستووەو تا ئێستاش ماونەتەوە.

لەسەردەمی خەلافەتی مەئمونی کوڕی هاڕوونە رەشیدی عەباسی، دانایەکی زەردەشتی بەناوی ئازەرفەرونبغ (198- 218 ه) لەشاری بەغداد (بەغ داد = خواداو)، دەستی کرد بە کۆکردنەوەو نووسینی کتێبی دینکرد Dinkard. کە بریتی بوو لەتەفسیری ئاوێستا.

تاسەدەی نۆ هەمی زاینی، ئاوێستای سەردەمی ساسانیەکان جگە لەچەند نەسکێکی (کتێب) ئەوانی دیکەی هەموویان هەبون، وەبەشکرابون بە 21 بەشەوە، هەر حەوت بەشێکی کرابوو بە کتێبێكواتە ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان بەشکرابو بە سێ بەشەوە:

کتێبی یەکەم، دەربارەی ئوسولأو بنچینەکانی کۆمەلآیەتیو ئاکاری دەدوا.

کتێبی دووهەم، دەربارەی تەوەری ئاکاریو ئایینیزایی بووە.

کتێبە سێهەم، باسی یاساو مەراسیمی ئاینی کردووە.

ئەو ئاوێستایەی ئێستا هەیەو لەبەردەستایە، پێکهاتووە لەپێنج بەش کە لەپاش ئەو هەموو ڕوداو گرفتارەی بەسەری هاتووە، هێشتا هەرماوەو بەهێزە. ئەم پێنج بەشە بریتین لە:

1ـ یەسنا: بریتیە لەستایشتو نیایشو نوێژو ئیتاعەتو باسی جەژنەکان. پێکهاتووە لە 72 هات(فصل، بەش، سورە)و دابەشکراوە بەدووبەشەوە.

2ـویسپرد (ویسپرتۆ): ئەم بەشە، بەشێکی زۆر سەربەخۆ نییە چونکو لەتەك بەشی یەکەمدا (یەسنا) بەکاردەهێنرێتو دەخوێنرێتەوە. پێکهاتووە لە27 هات.

3- وەندیداد: بریتیە لە22 هات، لەهەموویاندا باسی یاساکانی ئاینو ڕێوڕەسمو ئادابی تیاکراوە. بۆ نمونە گشت ئەو شتانەی دەربارەی پاکوتەمیزی لەشو خاوێنی جلوبەرگ، خۆشتن، پیسێتی، مردوو، دەخمە[26]، تۆبەکردن، نینۆك گرتن، کورتکردنەوەی موی لەشو.. تیایدا باسکراوە.

سەرجەم دەتوانین بێژین کە وەندیداد تەنیا دەربارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی یاساکانی ئایینزا دەدوێت.

4- یەشت: پێکهاتووە لە21 هاتو بە شێوەیەکی شاعیرانەو بەکێشەو قافیەی ڕێکوپێك نوسراوەتەوە. هەندێکیان کورتو بڕێکیان درێژترن، وگشتیان دەربارەی ستایشتو پەرستنی ئاهورامەزداو ڕێزگرتن لەفریشتەکان (ئەمشاسپەندان)و ئیزەدەکانن.

5- خوردەی ئاوێستا:واتە ئاوێستای چکۆڵە تازەترین بەشی ئاوێستایە، بڕێکی بە زمانی ئاوێستاییەو هەندێکی بە زمانی (پازەند)نوسراوەتەوە. ئەم بەشە باسی ڕێو ڕەسمی ئایینزایی وەك دوعاونزا،نوێژە، ئیتاعەتو ئەنجامی مەراسیمی جەژنە ئاینییەکانو...... دەکات هەروەها باسی مارەبڕینو زەماوەندو پرسەو... دەکا.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بێنین، بڕی لەو نوسینانەی کە مێژوونووسەکان دەربارەی ئەم کتێبە پیرۆزە نوسیویانە دەخەینە بەرچاو:

مەسعودی لەکتێبی (التنبیەوالاشراف) دەربارەی ئاوێستا نووسیویەتی کە ئاوێستا بریتی بووە لە21 کتێب (نسك)، مانای (نسك) ی بە (سورە) لێکداوەتەوەو دەبێژێ:

((وجاءه زرداشت، بالکتاب المعروف بالأبستاء واذا عرب أثبت فیه القاف فقبل الابستاق وعدد سوره احدی وعشرون سوره، کل سوره في مأتین من الاوراق وعدد حروفه واصواته ستون حرفاً وصوتاً لکل حرف وصوت صورة مفردة منها حروف تکرر ومنها حروف تسقط اذ لیس خاصة بلسان الابستاء. وزرداشت احدث هذا الخط والمجوس تسمیة (دین دبیره) ای کتابة الدین، وکتب الابستاء في اثنی عشر ألف جلد ثور یقبضان الذهب حفراً باللغة الفارسیة الاولی ولا یعلم احد الیوم معنی تلك اللغة وانما نقل لهم الی هذه الفارسیة شيء من السور فهي في ایدیهم یقرأونها

في صلواتهم كاشتاذ وضترشت وبانيست وهادوخت وغيرها من السور في جترشت الخبر عن مبدأ العالم ومنتهاه وفي هادوخت مواعضاً)).

واته:

((وه زەردەشت کتێبێکی هێنا کە (ابستاو) یان پێدەگوت، ئەگەر بیکەینە عەرەبیووشەی (ق)ی بخرێتە سەر دەبێتە ئابستاق، پێکهاتووە لەبیستو یەك سورە، هەر سورەیەکیشی لەدووسەد کاغەزدا نوسرابووو ژمارەی پیتەکانیو دەنگەکانی (خەتی نوسینەکەی) شەست پیتو ئاواز بووە. وبۆ هەر یەکآ لەپیتو دەنگەکان شێوەیەکی تەنیای بووە کە برێ لەپیتەکان دوپات دەکراو هەندێکی لێکەم دەبۆوە. زەردەشت ئەم جۆرە نوسینەی وەدیهێناو مەجوسییەکان (زەردەشتیەکان)بەمجۆرە نوسینە دەبێژن (دین دەبیرە) واتە نوسین یا خەتی ئاینی. ئاوێستا لەسەر پێستی دوانزە هەزار (گا) بەزێرو بەزمانی فارسی دێرین نوسرابوو، ئیمڕۆ ئیدی کەس لەم زمانە تێناگات، جگە لەوەی کە برِی لە(سورە) کان گوراونەتە سەر فارسی نویّو ئێستا لەبەر دەستیانەو لەکاتی نوێژکردندا دەیخوێننەوە وەکو، ئەشتاد، جترشت، باتیستو هادوختو هەندێ بەشی دیکە، لە(جترشت) دا باسی چۆنیەتی دروستبوونو کۆتایی پێهاتنی جیهان دەکا، هادوخت دەربارەی راوێژکاریو پەند دەدوێت)).

ئەبو رەیحانی بیرونی، لەکتێبی (آپار الباقیە) دا دەبێژێ:

((. کاتێك کە قتیبە بن مسلم بۆ جاری دوهەم شاری (خوارزم)ی داگیر کرد (چونکو خەڵکەکەی لّی هەلێگەرانەوە)، (ئەسکەجموك)ی کردە (میر)یان قوتەیبە دەستی کرد بە رِەشکوژی ئەو کەسانەی خەتی خوارزمی یان دەزانیو ئاگاداری مێژووو هەواڵەکانیان بوونو هەرکەسێك کەمترین زانیاری دەربارەی زانستەکانی ئەو سەردەمە دەزانی، هەمویانی کوشت یا ئاوارەی کردن، بە شێوەیەك ئەم کارەی ئەنجامدا، کە ئێستا هیچ ئامرازێك بۆ ناسینی هەوالو زانستەکانی ئەو سەردەمە، لەپاش ئیسلامدا لەبەر دەستا نییە..... لەبەرئەوەی قوتەیبە کوری مسلم نوسەرەکانی خورازمو هیربودەکانی کوشتو گشت نوسراوەکانیانی سوتاند، خەڵکی خوارزم ئەوەی مایەوە نەخوێندەوار بوو، ئەمانەش ئەو شتانەی کە پێویستی ئاینیان بوو لەبەریانکردبوو، بە تێپەڕبوونی رۆژگار، رۆژبەرۆژ ئەوشتانە لەبیر چۆتەوەو تەنیا برێ لەشتە گرنگەکان لەبیرمابۆوە.))

عبدالرحمن ابن خلدون/ لەپێشەکی کتێبی (العبر وديوان المبتدأ والخبر في ايام العرب والعجم والبربر)، لەبەشی(علوم العقلية واصنافها) دەبێژێ:

((اما الفرس فكان شأن هذا العلوم العقلية عندهم عظيماً ونطاقها متسعاً كانت عليه دولتهم من الضخامة واتصال الملك ولقد يقال ان هذه العلوم انما وصلت الى يونان منهم حين قتل الاسكندر دارا وغلب على مملكته الكيانيه فاستولى على كتبهم وعلومهم مالا يأخذه الحصر لما فتحت

ارض فارس ووجدوا فيها كتباً كثيرة، كتب سعد بن ابي وقاص الى عمر بن الخطاب ليستأذن في شأنها وتلقينها للمسلمين. فكتب اليه عمر، ان اطرحوها في الماء، فأن يكن مافيها هدى فقد هدانا الله باهدى منه وان يكن ضلالاً فقد كفانا الله، فطرحوها في الماء او في النار. وذهبت علوم الفرس فيها عن ان تصل الينا)).

واته:

((بەلآم ئێرانییەکان بەبۆنەی شکۆمەندیو گەورەیی دەوڵەتەکەیان گرنگێتی ئەم زانستە لایان فرەو بەربلآبووە، وەدەبێژێ کە ئەم زانستە لەلایەن ئێرانییەکانەوە گوێزراوەتەوە بۆ یۆنان، لەو سەردەمەی کە ئەسکەندەر دارای کوشتو فەرمانڕەوایی کەیانی لەناوبردو دەستی بەسەر هەموو ئەو کتێبو زانیاریانەی کە هەبووە گرت. ئەوکاتەش کە عەرەبەکان خاکی ئێرانییان داگیرکرد ژمارەیەکی یەکجار زۆر کتێبو نوسراویان دەستکەوت.

سعد بن ابیوقاص، دەربارەی ئەو هەموو کتێبانە نامەیەکی بۆ عومەری کوڕی خەتاب نوسیو داوای ئیجازەی لێکرد کە ئەو نوسراوانە بگۆردرێتە سەر زمانی عەرەبی. عومەر وەڵامی دایەوە کە هەرچی ئەو کتێبو نوسراوانە هەیە بیخاتە نێو ئاوەوە، چونکو ئەگەر ئەو کتێبانە سوودمەندنو ئامۆژگاری تێدایە، ئەوا خوا لەوە خاستری پێداوینو ئەگەریش گومڕا کەرەوەن، ئەوا خوا لە خراپیەکانیان رزگاری کردوین. لەبەر ئەوە هەموو ئەو نوسراوەنەیان خستە ناو ئاو یا سوتاندنیان. زانستی ئێرانیەکان کە لەو کتێبانەدا نوسرابۆوە لەناوچوو نەگەیشتە دەستمان)).

(دولت شاهی سەمەرقەندی) لەکتێبی (تزکره الشعراـ ل ـ 30) دەبێژێ:

......((امیر عبدالله بن طاهر کە لەسەردەمی عەباسییەکاندا ئەمیری خوراسان بووە، فەرمانی داوە کەوا لەچوارچێوەی سنوری دەسەلآتی ئەودا، هەرچی کتێبێکی عەجەمو موغەکان هەیە هەموی بسوتێنن.))..

ئەوەی شایەنی باسە ناوبانگی ئاوێستا تەنیا لەو سەردەمە کۆنەداو لەم ناوچەیەو بڕی شوێنی دیکەی سەر روی زەوی نەبووە، بەڵکو بە شانازییەوە دەبێژین کە پاش تێپەڕبوونی رۆژگارانی پڕ لەناسوریو چارەرەشی بەسەر ئەم ناوچەیەدا، دیسانەوە خۆری ڕاستی، ئاسمانی تاریکی ئەم جیهانە کە دوچاری نوشوستی بیروباوەڕبو بو. ڕووناك کردەوە.

زانایانو توێژەرانو ئەو پسپۆرانەی رۆژئاوا کە عەودالأو شەیدای ڕاستیو ڕونکردنەوەی ئەم پەیامە پیرۆزەبون، کەوتنەخۆو ڕویانکردە مەلێبەندی ڕووناهی، واتە کەوتنە شیکردنەوەو ڕۆشەنکردنەوەی ئەو بەشانەی ئاوێستا کە بەداخەوە خراپو بە هەڵە لێکدرابۆوە. بەم شێوەیە ژەنگی هەزاران ساڵ نیشتوی سەر ئاوێستا خاوێن کرایەوەو وەك ئاوێنەیەکی ڕوون بیروباوەڕو

ئامۆژگارییەکانی زەردەشتی تێدا(منعکس) کرایەوەو ئەم کتێبە پیرۆزە خاوێن کرایەوە لەهەموو ئەفسانەو دەمارگیرێتیو دوژمنایەتییەك.

بڕێ لەوانەی کە خۆیان بەم کارە ماندوو کردووە بریتین لە:

گولدنەر Geldner – جوستی Justi – بارتلومە Bartholomae –
ئەشپیگل Apiegle – دارمستەتر Darmesteter – میە Meillet –
جاکسون Jackson .........

## ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان

لەبەر ڕۆشنایی کتێبی دینکرد، ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان بریتی بووە لە21 نەسك یا کتێب (مەسعودی لەکتێبی ـ التنبیەوالاشراف ـ مانای (نەسك) ی بە (سورە) لێکداوەتەوەو دەبێژێ ئاوێستا پێکهاتووە لە21 سورەو هەر سورەیەکیش دووسەد لاپەڕەیە).

ئەم 21 نەسکە لەلایەن بابەتەوە کرابو بەسێ بەشەوە:

1– بەشی یەکەم پێی دەبێژن گاسانیك: بریتی بووە لەگاتاکان کە سروودەکانی خودی زەردەشتە(لەپاشاندا باسی لێدەکەین). ئەم بەشە پێکهاتبو لەحەوت نەسك (1، 2، 3، 11، 13، 20، 21).

2- بەشی دوهەم پێی دەگوترا هاتك مان سریك Hatak – Man sarik ئەمەش لەحەوت نەسك پێکهاتبو (4، 5، 6، 7، 8، 9، 10)و دەربارەی خورەوشتو یاسای ئاینی دواوەو زۆربەی دوعاونزاو نیایش بووە کە هۆکاربوون بۆ نزیکبوونەوەی خەڵك لەتەك ئاهورامەزدا، واتە زێتر دەربارەی جیهانی مادیو معنوی دواوە.

3– بەشی سێهەم بە داتیك ناسراوبووو پێکهاتبوو لەزانین دەربارەی جیهانی مادیو هەروەها دەربارەی ئەحکامو شەریعەتو یاسای بازرگانیو نەرێتی ئاینیو ڕێنماییو ئامۆژگاری خەڵك لەم جیهانەدا دواوە. ئەم بەشەش هەروەك بەشەکانی دیکە پێکهاتبوو لەحەوت نەسك(12، 14، 15، 16، 17، 18، 19) بەلآم لەزۆر شوێندا دەبینین کە بابەتەکانی ئەم سێ بەشە لەناویەکدا تێکەڵوبووە.

بیستو یەك نەسکی ئاوێستا بریتین لە:

1– سوتکەر نەسك Sutkar – Nask پێکهاتبوو لە22 بەشو دەربارەی داوێن پاکی ئایینداریو نوێژو کرداری خاس دەدوآ. هەروەها دەربارەی سەرگوزشتەی گەرشاسەبو کەیخەسرەوو کەیکاووس دەدوێت.

2ـ وەهشت مانپرا Varsht man Sar پێکهاتبوو لە22 بەش‌و دەربارەی دوعاونزاو نیایشت‌و کارە پیرۆزەکانی ئایین دەدوێت.

3ـ بەغ نەسك Bagh – Nask یا بەگ نەسك ئەمیش پێکهاتبوو لە 21 بەش یا 22 بەش‌و سەبارەت بە ئاینی زەردەشتی‌و نوێژو ئامۆژگارییە ئاینییەکان دەدوێت.

4ـ دامدات نەسك Damdat ئەم بەشە ناوبانگێکی زۆری هەبووە، وپێکهاتبوو لە32 بەش کە هەرە گرنگەکەیان دەربارەی رۆژی پەسلاَن‌و پاداش‌و سزا، هەروەها دەربارەی ئاژەڵ‌و گژوگیای سوودمەند بۆ ئادەمیزاد دەدوێت.

5ـ ناتەر نەسك Natar – Nask پێکهاتبو لە35 بەش، ودەربارەی ئەستێرە ناسی‌و پزیشکی دەدوآ.

6ـ پاجەك (پاجەم) نەسك Padjag – Nask پێکهاتبوو لە22 بەش‌و دەربارەی کارو فەرمان‌و هەڵسوکەوتی خواپەرستان بووە، هەروەها باسی ئاژەڵ‌و حەرامی‌و حەلالیان‌و چۆنیەتی سەربرینیان دەدوآ.

7ـ راتوداد (رادوداد) ئابیتیگ نەسك Radodad – aiting – Nask ئەم نەسکە، پێش هێرشەکەی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران، بریتی بووە لە 50 بەش، پاشان لە13 بەش زێتری لێنەماوەو دەربارەی تەوەری رِامیاری، کۆمەلآیەتی، فەرمانرِەوایی‌و سەربازی دەدوێت.

8ـ بەریش نەسك Barish – Nask ئەم بەشە دەربارەی مافـو یاساو ئاکاری دادوەرو ژیان‌و هەواڵی خۆنکاران دەدوێت. کاتی خۆی بریتی بووە لە60 بەش، بەلآم ئێستا تەنیا 12 بەشی لێماوەتەوە.

9ـ کەەش کیسروب نەسك Kashsrobo – Nask ئەمیش بریتی بووە لە 60 بەش‌و ئێستا 15 بەشی زێتری لێنەماوە. دەربارەی کارو فەرمانی ئاینی‌و شەریعەت دەدوێت. هەروەها باسی هۆش‌و دانایی سروشتی‌و اکتسابی دەکات.

10ـویشتاسب شاستو نەسك Wishtasp – shasto – Nask پێکهاتبو لە60 بەش بەلآم لە10 بەش زێتری نەماوە، وزۆربەی دەربارەی ژیانی گوشتاسەب شانکەیانی دواوە.

11ـ وەشتك نەسك Vashtag – Nask بریتی بووە لە22 بەش کە ئێستا تەنیا 6 بەشی لێماوەتەوە، ودەربارەی چونیەتی رِەفتارو کرداری ئاینیەکان دەدوێت.

12- چیترادات نەسك Tchitradat –Nask یەكێكە لەبەشە گرنگەكانی ئاوێستای ساسانیو پێكهاتبوو لە22 بەش، ودەربارەی زانستی پزیشكی، بوون (وجود)، نەژادەكانو خێڵەكان هەر لەسەردەمی ئافراندندا تا كاتی پەیدابونی زەردەشت، دابونەریتو (شا) كان دەدوێت.

13- سپەند نەسك Spend – Nask پێكهاتبو لە60 بەشودەربارەی زانستو ئاكارو چاكەكردنو ژیانی زەردەشت دواوە.

14- بوغان یەشت نەسك Baghan – Yasht – Nask پێكهاتبو لە 17 بەشو دەربارەی ئاهورامەزدا، ئیزەدەكان، فریشتەكان (ئەمشاسپەندان) وشێوەی دوعازنزاو پەرستن دەدەوێت.

15- نیكاتوم (نیارم) نەسك Nikatum – Nask پێكهاتووە لە 54 بەش، دەربارەی ڕاستیو دروستیو دادو مافی خەڵكو میانەڕەوی لەئیشوكارداو باسی كێشە (اوزان) دەكات. لەم نەسكەدا، هەمو جۆرە یاسایەكی تێدا ڕەچاوكراوە كە لەكاتی دادگادا بەكارهاتووە، بۆیە زێتر بە نەسكی حقوقیو قەزائی دەژمێردرێت.

بەگوێرەی ئەوەی لەكتێبی دینكردا هاتووە، لەم نەسكەدا بڕی بڕیاری تێدایە كە دەربارەی ئەو كەسانەی كە بەهەندێ گوناە تاوانبار دەكرێنو شێوەی سزادانو ڕاونانیان باسدەكات وەك دزی، چەتەیی، زیان گەیاندن بە خەڵك، كوشتن، زینا، هەڕەشەكردن بە زینا، دەستگیركردنی خەڵك بەبێ بریاری یاسا، زیانێك كە جادوگەران بە خەڵكی دەگەیەنن، كەمكردنی رۆژانەی كرێكاران بەبێ بریاری یاسایی.... هەروەها بڕی یاسای دیكە وەك مافی منداڵأو.....

16– گانابێد سەرنیجان نەسك Ganabad – Sar – Nidjat Nask پێكهاتبو لە65 بەشو دەربارەی (هاوسەرگیری) یاسای حقوقیو قەزاییو بنچینەی باوەڕو ئیمان دەدوێت.

17– هوسپاوم نەسك Husparam – Nask پێكهاتبو لە 64 یا 65 بەش، ودەربارەی رۆژی پەسلاَنو پاداشتو سزا، ئیشوكاری كشتوكاڵو مافی جووتیارانو هەروەها دەربارەی ئەستێرەناسی دەدوێت.

18- سەكاتوم نەسك Sakatum – Nask پێكهاتبو لە 52 بەشو دەربارەی چۆنیەتی فەرمانڕەوایەتی شاكانو دادوەرییەكانیان، رۆژی پەسلاَن، دادو دادگەرێتی، جەغد لەسەر هەوڵوكۆشش دژی خراپە، دادگەرێتیو بنەماكانیو پلەوپایەی دادوەرو ئەندازەی زانیارییانو ئەزمونەكانیان، چینەكانی دادوەرانو ئەحكامی مۆلێكایەتی دەدوێت.

19- وەندیداد نەسك Vendidad – Nask پێكهاتووە لە22 بەش، ئەمە تەنیا بەشێكی سەردەمی ساسانییەكانە كە دەقە ئەسلییەكەیو راژەكەی كەوتۆتە دەست. دەربارەی ئەحكامی پاكیو ناپاكیو بڕی یاسای جۆراوجۆر دەدوێت. بەشێكی دەربارەی جوغرافیا، دووبەشی دەربارەی داستانی جەمشید، دووبەشی دەربارەی كشتوكاڵو ئەو كارانەی دەبێ ئەنجام بدرێت،

بەشێکی دەربارەی داستانی ژیانی زەردەشت، بەشێکیشی دەربارەی زانیاری پزیشکیو نەخۆشییەکانو شێوەی چارەسەرکردنیان دەدوێت. بەشەکانی دیکەش دەربارەی ئەحکامی پاکوتەمیزیە.

20ـ هادوخت نەسك Hatokht – Nask پێکهاتبوو لە 30 یا 32 بەش، دەربارەی فریشتەکان، ئیزەدەکانو دوعاونزاو نوێژو چارەنوسی رۆح پاش ئەوەی لەلەش جیادەبێتەوە، دەدوێت.

21ـ ستوت یەشت نەسك Stot – Yasht – Nask لە33 بەش پێکهاتبوو، دەربارەی چۆنیەتی پەرستنی ئاهورامەزداو ستایشو رێزلێنانی فریشتەکان (ئەمشاسپەندان) دەدوێت.

ئەمە کورتەیەك بوو لەچەندو چۆنیەتی ئەو ئاوێستایەی کە لەسەردەمی ساسانییەکاندا بووە، وکاتی خۆی مەجموعەیەکی زۆر گەورە بووە. مەخابن، زۆربەی زۆری ئەمانە لەناوچون، تەنیا ڕاژەو پوختەیەکی لە(دینکرد) دا بۆ ئێمە ماوەتەوە.

شایانی باسە کە ئاوێستای سەردەمی هەخامەنشییەکان، بەگوێرەی ئەژماردنەی کە لەکتێبی دینکرددا کراوە، پێکهاتبوو لە 21 نەسكو 815 بەش، بەڵام ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان لەتەك ئەو هەموو هەوڵوکۆششەی کە بۆ کۆکردنەوەی کرابوو، تەنیا 348 بەش بووە.

ئەو ئاوێستایەی کە ئێستا ماوەتەوەو لەبەر دەستدایە تەنیا چواریەکی ئاوێستای سەردەمی ساسانیەکانە.

## ئاوێستای ئێستاکێ

ئاوێستا، ئەم کتێبەی بریتیە لەو سرووده پیرۆزانەی کە زەردەشتی نەمر بۆ ئێمەی بەجآ هێشتووە، ئەم کتێبە پیرۆزەی کە پێمان ڕادەگەیەنآ:

کارو کۆشش مایەی ڕزگاریمانەـ لەڕاستیو دروستیدا خۆشیو بەختیاری هەردوو جیهانمان دەستدەکەوێت ـ بیری خاسو پاك تیشكو ڕووناکی خواییە ـ کەسێك شیاوی فەرمانڕەواییە کە خۆی هەڵسوکەوتی لەبەر ڕووناکی فەرمانەکانی ئاهورامەزداوە بێت...

ئەم کتێبە پیرۆزە، هەروەکو گوتمان، بە داخەوە ئەوەی کە هەنوکە لەبەردەستماندایە شتێکی زۆر زۆر کەمەو تەنیا چواریەکی ئەسڵی کتێبەکەیە.

تا ئەو ڕادەیەی توانام بوبێت، ئەو باسانەی سەبارەت بە ئاوێستا هەیەو لەبەردەستایە، کۆمکردونەتەوەو بە شێوەیەکی سادە ڕێکخراون بۆئەوەی هەموان بتوانن سودی لێوەربگرن. هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد، ئاوێستای ئێستا بریتیە لەپێنج بەش:

1ـ یەسنا          Yasnaبریتیه لە 72 هات

2ـ یەشت          Yashtبریتیه له21 یەشت، بڕێ جار تا 24 یەشته

3ـ ڤیسپەرد          Visparadبریتیه له24 کرده

4ـ ئاوێستای بچوك (خردەواستا)          بریتیه لەنیاش‌و نزاو نوێژ

5ـ ڤەندیداد  Vendidad          بریتیه له22 فرگرد

هەریەکە لەم پێنج بەشە، بەکورتی باسی لێدەکەین.

## 1ـ یەسنا YASNA

گرنگترین بەشی ئاوێستایە، ئەم وشەیە، لەووشەی ئاوێستایی یەسنا Yasna وەرگیراوە کە بەمانای ستایش‌و پەرستن‌و رێز لێگرتن‌و نوێژو جەژن هاتووە. بە زمانی سانسکرێت(یەجنا Yajna)ی پآ دەوترێت، ئەم وشەیە بە زمانی پهلوی بۆتە یەزشن Yazashan و ئیزشەن izashn،وشەی جەژن (جێژن) کە بەمانای رۆژی خۆشی‌و شادییە، لەموشەیە وەرگیراوە.

هەروەها لەمانای ئەم وشەیە بڕێ زاراوەی تایبەتی بۆ ئاینی زەردەشتی و زەردەشتیەکان دانراوە، وەك: مەزدایەسنا (مزدیسنا Mazdayasna) کە مانای دەبێتە مەزداپەرستی، مەزدایەسنی بە مانای مەزداپەرست، وە مەزدیسنانوێتە مەزداپەرستان.

یەسنا، بە تێکڕایی بریتیە لەستایشتی ئیزەدەکان‌و هەموو ئەو شتانەی سوودمەندو خاسن‌و مایەی ژیانن، ئەم ستایشتانە بە شێوەی چەکامە بێژراون‌و بریتین لەستایشی ئاوی پاك، باران، مانگ، خۆر، ئەستێرەکان، ئاسمان، ڕوبارەکان، دەریاکان، کارێزو سەرچاوەکان، گژوگیای سودمەند، زەوی، ئاژەڵ، ساڵ‌و مانگ‌و رۆژ، شارودآ، گەورە پیاوان‌و پیاوچاکان‌و ڕۆح‌و ڕەوانی پاك، ئیزەدەکان‌و فریشتەکان، ئاینی خواپەرستی زەردەشتی، یاسا، کێوەکان، دارودرەخت، داد، زانست‌و زانیاری، دارایی، دڵری‌و ئازایەتی، ڕاستی‌و دروستی‌و.....

ستایشی ئەم ڕەگەزانە خۆی لەخۆیدا پەرستنی ئاهورامەزدا دەگەیەنێت چونکو، هەموو ئەم ڕەگەزانە دروستکراوی ئەون.

سەرەتای هەموو ستایشتێك بەمجۆرە دەست پێدەکات:

(مژدەی ستایش دەدەمو بۆ ئاهورامەزدای ئافەریدەرگاری ئەنجام دەدەم).

بەشە جۆراوجۆرەکانی یەسنا بەبۆنە تایبەتییەکانو لەجەژنە ئاینییەکاندا بەشێوەی سروود دەبێژرێت.

یەسنا پێکهاتووە لە 72 بەش کە پێی دەبێژن هائی تی Haiti یا (ها) یاخود (هات Hât). هەر بەشێك لەچەند بەند پێکهاتووە (لەنێوان 3 بەند تا 32 بەند). هەروەها هەر چەند بەشێك لەم هاتانە بۆ خۆیان ناوونیشانێکی تایبەتییان هەیە کە بەگوێرەی ئەو باسانەی لێی دەدوێن، ناو دەبرێن. هەفتاو دو هاتی یەسنا بە چەند بەشێك دابەش دەکرێن کە لەمانە سێ بەشیان بەناوبانگن، وبەم شێوەیەن:

بەشی یەکەم:

(لە (هات)ی یەك تا کۆتایی (هات) ی (27)ە. باسەکانی جۆراوجۆرن، سروودن دەربارەی موناجاتی ئاهورامەزداو ستایشی فریشتەکانو چەندین سروود کە لەکاتی رێو رەسمی ئاینیدا دەبێژرێتو بەشێکی دەربارەی گیایەکە کە پێی دەبێژرێت (هوم)، بریتیە لەگیایەکی بە کەلكو پیرۆز. ئەم بەشە نێوی (هوم یەشت)ە

بەشی دووهەم:

ئەم بەشە لە (هات) ی 28 وە دەست پێدەکات تاوەکو کۆتایی (هات) ی 53 جگە لە (هات) ی 52.

ئەم بەشە، خۆشی دەبێتە دوو بەش:

الف ـ لەدەستپێکردنی (هات) ی 28 تاوەکو کۆتایی (هات) ی 34، وە لەدەستپێکردنی (هات) ی 43 تا کۆتایی (هات) ی 53 بێجگە لە (هات) ی 52. ئەم بەشانە پێیان دەبێژرێت (گات) ە کان کە کۆنترین بەشی ئاوێستایەو بریتیە لەسروودەکانی خودی زەردەشت.

ب ـ لەدەستپێکردنی (هات) ی 35 وەدەستپێدەکات تا کۆتایی (هات) ی 42. ئەم بەشە پێی دەگوترآ (هەفتن هائی تی Haptat – Haiti) وە بە (هفتن یەشت) بەنێوبانگە. ئەم بەشە، پاش گاتاکان، دێرینترین یادگاری نوسراوی زەردەشتییە کە لەقوتابیانی زەردەشت بەجێماوە بۆمان.

بەشی سێهەم:لە(هات)ی 54 دەستپێدەکات تاوەکو کۆتایی (هات)ی 72.

ئەم بەشە پێی دەبێژرێت (ئەپەر ـ یەسن) یاخود (ئاپرویەسنو Aparo – Yasna)و بریتیە لەسرودی ستایشی فریشتەکانو نزاو دەستوری ئاینیو چەند باسێك دەربارەی خورەوشت.

پێش ئەوەی بچینە نێو باسی گاتاکان کە یەکآ لەگرنگترین بەشەکانی (یەسنا)یە، وهەروەکو لەمەوبەر گوتمانوتەکانی خودی زەردەشتن. بەپێویستدەزانم کە باسێکی کورت لەیەکێکی دی لەکۆنترین، ڕەسەنترینو بەناوباگترین بەشەکانی دیکەی یەسنا بکەم کە بریتە لە (هات 12).

ئەم هاتە، لەڕوی زمانو شێوازی نوسین، فرە لە (گاتا)کانەوە نیزیکە. لەم هاتەدا، تەنیا باسی ئاهورامەزداو ئەمشاسپەندان کراوە، ئەم هاتە پێی دەبێژرێ (فەرئوتی) یاخود درکاندن (اعتراف) کە خۆی لەخۆیدا دەتوانین بێژین بریتی بووە لەشایەتی دان بۆ ئەو کەسانەی کە تازە ئاینی زەردەشتی یان پەسەند کردووە. یاخود بۆ تۆبەکردن بەکارهاتووە. پوختەی ئەم (هات)ە بریتیە لە:

((ئەز مەزدا پەرستو زەردەشتیم، ستایشی ئەمشاسپەندان دەکەم. باوەڕم بە خوایەتی ئاهورامەزدایە کە شکۆمەندو زاناو دانایەو شیاوی پەرستنە. ئەوە کە ئەم جیهانەو بوونی ئافراندووەو ئادەمیزادی بە پاکی دروستکردووەو زەردەشتی هەڵبژاردووە بە پەیامبەرێتی. دژی خراپیو خراپەکارانو نەیارانی ڕاستیم، خۆم دوور دەخەمەوە لەخراپەو دەستدرێژی کردنە سەر خەڵک، ئاسایشو ئارامی لەنێو خەڵکدا بلآودەکەمەوە. لەکاتی نوێژو نیایشدا هەمیشە پەیمان تازە دەکەمەوە کە هەرگیز زیانووێرانی بە کۆمەڵگای مەزداپەرستان نەگەیەنم. بە هەموو هێزو تواناو ئیرادەوە پەیوەندی خۆم لەتەك دێوپەرستانو پەیڕەوانی ئاژاوەو جادوکەرانو ئەوانەی بیرووتەو کرادری خاسیان ناوەتە لاوە دەپچڕێنم. ئەو ڕێبازە دەگرمەبەر کە ئاهورامەزدا بە زەردەشتی ڕاگەیاندووەو زەردەشتیش ئەنجامی داوە.

ئەز مەزداپەرستم، مەزداپەرستێکی زەردەشتی، وبەهەموو دڵو گیانەوە باوەڕم هەیە، باوەڕم بە ئاینی خواپەرستی، بەزەردەشت، بە بیرووتەو کرداری خاس هەیە. باوەڕم بەوە هەیە کە ئاینی مەزداپەرستیە کە شەڕو هەراو هوریاو خراپەو ئاژاوەو گەندەڵی بنبڕ دەکات، وئاشتیو ئاسایشو تەبایيو خۆشەویستيو دۆستایەتی بۆ خەڵک دابین دەکات.

ئەز باوەڕم بەوە هەیە کە خاسترین ئایین، ئاینی مەزداپەرستی زەردەشتیە. هەموو شتێکی باش لەئاهورامەزدا دەبینم. ئەمە پەیمانێکە لەتەك ئاینی ئاهورایی دەیبەستم.))

هەروەها (هات 20) لەیەسنا دەبێژێ:

((ڕاستی، خاسترین چاکەیە، ومایەی بەختیارییە. کەسێك بەختەوەرە کە (ڕاست) بێتو باشترین ڕاستی بوێت.))

## گاتا Gatha

بەنرخترین، پیرۆزترین‌و ڕەسەنترین بەشی ئاوێستایەو کۆنترین کتێبی ئاینی جیهانە، بەشێوەی هۆنراوەو پەخشان لەلایەن خودی زەردەشتەوە بێژراوە.

گاتاکان، بریتین لە17 هات لەسەرجەمی 72 هاتی یەسنا، وە پێکهاتووە لە 238 بەندو 896 چەکامەو 5560وشە. لەئاوێستادا ئەم وشەیە بە گات gathaهاتووەو ماناکەی دەبێتە (سروود خوێندن بە دەنگێکی خۆش).

دکتور حسین‌وحیدی لەکتێبی (گاتها، سرودهای مینوی زردشت)ل ـ 104 دەبێژێ:

((گات، بەمانای سرووده، گاتەکان کۆنترین‌و بەنرخترین بەشی ئاوێستایە، وخودی زەردەشت بێژاویەتی، خۆشبەختانە ئەو هەموو تەنگوچەڵەمەو گیروگرفتانەو دەستدرێژییانەی کە لەدێرزەمانەوە بەسەر ناوچەکەدا هاتووە، نەیتوانیوە زیانی پێبگەیەنێت، ئەورۆ هەروەك چلۆن بێژراوە، هەروا ماوەتەوە)).

ناوبراو لەهەمان کتێبدا دەربارەی ئاهەنگی گاتەکان دەبێژێ:

((گاتەکان، بە ئاهەنگێکی تایبەتی‌و دڵڕفێن بێژراوە، وخۆشبەختانە ئەوڕۆ، هەروەك چلۆن پێش هەزاران ساڵ لەمەوبەر بێژراوە، هەروا ماوەتەوە. بەلاّم ئەوەی پتر سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کەوشەی (گاتار) کە ئێستاش نێوی ئاواز یا نەوایە کە لەکوردستاندا دەچرێت، ئەم وشەیە لەدوو بەش پێکهاتووە، واتە (گات) وە(تار)، وبەزمانی کوردی بەمانای ـ گاتاخوان (بێژەنی گات) دێت. لەوانەیە بتوانین بێژین کە ئاوازی (قەتار) کە لەروی بەیاتی تورك دەخوێنرێت، هەر (گاتار) بوبێـتو پیتی (گ) گۆڕاوە بە (ق).

موبدفیروز ئازەرگوشەسب لەکتێبی (گاتها یا سرودهای اسمانی زردشت) ل 1 دەبێژێ: (گات بە مانای سروودی ئاسمانییەو لەتەکوشەی گیتا کە سرودی پیرۆزی هیندۆکانە چونیەکن).

ناوەڕۆکی گاتاکان بریتیە لەباس دەربارەی فەلسەفە، ڕەوش‌و شێوەی ژیانی پاکوراست، ئوسوڵی یەکتاپەرستی، خواناسین‌و خۆناسین کە بە شێوەیەکی فرە سادەو ڕۆشەن‌و بەهێز بێژراوە.

بە تێکڕایی گاتاکان کۆڵەکەو ژێرخانی ئاینی زەردەشتین. کورتەی ئەو باسانەی لەم بەشەدا هاتووە بریتین لە:

باسی توانایی‌و مەزنێتی‌و یەکتایی خواو چۆنیەتی ناسینی ئاهورامەزدا، باوەڕ بەبوونی دوو هێزی دژ بە یەك‌و جیاواز لەیەکتر کە بریتین لە چاکەو خراپە، سەرکەوتنی چاکە بەسەر خراپەداو ڕووناکی بەسەر تاریکیدا پاش ململانییەکی درێژخایان، ئازادی بیروباوەڕو هەڵبژاردن (تەنانەت ئازادی هەڵبژاردنی ئایین)، باوەڕ بە بوونی بەهشت‌و دۆزەخ‌و پاداش‌و

سزا بۆ چاکانو خراپەکاران، یەکسانی لەنێوان ژنو پیاودا، بەرپرسیاربوونی ئادەمیزاد بەرامبەر بەو کارانەی پێی هەلێدەستآ، رِێگەی گەیشتنە پلەی پوختەییو گەیشتنە دەرگای بارەگای ئاهورامەزداوە.

باشترین دەرسێك کە لە گاتاکاندا وەریدەگرینو پێویستە لەژیانماندا بەکاری بهێنین بریتیە لەهەولْو تێکۆشان دژی خراپە.

زەردەشت داوامان لێدەکات کە هەمیشە ئامادەی ململانێو جەنگ بین دژی ناپاکیو خراپیەکانی ئەهریمەنی دەرونی کە بەربەستێکە لەسەر رِێگەی پێشکەوتنو ئاوەدانکردنی جیهان تاوەکو چاکە بەسەر خراپەو رووناکی بەسەر تاریکیدا زالْ دەبێت.

شایانی باسە، لێرەدا بێژین لەسەراسەری گاتاکاندا، تەنانەت بۆ یەکجاریش باسی ئیزەدەکان نەکراوە، چونکو شێوازی مادی ئەم ئیزەدانە بەلای زەردەشتەوە بەرپەرچ دراوەتەوە. تەنیا ئاهورامەزدای بەناوی خوای ئافەریدەگارو دانا باسکردووە.

هەروەها دەربارەی قوربانی کردنو پێشکەشی بە ئیزەدەکانو تەنانەت بە ئاهورامەزداش هیچ باسێکی نەکردووە، بەلْکو دژی ئەم جۆرە کردارانەوێستاوە.

باوەرِی زەردەشت لەناوەرِۆکی ئەم گاتانەدا زۆر بە جوانیو رِاشکاوی خۆی دەنوێنآ.

لەراِستیدا، بۆئەوەی خاس لەپەیامە پیرۆزەکەی بەو شێوەیەی کە بووەو خودی زەردەشت لەگاتاکاندا، بە بیرێکی پاك چراندوویەتی، بگەین، دەبێ هەرچی ئەفسانەوویردونزاو.... کە پاش گاتاکان خراوەنەتەسەر ئەم پەیامە، پاك بکرێنەوەو تەنیا بچینە بنجو بناوانی گاتەکان. رِاژەو لێکۆلْینەوەی گاتاکان دەبێ بە زمانێکی پاراوو سادە بۆ زۆربەی زۆری خەلْک، وبە بەیانێکی زانستانەو بەلْگەی زانیاریو کۆمەلآیەتی کە لەسەرچاوەیەکی فەلسەفیواقیعیەوە هەلێقولآبێت، بۆ زانایانو عەوداڵانی رِێگەی راستی باس بکرێت.

پلەوپایەو نرخی ئاکاریو معنوی لەپەیامی زەردەشتدا، پەیوەندی رِاستەوخۆی لەتەك ژیانی کۆمەلایەتی خەلْکیدایەو ئامانجو هیوای زەردەشت رێکخستنی ژیانێکی بەختیارو گەشەپێکردنی کۆمەلْگاو پێشخستنێتی. ئەوەی کە لەگاتاکاندا پتر بایەخی پێدراوە بریتیە لەپەیوەندی نێوان مرۆڤـو مرۆڤایەتی. زەردەشت زێتر ئاماژە بۆ هەلْسوکەوتی خەلْک دەکاتو دەیەوێت هەموان بە خۆشیو ئاشتیو تەباییو ئارامییەوە وەك برا لەتەك یەکتردا بژین، بآ گوێدانە جیاوازی رِەگەزو رِەنگـو بیرباوەوەرِو.....

لەروانگەی زەردەشتەوە بەختەوەری لەوەدایە کە خەلْکی بەختەوەر بکەیت.

گەر خاس بەووردی سەرنجی هەر پێنج بەشەکانی ئاوێستا بدەین، فرە بە ئاشکراو ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە گاتاکان لەلایەن زمانەوانییەوە، لەبەشەکانی دیکەی ئاوێستا کۆنترە، ئەویش بەم بەڵێگانەی لای خوارەوە:

1ـ زمانو شێوازی نووسینی گاتاکان، وئەووشانەی تیایدا بەکارهاتوون، لەبەشەکانی دیکەی ئاوێستا، فرە کەم وەبەرچاودەکەون. واتە، بڕی لەووشانەی کە لەسەردەمی نووسینی گاتاکاندا بەکاردەهێنران، لەپاشاندا کە بەشەکانی دیکەی ئاوێستا نوسراوەتەوە، ئیدی بەکارنەدەهێنرانو لەناوچوبون.

2ـ گشت گاتاکان بە شێوەیەکی ڕەوانو ئاسانو کێشەدارو فەلسەفی نوسراوەتەوە، ورستە بەرستەی نیشاندەری بیروباوەڕێکی یەکجار مەزنن، کە تەنیا دەتوانێت لەسەرچاوەی باوەڕی بەرزو پیرۆزی زەردەشت خۆیەوە هەڵێقولآبێت.

3ـ هەموو گاتاکان بخوێنینەوە، چاومان بە هیچ جۆرە ئەفسانەو داستانی خەیالآویو دوور لەراستی ناکەوێت.

4ـ لەناوەڕۆکی گاتاکاندا بۆمان دەردەکەوێت ـ کە تائەو سەردەمەی نووسراوەتەوە، ئاینی ڕاستیو خواپەرستی بە تەواوەتی نەگەیشتۆتە پوختەییو هێشتا خەڵک باوەڕی تەواویان پێی نەبووە، ونەهاتونەتە سەر رێی ئەو ئاینە، وسەرکەوتنی راستی بەسەر درۆدا لەئەگەرو نەگەردا بووە، چونکو لەزۆر جێگادا زەردەشت گلەیی دەکاو باسی گیروگرفتو دەردەسەرییەکان دەکات.

(17 هات)ی گاتاکان بە پێنج بەش دابەش دەکرێن، وهەربەشەی بۆ خۆی ناوێکی تایبەتی هەیە کە بەم شێوەیەیە:

1ـ ئەهوەن وەئی تی (ئەهنودگات) Ahunavaiti ئەم بەشە پێکهاتووە لە 7 هات، واتە لە هات 28 تاوەکو کۆتایی هاتی 34، ولەسەد بەند پێکهاتووە، هەر بەندەی بریتییە لە3 چەکامە. زێتر باسی پەرستنی ئاهورامەزدا، هەڵبژاردنی پەیامبەرو ئازادی لەهەڵبژاردندا دەکات.

2ـ ئوشتەوەئی تی (ئەشتودگات) ushtavaiti ئەم بەشە پێکهاتووە لە 4 هات (هاتی 43 تا 46) و بریتیە لە 66 بەندو هەر بەندەی لە 5 چەکامە پێکهاتووە، جگە لەبەندی 15 کە چوار چەکامەی لێماوەتەوە، وچەکامەی پێنجەهەمی بزربووە. هەر چەکامەیەکیشی بریتیە لە 11 پارچە.

ئەشنودگات، زێتر دەربارەی رازو نهێنی ئافراندن، خۆناسینو خواناسین بەهۆی بیری خاسو ڕاستیو دادەوە، دەدوێت. هەروەها بنچینەکانی ئاینی راستیو دژایەتی لەتەك درۆزناناو دوارۆژی راستکردەوەکانی شێکردۆتەوە.

3- سپەنتمەگات Spentamainya ئەم بەشە پێكهاتووە لە 4 هات (هاتی 47 تا 50) كە بریتییە لە41 بەند، وهەر بەندەی پێكهاتووە لە 4 چەكامەو هەر چەكامەش لە 11 پارچە پێكهاتووە.

ئەم بەشە، دەربارەی ئافراندنو سپەنتامینوو سەركەوتنی بەسەر ئەنگرەمینو، وپەرستنی ئاهورامەزدا دەدەوێت.

4- وەهوخشەتەرگات Vohu – Khshathra پێكهاتووە لەتەنیا یەك هات (هات 51) وبریتیە لە 22 بەندو هەر بەندەی لە 3 چەكامە پێكهاتووەو هەر چەكامەیەش بریتیە لە 14 پارچە، دەربارەی كارو كرداری ئادەمیزادو نوێ بونەوەی جیهان دەوێت.

5- وەهیشتوئیشتی Vahishtoishti ئەمە دوا بەشی گاتاكانە، وبریتیە لەتەنیا یەك هات (هات 53) وە پێكهاتووە لە 9 بەندو هەر بەندەی لە 4 چەكامە پێكهاتووە. دوو چەكامە كورتو دوانی درێژن. كورتەكانی بریتین لە 12 پارچەو چەكامە درێژەكان هەریەكەی بریتین لە 19 پارچە.

پێش ئەوەی یەكە یەكە سروودەكانی زەردەشت (گاتاكان) شیبكەینەوە، بەپێویستدەزانم بێژم، مەخابن ئەو كەسانەی ئەم سرووده پیرۆزانەیان لەزمانی ئاوێستاییەوە گۆڕیوە، لەزۆر شوێندا كەوتونەتە هەڵەو زۆربەی ئەو هەلآنە بەهۆی ئەوەوە بووە كەوشەیەك زێتر لەمانایەكی هەبووە، بۆوێنەوشەی گۆ - goی ئاوێستایی كە دوو مانای هەیە، یەكێكیان بە مانای جیهانەو ئەوی دیكەیان بە مانای(گا) یە،وشەی پسو Pasu كە مانایەكی (خەڵک) یا جەماوەرە، ومانایەكی دیكەی (ڕانەمەڕە). جا، بۆئەوەی كەمتر دوچاری هەڵەبم، پەنام بردۆتەوە بەر تازەترینو بەمتمانەترین گۆڕینو ڕاژەی گاتاكان.

## ئەهنودگات Ahunavaiti (ئەهوەنوەئی تی)

سرودی یەكەم

یەسنا – هات 28 – بەندی 1

((ئێستا،

ئەی مەزدای داناو مەزن

پێش هەموو شتێك،

هەردوو دەستم بەرەو لای تۆ درێژ دەکەم

وەستایشتت دەکەمو داوای بەختەوەریت لێدەکەم.

هیوادارم کە،

بتوانم لەژێرسایەی ڕاستیو دروستی،

وبەهۆی هۆشو زانیارییەوە،

جیهانێکی پڕ لەئاسایشو کامڕەوایی دابین بکەم،

وویژدانی پاکو گیانی گیانداران خۆشحاڵ بکەم.))

لێرەدا ئەوەمان دێتە بەرچاو کە زەردەشت ڕاوێستاوەو هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان درێژ کردووە، وبەوپەڕی ڕێزو بآ فیزییەوە ستایشتی خوای داناو مەزنو سەرچاوەی گشت چاکییەکان دەکاتو داوای شادیو بەختەوەری لێدەکات.

هوشیاریو زانیاریو بیری خاس، ئامرازی گەیشتنە بەختیارییە، لەبەر ئەوە دەبینین زەردەشت هیوادارە کە لەژێر سێبەری راستیو دروستیو پەیڕەوی لەیاسای راستی (ئاشا)، و(وەهومەن) کە بریتیە لەهوشیاریو زانیاریو بیری خاس بتوانێت گیانی گیانداران بەختەوەر بکاتو بەو هۆیەوە ئادەمیزادو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەرەو پێشکەوتنو پوختەییو بێخەوشێتی بگەیەنێت.

زەردەشت، بۆئەوەی لەنهێنی ئافراندن بگاتو چۆنیەتی ژیانی بۆ رۆشەن بێتەوە، پەنا دەبێتە بەر بیری خاس (وەهومەن)و لەکاتی سەغڵەتنۆ پێویستیدا داوای یارمەتی لێدەکات، چونکو هوشیاریو زانیاریو بیری خاس تەنیا ئامرازێکن کە دەتوانن ببنە کلیلی کردنەوەی قفڵی فرە لەنەزانراوەکانی ژیانو سروشت، ویارمەتی پەیامبەر بدەن بۆ ڕاگەیاندنی پەیامەکەی

بەندی 2

((ئەی مەزدا ئاهورا،

بە بیری خاسو دڵێکی ڕۆشەنەوە ڕووت لێدەکەم،

لەژێرسایەی ڕاستییەوە،

پێمان ببەخشە،

پاداشتی ژیانی مادیو معنوی

ئەو پاداشتەی کە ئیماندارەکان بەختەوەر دەکات.))

لەم بەندەدا، زەردەشت باوەڕی بەوە هەیە کە تەنیا ئامرازێك کە ئادەمیزاد لەخوا نیزیك دەکاتەوە ئەوەیە کە بیری خاسی هەبێتو خۆشەویستی خەڵکی لەدڵدا بێت. زەردەشت ئاواتە خوازە لەخوا کە لەهەردوو جیهانی مادیو معنوی نیعمەتی پوختەییو بەختەوەری کە تەنیا بەهۆی ڕاستیو پاکییەوە وەدەست دێت، پێمان ببەخشێت. ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە کە ئیمانداران‌و ئەوانەی گوێ ڕایەڵی قسەکانین ڕاستیو پاکی بکەنە ڕێبازو پیشەیان بۆئەوەی بەختەوەریو سەرفرازی ئەم جیهان‌و جیهانی دواییان وەدەست بکەوێت.

بەندی 3

((ئەی مەزدا ئاهورا،

وئەی ڕاستی (ئاشا)و ئەی بیری خاس(وەهومەن)

ئەز، سروودی وەهاتان بۆ دەهۆنمەوە،

کە تائێستا کەس نەیبێژاوە،

هیوادارم توانایی معنویو پاکی (خشەترا)،

لەدەروونمدا پتر بێتو بەسەر زاتما زاڵبم.

تکاو ئارەزوومان بەدیبهێنین.

وبەختەوەریو شادیمان پآ ببەخشن)).

لەم بەندەدا، ستایشی ئاهورامەزدا وەك ئافەریدەگاری مەزن، وئاشا (دیاردەی راستی پاکی)و وەهومەن (دیاردەی بیری خاس)ـ کە هەردوکیان لەنیشانەکانی ئاهورامەزدان ـ کراوە، لێرەدا هەر وەك لەباسی ئەمشاسپەندان باسمان کرد، زەردەشت ئەم ئەمشاسپەندانە بەنیشانەکانی ئاهورامەزدا دادەنێتو هیچ جۆرە بونێکی تایبەتیو سەربەخۆو جیاوزاییان نیە. یانی ئەمانە گشتیان نیشانەکانی خوان.

لێرەدا زەردەشت دەبێژێت کە بە پەروەردەکردنی ئەم سآ نیشانە تایبەتیانەی ئەم سآ ئەمشاسپەندانە دەتوانرآ باوەڕو فیدارکاری خۆ زێتر بکرێت کە لەپاشاندا گەیشتنە پوختەیی‌و بەختەوەری‌و نەمرێتیە کە ئارەزوو ئاواتی گشت کەسێکە، دەتوانین بێژین کە ئەم بەندە بریتیە لە بڕینی قۆناغەکانی پێشکەوتن‌و پوختەیی ئادەمیزاد چونکو پاش ئەوەی هەرکەس رێگەی ڕاستی‌و پاکی هەڵبژاردو بیری خۆی پاك کردەوەو خۆشەویستی‌و دلۆڤانی خەڵکی خستە نێو دڵیەوەو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتی کۆمەڵگا، واتە نیشانەکانی ئاشاو وەهومەن‌و خشەترای لە هەناوی خۆیدا پەروەردە کرد، ئەوسا رۆحی فیداکاری‌و لەخۆبوردن‌و باوەڕ بەخوا یا (ئارمەئیتی) تێدا زێتر دەبێت.

پاش بڕینی ئەم چوار قۆناغە بێگومان دەگاتە پلەی بەختەوەری‌و پوختەیی.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا، زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە لەکاتی پێویستیدا یارمەتی خۆی‌و هاوڕآکانی بدات‌و لەگرفتاری‌و ناخۆشیەکانیان رزگاریان بکات.

لەم بەندەدا زەردەشت زۆر بە ڕاشکاوی دەبێژێت کە یەکەمین مامۆستاو ڕاگەیەنێری یەکتاپەرستی بووە لەجیهاندا چونکو هیچ کەسێك لەپێش ئەودا ئەم جۆرە سروودانەی نەبێژاوە.

بەندی 4

((ئەز، ڕۆح‌و گیانم بەهۆی بیری خاسەوە

بەرەو بەهەشتی بەرین دەبەم.

بە زانیارییەکی تەواوەوە، لەو پاداشتەی کە،

ئاهورامەزدا بۆ کاروکرداری خاسی دیاری کردووە،

تا ئەو شوێنەی هێزو توانام هەیە،

ئامۆژگاری خەڵک دەکەم کە

تێبکۆشن ڕیبازی ڕاستی بگرنەبەر.))

بیری خاس‌و پاك، ئادەمیزاد لەخراپە دوور دەخاتەوەو بەرەو جیهان‌و ژیانێکی پڕ لەچاکەو پاکی‌و دلۆڤانی‌و میهرەبانی‌و ئاسایش‌و ئاشتی دەبێت، واتە بەسەرای پڕ لەڕووناکی مەزدایە ئافەریدەگاری دانا، واتە بۆ بەهەشت دەبێت. لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژی کە ئەو کاروکردارە

جێی ڕەزامەندی ئاهورامەزدا یە بآ چاوەڕوانی پاداش ئەنجام بدرێت، وتەنیا لەبەر خاتری خاسێتی خودی کارەکە ئەنجام بدرێت.

هەروەها لەم بەندەدا، زەردەشت زۆر بەڕاشکاوی باسی پێویستی سەرشانی دەکات کە بریتیە لەبلآوکردنەوەی باوەڕی خواپەرستیو ڕێنمایی خەڵک بۆئەوەی ڕێگەی ڕاستیو دروستی بگرنەبەر.

بەندی 5

((ئەی دیاردەی ڕاستیو پاکی (ئاشا)

کەی بەدیدارت شاد دەبم؟

ئەی دیاردەی بیری خاس (وەهومەن)،

کەی بەهۆی دانایيو هۆشەوە دەتوانم بتناسم؟

وئەی ئاهورای دانا، کەی ڕێگەی گەیشتنە لای تۆ دەدۆزمەوە؟

وکەی زایەڵەی دەرونی مەزدایي دەبیستم؟

هیوادرام کە

بە یاریدەی ئاخافتنی پیرۆز (سروودی پیرۆز)[27] و هێزی دەم پاراوی،

ڕێنمایی گومڕاکان بکەم

وبیانخەمە سەر خاسترین ڕێگە کە

ڕێی ڕاستیو یەکتاپەرستییە.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ڕێگەی گەیشتنە لای ئاهورامەزدامان بۆ دەستنیشان دەکات، کە بریتیە لەڕاستیو دروستیو بیری پاکو هۆشو زانست، وە جەغت لەسەر ئەوە دەکات کە دەبێ بەزمانی خۆشووتەی باش، ڕێگەی ڕاستو دروست پێشانی گومڕایان بدرێت، ونابێ بە تۆبزیو هەرەشەو زۆرەملآ لەتەکیاندا ڕەفتار بکرێت بۆئەوەی ناچاربکرێن کوێر کوێرانە

ئامۆژگاریەکانی پەسەند بکەن، ولێرەدا باشترینوێنەمان فێردەکاتو ئەویش ئەوەیە کە دەبێ هەمیشە لەتەك نەیارەکانماندا بەهێمنیووتەی خاسو دڵۆڤانییەوە ڕەفتار بکەین.

زەردەشت لەم بەندەدا، ئارەزووی ئەوەیە کە لەژێرسایەی ڕاستیو دروستیو بیری پاکو هۆشو زانستەوە، هەروەها بەهۆیویژدانی پاکەوە بتوانێت ئاهورامەزدای داناو توانا بناسێتو لێ نیزیك بێتەوە.

بەندی 6

((ئەی مەزدا،

بیری خاسو ڕاستیو،

تەمەن درێژیم پێببەخشە.

هەروەها بەهۆی ئامۆژگارییەکانت،

هێزو توانای معنویو شادومانی

بە زەردەشتو هاوڕێیانم ببەخشە،

تا بتوانین بەسەر کینەو تورەیی نەیاران سەرکەوین.))

زەردەشت، لەم بەندەدا داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە هێزو توانای معنویو بیری خاسو توانای ئاخافتنی باش بەخۆی هاورآ کانی بدات تا بتوانێت باشتر پەیامەکەی بە خەڵک ڕابگەیەنێت، بەتایبەتی گومڕاکانو ئەوانەی دژایەتی دەکەن، بخاتەسەر ڕێی راست.

ئەوەی لەم بەندەو بەندی پێشوتر دەگەین، ئەوەیە کە زەردەشت بەهیچ جۆرێك بە تۆبزی ڕێنمایی خەڵکی نەکردووە، بەڵکو هەمیشە بە قسەی خۆشو راستو دروست خەڵکی هانداوە کە لەراستی بگەنو دوورە پەرێزبن لەخراپە. بیری خاسو خۆشەویستی خەڵکی، تەنیا چەکی ڕاستەقینەی زەردەشتە.

بەندی 7

((ئەی ڕاستی (ئاشا)،

ئەو خەلآتەی کە پاداشتی بیری خاسە،

پێمان ببەخشە.

وەتۆ ئەی پاکی (ئارمەئیتی)،

هیواو ئارەزووەکانی گوشتاسبو هاورآکانی بەدیبهێنە.

ئەی مەزدا،

هێزو توانامان پێببەخشە،

تا بتوانین پەیامو دەستورەکانت بە هەموو خەڵکی جیهان ڕابگەیەنین.))

ئەو بەخشیشو خەلآتەی کە پاداشی بیری خاسەو زەردەشت داوای دەکات بریتیە لەهۆشیاریو زانیاریو حیکمەتو رۆشەنبینیو دڵۆڤانی بێخەوش بۆ هەموو خەڵک، هەروەها باوەڕو فیداکاریو خۆ بەزل نەزانین، زەردەشت، داوای ئەمانە دەکات بۆئەوەی وەك ئامرازێك بەکاریان بێنێت بۆ جآبەجآ کردنی فەرمانەکانی ئاهورامەزداو پەیامەکەی بە هەموو جیهان رابگەیەنێتو ئاینی یەکتاپەرستیو ڕاستیو دروستی لەنێو خەڵکدا بلآوبکاتەوە.

بەندی 8

((ئەی ئاهورا،

ئەی خاسترین خاسان،

ئەی گەوهەری ڕاستی،

لەناخی دڵمەوە ئارەزوو دەکەم،

بەفەرشوشتەری دڵرو هاورێکانم،

نەمرێتیو بیری خاسیان پآ خەلآت بکەیت.))

لێرەدا زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەكات كە فەرشوشتەر (وەزیری گوشتاسەبو برای جاماسەب بووەو یەكێكە لەوانەی كە زوو باوەڕی بە زەردەشت هێناوە)و یاوەرەكانیو ئەو كەسانەی خاوەنی بیری خاسن، بخاتە بەهەشت، واتە خاسترین ژیان لەم جیهانەداو ئاسوودەیی بیرو ڕاحەتیویژدانو ئارامی رۆحو ڕەوان لەجیهانی دیكە.

بەندی 9

((ئەی مەزدا ئاهورا،

هەوڵدەدەم لەكانگەی دڵمەوە،

سروودی ستایشی خۆمت ئاراستە بكەم،

هەرگیز ڕاستی (ئاشا)و بیری خاس (وەهومەن)،

لەخۆم نەڕەنجێنم.

چونكو ئەوانەو توانایی معنوی (خشەترا)

بەشیاوی ستایشت دەزانم.))

لەم بەندەدا، ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە كە ئەوشتە چاكانەی كە لەئاهورامەزدا بەخۆیو پەیڕەوانی بەخشیوەو دەیبەخشێت هەرگیز لەڕێی خراپەوە بەكاری نەهێنێتو ئازار بەكەس نەگەیەنێت بۆئەوەی ڕاستیو بیری چاك لەخۆی نەڕەنجێنێت. هۆشو زیرەكیو توانایی خۆیان بخەنەگەڕ بۆئەوەی خزمەتی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێبكەن، وهەرگیز كارێك نەكەن كەزیان بە خەڵك بگەیەننو ئاشاو وەهومەنو خشەترا لەخۆیان زویر بكەن.

دوبارە زەردەشت جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە ئاهورامەزداو نیشانەكانی (بیری خاس، ڕاستیو توانایی) شیاوی ستایشتە.

بەندی 10

((ئەی مەزدا ئاهورا،

هیواو ئارەزووی ئەو کەسانەی کە

دروستکردارنو خاس بیردەکەنەوەو راستی یان کردۆتە پیشە،

وتۆ خۆت خاسیان دەناسێت،

وەدیبهێنە.

ئەز، خاس دەزانم کە تۆ

ئەو ستایشتانەی لەناخی دەرونەوە دەردەچێت

وبۆ کاری خاس بێت

وەڵام دەدەیتەوە.))

لێرەدا زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکات کەویستو ئارەزووی ئەو کەسانەی کە بەهۆی بیری خاسولەسایەی ڕاستیو دروستیداو بەهۆشیاریو زانیارییەکی تەواوەوەو بآ هیچ جۆرە مەراییو خۆنوێندنێکەوە ستایشی ئاهورامەزدا دەکەن، وەدیبهێنی.

بەندی 11

((ئەی مەزدا ئاهورا،

هیوادارم بەهۆی ئەم ستایشتانەمەوە،

وبەهۆی بیرو ئەقلأو هۆشمەوە،

کە بۆ هەمیشە پارێزگاری لەڕاستیو بیری خاس دەکەم،

ئامۆژگارییەکانتم فێر بکەیت،

وپێم بێژیت کە،

هەر لەسەرەتاوە

ئافراندنو ژیان چلۆن پێکهاتووە؟))

لەم بەندەدا، ئاماژە بۆ ئەو نوێژو ستایشتانە کراوە کە لەبندی پێشودا باسمان کردو مەبەست ئەو ستایشانەیە کە لەکانگەی دڵەوە دەردەچێت بآ هیچ مەراییو ڕیایەك.

زەردەشت دەبێژێ کە بەهۆی ئەم جۆرە ستایشانەو بیرو ئەقڵو هۆشیەوە کە هەمیشە پارێزگاری لەڕاستیو بیری خاس دەکات، ئاهورامەزدا ئامۆژگارییەکانی پآ ئیلهام بکات، بۆئەوەی بتوانێت پەیامە پیرۆزەکەی کە بریتیە لەڕێنمایی بەرەو بآخەوشێتی، ڕابگەیەنێت. هەروەها زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە ڕازو نهێنی چونیەتی دروستبوونی ئەم جیهانەو (بوون)ی بەهۆی بیرو هۆشەوە بۆ ئاشکرا بکات، بۆئەوەی هەموو ڕاستییەکان بۆ خەڵک رۆشەن بکات (وەڵامی ئەم داخوازیەو باسی چونیەتی وەدیهاتنی جیهانی بوون لە (هات30) گاتاکاندا دەبینین.

**سروودی دووهەم**

یەسنا ـ هات 29 ـ بەندی 1

((ئەی مەزدا گیانی گیانداران، سکاڵو گلەیی خۆیت عەرزدەکا:

بۆچی منت ئافراند؟

بۆچی ئەم جەستە مادییەت پآ بەخشیم؟

ستەمو قینو سەرکێشیو جەردەیی،

دەوروبەرمی تەنیوەتەوە.

ئەز، لەتۆ بەولاوە، هیچ پشتوپەنایەکم نییە،

کەوابو،

کەسێك کە شیاوی ئەوەبێت لەم بارە ئالێۆزە ڕزگارم بکا

پێم بناسێنە.))

لەم بەندەدا، باسی بارودۆخی سەردەمی زەردەشت دەکا. کۆمەڵگای ئەو سەردەمە ئالێۆزو پڕ لەخراپەکاری بووە. دزێتی، جەردەیی، کوشتو کوشتار، جەورو ستەمو ئاژاوە ناوچەکەیان تەنیبۆوەو بە جۆرێك خەڵک لەسەغلەتیدابوون کە گیانی گیانداران (لێرەدا گیانی گیانداران نوێنەری هەموو ئادەمیزادو گیاندارانەواتە ڕەوانی هەموو جیهانە (وروح الوجود) ئۆقرەی

لێدەبرێیتو سکاڵی خۆی لەخزمەت ئاهورامەزدا عەرز دەکات، وداوای لێدەکات کە کەسێك هەڵیبژێرێت ئەم خەڵکە لەم بارە ئاڵێۆزە رزگار بکات.

بەندی 2

((ئەوسا،

ئافەریدەگاری جیهان، لەڕاستی (ئاشا)ی پرسی:

کـآ هەڵێدەبژێری بۆ ڕابەرایەتی جیهان؟

تا یاریدەی بدەینو پشتیوانی لێبکەینو، هێزو توانای ئاوەدانکردنەوەی جیهانی پێببەخشین.

ئەی ئاشا،

دەتەوێت کـآ هەڵێبژێریت بە ڕابەرو سەرداری جیهان

تا بتوانێت قینو تورەییو ئازاری درۆزنو خراپەکاران لەناوبەرێت؟))

دەتوانین بێژین کە تێکڕا (هات 29) بریتیە لەشانۆگەرێتییەکی ئیزەدی کە: ئاهورامەزدا، ئاشا، وەهومەنو گیانی گیانداران ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینین.

لەبەندی پێشودا باسمان کرد کە گیانی گیانداران، سکاڵو گلەیی خۆی دەربارەی بارودۆخی کۆمەڵگا دەردەبڕێتو داوا لەئاهورامەزدا دەکا کە رزگارکەرێکی بۆ هەڵبژێرێت.

لەم بەندەدا، لەبریتی ئەوەی ئاهورامەزدا ڕاستەوخۆ خۆی کەسێکی پێناسێناآ. داوا لە(ئاشا) کە دیاردەی ڕاستیو پاکیو زانستی خۆیەتی، دەکات کە رابەرێكو رزگارکەرێك دەستنیشان بکات کە بتوانێت دڵنەوایی گیانداران بداتەوەو یارمەتی بدات لەبڵاوکردنەوەی ڕاستیو دروستیو ئاوەدانی جیهان. ڕابەرێك کە هێزو توانای بەربەرەکانی بەدکارانو درۆزنانو گومڕایانی هەبێتو بتوانێت بەهێزی معنوی ململانێیان لەتەکا بکاتو بیانخاتە سەر ڕێی راستو کینەو تورەیی، کە مایەی بەدبەختیو دواکەوتنی کۆمەڵگایە، لەناوبەرێت.

هەرساتێك ڕابەرێکیوا دەستنیشان بکرێت، ئاهورامەزدا پشتیوانی لێدەکاتو یاریدەی دەدات.

بەندی 3

((ڕاستی (ئاشا) وەڵامی دایەوەو گوتی:

لەنێو ئەم خەڵکەی جیهاندا کەسێکیوا ناناسم

کە بتوانێت ئەم ئازارە لەکۆڵ خەڵک بکاتەوە،

ویاریدەی پیاو چاکان بدات دژی خراپەکاران.

بێگومان لەنێو ئەم خەڵکەدا،

ئەو کەسە دەبێ لەهەموان بەهێزترو بە تواناتر بێت،

تا هەرکاتێك داوای یارمەتی کرد

فریای بکەوینو یاریدەی بدەین.))

لەم بەندەدا، دەبینین کە ئاشا (دیاردەی راستیو پاکی) بۆ وەڵامدانەوەی ئاهورامەزدا کە پرسیاری لێکردبوو کێ هەڵیدەبژێرێت بۆ رزگارکردنی خەڵک، توانای نییەو بەڕاشکاوی دەبێژێ کە کەسێکیوا ناناسێت کە بەم کارە مەزنە هەڵسێت، بەڵام دەبێژێ بێگومان کەسێك بۆ ئەم کارە مەزنە هەڵیدەبژێرێت، دەبێ میهرەبانو بێ ئازارو بەویژدان بێتو نابێ ستەمکارو زاڵێم بێت، لەروانگەی راستیو پاکی دەبێ لەهەموان سەرتر بێت، دەبێ هێزوتوانایەکی وەهای هەبێت کە بتوانێت یاریدەی دروستکاران بدات دژی خراپەکاری. لەکۆتاییدا دەبێژێ کە ئامادەی یاریدەدانی ئەو کەسە توانایەو هەرکاتێك پەنای بۆ بردین یارمەتی بدەینو فریای بکەوین.

بەندی 4

((مەزدا ئاهورا، لەهەموان خاستر ئاگادارە

کە لەڕابووردوودا بت پەرستەکانو پەیڕەوەکانیان

چییان کردووە،

لەپاشە رۆژیشدا چ دەکەن.

لەبەر ئەوە، دوا بڕیارو داوەریکردن تەنیا بۆ ئاهورایە،

کەوایە، هەرچی شتێكویستوخواستی ئەوە، ئێمە گوێ ڕایەڵین.))

ئەم بەندە، تەواوکەرەوەی بەندی پێشووەو تیایدا (ئاشا) قسە دەکاو دەبێژێ: ئەی خوای داناو ژیر، تۆ خۆت هەموو شتێك دەزانیتو ئاگاداری هەموو کارو کرداری مرۆڤیت چ لەرابوردودا چ لەپاشەرۆژداو هیچ شتێك بآ ئاگاداری تۆ ڕوونادات.

لەبەرئەوە، تەنیا خۆت دەتوانیت لەم بارەشەوە بڕیار بدەیت چونکو بڕیارەکانت ڕاستو دروستنو ئێمە دەبێ گوێ ڕایەڵی دەستورەکانت بین.

بەندی 5

((ئەزو گیانی گیانداران، هەردوو پێکەوە،

وبەڕێزەوە دەستمان بەرز دەکەینەوە،

وستایشتی ئاهورامەزدا دەکەین،

وداوای لێدەکەین کە،

هەرگیز لەلایەن خراپەکاران، زیان بە،

مرۆ پاکەکانو خاسکردارەکانو ڕابەرەکەیان نەگات.))

لەم بەندەدا، (ئاشا) درێژە بە قسەکانی دەداو دەبێژی:

ئەی خوای گەورە، ئەزو گیانی گیانداران، هەردووکمان بەڕێزو مل کەچییەو دەستمان بەرز دەکەینەوەو ستایشتت دەکەین، ئارەزوومان ئەوەیە کە ئامرازێك هەڵبێژێری کەمرۆ خاسەکانو خاوەن باوەڕەکان لەخراپەی نەیارانو زیانەکانی ئەهریمەن بپارێزآو هیچ ئێشو ئازارێکیان پێنەگات. هەروەها ئاگاداری ڕابەرو پێشەواکەیان بە، کە ڕاسپاردەیە بۆ رزگارکردنی هەموو خەڵکو ڕێنمایی یانە بەرەو ڕێگەی ڕاستو دروست، ولەخراپەی نەیاران بیپارێزە.

بەندی 6

((ئەوسا،

ئاهورامەزدا،

کە بەزانستو دانایی خۆیەوە،

ژیانی ئافراندووە، فەرمووی:

ئایا تۆ، سەردارو ڕابەرێکی پاك ناناسیت؟

مەگەر تۆ، هەڵبژاردەی ئافەریدەگارنیت؟

ئایا چاودێری‌و ئاگاداری ئەم جیهانەم، بەتۆ ڕانەسپاردووە؟))

پاش ئەوەی ئاشا بآ توانایی خۆی بۆ وەڵامدانەوەی ئاهورامەزدا دەربڕێ، ونەیتوانی کەسێك دیاری بکات کە خەڵک لەو بارە ئالێۆزە ڕزگاربکا. ئاهورامەزدا دەفەرمەوآ کە چلۆن دەبێت کەسێك (لێرە مەبەست لەکەسێك، دیاردەی ڕاستی‌و دروستی‌و پاکییە- ئاشا-) کە هەڵبژاردووە بۆ چاودێری‌و ئاگاداری ئەم جیهانە، ئاگا نەبآ لەکەسێك کە بتوانێت ڕابەرێتی ئەم خەڵکە بکاتو ڕزگاریان بکا لەو بارودۆخە. لەم بەندەدا دوپاتی دەکاتەوە کە ئاهورامەزدا ئافەریدەگاری جیهانەو ئەم دنیایەی بەهۆی بیروهۆش‌و حیکمەتی خۆیەوە ئافراندووە. ئاشا ئەوەندە دەزانێت کە ئەو دەبێ کەسێیەتییەکی میهرەبان، جوامێر، بەویژدان، ڕاستوپاك‌و بەهێزوتوانا بێت. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوآ کە مەبەستی ئەسڵی ئەوەیە کە هەڵبژاردنی زەردەشت بەرابەرایەتی‌و پەیامبەرێتی ڕاستەوخۆ لەلایەن ئاهورامەزدا خۆی بووە.

بەندی 7

((ئەم ئاخافتنە پیرۆزە کە شادی‌و بەختەوەری دەهێنآ،

لەلایەن ئاهورایە کە:

ویستو خواستی لەتەك ڕاستی (ئاشا)دا، هاوئاهەنگە

ومەزدا ئاهورا،

لەبۆ ئاوەدانکردنی جیهان،

ئەمەی فێری مرۆی پاك‌و دروستکردار کردووە.

ئەی بیری خاس (وەهومەن)

کـآیە ئەو کەسەی لەتۆیەو مەبەستتە

کە بتوانێت بەڕاستی یاریدەی خەڵک بدات؟))

لەبەندی پێشودا، ئاهورامەزدا چلۆن پرسیاری لە(ئاشا)کرد، لەم بەندەدا هەمان پرسیار لەوەهومەن کە دیاردەی بیری خاسە، دەکاتو دەفەرموێت: ئایا ئەتۆ کەسێکی وەهات ڕەچاوکردووە کە بتوانێت یارمەتی خەڵک بداو لەم بارە ئالێۆزە رزگاریان بکات.

لێرەدا ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە(وەهومەن)یش ناتوانێت وەڵام بداتەوەو بێدەنگ دەبێت. بۆیەکا ئاهورامەزدا(لەبەندی دواییدا خۆی وەڵام دەداتەوە.

بەندی 8

((ئەمن، تەنیا کەسێك دەناسم کە،

گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانمە،

وئەو کەسە

زەردەشت ئەسپەنتمانە.

تەنیا ئەوە کە دەیەوێت

شێوەو ڕێگەی ڕاستیو سروودەکانی مەزدا،

بە خەڵک ڕابگەیەنێت.

هەر لەبەر ئەوەیە کە

دەم پاراویو قسەی دڵفرێنی پێدەبەخشین.))

هەروەکو لەبەندی پێشودا گوتمان، نە دیاردەی راستی (ئاشا)و نە دیاردەی بیری خاس (وەهومەن)، هیچکامیان نەیانتوانی بەڕاشکاوی وەڵامی پرسیارەکەی ئاهورامەزدا بدەنەوە. لەبەرئەوە ئاهورامەزدا خۆی وەڵامی پرسیارەکەی خۆی دەداتەوەو دەبێژی کە تەنیا کەسێك کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئاهورایەو دەستورەکانی جآبەجآ دەکات، زەردەشت ئەسپەنتمانە.

هەرئەوە کەبۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی راستیو یەکتاپەرستی ئامادەگی تەواوی هەیە.

ئەو تەنیا کەسێکە کە دەتوانآ ئادەمیزاد لەگومڕایی رزگار بکات.

لەبەرئەوە، بریارمان داوە کە دەم پاراوی پآ ببەخشین بۆئەوەی خاس بتوانێت پەیامی ئاسمانی بە خەڵک ڕابگەیەنێت.

لە (هات 28) بەندی 5 دا زەردەشت دەبێژی: با بەیاریدەدەریوتەی پیرۆز (سروودی پیرۆز)و هێزی دەم پاراوی، گومڕایان بخەمەسەر خاسترین رێگە (واتە راستیو دروستی). لێرەدا ئاهورامەزدا داخوازییەکەی زەردەشت وەدی دێنێتو دەم پاراوی پآ دەبەخشێ. شایانی باسە کە بێژین پروفیسۆر بارتلومەو پورداود، هەردوکیان لەو باوەڕەدان کە ئەم بەندەوتەکانی وەهومەنەیە نە ئاهورامەزدا.

بەندی 9

((ئەوسا،

گیانی گیانداران، دوبارە دەنگی بەرز بۆوەو گوتی:

ئایا ئەز دەبێ گوێڕایەڵی قسەی مرۆیەکی

لاوازو بآ توانا بمو پشتیوانی لێبکەم؟

بەڕاستی، ئارەزووم ئەوەبوو کە سەردارێکی بەهێزو توانا،

بۆ ئەم کارە هەڵبژێردرایە.

کەی کەسێکی وەها،

بەهێزی بازووی خۆی،

یاریدەم دەدات؟)).

شتێکی ئاساییە کە گیانی گیانداران لەم هەڵبژاردنەی زەردەشت قەڵسو نارازی بێت. چونکو تا ئەوکاتە هیچ کەس (جگە لەئاهورامەزدا)، زەردەشتی نەناسیبو، لەبەرئەوەی تا ئەوکاتە هیچ پەیامبەرێك لەلایەن خواوە بۆ سەر زەوی نەنێرابو، هیچ کەسێك یا هێزێك باوەڕیان بەوە نەبووە

كه جگه لەسەركردەيەك يا شاليارێك بتوانێت ئەوەندە بەهێزو توانا بێت كه بتوانێت بارودۆخی كۆمەڵگا بگۆڕێت.

لێرەدا شايانی باسه كه بێژين ئەم‌ووتووێژه كاتێك ڕويداوه كه زەردەشت وەك مرۆيەكی مادی لەئارادا نەبووە. باس باسی رۆحيانەتی (فرەوەهر)زەردەشتە ـ لەپاشاندا باسی (فرەوهر) دەكەين.

گيانی گيانداران هيچ شتێك دەربارەی ئەم رۆحيانەتە نازانێت‌ووادەزانێ كه كەسێيەتييەكی ئاسايیەو ناتوانآ بەم ئەركو كاره گرنگه هەڵێسيت، بۆيه داوادەكات كه شاليارێكی بەهێزوتوانا هەڵێبژێرێت كه ستەمكەرانو خراپەكاران بەهێزوتوانای بازووی خۆی لەناو بەرێت.

بەندی 10

((ئەی ئاهورا،

بەهۆی ڕاستی (ئاشا)و بيرخاسەوه (وەهومەن)،

هێزو توانايی پێببەخشه،

تا بتوانێت خانەو بەرەيەكی ئاوەدانو ئاسايشو ئارام

به هەموو جيهان بگەيەنێت.

ئەی مەزدا،

ئەمنيش ئەو بەخاسترين ئافەريدەو هەڵێبژاردەی تۆ دەناسم.))

هەر چەنده بڕێ لەزاناو رۆژهەلاتناسەكان دەبێژن كه ئەم بەنده لەوتەكانی خودی زەردەشتەو گيانی زەردەشت پێش ئەوەی بچێته قالێبی مادی، لەو كۆبونەوەيەدا ئاماده بووە.

بەلآم موبد فيروز ئازەرگوشەسب لەو باوەڕەدايه كه ئەم بەندەو بەندی داهاتوو، ئاخافتنی گيانی گياندارانه.

لەبەندی پێشودا ئەوەی پتر سەرنجی ڕاكێشا ئەوەبوو كه گيانی گيانداران لەڕوی بآ ئاگايی دەربارەی زەردەشت ئەو قسانەی كرد، بەلآم لەپاشانداو لێرەدا دەبينين لەو هاشوهوشه دەكەوێتو ڕەزامەندی خۆی بۆ ڕابەرێتی زەردەشت دەردەبڕێتو لەئاهورامەزدا داوا دەكات

كە هێزو توانای معنویو ڕابەرایەتی بە زەردەشتو یاوەرەكانی ببەخشێت تا بتوانێت ئاشتیو ئاسایشو تەباییو هێمنایەتی بۆ هەموو خەڵكی جیهان دابین بكات، وكۆتایی بەشەڕو شۆڕو هەراو هوریاو خراپە بهێنێت.

لەكۆتایی ئەم بەندەدا، گیانی گیانداران كە نوێنەری هەموو گیاندارانی سەر روی زەمینە دەبێژێ:

ئەی ئاهورامەزدا، ئەی دانای توانا، ئێمەش هەمووومان زەردەشت بە شیاوی ڕابەرایەتیو سەروەری دەناسینو ڕەزامەندین بەم هەڵبژاردنە.

بەندی 11

((كەی ڕاستی (ئاشا)و بیری خاس (وەهومەن)و توانایی معنوی (وەخشەترا)

ڕوومان تێدەكەن؟

كەی ئەنجومەنی مۆغەكان[28]

ئەم ئاینەی تۆ پەسەند دەكەن؟

ئەی ئافەریدەگاری مەزن

ئێستا كە یاوەرو ڕابەرمان بۆ دەستنیشان كراوە

ئێمەش ئامادەی خزمەتگوزارێین.))

لێرەدا، گیانی گیانداران درێژە بە قسەكانی خۆی دەداو دەبێژێ، ئەی خوای مەزن، هێزوتوانای معنوی ئاشاو وەهومەنو خشەترام پێببەخشە،واتە راستیو پاكی، ئەقلو هۆشو زانیاریو بیری خاس، هێزوتوانای خزمەتكردنی خەڵكو یارمەتی هەژارانو بێدەرامەتانم پێببەخشە بۆئەوەی بتوانم بەرامبەر سەختیو دژوارییەكانی ژیان خۆم ڕابگرم. ئەمجا داوا لەئاهورامەزدا دەكات، كە یارمەتی ئەنجومەنی باڵای مۆغەكان بدات كە لەپێناوی بڵاوكردنەوەی ئاینی یەكتاپەرستیو ئاینی ئاهوراییو ڕێنمایی كردنی خەڵك بەرەو یەكتاپەرستیو راستی بڕۆن. لەكۆتایی ئەم بەندەدا، دەبینین كە گیانی گیانداران لەو رەشبینییە رزگاری دەبێوورەی بەرز دەبێتەوەو دەبێژێ، ئێستا ئیدی كە یاوەرو سەردارێكمان بۆ دیاری كراوە كە لەهەموو بوارەكاندا شیاوی ڕابەرایەتییە، ئێمەش هەوڵو كۆشش دەدەین بۆئەوەی ئاواتی پیرۆزی پەیامبەر بەدی بهێنینو ڕەزامەندی ئافەریدەگار دابین بكەین، بەدڵو بەگیان خزمەتی دەكەینو هەرگیز سەركێشی

لەدەستورەکانی ناکەین. هەمیشە گوێڕایەڵی بانگهێشتیویژدانینو چاکی مەردایەتی لێدەکەین بەلاداو خزمەتی خەڵک دەکەین.

ئەگەرکو خاس بڕوانینە ئەو ڕازەیەی کە باسکرا، بە چاوێکی بیناو بیرێکی رۆشەن سەرنج بدەینو هەڵیسەنگێنین، دەبینین کە لەنێو ئەم شانۆگەریتی ئیزەدییە، گشت ئەو کێشەو مەسەلانەی کە دەربارەی چونیەتی سەر هەڵێهێنانی ئاینەکانو پوختەبونیان بە ئاشکرا دەبینین.

واتە، سەرەتا گیانی گیانداران کە لێرەدا دەبێتە نوێنەری خەڵک یاوتەبێژی نیازو پێویستییەکانی کۆمەڵگا، داواکاری خۆی دەخاتەڕوو. کەسێك لەنێو جەرگەی خەڵکیدا، بەهۆی ڕاستیو دروستی بیروکردارییەوە هەڵێدەبژێرێت بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵک، بەلآم کۆمەڵگا هەروا بە ئاسانی پەیڕەوی لێناکاتووتەکانی پەسەند ناکات (بڕوانینە ئەو قسانەی گیانی گیانداران دەیکات پاش هەڵبێژاردنی زەردەشت بە پەیامبەرێتی)، بەلآم پاشان کە دەبینین (ئەو) هیواو ئارەزووەکانیان دەهێنیتەدی، ئیدی دەست لەبەربەرەکانێتی هەڵێدەگرنو ئاواتی سەرکەوتنی بۆ دەخوازنو بەکردەوەش یارمەتی دەدەن.

## سروودی سێهەم

هات 30 ـ بەندی 1

((ئێستا ئیدی، بۆ ئێوە

ئەی عەوداڵانی زانیاری، قسە دەکەم،

وبۆ ئێوە ئەی مرۆ ژیرەکان

دەربارەی دوو گەوهەری (زات) مەزن.

هەروەها شێوەی ستایشتی،

ئاهوراو بیری خاس (وەهومەن)

وزانستی خاسو ئاینی ڕاستی (ئاشا)،

تا لەڕووناکی ڕاستەقینە تێبگەن،

وبگەنە پلەی پوختەییو بەختەوەری.))

بەگوێرەی بۆچونی برێ لەئاوێستاناسان، (هات 30) شاکاری گاتاکانو بنچینەی ئاینی زەردەشتییە، چونکو دوو زاتی گرنگی ئاینی زەردەشتی تێدا باسکراوە. ئەم دوو دیاردەیە بریتین لەسپەنتامینوو ئەنگرەمینو، بیری چاکـو بیری خراپ.

هەروەها باسی ئازادی دەربڕینی باوەڕو هەڵبژاردنی ڕێگەی ڕاست یا چەوت لەژیاندا دەکات. ئامۆژگارییەکانو ڕێنماییەکانی زەردەشت لێرەوە دەستپێدەکات. لەیەکەمین هەنگاوی بلاوکردنەوەی ئاینو بیروباوەڕەکەی، لەنێو خەڵکدا قسەدەکاو دەبێژی:

دەخوازم بۆ ئەوانەی کە عەودالی ڕاستینو ئەوانەی کە داناو ڕۆشەنبیرن، دەربارەی دوو دیاردە (گەوهەر)ی دژ بە یەك کە لەسەرچاوەی بیری خودی ئادەمیزاد هەڵێقولاوە، بدوێمو ڕاستیتان بۆ ئاشکرا بکەم. هەروەها دەربارەی چۆنیەتی ستایشی خواو نیایشی وەهومەنوێتە بیری خاس کە مایەی بەختیاریو ئاوەدانی جیهانە، ئاگادار بکەم.

هەروەها ڕێگەی گەیشتنە زانستی خوایی کە تەنیا بەهۆی (ئاشا) واتە ڕاستیو دروستیو لەخۆبوردن وەدەست دێت، پێشانتان بدەم.

مەبەست لەزانیاری راستەقینەی خوایی، بریتییە لەو زانیارییەی کە لەسەر بنەمای ڕاستیو دروستیو پاکیو لەخۆبوردنو خۆشەویستی خەڵک دامەزراوەو دەتوانآ ئادەمیزاد بەرەو پوختەیی بەرێت.

بۆ گەیشتنە قۆناغی پوختەییوویژدانی ئاسوودەو پڕ لەڕوناکی ئاهورایی (واتە بەهەشت)، زەردەشت لەم بەندەدا ئەمانەی بە پێویست زانیوە:

ستایشی ئاهورامەزدا لەکانگەی دڵەوەو بە باوەڕی تەواوەوە، ئاگاداری تەواو لەو دوو دیاردەیەو ململانآ کردن لەنێوان چاکەو خراپە، پەروەردەی وەهومەن، واتە بەهێزکردنی بیری خاس لەخۆدا، وەرگرتنی زانیاری ڕاستەقینە بەهۆی ڕاستیو پاکییەوە.

بەندی 2

((کەوایە،

گوێڕایەڵی خاسترینوتەکان بن،

و بەبیرێکی رۆشەنەوە هەڵیسەنگێنن،

وهەریەکە لەئێوە بۆ خۆی

لەم دوو ڕێبازە، یەکێکیان هەڵبیژێرن،

پێش ئەوەی ڕوداوی مەزن ڕوودات،

هەریەکەتان بە دروستی ئاگاداربن،

لەم پەیامە تێبگەن‌و بلآوی بکەنەوە.))

لەم بەندەدا، یەکآ لەگرنگترین ئامۆژگارییەکانی زەردەشت بەشێوەیەکی فرە سادەو ڕۆشەن‌و بە ڕاشکاوییەوە بەیان کراوە، کە بریتیە لەئازادییەکی تەواو بۆ هەر مرۆیەك کە ڕێگەی چاک یا خراپ (راست یا درۆ) هەڵبیژێرێت.

زەردەشت، داوا لەپەیڕەوەکانی دەکا، ئازادانەو بە بیرێکی رۆشەن‌و دیدێکی کراوەو بەووردییەوە بیر لەئامۆژگارییەکانی بکەنەوە، ئەوسا هەر ئافرەت‌و پیاوێك، بە بیروهۆش‌وویژدانەوە، چاکە لەخراپە، ڕاست لەناڕاست جیابکاتەوەو ڕێگەی خۆی هەڵبیژێرێت. زەردەشت بە هیچ جۆرێك هەڕەشەو زۆرەملآ بەکارناهێنێت بۆئەوەی خەڵک ئامۆژگارییەکانی وەربگرن، وهیچ کاتێك داوای لەپەیڕەوەکانی نەکردووە کە کوێر کوێرانە دوای بکەون.

ئەم بەندە، تەواوکەرەوەی بەندی پێشووە، وتیایدا زەردەشت سەرنجی خەڵک بۆ ئامۆژگارییەکانی راکێشاوەو دەبێژێ:

خەڵکینە، گوێ بۆ قسەکانم شل بکەن‌و هەڵیسەنگێنن، وهەر ئافرەت‌و پیاوێك، خۆی بە شێوەیەکی ئازاد هەولأ بدات ڕێگەی ڕاست لەرێگەی چەوت جیابکاتەوە، وڕێگەی راست هەڵبیژێرێت.

لەدوابەشی ئەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ:

پێش ئەوەی ژیان لەم جیهانەدا کۆتایی پآ بێت‌وورۆژی پەسلان بێتەپێش، دەبێ خەڵک لەخەوی بێهۆشی ڕاپەرن، تێبکۆشن پەیامی ڕاستی‌و دروستی‌و ئەحکامی ئاهورایی‌و ئامۆژگارییەکانی زەردەشت لەجیهاندا بلآوبکەنەوە، وئەوانەی ڕێگەی چەوتیان هەڵبیژاردووە، بەرەو ڕێگەی ڕاست هیدایەت بکەن.

ئەم پەیامە، پەیامێکی جیهانییەو بۆ هەموو خەڵکی سەرروی زەوییە.

بەندی 3

((ئێستا،

ئەم دوو گەوهەره هاوالأ دوانه دژ به یەکە، کە هەر لەسەرەتاوە،

لەنێو بیرو خەیاڵی مرۆڤدا دەرکەوتن،

یەکێکیان چاکە دەنوێنیو ئەوی دیکەیان خراپە.

ولەم دوانە

مرۆی ژیرو دانا، راستیو دروستی هەڵێدەبژێرێتو

نەزانو بآ هۆش، خراپە هەڵێدەبژێرێت.))

زەردەشت، لەم بەندەدا، دەربارەی فەلسەفەی چاکەو خراپەو سپەنتامینوو ئەنگرەمینو دەدوآو دەبێژێت: ئەم دوو دیاردەیە، واتە چاکەو خراپە، لەبیری ئادەمیزاد خۆیەوە دێنە ئاراو دروستکراوی بیری ئادەمیزاد خۆیەتی، وبەهۆی بیرەوە بۆ کرداروووتار رێی خۆی خۆشدەکات. واتە، سەرچاوەو بنەمای گشتووتارو کرداری خاس یا خراپ، لەبیری ئادەمیزادەوە هەڵدەقوڵێت. ئەگەر بیری کەسێك خاس بێت، بێگومانوتەو کرداری ئەو کەسە خاس دەبیو بە پێچەوانەوە، هەر کاتێك بیری کەسێك خراپو چەواشە بێت، وتەو کرداری ئەو کەسە خراپ دەبێ. بیری ئادەمیزاد، بەهەشتو دۆزەخی ئەو کەسە خۆیەتی.

لەروانگەی کەسێکی خاوەن بیری خاس، گشت شتێك خاسو جوانە، بەلآم لەدیدی خەڵکی خاوەن بیری خراپ، بەهەشتیش وەك دۆزەخوایە.

کەواتە چاکەو خراپە، جوانیو ناشیرینی، پەیوەندی بە شێوەو چونیەتی بیرکردنەوەی ئادەمیزاد خۆیەتیو هیچ پەیوەندییەکی بە ئافەریدەگاری ژیرو توانا نییە.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا دەبێژی کە مرۆی ژیرودانا، بەهۆی هۆشو بیری خاسی خۆیەوە، چاکەو خراپەو راستو درۆ لەیەکتری جیادەکاتەوەو رێگەی راستی هەڵێدەبژێرێت، وبە پێچەوانەوە، مرۆی بێهۆشو نەزان، بەهۆی نەزانینیەوە، دوچاری هەڵە دەبێتو وەدوی ئارەزووی مادی دەکەوێتو دوچاری گرفتاریو پەرێشانیو خراپەکاری دەبێت.

خوا، هێزوتوانای بیرکردنەوەی بە ئادەمیزاد داوە تا چاکەو خراپە لەیەکدی جیابکەنەوەو بەهۆی بیروهۆشی خۆیانەوە چاکە هەڵبژێرنو دژی خراپە ڕاوێستن، وبەربەرەکانی بکەن.

بە کورتی، ئەوەی لەم بەندەدا ڕەچاو دەکرێت ئەوەیە کە زەردەشت، هەموو خراپەو گومڕاییو گەندەڵییەك لەنەزانینو بآ ئاگایی دەزانێ، وهۆشو بیرو زانیاری بە مایەی بەختەوەرییو خۆشی دەژمێرێت.

بەندی 4

((ئەوسا،

کە لەسەرەتای ژیاندا،

ئەو دوو گەوهەرە، لەنێو بیردا گەیشتنە یەکدی،

ژیانو نەبوونیان هاوردە ئارا.

تا کۆتایی (بوون) هەر بەم شێوەیە دەبێ کە:

خاسترین بیرو باشترین ژیان بۆ پەیڕەوانی راستی،

وخراپترین حاڵەتی دەرونی بۆ لایەنگرانی درۆ دەبێت.))

زەردەشت، لەم بەندەدا دەبێژێ: کاتێك ئەم دوو دیاردەیە یا ئەم دوو هاوالأ دوانە دژ بە یەکە (سالبو موجەب) کەوتنەکار، ئاوەدانیو ڕوخاندن، یا ژیانو نەبوونیان هێنایە ئارا، مەبەست لەژین، ژیانی خۆشیو ئارامو کۆششو هەوڵدانە لەپێناوی پێشخستنو پێشکەوتنی کۆمەڵگاو خزمەتکردنی خەڵکە، ئەمەش تەنیا بەهۆی کارتێکردنی بیری چاكو دڵێکی پڕ لەخۆشەویستی خەڵك، یانی، بەهۆی دیاردەی خاسێتی وەدی دێت. بەڵآم نەبوون یا ڕوخاندن، بریتیە لەژیان بردنەسەر بە بیرێکی خراپو نارەواو پڕ لە ئاکاری خراپە. بێگومان ناتوانین ئەم جۆرە ژیان بردنەسەرە، بە ژیانێکی ڕاستەقینە بژمێرین، بەڵکو زێتر لەمەرگ دەچآ تا ژیان.

کەوتنە نێو داوی خراپە، تەنیا بەهۆی بیری خراپەو دیاردەی خراپەیەو بەس. مردن تەنیا مەرگو لەناوچوون نییە، بەڵکو ژیانێکی خراپیش کە هیچ سودێکی بۆ کۆمەڵگا نەبێت جۆرێکە لەمردن. هەروەها دەبێژێ تا ژیانو بوون هەیە، حالأ هەربەمجۆرە دەبێتو دیاردەی چاکەو خراپە هەمیشە لەململانآ دەبن. لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە کە هەوڵوکۆشش بدات دیاردەی چاکە بەسەر خراپەدا سەرکەوێت.

لەکۆتاییدا، دەربارەی پاداشتی چاکانو سزای خراپەکاران دەدویو دەبێژێ:

ئاسوودەیی بیرووویژدان، خاسترین پاداشتی خاسانەو بە پێچەوانەوە نارەحەتی بیرووویژدانو ئەشکەنجەی ڕەوان، گەورەترین سزای خراپەکارانە. لێرەدا زێتر ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە بەهەشتو دۆزەخ. لەروانگەی زەردەشتەوە، مادیو جسمی نییە، بەڵکو شتێکی معنویو دەرونییە. بە بۆچونی ئازەرگوشەسب، بەهەشتی زەردەشت شوێنیکی تایبەتی پڕ لەسەوزەڵانیو حۆریو غولمان نییە، هەروەکو چلۆن دۆزەخیش شوێنێکی دیاریکراوی ترسناکی پڕ لەمارو دوپشك نییە. بەڵکو هەردووکیان بریتین لەچلۆنایەتی باری دەرونی ئادەمیزاد کە لەتەك بیرو چونیەتی بیرکردنەوەیان پەیوەندی هەیە.

بەندی 5

((لەم دوو گەوهەرە،

لایەنگری درۆ، خراپترین کردارەکان هەڵێدەبژێرێت،

وئەوەی پاکترین بیری هەیە،

وبەتیشکی ڕووناهی هەمیشەیی ڕازاوەتەوە،

وئەوەی کە بەبێوەڕی پتەوو کرداری دروستەوە،

مەزدا ئاهورا خۆشحال دەکات،

ڕاستی هەڵێدەبژێرێت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ: ئەوانەی پەیڕەوی لەبیری کرچوکاڵی خراپە، درۆو فریوو دووڕوویی دەکەنو خوو خەسڵەتی ناپاکیان هەیە، ورۆحی ئەهریمەنی بەسەریاندا زاڵ بووەو گیرۆدەی کرداری خراپ دەبنو هەمیشە بەرەو کاری خراپە دەڕۆن. بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەو کەسانەی کە بیریان بەرووناهی هەمیشەیی زانستی خاسو بە گیانێکی پاكو خەسڵەتێکی چاکەوە خۆیان دەرازێننەوە، ئاکاری ئەهریمەنی لەخۆیان وەدوور دەخەنو ڕێگەی راستیو دروستی دەگرنەبەرو تێدەکۆشن بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵگاو بەختەوەری هەموو خەڵک. هەروەها دەفەرموێ: ئەو کەسانەی بیری خۆیان بە رووناکی هەمیشەیی زانست ڕازانبێتەوەو باوەڕیان بە خوای هۆشو دانابێتو خەریکی خزمەتکردن بە کۆمەڵگابنو خەڵک بەختەوەر بکەنو خوا خۆشحال بکەن، بەم کردەوەیەیان، ڕێگەی راستیو دروستی هەڵێدەبژێرن.

بەندی 6

((لەنێو ئەم دوانەدا،

بیرخراپانو گومڕاکان، ڕاستی هەڵێنابژێرن

چونکو لەکاتێکدا کە ڕاڕاو دوو دڵن،

تەفرە دەخۆن،

ودەچنە ڕیزی بیر خراپان،

وپەنا دەبەنە بەر توڕەییو ڕقو کینە،

وژیانی خەڵک دەشێوێنن.))

ئەم بەندەو بەندی پێشوتر، پەیوەندییەکی تەواویان بە یەکەوە هەیە.

لەبەندی پێشوداوێژرا کە پەیڕەوانی درۆو خراپە، کەسانێکی نەزانو بێهۆشن کە گیرۆدەی هەواو هەوەسی ئەهریمەنی بون، ڕێگەی خراپەیان هەڵێبژاردووە. بە پێچەوانەوە، ئەوانەی کە خەسڵەتی پاکیان هەیە، هۆشو بیری خاسیان هەیەو ڕێگەی راستو دروستیان هەڵێبژاردووە.

لەم بەندەدا، هۆی ئەوەی کە بۆچی خراپەکارانو پەیڕەوانی درۆ، ڕێگەی نادروستیان هەڵێبژاردووە، باسدەکاو دەبێژێ:

پەیڕەوانی درۆو گومڕایانو ئەوانەی لەبریتی پەرستنی خوای تاکو تەنیا پەنا دەبەنە بەر خوایانێکی جۆراوجۆر، بەهۆی ڕاڕاییو دوو دڵیو وەسوەسەی ئەهریمەنی دەرونییانەوە، لەکاتی هەڵێبژاردنی ڕێگەی خۆیان، دوچاری بەدگومانی دەبن، ڕێگەی خراپو نادروست هەڵێدەبژێرنو ڕودەکەنە کینەو توڕەیی کە سەردەستەی هێزی ئەهریمەنییە، وخەڵک گیرۆدەی خراپەو تاوان دەکەن.

بێگومان کاتێ بیری خراپ لەتەك توڕەییو کینەدا ئاوێتە دەبێت، ئیدی هەموو شتێکی خراپی لێدەوەشێتەوەو ژیانی معنوی ئادەمیزاد گلآو دەکات.

بەندی 7

((ئەو کەسەی کە ڕێگای چاکە هەڵیدەبژێرێت،

توانایی مینوویی،

ڕامانی پاکو ڕاستی دەست دەکەوێتو

پاکی بەتەنو گیانی ئەو،

پایەداریو توانامەندی دەبەخشێت

بێگومان چونکە ئەو لەلایەنی تۆوە بووە،

لەئەزمونی دژواری ژیاندا

سەردەکەوێت.))

ئەم بەندە، لەتەك بەندەکانی 5، 6 و بەندی هەشتدا، پەیوەندییەکی تەواویان پێکەوە هەیە. خاستروایە هەر چوار بەندەکە پێکەوە بخوێنرێتەوە.

ئەم بەندە، ئاماژە بۆ ئەو کەسانە دەکات کە ڕێگەی ڕاستیان هەڵبژاردووەو دەبێژێ، ئەو جۆرە کەسانە لەنیعمەتی بیری خاسوویژدانی پاکو ڕێگەی ڕاستیو دروستی کە لەدیاردەکانی وەهومەنو ئاشان، بەرخوردارن. ئەوسا (خشەترا)و(ئارمەئیتی)، هێزی معنویو خۆڕاگرتنیان پێدەبەخشێت.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا، ڕاستییەکمان بۆ ئاشکرا دەبێو دەبێژی، ئەو جۆرە کەسانە پاش ئەوەی بەسەر وەسوەسەکانی ئەهریمەنیو ڕاڕاییو دژوارییەکانی ژیاندا سەرکەوتنو زاڵ بون، ئەوسا دەبنە خزمەتگوزارانی ڕاستو دروستی ئاهورامەزدا.

بەندی 8

((و ئەوکاتەی کە،

گومڕاکان سزای خۆیان دەبینن،

ئەوسا، ئەی ئاهورا،

دەسەڵاتو شالیاری تۆ، بەهۆی بیری خاسەوە (وەهومەن)،

بۆیان ئاشکرادەبێت،

وتێدەگەن کە،

چلۆنوێز لەرێی چەوت بێنو رێبازی ڕاستی بگرنەبەر.))

لەبەرئەوەی گومڕایانو درۆزنەکان ڕێی خراپەو کرداری نارەویان بۆ خۆیان هەلێبژاردو بە بیری خراپەوە کەوتنە نێو داوی ئەهریمەنی دەروونییەوە، ویژدانیان ئەشکەنجەیان دەداوژیانیان دەبێتە دۆزەخ. ئەوسا، دەگەنە ئەو راستیەی کە خوای گەورەو دانا سزای خراپەکانیانی بەمجۆرە داوە کە دووچاری ئەشکەنجەی ڕەوانوویژدان بن. ئەوسا، فەرمانی ئاهورامەزدا کە بریتیە لە لەناوبردنی خراپەو ڕووکردنە چاکەو رێگەی راست گرتنەبەر، بەجآ دێنن. بەبۆچونی زەردەشت، لەبەرئەوەی خراپە هەلێقولآوی بیری کرچوکاڵی ئادەمیزاد خۆیەتی، کەوابو، گشت لادراوان لەرێی راستو خراپەکاران، دەکرآ پەروەردەبکرێنو فێری راستی بن.

بەندی 9

((ئەی مەزدا ئاهورا،

هیوادارم کە

خزمەتگوزاری تۆبین،

ولەو کەسانە بین کە هەموو جیهانو ژیان نۆژەن دەکەنەوە.

با:

کاتێك بیروهۆش، گیرۆدەی سستیو خۆڕانەگرتن دەبێ،

ڕاستی(ئاشا) یارمەتیمان بدات،

وبیرمان لەیەکدی نیزیك بکاتەوە.))

ئەم بەندە، تەواوکەرەوەی بەندی حەوتەو دەبێژی کە ئەو کەسانەی پەیڕەوی لەسپەنتامینوو چاکە دەکەن، لەڕیزی خواپەرستان دەژمێردرێنو ڕێبازی ئەوانەیان گرتۆتەبەر کە هەوڵوکۆشش دەدەن بۆ ئاوەدانکردنەوەی جیهانو پێشخستنی کۆمەڵگا.

ئەوەی کە لەم بەندەدا دەستمان دەکەوێت ئەوەیە کە، کەسێك گەر بیەوێت بەهۆی بیرو کارو کرداریەوە ببێتە دۆستو یاوەری ئاهورامەزدا، پێویستە لەسەری لەپێناوی ئاوەدانیو پێشکەوتنی جیهانو پوختەبونی ئادەمیزاد، چاکی مەردایەتی لێبکا بەلاداو خزمەتی خەڵک بکات.

بۆ جآبەجآ کردنی ئەم کارە، دەبێ ڕاستیو دروستی بکاتە پیشەو ڕێبازی خۆی.

بەندی 10

((ئەوکاتەی کە

درۆو خراپە شکست دەخواو تێدەشکآ،

ئەو کەسانەی بەخاسی تێکۆشاون

وبەخۆشناوی ناویان دەرکردووە،

لەکۆشکی پڕ لەخۆشی بیری خاسی مەزداییو ڕاستیدا،

هیواو ئارەزوویان

دێتەدی.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ئاماژە بۆ کاتێك دەکا کە درۆو دووڕوییو ناپاکیو ناڕاستیو گەندەڵی لەجیهاندا بنبڕ دەبێت. ئیدی درۆزنانو خراپەکاران هیچیان لەدەست نایەتو کارێکیان پآ ناکرێت. ئەمەش ئەوکاتەیە کە ڕاستیو پاکی بەسەر درۆو ناپاکی، رووناکی بەسەر تاریکیدا سەرکەوتوو دەبێ.

خاسگەل(چاکان)و ئەو کەسانەی لەنێو خەڵکدا بە خاسی ناو دەبرێن، پاداشتی خۆیان وەردەگرن.

بەکورتی، ئەوکاتەی کە راستیو پاکی جێی درۆو ناپاکی پڕبکەنەوەو لەژێر سایەی خاسگەل کۆششو ململانێیان دژی خراپەکاران سەرکەوێت، جیهان ئاوەدان دەبێو خەڵک بەرەو پێشکەوتن دەڕۆن، وهەموو دنیا تازەو نۆژەن دەبێتەوە. ئەوسا ئیدی دوکانو بازاڕی درۆزنانو خراپەکاران دادەخرێتو چاکان لەنیعمەتی بەهەشت بەهرە وەردەگرن.

بەندی 11

((خەڵكینە،

هەركاتێك لەم یاسایەی مەزدا بڕیاری لەسەرداوە، تێبگەن،

وبزانن كە ڕەنجی درێژخایان سزای درۆزنانو بەدكارانە

وخۆشیو بەختەوەری هەمیشەیی پاداشی پەیڕەوانی ڕاستییە،

ئەوسا، بەهۆی ئەم یاسایەوە

دەگەنە بەختەوەریو رزگاری ڕاستەقینە.))

لەم بەندەدا، زەردەشت پوختەي بۆچونەكانی خۆی بەمجۆرە باسدەكاو دەبێژی:

خەڵكینە، ئەگەر بە تەواوەتی لەبنچینەی ئەو شادیو خۆشیو ڕەنجو بەدبەختییەی كە یاسای سروشت بڕیاری لەسەر داوە ئاگاداربنو ئەمە بزانن كە لەئاكامدا، درۆزنەكانو پیاو خراپان گرفتارو دوچاری سزای درێژخایان (نە هەمیشەیی)دەبنو پیاوچاكانو دروستكرداران و پەیڕەوانی ڕاستیو دروستی، بەهرە لەخۆشیو بەختەوەری هەمیشەیی دەبەن، ئەوسا بەگوێرەی یاسای كردارو دژەكردار رەفتار دەكەنو تێدەكۆشن ڕاستیو دروستی بكەنە پیشەی خۆتانو بێگومان بەختەوەر دەبن.

بەواتەیەكی دیكە، هەركاتێك ئادەمیزاد باوەڕی بەو ئەسڵە بوو كە هەر كردارێك، دژەكرداری خۆی هەیەو، وئاكامی كردارو ڕەفتارو هەڵسوكەوتی خاسو خراپی مرۆڤ خۆیەتی كە شادیو خۆشیو بەختەوەری یا بە پێچەوانەوە، خەمو خەفەتو بەدبەختی بۆ دێنێت، ئەوساكە بەدوی بەختەوەریو رزگاری دەگەرێت.

كاتێك ئادەمیزاد بزانێت هۆی خۆشیو بەختەوەری یا دەردو ڕەنجو ناخۆشی لەژیاندا چین، بێگومان هەولأ دەدا دوركەوێتەوە لەو شتانەی دەبنە هۆی خراپەكاریو ناخۆشی، وڕوو دەكاتە هۆكاری بەختیاری كە جگە لەڕاستیو پاكی، هیچی دیكە نییە.

ئەوەی پتر شایانی باسە لەم بەندەدا، ئەوەیە كە سزای خراپەكاران هەمیشەیی نییە، بەڵام درێژخایانە، وئەمە خۆی لەخۆیدا دادپەروەرێتی خوا دەگەیەنێت كە خراپەكاران بە ئەندازەی خراپیەكانیان سزابدرێنو پاش ئەوەی خراپەكار ماوەیەك لەخانەی درۆ كە هەمان دۆزەخیویژدانە لەم جیهانەدا، واتەویژدانی ئەو كەسەیە، مایەوەوویژدانی دوچاری رەنجو

ئەشکەنجە بوو، ئەوسا پاك دەبێتەوەو ڕاستی هەڵێدەبژێرێتو هەروەك پیاوچاکان ڕزگاری دەبێت.

## سروودی چوارەم

هات 31 ـ بەندی 1

((ئەی عەودالانی زانست،

ئێستا پەیامێکتان پێڕادەگەیەنم،

وئامۆژگارییەکتان دەکەم کەتائێستا

کەس نەیبیژاوەو نەیبیستووە.

بێگومان ئەم ئامۆژگارییانە،

بۆ ئەو کەسانەی بەهۆی بلاوکردنەوەی درۆ،

جیهانی ڕاستی

بەرەو هەڵێدێر دەبەن، ناخۆشە،

وبۆ ئەویندارانی مەزدا، خۆشو شادی بەخشە.))

لەم بەندەدا، وادەردەکەوآ کە زەردەشت پەیامی ئاسمانی پێڕاگەیەندراوەو خەریکی ئامۆژگاریکردنی خەڵکە، لەوەدەچآ کە جەماوەرێکی زۆر بەدەوری پەیامبەر کۆبونەتەوەو قسەیان بۆ دەکات، بۆیە دەبێژی: ئەی ئەو کەسانەی بەدوی ڕاستیدا دەگەڕێن، ئەی ئەو کەسانەی عەودالی زانستنو دەتانەوآ شت فێربن. ئێستا پەیامێکتان پێڕادەگەیەنمو ئامۆژگارییەکتان دەکەم کە تائێستا هیچ کەس نەیبیژاوەو نەیبیستووەواتە پێش پەیامی زەردەشت، لەو کاتەدا بآوێنە بووەو بۆ یەکەم جار باسکراوەو تا ئەوکاتە هیچ کەس لەم قسانەی نەکردووە. هەروەها زەردەشت دەفەرموێ کە ئەم ئامۆژگارییانەی کە لەپەیامەکەیدا باسی دەکات، بەدڵی ئەو کەسانە نییە کە گرفتاری ڕاڕاییو دوودڵی بونو بیری خراپ بەسەریاندا زاڵ بووەو ئەهریمەن وەسوەسەی کردونو لەڕێی ڕاست لایان داوە. بە پێچەوانەوە ئەوانەی کە خاس بیردەکەنەوەو باوەڕیان بە ئافەریدەگاری داناو ژیر هەیە، بەدڵوبە گیان ئامۆژگارییەکانی پەیامبەر وەردەگرن، چونکو دەزانن مایەی بەختەوەرییانە لەم ژیانەو مایەی ڕزگارییانە لەژیانی پاش مردن.

بەندی 2

((لەبەرئەوەی بەهۆی دوودڵیو ڕاڕایی یەوە

هەڵبژاردنی ڕێگەی ڕاستودروست، ئاشکراو رۆشەن نییە،

ئەز، وەك ڕابەرو مامۆستایەك

كە هەڵبژاردەی مەزدایە،

بۆ ڕێنمایی ئێوە نێردراوم،

كە هەردوو دەستە فێربكەم

چلۆن لەژێر سایەی ئاینی ڕاستیدا، بژین.))

لەبەندی پێشودا، زەردەشت مژدە بە خەڵک دەداتو باسی پەیامێك دەكا لە تا ئەوكاتە كەس نەیبیژاوەو نەیبیستووە.

لەم بەندەدا دەبێژێ، لەبەرئەوەی ڕاڕاییو پەیڕەوی لەهەوەسو ئارەزوو، وا لە برێ كەس دەكات، چاكەو خراپە لەیەكدی جیانەكەنەوەو پتر بەرەو كاری خراپو خراپەكاری برِۆن. ئاهورامەزدا، خوای داناو ژیر، فەرمانی پێداوەو هەڵیبژاردووە كە خەڵک(هەموو خەڵک، واتە خاسو خراپ) ڕێنمایی بكاتو لەو بیرە چەوتەی كە هەیانە، ئاگاداریان بكاتەوەو ڕێگەی راستو دروستیان پێشان بدات. لەم بەندەدا، دیسانەوە ئەوەمان بۆ ئاشكرا دەكا كە زەردەشت هەڵبژاردەی خوایەو پەیامبەرەو لەلایەن ئاهورامەزداوە نێردراوە بۆئەوەی ڕێگەی ڕاست پێشانی خەڵک بدا.

لەبەرئەوەی زەردەشت پەیامی ئاهورامەزدای بەگیانو بیری دەرونیەوە گوێ بیست بووە، كەوایە پەیامبەری هەڵبژاردەی خوایە، وە چونكو ڕاستی ئاهورامەزدای لەبیری خۆیدا دیوەو هەستی پێكردووەو بەهۆی هۆشو ئەقڵی خۆیەوە باوەڕی پێهێناوە، فەیلەسوفە. چونكآ ئەم بیرو پەیامەی بە جەماوەر ڕاگەیاندووە، وفێری كردووەن، مامۆستایە. كەوایە لەیەك كاتدا، پەیامبەر فەیلەسوفـو مامۆستایە.

بەندی 3

((ئەی مەزدا،

ئەو بەختەوەرییەی کە لەژێرسایەی رووناکی معنوی،

وبەهۆی پەیڕەوی لەڕاستیو پاکی یەوە،

مژدەیت بە هەردوو دەستە داوە،

وئەو بڕیارەی کە بۆ مرۆی ژیرودانا، داوە

بەهۆی ئامۆژگارییەکانتەوە،

بۆ ئاگادارییمان، بۆمان ئاشکرابکە

بۆئەوەی هەموو خەڵک بەرەو ئاینی ڕاستی بانگهێشت بکەم.))

لەم بەندەدا، زەردەشت، ئاماژە دەکا بۆ ئەو تیشکی معنوی یا ئاگری دەرونیو نوری خواییەی کە لەنێو دڵودەرونی هەموو کەسێکدا هەیەو بەرەو پێشخستنی کۆمەڵگا دەبێتو دەبێژێ:

بەهۆی پەیڕەوی لەراستیو لەژێر سایەی تیشکی رووناکی معنوی، ئەی خوای میهرەبان چیمان پێدەبەخشی؟واتە لەڕێی پەرەسەندنو بەتین کردنی ئاگری دەرون چی ڕازو نهێنی یەکمان بۆ ئاشکرا دەکەیت، کاتێك کە نوری ئیمانو باوەڕ بەخوا لەنێودڵی ئادەمیزاددا پتر دەبیو کلپە دەسێنآ، ولەکاتێکدا کە خۆپەرستیو کینەو ئارەزووی مادیو دەرونی خستە لاوەو ڕێی ڕاستو دروستی هەڵبژارد، ئەوسا دڵی بە نوری ئیمان رۆشەن دەبیو فرە لەڕازو نیازی گیتیی بۆ ئاشکرا دەبیو بەختەوەریو خۆشی ڕوی تێدەکات.

زەردەشت گەرەکێتی بزانێت کە ئەو بەختەوەریو خۆشییەی تەنیا لەڕێی ڕاستیو دروستیو پاکی بەدەست دێتو هەموو خەڵک بەبێشو خراپ، خواپەرستو بت پەرستیەوە دەیانەوێت پێی بگەن چییەو پاداشتی هەردوو دەستەی چاکـو خراپ چلۆنە.

هەروەها، پەیامبەر دەیەوێت بزانێت چارەنووسی هۆشمەندانو زانایان کە باوەڕیان بەبوونی خوا هەیە چییە؟

زەردەشت ئەم زانیاریانەی بۆ ئەوە دەوێت کە بتوانێت بەهۆی ئەوەوە خەڵک هوشیار بکاتو بەرەو ئاینی ڕاستیو زانیاری بەرێت.

بەندی 4

((ئەی مەزدا،

وئەی نەمرە پاکەکان (ئەمشاسپەندان)،

کەوایە، ئێمە داوای ڕاستیو پاکی

وخاسترین ئەندێشە دلخوازەکان

وتوانایی مەعنەوی بەهێزدەکەین،

تا بە ڕاگەیاندنو چەسپاندنی ئەمانە،

بەسەر درۆدا سەرکەوین.))

لەم بەندەدا، زەردەشت داوای کۆمەڵو یارمەتی لەئاهورامەزداو دیاردەکانی (ئەمشاسپەندان) دەکات تا بتوانێت بە پتەوکردنو بەهێزکردنی سیفاتی ئاهورایی (ئاشاو ئارمەئیتیو وەهومەن)، واتە ڕاستیو پاکیو دڵۆڤانیو خۆشەویستیو باوەڕ بە خواو بیری خاسو پاك، هێزو توانای معنویی بەهێزبێتو بەرامبەر درۆزنانو خراپەکاران خۆی ڕابگرێتو بەسەریاندا زاڵ بێت. ئادەمیزاد بۆئەوەی بەسەر خراپەو ئارەزووی مادیو سیفاتی ئەهریمەنیدا سەرکەوێت، دەبێ هێزوتوانای معنویو سیفاتە خاسەکان لەنێو دەرونی خۆیدا لەهەموو ناپاکیو ژەنگوژار پاك بکاتەوە، ڕاستیو دروستی بکاتە پیشەی خۆی، باوەڕی تەواو سەنگی بەخوا هەبێتو دیاردەکانی راستیو پاکیو خۆشەویستی خەڵکو بیری خاس لەخۆیدا بەهێز بکاتو خۆی بگەیەنێتە ڕادەی پوختەیی.

بەندی 5

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئاگادارم بکە

تا لەرێگەی ڕاستیو بیری خاسەوە

ئەو ئایینەی کە

بۆمن خاسترینە، هەڵێبژێرم

وبەهرە لەپاداشتەکەی وەربگرم.

وئەوەی (ڕویداوە)و ئەوەی(ڕوو دەدات) ببینم.))

زەردەشت بۆ هەڵێبژاردنی خاسترین ڕێگەو شێوەی ژیانو گەیشتنە ڕزگاریو بەختەوەری داوای یارمەتی و هاوکاری لەئاهورامەزدا دەکاتو دەیەوێت هەر شتێك کە پەیوەندی بە یاسای راستی (ئاشا) هەیەو بۆ سوودو قازانجی کۆمەڵگا دەشآ لًی فێربێت. هەروەها توانایيو هێزی پێبدات بۆئەوەی بتوانێت بەهۆی بیری رۆشەنو هۆشەوە ئاگاداری ئەو پاداشتە بێت کە پێی خەلات دەکات.

هەروەها گەرەکێتی لەو شتانەی ڕویداوەو یا ڕوو دەدات ئاگاداربێت بۆئەوەی بتوانێت خاستر پەیامەکەی خۆی ڕابگەیەنێتو جەماوەر بەرەو ڕێگەی ڕاست بەرێت.

ئەم بەندە ئەوەمان بۆ ڕوندەکاتەوە کە پەیڕەوی لەراستيو دروستيو پاکی بآ پاداشت نامێنێتەوەو ئەم پاداشتە مرۆڤ بەختەوەرو شاد دەکات.

بەندی 6

((خاسترین جۆری پاداشتەکانو بالآترین پلەی بەختەوەری،

بۆ ئەو دانایە دەبێت،

کە پەیامی ڕاستەقینەو ئامۆژگاریە پاکەکانم

کە خەڵک بەرەو پوختەيیو نەمرێتی دەبێت،

بەهەموان ڕادەگەیەنێت.

مەزدا ئاهورا،

بەهۆی بیری خاسەوە

هێزو توانای ئەو کەسانە پتر دەکات.))

زەردەشت، لەم بەندەدا بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕون داوا دەکا کە ئاینی ڕاستی بڵاوبکرێتەوەو پەرەی پآ بسێنرآو ئارەزووی بەختەوەری‌و خۆشی‌و باڵآترین پلەوپایە دەکا بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم پەیامە بڵآودەکەنەوەو هەوڵ‌وکۆشش دەدەن بۆ پەرەسەندنی راستی‌و دروستی لەنێو کۆمەڵگادا. هەروەها دەبێژێ هەرکەسێك کە خەڵک هاندەدا کە رێبازی راستی بگرنەبەرو دووربن‌و لەخراپەکاری، خوا هێزوتوانای معنوی پێدەبەخشێ‌و یارمەتی دەدات بۆئەوەی بە ئارەزووە ئاواتەکانی بگات. (بێگومان ئەم هێزوتوانای معنوییە بەهۆی بیری خاس‌و پاکەوە پتر دەبێت.))

بەندی 7

((ئەو یەکەمین بیرەوەرێکە

کە لەسەرەتاوە، لەرووناهی خۆیەوە،

گشت کەشکەڵآن‌و جیهانی بوونی ڕووناك کردۆتەوە،

وبەهۆی هۆش‌و ئەقڵی خۆیەوە یاسای ڕاستی بەدیهێنا،

بۆئەوەی هەمیشە پالێپشت‌و یاوەری بیرخاسان بێت.

ئەی مەزدا ئاهورا، کە هەمیشە نەگۆڕو یەکسانی

بەهۆی رۆحی پیرۆزی خۆتەوە

هێزی باوەڕ لەدڵماندا پترو پتەوبکە.))

موبد فیروز ئازەرگوشەسب، دەبێژێ ئەم بەندە یەکآ لەدژوارترین بەندەکانی گاتاکانە، هەریەك لەئاوێستا ناسان بەگوێرەی بۆچونی خۆیەوە باسی لێکردووەو شیکردۆتەوەو هەڵیسەنگاندووە. لەم بەندەدا، زەردەشت، ئاهورامەزدا بە یەکەمین بونێك دەزانێت کە بەهۆی هۆش‌و دانایی خۆیەوە نەخشەی ئافراندنی داڕشتووەو هەسارەکان‌و گشت کەشکەلآنی بەرووناکی خۆیەوە رۆشەن‌و دروست کردووە.

لەڕاستیدا، ئەم بەندە ئەوەمان بۆ ڕوندەکاتەوە کە خۆرو مانگ‌و هەسارەکان‌و و گشت کەشکەلآن پرشنگێکن لەرووناکی کە لەسەرچاوەی ڕوناهی ئاهورامەزدا هەڵێقولاون. یاخود بەواتەیەکی دیکە، خوای بەهۆش‌و ئەقلی تەواو سەنگ داناوەو هەموو (بوون)و جیهانی مادی‌و زەوی‌و ئاسمانەکان بە بەشێك لەبیروهۆشی تەواو سەنگی ئەو دەزانێت. هەروەها بۆئەوەی تەکوزی

لەهەڵێسوراندنی سروشتدا هەمیشەیی بێت، خوای بیروهۆش یاسای ڕاستی (ئاشا)، کە یاسایەکی هەمیشەییو نەگۆڕە، داناوە بۆئەوەی هەموو شتێك ڕێبازی ئاساییو سروشتی خۆی بگرێتەبەر چونکو هەموو لادانێك لەراستیو دروستی لەتەك یاسای سروشتدا دەبێتە هۆی کاردانەوەیەکی یەکجار سەختو دژوار، ولەوانەیە بە هەڵێدێرمان بەرێتو هەموو (بوون) بەرەو نەبوون بەرێت. لەکۆتایی ئەم بەندەدا، زەردەشت دەفەرموێت:

ئەی مەزدا ئاهورا، ئەی خوای داناو ژیر، رووناکی باوەڕو ئیمان بخەرە دڵمان بۆئەوەی خاستر بتوانین بتناسینو لەکاتی پێویستدا پەنات بۆ بەرین بەرتو تەنیا داوای یارمەتی لەتۆبکەین.

بەندی 8

((ئەی مەزدا،

ئەوکاتەی کە بەئەندێشەوە تۆم ناسی،

بۆم ڕونبۆوە کە

تۆ، سەرەتاو پاشینەی هەموو (بوون)ی،

وتۆی سەرچاوەی بیری خاس

وئەوکاتەی کە بەدیدی دڵەوە تۆم دی،

زانیم کە تۆی ئافەریدەگاری ڕاستەقینەی ڕاستی

وتۆی داوەری کرداری هەموو خەڵک.))

ئەم بەندەش، هەروەك بەندی پێشوتر باسی وەسفی خوادەکات. ئاهورامەزدا بەسەرەتاو ئاکامی هەموو(بوون)و سەرچاوەی بیری خاسو راستیو دروستی دەزانێت، هەروەها بەدادوەری هەموو کاروکرداری خاسو خراپ لەم جیهانی بوونە دەناسێت.

زەردەشت، خوای گیانو هۆش بەبیرو هۆشی تەواوسەنگ دادەنآـ ئافەریدەگاری هەموو بوون ــ دابین کەری تەکوزیو یاسای سروشت ـ هێزووزەی هەمیشەییو سەرەتاو ئاکامی جیهانی بوون ـ سەرچاوەی هەموو خاسیەکانووبیری چاکو دیاردەی راستیودروستی دەزانێت، تەنیا ئەو بەشیاوی دادوەرێتی ڕەفتارو کرداری خەڵک دەزانێ، هێزێك کە دیاردەی خاسیو پاکی بێت بێگومان دادوەرێکی دادگەرو میهرەبانە، ستەمکارو زالێم نییە.

ئەوەی لەم بەندەدا پتر سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە زەردەشت دەبێژێ:

دەبێ بەهۆی بیرو هۆش‌و بیناییەکی تەواوەوە خوا بناسین‌و هەست بەهێزو توانای بکەین، چونکو خوا شتێك نییە کە تەنیا بەهۆی پێنج هەستکارەکانمانەوە (حواس) هەستی پێبکەین، یا جێگەو شوێنێکی تایبەتی بۆ رەچاو بکەین. هەروەها زەردەشت، ئاهورامەزدا بەسەرچاوەی راستی‌ودروستی‌و پاکی‌و خۆشەویستی‌و وەفا باسدەکات‌و دەبێژێ کە مەزدا باٚ کەموکوڕییەو بێخەوشە.

بەندی 9

((ئەی مەزدا ئاهورا،

بۆم ئاشکرابووو تێگەیشتم کە

ئارمەئیتی‌و پاکیش لەتۆوەیە

تۆی ئەو ئەقلێو هۆشە معنوییەی جیهانت دروستکرد

تۆ، ئازادی هەلێبژاردنی رێگەت بە خەڵک داوە

تا ڕابەری ڕاستەقینەی خۆیان هەلێبژێرن،

ولەڕابەرە درۆزنەکان دوربکەنەوە.))

ئەم بەندەش، هەروەك دوو بەندەکانی پێشوو، باسی هێزوتوانایی ئاهورامەزدا دەکات.

ئارمەئیتی کە دیاردەی باوەر(ئیمان)و فیداکاری‌و دلۆڤانییەو لەرووناکییە تایبەتییەکانی ئاهورامەزدایەو پەروەردەکردنی ئەم دیاردەیەی بە ئامرازو هۆی گەیشتنە ڕادەی باٚخەوشێتی داناوە.

ئاهورامەزدای خوای ئەقل‌و هۆش لەم بەندەدا بەئافەریدەگاری هەموو گێتی‌و خاوەنی ئەقل‌و هۆشی تەواوسەنگ دانراوە.

لەم بەندەدا، دووبارە هەروەك بەندی دوهەم لەهات 30، باسی ئەوە دەکا کە ئادەمیزاد ئازادە لەهەلێبژاردنی رێگەی ژیانی خۆی‌و دەبێژێ مرۆ ئازادەو دەتوانآ پەیڕەوی لەرابەرێکی راست‌و پاك بکات‌و لەئاکامدا بەختەوەر بێت یاخود فریوی درۆزنان‌و ئەو کەسانەی گورگ سیفەتن‌و لەبەرگی پەزدا خۆیان دەنوێنن، لەڕێی راست وەدوورکەون‌و رێگەی چەوت بگرنەبەرو لەئاکامدا بەدبەخت‌و چارەڕەش بن.

بەندی 10

((ئەوسا، مرۆ دەبێ

لەنێوان ئەم دوانەدا،

رابەرێکی ڕاست بۆخۆی هەڵبژێرێت

کە دروستکرداربێت،

وبیری خاس بڵاوبکاتەوە.

ئەی مەزدا،

هەرگیز ڕابەرێکی فریوکارو تەڵەکەباز

هەرچەندە بەدرۆ خۆیواپیشان دەدا کە ڕاستوپاکە

ناتوانێت پەیامی تۆ ڕابگەیەنێت.))

لەبەندی پێشودا، زەردەشت ئازادییەکی تەواوی داوە بە خەڵک کە بەگوێرەی بیروبۆچونی خۆیان رێگەی ژیانیان هەڵبژێرن. هەروەها دەربارەی پەیڕەوی کردن لەڕابەری راستکردارو دروست پیشەیش ئامۆژگاری خەڵکی کردووە. لەم بەندەشدا دوبارە دەبێژێتەوە، ئادەمیزاد دەبێ بەهۆی بیروویژدانو هۆشی خۆی، ڕابەری ڕاستەقینەو دروستکردارو خاوەن باوەڕو بیری خاس هەڵبژێرێتو پەیڕەوی لەکاروکرداری بکاتو ئامۆژگارییەکانی ئەنجام بدات. نابێ فریوی درۆزنانو ڕیاکارانو دووڕوان بخۆن. هەروەها داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە هێزوتوانا بەو جۆرە ڕابەرە درۆزنانە نەدات، بۆئەوەی نەتوانن بە فێڵو تەڵەکە، خەڵک لەڕێی راست لابدەن.

بەندی 11

((ئەی مەزدا،

هەر لەوساتەوەو لەسەرەتاوە کە

بەبیروهۆشی خۆتەوە،

ژیانوویژدانو هۆشت بۆ دروستکردوین،

گیانت کردە نێو لەشمان،

وتوانایی گفتوگۆو کارکردنت پێبەخشین،

هەر لەوکاتەوەویستت کە ئێمە بە شێوەیەکی ئازاد

باوەڕو ڕێو ڕەوشی ئاینی خۆمان هەڵبژێرین.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ کە ئاهورامەزدای خوای گیانو هۆش، ئادەمیزادی ئافراندووە، رۆحی نەمرو هەمیشە زیندوی کردۆتە بەر لەشی مادیو کاتی، هێزوتوانای بیرکردنەوەو قسەکردنو توانایی کارکردنی پێبەخشیوین.

گرنگترین بەهرەی پێداوین کە بریتییە لەئازادیو ئازادی هەڵبژاردنی ڕێگەو چونیەتی ژیان

لێرەدا دەبێ دوپاتی بکەینەوە کە زەردەشت هەزاران ساڵ لەمەوبەر بایەخێکی یەکجار زۆری بە ئازادی داوە، دەبێژێ، ئادەمیزاد ئازاد هاتۆتە جیهانو لەبەر ئەوەی توانای بیرکردنەوەی هەیەو دەتوانآ بیری خۆی بەیان بکات، دەبێ بە شێوەیەکی ئازادانە ئەو ڕێگەیەی کە هۆشو بیری خۆی هەڵیدەبژێرێت، هەڵبژێرێت. بەندەو کۆیلەی هیچ کەس نەبێت، سەربەرزو عەگیدو جوامێربێتو ڕێز لەئازادی هەموان بگرێت.

بەندی 12

((بەم شێوەیە، هەرکەسێك،

چ ڕاستبێژبێت یا درۆزن،

چ زانا بێت یا نەزان،

ئەوەی لەبیرو مێشکیدایە

بەشێوەیەکی ئازادانە ئاشکرای دەکاو دەیبێژی

وهەرکاتێك کە

ئەندێشە گیرۆدەی دوودڵیو ڕاڕایی بو،

ولەنێوان ئەم دوو باوەڕەدا حەپەسەواو قەتیس ما

ئەوسا، ئارمەئیتی، بەدەم هاوریانەوە دێتو

ڕێنماییان دەکات.))

هەروەکو لەکۆتایی بەندی پێشودا بێژرا، زەردەشت جەختی لەسەر ئازادی دەربڕینی بیروباوەڕ کردووە. لێرەدا دەبێژی کە هەموو کەسێك راستگۆ بێت یا درۆزن، زاناو دانابێت یا نەزان، هەموان دەبێ مەرامو ئاینو باوەڕی خۆیان بە ئازادی دەربڕن.

بێگومان لەهەموو کاتێكو شوێنێكدا، کەسانێك بە بیستنی باوەڕی جۆراوجۆر دوچاری سەرسامی دەبنو دۆش دادەمێننو نازانن چ بکەن، وکام ڕێگا هەڵبژێرنو دوای کـآ بکەون. لێرەدایە کە فریشتە ئارمەئیتی(دیاردەی ئیمانو باوەڕو فیدارکاری) بەدەم هاوارو خواستیانەوە دێتو یارمەتییان دەدا کە رێگەی راستودروست هەڵبژێرن.

بەندی 13

((ئەی مەزدا،

ئەتۆ، لەهەموو بیروکردارێکی

ئاشکراو نهێنی هەموان ئاگاداریت،

ئاگاداری ئەو کەسەی کە بۆ رزگاربون لەگوناهێکی بچوك،

همە جۆرە سزایەك تەحەمول دەکا.

تۆ هەموو شتێك بەچاوی تیژەوە چاودێری دەکەیت،

وبەهۆی یاسای راستی (ئاشا)یەوە

بەووردی سەرنجی گشت شتێك دەدەیتو دەیبینی.))

لەم بەندەدا، زەردەشت باسی هێزوتوانای ئاهورامەزدا دەکاو دەبێژی:

مەزدا ئاگادرە لەهەموو هەڵسوکەوتو بیری ئادەمیزاد، ئاشکرا بآ یا نهێنی، چاک بێت یا خراپ، هەروەها ئاگای لەنهێنیەکانی هەناوویژدانی هەموانە. ئاهورامەزدا ئاگادارە لەنیەتی ئەو کەسانەی بۆ لێبوردن لەگوناهەکانیان پەنای بۆ دەبەنو تەحەمولی هەمە جۆرە دژوارییەكو ئەشکەنجەی رەوانی دەکەن.

لەپاشاندا دەبێژێ هیچ کاروکردارو بیرێکی ئادەمیزاد لەچاوی تیژبینی ئاهورامەزدا وەدوور نییەو بەگوێرەی یاسای (ئاشا)، چاودێری هەموو بیرو کرداری ئادەمیزادە.

ئەوەی لەم بەندەدا پتر سەرنج ڕادەکێشآ، یاسای راستی (ئاشا)یە کە لەهەموو شوێنێکداو بەسەر هەموو شتێکدا خۆی دەنوێنآ.

یاسای (ئاشا)، یاسایەکی راستەو نەگۆڕە، یاسایەکی سروشتییە، هەرکەسێك بە پێچەوانەی ئەو یاسایە کردارێك بنوێنآ، بێگومان گیرۆدەی سزایەکی توند دەبێت.

زەردەشت، کاتێك کە دەبێژێ ئاهورامەزدا لەهەموو کارێکدا بەگوێرەی یاسای (ئاشا) چاودێری دەکات، مانای ئەوەیە کە هەموو کارێك بەگوێرەی یاسای ڕاستی ڕەچاو دەکاو هەڵیدەسەنگێنآ، یاخود بە مانایەکی دیکە، یاسای ئاشاو یاسای پێشکەوتنو پوختەیىو ئادەمیزاد، پێوەری چاکەو خراپەیە.

بەندی 14

((ئەی مەزدا،

پرسیارت لێدەکەم:

لەتۆماری ژیانی خەڵکـو ئاکامیان

ئاگادارم بکە،

لەڕابووردودا، چ ڕویداوەو لەپاشەڕۆژدا چ ڕوودەدات

چ پاداشتێك بۆ پەیڕەوانی ڕاستی ڕەچاوکراوە؟

وبۆ خراپەکاران، چ سزایەکیان بۆ دانراوە.))

هەروەکو پێشوتر باسمان لێکرد، زەردەشت، پێش ئەوەی پەیامی ئاسمانی پێرابگەیەنرێتو لەلایەن ئاهورامەزداوە بە پەیامبەرێتی هەڵیببژێرێت، لەو بارودۆخەی کۆمەڵگای ئەوکاتە پیایدا تێدەپەڕاو خەڵک دوچاری گرفتێکی یەکجار زۆر بوبون، بیری لەکێشەو گرفتارییەکانی خەڵک دەکردەوەو بۆئەوەی بگاتە ئەو ڕاستیەی کەوا ئادەمیزاد چلۆن دەتوانآ بەختەوەربێتو گرفتەکانی کۆمەڵآیەتی چۆن چارەسەربکات، چەندین ساڵ لەخەڵک دورکەوتەوە بۆئەوەی تێبفکرێتو بیر لەڕازی چونیەتی دروستبونی ژیان بکاتەوە.

لەم بەندەو سآ بەندی داهاتودا، زەردەشت بیر لەم پرسیارانە دەکاتەوە کە بەبیریدا هاتووەو وەڵامی ئەم پرسیارانە لەویژدانی پاکو ڕۆشەنی خۆی دەخوازێت، بۆیە دەبێژێ: ئەی خوای داناو ژیر، تۆ ئاگاداریت لەو شتانەی ڕویداوەو ڕوودەدات، ئایا ئاکامی پیاوچاکانو خراپەکاران چییەو پاداشتو سزایان چییەو لەرۆژی پەسلآندا چلۆن لەتەکیاندا رەفتار دەکرێت؟

زەردەشت ئەم جۆرە پرسیارانەو پرسیاری دیکەش لەخۆی دەکاتو وەڵامەکانی لەبەندەکانی داهاتودا دەبینین.

بەندی 15

((ئەی ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم:

سزای ئەو کەسەی کە خراپەکارو بەدکار بەهێزوپتەو دەکا

چییە؟

وکەسێك کە لەژیانیدا،

جگە لەئازاردانی ڕابەری دروستکردار

ودوورخستنەوەی خەڵک لێ، کارێکی دیکەی نییە

چ سزایەکی بۆ ڕەچاوکراوە؟))

ئەم بەندە تەواوکەرەوەی بەندی پێشووە. زەردەشت بەردەوامە لەسەر پرسیارەکانیو دەیەوێت بزانێت سزای ئەو کەسانەی کە درۆزنو پەرە بەدرۆزنی دەدەن لەنێو خەڵکدا، چییە. هەروەها

گەرەکێتی بزانێت سزای ئەو کەسانەی هیچ کارێکیان نییە جگە لەدوورخستنەوەی جەماوەر لەڕابەرە راستەقینەکان.

ئەم بەندە ئەوەمان پێشان دەدات کە لەپەیامی زەردەشتدا، تەنیا درۆکردنو کارە نارەوکان گوناه نییە، بەڵکو هاریکاری لەتەك بیر خراپانو یاریدەدانی خراپەکارانیش گوناهی گەورەیەو سزای تاوانی ئەو جۆرە کەسانە دەبێ بدرێت.

بەندی 16

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم:

کەسێك کە بەدانایيو بیری خاسەوە،

تێدەکۆشێت بۆ

بلآوکردنەوەی ئاینی ڕاستيو ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگا،

کەيو چلۆن دەتوانآ لێت نیزیکبێتەوەو بگاتە لات؟))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ ئایا ئەو کەسانەی کە بەنیەتی پاکو بە ئەقلأو هۆشەوە، هێزو توانای خۆیان بەکاردێنن بۆ پێشخستنی کۆمەڵگاو شارودآ، وخزمەتکردنی جەماوەری. بەدڵوبە گیان هەول دەدەن بۆ دابین کردنی راستيو دروستی، ئایا ئەم جۆرە کەسانە دەگەنە ئارەزووی خۆیان کە بریتیە لەنیزیك بونەوە لەخوای ئافەریدەگار یا نە؟ لەپاشان دەپرسآ، ئەی مەزدا، کەيو چلۆن ئارەزووەیەکی وەها دێتەدی؟ ئادەمیزاد دەبێ چ بکات بۆئەوەی بەم ئارەزووەی بگا؟.

ئەوەی لەم بەندەدا تێدەگەین ئەوەیە کە زەردەشت رێگەی نیزیکبونەوە لەئاهورامەزدا بەخزمەتکردنی کۆمەڵگاو هاریکاری لەپێناوی پێشخستنو بلآوکردنەوەی راستيو دروستی دەزانێت.

بەندی 17

((لەنێوان مرۆی پاكو ناپاكدا،

كامیان ڕێبازی دروستیان هەڵبژاردووە؟

مرۆی داناو ڕووناكبین دەبێ

خەڵک هۆشیار بکاتەوەو ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕۆشەن بکات

بۆئەوەی ئەو بآ فەڕە لادەرانە نەتوانن

خەڵک تەفرە بدەنو گومڕایان بکەن

ئەی مەزدا ئاهورا،

تۆ بۆ ئێمە

مامۆستاو ڕێنمای بیری خاس بە.))

لەسەرەتا زەردەشت دەپرسآ کام ڕێگا خاسترە، ئەو ڕێگەیەی کە پیاو چاکان خەریکی ئاوەدانیو پێشخستنی کۆمەڵگانو تێدەکۆشن بۆ بەختەوەری خەڵک، یا ئەو ڕێگەیەی کە خراپەکاران گرتویانەتە بەر بۆ لەناوبردنوویرانیو دواخستنی کۆمەڵگا.

هەروەها دەبێژێ کە مرۆی داناو ژیر دەبێ بە ئەقڵو هۆشی خۆیەوە ڕێگای ڕاستی پیشانی خەڵک بدات بۆئەوەی ئەوانەی تێنەگەیشتونو نەفامن، بەبێ هۆشیو نەفامی نەمێنەوەو ڕاستیان بۆ ڕوون بێتەوە.

زەردەشت لەم بەندەدا سوورە لەسەر ئەوەی کە پێویستە لەسەر مرۆی داناو ژیر ئامۆژگاری خەڵک بکاتو ڕێگەی ڕاستو دروستیان پیشان بدات، وگومڕاکان بخاتەسەر ڕێی ڕاست.

بەندی 18

((کەواتە باهیچ کەسێك لەئێوە،

گوێ بیستی

فەرمانو گوفتاری خراپەکارانو درۆزنان نەبێت،

چونکو، بێگومان درۆزنان

ماڵأو گوندو شاروێران دەکەن.

کەوایە، بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە،

ڕاوێستنو ململانێیان لەتەکا بکەن.))

لەم بەندەدا، زەردەشت جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە دەبێ خۆمان دووربخەینەوە لەخراپەکارانو درۆزنانی نێو کۆمەڵگاو گوێ بیستی قسەیان نەبین، ودەستورەکانیان ئەنجام نەدەینو پوچەڵیان بکەینەوە، چونکو ئەم جۆرە کەسانە تەنیاوێرانی کۆمەڵگایان مەبەستەوهیچی دیکە. لەبەرئەوە دەبێ هەموو کەسێك بەرامبەر ئەم جۆرە کەسانە خۆی بە چەکی ڕاستیو دروستیو پاکی چەکدار بکاتوبیری کرچوکاڵیان پوچ بکاتەوە.

ئەوەی لەم بەندەدا لـآی فێردەبین ئەوەیە کە هەرگیز نابێ خۆمان بدەینە دەست خراپەکارانو درۆزنان، وزەبونو ملکەچی دەستورەکانیان بین، بەڵکو پێویستە هەمیشە لەململانێو جەنگدا بین، ودژیان ڕاوێستین، بەلآم بە چەکی ڕاستیو پاکیو دلۆڤانی کە خاسترینو کاراترین چەکن بۆ لەناوبردنی ئەم جۆرە بیرانە.

بەندی 19

((ئەی مەزدا ئاهورا،

باهەموو کەس

گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی دانایەك بن کە

خاس بیردەکاتەوە،

چارەسازی ژیانی خەڵکە،

ولەئامۆژگارییە ڕاستەقینەکانیدا، تواناو دەم پاراوە،

ولەژێر سایەی پرشنگی رووناکی تۆوە

جێگەی هەردوو دەستە، دیارو رۆشەن دەکات.))

لەم بەندەدا، زەردەشت داوا لەخەڵک دەکات گوێ ڕابگرن بۆ قسەی داناو بیرخاسانو ئامۆژگارییەکانیان وەربگرن، چونکو پیاوی دانا وەك پزیشکێكوایە کە نەفامانو دواکەوتوانو بیرخراپان دەرماندەکات، ورۆحو ڕەوانی نەخۆشەکان بەهۆی نوری زانستو حیکمەت شادو زیندوو دەکاتەوە، ومەلهەمی دەردو ئازاری ژیانی خەڵکن.

هەروەها زەردەشت لێرەدا جەخت لەسەرئەوە دەکا کە دەبێ گوێ بۆ ئەو کەسانە شل بکرێت کە توانای بلآوکردنەوەی ئاینو باوەڕی ڕاستیو دروستی یان هەبێتو دەم پاراوو روشەنبیربن.

بەندی 20

((ئەو کەسەی ڕاستی هەڵدەبژێریو ڕوودەکاتە ڕاستبێژان،

جێگەو مەلێبەندی، کۆشکی رووناکی دەبێت.

وئەو کەسەی درۆزنو خراپەکارە

تا ماوەیەکی زۆر

دۆش داماو دەبێو شیوەنو زاری پیشەی دەبێتو

لەتاریکیدا دەژی.

دووچاری ئاکامێك دەبێ کە

بەهۆی دیدوویژدانو خراپەکارییەکانی خۆیەوە پێی دەگاتەوە.))

دەتوانین بێژین کە ئەم بەندە وەڵامی پرسیارەکانی بەندەکانی (15و16)ەیە کە تیایدا بە ئاشکراو ڕاشکاوی وەڵام دراونەتەوە، ودەبێژی کەسێك کە لەژیانیدا رێگەی راستی هەلێبژێرێتو بە پاکی بژی، جێگەی بەهەشتە، بەلآم درۆزنو خراپەکار، جێگەی دۆزەخە.

لەڕوانگەی زەردەشتەوە، بەهەشت بریتییە لەکۆشکی ڕووناکیو جێگەی باشترینو پاکترین بیرە، دۆزەخ تاریکترین جێگەیە کە شوێنی درۆزنانو خراپەکارانە، ویژدانی بآ ئۆقرە، ژیانی مرۆڤی گوناهکارو خراپەکار دەکاتە شەوی تاریکوتار. ئەم تاریکەشەوەی ژیان، مرۆی بەدکار بەدەستی خۆی بۆ خۆی دەخولێقێنآ، دۆش دادەمێنێو پەلەقاژە دەکا بۆ ڕزگاربون، بەلآم بیری

ڕەش‌و کرداره خراپەکانی، ماوەیەکی زۆر وەك بەربەستێك ڕێگەی ڕاستی لێدەگرێت، تا بەرەبەره پەشیمان دەبێتەوەو ئاوات دەخوازآ کە لەم بارودۆخە ڕزگاری بێت. ئەم پەشیمانییە لەبیرو کردارەکانی ڕابووردووی، دەرگای دڵی بۆ ڕووناکی ڕاستی‌و پاکی دەکاتەوەو بەرەبەرە چاوو دڵی ڕووندەبێتەوەو مانای ژیانی ڕاستەقینەی بۆ ئاشکرا دەبێت‌و بەرەو ڕێگەی ڕاستی‌و دروستی‌و پاکی هەنگاو هەڵێدێنآ بۆئەوەی لەوەودوا ڕزگاری بێت‌و بەختەوەربآ.

دووبارە لەم بەندەدا، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە سزای خراپەکاران هەمیشەیی نییە، وماوەیەك دەخایەنآو پاشان ئەوانیش دوای پەشیمانی ڕزگاریان دەبێ.

کەوایە، دووپاتی دەکەینەوە کە لەڕوانگەی زەردەشتەوە، بەهەشت‌و دۆزەخ، بریتین لەئارامی‌و نائارامی بیروویژدانی ئادەمیزاد خۆی. خراپەکاریش بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، دووچارو گیرۆدەی ئەشکەنجەی‌ویژدان دەبێت، پاشان ئەویش ڕزگاری دەبێت.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە، بیرخاسان زووتر دەگەنە ئەو کۆشکی ڕووناکییە کە بریتیە لەئاسودەیی‌ویژدان.

بەندی 21

((مەزدا ئاهورا،

بەهۆی ئەقڵ‌و هۆشی تەواوسەنگی خۆیەوە،

پوختەیی‌و نەمرێتی،

ڕاستی‌و توانایی معنوی‌و بیری خاس

بە کەسێك خەڵات دەکاو دەبەخشێت

کە لەڕوی بیروکردارەوە، دڵی پێببەستن.))

لێرەدا، زەردەشت دەبێژێ:

ئەو کەسانەی بەرۆح‌و کردەوەوە، ولەڕوی بیرو هەڵسوکەتییەوە ئەمەکداری ئافەریدەگاربن‌و باوەڕیان پێی بێت، وهەرگیز لەژیانیاندا دژی ڕاستی‌و دروستی هەنگاو هەڵێنەهێنن.

بەخشیش‌و خەلاتی ئاهورامەزدایان پێدەبەخشرێت کە بریتییە لە:

پوختەیی‌و بآخەوشێتی، نەمرێتی، ڕاستی، توانایی‌و بیری خاس.

بەندی 22

((ئەم ڕێبازو ئاینە،

بۆ دانایەك كە بەهۆی بیرو هۆشیەوە تێدەگات،

وبەهێزی معنوی‌و گوفتارو كردار

هەست بەڕاستی دەكات‌و پشتیوانی لێدەكات،

ڕۆشەن‌و ئاشكرایە.

ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەم جۆرە كەسانە، لەلایەن تۆوە لێهاتووترین

یاوەرو ڕێنمای خەڵكن.))

لەم بەندەدا دەبێژێ: ئەو كەسانەی داناو هۆشیارو ژیرن، وهەروەها بیرەوەران‌و ڕووناكبیران ئاگایان لەیاسای ئیزەدییەو بەبیرو‌ویژدانێكی پاكو ڕۆشەنەوە، هەست بەڕاستی دەكەن، بە هەموو هێزو توانایانەوە داكۆكی لەڕاستی‌و دروستی‌و پاكی دەكەن، وهەوڵ‌وكۆشش دەدەن بۆ بلآوكردنەوەی ئاینی ڕاستی‌و دروستی. هەرگیزوتەی خۆیان ئاوێتەی درۆو ناڕاستی ناكەن‌و كرداری خۆیان بەكردەوەی لێنەهاتوو خراپەوە پیس ناكەن.

زەردەشت، ئەم جۆرە مرۆڤە ژیرو هۆشیارانە، كە راست كردارو شیرین‌و پاك گوفتارن، بە لێهاتوترین یارو یاوەری جەماوەری خەڵك دەزانێت، وبەبێشترین دۆست‌و ئەمەكداری ئاهورامەزدا دەناسێت.

## سرووودی پێنجەهەم

یەسنا ـ هات 32 ـ بەندی 1

((ئەی مەزدا ئاهورا،

بۆ گەیشتنە دوندی بەختەوەرییەکان،

کەسوکارو هاوکارانو یاران

ستایشتی تۆ دەکەن

وسروشت پەرستەکانیش بەهەمان ئەندێشەوە

ستایشتت دەکەن.

هیوادارم کە

پەیامنێری تۆ بین،

وڕێگە لەنەیارەکانت بگرین

کە نەتوانن ئازار بە لایەنگرەکانت بگەیەنن.))

لەم بەندەدا، زەردەشت باسی سآ گروپ یا دەستە، لەخاسترین پەیڕەوەکانی دەکاو دەبێژێ، کەسوکارەکانو هاوکارانو یاران، ستایشتی ئاهورامەزدا دەکەنو داوا دەکەن کە توانایيان پآ ببەخشێت بۆئەوەی پەیامی ڕاستی لەهەموو جیهاندا بلآوبکەنەوەو بوغزو کینەو نەیاری بەدکاران، بەدۆستیو برایەتی بگۆڕن. هەروەها لەم بەندەداواپێشان دەدا کەبڕێ لەو کەسانەی کە هێزە سروشتی یەکانیان دەپەرست، هاتونەتە سەر ڕێی راستو ئاینی ئاهورایيان پەسەندکردووە.

کەسوکارانو هاوکارانو یاران، سآ دەستەبون کە لەهەموو ڕویەکەوە پتر لەخەڵکی دیکە لەزەردەشت نیزیك بونو لەڕوی پاکیو دروستیو بیری خاسو کردارو گوفتارەوە، لەسەرو ئەوانی دیکەبون. زەردەشت فرە ڕێزی لێدەگرتنو متمانەی پێیان هەبوو، بۆیە پێی دەگوتن خۆمانی. ئەمانە ئامادەبون خۆیان بەخت بکەن لەپێناوی بلآوکردنەوەی ئاینی پاکی یەکتاپەرستی.

بەندی 2

((مەزدا ئاهورا،

که بەهۆی بیری خاسو بە توانابیەوە

بەسەر ئەم جیهانەدا شالیاری دەکات،

وەڵامی ستایشکەرەکانی دایەوە:

ئارمەئیتی پاکو پیرۆزم بۆ هەڵبژاردوون،

کە دۆستو هاوەڵی نیزیکی (ئاشا)یە.

هەوڵ بدەنو تێبکۆشن هەمیشە

لەتەکیابنو لەخۆتانی بزانن.))

لەم بەندەدا، پاش ئەوەی باسی هێزوتوانای ئاهورامەزداو چۆنیەتی دروستکردنی ئەم جیهانەو کەشکەلان دەکات، کە بەهۆی هۆشو ئەقڵی ئاهورامەزداوە هاتۆتەگەڕ، وسەروەری بەسەر هەموو جیهان دەکات، دەبێژێ کە ئاهورامەزدا وەڵامی ئەو سآ دەستەیە دەداتەوە کە لەبەندی پێشودا باسیان لێکرا، وداوای یارمەتییان لێکردبوو دەبێژێ هەمیشە هەوڵ بدەنو تێبکۆشن ئارمەئیتی پیرۆز کە دۆستی هەمیشەیی(ئاشا)یە لەخۆیان بزانن. مەبەست لەئارمەئیتی دیاردەی باوەڕو خۆشەویستیو فیداکاریو بیری پوختەو پاکییە. بێگومان هەرکەسێك کە باوەڕی بەخوا هەبێت، پەیڕەوی لە(ئاشا) بکات کە بریتیە لەدیاردەی ڕاستیو پاکیو تەکوزیو یاسای نەگۆڕی سروشت، هەرگیز لەیاسای راستیو دروستی لانادات. بەواتەیەکی دیکە، پاکی وراستیو دروستی لەپێویستیەکانی باوەڕکردنی ڕاستەقینەیە بەخوا.

بەم شێوەیە دەبینین کە(ئاشا)و (ئارمەئیتی)دوو دۆستو هاوبیری فرە نیزیك بە یەکترن. ئەوەی لەم بەندەدا شایانی باسە، ئەوەیە کە چلۆن دەبێ کە ئاهورامەزدا، خوای داناو ژیر، راستەوخۆ لەتەك خەڵکدا قسە بکات. بۆ وەڵامی ئەم چلۆنایەتیە، موبد فیروز ئازەرگوشەسب دەبێژی:

لەنێو گشت کتێبە ئاسمانییەکاندا (واتە ئاوێستا، تورات، ئینجیل، وقرئان)هەمیشە پەیامبەرەکان ئەووتانەی کە بۆیان ئیلهام دەبوو یا وەحی دەبوو، بەوتەو دەستوری خوایان داناوە. ئەمە نابێوامان لێبکات کەوا بزانین خوا خۆی ڕاستەوخۆ لەتەك خەڵکدا قسە دەکا، بەڵکو زەردەشت ئەو قسانەی بۆی ئیلهام دەبوو، لەزمان ئاهورامەزداوە بۆ خەڵکی دوپات دەکردەوەو دەبێژێ گشت ئافەریدەکانی خوا، بآ هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا، بۆئەوەی ڕزگاریان بێتو بگەنە پلەی پوختەیی، دەبێ (ئاشا) واتە راستیو دروستیو هەروەها (ئارمەئیتی) بکەنە پیشەیانو بۆ خۆیان هەڵبژێرنو بەپاکیو دروستی بژین. باوەڕیان بەخوابێتو لەکاتی سەخڵەتیو سەختیو دژواری ژیانیاندا، لەکاتێکدا کە ڕاڕاو دوودڵ دەبن، پەنای بۆ بەرنو گوێ ڕایەڵی بانگەوازیویژدانی خۆیان بن.

بەندی 3

((ئەی بیر خراپو گومڕایان،

ئێوە هەمووتانو گشت ئەو کەسانەی کە،

پەیڕەویتان لێدەکەن،

خاوەن سروشتێکی ناشیرینو نادروستو خۆپەرستن.

وئەم کردەوە فریوکارانەتانە بۆتە هۆی ئەوەی،

کە لەهەر حەوت دەڤەرا بە بەدناوی

ناوبانگتان زڕاوەو خەڵک لێتان بێزارە.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ڕوو لەسروشت پەرستەکانو پەیڕەوانی ئایینزای ئاریایی ئەو سەردەمە دەکاو دەبێژی:

ئەی گومڕاو دڵڕەشانو بیر خراپان، ئێوە گشتتان پەیڕەویتان لەهەواو هەوەسو بیری خراپو نادروستی خۆتان کردووەو، خەڵک گیرۆدەی خراپەکاری دەکەن. هەروەها دەبێژێ ئەوانەی کە ڕێبازی ئەمانە دەگرنەبەرو ڕێگەی هەڵە هەڵێدەبژێرنو پەیڕەوی لەبەدکاران دەکەنو ڕێزیان لێدەگرن، ئەمانەش لەڕیزی خراپەکاران دەژمێردرێنو هەروەك ئەوان فێری درۆو دەڵەسە بون. لەبەرئەوە، جگە لەخراپەو درۆو فریودان هیچی دیکە لەهەڵسوکەوتیان ناوەشێتەوە.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا دەبێژی: ئەی گومڕایانو خۆپەرستان کە لەهەموو ڕاستییەك بێخەبەرن، ئەوەندە بزانن کە ناوتان زڕاوە لەهەموو شوێنێکی حەوت دەڤەرا، هەرکەسێك تۆزقاڵێك هۆشی بێت، لێتان وەدوور دەکەوێتەوە بۆئەوەی دووچاری دوودڵیو گومڕاییو درۆکانتان نەبن.

لێرەدا دەبێ ئەوە بێژین کە لەگاتاکاندا، زەردەشت ئەو کەسانەی کە خراپ بیردەکەنەوەو خۆپەرستو لوت بەرزو فریوکارو درۆزننو هەمیشە خەریکی بڵاوکردنەوەی خراپەن لەکۆمەڵگادا، بە ئەمانە هەمویان دەبێژی (دێو).

بەندی 4

((ئێوه ئەی گومڕایان،

بەم شێوەیە

بیری خەڵکتان

وەها ئالێۆزو پەرێشان کردووه،

کە خراپترین کار ئەنجام دەدەن،

هاوکاریو دۆستایەتی لەتەك بیرخراپان دەبەستن،

لەبیرکردنەوەی خاس دوور دەکەونەوه،

لەویستو خواستی خوا سەرپێچی دەکەن،

ولەئاینی ڕاستی وپاکی دوور دەکەونەوە.))

ئەم بەندە تەواکەرەوەی بەندی پێشووەو زەردەشت دەبێژێ: ئەی دێوەکان، ئەی گومڕایان، بەهۆی بیری خراپی خۆتانەوه، بیری خەڵکتان ئالێۆز کردووەو گرفتاری گومڕایی یان دەکەن، ووایان لێدەکەن کە لەڕێی ڕاست دووربکەونەوه، وناشیرینترین کارو کرداریان لێبوەشێتەوە. ئەوانەی لەڕێی ڕاست لادەدەنو گومڕادەبن، ئامادەنین کۆمەك لەبیروویژدانی خۆیان وەربگرن، لەبەرئەوە خۆیان دەسپێرنە دەست بیری خراپو دلأ پیسی، وڕوو لەپاکیو ڕاستیو دروستیو خواناسی وەردەگێڕنو پەنا دەبەنە بەر خراپەکاریو تاوانبارێتی کە لەبیری خراپەوە دێتەدی.

زەردەشت، ئەم جۆرە کەسانە بە یارو دۆستی دێوەکان دەزانێتو بە گومڕایان باس دەکاو بەخەڵک دەبێژێ کە لێیان وەدووركەونەوە.

بەندی5

((ئەی بیرخراپان،

بەم شێوەیە ئێوە

بەهۆی کرداری ناپەسەندتانەوە،

وبه بیرو گوفتاری خراپتانەوە

ومژدە دان بەسەروەرێتی گومڕایان،

خەڵکتان تەفرە داوە

ولەژیانی بەختەوەریو نەمرایەتی بآ بەریتان کردون.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ڕوو لەڕابەرو پێشەوایانی ئاینی درۆو دەڵەسە دەکاتو دەبێژێ: هەر بەو شێوەیە کە ئەهریمەن بە بیری خراپوویژدانی ڕەشو رۆحی خراپەکاری خۆیەوە، ئێوەی لەرێگەی راستو دروست لاداوەو گومڕای کردونووادەی سەروەرێتی جیهانی پێداون بە مەرجێك کە بەهۆی تاوانکاریو کرداری خراپەوە، کۆمەڵگا ئالێۆزبکەن،

هەر بەو شێوەیە ئێوەش خەڵکی ساکارو سادەو دڵپاکتان گومڕا کردو لەڕێی راست لادا تا لەژیانی خۆشو بەختەوەری هەمیشەیی بآ بەری بن.

مەبەستی زەردەشت ئەوەیە کە بیری خراپ کە بە ئەهریمەن ناسراوە، مرۆڤ لەڕێی راست لادەداتو هانی دەدا کە کاری خراپ ئەنجام بدا، هەر بەو شێوەیە، پێشەواو رابەرانی ئاییزای ئەو سەردەمە، کە درۆیان کردبووە پیشەی خۆیان، بەهاوکارو یاریدەدەری دێوەکان ناسراونو بەبیری ڕەشیانەوە خەڵک فریو دەدەنو ژیانیان لـآ تالأ دەکەن. ئاشکرایە کە بیری خراپو کرداری ناپەسەند، جگە لەبەدبەختیو بێچارەییو چارە ڕەشیو بآ لانەییو ئاوارەیی، هیچی دیکەمان بە دیاری بۆ ناهێنێت. کەوایە، هەرکەسێك خۆی گیرۆدەی وەسوەسەکانی ئەهریمەنی بکاتو باوەری خۆی لەدەست بدات، وخۆی بخاتە باوەشییەوە، دەبێ لەهەموو خۆشیو بەختەوەری هەمیشەیی چاو بپۆشێت. ئەرکی سەرشانو کاری ئەهریمەنو دێوەکان، فریودانو گومڕاکردنی خەڵکە. زەردەشت ئامۆژگاری خەڵک دەکاو بە پەیڕەوانی خۆی ڕادەگەیەنێت کە فریوی ئەمانە نەخۆنو ژیانی خۆیان بە فیرۆ لەدەست نەدەن.

بەندی6

((لەوانەیە گوناهبارێك بەهۆی کرداری نارەوای خۆیەوە

بۆ ماوەیەك بەختەوەربێتو ناوبانگێك

بۆخۆی بەدەبیهێنێت،

بەلآم، ئەی ئاهورا،

تۆ هەموو شتێك دەزانیت،

وبەهۆشی خۆت، لەبیرو ئەندێشەیان ئاگاداریت.

لەژێرسایەی شالیاری تۆیە کە لەئاکامدا

ئاینی ڕاستی، فەرمانڕەوا دەبێت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ: هەرچەندە لەوانەیە کەسێکی تاوانبارو پیاوخراپ، بەهۆی فروفێڵو برێ کردەوەی ناشایستەوە، بۆ ماوەیەك خەڵک فریو بداتو بگاتە پلەوپایەکی بەرزو ناوو ناوبانگێك بۆخۆی وەچنگ بهێنێت، وخۆی بترنجێنێتە نێو پیاوە گەورەکانو جوامێران، بەلاّم ئاهورای داناو ژیرو ئاگا، کە ئاگاداری هەموو شتێکە، لە(نیەتی) ئەو جۆرە کەسانە ئاگادارەو لەئەنجامدا سزایان دەدات.

هەروەها دەبێژێ کە لەئاکامدا ئاینی ڕاستیو پاکی بالأ بەسەر هەموو جیهاندا دەکێشآو حوکمڕان دەبێو کۆتایی بەسەردەمی پڕ لەدرۆو ڕیاو خراپەکاریو تاوانو بیری خراپ دەهێنێت. ئاشتیو ئاسایشو ئارامیو تەباییو ڕاستیو پاکیو برایەتیو یەکسانی لەهەموو گیتی دا حوکم فەرمادەبێ.

ئەوەی شایانی باسە، لەگاتاکاندا، چەندین جار مژدەی سەرکەوتنی چاکە بەسەر خراپە، ڕووناکی بەسەر تاریکی، ڕاستی بەسەر درۆی داوە. هەروەها جەختی لەسەر ئەمە کردووە کە پەیڕەوانی ئاینی یەکتاپەرستی بەهەموو هێزو توانایانەوە لەململانێیاندا دژی خراپەو درۆ هیلاكو ماندوو نابن.

بەندی 7

((هیچ یەکێك لەم گوناهبارانە

نازانن کە،

پێشکەوتن تەنیا بەهۆی کارو کۆششەوە

بەدەست دێت.

ئاگاداری ئەزمونی بلێیسەی ئاگرو مسی تواوەنین.

ئەی مەزدا ئاهورا،

تۆ پتر لەهەموان ئاگادری

چارەنووسی ئەم جۆرە کەسانەیت.))

لەم بەندەدا دەبێژی کە هیچ یەکێ لەم تاوانبارانە، مانای ڕاستی پێشکەوتن نازانن‌و هەروەها نافامن کە تەنیا بەهۆی کارو کۆششەوەیە کە پێشکەوتن دێتەدی. ئەمانە نازانن کە ئەزمونی ژیان سەلماندوویەتی جیهان بەرەو پوختەیی‌و پێگەیاندن دەڕوا، وئامرازی گەیشتنە ئەم پێگەیاندنە تەنیا کارو تێکۆشان‌و هەوڵدانە. ئەو گوناهکارانە، وادەزانن کە دەتوانن بەهۆی درۆو دەڵەسەو تاوانەکانیانەوە ڕەوڕەوەی مێژوو بەرەو دواوە بگەڕێننەوەو خۆیان سواری سەری خەڵک بن‌و جەماوەر بەدواکەوتویی بهێڵێنەوە. ئەمانە لەگوێی گادا نووستون چونکو گەرەکیان بێت یا نە، ژیان خۆی لەخۆیدا ئەزمونێکە کە مرۆڤ پێدەگەیەنێت‌و پوختەی دەکات. هەوڵو تێکۆشان بۆ دابینکردنی ئامرازەکانی ژیان‌و ئاسودەیی‌و ئاسایش بەهۆی هەڵسوکەوتی ڕاست‌و دروست‌و خۆڕاگرتن بەرامبەر بەهەموو دژوارییەکان‌و ململانآ دژی بیری خراپ‌و خراپەکاری، کارێکی فرە سەخت‌و چەتونە، هەروەکو ئەزمونی ئاگرینوێیە[29].

تاوانباران‌و خراپەکاران ئاگاداری ئەم جۆرە ئەزمونە نین چونکو بۆ خۆیان‌و بە بیری کرچوکاڵی خۆیان، ئاسانترین ڕێگەیان هەڵبژاردووەو بۆ گەیشتنە ئامانجە گلآوەکانیان، ڕێگەی دزێتی‌و جەردەیی‌و فریوکاری یان هەڵبژاردووە، وپشتیان کردۆتە ڕاستی‌و دروستی‌و بیری چاک.

بەندی 8

((یەکێ لەو گوناهبارە ناسراوانە،

جەمشید کوڕی‌ویونگهانە،

ئەو کەسەی کە بۆ ڕاگرتنی دڵی خەڵک‌و خۆشی خۆی

بەچاوی سووکەوە ڕوانییە خوای جیهان.

ئەی مەزدا،

ئەز، دڵنیاو بێگومانم لەو دادوەرییەی

لەرۆژی پەسلآندا دەربارەی گوناهباران دەیکەیت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ئاماژە بۆ جەمشیدی کوڕیویونکهان دەکاو بە یەکێك لەگوناهبارەکانی دادەنێت. ئەم جەمشیدە یەکآ لەبەناوبانگترین شاکانی (پێشدادی)یەکان بووە، کە ماوەیەکی زۆر حوکمڕانی هەموو سەر زەوی ئێران بووە، ونێو بانگێکی یەکجار زۆری هەبووە. فرە هەوڵی داوە ئاسایش بۆ خەڵک دابین بکاتو هەمو جۆرە کەرەسەیەکی بۆ ئەم کارە تەرخان کردبوو. هۆی ئەوەکە بەگوناهبار دەژمێرێت، ئەوەبووە کە پاش ئەوەی خۆی دەبینێتەوەو دوچاری خۆپەرستیو غرور دەبێ، دەگاتە ڕادەیەك کە خۆی بەخوا دەزانێتو خەڵکی ناچار کردووە سوجدەی بۆ بەرنو بیپەرستن. ئیدی ئاهورامەزدا ئەو مەزنێتییەی لێسەندۆتەوەو گیرۆدەی زوحاکی کردووەو کوشتویەتی.

بەبۆچونی من، زەردەشت لەم بەندەدا دەیەوێت، باسی یەکی لەخراپترینو کوشەندەترین دەردەکانی ئادەمیزاد بکات کە بریتییە لەخۆ بەزلزانینو لوت بەرزێتی.

زەردەشت، لەکۆتایی ئەم بەندەدا دەبێژێ هەر جۆرە دادوەرییەکو سزایەك کە بەمجۆرە کەسانە لەلایەن ئاهورامەزداوە دەدرێت، بآ هیچ ڕاڕاییو دوودڵی یەك پێی ڕەزامەندە.

بەندی 9

((پێشەوا بیر خراپەکان،

ئامۆژگارییە ئاینیەکان ئاوەژوو، وئالێوز دەکەن

وبە ئامۆژگارییە هەڵەکانیانەوە،

ڕێی ڕاستو مەبەستی سەرەکیو راستەقینەی ژیان

لەخەڵک چەواشە دەکەن.

بەم شێوەیە،

وا لەخەڵک دەکەن کە دوورەو پەرێزبن

لەخاسترین سەرمایەی ژیان کە بریتیە لە

ڕاستیو دروستیو پاکی.

ئەی مەزداو ئەی ڕاستی (ئاشا)،

لەکانگەی دڵمەوە سکاڵی خۆمتان بۆ دەردەبڕم،

وپەناتان بۆ دەبەم.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ کە پێشەوایانی بیری خراپو درۆزنەکان هەوڵدەدەن تا ئەو راستییانەی لەئامۆژگاری پیاو چاکانو کتێبە ئاینیەکاندا هەیە، ئاوەژوو بکەنو بە هەڵە بۆ خەڵکی ڕاژە بکەنو بەهۆی ئامۆژگارییە چەوتو گومڕاکانی خۆیانەوە، خەڵک لەمەبەستی سەرەکیو ڕاستی ژیان دوور بخەنەوەو ڕێی ڕاستیان لـآ چەواشەبکەن. پێشەوایانی بیری خراپ، خەڵک لەرێی ڕاستو دروست دوور دەخەنەوەووایان لێدەکەن کە بیر لەراستیو پاکیو بیری خاس نەکەنەوە.

لەکۆتاییدا، زەردەشت وەك هەمیشە پەنا دەبێتەبەر خوای داناو ژیرو لەکانگەی دڵیەوە داوا لەمەزداو (ئاشا) کە دیاردەی راستیو پاکییە، دەکات کە ئەم جۆرە کەسانە لەشوێنی خۆیان ڕابگرێتو بآ هێزو توانایان بکات تا نەتوانن خەڵک چەواشەبکەن.

## بەندی 10

((بەڕاستی رابەرە بەدو بیرخراپەکان

کە گوتارە ئاینیەکان، چەواشەو ئالێۆزدەکات،

وبەچاوی ڕێزەوە، ڕوانینە زەویو خۆر

بەکارێکی فرە نارِەواو گوناه دەزانن،

بیر خاسان بەرەو گومڕایی دەبەن،

وزەویو زارو کێڵێگەکانوێران دەکەن،

ودژی بیر خاسان چەك بەکاردێنن.))

لەم بەندەا، باسی هەڵێویستی رابەرانی درۆو درۆزنان دەکاتو دەبێژی ئەمانە بە شێوەیەکی وەها ڕاستی لەخەڵک چەواشە دەکەن کە تەنانەت رێزگرتن لەخۆریش کە سەرچاوەی گەرمایی‌و روناکی زەوییەو مایەی ژیانی ڕووەكو ئاژەڵە، بە کارێکی فرە خراپ دەزانن. ستایش کردنی زەویش کە دایکی هەموو زیندەورانە بە کارێکی ناشایستە دەزانن، هەروەها هەوڵدەدەن کەبیرخاسانو پیاوچاکان لەرێی ڕاست لادەن‌و بیانخەنە سەر ڕێی چەوتو نارێكو تووشی درۆو خراپەیان بکەن. لەبەر ئەوەی ئەمانە دژی نیشتەجێی‌و کشتوکالێن، هەوڵدەدەن کە کێڵێگەکان‌و مێرگ‌و گیاجارەکان‌وێران بکەن. هەروەها بەهێزی چەکەکانیان دژی خەڵکی بیرخاس ڕادەوستن بۆئەوەی رێگە لەپێشکەوتن‌و شارستانییەت بگرن.

بەندی 11

((ئەی مەزدا،

ئەم جۆرە کەسانە، ژیانیان لەخەڵک تێکداوە کە

خراپەکارانیان گەورەو بەرزکردووە،

وبیری ژنان‌و پیاوە هێژاکانیان ئاڵێۆزکردووە

بۆئەوەی خەلآتی یەزدانیان پێنەگات.

پاکان‌و ڕاستکردەوەکانیش

دوور دەخەنەوە لە

خاسترین ئەندێشەکان، وئازاریان پێدەگەیەنن.))

ئەم بەندە، تەواوکەرەوەی دوو بەندی پێشووەو تیایدا باسی رۆڵی تێکدەرانەی ڕابەرە درۆزن‌و خراپەکاران دەکاتو دەبێژێ: ئەم پێشەوا کۆنەپەرستانە بەهۆی بیری ناڕاستو خراپی خۆیان، ژیانی کۆمەڵگایان ئاڵێۆز کردووە، وبەهۆی ئامرازی ماددییەوە خەڵکی ساکارو نەفامیان لەرێی ڕاست لاداوە، هەرچی‌و پەرچی ناو کۆمەڵگایان فریو داوەو بەهۆی پارەو پلەوپایەی کاتییەوە، بە بەرزو گەورە پێشان داوە. بەم شێوەیە، ژنان‌و پیاو خاسانیش کە باوەڕیان کزو لاواز بووە. فریوداوە بۆئەوەی نەتوانن بگەنە ئاواتو هیوای خۆیان کە بریتیە لەبەختەوەری‌و پوختەیی‌و هەروەها لەخەلآتو بەخشینی ئیزەدی کە بریتیە لەبیری چاکو ئەڤین‌و خۆشەویستی خەڵک، بێبەش کردووە، خەڵک فێری خراپەو تاوان دەکەن، ودڵیان بە شکۆیی‌و پلەوپایەی کاتی

خۆشدەکەن. لەکۆتاییدا، زەردەشت ئامۆژگاری خەڵک دەکات کە فریوی ئەم جۆرە کەسانە نەخۆن‌و لەڕێی ڕاست لانەدەن.

بەندی 12

((ئەوانە، بەهۆی ڕاهێنانە خراپەکانیانەوە، خەڵک

لەڕێی ڕاست لادەدەن‌و ناهێڵێن کاری خاس‌و شایستە ئەنجام بدەن.

بەقسە، خەڵک تەفرە دەدەن‌و ڕێیان لێ چەواشە دەکەن

وژیانیان تێکدەدەن

پتر ڕێز لە (گرەهما)و(کەرپەن)ەکان دەگرن‌و

ئارەزووی سەروەرێتی‌و رابەرایەتی

بۆ بیرخراپان‌و درۆزنان دەکەن.

ومەزدا،

بۆ ئەم جۆرە کەسانەو کارە خراپەکانیان

سزای سەخت‌و دژواری داناوە.))

ئەم بەندەش تەواوکەرەوەی بەندەکانی پێشووەو تیایدا باسی خراپی ئەو کەسانە دەکات کە بەبیری ناڕاست‌و خراپی خۆیانەوە کۆمەڵگایان تێکداوە، ودەبێژێ ئەمانە بە شێوەیەك بیری خەڵکیان ئالێۆز کردووە، وبەهۆی خراپ فێرکردنەوە، خەڵکیان چەواشە کردووەوو وایان لێکردوون کاری خراپ لە کاری خاس بە باشتر بزانن ئەو گورگانەی لەپێستی ئادەمیزادن وەك گرەهماو کەرپەنەکان بەسەر بیرخاسان‌و پیاوچاکان ترجیح بدەن. هەروەها ئەوەندە زێدەڕەوی دەکەن، کە رابەرایەتی‌و پێشەوایەتییان بۆ ئارەزوو دەکەن. بەڵام لەکۆتاییدا دەبێژێ کە ئاهورامەزدای داناو ژێر بەگوێرەی یاسای راستی‌و دروستی، سزای تایبەتی بۆ ئەو جۆرە کەسانەو کردارەکانیان داناوە.

بەندی 13

((هەر هێزو توانایەك كە (گرەهما)،

بەهۆی خراپترین بیرەكانیەوە

ئارەزووی وەدەست هێنانیانی هەیە،

لەئاكامدا،

دەبێتە مایەی چارەرەشی ژیانی خۆی.

ئەی مەزدا، ئەوسایە

كە بەشیوەنو زارییەوە،

دەكەونە پاڕانەوەو

ئارەزووی بیستنی پەیامی پەیامنێرەكەت دەكەن،

ئەو پەیامنێرەی كە ڕاستیو دروستی

دەپارێزێت دژی هەڕەشەی نەیاران.)

لەم بەندەشدا، زەردەشت دووبارە باسی هەوڵوكۆششی خراپەكارانو ڕابەرەكانیان دەكاتو دەبێژێ كە ئەم گورگ سیفەتانە دەیانەوێت بە بیری خراپیانەوە بگەنە پلەوپایەیەكی وەها كە ڕێگە لەشارستانیەتو پێشكەوتن بگرن، بەڵام تەنیا بۆ ماوەیەكی فرە كەم دەتوانن بە ئامانجی خۆیان بگەن. پاشان چونكو لەئاكامدا ڕاستی بەسەر درۆدا سەردەكەوێت، ئەمانەش مایەپوچو پەشیمانو شەرمەزار دەبن.

پاش ئەوەی شكست دەخۆنو هیچ كارێكیان لەدەست نایەت، بە شەرامەزارییەوە ڕوودەكەنە لای زەردەشت كە پەیامبەری پەیامێكی پیرۆزەو داوای لێدەكەن كە لێیان ببورێتو بەلایەنگرانی خۆی بزانێت.

دەتوانین بێژین كە لەبەر ئەوەی كۆمەڵگا بەرەو پێشكەوتنو شارستانیەت دەڕواتو ئیدی خەڵك فریوی قسەكانی ئەمانە ناخۆن، ناچاردەبن بڕێكیان بەراستیو هەندێكیشیان بەدرۆ لەكردەی خۆیان پەشیمان ببنەوە.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا، ئەوە دەخاتە ڕوو کە زەردەشت لەهەموو بوارێکدا بەرامبەر هەڕەشەو گروشەی نەیاران خۆی ڕاگرتووەو هاورآکانی پاراستووە.

بەندی 14

((زۆر لەمێژە،

(گرەهما) بەهاوکاری لەتەك (کاوی)یەکاندا

هێزو تواناو بیری خۆیان،

وەگەر خستووە

بۆئەوەی پەیامبەرەکەت وەڕس بکەنو بیخەنە داوەوە.

ئەوانە

هێزو توانای خۆیان لەدرۆزنانو گومڕایان

وەدەست دێننو دەبێژن،

دەبێ هەموو جیهان تێکبدەنو دووچاری خراپەی بکەن

تا (هوم)ی نەمر بگا بەدەم هاواریانەوە.))

لەم بەندەدا، پەردە لەسەر پیلانی نەیارانی زەردەشتواتە (گرەهما) و(کاوی)یەکان لادەبرێت، وتیایدا دەبێژرێ:

گرەهمای بەدکار، بە هاوکاری لەتەك کاوییەکانو فەرمانڕەوا درۆزنەکان، هەوڵدەدەن کە ببنە کۆسپ لەڕێی زەردەشتو نەهێڵێن پەیامەکەی بەخەڵک ڕابگەیەنێت. بۆ گەیشتنە ئامانجەکەیان کە بریتیە لەرآ لادانی زەردەشت یاخود بەلایەنی کەمەوە وەڕس کردنی بۆئەوەی دەست لەم کارە پیرۆزەی هەڵیگرێت، پەنادەبەنە بەر خەڵکی هیچوپوچو درۆزنو ریاکار. ئەم خراپەکارانە، تەنیا ئامانجیان ئەوەیە کە کۆمەڵگا بەرەو هەڵێدێر بەرن بەهۆی بلآوکردنەوەی

درۆو خراپەو شەڕو کوشتار، بۆئەوەی خەڵک لەڕاستیو دروستیو پاکیو یەکتاپەرستی دووربخەنەوە.

هەوڵدەدەن، بەهەر شێوەو ئامرازێك بێت نەهێڵێن زەردەشتو هاوەڵەکانی بیری ڕاستو دروست بڵاوبکەنەوە.

هەروەها لەم بەندەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە نەیارانی زەردەشت پەنا دەبەنە بەر (هوم)و هیوایان ئەوەیە لەکارە خراپەکانیاندا یارمەتیان بدات.

بەندی 15

((بەم شێوەیە

(کەرپەن)و (کاوی) یەکان

دووچاری چارەنوسی ڕەشی خۆیان دەبن

بەدەست ئەو کەسانەی کە کاتی خۆی هەرگیز

نەیاندەهێشت ئازادانە بژین،

وەبەختەور بن.

ئەو کەسانەی کە لەژێرسایەی پوختەییو نەمرێتی

دەگەنە کۆشکی بیری خاس(بەهەشت).))

هەروەك لەمەوبەر گوتمان (کەرپەن)و (کاوی)یەکان، یاخود بێژین فەرمانڕەوا درۆزنو بآ باوەڕ کە لەنەیارە سەرسەختەکانی زەردەشت بون، بە هەموو هێزو تواناى خۆیانو یارمەتی درۆزنەکانو پیاوخراپان، هەوڵیان داوە پەیڕەوانی ئاینی یەکتاپەرستیو ڕاستی لەڕێی ڕاست لابدەن، وگومڕایان بکەن بۆئەوەی ڕێگەی ژیانی بەختەوەرییان لـآ چەواشە بکەن، بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجەیان، هەمە جۆرە رآو رەوشێکیان بەکارهێناوە، درێغی یان لەهیچ کردەیەکی ناشایستو نارەوا نەکردووە، پیلانی گڵآویان دارشتوەو ئازاری خەڵکیان داوە.

لەم بەندەدا، درێژە بە باسەکە دەداو دەبێژێ:

بەم شێوەیە هەڵوێستی ئەم تاقمە کە هەرگیز ئامادە نەبوون کە گوێ بۆ ڕاستی شل بکەنو گوێڕایەڵی قسەو ئامۆژگارییەکانی زەردەشت بن. شکۆو مەزنێتی ئاهورامەزدایان بەچاوی سووکەوە تەماشا کردووەو بەردەوام بون لەسەر ئازاردانی خەڵک.

ئەمانە لەئەنجامدا دوچاری شکستو نوشوستی دەبن. گیرۆدەی چارەنوسی ڕەشی خۆیان دەبنو دەکەونە ئەو چاڵەی کە خۆیان بۆ خەڵکیان هەڵیکەندبوو.

بیرخاسانو پیاوچاکان کە بۆ ماوەیەکی یەکجار زۆر توشی شکستی بوبون بەدەست ئەم تاقمەوە، ئازادییان لـێ زەوت کرابوو، بەهۆی بیری راستو دروستو بەیاریدەی دوو خەلاَتی ئاهورا، واتە پوختەییو نەمرێتی، بەسەر ئەمانەدا زاڵ دەبن، وخۆشیان دەگەنە کۆشکی بیری خاس کە بریتیە لە بەهەشت.

بەندی 16

((بەڕاستی،

ئامۆژگاریی ڕاستەقینەو ژیرانەی پیاوچاکان،

لەهەموو شتێك خاسترە.

ئەی مەزدا ئاهورا،

تۆ دەتوانی پیلانی ئەو کەسانە پوچەڵ بکەیتەوە،

کە دەیانەوێت ئازارم پێبگەیەنن.

ئەمنیش تێدەکۆشم،

لایەنگرانو ئەڤیندارانت،

لەهەڕەشەو دوژمنایەتی درۆزنان رزگاربکەم.))

سەرەتا، لەم بەندەدا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کە مرۆڤ هەمیشە نیازی بە ئامۆژگاریو ئەزمون وەرگرتن هەیە بۆئەوەی سودیان لێوەربگرێت، ولەژیاندا دوچاری گومڕاهی نەبن. خاستروایە کە سوود لەئەزمونو ئامۆژگاری مرۆی پاکوراستو ژیر وەربگیرێت، چونکو ئەو ئامۆژگارییانە بۆ سودی کۆمەڵگایەو بەهیچ جۆرێك خۆپەرستیو کینەو خراپەی تێدانییە. زەردەشت، هەمدیسان لەم بەندەدا دەبێژێ، خوای داناوژیر، توانای ئەنجام دانی هەموو کارێکی هەیەو دەتوانێت دەستی نەیارانی لایەنگرانی راستیو پاکی کورت بکات، وپیلانە چەپەڵەکانیان پوچ بکات، ونەهێڵێێت دەستدرێژییان بکاتەسەر. ئەمجا، داوا لەئاهورامەزدا دەکا، کە نەیارەکانی لاوازو بێدەسەڵات بکات بۆئەوەی یارەکانیو لایەنگرانی راستیو پاکی بآ هیچ ترسێك بتوانن ئاینی یەکتاپەرستی بلآوبکەنەوە.

لەکۆتاییدا، زەردەشت ئارەزوو دەکا، کە بەهۆی کۆششو تێکۆشان، رێگە لەخراپەکارانو بەدکرداران بگرێت کە نەهێڵێن ئازار بە خەڵک بگەیەنن، وبتوانێت بە میهرەبانییەوەو بە زمانی شیرین ئەوانە بەرەو رێگەی راستی هیدایەت بکات.

**سروودی شەشەم**

هات 33 ـ بەندی 1

((هەموو کەسێك لەم جیهانەدا،

دەبێ کردارو هەڵسوکەوتی لەتەك ڕاستیدا،

کە بنەماو مایەی ژیانە ـ یەکسان بێت.

ڕابەر دەبێ،

لەتەك خراپەکارانو خاس کردارندا،

هەروەها لەتەك ئەوانەی کرداری خاسو خراپیان پێکەوە لکاوە،

بەخاسترین ڕەوشو کردەوەوویژدانەوە ڕەفتار بکات.))

زەردەشت لەم بەندەدا بە هەموو خەڵکی جیهان دەبێژێ کە دەبێ هەموان ئاگاداری کردارو هەڵسوکەوتی خوێمان بین، وپێویستە لەسەرمان کە ڕەفتارمان لەتەک راستیو دروستیدا (ئاشا)، کەیاسایەکی نەگۆڕو هەمیشەییە، هاوجوت بێت. نابێت هەرگیزو بە هیچ جوێرێك لە ریێ

راست لابدەین چونکە تەنیا ڕاستی بنەماو مایەی رزگاریمانە. زەردەشت جەختێکی تایبەتی لەسەر ئەوە هەیە کەپێویستە لەسەر هەموان ئاگاداری هەڵسوکەوتو ڕەفتاری خۆمان بین، چونکە لە ڕۆژی پەسڵاندا، کاری خاسو خراپمانە کە داوەری لەسەردەکرێتو زۆربەوردی کارەکانمان هەڵێدەسەنگیرێت.

زەردەشت دەبێژێ: هیچ کردەوەیەکی ئادەمیزاد بێ پاداشت یا سزا نامێنێت. پاداشی خاسان بەهەشتە، کە بریتیە لەویژدانی ئارامو ئاسودە.. خراپەکارانیش، سزای خۆیان لەدۆزەخدا دەبینن کە بریتیە لەنائارامی بیروویژدان.

بەندی 2

((هەرکەسێك کە بەهۆی بیرووتەو کردارو هێزی بازوو

دژی خراپەکاران ڕابوێستآ،

یاخود رێگەی ڕاستو دروست پێشانی ئەوانو پەیڕەوانیان بدات.

ئەو جۆرە کەسانە، بەدڵو بەگیان

ویستو ئارەزووی مەزدا ئەنجام دەدەن.))

ئەم بەندە، یەکآ لەبەهێزترین بەندەکانی (گاتا)کانەو گرنگترین ئامۆژگاری زەردەشتە.

زەردەشت لەم بەندەدا، زۆر بە ڕاشکاوی هانی خەڵک دەدات کە کاری خاس ئەنجام بدەن. دەبێژێ، ئەرکی سەرشانی گشت کەسێکە کە بەهۆی بیرو کرداروتە، وبەهۆی هێزی بازووو زمانو هەر ئامرازێکی دیکە کە لەبەر دەستیایەتی تێبکۆشآو ململانآ لەتەك خراپەو ناپاکی بکاتو پیلانی گلآوی خراپەکاران پوچەڵآ بکاتەوە.

ئامۆژگاری خەڵکی گومڕابکاتو بیانخاتە سەر ڕێی راستو دروست. پێویستە هەموان رێبازی هێنانەدیویستو ئیرادەی ئاهورامەزدا بگرینەبەر کە بریتیە لەرزگاری ئادەمیزادو گەیاندنی بۆ رۆخی دەریای ئارام. یەکآ لەهەرە کارە شایستەکانی پەیامی زەردەشتی ئەوەیە کە مرۆ درۆ نەکاتو کاری ناشایست ئەنجام نەدات. بەلآم مرۆی ژیرو پێگەیشتو، ئەو کەسەیە کە کارێکیوابکات خەڵکی دیکە لەدرۆکردنو دزی کردنو هەڵسان بەکاری نادروست رابگرێتو هانیان بدا کە کاری خاس ئەنجام بدەنو سوودمەند بن بۆ کۆمەڵگا.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بکەین بۆ ئەو ڕاستییە کە لەئاینی زەردەشتیدا تاوەکو ئێستاش پێویستە لەسەر هەر زەردەشتییەك کە بەهۆی بیری خاسی خۆیەوە یارمەتی خەڵک بدات، بەدەست یاریدەی هەژارانو بێدەرامەتان بدات، بەزمان ڕەنجی دەروونی خەڵک کەم بکاتەوەو ئارامیان بکات.

بەکورتی پێویستە لەسەر هەموو زەردەشتییەك کە پێشڕەوبێت لەهاریکاریو یارمەتیدانی هاونەوعی خۆیو لەئەنجامدانی کاری خاسو سوودمەند بەکۆمەڵگا.

ئەم جۆرە کەسانە، بۆ هێنانەدیویستو خواستی ئاهورامەزدا کە بریتیە لەگەیاندنی ئادەمیزاد بۆ پلەی پوختەیيو بآخەوشێتی، دەبنە یاریدەدەرو دۆستو هاوەلی ئاهورامەزدا.

بەندی 3

((ئەی ئاهورا،

کەسێك کە لەتەك خاساندا،

چ کەسوکاربن یا هاوکارانو یاخود یاران،

باشترین هەڵسوکەوتی بێتو میهرەبان بێت لەتەکیاندا،

وەکەسێك کە تێبکۆشێت ئاگاداری ئافەریدەکانی خوابێت،

ئەو جۆرە کەسە.

جێگەو مەلێبەندی تەلارو سەرزەمینی ڕاستیو بیری خاس (بەهەشت) دەبێت)).

لەبەندی پێشودا، زەردەشت ئامۆژگاری خەڵک دەکات کە دژی خراپەو خراپەکاران ڕاوێستنو ململانێیان لەتەکا بکەن، وپیلانەکانیان پوچەڵأ بکەنەوە.

لەم بەندەدا، داوا لەخەڵک دەکات کە یارمەتی خاس کرداران بدەنو لەتەکیاندا بەمیهرەبانی ڕەفتار بکەن. چاودێری لەگشت ئافەریدەکانی ئاهورامەزدا بکەن. لەپاشاندا مژدە دەدات بەو کەسانەو دەبێژێ هەرکەسێك ئەمە کردەوەی بێت، جێگەی تەلاروولآتی راستیو بیری خاس دەبێت، واتەویژدانی ئاسوودەو ژیانێکی بەختەوەری هەمیشەیی دەبێت.

ئەوەی لێرەدا شایانی باسە، ئەوەیە کە هەروەکو بەندی یەکی (هات 32) باسمان کرد، سآ دەستە لەهەرە خاسترین پەیڕەوانی زەردەشت ـ لەو سەردەمەدا ـ لای زەردەشت خۆشەویست بونو زێتر رێزی لێدەگرتن.

دەستەی یەکەم ئەو کەسانە بوون کە لەڕوی پاکیو دروستیو خواپەرستیەوە لەخەڵکی دیکە پێشرەوتربون، وپێی دەبێژێن دۆستو یار.

دەستەی دوهەم، کەسانێك بوون کە لەپلەی یەکەم تێپەڕیبونو پوختەتربون، خاوەن ئیرادەیەکی بەهێزبونو بیرو هۆشی خۆیان لەهەمە جۆر کینەو ڕاراییو.. پاك کردبۆوەویارمەتی هەموو خەڵکیان دەدا بآ گوێدانە ڕەنگو نەژادو پلەو پایەیان، زەردەشت بەمجۆرە کەسانەی دەکوت(هاوکار)، ئەمانە لەتەك ئەوەی کە لەنێو خەڵکدابون، بەلآم هەرگیز سامانو مادیاتو پلەو پایە بیری پاکیانی ئالێۆز نەدەکرد.

دەستەی سێهەم، بریتی بون لە(کەسوکار) یا (خۆمانی یەکان)، ئەو کەسانە بوون کە لەهەردوو پلەی یەکەمو دوهەم تێپەڕی بوونو شیاوێتی خۆیان سەلماندبوو، ئەمانە بە تەواوەتی پوختەبوبون، ئیرادەیەکی پۆلآینیان هەبوو، وبەسەر هەواو نەفسی خۆیان زاڵ بونو زەردەشت فرە متمانەی پێدەکردن.

بەندی 4

((کەواتە، ئەی مەزدا،

دەتپەرستمو داخوازیم ئەمەیە لێت:

بیری خراپو بآ باوەڕی، لەئافەریدە خاسەکانت دوورکەوێت،

لەکەسوکاران، دوودڵیو خۆپەرستی،

لەهاوکاران، نەیارێتیو درۆی نزیکان،

لەیاران، خراپەو لۆمەکردن.

ڕابەرانی درۆزنو فریوکار

لەهەموو جیهانی بووندا، نەمێنن.))

ئەم بەندە، لەتەك بەندی پێشووو دوو بەندی داهاتودا، پەیوەندییەکی پتەویان پێکەوە هەیە.

لەم بەندەدا، زەردەشت پاش ئەوەی ستایشی مەزدا دەکا، داخوازی لێدەکات کە هێزی باوەڕو بیری خاس بە گشت ئافەریدەکانی ببەخشێتو دوریانبخاتەوە لەبیری خراپو بآ باوەڕی کە مایەی بەدەبەختیو چارەرەشیە.

ئەوەی لەم بەندەدا پتر سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە زەردەشت زۆر بەڕاشکاوی بەهۆی ستایشی مەزدا، پەنا دەبێتە بەر هێزو توانای ئافەریدەکاری داناو ژیر، کە تەنیا هێزێکە دەتوانێت بەختەوەری بۆ ئادەمیزاد دابین بکاتو دوریان بخاتەوە لەبیری کرچوکاڵو خراپە.

ئەو سآ دەستەیەی لەبەندی پێشودا باسمان کرد، دووبارە لێرەدا باسیان لێکراوەو داوا لەمەزدا دەکات کە هەریەکەیان دووربخاتەوە لەکارە ناشایستەکان.

سآ جۆر مەترسی لەخراپە هەیە کە هەڕەشە لەم سآ دەستەیە دەکات: خۆمانییەکان یا کەسوکارەکان، لەبەرئەوەی لەڕوی رۆحانیەتەوە گەیشتونەتە بالآترین پلە، باوەڕیان پتەو بیریان پاكو پوختەیە، هیچ بیرێکی خراپ ناتوانێت جێی مەترسی بێتو هەرەشەیان لێبکاتو لەڕێی ڕاست لایانبداتوویژدانیان نائارام بکا.

تەنیا شتێك کە دەتوانآ تا ئەندازیەك باوەڕیان لەق بکات، خۆپەرستیو من منایەتیە. هەر لەبەر ئەمەیە زەردەشت داوا لەمەزدا دەکات کە ئەم (خەسڵەتە) لەکەسوکارو خۆمانییەکان دووربکات.

دەستەی هاوکاران، هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد، هەرچەندە فریوکارەکان ناتوانن زەفەریان پێبەرن، بەلآم ئەمانیش وەکو هەموو مرۆڤێکی دیکە خاڵی لاوازیان هەیە ئەو خاڵە بریتیە لەوەی کە ناتوانن خۆیان ڕابگرن بەرامبەرویستو خواستو ئارەزووی خۆشەویستە نیزیکەکانو کەسوکاریان. ئەم خاڵە لاوازە زۆرجار دەبێتە هۆی لادان لەڕێی ڕاستو ئالێۆزکردنی بیریان.

دەربارەی دەستەی سێهەم، واتە (یاران)، چونکو ئەم دەستەیە هێشتا لەپلەی یەکەمدانو بە تەواوەتی پوختە نەبون، لەبەر ئەوە خراپەکارانو لۆمەکاران دەتوانن دڵیان ساردبکەنەوەو ڕێیان لـآ چەواشە بکەن. لەبەر ئەوە زەردەشت داوا لە خوای داناوژیر دەکات کە ئەم سآ دەستەیە لەبەلآو دەستدرێژی ئەو جۆرە سیفەتانە وەدووربخات.

لەکۆتاییدا داوا دەکات دەستی رابەرو پێشەوا درۆزنەکان لەهەموو جیهاندا کورت بکات تا نەتوانن دەستدرێژی بکەنەسەر بەرژەوەندی خەڵکو گومڕایان بکەنو لەڕێی راست دوریان بخەنەوە.

لەم بەندەدا، زێتر ئەوەمان بەرچاو دەکەوآ کە زەردەشت ئارەزوو دەکا کۆمەڵگایەکی پاكو راستو دروست لەسەراسەری جیهان سەقامگیربێت بۆئەوەی بەختەوەریو شادیو خۆشیو بیری خاسو باوەڕی پاك بۆ هەموو ئادەمیزاد دابین بکرێت.

هات 33

بەندی 5

((کەواتە،

بۆ گەیشتنە هیواو ئارەزووەکانم،

وبەدەست هێنانی ژیانی نەمرێتی،

وگەیشتنە شالیاری بیری خاس،

داوای یارمەتی لە(سروش) دەکەم،

کە لەمەزنترین سیفەتو نیشانەکانتە،

وبەهەنگاو هەلێنان لەرێی ڕاستو دروستدا،

بگەمە بارەگای فەرمانڕەوایی مەزدا ئاهورا.))

لەم بەندەدا، زەردەشت گوێڕایەڵی لەبانگهێشتیویژدان بە تەنیا رێگەیەك بۆ گەیشتنە ئارەزووەکانی ئادەمیزاد دەزانێت کە بریتیە لەرزگاریو بێخەوشێتی، بۆیە پەنا دەبێتە بەر یەکێ لەمەزنترین سیفاتو نیشانەکانی ئاهورامەزدا کە بریتیە لە(سروش).

ئاواتو هیوای هەموو کەسێك لەژیاندا هەستکردن بە بەختەوەریو خۆشی هەمیشەییە، ئەم ئارەزووەش کاتێك دێتەدی کە مرۆڤ بگاتە پلەی بێخەوشێتی، بۆ گەیشتنە ئەم پلەیە، پێویستە ئادەمیزاد هەموو ئەو قۆناغانەی لەباسی فەلسەفەی ئەمشاسپەندداندا باسمان کرد، بپێوێت کە بریتین لەبەرخوداری لەخورەوشتی بەرزو لەخۆبوردنو پاکیو ڕاستی. ئاسانترینو کورت ترین رێگەی گەیشتنە ئاواتو دوا ئارەزوی مرۆڤـوهەست پێکردن بە بەختەوەری بریتیە لەگوێڕایەڵی لەبانگهێشتیویژدانو بەجآ هێنانی فەرمانەکانی ئیزەدی سروش کە هەروەك تیشکێکی خوایی لەناخی دەرونی هەریەك لەئێمە دەدرەوشێتەوەو لەکاتی پێویستیو سەغلەتیدا بەدەم هاوارمانەوە دێت. ئەم سروشە لە(گاتا)کاندا بە مەزنترینو هێژاترین یاوەر ناوی لێبراوە

که هەمیشه ئادەمیزاد بۆسەر ڕێی راست رێنمایی دەکات، به مەرجێك که بەدروستی فەرمانەکانی جآبەجآ بکەین‌و دووربین لەکینەو من منایەتی‌و....

لەکۆتاییدا دەبێژێ: با بەهۆی راستی‌و دروستی‌و پاکی‌و دووره پەرێزی لەخراپەو گەندەڵی بگەینه بارەگای ئاهورامەزدا، خوای ژیرو دانا که پێی دەبێژرێ بەهەشت.

هات 33 بەندی 6

((ئەز،

هەروەك خواپەرستێك که باوەڕی پتەوی بەڕاستی،

وبەخاسترین بیر،

وخۆشەویستی بەتۆ هەیه،

وه هەروەکو تۆ گەرەکته،

ئەمنیش دەخوازم بەو جۆرەی کەتۆ دەتەوێت رِێنمایی‌و رابەرایەتی خەڵک بکەم،

ئەی مەزدا ئاهورا،

ئارەزووم ئەوەیه بتبینم‌و گفت‌و گۆت لەتەکا بکەم.))

لەم بەندەدا بەڕاشکاوی باسی ئەوه دەکا که زەردەشت لەلایەن ئاهورامەزداوه به شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەڵبژێراوه به پەیامبەرێتی‌و ئامادەیی خۆی دەردەبرێت بۆ هەڵسان بەم کاره پیرۆزه که بریتیه لەرِێنمایی خەڵک.

لەم بەندەدا، زەردەشت بۆئەوەی ئەرکی سەرشانی وەك پەیامنێرێك به خاسی ئەنجام بدات، بەئاشکرا دەبێژێ که پێویستی بەوه هەیه که ئەو پرسیارانەی لەئاهورای هەیه وەڵام بدرێتەوەو لەلایەن مەزداوه ئیلهامی پآ بکرێت‌و دەستوره پێویستەکانی پآ بدرێت.

زەردەشت به هەموو دڵو گیانییەوەو به باوەڕێکی پتەوەوه خوای داناوژیر دەپەرستێت‌و داوای یارمەتی لەئەقلی تەواوسەنگی ئاهورادەکات که یاریدەی بدا بۆئەوەی وەك پێویست‌و بەو شێوەیەی که خوا گەرەکێتی رِابەرایەتی خەڵک بکات‌و هەموو دەستورەکانی وەك پێویست بەکاربهێنێت.

بە کورتی بێژین، زەردەشت شیوەی پەرستنی خوای پێشان داوەو دەبێژێ: دەبێ بەهۆی راستیو پاکیو باوەڕی پتەوو دڵێکی پاکەوە خوابپەرستین.

هات 33 بەندی 7

((ئەی مەزدا،

ئەی خوای ژیرودانا، ئەی خاسترین خاسان،

نیزیك بەرەوە لێمو خۆتم لـآ ئاشکرا بکە.

تا لەژێر سایەی ڕاستیو بیری خاس،

بتوانموتەکانمو بیرو باوەڕم،

ڕابگەیەنمو جگە لەئەنجومەنی مۆغەکان،

بەگوێی خەڵکی دیکەشی بگەیەنم،

بەگوێی ئەو شتەی کە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە،

وئەو نوێژو ستایشتەی کە شایانی تۆیە،

لێمان ڕوونو ئاشکرا بێت.))

لەم بەندەدا زەردەشت بۆئەوەی ڕاسپاردەکەی بە خاسی ڕابگەیەنێتو بە چاکیو دروستی رابەرایەتی خەڵکی بکات، دەبێژێ:

ئەی خوای ژیرو دانا، ئەی مەزدا، لێم نیزیك بەرەوەو بەهۆی ئیلهامەوە ڕاستیم بۆ ڕوون بکەرەوەو بەهرەمەندم بکە لەخەلآتی (ئاشا)و (وەهومەن) واتە دیاردەکانی راستیو دروستیو بیری خاسو زانست، تا بتوانم جگە لەئەنجومەنی مۆغەکان یانی پەیڕەوانی راستەقینەو بە ئەمەكو خواناس، خەڵکی دیکەش ڕێنمایی بکەمو ڕابەریەتییان بکەم بۆئەوەی ڕێبازی خواپەرستیو راستی بگرنەبەرو گوێ بۆ ئامۆژگاریو قسەکانم شل بکەن.

لەپاشان دەبێژێ: با خەڵکی ڕآو ڕەوشی ستایشتو پەرستنی راستیو ئەرکی سەرشانی خۆیان بەرامبەر بە ئافەریدەگار بزانو چۆنیەتی ڕێزگرتنیان فێربن.

ئەوەی کە لەم بەندەدا زێتر سەرەنج رادەکێشآ ئەوەیە کە زەردەشت جگە لەئەنجومەنی مۆغەکان کە پەیڕەوانی رێگەی راستیو دروستینو خواپەرستن، خەڵکی گومراو لادەرانیش بەرەو رِێی راستی داوەت دەکات.

هات 33 بەندی 8

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئامانجو مەرامی تەواوەتیو رِاسپێرییەکانم بۆ رِوون بکەرەوە،

بۆئەوەی لەژێر سایەی بیری خاس،

ئەنجامیان بدەم،

ولەرِێی رِاستییەوە ستایشتت بکەم،

ئەی مەزدا،

خەلآتی هەمیشەیی پوختەییو نەمرێتیم،

پێببەخشە.))

لەم بەندەدا، زەردەشت بۆئەوەی خاستر بتوانێت رِاسپێرییەکەی ئەنجام بدات، داوای یارمەتی لەخوای داناو ژیر دەکاتو دەبێژێ ئەو رێگایەی کە دەبێ بیگرمەبەر بۆم رۆشەن بکەو دوا ئامانجو مەرامی ژیانم بۆ رِون بکەو بیری خاسو زانستم پێببەخشە بۆئەوەی بەهۆی ئەم نیشانە خواییە بتوانم پێویستی سەرشانمو راسپێرییەکەم ئەنجام بدەمو بانگەوازی خەڵک بکەن بۆئەوەی ستایشتت بکەنو رێز لەهەموو نیشانەکانت بگرن کە خۆیان لەئەمشاسپەندان دەنوێنن.

لێرەدا زۆر بەرِاشکاوی ئەوەمان بۆ رۆشەن دەبێت کە زەردەشت دەیەوێت بەهۆی هێزی(وەهومەن) واتە بیری خاسوویژدانی پاکو زانستو ئیلهامی خواییەوە، ئامانجو ئەو رێگەیەی بۆ رۆشەن بێتەوە کە چەندین ساڵ هەوڵو کۆششی بۆداوە بۆئەوەی رێگەی راست پێشانی خەڵک بدات.

هەروەها داوا لەخوا دەکاو ئارەزووی ئەوەیە کە ئەو ستایشتەی خەڵک کە بە دڵێکی پاکو باوەرِێکی پتەوەوە بەراستیو دروستی ئەنجامی دەدەن لێیان قبولأ بکاتو خەلآتی بەختەوەریو تەندروستیو پاکیو نەمرێتی معنوی یان پآ ببەخشێت.

هات33 بەندی 9

((ئەی مەزدا،

ئەم دوو هێزە مەزنە کە (راستیو پاکی)و (نەمرێتی)یە،

لەتۆوەیە،

بەرۆشنایی دڵو بیرو زانست وەدەست دێن،

با،

لەژێرسایەی خاسترین بیر،

لەخەڵاتی ئاسمانی ئەم دوو هێزە هاوکردارە

بەهرە وەربگرین.))

لەبەندی پێشودا گوتمان کە زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە پوختەییو نەمرێتی پآ ببەخشێت بۆئەوەی بتوانێت ئەو پەیامەی پێی سپێردراوە بە خاسی ئەنجامی بدات.

لەم بەندەدا دەبێژێ: ئەی خوای ژیرودانا، دەزانم کە ئەم دوو خەڵاتە خواییە یا ئەم دوو گەوهەرو هێزەواتە پوختەییو نەمرێتی لەنیشانە تایبەتییەکانی تۆیەو تەنیا بەهۆی بیرو زانستەوە وەدەست دێن. هەروەها خاس دەزانم کە بەدەست هێنانی ئەم دوو خەڵاتە دەبێتە هۆی گەشەکردنی پاکیو راستیو دروستیو ئاوەدانیو پێشکەوتنی جیهان.

لەبەرئەوە داوات لێدەکەم کە لەژێرسایەی بیری پاكو بآخەوشو خۆشەویستی خەڵکو بەهۆی ئەقڵو زانست ئەم دوو خەڵاتە خواییە کە هەروەك دوو رِۆح لە لەشێکدانو هاوکارو یەکسانو هەمیشە پێکەوەن، پێم ببەخشێت.

هات33 بەندی 10

((ئەی مەزدا،

ئاسایش‌و خۆشییه‌كانی ژیان كه تائێستا بووه‌و هه‌یه‌و ده‌مێنآ،

وگشتیان له‌تۆوه‌یه‌،

به میهره‌بانی خۆت ئه‌مانه‌مان پێببه‌خشه‌،

وله‌ژێرسایه‌ی بیری خاس‌و هێزی معنوی‌و راستی،

ته‌ندروستی‌و به‌خته‌وه‌ریمان زێتر بكه‌.))

له‌م به‌نده‌دا، زه‌رده‌شت گشت خۆشییه‌كانی ژیان، خاسییه‌كانی، ئارامی‌و ئاسایش‌و جوانییه‌كانی، هه‌موی به ئافه‌ریده‌ی ئاهورامه‌زدا ده‌زانێت‌و ئاره‌زوی ئه‌وه‌یه كه مرۆی خاس كردارو پاك، به‌رخوردارو كامرِه‌وابن پێی، زه‌رده‌شت له‌م به‌نده‌دا ده‌بێژێ: ئه‌ی خوای داناوژیر، له‌روی میهره‌بانی خۆته‌وه‌، ئافه‌ریده خاسه‌كانت به‌م نیعمه‌تانه كامره‌وابكه‌و به‌هۆی هێزی بیری پاك‌و خۆشه‌ویستی یه‌كدی‌و هێزی معنوی‌و پاكی‌و راستی رزگاریان بكه‌و بیانگه‌یه‌نه به‌خته‌وه‌ری هه‌میشه‌یی كه ئاره‌زووی هه‌موو مرۆڤێكه‌.

ئه‌وه‌ی زێتر له‌م به‌نده‌دا دێته به‌رچاوو سه‌رنج رِاده‌كێشآ ئه‌وه‌یه كه زه‌رده‌شت زۆر به رِاشكاوی ده‌بێژێ، هه‌موو خۆشی‌و خاسی‌و شادمانی‌و ئاسایش‌و ئارامییه‌كان له‌لایه‌ن خواوه به ئاده‌میزاد خه‌ڵآت كراوه‌و ئاده‌میزاد ده‌بێ به‌رخوردارو كامرِه‌وابێت به‌م خه‌لاتانه‌و به‌شێوه‌یه‌كی خاس سودیان لێوه‌ربگرێت.

له‌كۆتایی ئه‌م به‌نده‌دا، زه‌رده‌شت بیری خاسی به‌هۆیه‌ك داناوه بۆ گه‌یشتنه به‌خته‌وه‌ری هه‌میشه‌یی‌و رزگاری.

هات 33 به‌ندی11

((ئه‌ی مه‌زدا ئاهورای مه‌زنان مه‌زنتر،

ئه‌ی ئارمه‌ئیتی ـ دیارده‌ی باوه‌رِو فیداكاری،

ئه‌ی ئاشاـ دیارده‌ی راستی ـ مایه‌ی ئاوه‌دانی جیهان،

ئه‌ی وه‌هومه‌ن ـ دیارده‌ی بیری خاس،

ئه‌ی وه‌خوشترا ـ دیارده‌ی توانایی معنوی،

گوێم بۆ ڕابگرن،

ئەوکاتەی کە پاداشتی کرداریان دەدەنەوە،

لەتەك منیشدا میهرەبان بنو لەبەخشندەیي خۆتان،

بآ بەشم مەکەن.))

لەم بەندەدا، زەردەشت داوا لەئاهورامەزداو فریشتەکانی(واتە دیاردە پیرۆزەکانی ئاهورا) دەکات کە یاریدەی بدەنو ئارەزوو دەکا کە لەرۆژی پەسلآندا کە هەرکەس بەگوێرەی کارو کردارێك کە ئەنجامی داوە پاداشتو سزای خۆی دەبینآ، میهرەبانیو لێبوردنیان ئەمیش بگرێتەوەوە درێغی لـآ نەکەن.

شایانی باس لەم بەندەدا ئەوەیە کە:

ئاشاواتە (راستیو پاکی) بە سیفەتو مایەی ئاوەدانی جیهان باسکردووە، بێگومان راستیو دروستیو پاکی مایەی پێشکەوتنو ئاوەدانی جیهانەو هۆی خۆشیو ئاسایشی خەڵکیە، بە پێچەوانەوە، درۆو خیانەتو دزیو جەردەییو فریو مایەی بەدبەختیو چارەرەشیو دواکەوتنە.

زەردەشت بۆ ڕاگوێزی جیهان بەرەو پوختەییو پێشکەوتنو بەرخورداری لەنیعمەتی خۆشیو ئاسایشو ئازادیو ئاوەدانی، دیاردەی (ئاشا) کە بریتیە لەراستیو دروستیو پاکی بە پێویست داناوە.

زەردەشت، راستیو پاکی بە(هۆ)یەك بۆ رزگاری ئادەمیزاد داناوە، وهاورآ لەتەك یاریدەی دیاردەکانی دیکەی ئاهورامەزدا، هیوادارە کە لەرۆژی پەسلآندا کە کاروکرداری ئافەریدەکان هەڵێدەسەنگێنرێتو خاس کردەکانو بەدکرداران پاداشتو سزای خۆیان دەبینن، کەرەمو میهرەبانی ئاهورامەزدا ئەمیش بگرێـتەوە.

هات 33 بەندی 12

((ئەی مەزدا ئاهورا،

خۆتم لـآ ئاشکرا بکە،

وبەهۆی (ئارمەئیتی)توانایی معنویم پێببەخشە،

به یارمەتی رۆحی پاکی خۆت،

وەڵامی نیایشتەکانم بدەرەوە.

بە یارمەتی راستی (ئاشا)،

لەهێزو توانا بەرخۆردارم بکە،

وبەیارمەتی بیری خاس (وەهومەن)

هێزو توانای رابەرایەتیم پێببەخشە.))

ئەم بەندەلەتەك دوو بەندی داهاتو، بریتین لەداخوازی زەردەشت لەئاهورامەزدا، لەم بەندەدا زەردەشت دەبێژێ: ئەی مەزدای داناوژیر، خۆتم لێ ئاشکرا بکەو توانایی خۆتم پێشان بدە. بۆ گەیشتنە ئەم ئارەزووە داوای توانایی معنویو هێزی رۆحیو بەرخورداری لەگشت خاسییەکانی جیهانی کردووە. هەروەها زەردەشت هیواداره کە بە بەهێزکردنی دیاردە پاکەکانی ئاهورایی، واتە، باوەڕو فیدارکاری ـ راستیو دروستیو پاکی، وبەیارمەتی بیری پاكو ژێرێتیو زانست بتوانێت پێشەواییو رابەرایەتی خەڵک بگرێتە ئەستۆو بە خاسی ئەنجامی بدات. لەهەمانکاتدا زەردەشت دەبێژێ کە ستایشێك کە لەکانگەی دڵەوەو بە نیەتێکی پاك ئەنجام بدرێت بێگومان بێ پاداشت نامێنێ.

ئەوەی کە لەم بەندەدا زۆر گرنگە، مەسەلەی رابەرایەتیو پێشەوایەتی خەڵکە بە بیرێکی پاكو ژێرێتیو زانستەوە. کەسێك کەپلەوپایەی پێشەوایەتیو ڕابەرایەتی خەڵکی لەئەستۆدایە دەبێ کەسێکی ژیرو دوور ئەندێش بێتو ئەو کارانەی دەیکات دەبێ بەهۆی ئەقڵو زانست ئەنجام بدرێت. هەروەها پێویستەویژدانێکی پاكو بیرێکی رۆشەنی هەبێتو خێروخۆشی خەڵک ڕەچاو بکات.

هات33 بەندی 13

((ئەی مەزدا ئاهورای چاوتیژی فره بیناو،

خەلآتو بەخشیشی بێ ئەندازەت کە لەشالیاری تۆ(خشترا)،

ولەبیری خاسەوەیە (وەهومەن).

بۆ بەختەوەریو شادمانیم،

ئاشکرای بکە لێم،

وەتۆ ئەی (پاکیو پوختەیی)،

بەهۆی راستییەوە،

رۆشنایی دڵم پآ ببە خشە.))

زەردەشت، بۆ گەیشتنە نیعمەتی شادمانیو بەختەوەری ڕاستەقینە، ئارەزووی بەرخورداری لەخەلآتەکانی وەهومەنو خەشترا دەکات.

هەروەکو لەبەندەکانی پێشودا بۆمان ڕوون بۆوە بەخشیشەکانی وەهومەن بریتین لەرۆشەن بینیو ژێرێتیو زانستو توانای تێگەیشتنو نیەتی پاکو خۆشەویستی خەڵکو لەخۆبوردن. بەخشیشەکانی (خەشترا) بریتیە لەهێزی لەش بۆ ئەنجامدانی کار.

ئاشکرایە کە بەختەوەریو شادمانی بەهۆی رۆشەن بینیو خۆشەویستی خەڵک بە سودوەرگرتن لەهێزی معنویو کاروکۆشش وەدەست دێت.

بۆیەکا زەردەشت داوا دەکات کە بەرخۆرداربێت لەم بەخشیشانە. هەروەها بۆئەوەی هەرکەس بتوانێت خاس لەراستی خۆیوویژدانی خۆی بگاتو کەموکورِیەکانی خۆی دەستنیشان بکات، پێویستە راستیو پاکی بکاتە پیشەی خۆی، پەنا بەرێتەبەر خۆشەویستیو باوەرِ بەخوا بۆئەوەی دڵی بەهۆی نوری باوەرِو راستی رۆشەن بێتو بگاتە ئەوەی هەست بەرِاستی، واتە ناسینی خوابکات.

زەردەشت ناسینی خوای هاوجوت لەتەك ناسینی خۆ داناوەو دەبێژێ سەرەتا خۆت بناسە تا بتوانی رێگەی ناسینی خوا بدۆزیتەوە. بۆ ناسینی خۆ (خۆناسین)، راستیو پاکیو باوەرِ بەخواو ئیرادەی پتەوو بیری پاكو رۆشەن پێویستە.

خۆناسین، دەبێتە هۆی شادومانیو خۆشی، ئەمە شتێکە زەردەشت نە تەنیا بۆخۆی بەڵکو بۆ هەموو ئادەمیزادی ئارەزوو کردووە.

هات33 بەندی 14

((ئێستا ئیدی زەردەشت،

هەموو لەشو گیان،

وهەڵبژاردەیەك لەبیری خاسی خۆی،

پێشكەش بە مەزدا دەكات،

وخاسترین كرداروو‌تەو فەرمانبەری لەدەستوورەكانی خوایی،

وهەموو هێزو توانای معنوی خۆی،

پێشكەش بە راستی (ئاشا) دەكات.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ڕادەی باوەڕو فیداكاری خۆی بە ئاهورامەزدا پێشان دەداتو دەبێژێ، بە لەشو گیانو هەموو (بوونی) خۆی، ئاهورامەزدا خوای داناو ژێر ستایشت دەكاو هێزی بیركردنەوەی خۆی كە یەكێ لەمەزنترینو پیرۆزترین خەڵاتەكانی خوایە، جگە لەڕێی بڵاوكردنەوەی باوەڕی یەكتاپەرستیو خێرو خۆشی خەڵك، هیچ ڕێگەیەكی دیكە ناگرێتەبەر، بەم شێوەیە قەرزی خۆی دەداتەوە. لەپاشان دەبێژێ: (ئاشا) واتە راستیو پاكی دەكاتە سەر لەوحەی ژیانی خۆیو پەیڕەوی لەفەرمانەكانی خواو بانگهێشتیویژدان دەكاو هەموو هێزی لەشو كرداروو‌تەی خۆی پێشكەش بە ئاشا دەكا. واتە جگە لەراستی هیچوتەیەكی دیكە لەزاری دەرناچێتو هیچ هەنگاوێك جگە لەسەر ڕێگەی راست هەڵێناهێنێتو گیانی خۆی لەڕێی راستیدا بەخت دەكات.

ئاوێستاناسان دەبێژن لەم بەندەداوا دەردەكەوێت كە كاتێك زەردەشت ئەم بەندەی بێژاوە نەیارەكانی تەنگیان پآ هەڵێچنیوەو بە هەڕەشەو بڕی جار بە تەماح خستنەبەر هەوڵیان داوە لەڕێی یەكتاپەرستیو راستی لایبدەنو بیخەنە سەر ئاینی خۆیان. بەڵام زەردەشت سەرسەختانە بەرامبەریان ڕاوێستاوەو بە باوەڕێكی پتەوەوە بەخوا، بەرگری لەباوەڕی خۆی دەكات.

ئەوەی لەم بەندەدا شایانی باسە ئەوەیە كە زەردەشت، ئیتاعەت لەبانگەوازیویژدانو فەرمانبەرداری لەدەستورەكانی، پەیڕەوی لەراستیو دروستیو دووركەوتنەوە لەدرۆ، بە مایەی رزگاریو بەختەوەری دەزانێت، لەشوێنێكی دیكەدا دەبێژێ: ((لەجیهاندا یەك ڕێگە هەیەو ئەویش ڕێگەی راستییە.))

## سروودی حەوتەم

هات 34 بەندی 1

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەو بیروکرداروتە خاسانەی کە.

نەمرێتیو ڕاستیو هێزی پوختەبوون بە خەڵک دەبەخشێت،

هەموو ئەمانە،

سەرەتا پێشکەش بەتۆی دەکەم.))

لەبەندی پێشودا، زەردەشت فیداکاریو خۆبەختکردن لەپێناوی بلاَوکردنەوەی ئاینی خواپەرستی گەیاندە دوندی بآخەوشێتی، ئامادەگی خۆی دەربڕێ کە گیانی خۆی فیدابکات بۆ گەیشتنە ئامانجە پیرۆزەکەی.

لەم بەندەدا درێژە بە گوفتارەکەی دەداو دەبێژێ:

بیروووتارو کردارە خاسەکان کە بە نییەتێکی پاكو لەکانگەی دڵەوە ئەنجام دەدرێت، شوێنەوارێکی فرە خاسو بەنرخی دەبێت کە بریتیە لەبەهرە وەرگرتن لەخەلآتی یەزدانی کە بریتین لەراستیو پاکیو پوختەبونو نەمرێتی.

لێرەدا زەردەشت ئەو سآ ئەسلەواتە، بیر، وتەو کرداری خاس بە بنچینەی بەختەوەریو بەهرە وەرگرتن لەنیعمەتی پوختەییو نەمرێتی دەزانێتو دەبێژێ پێویستە هەمیشەو پێش هەموو شتێك ئەم سآ ئەسلە بآ ڕیاو دوو ڕوویی پێشکەش بە یەزدانی بکەین. مەبەستی زەردەشت ئەوەیە کە پێویستە لەسەر ئادەمیزاد هەمیشەو لەپێش هەموو شتێکدا ئاهورامەزدا ڕەچاوبکرێت بۆ هەموو کارێك.

هات 34 بەندی 2

((ئەی مەزدا ئاهورا،

مرۆی پاكو بیر خاس،

کە رۆحو ڕەوانی لەتەك ڕاستیدا ئاوێتەیە،

هەموو بیرو کرداری خۆی پێشکەش بەتۆ دەکات،

باوابێت کە،

بەهۆی نیایشتو مەدحێك کە دەیکەین،

لێت نیزیك بینەوە.))

زەردەشت لەم بەندەدا دەبێژێ: مرۆی پاكو بیرخاس کە ڕاستیو دروستی یان کردۆتە دروشمی ژیانیان، کەسانێکن کە هەمیشە لەبیروکرداروتەکانیاندا خوا ڕەچاو دەکەن چونکو باوەڕی تەواویان پێی هەیە. ئەمانە کار بۆخوا دەکەن بآ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ جۆرە پاداشتێکیان لـآ هەبێت، هەرشتێك ئەنجام دەدەن لەپێناوی خزمەتو وەکو ئەرکی سەرشانیان ئەنجامی دەدەنو لەبیری خۆیاندا جگە لەخۆشەویستی خواو مرۆڤ هیچ سەودایەکی دیکەیان نییە. ئەمانە ئەڤینداری ئافەریدەگارنو بیرووتەو کرداری خاسی خۆیان نەزرو پێشکەشی ئەو دەکەن. بەواتەیەکی دیکە بیرکردنەوەیان لەپێناوی بەختەوەریو ئاسایشی گشت مرۆڤەو هەر هەنگاوێك کە هەڵیدێنن بەناوی خوای خولێقێنەرەوەیە. لەکۆتاییدا زەردەشت دەبێژێ، ئەی مەزدا با بەهۆی ستایشتو مەدحێك کە دەیکەین لێت نیزیك بینەوە، زەردەشت ئارەزوی دڵی خۆی دەردەبڕێو ئاشکرای دەکاو دەیەوێت کە هەموو ئافەریدەکانی خوا ببنە لایەنگری ڕاستیو بەهۆی ستایشتی ئافەریدەگار هەموو بیرو هۆشی خۆیان ئاراستەی ئەو هێزە مەزنە بکەنو لٚی نیزیك ببنەوە.

هات34 بەندی 3

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەوەی شایانی تۆو لەڕێی ڕاستیدایە،

بەرێزەوە لەنیایشتتدا بەجێی دێنینو پێشکەشی تۆی دەکەین،

باهەموو خەڵک،

لەژێرسایەی بیری خاسو شالیاری تۆ،

بگەنە پلەی پوختەیی.

ئەی مەزدا،

لەڕاستیدا مرۆی داناو رۆشەنبیر،

هەمیشە لەهێزی معنوی تۆ بەهرەدەبەن.))

لەم بەندەدا، زەردەشت سآ باس دێنێتە پێشەوە، سەرەتا لەخوای داناوژیر ئارەزوو دەکا کە بتوانێت ئەو شتەی کە شیاوی ئەوو (ئاشا) کە دیاردەی راستیو پاکییە ئەنجام بدات. راستیو دروستیو پاکیو پوختەیی، خۆشەویستیو یارمەتیدانی خەڵکو هەموو ئافەریدەکانی بە کەلێكو سوودمەندی خوا، سوپاسکردنی خوا بۆ ئەو هەموو خەلآتو بەخشیشانەی کە پێی داوین بەهۆی ستایشتو نوێژو.... ئەمانە ئەو کارانەن کە دەبنە هۆی رزگاریمانو رازی بونی خوا لێمان. خاسترینو ستایستەترین شتێك کە مرۆ دەتوانآ پێشکەشی خوای خۆی بکات بریتیە لەبیری چاک، وتەی خاسو کرداری پەسەندو ستایشتێك کە لەکانگەی دڵەوەبێت.

پاشان زەردەشت ئارەزوو دەکا کە گشت ئافەریدەکان لەژێرسایەی بیری پاكو خەلآتی وەهومەن کە بریتیە لەهۆشو ژێرێتی بۆ وەرگرتنی زانست بگەنە رِادەی پوختەییو مرۆی زانایان لێدەرچێت لەکۆتاییدا دەبێژێ، دەزانم کە مرۆی داناو رۆشەنبیر کەسێکە کە سود لەنیعمەتو خەلآتی وەهومەن وەروڵاخدەگرێو لەهێزی معنویو ئیرادەی بەهێز بۆ ئەنجامدانی کاری بەکەلێكو خاس بەهرە وەروڵاخدەگرێ.

هات34 بەندی 4

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئێمە تواناوزەی روناکی تۆمان دەوێت،

کە لەژێرسایەی رِاستیدا دەدرەوشێتەوە،

ئەو رووناکیە کە نەمرو توانایەو

بە ئاشکرا رِێنمایی لایەنگرانی راستی دەکات،

وبەتواناییەوە یارمەتییان دەدات،

ودوژمنایەتیو ئازاری نەیاران

دەبینێتو دەست نیشانیان دەکاو دوریان دەخاتەوە.))

لەم بەندەدا زەردەشت باسی رِوناکی نێو دەرونو یاخود بێژینویژدانی رۆشەنو زیندوی ئادەمیزاد دەکات. بەم روناکیە دەگوترێت روناهی خواییو گەرمایی معنویو دەرونی. ئەم

ڕووناكیەیە كە ئادەمیزاد بەرەو كارو كرداری خاس دەبێو نەبونی بەرەو كاری خراپ ڕادەكێشآ.

ئەم ڕووناكیە بەهۆی پاكیو ڕاستیو دروستیەوە هەمیشە دەدرەوشێتەوەو درخشانەو دڵی ئادەمیزاد ڕۆشەن دەكاو بیری بەرەو كارو كردەوەی خاسو یارمەتی بێدەرامەتانو بآ دەسەلآتان ڕێنمایی دەكات.

ویژدانی بێدارو ڕوناكی دەرونە كە خراپەكاران دەهێنێتەوە سەرهۆشو بیرە ئالێۆزو خراپەكانیان ئاشكرادەكاو ئاگاداریان دەكاتەوە لەو مەترسییەی كە لەبۆسە دایە بۆیان. ئارزووی زەردەشت ئەوەیە كە هەموو خەڵك بەهرە لەم ڕوناكیە دەرونیەو نوری خواییە وەربگرن كە بریتیە لەویژدانی بێدارو بیری پاكو ڕۆشەن، بۆئەوەی سۆزو هەستی خۆشەویستی یەكتر لەدڵیاندا زێترو مەزنتربێتو لەرێگەی ڕاستیو پاكی هەنگاو هەڵبێنو تێبكۆشن بۆ پێشكەوتنو پێگەیاندنی كۆمەڵگا.

گرنگی ئەم بەندە لەوەدایە كە پێماندەبێژێ ئەم ڕووناكییە لەژێرسایەی ڕاستیو دروستیدا درەخشانە. ئەو كەسانەی كە درۆزنیو ریاكاریو دووڕوییو ئازاردانی خەڵكو ڕكو كینە دارییان كردۆتە پیشەی خۆیان، لەراستیداویژدانی خۆیان كوێر كردووەو دڵو دەروونیان لەڕووناكیو نورووویژدانی پاك بەتاڵە، بۆیەكا ڕێگەی هەڵە دەگرنەبەرو دوچاری چارەنووسی ڕەشی خۆیان دەبن.

ویژدانی بێدارو دڵو دەرونی ڕۆشەن هەمیشەوانەی مرۆڤایەتیو ئەمەكداریو خۆشەویستیو میهرەبانیو خزمەتكردنی خەڵكو پاكی لەژیاندا بە خەڵك فێردەكاو بەرەو بەختەوەریو خۆشییان دەبێت. بە پێچەوانەوە، ڕوناكیویژدانێك كە خامۆش بووە. ئادەمیزاد بەرەو دڵڕەقیو خراپەكاری دەبێت.

لەروانگەی ئەم بیرەوە، زەردەشت، بەهەشتو دۆزەخ بە ئاسودەیی بیرو ئاسایشیویژدانو نارەحەتیو ئەشكەنجەیویژدان دەزانێت كاتێك كە ئادەمیزاد بیری پاكو ڕۆشەن بێتوویژدانی بێدارو ئاسودەبێ، خۆی لەبەهەشتا دەبینێتەوەو هەموو شتێك لەروانگەی خۆشبینی دەبینێتو لەتەك هەمواندا بە میهرەبانیو خۆشەویستیەوە دەجولێتەوەو هەرگیز هەست بەرك و كینەو بەخیلی بەرامبەر بە كەس ناكات. بە پێچەوانەوە، كاتێك ڕوناكیویژدانی خامۆش بێتو تاریك دابێتو بیری ناراحەت بآ، هەموو شتێك بەچاوی ڕەشبینیەوە دەبینآو بە چاوێلكەی تاریكەوە دەراونێتە هەموو جیهانو ڕەش دەبینآ. بیری ئالێۆزو خراپ لەلایەكەوەو ئەشكەنجەو نارەحەتیویژدان لەلایەكی دیكەوە دوچاری ئەشكەنجەی دەكاو جیهان بەهەموو جوانیو خۆشي یەكیەوە وەك دۆزەخی سوتێنەر دێتە بەرچاوی.

هات34 بەندی 5

((ئەی مەزدا،

چەندە مەزنو بەشکۆیە شالیاریو توانایی تۆ،

چەندە ئارەزوو دەکەم کە لەڕێی تۆدا خزمەت بکەمو بگەمە لای تۆ،

هاورآ لەتەك ڕاستیو بیری خاسدا،

ببمە یارو یاوەری لایەنگرانی تۆ.

لەمەزنان مەزنترت دەزانم،

وبێزارم لەخوا درۆزنەکانو مرۆ خراپەکان.))

لەم بەندەدا، زەردەشت باسی هێزو توانایی لەڕادەبەدەری مەزدا دەکاو لەهەموو شتێك مەزنتری دەزانێت. ئارەزووو ئاواتی ئەوەیە کە بەهۆی کرداری خاسو خزمەتکردنی خەڵکو ڕاستیو دروستیو پاکیو لەژێرسایەی بیری پاكوویژدانی رۆشەنو یارمەتیدانی بآ دەسەلآتانو هەژاران، لەخوا نیزیك ببێتەوە. واتە ئەو کردەوانە ڕێگەن بۆ گەیشتنە لای خوا.

زەردەشت چوار مەرجی داناوە کە دەبنە هۆی نیزیك بونەوە لەئاهورامەزدا، یەکەم راستیو پاکی، دوهەم رۆشەندڵیو خۆشەویستی، سێهەم خزمەتکردنی خەڵکو ئەنجامدانی کاری خاس ئەویش تەنیا لەبەر هەڵسان بە ئەرکی سەرشان نەك بەهیوای وەرگرتنی پاداشت، چوارهەم یارمەتیدانی هەژارانو بێدەرامەتان. لەکۆتایی ئەم بەندەدا، زەردەشت بۆ هۆشیارکردنەوەو ڕێنمایی کردنی بآ باوەڕانو سروشت پەرستانو خەڵکی گومڕا دەبێژێ کە ئاهورامەزدای خوای داناوژیر لەهەموان مەزنترە.

هات 34 بەندی 6

((ئەی مەزدا، ئەی ڕاستی،

وئەی بیری خاس

لەبەرئەوەی بەراستی تۆ بەو شێوەیەی کە ئەز بەدروستی تێگەیشتوم،

لەسەرو هەمووانیو تواناترینی،

کەوایە ئارەزوو دەکەم لەهەموو قۆناغەکانی ژیاندا،

ڕێنماییم بکەیت،

بۆئەوەی لەکانگەی دڵمەوە، نیایشتت بکەم،

وبۆ لای خۆت بگەڕێمەوە.))

زەردەشت، درێژە بە قسەکانی بەندی پێشوو دەداو دەبێژێ:

ئەی مەزدا، ئێستا کە تێگەیشتم تۆ لەسەرو هەموو شتێکیو بلێندترو بەهێزتر لەگشت هێزەکانی بوونی. تەنیا نیایشتی تۆ دەکەمو دەتپەرستم. ئارەزووم ئەوەیە لەهەموو قۆناغەکانو لەگشت بوارەکانی ژیاندا بەتایبەتی لەکاتی دوودڵیو ناخاتر جەمی ڕێنماییم بکەیتو ڕێگەی گوناهم لێبگریت بۆئەوەی بە پاکی بۆ لای خۆت بگەڕێمەوە.

ئەوەی لەم بەندەدا سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە زەردەشت بە تەواوەتیو بەشێوەیەکی زانستی خوای ناسیوەو ئەوەی بۆ ڕۆشەن بۆتەوە کە ئافەریدەگارێك کە زەویو ئاسمانەکانو ئادەمیزادو ئاژەڵو گیاو ئاوو هەموو(بوونی) خولێقاندووە، ئەوە نییە کە بڕێ لەبیری خۆیاندا وەك بت یا خەیالێێك دایانتاشیوە.

زەردەشت دەزانێت ڕابەرو پێشەوای ڕاستەقینەی ئادەمیزاد لەگشت قۆناغەکانی ژیاندا بەتایبەتی لەکاتی سەغڵەتیو سەختیو دوو دڵی، تەنیا ئاهورامەزدای خوای بیروهۆشەو بەس. تەنیا ئەوە کە دەبێ پەنای بۆ ببرێت.

ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە کە بگەڕێتەوە بۆ لای ئاهورامەزدا. لەبەندی پێشوودا مەرجەکانی گەیشتنە لای مەزدای بەراستیو پاکیو خۆشەویستی خەڵکو یارمەتیدانی هەژارانو بێدەرامەتانو کرداری خاس، دانابوو. پاش ئەوەی مرۆڤ ئەو چوار مەرجەی بەجآ هێنا، دەبێ خەریکی ناسینی خۆی بێت چونکو هەرکەس تا خۆی نەناسێت ناتوانێت خوا بناسێت، واتە لەراستیدا هەر کەسێك توانی خۆی بناسێت ئەوە دەتوانێت خواش بناسێت. ئادەمیزاد بۆئەوەی بتوانێت خۆی بناسێت، دەبێ هێزی بیرکردنەوەو ئیرادەو توانایی معنوی خۆی بناسێت، دەبێ بچێتە ناخی دەرونی خۆیو بگەڕێت بەشوێن خاڵە سستیەکانی خۆیو بیاندۆزێتەوەو بە بەهێزکردنو بەکارهێنانی هێزی بیرکردنەوەوویستو ئیرادەی خۆی، ئەو خاڵە سستیانەی

بەهێز بکاتەوەو بە پەروەردەکردنی سیفاتی خاس‌واتە راستیو دروستیو پاکیو جوامێریو ئازایەتی بەسەر درۆو ناپاکیو کینەو سیفاتی نامرۆڤانەو.... سەردەکەوێت.

بەم شێوەیە دەتوانآ هەستی مرۆڤایەتیو خۆشەویستی خەڵک لەبیرو دڵی خۆیدا بەهێزو پەروەردەی بکاو ئامادەبێت بۆ فیداکاری لەپێناوی خەڵکداو خۆخۆییو خۆپەرستی بە تەواوەتی لەبیریدا دوورکەوآو تەنیا بیر لەنیشانەو رووناکییەکانی خوا دەکاتو لەنێو دەرونی خۆیدایەو هەروەك مەشخەڵێك دەدروشێتەوەو رێگەی ژیانی روناك دەکاتەوە.

ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە کە هەموو ئافەریدەکانی خوا بتوانن خوابناسنو بەهۆی رێنمایی ئەوەوە بتوانن ژیانێکی پاكو بآخەوشو پڕ لەکارو کۆششو خزمەتکردنی خەڵک بەرنەسەر.

هات 34 بەندی 7

((ئەی مەزدا،

لەکوێن ئەو دڵدارانەی تۆ؟

کە بە بیری خاسەوە،

ئاگادارن لەئامۆژگارییە بەنرخەکانت.

وئەو ئامۆژگارییانە،

چ لەکاتی خۆشیداو چ لەکاتی سەغلەتیدا،

بە بیرو هۆشەوە ئەنجامی دەدەن.

ئەز جگە لەتۆ کەسی دیکە ناناسم،

کەوایە، لەژێرسایەی راستی،

پەناو پشتیوانم بە.))

لەم بەندەدا زەردەشت دەربارەی ئەو جوامێرو ستایشتگەرە ئەمەکدارانە دەدوآو دەبێژێ: ئەوانەی بەهۆی بیری خاسەوە، خاوەنیویژدانی رۆشەنو زانستو تێگەیشتنن، ئەمانە هەمیشە پەیرەوی لەفەرمانەکانی خوا دەکەنو هەرگیز لەرێی راستو دروست لانادەن، تەنانەت لەکاتی

رەنجو سەختیو سەغلەتیو ئازاری نەیارانیش هەمیشە لەسەر باوەڕی خۆیانو هەوڵوكۆشش دەدەن بۆ بڵاوكردنەوەی ئاینی ڕاستیو دروستیو ئامۆژگارییە معنویەكانی.

زەردەشت ئارەزوو دەكا ئەم جۆرە كەسانە لەلایەن ئاهورامەزداوە لەخراپەو دەستدرێژی نەیاران بپارێزرێنو یارمەتییان بدات. لەدوا دێری ئەم بەندەدا، زەردەشت دوبارەجەخت لەسەر یەكتاپەرستی دەكاو دەبێژێ كە جگە لەئاهورامەزدای خوای داناوژیر، هیچ كەسی دیكە شیاوی ستایشت نییە، هەروەها راستیو دروستی بەتەنیا ئامرازێك بۆ رزگاریو بەختەوەری ئادەمیزاد داناوەو دەبێژێ خوای داناو توانا یارو پشتیوانی مرۆی راستو پاكەو چاودێری یان لێدەكات.

هات 34 بەندی 8

((ئەی مەزدا،

بەڕاستی كافرە درۆزنەكان،

بەكردارە ناشیرینەكانی خۆیان هەراسیان پآ هەلێگرتوین،

چونكو ئەوانە،

مایەی خراپەوویرانین بۆ خەڵك،

دەسەڵاتدارەكانیان ئازار بە بێتواناكان دەگەیەنن،

دوژمنایەتی لەتەك ئاینی تۆدەكەن،

هەرگیز بیر لەڕاستی ناكەنەوە،

ولەبیری خاس ڕوو وەردەگێڕنو پشتی تێدەكەن.))

لەم بەندەدا زەردەشت باسی ئەو كەسانە دەكات كە بآ باوەڕو درۆزننو كردارو رەوشتیان ناپەسەندو ناشیرینە. ئەم ناحەزانە ترسو هەراس دەخەنە دڵی خەڵكەوە. ئەم كۆمەڵە ترسناكە گوێ نادەنە دەستوورەكانی مەزداو ئامۆژگارییەكانی پەیامبەر. لەراستیو پاكی دورن، مانای ئەقلأو هۆشو دڵی بێگەردو رۆشەنو بیری خاس، نازانن. كاروكرداریان بریتیە لەكوشتنوویرانیو خراپەكاری. زۆردارەكانیان فرە بآویژدانانە ستەم لەژێر دەستانو بآ دەسەلآتان دەكەن بۆئەوەی ئازایەتی خۆیان بنوێنن.

هات 34 بەندی 9

((ئەی مەزدا،

ئەو کەسانەی بەکردەوە ناشیرینەکانیان،

ودورکەوتنەوە لەبیری خاس،

خۆشەویستیو جوامێریو پاکی کە لای داناکان بەرێزە،

بەچاوی سوکەوە تەماشادەکەن.

راستی (ئاشا) لێیان دوردەکەوێتەوە،

هەروەکو چلۆن درۆزنانو ستەمکاران

لەئێمە دوور دەکەونەوە.))

لەم بەندەدا باسی ئەوەدەکا بەدکارانو بی هۆشەکانو ئەوانەی هیچ جۆرە بەهرەیەکیان لەبیری خاس نەبردووەو نوقمی دەریای نەزانینو بآ هۆشی بون، ئەمانە، نیشانەو دیاردەی (سپەنتا ئارمەئیتی)، دلۆڤانیو باوەڕو ئەمەکداریو فیداکاری کە لای هۆشمەندانو هۆشیاران ریزی تایبەتیان هەیە، بەچاوی سوکەوە تەماشا دەکەن. ئەمانە ئەو کەسانەن کە راستیو دروستیو پاکی لێیان دور دەکەوێتەوە، چونکو ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە مرۆڤایەتیو دیاردەکانی سپەنتا ئارمەئیتیواتە خۆشەویستیو ئەمەکداریو باوەڕ بەخواو لەخۆبوردن نییەو گیرۆدەی نەزانینو بآهۆشیو کردەوەی ناشیرینو خراپەکاری بون، بێگومان راستیو پاکی بەلایاندا ناچآو لێیان تورِەیە. یاخود بێژین لەو شوێنەی کە خۆشەویستیو باوەڕو خۆبەختکردنو بآفیزی نرخو بایەخێکی نەبێت، راستیو دروستیو پاکی رێی پآ نابەن.

مرۆی نادانو نەزانو هەڵەکارو بآهۆش کاتێك کە هیچ هەستو سۆزێکی نەبآ، بێگومان دلأ رەقو بآویژدان دەبێو هەموو کردەوەیەکی خراپو دژی مرۆڤایەتی لێدەوەشێتەوە.

هات 34 بەندی 10

((مرۆی داناو هۆشمەند دەبێژێ:

به بیری خاسەوە کاربکەن،

خۆشەویستیو باوەڕ بە خوا(سپەنتەئارمەئیتی) کە سەرچاوەی راستەقینەی راستییە

ڕابگرنو ستایشتی بکەن،

وبزانن کە گشت ئەمانە،

لەشالیاریو شکۆی مەزدا ئاهورا خۆیان دەنوێننو دەردەکەون.))

لێرەدا ئاماژە بۆ کارو کردارە مرۆ ناپاکەکان دەکاو زەردەشت دەبێژێت کە ئەرکی سەرشانی مرۆڤی داناوو ژیر ئەوەیە کە ئەم جۆرە کەسانە ئامۆژگاری بکەنو فێری ئەوەیان بکەن کە فێری زانیاربنو بیری خاسو خۆشەویستی خەڵک لەخۆیاندا پەروەردە بکەن.

هەروەها بۆیان ڕون بکەنەوە کە خۆشەویستیو باوەڕ بەخواو خۆشەویتی یەکتر (غەریزەیەکە لەنێو دڵی هەمواندا هەیەو ئەمانە سەرچاوەی راستیو پاکینو لەراستیدا سپەنتەئارمەئیتی بانگەوازیویژدانو راستیە کە ئادەمیزاد بەرەو لای خوا هیدایەت دەکات.

تایبەتکارییەکانی (وەهومەن)و (سپنتەئارمەئیتی) بکەنە سە لەوحەی ژیانیان، واتە هەڵسوکەوتیان لەتەك بیری خاسو هۆشو خۆشەویستی وباوەڕو لەخۆبوردن بێت، ئەوانیش دێنەسەر ڕێی راستو بەرەو لای تۆ دێن. واتە لەراستی دەگەنو بەهرە لەپوختەیی دەبەنو بەرەو خوای داناو ژیر دەڕۆن. ئەمەوانەیەکە کە پێویستی سەرشانی مرۆی داناو هۆشیار پێشان دەدات کە گومڕاو بآ هۆشان هۆشیار بکەنو ڕێی راستیان پێشان بدەن.

هات 34 بەندی 11

((ئەی مەزدا،

دوو خەلآتی تۆ:

پوختەیی (هەئورەتات)و نەمری (ئەمرتات)،

مرۆڤ بەرەو ڕوناکی دەرونیو معنوی ڕێنمایی دەکەن،

لەژێر سێبەری بیری خاس (وەهومەن)و راستیو پاکی (ئاشا)و خۆشەویستیو باوەڕ بەخوا(ئارمەئیتی)،

ژیانی هەمیشەییو هێزو توانای معنوی زێتر دەکات.

ئەی مەزدا:

بە یاریدەی ئەمانە

سەرکەوتن بەسەر نەیاراندا،

وەدەست دێت.))

دوا بەدوای بەندی پێشوو، زەردەشت دەبێژێ:

بەدکرداران‌و درۆزنەکان، بەراهێنانی بیری خاس‌و خۆشەویستیو باوەڕ بەخوا، پیشەکردنی ڕاستیو دروستیو پاکی لەژیانیاندا، دەگەنە پوختەییو نەمرێتی. ئەم دوو نیشانە خواییيە بەرەو روناکی معنوی ڕێنمایی دەکەن‌و بەهرە لەرۆشەندڵیو بینایی دەبەن.

بۆ نیزیك بونە لەخوای داناوژیر، پێویستیمان بە پوختەییو نەمرێتیە، ئەم نیشانانەش پاش گەیشتنە بیری خاس‌و خۆشەویستیو باوەڕ بەخواو راستیو پاکی دێنەدی. ئادەمیزاد بەهۆی ئەم نیشانە ئاهوراییی یانەوە دەتوانآ زاڵ بێت بەسەر رکوکینەی نەیاران‌و بەرەو لای خۆی ڕایان بکێشێت.

بەکورتی بێژین، تێپەڕبون بەسەر هەر شەش قۆناغەکانی ئەمشاسپەندان، مرۆ دەگەیەنێتە روناکی بآ پایان کە مەڵبەندی ئاهورایەو بەهرە لەروناکی معنوی‌وویژدانی دەبێت.

هات 34 بەندی 12

((ئەی مەزدا،

ویست‌و ئاینی تۆچییە؟

چییە

ویست‌و ئیرادەت، وستایشتێك کە شیاوی تۆبێت؟

بۆمان ئاشکرای بکە.

تا بەگوێرەی پەیڕەوی لەفەرمانەکانت بەهرە لەپاداشتەکانت بەرین،

ولەژێرسایەی ڕاستیدا،

ڕێگەو رەوشی خاس بیرکردنەوەو خۆناسین بناسین.))

لەم بەندەدا، زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکات ئەو یاساو ئاینەی کە ئادەمیزاد بەرەو گەشە کردنو پێشکەوتنو پوختەیی دەبێت، بۆ ڕونو دیاری بکات. هەروەها دەخوازێت بزانێت چە جۆرە ستایشتو پەرستنێك شیاوی ئاهورامەزدایە.

زەردەشت دەبێژێ، ئادەمیزاد کاتێك ئەو یاساو ئاینەی بۆ دیاری کراو تێگەیشتو فەرمانەکانی بەجآ هاورد، ئەوسا بێگومان بەهرە لەو پاداشتە وەروڵاخدەگرێ کە مژدەی بۆ دراوە. واتە بەهرە لەبەختەوەریو رزگاری.

لەکۆتاییدا داوا لەپەروەردگار دەکات کە ڕێگەی خاس بیرکردنەوە کە ڕێگەی حۆناسینو کۆنترۆڵی ئارەزووە لەسایەی راستیو پاکیدا پێشان بدات تابتوانێت بەو هۆیەوە ڕێنماییو رابەرایەتی خەڵک بکات ئەوەی کە لەم بەندەدا زێتر شایانی سەرنجە، ڕێگەی خاس بیرکردنەوەو خۆناسینە. ئەو ڕێگەیەی کە ئادەمیزاد دەگەیەنێتە ئامانج. ڕێگەیەك کە مرۆی ژیرو هۆشمەند دەیپێوآ، ڕێگەیەك کە ئادەمیزاد لەخوا نیزیك دەکاتەوە، ڕێگەی خۆناسینو خاس بیرکردنەوە ڕێگەیەکی دژوارو سەختەو تەنیا بەهۆی ڕاستیو پاکیو لەخۆبوردونو دڵێکی پڕ لەمیهرەبانیەوە دەپێوێنرێت. ڕێگەی بیرخاسو پاك، ڕێگەی خۆشەویستی هەموو ئافەریدەکانی خوایە.

هات 34 بەندی 13

((ئەی ئاهورا،

ئەم ڕێگەیەی کە پێشانت دام،

ڕێگەی بیری خاسو فەرمانو ئامۆژگاری سوشیانتەکانە[30]

ئەو ئامۆژگارییانەی کە دەبێژێ:

تەنیا ئەو کارە خاسانەی کە لەسایەی ڕاستیدا ئەنجام دەدرێت،

خۆشیو شادومانی دەگەیەنێت.

ئامۆژگارییەك كە ئادەمیزاد بەرەو زانیاری راستەقینەو هۆش دەبێت،

وپاداشتەكەی گەیشتنە لای تۆیە ئەی مەزدا.))

لەبەندی پێشودا زەردەشت داوا لەخوا دەكات كە لەسایەی راستیدا رێگەی خاس بیركردنەوەو خۆناسینی فێربكات. لەم بەندەدا باسی خاس بیركردنەوە دەكاو دەبێژێ:

رێگەی خاس بیركردنەوە، رێگەیەكە كە ئادەمیزاد دەگەیەنێتە ئارەزووەكانیو بەختەوەریو خۆشی پێدەگەیەنێت. رێگەیەكە كە سوشیانتەكان پیشانی خەڵكیان داوەو خۆیان هەمان رێگەیان پێواوە، رێگەیەكە كە سەرەتاكەی بە ئامۆژگاری رابەرانو پێشەوایان دەستی پێكردووەو دەبێتە مایەی رزگاری ئادەمیزاد.

ئەم رێگەیە بریتیە لە بەئەنجام گەیاندنی هەركارێك بە نیەتی خێرو خاسی بآ ئەوەی چاوەروانی پاداشتی لێبكرێت، تەنیا ئامانجی ئەوەبێت خزمەتی خەڵک بكرێت. رێگەی بیری پاك ئەو رێگەیەیە كە رابەرایەتی خەڵک دەكات بە زانستی راستەقینەو ناهێڵێت گیرۆدەی هەڵێدێربنو لەرێگەی خراپ لایان دەدا. بێگومان كارێك كە لەڕوی هۆشەوەو بۆ گەیشتنە هیوایەكی یەكجار پیرۆز، بآ گوێ دانە سودو زیانی تایبەتی، ئەنجام بدرێت ئەو جۆرە كارانە شادی بەخش دەبێ چونكو بەسودو قازانجی خەڵک تەواو دەبێتو لەئاكامدا دەبێتە مایەی ئاسودەییوێژدانو خۆشبەختیو بەختەوەری ئەو كەسەی بەو كارە هەڵساوە. جگە لەمە پەیڕەوی لەفەرمانو ئامۆژگارییەكانی سوشیانتەكانو مامۆستاو رابەرە رۆحانییەكان ئادەمیزاد بەرەو زانیاریو پوختەیی رابەرایەتی دەكاو لەئەنجامدا گەیشتنە دوا ئارەزوو هیوا كە بریتیە لەگەیشتنە لای خوای یەكتاو داناوژیر.

هات34 بەندی 14

((ئەی ئاهورا،

بێگومان،

جەستەوگیانی ئەو كەسانە

بەهرە دەبەن لەو پاداشتەی مژدەیان پێدراوە

که کردەوەیان بەهۆی بیری خاسەوە بێت،

تێبکۆشن بۆ ئاوەدانیو پێشکەوتنی جیهان،

ولەسایەی راستیدا

ئاینی ئەقلو هۆشی تۆ پێشبخەن

وویستو ئارەزووەکانت بەدیبهێنن.))

لەبەندی پێشودا باسی ئەو پاداشتەمان کرد کە دوا ئارەزووو ئاواتی هەموو کەسێکە، ئەویش بریتیە لەنیزیك بونەوەو گەیشتنە لای خۆشەویستی ڕاستەقینە، واتە خوای داناو ژیر، بۆ گەیشتنە ئەو شوێنە پیرۆزە گوتمان دەبێ رێگەی بیری خاس بگرینە بەرو پەیرەوی لەدەستورو ئامۆژگارییەکانی پیاوخاسانو سوشیانتەکان بگرین.

لەم بەندەدا، دوبارە باسی هەمان پاداشت دەکاو دەبێژێ ئەو کەسانە بەهرە لەم پاداشتە دەبەن کە کارو کرداریان لەروی ئەقلو هۆشەوە بێتو لەهەموو کارێکیاندا بیری خاس ڕەچاوبکەن. هەروەها پێویستە ئەو کەسە هەولأو کۆششێکی زۆر بدات بۆ پێشخستنو ئاوەدانی کۆمەڵگاو کارێك بکات کەویستو ڕەزامەندی خوا بەدی بهێنێت کە بریتیە لەپێشخستنی کۆمەڵگا بەرەو کۆمەڵگایەکی بآخەوشو ئاوەدانو خورەم. لەهەموو هەلسوکەوتیدا راستیو پاکی رەچاوبکاتو هەرگیز بیر لەخراپەو درۆ نەکاتەوە.

بەم شێوەیە ئادەمیزاد دەتوانآ بەهرە لەو پاداشتە وەربگرێت کە مژدەی پێدراوەو ئەویش گەیشتنە لای بارەگای رۆشنایيوویژدانی ئاسودەو بەهەشتە. شیاوی باسە لەم بەندەدا کە سآ فەرمانی ئاسمانیو ئامۆژگاری حەکیمانەمان بۆ رۆشەن دەبێتەوە:

یەکەم: پێویستە مرۆ هەمیشە بە ئەقلو هۆشو ئەندێشەی پاکەوە هەڵسێت بەکاروکردەوەو هەرگیز بێ بیرکردنەوەکارێك ئەنجام نەداتو خۆی دوچاری چارەنووسی رەش نەکا.

دووهەم: لەسەر هەموو کەسێك پێویستە کە تێبکۆشێت بۆ پێشخستنو ئاوەدانی کۆمەڵگاو جیهانو ئاسایشو خۆشی بۆ هەموو خەڵک وەدی بهێنێتو لەرێی کارو کۆششدا درێغی نەکات، چونکە هێنانەدی ئەو ئامانجە تەنیا بەکارو هەوڵوکۆشش دەشآ. بە پێچەوانەوە، تەمەڵیو تەوەزلیو بێکاری جگە لەچارەرەشیو دواکەوتوییو هەژاریو مەینەتی هیچی دیکەی لێوەدەست نایەت.

سآهەم: لەسایەی راستیو دروستیو پاکیدایە کە دەتوانین بۆ هێنانەدیویستو ڕەزامەندی ئافەریدەگار هاوکاری بکەین.

هەرکەسێك ئەو سآ فەرمانو ئامۆژگارییانە بەسەریەکەوە ئەنجام بدات ئەوسا بەهرە لەوپاداشتەی مژدەی پێدراوە دەبێت.

ویستو ئارەزووی پەروەردەگاریش ئەوەیە کە ئافەریدەکانی لەخۆشیو خورِەمیو ئاسایشدابنو بەهرە لەنیعمەتی پوختەیی ببەن بۆئەوەی بگەنە دیداری.

هات34 بەندی 15

((کەوایە ئەی مەزدا،

خاسترینوتەو کردارم فێربکە تا،

بە بیری خاسو راستیو پاکی،

بتناسمو ستایشتت بکەم،

ئەی ئاهورا،

بەویستو تواناییو شالیاری خۆت،

ولەژێر سایەی ڕاستیدا،

ژیانێکی نوێم پێببەخشە.))

ئەم بەندە، دوابەندی (ئەهنودگات)ە. زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکات خاسترین ئامۆژگاری فێربکات کە مایەی رزگاریو بەختەوەری هەموو خەڵک بێت تا بە لایەنگرەکانی خۆی ڕابگەیەنێت، ئەو ئامۆژگارییانە کە مرۆڤ بە خاسترین کرداروتە ڕێنمایی دەکات بۆئەوەی بیکەنە سەرمەشقی رێگەی ژیانیانو پەیرەوی لێبکەن.

هەروەها دەبێژێ کە پێویستە بە ئەقڵو هۆشی رۆشەنو بیری پاکوو نیەتی بآخەوشەوە ستایشتی خوا بکەین.

ستایشتێك کە لەکانگەو ناخی دڵو دەرونەوە نەبێتو بەنیەتی پاکیەوە نەبآو بیرێك کە لەکاتی ستایشت کردندا ئالێۆزو ناپاك بێت، ناگاتە شوێنی خۆیو لەلای خواوە پەسەند نییە، لەکۆتاییدا ئارەزوو دەکا کە هەموو ئافەریدەکانی خوا بەهرە لەژیانێکی نوێی پڕ لەراستیو دروستی بەرن،

واته درۆو خراپە لەهەموو جیهاندا بنبرِبێتو ئادەمیزاد لەژێر سێبەری راستیو پاکیو خۆشەویستی بەهرە لەژیانێکی پوختەو بآکەمایەسیو پێشکەوتوو بەرن.

## سروودی هەشتەم   ئەشتودگات

هات 43 بەندی 1

((مەزدا ئاهورای فرە توانا

برِیاری داوە کە،

کەسێك بەختیارە،

کە خەڵکی دیکە بەختەوەر بکات

ئەی ئافەریدەگار،

ئەز بۆ جێگیرکردنو پەرەسەندنی ئاینی راستی،

داوای هێزو توانای جەستەوگیان دەکەم.

ئەی ئارمەئیتی، ئەی دیاردەی خۆشەویستیو باوەرِ،

ئەو تیشکە یەزدانییەی کە،

پاداشتی ژیانی پرِ لەبیر خاسییە،

پێم ببەخشە.)))

ئەم بەشە لەگاتاکان کە پێی دەبێژرێ(ئەشتودگات) بەمانای خۆشیو شادیو روناکیە، پتر باسی گفتوگۆو پرسیارو داخوازی زەردەشتە لەتەك ئاهورامەزدا دەربارەی نهێنیەکانی (بون)و ژیانو هێزو توانایی خوای داناو ژیر.

زەردەشت پەیامەکەی بۆ جەماوەر ئاشکرا دەکاو ئامۆژگاریمان دەکات کە بۆ گەیشتنە بەختەوەری ڕاستەقینەو پوختەیی دەبێ بیری خاسو دیاردەکانی راستیو دروستیو دلۆڤانیو لەخۆبوردن لەخۆماندا پەروەردە بکەین هەڵسوکەوتمان هاوجوت بێت لەتەکیاندا.

لەم بەندەدا سەرەتا باسی راستییەکی نەگۆڕ لەباوەڕدا دەکاو دەبێژێ کەسێك دەتوانێت بەگوێرەی فەرمانو بڕیاری ئاهورامەزدا بەختیار بێت کە تێبکۆشێت بۆ بەختەوەری هەموو خەڵک.

بەختەوەری راستەقینە بریتیە لەیارمەتیدانی خەڵک، کۆمەك کردنی بێدەرامەتانو هەژارانو لێقەوماوان.

زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکا کە هێزو توانای جەستەوگیانی پآببەخشێت بۆئەوەی بتوانێت پەیامەکەی کە بریتیە لەئاینی راستی بەخاسی بلآوبکاتەوەو هیچ هێزێکی نەیار نەتوانێت رێگەی لێبگرێتو باوەڕی لاوازبکات.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا ئارەزوو دەکا کە بەرخۆردار بێت لەفەڕو تیشکی یەزدانی کە تەنیا لەسایەی راستیو دروستیو بیری خاسەوە وەدەست دێت.

هات 43 بەندی 2

((وەهەروەها،

خاسترین پاداشتەکان

بۆ کەسێکە کە

رووناهی بۆ خۆی گەرەکە،

وڕووناکی بە خەڵک ببەخشێت.

ئەی مەزدا ئاهورا،

بە بیرو ئەندێشەی پاکی خۆت،

ولەژێر سایەی ئاینی ڕاستیدا،

پێمان ببەخشە

زانستێك کە هەڵێقولآوی بیری خاس بێت،

بۆئەوەی بەهرە لەژیانێکی بەختیار بەرین.))

ئەم بەندە تەواوکەرەوەی بەندی پێشووەو تیایدا دەبێژێ کەسێك بیەوێت بەهرە لەروناکی دڵو دەرون وەربگرێت دەبێ هەوڵو کۆششی بۆ بدات ئەوسا بێگومان بە ئارەزووەکانی دەگات.

زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکا کە تیشکی زانیاریو حیکمەت لەدڵو دەرونی هەموو خەڵک بدرەوشێنێتەوە بۆئەوەی بەهرە لەژیانێکی پڕ لەخۆشیو شادی وەربگرن.

بێگومان هەرکەسێك کە خاوەنی بیرو هۆشی پاك بێتو بەدیدێکی زانستییەوە بڕوانێتە ژیان، بەهیچ جۆرێك گیرۆدەی هەڵەو خراپە نابێتو هەرگیز بەکارێك هەڵێناسێت کە دوچاری نوشوستیو خراپەی بکات.

ئەوەی لەم بەندەدا زێتر سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە زەردەشت داوای ژیانێکی بەختەوەرو پڕ لەخۆشیو هەروەها درێژخایەن بۆ هەموو خەڵک دەکات.

هات43 بەندی 3

((کەوایە بەراستی،

خاسترین خاسییەکان ڕەوای کەسێك دەبێ

کە لەژیانی مادیو معنوی،

ڕێگەی ڕاستەقینەی بەختەوەری

کە دەمانگەیەنێتە بارەگای ئاهورا مان

پێشان دەدات

ئەی مەزدا، لەئاکامدا،

بەتیشکی زانیارییەکی خاسو پاكو بێگەرد

ئەویندارەکانت دەگەنەلات.))

لەم بەندەدا، زەردەشت داوای خاسترین پاداشتەکان دەکا بۆ ئەو کەسانەی کە خەڵک ڕێنمایی دەکەنو ڕێگەی راستیان بۆ رۆشەن دەکەنەوە. موبد فیروز ئازەرگوشەسب لەو باوەڕەدایە کە

ئەم بەندە دەشآ یەکی لەنیزیکترین یارانی زەردەشت یاخود خودی زەردەشت بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ گوتوبێتی، بەڵگەی بۆ ئەمە، ئەوەیە کە کەسێك رێگەی راستیو دروستیو بەختەوەری لەم جیهانەداو رێگەی رزگاری تەواوسەنگ لەجیهانی معنوی بە خەڵک پیشانداو رێنمایی کردن بۆ ناسینی راستەقینەی ئاهورامەزدای خوای داناو ژیر، جگە لەخودی زەردەشت کەسی دیکە نەبووە. لەکۆتاییدا دەبێژێ ئەویندارەکانی مەزدا بەهۆی تیشکی زانیاری بیروهۆشی معنویو پاکیەوە لێی نیزیك دەبنەوە.

زەردەشت لێرەدا زۆر بە ڕاشکاویو بەشێوەیەکی رۆشەن رێگەی گەیشتنە لای ئاهورامەزدا بەهۆشو بیرو زانیاریو ژیانێکی پڕ لەراستیو پاکی زانیوە.

هات43 بەندی 4

((ئەی مەزدا،

ئەوکاتە تۆم بە پاکو فرە توانا ناسی

کە تێگەیشتم، تۆ بەهێزو توانای خۆت،

ئارەزووو ئامانجەکانمان بەدی دێنێیت،

ودرۆزنانو راست کرداران،

هەریەکە سزاو پاداشتی خۆیانییان پێدەگەیەنێت،

وبە پرشنگی روناکی خۆت، کە هێزو توانای لەراستییەوەیە،

وگەرمایی بەدڵو دەرون دەبەخشێت،

لەتواناییو بیرو ئەندێشەی خاس

بەهرەدارمان دەکەیت.))

لەم بەندەدا دەفەرموێت، مرۆ کاتێك هەست بە مەزنایەتیو هێزو توانای ئافەریدەگار دەکات کە نیازو ئارەزووەکانی بەدیبێتو بەچاوی خۆی سزاو پاداشتی درۆزنانو راست کرداران ببینێت.

سەرجەم مرۆڤ بە تێکڕایی ئارەزوو ئاواتی یەکجار زۆری هەیەو هەمیشە بۆ هێنانەدی ئارزووەکانی دەستی پاڕانەوەی بۆ ئافەریدەگار درێژەو داوای یاریدەرو کۆمەکی لێدەکات، بەتایبەتی لەو کاتێنەدا کە ئیدی خۆی هیچی پێناکرێتو هیچ دەسەلآتێکی بونابێت ئەوسا تەنیا پەنا بۆ خوا دەبێ، وکاتێ کە داخوازییەکەی بەدی هات، ئەوسا پەی بە توانایی‌و مەزنایەتی خوا دەبێ‌و باوەڕ بەهێزی لەرادەبەدەری دەکات.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا دەبێژێ. هەرکە تیشکی روناکی باوەڕو گڕو بلێیسەو گەرمایی ئەڤین لەنێو دڵی مرۆدا کلپەی سەند، ئەندێشەو بیری ئەو کەسە بەرەو راستی‌و دروستی دەڕواو هەموو بیرو هەستو سۆزی بەرەو پەروەردەگاری مەزن دەڕوات.

هات43 بەندی 5

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەوکاتە تۆم بەپاك ناسی،

کە تۆم لەسەرەتای ژیاندا دی،

وتێگەیشتم،

کەتۆ پاداشتت داناوە بۆوتەو کردار:

سزا بۆ خراپەکاران‌و خاسی بۆ خاسان،

ڕێوڕەسمێك (ئاینێك) کە لەژێرسایەی هونەرو هۆشی تۆ،

هەتاهەتایە

دەمێنێ))

لەم بەندەدا، زەردەشت باسی ئاهورامەزدا دەکاو بەسەرچاوەی ژیان‌و هەمیشەیی دەزانێتو دەبێژێ کە ئافەریدەگار بەهۆی تیشکی هۆش‌و حیکمەتی خۆیەوەو بەگوێرەی یاسای راستی، بۆ هەر کارێکی خاس‌و خراپ، پاداش‌و سزایەکی داناوە. ئەم پاداش‌و سزایە هەتاهەتایەو تا جیهان‌و کەشکەلآن هەیە، بەردەوام دەبێت.

واتە ئاکامی خاسان خاسیەو پاشینەی خراپەکاران چارە رەشی‌و خراپییە.

هات43 بەندی 6

((ئەی مەزدا،

ئەوساتەی کە،

هۆشی پاکی تۆ دەردەکەوێت،

هێزو توانای معنویو ئەندێشەی خاس (وەهومەن)،

لەتەك کردارا (خەشترا)

هەموو جیهان بەرەو ڕاستیو پێشکەوتن دەبێ،

وپاکی (ئارمەئیتی)،

ئاینی ژێرێتی تۆ،

کە هیچ کەس توانای فریودانی نییە،

فێری خاسان دەکات.))

کاتێ هۆشو زانیاری معنویو سپەنتامینو یاخود گەوهەری پاکیو خاسی لەتەك (خەشترا)ی هێزو توانای خزمەتکردنی خەڵکو (وەهومەن) دیاردەی بیری خاس رومان تێدەکاتو لەنێو بیرو دەرونماندا نەشونمای کرد، ئەوسا جیهانی بوون بەرەو راستیو دروستی هەنگاو هەڵێدێنآو پێشدەکەوێتو درۆو خراپەو پاشەگەردانی تێدا نامێنێت.

هەروەها دەبێژێ ئارمەئیتی کە دیاردەی خۆشەویستیو دلۆڤانیەو لەهەمان کاتدا پرشنگی روناکی باوەڕە هەروەك ڕابەرێك مرۆ بەرەو راستیو ڕەوا هیدایەت دەکات.

لەکۆتاییدا دوبارە ئاماژە بۆ مەزنایەتی ئاهورامەزدا دەکاو دەبێژێ، هیچ کەس بە پێچەوانەیویستو ئارەزووی پەروەردەگار ناتوانێت کارێك ئەنجام بداتو هەروەها کەس ناتوانێت خوا فریو بدات چونکو ئەو داناو ژیرە.

هات 43 بەندی 7

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەوکاتە تۆم بە پاك ناسی کە،

ئەندێشەی پاك هاتە لامو لٔی پرسیم:

تۆ کێیتو لەچی بنەمالەیەکی؟

وبۆ ئەو پرسیارو دودڵیو ڕاڕاییانەی رۆژانە،

دەربارەی جیهانو خۆتەوە،

چی ڕآو ڕەوشێك فێردەکەیتو بەکاردێنآ؟))

ئەم بەندە، دیمەنێك پێشان دەدات کە زەردەشت لەشوێنێکی چۆڵێدا، بە تەنیایی نوقمی دەریای بیرو خەیالأ بووەو دەربارەی بڕێ شتی جۆراوجۆر پرسیار دەکات. یاخود بێژین پرسیاری جۆراوجۆر بە مێشکی دا تێپەڕ دەبێ. لەخۆیوورد دەبێتەوەو بەخۆی دەبێژێ تۆ کێیتو لەچی بنەماڵەیەکی، لەکوێوە هاتویو لەئاکامدا بۆکوێ دەچیت، لەژیاندا چی دەکەیو کارو هەڵسوکەوتت چییەو چی ڕێبازێك دەگرێتەبەر. ئایا هەوڵوکۆشش دەدەیەت سودو بەهرە بە خەڵکی بگەیەنێت یاخود تەنیا بە بیرێکی تەسکەوە بەرژەوەندی خۆت رەچاو دەکەیت؟

بۆ ئەم پرسیارانە، تەنیا کاتێك زەردەشت دەتوانێت وەڵامێکی بەجآو دروستیان بداتەوە کە بیری پاکوخاس روی تێبکات، ئەندێشەیەك کە سودی تێدابێتو دوربێت لەبوغزو کینە. ئەندێشەیەکی وەها پاکو بێگەردو دڵو دەرونێکی رۆشەن دەتوانآ ئادەمیزاد لەدوودڵیو ڕاڕاییو نیگەرانی رزگار بکاتو رێگەی راستی پێشان بدات.

زەردەشت لەم کاتێنەدا، واتە کاتێك کە دوودڵیو ڕاڕایی خەریکە زەفەری پێدەبێ، بۆئەوەی خۆی رزگار بکات پەنا دەبێتە بەر ئەندێشەی پاکوویژدانی رۆشەنی خۆیو ئەوسا وەڵامی پرسیارەکانی وەردەگرێت.

هات 43 بەندی 8

((سەرەتا پێمگووت:

ئەز زەردەشتم،

وتا ئەو شوێنەی تواناووزەم هەیە

نەیاری سەرسەختی درۆزنانو بآ باوەڕانم،

وپشتوپەنای بە توانام بۆ ڕاستگۆیان.

ئەی مەزدا، با

تا ئەوکاتەی ستایشتکەری تۆم،

هەمیشە بەهرە بەرم لە

هێزو توانای بآ ئەندازەت.))

دوا بەدوای ئەو پرسیارانەی زەردەشت دەیکاتو نوقمی دەریای بیرکردنەوە دەبێ، وەڵامەکان یەك لەدوای یەك بۆی ڕۆشەنو رون دەبێتەوە. کاتێ کە لەخۆی دەپرسآ تۆ کێیت، خۆی وەڵام دەداتەوەو دەبێژێ: ئەز زەردەشتم، دوژمنی سەرسەختو بآ ئامانی درۆزنانو خراپەکارانم.

ئا لێرەدا زۆر بەڕاشکاوی پەیامەکەی خۆی ئاشکرا دەکا کە بریتیە لە ڕێنمایی خەڵک بەرەو راستیو دروستیوویستو ئارەزووی خۆی دەردەبڕێ دەربارەی چۆنیەتی گەیاندنی پەیامەکەیو دەفەرموێت:

تا ئەو شوێنەی هێزو توانام هەیە ململانێ لەتەك خراپەکارانو درۆزنان دەکەمو بەهەموو هێزو توانامەوە یارمەتی خاسانو دروستکاران دەدەم.

زەردەشت ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ کە گیانوجەستە خۆی بەخت بکات لەپێناوی بلآوکردنەوەو گەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی. بۆ دروست رێنمایی کردنی خەڵکو سەرکەوتن لەگەیاندنی پەیامەکەی، زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکا کە هێزی معنوی پێبدات بۆئەوەی هیچ جۆرە ڕاڕاییو دودڵییەك کار نەکاتە سەرویستو ئارەزووەکانی.

زەردەشت خۆی بە لایەنگرو دۆستی ئاهورامەزدای خوای داناو ژیر دەزانێو هەمیشە بەدڵو بەگیانو بە نیەتێکی پاکەوە ستایشتی دەکاو داوای کۆمەكو یاریدەی لێدەکات. ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە کە هەموو خەڵک تەنیا ڕوبکەنە ئاهورامەزداو تەنآ لایەنگری ئەوبن.

هات 43 بەندی 9

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەوکاتە تۆم بە پاك ناسی کە

بیری خاس هاتە لامو لێی پرسیم:

ستایشتو نوێژ بۆ کێ دەکەیت؟

گوتم:

نوێژ بۆ ڕوناکی معنوی مەزدا دەکەم،

و تا ئەو شوێنەی هێزو توانام هەیە،

دڵو گیانم لەتەك ڕاستیدایە.))

کاتێ مرۆ بە ئەندێشەیەکی بێگەردو پاك نوقمی دەریای بیرکردنەوە دەبێت، دڵی بە روناکی راستەقینە رۆشەن دەبێتو رێگەی فرە لەگێروگرفتو پرسیارەکان دەدۆزێتەوە.

زەردەشت لەم بەندەدا پرسیار لەخۆی دەکاو دەبێژێ، دەبێ ستایشتی کێ بکەمو سوپاسی چی کەسێك بکەم بۆ ئەم هەموو نیعمەتانەی بە مرۆڤی داوە. پاش ئەوەی بیردەکاتەوە، خۆی وەڵامەکەی دەدۆزێتەوەو دەبێژێ تیشكو بلێیسەی روناکی معنوی ئاهورامەزدا (کە لەرواڵەتا بریتیە لە ئاگری پیرۆزو لەروی ماناوە هەمان گەرمایيو هێزو توانای باوەڕە) دەبێ هەمیشە ستایشت بکرێتو لەژێر سایەی ئەم روناکییە دڵبەستی ئاینی راستیو دروستی بین،

لەڕاستیدا، زەردەشت بانگەوازی خەڵکی دەکات کە ڕوبکەنە ئاینی راستیو دروستیو دەبێژێ، تا ئەو شوێنەی هێزو تواناوزەتان هەیە ڕوبکەنە روناکیو ئاگری پیرۆزو لەژێرسایەی تیشکی روناکی معنویو باوەڕ، پەروەردەگاری یەکتاستایشت بکەنو دڵا ببەستن بە راستیو دروستیو پاکی.

هات 43 بەندی 10

((ئەی مەزدا،

کەوایە ڕِێنماییم بکە بەرەو،

ڕاستی کە ئارەزووی دڵمە،

تا بتوانم بەهۆی پەیڕەوی لە پاکییەوە (ئارمەئیتی) پێی بگەم.

پرسیارمان لـآ بکەو تاقیمان بکەرەوە،

چونکو پرسیارو ئەزمونەکانی تۆیە،

کە هێزو توانا

بەرابەران دەبەخشێت.))

زەردەشت لەم بەندەدا ئارەزوووویستی خۆی دەردەبڕێ بەوەی کە گەیشتنە پلەی پوختەیىو پاکییەو دەبێژێ لەژێر سایەی (ئاشا)دا کە ڕاستیو دروستیو پاکییەو بە پەیڕەوی کردن لەباوەڕی ڕاستەقینەو خۆشەویستی خەڵک دەگەینە پوختەیی.

زەردەشت هەمیسان دەست دەکاتەوە بە پرسیار کردنو گەڕان بە شوێنی ڕاستیدا لەنێو دەرونو بیری خۆیەوە. لەبەر ئەوەی لەهەموو بوارێکەوە خۆی ئامادە دەبیناَ بۆ وەرگرتنی پەیامە پیرۆزەکەی کە ئەرکێکی فرە دژوارە، دەفەرموێت: ئەی پەروەردەگاری بآهاوتا تاقیم بکەرەوەو بە هەموو جۆرە ئەزمونێك هەڵیمسەنگێنە بۆئەوەی باوەڕی خۆمت بۆ بسەلمێنم. واتە لێرەدا زەردەشت ئامادەیی خۆی بۆ ڕابەرایەتی خەڵک دەردەبڕێ. ئەم ئەزمونانەی کە زەردەشت خۆی باسیان دەکا بریتین لەخۆڕاگرتن بەرامبەر بە هەموو دەردو ڕەنجو ئەشکەنجەو دژواریو سەرسەختیەکانی ژیانو پتر پەیوەندییان لەتەك معنویاتدایە.

هات 43 بەندی 11

((ئەی مەزدا،

ئەو ساتە تۆم بە پاك ناسی کە

خاس بیرم کردەوە،

ولە ئامۆژگارییەکانت تێگەیشتمو زانیم کە،

چەسپاندنی باوەڕ بەتۆ، لەنێو دڵی خەڵکدا دژوارە

بەڵام ئەز،

ئەو شتەی کە لای تۆ خاسترینە

ئەنجام دەدەم.))

زەردەشت لەم بەندەدا دەفەرموێت: کاتێك کە بەهەموو ئەندێشەوە رومکردە (وەهومەن)، واتە بیری خۆمم پاكو بێگەردکرد، وهەموو هەستو هۆشی خۆمم تەنیا ئاراستەی ئافەریدەگار کرد، ئەوسا هەستم بە مەزنایەتیو پاکی ئەوکردو لەناخی دەرونمدا گڕو بڵێیسەو بینابیەکی یەکجار زۆر جێگیر بوووئیلهامم بۆ هات، لەبەرئەوەیویستم کە هەموو خەڵکی لەجیهاندا بەرەو یەکتاپەرستیو راستیو خواناسینی راستەقینە ڕابەری بکەم، بۆم رۆشەن بۆوە کە تەنیا باوەڕ بە ئاهورامەزدا دەتوانێت ڕآ گوشاو ڕێنمام بێت بۆ ئەم کارە دژوارە.

بێگومان، باوەڕ پآ هێنان بە خەڵک کە لەناخی دەرونیانەوە باوەڕبێنن، کارێکی یەکجار سەختو چەتونە. بەڵام دەبێژێ لەتەك ئەمەشدا هەوڵوکۆشش دەدەم: ڕاستی بە خەڵک ڕابگەیەنم، ڕێنماییان بکەمو دڵیان رۆشەن بکەم. ئەوەی لێرەدا پتر سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە زەردەشت ئامادەیی خۆی دەردەبرآ بۆ ئەنجام دانی هەموو کارێك کە ئاهورامەزدای داناو ژیر بە خاسی دەزانێت هەرچەندە دەشزانێت کە هەڵسان بەم کارە توشی دەردەسەریو ڕەنجو ناخۆشی دەکات، چونکو پەیامەکەی، کە گەیاندنی راستیو دروستیو پاکییە بە خەڵک، لەتەك بەرژەوەندی بڕێ کەسو تاقمو دارو دەستەی ئەو رۆژگارە ناگونجآو دژی بەرژەوەندییەکانیانەو قایل بە وەرگرتنی ئامۆژگارییەکانی نین، بەتایبەتی چینی پیاوە بەنێو ئاینییەکانی ئەو سەردەمە کە بەسەر خەڵکیدا زاڵ بوبون، هەستو بیرو هۆشیانیان زەوت کردبو، وئامادە نەبونوێ بەئاسانی پلەو پایەی خۆیان لەدەست بدەنو خۆیان تەسلیمی راستی بکەن. لەبەر ئەوە بە هەموو توانایەکیان ململانێیان لەتەك ئەم پەیامە تازەیەو ئەو پەیامبەرە دەکرد.

زەردەشت جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە لەتەك هەموو ئەم دژوارییانەدا، خۆی ڕاوڵاخدەگرێو ئەرکی سەرشانی خۆی بەجآ دێنێتو پەیامەکەی ڕادەگەیەنێت.

هات 43 بەندی 12

((ئەوسا،

ئامۆژگارییەکی وەهات کردم، کە تائەوکاتە نەمبیستبوو،

فەرموت:

بۆئەوەی دانابم

رێگەی راستی بگرمە بەر،

تێبکۆشم تا زایەڵەی(سروش) لەنێو دەرونمدا دەنگ بداتەوە،

ولەبەر تیشکی روناکی ئەو تێبگەم

کە هەردوو دەستەی خاسانو بەدکاران،

پاداشتو سزای شیاوی خۆیان وەردەگرن.))

لەم بەندەدا، هەروەك بەندی پێشوو، زەردەشت لەئەندێشەدایە دەربارەی ژیانو بە بیرێکی پاکەوە لەپرسیارەکانی خۆی دەکۆڵێتەوە. کاتێك کە دەبێژێ(ئەوسا ئامۆژگاریت کردم)، لەراستیدا ئاماژە بۆ بانگەوازیویژدان یاخود بێژین فریشتەی (سروش) دەکات کە هەمیشە ئادەمیزاد بەرەو ڕاستیو بآخەوشێتی رابەری دەکا.

زەردەشت دەبێژێ دەبێ تێبکۆشینویژدانی خۆمان کە تیشکێکە لەپرشنگی خوایی، لەنێو دەرونماندا بێداربکەینو گوێ بۆ زایەڵەی ئەو بانگەوازە ڕابگرین کە جگە لە راگەیاندنی ڕەوا هیچی دیکە نییە. پێویستە گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی بین کە بریتین لەویستو خواستی ئاهورامەزداو رەفتاری لەتەکا بکەین بۆئەوەی لەم جیهانەدا بەختەوەرو لەپەسلآندا رزگاربین.

زەردەشت، ئەو نهێنییەی بۆ ئاشکرا بووە کە هەر کەسێك شیاوی هەرچییەك بێت(چاکە یا خراپە) هەر ئەوەی دەستدەکەوآ، واتا هەرچییەك بڕوێنین هەر ئەوە درەو دەکەین.

هات 43 بەندی 13

((ئەی مەزدا،

ئەو ساتە تۆم بەپاك ناسی کە

خاس بیرم کردەوەو

گووتم:

بۆئەوەی بە ئاواتەکانم بگەم،

پێویستیم بە ژیانو تەمەنێکی درێژە،

ئەو ژیانە دڵخوازەی،

کە تەنیا تۆ دەیبەخشیت،

ولەوزەو توانای شالیاری تۆوەیە.))

سەرەتای ئەم بەندە، دوپاتکردنەوەی بەندی یانزەیەو دەبێژێ:

ساتێك کە ئەندێشەی مرۆڤ پاکو خاوێن دەبێتەوە، رووناکی راستەقینەو بینایی‌و تێگەیشتن لەنێو دڵو دەرونیدا دەگەشێتەوە. لەپاشاندا، زەردەشت بۆئەوەی ئاوات‌وویستەکانی بێنەدی، وپەیامەکەی بەخاسی ڕابگەیەنێت، داوای تەمەن درێژی لەئاهورامەزدا دەکات. تەمەن درێژییەك کە زەردەشت داوای دەکا، نەبۆ خۆشگوزەرانی‌و خواردن‌و نوستنە، بەڵکو دەیەوێت زێتر خزمەتی خەڵک بکات‌و پتر هەوڵو کۆششە بدا بۆ پەرەسەندنی ئاینی ڕاستی‌و پێشخستنی کۆمەڵگا.

لەکۆتاییدا، ئەو ژیانە دڵخوازەی کە زەردەشت داوای دەکا، پەیوەندی راستەوخۆی لەتەك (خەشترا)دایە کە دیاردەی هێزو توانای خزمەتکردنی خەڵک‌و کۆششە بۆ پێشخستنی کۆمەڵگا.

کەواتە، ئارەزووی تەمەندرێژی زەردەشت تەنیا بۆ ژینێکی ئاسایی بردنەسەر نییە، بەڵکو بۆ پتر هەوڵ‌وکۆششە لەپێناو ئاوەدانکردنەوەو پێشخستنی کۆمەڵگای جیهانیە.

هات 43 بەندی 14

((ئەی مەزدا،

هەر بەو شێوەیەی مرۆی تواناو دڵر،

خۆشی‌و شادی بەهاورێکەی دەبەخشێ،

ئەتۆش، بەهۆی شکۆو شالیاری خۆتەوە،

ولەبەر تیشکی رووناکی ڕاستیدا،

خۆشیو بەختەوەری

بەلایەنگرەکانم ببەخشە.

ئەز، ڕادەپەڕم،

وهاوڕی لەتەك گشت ئەوانەی کە

پەیامی ئاسمانی تۆو ئامۆژگارییەکانت ڕەچاودەکەن،

پشتیوانو پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی تۆ دەبم.))

ئەوەی لێرەدا پتر سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە، زەردەشت، ئاهورامەزدای خوای داناو ژیر، بەچاوی باوکێکی میهرەبانو دۆستو یارێکی نیزیکی خۆی دەبینآ، لەبەرئەمەیە کە چاوەڕێی کۆمەکو یارمەتی لەدۆستی خۆی دەکا بۆ دۆستانو یارانو پەیڕەوانی خۆی.

زەردەشت، خێرو خۆشی بۆ هەموو ئادەمیزاد دەوێت، لەخوا داوای خۆشیو شادییان بۆ دەکات، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە پەیڕەوی لەئاینی ڕاستی دەکەن، چونکو دەزانێت، کاتێك ئادەمیزاد شادو خۆشحال بێت، ورەی بەرز دەبێو پتر حەز لەئیشوکارو کۆشش دەکاو ئامادەیی زێتر دەبێ کە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجآ بهێنآ بۆ هەلێسوراندنی ئیشوکاری کۆمەلآیەتی.

بەپێچەوانەوە، ماتەمو دەست بە ئەژنۆ گرتنو خەمو خەفەت، هێزو توانای مرۆ کەمدەکاتوورەی ئادەمیزاد نزم دەکاتەوەو لەئەنجامدانی ئیشوکار، سستو بێکاری دەکات.

دیسانەوە شایانی باسە کە زەردەشت دەفەرمەوێت، ئەو خۆشیو شادییە کە بەهۆی کۆششو تێکۆشانو لەرێگەی ڕاستیو دروستیەوە بەدەست دێت، مایەی بەختەوەریە، نەك خۆشیو شادی یەك کە لەرێگەی نادروست وەدەست دێت چونکو ئەوەی دواییان کاتییەو زوو لەناودەچآ.

لەکۆتاییدا دەبێژێ، ئەز ڕادەپەڕمو یارمەتی هەموو ئەو کەسانە دەدەم کە ئاینی ڕاستی ئاهورامەزدایان پەسەند کردووەو ئامۆژگارییەکانی ڕەچاو دەکەن.

هات43 بەندی 15

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەو ساتە تۆم بە پاك ناسی کە،

خاس بیرم کردەوەو،

ئەندێشەی پاك هاتە بیرم،

وتیشکی روناکی راستەقینەی خستە نێو دڵمەوە،

ئەوسا زانیم کە،

بیرکردنەوەی قوڵأو ئارام، خاسترین ئامرازی فێربونو بینایی معنویە، ورِابەر نابێ هەرگیز درۆزنانو بآ باوەرِان شادو خۆشحال بکات،

چونکو ئەوانە،

هەمیشە لەتەك پیاو خاسانو پەیرِەوانی راستی نەیارنو

دوژمنایەتییان دەکەن.))

ئەوەی زێتر لەم بەندەدا لەبەرچاوە ئەوەیە کە، قوڵأ بیرکردنەوەو تێفکرین (رِامان)، دەتوانێت دەروازەی زانیاریو فێربون بەرِوی ئادەمیزادا بکاتەوە. بۆ فێربونی زانیاریو گەیشتنە هەقیقەتی ژیان، مرۆ دەبێ بیربکاتەوەو لەتەك ئەندێشەی خۆیدا گفتوگۆ بکاو ماوەیەکی زۆر بچێتە قوڵایی بیرکردنەوەو لەدەوروبەرێکی ئارامدا بێت بۆئەوەی ئەوەی گەرەکێتی پێی بگات.

زەردەشت، لێرەدا دەیەوآ بێژێت کە هیچ دەردو چەرمەسەرییەك نییە کە بەبیرکردنەوەیەکی پاکو قول چارەسەر نەکرێت.

کەوایە، بیرکردنەوەی قوڵأ، خاسترین ئامرازە، بۆ سەرکەوتن بەسەر ناخۆشییەکانی ژیان (هەرچییەك بێت).

هەروەها زەردەشت ئامۆژگاری ململانآ کردنمان دەکا لەتەك درۆزنانو بآ باوەرِانو بیر تەسکانو داوامان لێدەکات کە هەوڵوکۆشش بدەین بۆ رێنماییو هیدایەت کردنیان بۆسەر رێی راست، ونابێ کەمتەرخەمی بنوێنین لەتەکیاندا.

هات43 بەندی 16

((ئەی ئاهورا،

کەوایە زەردەشت

لەبۆ رێنمایی خۆی، خاسترین‌و پاکترین ئەندێشەکان هەڵدەبژێرێ.

هیوادارم،

لەژێر سایەی ڕاستیدا،

ژیانی (مادی)مان بەهێزو پتەوبێت،

پاکی‌و توانایی معنوی

ژیانمان بدرەوشێنێتەوە،

وبیری خاس

پاداشتی باش بە کردەوەکانمان بگەیەنێت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت، بۆ گەیشتنە (پوختەیی)و نیزیك بونەوە لەئاهورامەزدا، بیرکردنەوەی قول‌و دەرونی بە خاسترین ئامرازی ڕێنمایی دەزانێت. پەروەردەکردن‌و گەشەپێدانی بیرکردنەوەی قول‌و بایەخدان بەرۆح، مرۆڤ لەئاهورامەزدا نیزیك دەکاتەوە، چونکو هۆش‌و ئەندێشە پرشنگێك لەروناکی بآ پایانی ئاهورامەزدان. کاتێ دەرونی ئادەمیزاد لەخراپی‌و چەپەڵی خاوێن بۆوە، ئەوسا دەگاتە دوا ئارەزووی خۆی کە بریتیە لەنیزیك بونەوە لەئافەریدەگار.

زەردەشت، ئامۆژگاریمان دەکا کە گەوهەری پاکی یاخود سپەنتامینو هەڵیبژێرین‌و بیکەینە چراو رێنمای رێگەی ژیانمان بۆئەوەی هەرگیز گیرۆدەی هەڵێدێرو پەشیمانی نەبین، هەروەها ئارەزوی ئەوەیە کە، ئادەمیزاد بەتێکڕایی ژیانیان پڕ لەخۆشی‌و ڕاستی‌و دروستی‌و پاکی بێت. هێزو توانای معنوی (وەخشتەرا) هەموو خەڵک بۆ کارو خزمەتکردن راکێشێت‌و دڵو دەرونیان پڕ لەتیشکی رووناکی باوەڕو دلۆڤانی بێت، بۆئەوەی بەرخوردارین لەبەختەوەری‌و (پوختەیی).

هات44 بەندی1

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم راستییەم بۆ ئاشکرابکە،

چۆن ئەویندارانت

تۆ بناسنو ستایشتت بکەن؟

کەی ڕێنمایی

دۆستێکی وەك من دەکەیت؟

وکەی لەبەر تیشکی راستی (ئاشا) دڵخواز

یاریدەم دەدەیت،

تا ئەندێشەی خاسمان (وەهومەن) بۆ بێت؟))

لەم بەشە لەگاتاکاندا، زەردەشت بڕی پرسیاری جۆراوجۆری کردووە، پاش بیرکردنەوەیەکی قولأ، وەڵامەکانی بۆ ڕونبۆتەوە. پرسیارەکانی ئاراستەی ئاهورامەزدای داناو ژێر دەکاو داواکارە لێ کە ڕاستی بۆ ئاشکرا بکات.

لێرەدا دەبێ ئەوە بزانین کە زەردەشت، چۆتە ناخی بیرکردنەوەیەکی یەکجار قولو لەدەرونی خۆیدا خەریکی رازونیازە لەتەك ئاهورامەزداو چاوەڕێی ئیلهامو وەڵام دەکات.

سەرەتا پرسیاری ئەوە دەکا، ئەویندارانی راستەقینەی راستی چلۆن بتوانن ئافەریدەگار بناسنو ستایشتی بکەن.

شایانی باس لەم بەندەدا ئەوەیە کە، زەردەشت خۆی بە ئەویندارو دۆستی ئاهورامەزدا دەزانێ، ودەیەوێت وەك هاوەڵێیکی بەئەمەك ستایشتی ئاهورامەزدا بکاتو بیپەرستێت نەك بە توپزیو لەروی ترسو لەرزەوە.

لەپاشان، زەردەشت ئارەزوو دەکا کە هەموو خەڵک لەژێر سایەی راستیو دروستی بەرخوردارین لەمیهرەبانیو خەلآتی ئاهورامەزدا، دڵو دەرونیان هەمیشە رۆشەن بێت بەهۆی بیرکردنەوەیەکی پاکو قولأ..

هات 44 بەندی 2

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم راستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

سەرچاوەو سەرەتای خاسترین شێوەی ژیان چییە؟

وکەسێك کە عەودالێتیو تێدەکۆشآ بۆی،

چ پاداشتێك وەروڵاخدەگرێ؟

وئەو کەسەی هەلێبژاردەی هەموو خەڵکە

چلۆن لەژێر سایەی ڕاستیدا،

بە پاکی، دۆستو چارەسازی ژیان،

وپارێزگاری هەموو کارە معنوی یەکان دەبێ؟))

لەم بەندەشدا، دیسانەوە زەردەشت بەردەوامە لەسەر پرسیارکردن. دەربارەی سەرەتاو سەرچاوەی خاسترین شێوەو جۆری ژیان دەپرسیت، وچلۆنایەتی وەدەست هێنانی دەوێت.

پاشان، خۆی وەڵام دەداتەوەو دەبێژێ: ئەو کەسەی کە عەودالی ئەو جۆرە ژیانەیە، وتێدەکۆشآ بۆ وەدەستهێنانی، بێگومان پاداشتی خۆی وەردەگرێت.

کۆتایی ئەم بەندە لەوە دەچآ کە یەکآ لەیارو لایەنگرانی نیزیکی زەردەشت، ئەم بەندەی تەواو کردبآ.

هات44 بەندی 3

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

کـآ لەسەرەتاوە

داهێنەرو سەرچاوەی ڕاستی بوو؟

کـآ، خۆرو هەسارەکانی

فێری گەردەشو خولانەوە کردووە؟

کـآیە کە بەهۆی ئەوەوە،

مانگ، بڕی جار خڕوپڕو هەندێ جار کز دەبێ؟

ئەی مەزدا،

دەمەوێت ئەم شتانەو شتی دیکەش بزانم.))

زەردەشت، لەم بەندەدا دەیەوێت لەرازو نهێنیەکانی ئافراندن، خولانەوەی هەسارەکان، ومانگـو خۆر ئاگاداربێت. گەرەکێتی بزانێت کـآیە یا چ هێزێکە کە ئەم تەکوزیەی داوە بە کەشکەلآن، چ کەسێکە بەهۆی ئەقلو هۆشی خۆیەوە هێڵی ئەم جولآنەوەیانەی دارِشتووە؟ مانگ بڕی جار خڕوپڕو هەندێ جاریش کزو لاوازدەبێ،

زەردەشت، دەیەوێت بزانێت ئەو هێزوووزەیەی کە کۆنترۆڵی ئەم هەموو روداوانە دەکات چییەو کێیە، دەیەوێت هەموو راستیەکان دەربارەی (بون) بزانێت.

هات44 بەندی4

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرابکە،

کێیە ئەو کەسەی،

لەخوارەوە زەوی‌و لەسەرەوە ئاسمانی بەبێ نشێوی

ڕاگرتووە؟

چ کەسێکە

ئاوو گژوگیای ئافراندووە؟

کـآیە ئەو کەسەی

تیژڕەوی بە(با) و(هەور) داوە؟

وئەی مەزدا، کـآیە ئەوکەسەی

ئەندێشەی خاسی هێناوەتە ئارا؟))

ئەم بەندەش، تەواوکەرەوەی بەندی پێشووە، زەردەشت، بەردەوامە لەسەر پریارکردن‌و بیرکردنەوە دەربارەی جیهان‌و نهێنیەکانی، دەیەوێت هەموو شتێك بزانێت. کـآیە ئەم هەسارانەی بەم شێوەیە ڕاگرتووە، چ هێزێکە کە زەوی لەخوارەوەو ئاسمانی لەسەرەوە ڕاگرتووە بآ ئەوەی بەرەو نشێوی بڕوات. ئاوو ڕوەك چلۆن هاتونەتە ئارا، کـآ هێزو توانای داوە بە (با) بەم شێوەیە هەڵێکاو هەور ئاوەها تیژڕەوبێت؟ کـآ بیری خاسی هێناوەتە ئارا؟

هات44 بەندی 5

((ئەی مەزادا ئاهورا

پرسیارت لێدەکەم

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

کام پیشەگەری کارامە،

روناهی‌و تاریکی دەخولقێنێت؟

خەوو هۆشیاری دەهێنێتە ئارا؟

کـآیە ئەو کەسەی،

بەیان‌و نیوەڕۆو شەوی وەدەیهێنا؟

کـێ داوا لەدانا دەکا

پێویستیەکانی سەرشانی ئەنجام بدات؟))

ئەم بەندەش، هەروەك بەندەکانی پێشووە، ئەوەندە رۆشەنو ئاشکرایە کە پێویستی بە شیکردنەوە نییە.

هات44 بەندی 6

((ئەی مەزدا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

ئایا ئەو شتانەی دەیبێژمو فێری دەبم،

بەڕاستی گشتیان دروستن؟

ئایا پاکی (ئارمەئیتی)، بەهۆی کارو کردەوەوە،

ڕاستی، پتر دەکات؟

ولەبەر تیشکی بیری خاس،

شالیاری تۆ، ئاشکرا دەکا؟

ئەی مەزدا،

بۆ کـآ

ئەم جیهانە پڕ لەپیتو بەرەکەتو شادی بەخشەت دروست کردووە؟))

لەم بەندەدا، زەردەشت، بڕی پرسیاری کردووە کە لەنێو پرسیارەکاندا وەڵامەکانیشی ڕەچاو کردووە، بۆوێنە: دەفەرموێت: ئایا بەهۆی ئەوینو باوەڕ بەخواو لەژێرسایەی کاری خاسدا،

راستیو دروستی پتر دەبێت؟ گومانی تێدا نییە کاتێك مرۆ باوەڕی تەواوسەنگی بە ئافەریدەگار هەبێت، ولەهەموو هەڵسوکەوتو کارەکانیدا، راستیو پاکیو ئەمانەت رەچاوبکات، ئەوکاتە راستیو دروستی پتر دەبێو کەس وەدوی خراپەو درۆو ڕیاکاری ناروات. هەروەها بیری پاكو خاس کە دوربێت لەئەندێشەی بوغزو کینەو خراپە، هێزو توانای یەزدانیو معنوی لەمرۆ پتر دەکات.

لەکۆتاییدا دەبێژێ: ئەم جیهانە پڕ لەپیتو بەرەکەتو جوانیو شادی بەخشەت بۆ ئافراندوین بۆئەوەی سوود لەهەموو خۆشیو نیعمەتەکانی وەربگرین، وبەخۆشیو بەختیاری تیایدا بژین.

هات44 بەندی 7

((ئەی ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چ کەسێك،

هێزو توانای معنوی (خەشترا) لەتەك پاکیدا (ئارمەئیتی) ئافراند؟

چ کەسێك بەداناییەوە

خۆشەویستی منداڵی خستە دڵی بابەوە؟

ئەز، هەمیشە تێدەکۆشم، ئەی مەزدا،

بەم پرسیارانەو بە بیری پاکەوە،

تۆ بە ئافەریدەگاری هەموو (بوون)بزانم.))

لەم بەندەدا، زەردەشت پاش ئەوەی هەندێ پرسیاری دیکە دەکات، دەفەرموێت: کە بەهۆی ئەم پرسیارانەو بە بیری پاکو هۆشی تەواوەوە بۆم رۆشەنو ڕوون بووە کە، ئاهورامەزدای داناو ژیر، ئافەریدەگاری هەموو شتێکە، ئەوە بە داناییو هۆشێکی تەواوسەنگەوە، خۆشەویستی باوکو فەرزەندی خستۆتە نێودڵی یەکدی. ئەوە هۆی هەستو سۆزی مرۆڤایەتی.

هات44 بەندی 8

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

بۆئەوەی بتوانم بیر لەئامۆژگارییەکانت بکەمەوە،

ئەی مەزدا،

گەرەکمە بەهۆی بیری خاسەوە (وەهومەن)،

هەست بە ئامۆژگارییەکانت بکەم.

چلۆن لەژێر سایەی راستیدا (ئاشا)،

دەگەمە ژیانێکی پوختە،

وبەرخوردار دەبم لەشادیو ئاسودەیی ڕەوانوویژدان؟))

زەردەشت، بۆئەوەی بتوانێت ئەرکی سەرشانی خۆی کە بریتی بو لە ڕێنمایی کردنی خەڵک، بە خاسی ئەنجام بدات، دەبوایە ماوەی دە ساڵێك، بە تەنیایی لەگۆشەیەکدا خەلێوەت بکاو تەنیا خەریکی بیرکردنەوەبێت، بیر لەو گیروگرفتانە بکاتەوە کە خەڵکی دوچاری بون، ورێگەی چارەسەرکردنیان بدۆزێتەوە.

بڕی جار، دەچووە بیرکردنەوەیەکی یەکجار قولأ، ئەوسا ئیلهامی بۆ دەهات، بیری بە تیشکی زانست رۆشەن دەبۆوەو نهێنیەکانی بوونی بۆ ئاشکرا دەبوو.

لەم بەندەدا، ئەوە دەبینین کە، زەردەشت بیر لەو شتانە دەکاتەوە کە بۆی ئیلهام بووە، داوا لەئاهورامەزدای خوای داناو ژیر دەکات، بەهۆی بیری پاکەوە (وەهومەن) بتوانێت ئەو ئامۆژگارییانەی کە پێی ئیلهام دەبێ، هەڵیسەنگێنێو هەستو باوەڕی پێبکات، بۆئەوەی بەخەڵکی ڕابگەیەنێت. داوا دەکا کە بەهۆی راستیو پاکییەوە پوختە بێت.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا، پرسیار دەکا چلۆن دەتوانآ، ودەبێ چ بکات بۆئەوەی رۆحو رەوانی بەرخوردابێت لەشادیو ئاسایشو ئارامی.

ئەوەی شایانی باسە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، هەر لەم بەندەدا، خۆی وەڵامی داوەتەوەو دەبێژێ: لەژێر سایەی بیری خاسو هەستکردن بە ئامۆژگارییەکانی ئاهورامەزدا، هەروەها بەهۆی پاکیو راستیو بەرخورداری لەپوختەییویژدان، مرۆ هەست بە شادیو بەختیاریو ئارامی دەکات.

هات44 بەندی 9

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چۆن زاتی خۆم بۆ خزمەتگوزاری خەڵک،

دەربەست پێشکەشی تۆ بکەم؟

تا بەو هۆیەوە،

وبەهۆی ئەو زانیارییەی کە لەسایەی شالیاری تۆوە فێری دەبم،

وهەروەها بەهۆی توانایی معنوی،

وڕاستیو بیری خاسەوە،

بەرەو بارەگای تۆ ڕآ بگرمەبەر.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژی: فەرمانو ئامۆژگارییەکانی یەزدان، فێرمان دەکا کە چلۆن لەپێناوی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانمانو خزمەتکردنی خەڵک، درێغی لەهیچ شتێك نەکەین، گیانی خۆمانی بۆ بەخت بکەین، هەروەکو چۆن ئەم پەیامبەرە مەزنەمان، گیانی خۆی فیدای بە ئەنجام گەیاندنی پەیامەکەیو ڕێنمایی کردنی خەڵک کرد.

کاتێك كه زەردەشت، ئەم پرسیارە دەکاو دەبێژێ چلۆن زاتی خۆی لەپێناوی خزمەتکردنی خەڵک پێشکەش بە ئاهورامەزدا بکات، مەبەستی ئەوەیە کە بێژێت ئەو کەسەی کە ڕێبازی ڕاستی دەگریتە بەر، بەهەموو باوەڕو پەنایەك کە بەخوای هەیە، هەموو زاتی خۆیووژیدانو بوونی خۆی، لەپێناوی خزمەتکردنی خەڵک بەکاردێنێت، بۆئەوەی لەبارەگای خوا نیزیك بێتەوە. لەکۆتاییدا دەبێژێ: کەسێك کە عەوداڵی گەیشتنە لای ئاهورامەزدایە، کەسێك کە هەموو بیرو هۆشی گەیشتنە لای تەنیا ئەوینی ڕاستەقینەی خۆیەتی، واتە گەیشتنە لای ئافەریدەگار، لەئاکامدا، بە پرشنگی ڕوناکی ئاشا، واتە ڕاستیو خۆشەویستی، لەتەك وەخشتەراواتە خزمەتکردنی خەڵک، جێگەو مەلێبەندی بەهەشتی بەرین دەبێ.

هات 44 بەندی 10

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

ئاینی تۆ چییە؟

کە بۆ هەموو خەڵک خاسترینە،

وهاوڕآ لەتەك ڕاستیدا (ئاشا)،

جیهان بەرەو پێشەوە دەبێت،

ولەژێر سایەی پاکیدا (ئارمەئیتی)،

کارەکانمان ڕوو بە ڕاستی ڕێنمایی دەکا؟

ئەز بەویستو ئارەزووو هۆشی خۆمەوە،

ڕوودەکەمە تۆو ئاینی تۆ)).

لەم بەندەدا، چوار خاڵی گرنگ ڕەچاو کراوە:

یەکەمیان ئەوەیە کە زەردەشت، ئارەزوو دەکا، ئەو شتانەی کە بۆ هەموو خەڵک باشترینەو مایەی بەختەوەرییانە، لەلایەن ئاهورامەزداوە بە شێوەی ئیلهام بێتە بیریەوە بۆئەوەی بتوانێت بەو هۆیەوە بەختیاری بۆ خەڵک دابین بکات.

دوهەم باوەڕو ئاینی زەردەشت، ئاینی راستیو پاکیە، ئاینێکە کە لەتەك یاسای سروشتیدا هاوجوتو هاوڕآیە، وپەیڕەوی کردن لەم ئاینە، هەموو جیهانی (بوون) بەرەو پێشکەوتنو ئاوەدانی دەبێت.

سێهەم، پرشنگو رووناکی باوەڕ بە ئاهورامەزداو پەنابردنە بەری، خەڵک لەگومڕاییو ستەمو بێدادی، دور دەخاتەوە، وبەرەو راستیو دروستی دەیانبات. سەرچاوەی گشت چارە رەشیو مالأوێرانیو بەدبەختیەکانی مرۆڤ، لەبآ باوەڕی بەخوای داناو ژیرو هەروەها فیزو خۆ بەزل زانینێتی.کەوایە، دەبێ داوا لەخوا بکەین کە هەمیشە تیشکی رووناکی باوەڕ لەدڵی یەکە یەکەمان هەڵێگیرسێت بۆئەوەی دوچاری فیزو خراپە نەبین.

چوارهەمیانو گرنگترینیان ئەوەیە کە: ئارەزوو ئاواتی هەموو مرۆڤێك ئەوەیە کە بگاتە لای ئەوینی راستەقینەی خۆی کە بریتیە لەدیداری ئافەریدەگاری داناو ژیر: ئەم دیدارەو چۆنیەتی گەیشتنە لای، چەندین جار زەردەشت لەگاتاکاندا باسی لێکردووە، لێرەشدا دەفەرموێت، بەویستو ئارەزووی خۆمو بەهەموو هۆشو هۆشیارییەکەوە، ئاینی ئاهورامەزدا پەسەند دەکەمو روی تێدەکەم.

هەروەکو لەمەوبەر گوتمان، بەگوێرەی ئامۆژگارییەکانی زەردەشت، پرشنگی رووناکی تەواوسەنگی یەزدانی لەنێو دڵودەرونو مێشکی هەموو مرۆڤێکدا بە (ئەمانەت) دانراوە، ئەم پرشنگانە هەمیشە بەرەو پێشکەوتنو پاکیو پوختەیی مان دەبێت، تا دەمانگەیەنێتە کۆشكو سەرای ئافەریدەگار.

هات44

بەندی 11

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چلۆن پاکێتیو باوەڕ بەخواو میهرەبانی (ئارمەئیتی)،

دەچێتە نێو دڵو دەرونی ئەو کەسانەی کە ڕآو ڕەوشی تۆ فێربوون؟

ئەز، بۆ ئەم کارە

یەکەمین کەسێکم کە لەلایەن تۆوە هەڵبژێراوم،

کەواتە، پەیڕەوانی تۆ بە یارو ئەوانی دیکە بە نەیار دەزانم.))

لەم بەندەدا، ئەوەمان پآ دەبێژێ کە، ئەوانەی پەیڕەوی ئاینی ڕاستین، میهرەبانو پاکو ڕاستگۆن، لەتەك هەمواندا بە نەرمیو میهرەبانی ڕەفتار دەکەن. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە پەیڕەوانی ئەم ئاینە خاستر بتوانن بچنە نێو دڵو دەرونی خەڵکو ئامۆژگارییان بکەن.

زەردەشت لێرەدا، واپێشان دەدا کە یەکەمین کەسێکە لەلایەن ئاهورامەزداوە هەڵبژێردراوە بۆ ڕابەرایەتی، بۆئەوەی ڕێگەی ڕاستی پێشان خەڵک بدات.

لەکۆتاییدا دەبێژێ: ئەوانەی کە گوێ بیستی فەرمانو ئامۆژگاریەکانی ئاهورامەزدای داناو ژیرنو پەیڕەوی لەئاینی یەکتاپەرستی دەکەن، خۆشی دەوێنو بە یارو یاوەری خۆی دەناسآ، وئەوانەشی کە سەرپێچی لەم ئامۆژگاریانە دەکەن، بە نەیاریان دەناسێت.

هات 44 بەندی 12

((ئەی ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

لەنێو ئەوانەی بۆیان دەئاخافم،

کآ ڕاستکردارەو کآ درۆزنە؟

وئەز، ڕووبکەمە چ کەسێك؟

ئەو کەسەی کە خراپەی لەتەکا کراوە.

یا ئەو کەسەی خۆی لەخۆیدا، بەدکارە؟

وچلۆن ئەو درۆزنەی

کە لەتەك ئەو هەموو بەخشینانەی تۆ، لەتەك مندا

ململانێ دەکا، بە بیر خراپی نەزانم؟))

لەڕوانگەی ئەم پرسیارانەدا، وا دەردەکەوێت کەزەردەشت دوچاری دوو دڵی بوبێت، چونکو دەفەرموێت: ئایا داوای هاریکاری لەوانە بکەم کە عەودالی ڕاستین، یاخود ڕووبکەمە هەوادارانی درۆو خراپە؟ ئایا ئامۆژگاری درۆزنانو خراپەکاران بکەم، یاخود کەسانێك کە بەهۆی گوتنیوتەی ڕەواو راستی، رەنج دەبەنو لەلایەن خراپەکارانەوە دوچاری ئەشکەنجەو ئازار دەبن؟ ئایا سزاوارە کە لەتەك ئەوانەی ئەم هەموو خەلآتو بەخشینەی ئافەریدەگار دەبینو هەستی پێدەکەن، بەچاوی سووکایەتیی تێی دەروانن‌و بە هیچی نازانن، خراپەو درۆو تاوان دلأ رەشی کردون، دۆست بەو بە خراپیان نەزانم؟ یاخود دەبێ تا ئەو شوێنەی بۆم دەکرێت، دوربم لەم جۆرە کەسانەو ئاگاداری خەڵکی بکەم کە دورکەونەوە ڵیان.

هات 44 بەندی 13

((ئەی ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چلۆن خۆمان لەدرۆ دوور ڕابگرینو دووری بخەینەوە؟

وچۆن چۆنی،

لەو کەسانەی کەسەرکێشن،

وتێناکۆشن بۆ پەیڕەوی کردن لەراستی

وبیری خاس ناکەنەوە، دوور بکەوینەوە؟))

دوا بەدوای ئەوەی کە زەردەشت، لەبەندی پێشوودا، ئەوپرسیارانەی کرد کە ڕوی ئاخافتنی بکاتە کام یەك لەو دوو دەستەیە، راستکرداران یاخود خراپەکاران.

لێرەدا زۆر بەڕاشکاوی دەفەرمویت، مرۆ دەبێ تێبکۆشێت تا مۆتەکەی درۆو فریوو ڕیا لەخۆی دووربخاتەوە.

دووره پەرێز بێت لەبآ باوەڕانو خراپەکاران.

ئەوەی لەم بەندەدا دەستگیرمان دەبێ ئەوەیە کە:

دەبێ درۆ (کە سەرچاوەی هەموو خراپەکارانە) لەخۆمان دوور بخەینەوەو هەمیشە عەودالًی راستیو دروستی بین، خۆمان لەبآ باوەڕان دووربخەینەوە، تا ئەو شوێنەی دەتوانین دووره پەرێز بین لەو کەسانەی بیر خراپن، نایانەوێت هەنگاوێك هەڵێنێن بۆ پێشخستنی کۆمەڵأو خۆشیان.

زەردەشت، لێرەدا دژایەتی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر دل رەشانو خراپەکارانو ئامۆژگاری خەڵک دەکا کە لًیان دوور بکەونەوە.

هات44 بەندی14

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چۆن چۆنی درۆ بسپێرینە دەست راستی؟

تا بەهۆی پەیامو ئامۆژگاریە هۆشمەندو پیرۆزەکانت،

پاك ببنەوە،

ولەم رێگەیەوە

درۆزنان دوچاری نوشوستی بن،

وفریوو ئازاریان بنبڕبێت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت زۆر بەجوانی مژدەی بە هەموو خەڵک داوە کە، سەرکەوتن بۆ راستیە بەسەر درۆدا، ڕەوا بەسەر نارەوا، خاسی بەسەر خراپی.

پرسیار ئەوەیە، چلۆن دەتوانرآ بەسەر درۆدا زاڵ بینو هەموو جیهان لەفریوو ریاو خراپەی درۆزنانو بەدکاران پاك بکەینەوە، لەوەڵامدا خۆی دەفەرموێت: پەیڕەوی لەئامۆژگاریو فەرمانەکانی ئاهورامەزدا دەتوانێت رقو کینەو خراپەکاری درۆزنان بآ بایەخ بکات، رۆحو رەوانی چەپەڵی خراپەکارانو بەدکرداران خاوێن بکاتەوە، وبەرەو راستیو دروستی یان بەرێت.

ئەمەوانەیەکی یەکجار پیرۆزە کە هەموو خەڵک فێردەکا چ بکەن، هیوایەکە بۆ ئادەمیزاد، کە لەکاتی تەنگانەو ناخۆشیدا ڕەشبین نەبنو بەدیدێکی رۆشەنەوە بڕواننە پاشەرۆژ، دەست لەکارو کۆشش هەڵنەگرن، وبزانن کە لەئاکامدا چاکە بەسەر خراپە دا زاڵ دەبێت.

ئەوەی لێرەدا دەردەکەوێت، ئەوەیە بە شێوەیەکی ڕاشکاو ئاشکرا بووە کە، لەئاکامدا درۆزنانو بیر خراپان، بەهۆی ئامۆژگارییەکانی زەردەشتەوە، پەشیمان دەبنەوەو پەیڕەوی لێدەکەن، ڕوودەکەنە راستیو دروستی، وپاکی دەکەنە پیشەیان. واتە دەست لەبیری خراپ هەڵێدەگرنو لێ دوور دەکەونەوە.

هات44 بەندی 15

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم راستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

لەبەر ئەوەی تۆ دەتوانی لەژێرسایەی راستیدا،

پشتوپەنای ڕاستکرداران بیت،

ئایا، کاتێك کە دوو دەستەی ناساز بە یەکدەگەن،

بەگوێرەی ئەو یاسایەی داتڕشتووە،

بەکام یەك لەو دوو دەستەیەو لەکوآ،

سەرکەوتن دەبەخشیت؟))

زەردەشت، داوا لەئاهورامەزدای توانا دەکات کە بەهۆی راستیەوە، واتە یاسای سروشتیو راستیو پاکی، پارێزگاری لەراستکرداران بکات کە دەستی جەوروستەمی درۆزنانو خراپەکاران نەتوانآ ئازاریان پآ بگەیەنێت.

هەروەها دەپرسآ، کاتێك کە دوو دەستە یا دوو سوپای دژ بەیەك، بەرامبەر یەکدی ڕادەوێستێن (یانی دەستەی هەوادارانی درۆو خراپە بەرامبەر دەستەی خواپەرستانو راستگۆیان)، کام یەك لەم دوو دەستەیە، بەگوێرەی یاسای یەزدانی، سەردەکەون؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لەبەندی پێشودا دراوەتەوە.دەبینین کە لەئاکامدا راستی بەسەر درۆدا سەردەکەوێت.

ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەیە کە، هەر زەردەشتیەك پێویستە لەسەری هەمیشە لەتەك هێزو توانای ئەهریمەنی لەململانێ دابێت، هەواو هەوەسو ئەو ئارەزووە دەرونیانەی کە سەرچاوەکانیان لەبیرکردنەوەی خراپەوەیە، لەخۆی دوورخاتەوە، وخۆی نەسپێرێتە دەست بیری خراپو خراپەکاران.

ململانێی نێوان خاسیو خراپی هەمیشەییە، بەڵآم لەئاکامدا سەرکەوتن بۆ خاسانو خواپەرستانو دروستکردارانە.

هات 44 بەندی 16

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم راستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

ئەو کەسەی بەهۆی ئامۆژگارییەکانت

سەردەکەوێت،

ودەبێتە پشتوپەنای خەڵک، کـآیە؟

ئەو رابەرە داناو چارەسازی ژیانەم پآ بناسێنە،

و(سروش)و بیری خاس(وەهومەن)

بەو کەسەو هەر کەسێك کە خۆت دەخوازیت،

ببەخشە.))

موبد فیروز ئازەرگوشاسب لەکتێبی (گات ها، سرودهای زردشت)، بەرگی دوهەم ل 134، دەربارەی ئەم بەندە دەبێژێ:

لەوە دەچآ کەسێکی دیکە (جگە لەزەردەشت)، ولەوانەیە یەکآ لەقوتابیەکانی زەردەشت، ئەم سرودەی بێژابێت، چونکو زەردەشت لەم بەندەدا هەروەك (الشخص الپالپ الغائب) ناوبراوە. بۆوێنە، ئەو کەسەی لەژێرسایەی ئامۆژگارییەکانی ئاهورامەزدا سەردەکەوێتو دەبێتە پشتوپەنای خەڵکو رێنماییان دەکات، جگە لەزەردەشت کەسێکی دیکە نیە. هەروەها، زەردەشت بە رابەرو داناو چارەسازی ژیان دەزانێت.

لەکۆتاییدا، دوبارە دەبێژێ کە زەردەشت بەهرە لەدووخەلآتی بەنرخی ئاهورایی، واتە (سروش)و(وەهومەن) دەبێت.

بەکورتی، زەردەشت لەم بەندەدا، وەك رابەرێکی ژیر، چارەسازێکی ژیانو بە ئەزمون، کەسێکی خاوەن بیری خاسوویژدانی پاکو بێدارو فەرمانرەوایەکی چالاك، کە فەرمانەکانی ئاهورا ئەنجام دەدا، ناسێنراوە، کەسێك کە ئامۆژگارییەکانی دەتوانێت ئادەمیزاد لەفرە لەگرفتارو چەرمەسەرییەکانی ژیان رزگاربکات.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا، بێژەر لەخوا دەخوازێت کە: هەرکەسێك کە کۆشش دەکا بۆ پێشخستنی کۆمەڵگا، وخەڵکی بەرەو راستیو دروستی دەبێ، بە یارو یاوەری خۆی بزانێتو سروشو (وەهومەن)ی پآ ببەخشێت.

هات 44 بەندی 17

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چلۆن بەهۆی ڕێنمایی تۆوە،

ئاواتم دێتەدیو دەگەمە خزمەتت؟

کەیوتەکانم جێگەی خۆیان لەنێو دڵی خەڵک دەکەنەوە،

تا بەو پەیامەی کە لەسەرچاوەی ڕاستییەوە هەڵێدەقولێیت،

خەڵک،

بەرەو پاکیو بێخەوشێتیو نەمرێتی ڕێنمایی بکەم.))

ئەم بەندەش، دوبارە دەربارەی دوا ئاواتی زەردەشت دەدوآ کە بریتیە لە، گەیشتنە ئامانج، واتە گەیشتنە لای ئەوینی راستەقینەی خۆیو یەکبون لەتەکیادا. زەردەشت، تەنیا ئاواتی ئەوە نیە خۆی بگاتە ئامانجەکەی، بەڵکو دەیەوێت کە هەموو خەڵک رێگەی گەیشتنە پلەی پوختەییو بآ کەمایەسی بپێون، وهەموان بگەنە ئەو ئامانجە پیرۆزە. زەردەشت دەبێژێ: تێدەکۆشم بە هەموو توانامەوە بەوتەی خاس، ئەو پەیامە ئاسمانیەی کە لەسەرچاوەی راستیەوە هەڵێقولآوە بە هەموو خەڵکی ڕابگەیەنم، بۆئەوەی پەیرەوی لەراستی بکەنو ئەو پەیامە بکەنە سەر لەوحەی ژیانیانو بەرەو پوختەییو کەمالو نەمریتی هەنگاو هەڵێبێنن. ئەوەی لەم بەندەدا، زێتر ئاشکرایە ئەوەیە کە زەردەشت، دەخوازێت هەموو خەڵک بگەنە ئەو بەختەوەریە کە بریتیە لە گەیشتنە لای خوا. بۆ ئەم کارەش هەروەکو لەمەوبەر گوتمان تەنیا لەرێگەی پەروەردەکردنی ئەو دیاردەو نیشانە خاسانەیەو بەس.

هات 44 بەندی 18

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم،

ئەم ڕاستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

چلۆن لەژێرسایەی ڕاستیدا،

ئەو پاداشتەم پآ دەبەخشی کە

(دە) هەستو هێزی دەرو دەرونیم[31]

زێترو بەهێزترو درەخشانتر بێت؟

تا لەتەك ئەوانەدا، لەپوختەیی‌و نەمرێتی بگەم،

وپێشکەش بە خەڵکیان بکەم.))

پاداشتێك کە زەردەشت لەم بەندەدا دەیخوازآ، بریتیە لەبەهرەمەندبون لەهێزی بیرکردنەوەیەکی خاس‌و دیدو بۆچونێکی پێویست بۆئەوەی هەر (دە) هەستەکان رابەری بکات، هەروەها بەهرەبردن لەراستی‌وویژدانی پاکو رۆشەن، لەئاکامدا، گەیشتنە رۆشنایی هەمیشەیی کە بریتیە لەگەیشتنە لای خوا.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا، زەردەشت وەك هەمیشە، بیر لەبەختەوەری‌و رزگاری هەموو خەڵک دەکات. هیواو ئاواتی ئەوەیە کە هەموو بگەنە پوختەیی‌و نەمرێتی‌و بەهۆی ئەندێشەی پاکەوە بەسەر هەواو هەوەسی خۆیان زاڵ بن‌و دڵو دەرونیان بەتیشکی رووناکی یەزدانی رۆشەن بێت.

هات44 بەندی 19

((ئەی ئاهورا،

پرسیارت لێدەکەم

ئەم راستیەم بۆ ئاشکرا بکە،

کاتێك کە نیازمەندێکی ڕاستگۆ

دەچێتە لای کەسێك،

وئەو کەسە، وەڵام یا پاداشتی پێویستی ناداتەوە،

سزاو تاوانی ئەو کەسە چییە؟

ئەز، ئاگادارم لەو سزایەی لەرۆژی پەسلآندا پێی دەگات.))

زەردەشت، لەم بەندەدا، زێتر ئاماژەی بۆ پیسکەیی‌و نارِەسەنی برِی کەس کردووە. سزای تایبەتییان بۆ دەخوازێ، چ لەم جیهانەداو چ لەرۆژی پەسلاندا، پێویستە مرۆی توانا لەهەموو بوارەکاندا، یارمەتی بآ توانایان‌و کەمدەرامەتان بدەن، ئەوەی دانایە، دەبێ نەزانان فێربکات، ئەوەی دەسەلآتدارە کۆمەکی بآ دەسەلآتان بکات.

ئەموانەیەی لەم بەندەدا فێری دەبین، ئەوەیە کە:

پێویستە یارمەتی نیازمەندانی دروستکردارو راستگۆ بدەین، ژێربالّی ستەم لێکراوان بگرینو داکۆکیان لـآ بکەین.

هات44 بەندی 20

((ئەی مەزدا،

ئەمەش دەپرسم،

چلۆن بەدکرداران دەتوانن ببنە شالیارانی خاس؟

ئەوانەی کە،

بە یاریدەی (کەرپەن)و (کاوی)و (ئوسیخش)[32]

جیهانیان پڕ لەکینەو ئازار کردووە،

وخەڵکیان دوچاری ئاەونالّەو هاوار کردووە،

وهەرگیز لەسەر ڕێگەی راست نەبوون،

وهەوڵیان نەداوە کۆمەڵگا ئاوەدان بکەنو

بەرەو پێشەوەی بەرن.))

لەم بەندەدا، زەردەشت باسی نەیارانی خۆی دەکا کە چلۆن کۆمەڵگایان ئالۆزکردووە، خەڵکیان گیرۆدەی ئازارو ئەشکەنجە کردووە.

دەبێژێ: ئەو کەسانەی کە لەپێناوی گەیشتنە ئارەزووە چەپەڵەکانیان ئامادەن هەمو جۆرە خراپەکارییەك ئەنجام بدەن، ئەو کەسانەی کە پیاوەتیو جوامێری بەلایانەوە پوچو بآ بایەخە، ئەو کەسانەی گوێی خۆیان لەئاست ئەو پەیامە پیرۆزە کپ کردووە بۆئەوەی نەبیستنو چاوی خۆیان بۆ نەبینینی هەموو جۆرە راستیەك داخستووە، ئەو کەسانەی خۆیان خستۆتە نێو داوی (کەرپەنو کاویو ئوسیخش)ەکان، کە لەنەیارە سەرسەختەکانی زەردەشتن، ئایا ئەو کەسە ناپاکانە دەتوانن رۆژی لەرۆژان ببنە فەرمانڕەوایەکی پاکو دادپەروەر. ئایا رۆژآ دەبێ ئەمانە

بێنەسەر رێی راستو دروست، ولەژێر سایەی راستیدا تێبکۆشن بۆ ئاوەدانیو پێشخستنی کۆمەڵگا، ولەبری رقو قینەو خراپە، ئاشتی، خۆشەویستیو ئاسایش لەجیهاندا دابین بکەن.

زەردەشت، لەو باوەڕەدا نیە کە ئەمانە بێنە سەر رێی راست، چونکو ئەم جۆرە نەیارانە بریاریان داوە کە تا دوا هەناسەی ژینیان، دوژمنایەتی زەردەشتو ئاینی یەکتاپەرستی بکەن.

## سروودی دەیەم

هات45 بەندی 1

((ئێستا بۆتان دەئاخافم،

گوێم بۆ ڕابگرن،

ئەی ئەو کەسانەی عەودالی بیستنن،

وئەی ئەو کەسانەی لەڕێی دوورو نیزیکەوە هاتون،

هەموو، ئەم قسانەم بە خاسی وەربگرنو لەیادی مەکەن،

نەکا کوناَ،

ڕێنما خراپەکان،

هەمیسان ژیانتان لـآ چەواشە بکەن

ودرۆزنەکانو خراپەکاران بەگوفتارو بیرە خراپەکانیان،

گومڕاتان بکەنەوە.))

لەم بەندەداوا دەردەکەوێت، کە زەردەشت بۆ جەماوەرێکی زۆر قسە دەکات. خەڵکێك کە لەرێگەی دوورو نیزیکیەوە هاتون بۆ بیستنی ئامۆژگاریووتە پیرۆزەکانی. لەراستیدا ئەم بەندە، بەندێکی ئیرشادیە کە ڕاستەوخۆ لەتەك خەڵکدا قسە دەکاو ئامۆژگارییان دەکات، زۆر بەڕاشکاوی دەبێژێ، کە پێویستە لەسەریان دووربکەونەوە لەرێنما خراپەکانو بە قسەیان

نەکەن، چونکو ئەوانە تەنیا ژینیان لـآ تێکدەدەن‌و گومڕایان دەکەن‌و جگە لەخراپەو خراپەکاری، هیچ کارێکی دیکەیان لـآ ناوەشێتەوە.

هات45 بەندی 2

((ئێستا دەربارەی دوو گەوهەر دەئاخافم،

کە لەسەرەتای ژیاندا، بوون.

لەو دوانە، گەوهەری پاك بەوی دیکەی گووت:

لەنێوان هەردووکماندا،

نە ئەندێشەو ئامۆژگاری، نە هۆش‌و نەباوەڕ،

نە گوفتارو نەکردارو نەویژدان‌و نە رەوانمان،

پێکەوە هاوجووت‌و سازگار نین.))

دوا بەدوای بەندی پێشو، کە زەردەشت ڕاستەوخۆ خەریکی ئاخافتن بوو بۆ خەڵکو داوای لێدەکردن کە دوور بکەونەوە لەرێنما خراپەکان، لەم بەندەدا، دەربارەی دوو گەوهەری هاوالأ دوانەواتە، (سپەنتامینو)و (ئەنگرەمینو) دەدوێت.

ئەم دوو گەوهەرە، یاخود ئەم دوو هێزە دژ بە یەکە، هەر لەسەرەتای ژیاندا، بوون‌و هەتاهەتایە لەتەك بووندا دەمێنن.

ئەم دوو هێزە یا گەوهەرە، لەرووی ئاکاری یەوە، بریتین لەچاکەو خراپە، جوانی‌و ناشیرینی، لەرووی سروشتیەوە وەك (سالب)و (موجب)ن، رۆژو شەون.

زەردەشت لەم بەندەدا، دەربارەی بەهێزترین فەلسەفەی خۆی‌واتە فەلسەفەی (چدین) یاخود چاکەو خراپە دەدوێت‌و دەبێژێ:

ئەم دوو هێزە دژ بەیەکە، هەر لەو ساتەی کە (بوون) هاتۆتە ئارا، ئەمانیش بوون‌و لەتەك بووندا دەمێننەوەو (لازمو ملزوم)ی یەکدین، بەڵام لەهەموو ڕویەکەوە دژ بە یەکترن. وەلـآ ژیان‌و پێشکەوتن بەبێ بوونی ئەم دووانە مەحاڵەو ناچەرخێت.

زەردەشت دەبێژێ: ئەم دوو گەوهەرە (خاسو خراپ) لەهەموو بوارێکدا دژ بە یەکدینو هەرگیز پێکەوە دانویان لەمەنجەڵێکدا ناکوڵی.

هات45 بەندی 3

((ئێستا بۆتان دەئاخافم،

دەربارەی ئەو شتەی مەزدا ئاهورای دانا،

لەبارەی ئوسولی شێوەی ژیان پێی ڕاگەیاندوم،

هەرکەسێك، ئەم پەیامە ئەندێشمەندانە،

کە بەو شێوەیەی ئەز وەرمگرتووەو دەیبێژم،

بەکارنەهێنێت، لەئاکامدا ژیانی

مایەپوچو پڕ لە رەنجو ئەفسوس دەبێت))

پاش ئەوەی لەبەندی پێشودا، باسی جیاوازی نێوان دوو گەوهەری خاسو خراپ، واتە سپەنتامینوو ئەنگرەمینو، کرا، لەم بەندەدا زەردەشت باسی شێوەی ژیان بۆ خەڵک دەکاتو دەبێژێ:

ئەو شتانەی کە لەروانگەی ئامۆژگاریو فەرمانە پیرۆزەکانی ئاهورا فێربووەو بۆ ئێوەی دەبێژم، گوێ بیستی بنو بەدڵو بەگیان پەیڕەوی لێبکەنو لەژیانتاندا بەکاری بهێنن، بۆئەوەی لەم جیهانەدا بەختەوەربنو لەپەسلاندا رزگاربن. بەڵام ئەگەر گوێ رایەڵی ئەم ئامۆژگارییانە نەبن، لەئاکامدا گرفتاری پاشە گەردانیو گیروگرفتو مایەپوچی دەبن، ئەوەندە پەشیمان دەبنەوە کە ژیانتان پڕ لەئاهو حەسرەت دەبێت.

زەردەشت، لێرەدا بە ڕاشکاوی دەبێژێ کە ئەو ئامۆژگارییانەی بۆ خەڵکی دەکات، سەرچاوەکەی ئیلهامێکە کە لەلایەن ئاهورامەزداوە چۆتە ئەندێشەیەوە یاخود بەوتەیەکی دیکە دەبێژێ کە ئامۆژگارییەکانی لەلایەن ئاهورامەزدایەو ئەم راسپاردەیەتی.

هات45 بەندی 4

((ئێستا بۆتان دەئاخافم،

دەربارەی ئەو شتەی لەژیاندا خاسترینە،

ئەمەم بەهۆی (راستی)یەوە دەستکەوتووە:

مەزدا، وەدەیهێنەری راستیە،

مەزدا، سەرچاوەی بیری خاسە،

وبیری خاسیش بۆ هەوڵو تێکۆشانە.

مەزدا، ئافەریدەگاری پاکیە،

وپاکی مایەی کاری خاسە.

ناتوانرآ مەزدای داناو لەهەمووشت ئاگا،

فریو بدرێت.))

ئەم بەندە، کە تەواوکەرەوەی بەندی پێشووە، زەردەشت تیایدا دەبێژی کە: ئێستا دەربارەی خاسترین ئامانجی ژیان قسەتان بۆ دەکەم، دەربارەی راستییەك کە بەهۆی (ئاشا)وە پێم ئیلهام کراوە. ئەوسا باسی ئاهورامەزدا دەکاو دەڵێت کە مەزدا لەهەموو شتێك ئاگادارەو دانایە، ئەوە کە سەرچاوەی ئەندێشەی خاسە، ئەندێشەی خاسیش‌واتە هەوڵو کۆشش بۆ پێشخستنی کۆمەڵگا. هەروەها مەزدا خولقێنەری پاکیەو پاکیش دەبێتە هۆی ئەنجامدانی کاری خاس.

لەکۆتاییدا دەبێژێ کە هیچ هێزو توانایەك نیە بتوانێت ئاهورامەزدای داناو ژیر فریو بدات، کەواتە، دەبێ هەمیشە لەتەك خواوویژدانی خۆمان ڕوراستو راستگۆبین. خاسترین ئامانجو ئاواتێك کە هەرکەس دەبێ بیکاتە سەر لەوحەی ژیانی خۆی، ژیانێکی پڕ لەهەوڵو کۆششە کە لەئەندێشەیەکی پاکو خاسەوە سەرچاوەی گرتبآو راستیو دروستی بەردی بناغەی بێت.

هات45 بەندی 5

((ئێستا بۆتان دەئاخافم،

دەربارەی ئەو شتەی ئاهورامەزدای لەهەموان پاکتر، پێی ڕاگەیاندوم:

ئەو قسانەی کە گوێ ڕایەڵی کردنیو بەکارهێنانی بۆ خەڵک خاسترین شتە.

ئەو کەسانەی گوێ ڕایەڵی ئامۆژگارییەکانم بن،

وبایەخی پآ بدەنو ئەنجامی بدەن،

دەگەنە پوختەیی‌و نەمرێتی،

وبەهۆی ئەو کردارانەی کە لەئەندێشەی پاکەوە دێتە ئارا

دەگەنە مەزدائاهورا.))

دووبارە زەردەشت دەبێژێ، ئامۆژگارییەکانی بۆ خەڵک، لەلایەن ئاهورامەزداوە پێی ئیلهام بووە، ئەم ئامۆژگارییانە ئەگەر هەرکەسێك لەژیانی خۆیدا بەکاری بهێنێت، لەدوو خەلآتی ئاهورایی بەهرەمەند دەبێت کە بریتین لەپوختەیی‌و نەمرێتی.

بێگومان هەرکاتێك مرۆڤ بیری خاس‌و پاکی هەبوو، ڕەفتارو کرداریشی خاس دەبێت‌و لەئاکامدا ڕووناکی ڕاستەقینەی هەمیشەیی.

هات 45 بەندی 6

((ئێستا بۆتان دەئاخافم،

دەربارەی ئەو کەسەی لەمەزنان مەزنترە،

وبەراستی ستایشت دەکەم،

ئەو سەروەرە دانایەو گشت نەمرە پاکەکانی (ئەمشاسپەندەکان).

ئاواتەخوازین، مەزدا ئاهورا،

بە بیرو هۆشی پاکی خۆی، گوێ بیستی ستایشتەکانمان بێت.

هیوادارین،

بەدلۆڤانیو لەژێرسایەی ئەندێشەی خاس، بگەینە لای.

هەروەها دەخوازین، بەهۆی بیرو هۆشی خۆیەوە،

خاسترین شتمان فێربکات.))

لەم بەندەدا، باسی ئاهورامەزداو فریشتەکانی (دیاردەکانی ئاهورا)دەکاو دەبێژێ: زاتی ئاهورامەزدا لەهەموان مەزنترە، کەوایە دەبێ ئەوو هەر شەش دیاردەکانی (یانی شەش فریشتەکانی) کە بریتین لەپرشنگێك لەرووناکی بآ ڕادەی ئاهورا، ستایشت بکەینو بە نیەتێکی پاکو بێگەردەوە روی تێبکەینو ئاواتەخوازیین کە گوێ بیستی ئارەزووەکانمان بێتو ئاواتەکانمان بێنیتەدی. هەروەها دەبێژێ کە داوا لەئافەریدەگاری مەزنو دانا بکەین کە هێزو توانای ئەوەمان پآ ببەخشێت کە لەژێرسایەی ئەندێشەی پاکو دلۆڤانیو باوەڕی راستەقینەو بآ فیزیەوە لًی نیزیك بینەوە، ئەوەندە نیزیك بینەوە لًی کە بتوانین داوای لێبکەین بەرەو رووناکی راستەقینە رێنماییمان بکاتو دوورمێنبخاتەوە لەگومڕاییو خراپەکاری، بەواتەیەکی دیکە، هەرچی شتی خاس هەیە، فێرمان بکات.

هات45 بەندی 7

((ئەو، کەسێکە کە

گشت خاسانو جوامێران،

چ ئەوانەی کە بوون، چ ئەوانەی هەن،

وە چ ئەوانەی کە دەبن،

رزگاری خۆیانی لێدەخوازن.

وە ئەمە بزانن کە

رۆحو رەوانی خاسان، هەمیشە تواناو سەرکەوتودەبێ،

ودرۆزنو خراپەکار، ژیانی پڕ لەرەنجو ئەشکەنجەیە.

ئەمە، یاسایەکە

مەزدا ئاهورا، بەهۆی شالیاری خۆیەوە، بونیادی ناوە.))

لەم بەندەدا، باسی ئەوە دەکات، کە هەموان بەتایبەتی بیرخاسان چ ئەوانەی کە لەرابووردابونو چ ئەوانەی کە ئێستا دەژینو ئەوانەی کە لەپاشەرۆژدا دێنە ئەم جیهانە، هەموان داوای بەختەوەریو رزگاری لەو دەکەن.

ئەو خەلآتەی کە ئاهورامەزدا دەیبەخشێت، واتە بەختەوەریو رزگاری، تەنیا بۆ ئەو کەسانەیە کە پاکو ڕاستگۆو دروستکردارن، بەلآم ئەوانەی کە بآ باوەڕو درۆزنو خراپەکارن، لەم خەلآتە بآ بەرین، بەڵکو بەپێچەوانەوە، دوچاری تەنگوچەڵەمەو ناخۆشیو ئەشکەنجە دەبن. ئەم ناخۆشیانەیان ئەوەندە دەخایەنآ تاوەکو رۆحیان لەگوناە پاك دەبێتەوەو دێنە سەر رێی راست.

موبد فیروز ئازەرگوشەسب لەکتێبی (گات ها، سرودهای زردشت بەرگی دوەم ل 181) لەم بارەوە دەبێژێ:

((... باسی گەڕانەوەی رۆح بۆ ئەم جیهانەو دوبارە دەستپێکردنەوەی ژیانی خراپەکاران تا ئەوکاتە درێژە دەخایەنێت کە بتوانێت بە پاکی بگەرێتەوە بۆ شوێنی ئەسلی خۆی. لەبەرئەوەی رۆحی ئادەمیزاد نەمرەو هەرگیز لەناوچونی بۆ نیەو بریتیە لەپرشنگێك لەسەرچاوەی پڕ لەرووناکی یەزدانی، وپێویستە دوبارە بگەرێتەوە بۆ شوێنی خۆی، بەلآم ڕۆحی خراپەکاران ناتوانن پاش مردنی جەستەیان، بەو شێوە ناپاکیەو پڕ لەگوناهە بگەرێنەوە بۆ شوێنی ئەسلی خۆیان، لەبەرئەوە دوبارە دەگەرێنەوە بۆ ئەم جیهانە مادیەو دوچاری دەردو ئەشکەنجەو ناخۆشی دەبن تاوەکو پاك دەبنو هیچ جۆرە ناپاکیەکیان نامێنێت، ئەوسا روخسەتی ئەوەیان پآ دەدرێت کە بگەرێنەوە شوێنی ئەسڵی خۆیان (بارەگای ئاهورامەزدا) بێگومان هەموو رۆحێك چ پاکو خاس بێت یاخود خراپ بێت، گەرانەوەیان بۆ جێگەی ئەسڵی خۆیان شتێکی بدیهیو بەڵگە نەخوازە، بەلآم جیاوازییەك کە هەیە ئەوەیە، رۆحی خاسو پاك دەتوانآ لەماوەی ژیانێك یا دوو ژیان، لەخەلآتی پوختەییو نەمرێتیو رزگاری بەهرە بەرێت، بەلآم خراپەکارانو تاوانباران چەندین جار دەبێ دوچاری دەردو ئەشکەنجەی رۆحی بن تا بگەنە ئەو پلەیەی کە ئیدی پاکو بێخەوش دەبنو لەو خەلآتانە بەهرە وەردەگرنو بەرەو جێگەی ئەسڵی خۆیان دەگەرێنەوە.))

هات 45 بەندی 8

((بەستایشتەوە،

ڕوو دەکەمە مەزدا ئاهورا،

و بەدیدی دڵەوە، دەیبینم،

وبە بیرو گوتارو کرداری خاس،

ولەژێرسایەی ڕاستیەوە،

ئەو بە ئافەریدەگاری داناو مەزن دەناسم،

لەبەر ئەمە، نزاو ستایشتەکانمی

پێشکەش دەکەم.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ. تەنیا بەهۆی دیدەی دڵەوە دەتوانین ئافەریدەگار بناسین. چونکو ئەو خوای داناو ژیرو نەمرە (ئاهورامەزدا) ناتوانرێت بەهۆی چاو، گوێو هەستەکانی دیکە ببینرێت، بەڵکو تەنیا بەهۆی بیرو ئەندێشەوە دەتوانین هەست بەهێزو تواناو مەزنێتی خوا بکەین، وبەهۆی ئەو یاساو تەکوزییەی کە لەکاری دروستکردنی سروشتو بووندا بەکارهاتووە، دەتوانین پەی بەرین بە زانستو حیکمەتی ئافەریدەگار.

تەنیا ئامرازێك کەدەتوانێت مرۆ لەخوا نیزيك بکاتەوەو بتوانێت بیناسێتو چاوی پآ کەوێت، بریتیە لە بیرو کردارو گوفتاری خاس، ڕاستیو دروستیو پاکی.

زەردەشت دەبێژێ: لەبەرئەوەی دەزانم کە تەنیا بەدیدەی دڵا دەتوانم ئاهورامەزدا بناسمو ببینم، تێدەکۆشم ڕازونیازی لەتەکا بکەمو نزاو ستایشتەکانمی پێشکەش بکەم.

هات45 بەندی 9

((بە بیری خاسەوە،

مەزدائاهورا، خۆشنود دەکەین،

ئەو، کە بەخواستی خۆی،

شادیو کاری بۆ ئافراندووین.

هیوادارین، مەزدائاهورا،

بەتوانایی خۆیەوە،

هێزی کارکردنمان پآ ببەخشێت،

تا بتوانین، بەهۆی بیری خاسو راستیو زانستی راستەقینەوە،

تێبکۆشین بۆ پێشخستنی خەڵکو کۆمەڵگا.))

پاش ئەوەی زەردەشت لەبەندی پێشودا، بەهۆی دیدەی دڵەوە خوای ناسی، وهەستی بە مەزنێتیو توانایی ئاهورامەزدا کرد، لەم بەندەدا، داوای لێدەکات کە بەهۆی(وەهومەن) واتە بیری خاسو پاك بتوانێت بەهرە لەو ئازادیە وەربگرێت کە خوا پێی بەخشیوە بۆ هەڵبژاردنی رێگەی راست یا ناراست، شادیو بەختەوەری یاخود رەنجو بەدبەختی، کە ئاهورامەزدا بریاری لەسەرداوە.

زەردەشت ئاواتە خوازە کە ئاهورامەزدا هێزو توانای کارکردنو خزمەتکردنی خەڵکی پآ ببەخشێت، تاوەکو بتوانێت بەو هۆیەوە کۆمەڵگا بەرەو پێشو ئاوەدانی ببێت.

لەکۆتاییدا، ئامۆژگاریمان دەکات کە دەبێ مرۆ بەهۆی بیری خاسو راستیو دروستیو زانستەوە، گومڕاو خراپەکاران بەرەو رێگەی راستو رووناکی هیدایەت بکەین.

لەم بەندەدا، زەردەشت، وانەیەکی پڕ مانا لەچۆنیەتی ژیانمان پآ دەڵێتەوە:

هەر کۆمەڵگایەك بخوازێت کە بەخۆشیو بەختەوەری بژی، پێشبکەوێتو گەشە بکاتو ئاوەدان بێت، تەنیا دەتوانێت بەهۆی کارو کۆششو خزمەتکردنی یەکتر بگاتە ئامانج، وبەهۆی راستیو پاکیو زانستی راستەقینەوە، خەڵکی نەفامو دواکەوتوو، بەرەو رێگەی راستو دروست هیدایەت بکات.

هات45 بەندی 10

((بە باوەڕێکی پاکەوە، ستایشتی دەکەینو بەگەورەی دەزانین،

ئەو، کە هەمیشە،

ئافەریدەگارو دانای مەزنە

بەهۆی (ئاشا) راستیو (وەهومەن) بیری خاس،

وبەشالیاری خۆیەوە

مژدەی پوختەیی‌و نەمرێتی بەخەڵک دەدات،

وتەندروستی‌و تواناییمان پآ دەبەخشێت.))

زەردەشت، لەم بەندەدا دەفەرموێت، پێویستە بە باوەڕێکی پاکو لەناخی دڵودەرونەوە ستایشتی خوا بکەین. هەروەها باسی ئاهورامەزدا دەکاو دەبێژێ، کە ئەو ئافەریدەگاری هەر دوو جیهانە (مادی‌و معنوی)، دانایە، مەزنە، تواناو بینایە، مژدەی پوختەیی‌و نەمرێتی لەژێرسایەی پەروەردەکردنی دیاردەکانی داوە. بۆ گەیشتنە پلەی پوختەیی‌و نەمرێتی، پێویستیمان بەهێزو تواناو تەندروستی‌و ئاسودەیی هەیە کەوایە، دەبێ لەدیاردەکانی یەزدانی، واتە لەیاسای راستی‌و دروستی‌و بیری خاس‌و پاكو كۆنترۆڵی هەواو هەوەسی خۆمان‌و خۆشەویستی خەڵکو باوەڕی راستەقینە بەخوا، پەیڕەوی بکەین.

هات 45 بەندی 11

((مەزدا ئاهورا،

بۆ ئەو کەسەی کە،

بت پەرستان‌و پەیڕەوەکانیان، بە نەیار دەزانێ،

ورێگەی خۆی لەو کەسەی کە،

بەچاوی سووکەوە دەڕوانێتە مەزدائاهورا، جیاکردووە،

ودەربارەی مەزدائاهورا، خاس بیردەکاتەوە،

و (سوشیانس)ە داناکان‌و یاوەرانی ئایین،

بەدروستی دەناسآ،

هەروەك دۆستو براو باوك، دەبێت.))

زەردەشت، لەم بەندەدا زۆر بەراشکاوی‌و ئاشکرا بە خەڵک ڕادەگەیەنێت کە، بەهەموو هێزو توانایانەوە لەتەك بتپەرستەکان‌و ئەوانەی کە بەخراپی ناوی خوای داناو ژێر دەبەن‌و بەچاوی سووکەوە تەماشای دەکەن‌و خراپ بیردەکەنەوەو گومڕان‌و گیرۆدەی ئەفسانەو درۆ بوون ململانآ بکەن.

هەروەها، زەردەشت دەبێژێ پێویستە ڕێز لەو کەسانە بگیرێت کە ڕێگەی خۆیان لەو جۆرە کەسانە جیاکردووە، خواناسن‌و یاوەرانی ئاینی راستین‌و باوەڕیان بە سوشیانسەکان هەیە، ئاهورامەزدای دانا هەروەك باوك، براو دۆستوایە بۆ ئەو کەسانە.

ئەوەی کە لەم بەندەدا سەرنج رادەکێشآ ئەوەیە کە: پەیوەندی نێوان ئادەمیزادو خوا، لەڕاستیدا وەك پەیوەندی نێوان باوکو فەرزەندە، یا پەیوەندی نێوان دوو برا یا دوو دۆستی خۆشەویستە. پێویستە لەنێوان ئافەریدەگارو ئافەریدەکانی، خۆشەویستی‌و ڕێزلێنان هەبێت، نە ترس‌و لەرز، پەرستن‌و ستایشتی ئافەریدەگار دەبێ بە دڵێکی پاکو پڕ لەخۆشەویستی‌و باوەڕ ئەنجام بدرێت، ئەمەش کاتێك ئەنجام دەبێ کە بەچاوی باوکو فەرزەندی تەماشای بکەین‌و سوپاسی بکەین.

لەئاینی زەردەشتدا، خوا، زۆردارو تووڕە نیە، بەڵکو بەخشەندە، دادگەرو میهرەبانە.

**سرودی یانزەهەم**

هات46 بەندی 1

((ڕوو لەکام سەرزەمین بکەم؟

وبۆکوێ کۆچ بکەم؟

لەکەسوکارو یارەکانم دوورم دەکەنەوە،

دڵخۆشییەکەم نە لەهاوکارەکانم هەیە،

ونە لەشالیارەکان کە پەیڕەوی درۆو خراپەن،

ئەی مەزدا ئاهورا،

چلۆن دەتوانم رەزامەندی تۆ وەدەست بهێنم؟))

لەم بەندەدا، زەردەشت لەناخی دەرونیەوە سکاڵ دەکاو خۆی بە بێکەس‌و یارو یاوەر دەزانێت. لەم قۆناغەدا، بەد گومانی‌و نائومێدی خەریکە بەسەریدا زاڵ دەبێت‌و دەبێژێ، کە نەیارەکانی بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە دژایەتی دەکەن‌و هەڕەشە لەیارەکانی دەکەن کە لێی دووربکەونەوە. زەردەشت نازانێت چ بکات‌و بۆکوێ بچێت. ئەوەی کە لەمێژوودا باسدەکرێت ئەوەیە کە زەردەشت پێش ئەوەی بگاتە شاری (بلخ) لای گوشتاسەب شا، چەندین ساڵ ئاوارەو دەربەدەری ئەم ناوچەو ئەو ناوچە بووە.

ئەوەی شایانی باسە، ئەوەیە کە زەردەشت لەتەك ئەم هەموو ڕەشبینیو نائومێدیە، تروسکەیەك لەپرشنگی هیواو ئاوات لەنێو دڵیدا دەدرەوشێتەوەووروەی بەرز دەکاتەوە. دوبارە پەنا دەبێتەوە بەر ئاهورامەزداو ڵی دەپرسێت چلۆن دەتوانم بەکارو کردارەکانم دڵشادت بکەمو ڕەزامەندیت بەدەست بهێنم. واتە زەردەشت دوبارە داوای هێزو توانای معنوی دەکات تا بتوانێت بەرامبەر ئەو هەموو ناخۆشیو سەختیو ناکامیانە ڕاوەستێت، وپەیامەکەی بە باشترین شێوە بگەیەنێتە جێی خۆی.

هات 46 بەندی 2

((ئەی مەزدا ئاهورا،

دەزانم بۆچیوا بآ توانام،

چونکو دەستکورتمو کەسوکارم کەمن،

ئەز، پەنا بۆتۆ دەبەم،

خاس لێم بڕوانە

ئەز، ئەو خۆشەویستیە لەتۆ دەخوازم کە،

دڵدار بە دڵبەر دەبەخشێت.

لەژێرسایەی راستیدا (ئاشا)،

ولەتوانایی بیری خاس (وەهومەن)، ئاگادارم بکە.))

دوابەدوای بەندی یەك، زەردەشت دەبێژێ، بەبێشی هۆی ئەوە دەزانم کە بۆچیوا بآ توانامو بەو شێوەیەی کە پێویستە خەڵک بە پیرمەوە نایەن، تەنانەت دۆستو خزمو کەسوکارەکانیشم وەك پێویست لەتەکما نین، هۆی ئەمانە هەموو ئەوەیە کە دەستکورتمو ئەم دەستکورتیو بآ کەسییە، دەبێتە هۆی ئەوەی نەیارەکان زێتر بەربەرەکانیم بکەن. دیسانەوە، زەردەشت پەنا بۆ ئاهورامەزدا دەبێتو داوای لێدەکات کە لەو بارودۆخە سەختو چەتونە رزگاری بکات، ولایەکی لێبکاتەوەو هەروەك دڵدارێكو دۆستێك، هەموو خۆشەویستی خۆی بە دڵبەرەکەی ببەخشێت.

لەکۆتاییدا دەبێژێ، هیوادارم لەژێرسایەی ئاشاواتە راستیو دروستیو بەهێزو توانای (وەهومەن) یانی بیری خاسو پاك، بتوانم بەسەر ئەم هەموو کێشانە سەرکەومو ئەوەی کەویستو خواستی ئاهورامەزدایە، ئەنجام بدەم.

هات46 بەندی 3

((ئەی مەزدا ئاهورا،

کەی ئاسۆی ئەو رۆژە هەڵیدێت،

کە (راستی)، بۆ پارێزگاری لەجیهان، بدرەوشێتەوە؟

کەی سۆشیانسەکان،

بە ژیرێتیو ئامۆژگارییە پیرۆزەکانیان دێنو رێنمایی خەڵک دەکەن؟

و(وەهومەن) ئەندێشەی خاس، یاریدەی کێ دەدات؟

ئەی ئاهورا،

ئەز، تەنیا ئامۆژگاریو ئاینی تۆ هەڵیدەبژێرم.))

پاش ئەوەی زەردەشت لەبەندەکانی پێشودا، سکاڵی لەتەنیاییو بێکەسیو دەستکورتی خۆی کرد، وداوای یارمەتی لەئاهورامەزدا کرد، ئێستا لەم بەندەدا دەفەرموێت: ئایا رۆژێك دێت ئەو گومڕاو نەفامانە لەخەو راپەڕنو دەست لەدەمارگیرێتی هەڵبیگرنو ڕووبکەنە راستیو دروستیو یەکتاپەرستی. ئایا رۆژێك دێت کە ئاسۆی بەختەوەری هەڵبێیتو جیهان بدرەوشێنێتەوەو خەڵك گوێ ڕایەڵی ئامۆژگارییە بەنرخو ژیرانەی سوشیانسەکان بن، ودەست لەخراپەکاریو درۆ هەڵبیگرنو فریشتەی وەهومەن، واتە بیری خاسوویژدانی رۆشەنو پاك، یاریدەریان بدات، تا بەرەو راستیو رووناکی هەنگاو هەڵبێنن.

لەکۆتاییدا، زەردەشت دەفەرموێت، ئەز تەنیا تۆ بەسەروەرو ئامۆژگار هەڵیدەبژێرم. لێرەدا زەردەشت دەیەوێت بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، ئەو رێبازەی گرتویەتیە بەرو ئەو ئامۆژگارییانەی بۆ خەڵکی دەکا، گشتی ئیلهامن لەلایەن ئاهورامەزداوە پێی ڕاسپێردراوە، ئەویش بەهۆی بیرکردنەوەیەکی یەکجار قولأو لەماوەی ساڵنێکی زۆر پێی گەیشتووە.

هەروەها، دەیەوێت بێژێتو مژدە بەهەموو خەڵک بدات، کە هەمیشە پاش تاریکیو شەوەزەنگ، رووناهی، وپاش نەزانینو نەفامیو گومڕاییو خراپە، ئاسۆی زانستو بەختەوەری هەڵێدێتو خەڵکی بەرەو رێگەی راستو دروستی هەنگاو هەڵێدێنن. سوشیانسەکانوێتە، ئەوانە کە پەیامی رزگارکردنی خەڵکیان لەئەستۆدایە، خەڵکی بەرەو ژیانێکی پڕ لەبەختەوەریو شادیو راستیو دروستیو پاکی، رێنمایی دەکەن.

هات 46 بەندی 4

((درۆزنو خراپە کارێك کە

بەکردارو هەڵسوکەوتی دوژمنانەو زیان بەخشی خۆی،

بە خراپە کار نێوی زڕاوە،

ڕێ لە پشتیوانانی ڕاستی دەگرێ

کە دەیانەوێت ژیانی خەڵکو

کۆمەڵگا بەرەو پێش بەرن.

ئەی مەزدا،

کەسێ کە بە دڵو گیانو هەموو هێزێکی یەوە، مل ملانێ لەتەک خراپە کاران دەکا خەڵکو هەموو گێتی بەرەو زانستی راستەقینەو هۆشوویژدانی پاك، ڕێنمایی دەکات.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەربارەی دژایەتی درۆزنانو هەوادارەکانیان دەدوێودەبێژێ کە ئەم دارو دەستەیە، نە تەنیا دورن لە ڕاستیو دروستیو هەڵیسو کەوتی خاس،بەڵکو بونەتەبەر بەستێك بۆ ئەو کەسانەی خاسکردارنو دەیانەوێت تێبکۆشن بۆ ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگاو ڕێگەیان لێدەگرن.

زەردەشت لەم بەندەدا، ئامۆژگاری خەڵک دەکا کە بە هەموو هێزو توانایەکیان، وبەدڵو بەگیان

ململانێ بکەن لەتەك نەیارانو ئەو کەسانەی ناحەزن بە ئاوەدانیو پەرە سەندنی کۆمەڵ،ئەم  تێکۆشانو مل ملانێ یە دەبێ تاگەیشتنە ئامانج بەردەوام بێت (واتە گەیشتنە زانستی ڕاستی

و کۆمەڵگایەکی پڕ لە خۆشیو شادیو خە لێکێك کە دارایویژدانی پاکو بێ خەوش بن).

ئەوەی شایانی باسە دەبێ بگوترێت ئەوەیە کە، زەردەشت ئەم ئەرکەی بە جیهادێکی ئایینرایی دانەناوە، کە هەر زەردەشتی یەك بەهێزی چەكو بازو، درۆزنو خراپەکاران لەنێو بەرێت، بەڵکو مەبەستی لە مل ملانێ کردن لەتەکیاندا، زێتر بە گوفتاری شیرینو ڕاستو مەنتیقەوەوپێشاندانی ڕێگەی ڕاستو دروستو هیدایەتکردنی خەڵک بەرەو چۆنیەتی پەرەسەندنو گەشە پێکردنو ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگا، ئەنجام دەدرێت.

هات 46 بەندی 5

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەگەر مرۆیەکی داناو توانا کە پەیڕەوي ڕاستی یە،

و بە دروستی ژیان دەبێتە سەر،

لەبەر ڕۆشنایی ئاینی یەزدانیو لەڕێی خۆشەویستی یەوە،

خراپە کارێك،کە پەنای بۆ بردووەو داوای کۆمەکی لێدەکات

بە گەرمی باوەشی بۆ بکاتەوە،

بە بیرو هۆشی خۆی دەتوانێت

ئەو خراپە کارە، لە گومڕاییو خراپە، ڕزگار بکات

و بیگەیەنێتە خۆ ناسینی ڕاستە قینە.))

زەردەشت، لەم بەندەدا، مرۆی داناو ژیر بەمجۆرە باسدەکات:

کەسێکە کە لەبەر ڕۆشنایی ئاینی یەزدانیو دەستورەکانی ئاهورا مەزداولە ڕێی خۆشەویستیو هەستی مرۆڤایەتی، بە یەکچاو دەڕوانێتە خاسکردارو خراپکرداران،وە هەر کامێکیان داوای یارمەتی لێبکات، بەرەو پیریان بڕواتو بە دڵو بەگیان باوەشیان بۆ بکاتەوەو کێشەکانیان چارەسەر بکات.هەروەها مرۆی داناو ژیر، کەسێکە کە زانیاری خۆی بەکار بهێنێت بۆ لە خەو ڕاپەڕاندنی گومڕاو نەفامەکانو ڕزگاریان بکات لەو هەڵەیەی تێی کەوتونو ڕێگەی خۆناسینو

باوەڕ بە خۆکردنیان پێشان بدات. هەروەها لە کۆتاییدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە، ژیانی مرۆی دانا دەبێ پڕ بێت لە لە خۆ بوردنو ڕاستیو دروستیو پاکی.

هات 46 بەندی 6

((بەلآم، ئەگەر ئەومرۆتوانایە،

یارمەتی ئەو کەسانە نەدات کە

داوای یاریدەیان لێکردووەو پەنایان بۆ بردووە،

ئەو کەسە خۆی دەکەوێتە داوی خراپەکاران،

چونکو، بەگوێرەی ئاینی ڕاستی

کە ئاهورامەزدا لەسەرەتاوە دایڕشتووە،

کەسێك کە یاریدەی خراپەکار بدات،

ئەو کەسە خۆی خراپە کارە.

و ئەو کەسەی ڕێز لە ڕاستگۆو خاسان دەکرێ،

لە پیاو چاکانە.))

لەم بەندەدا، زەردەشت زۆر بە ئاشکرا دەبێژێ، هەرکەسێك،

بە هەر جۆرو شێوەیەك یارمەتی خراپەکارانو درۆزنان بدات، تەنانەت ئەگەر نیەتیشی ئەوە نەبوبێت کە بەو کارە هەڵسێتو بێ ئەوەی پێی بزانێت ئەنجامی دابێت، ئەو کەسە، خۆی بە خراپەکار دەژمێرێتو یاخود دەکەوێتە داویانەوە. هەرکەسێکیش ڕێبازی خاسانو دروستکرداران بگرێتە بەرو ڕێزیان لێبگرێتو خۆشی بوێن، ئەو کەسە خۆشی لە ڕیزی خاسان دەژمێریت. ئەم یاسایە، لەسەرەتای ژیاندا بووەو بەردەوام دەمێنآ، مەبەستی زەردەشت ئەوەیە کە، خەڵک هوشیار بکاتەوە کە بە هیچ جۆرێك یارمەتی خراپەکارانو ئەندێشە ناپاکان نەدەن. بەکورتی زەردەشت

لەم بەندەدا دەفەرمویت،هەر کەسێك تواناو هێزی ئەوەی هەبێت کە گومڕاو خراپەکاران بەڕێی ڕاست هیدایەت بکات، بەڵام بەم کارە هەڵنەستێت، ئەو کەسە خۆشی بە گومڕاو خراپەکار دەژمێرێت. کەوایە، پێویستی سەرشانی هەموانە، بەگوێرەی توانا، یارمەتی خەڵک بدەین‌و ڕێی ڕاستو دروست پیشانی گومڕایان بدەین.

هات 46 بەندی 7

((ئەی مەزدا،

کاتێ کە خراپە کار ئامادە یە ئازارم پێ بگەیەنێت،

جگە لە ڕووناکی تۆو بیرکردنەوە لەتۆ،

کێ پەناو یاوەری من دەبێت؟

ئەی ئاهورا،

کاتێ کە ئەم دوو نیشانەی ڕۆشنایی‌و دانایی یە لەویژدانمدا بێدار دەبێ،

ئاینی ڕاستی دەگاتە لوتکە.

کەوایە، ویژدان‌و دەرونم، لەم ئاینە ئاگادار بکە.))

لەم بەندەدا، وا دەردەکەوێ کە دوژمنانی یەکتا پەرستی لە هەموو لایەکەوە ئابلێوقەی زەردشتیان داوەو زۆریان بۆ هێناوە، تووشی دەردەسەری‌و ناخۆشیان کردووە، و بوونەتە بەربەستێك لە ڕێی بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی. لەم کاتەدا، زەردەشت ڕوو دەکاتە بارەگای ئاهورا مەزداو لێ دەپرسێت،لەم بوارەدا کێ پشتیوان‌و پەنا بەرم دەبێت؟

دوبارە خۆی وەڵام دەداتەوەو هەمیسان گرێی ئەم گرفتە دەکاتەوەو دەبێژێ، تەنیا ڕووناکی معنوی‌و باوەڕو هێزی ئەندێشەی پاك دەتوانن لەم بوارە ناسك‌و دژوارە یارمەتی بدەن. هێزی ئەندێشەو ڕووناکی باوەڕ دەتوانن ئادەمیزاد لە سەخڵەتی‌و دژوارییەکانی ژیان ڕزگار بکەن‌و مرۆ بگەیەننە ئاسایش‌و پوختەیی.لێرەدا، پێویستە ئەو ڕاستی یە بخەینە بەرچاو کە، بڕێ جار ئەندێشەو بیرکردنەوە بەتەنیایی دەتوانێت ببێتە مایەی لە ناوچوونی شارستانیەت‌و فەرهەنگ. لە ڕێگەی دروستکردنی هەمە جۆرە چەکی کۆمەڵ کوژو ڕەشکوژی. زۆرجار، هێزی باوەڕی پووچو هەڵە بەتەنیایی مرۆ دوچاری خۆپەرستی دەکات‌و دووری دەخاتەوە لە هەموو جۆرە مرۆڤ دۆستییەك.

کەوایە، هێزی بیرکردنەوە دەبێ لەتەك باوەڕی ڕاستەقینەدا کە لەناخی دڵی ئادەمیزادەوە هەڵێدەقولێێت، هاو جووت بنو پێکەوە مرۆڤ بەرەو پوختەیی ببەن.

لەکۆتاییدا، زەردەشت داوا لە ئاهورا مەزدا دەکات، ئەم ڕاستیە بۆ هەموو خەڵک ئاشکرا بکاتوویژدانیان بێدار بکا تا هەموان بەختەوەر بنو ئاسایشو ئارامی لەنێو کۆمەڵدا پەرە بسێنێتو ئاینی ڕاستیو دروستی فەرمانڕەوابێت.

هات 46 بەندی 8

((ئەی مەزدا،

لە کرداری کەسێك کە،

خەریکی ئازار گەیاندنە بەخەڵک،

هیچ زیانێك بەمن ناگات،

ئاکامی ئەو کردارە نەیارانەی،

هەمووی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە،

ودوری دەخاتەوە لە ژیانێکی خاسو

ڕۆژگارانی بەرەو خراپە دەبێت.))

لەم بەندەدا، باسی ئەوبەڵگە نەویستە دەکات کە بۆ هەر کارێك، کاردانەوەیەك هەیە

(لکل فعل رد فعل)، وهیچ کارێکی خراپ بێ سزا نامێنێتەوە. سەرەتا دەبێژێ: کەسێك کە بیر لە ئازاردانی خەڵک دەکاتو خەریکی ئازار پێگەیاندنیانە، ئاکامی ئەو کردارە خراپەی، زیانێکی ئەوتۆ بە بەرامبەرەکەی ناگەیە نێت، بەڵکو زێتر زیان بەخۆی دەگەیەنێت. جگە لەمە، ئەو کردارە ناشرینو خراپانەوپڕ لەقینو توڕەیی یە، خراپە کار لە ئەنجامدانی کاری خاسو بەهرە وەرگرتن لەژیانێکی بەختیارو خۆش دوور دەخاتەوە، و هیچ هێزێك ناتوانێت ئەو ژیانە پڕ لە ئەشکەنجەو ناخۆشیەی چاوەڕێی دەکات، بگۆڕێت.

هات 46 بەندی 9

((کێ یه ئەو جوامێرەی که

بۆ یەکەمین جار فێری کردین،

که تۆ پتر لە هەموان شیاوی ستایشی،

و تۆ، سەروەری ڕاستیو داوەری پاك کردارەکانی؟

ئێمە هەمیشە دەخوازین کە بە بیری پاکەوە،

لە یاسای ڕاستیو هەموو ئەو ئامۆژگارییانەی لەو بارەوە گوتوتە،

ئاگادار بین.))

ئەوەی لە ناوەڕۆکی ئەم بەندەدا دەردەکەوێت ئەوەیە کە، دەبێ یەکێ لە هەرە نزیکە کانی زەردەشتو یاخود لە مریدە بەئەمەکەکانی، ئەم بەندەی بێژا بێت، چونکو زەردەشت، بەیەکەمین مامۆستاو ئامۆژگاری ئادەمیزادو جوامێرێکی بە تەواو مانا باسدەکات، و دەڵێت کە بەگوێرەیوتەی ئەم عەگیدە، تەنیا ئاهورا مەزدا شایانی ستایشت پەرستنە. هەروەها پەروەردگاری یەکتای بە داوەرێك داناوە کە چاودێری هەموو کردارەکان چ خاسو چ خراپ دەکات، و لە ڕۆژی پەسلاندا داوەری دەکات.

بەواتایەکی دیکە،هەر کەسێك دەبێ بەرپرس بێت بەرامبەر هەرکارێك کە دەیکات، خاس بێت یا خراپ، و دەبێ چاوەڕێی پاداشتو سزاکەشی بێت.لە کۆتاییدا دەبێژێ، کە بەهۆی ئەندێشەی پاکەوە، مرۆ دەتوانێت پەردە لەسەر نهێنی یەکانی (بوون) و هەموو کەشکەڵان ڕامالێێتو ئاینی ڕاستیو ئامۆژگارییەکانی ئافەریدەگاری جیهان تێبگاتو ئاگاداری بێت.

هات 46بەندی 10

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەز،بە دروستی دەبێژم،

هەر کەسێك چ پیاو چ ژن،

ئەو شتەی کەتۆ بە خاسی دەزانیت بۆ ژیان، ئەنجام بدات،

لەژێر سایەی ئەندێشەی خاس،

بەهرە وەربگریت لە پاداشتی ڕاستی (ئاشا)و توانایی معنوی‌و خزمەتکردنی خەڵک

ئەز، ئەو جۆرە کەسانە،

ڕێنمایی دەکەم کە ستایشتت بکەن،

و لەسەر پردی دووڕیانی چاکەو خراپە (پردی چینوت)[33]، ڕێنماییان دەکەم.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەفەرموێت، هەر کەسێك، ژن بێت یاخود پیاو، لەم جیهانەدا کاری خاس ئەنجام بدات، واتە کارێك کە بە سوودی کۆمەڵگا تەواو بێت، بێگومان بەهرە لە پاداشتێك دەبێت کە (ئاشاو وەخشتەرا) دیاردەکانی ڕاستی‌و پاکی توانای معنوی‌وخزمەتکردنی خەڵک پێی دەبەخشن.

ئەم پاداشتە بریتی یە لە ژیانێکی پڕ لە ڕاستی‌و پاکی‌و خزمەتکردنی خەڵک بە هەموو باوەڕو خۆشەویستی یەوە.خزمەتکردنی خەڵک لەژێر سایەی بیری خاسەوە دێتە ئارا.

کەوایە، هەر کەسێك پێویستی سەرشانی خۆی بە خاسترین شێوە ئەنجام بدات، و ئەوکارەی بە ئەنجامی دەگەیەنێت، تەنیا لەبەر ئەنجامدانی ئەو پێویستی یە بێت نەك بۆ سوودو بەهرە وەرگرتن، و ئەندێشەی پاك بێت بۆ هەڵێسوڕاندنی کارەکە،بێگومان لەپاداشت‌و خەڵاتەکانی(ئاشاو وەخشتەرا) بەهرە وەردەگرێت. لە کۆتاییدا زەردەشت دەبێژێ، ئەز، ڕێنمایی ئەو جۆرە کەسانە دەکەم کە تەنیا ستایشی ئاهورا مەزدای داناو ژیر بکەن، چونکو تەنیا ئەوە کە شایانی پەرستن‌و ستایشەو ڕووبکەنە بارەگای ئەو، بۆئەوەی لە ڕۆژی پەسلاندا لەسەر پردی دووڕیانی چاکەو خراپە (پردی چینوت) بە ئاسانی بپەڕێنەوە.

هات 46 بەندی 11

((کاوی یەکان‌و کەر پەنەکان، یەکیان گرتووە،

لەتەك پیاوەکانیاندا،

به کردەوە ناشرینەکانیانەوە،

ژیانی خەڵک ئالێۆزو پەرێشان دەکەن.

بە ڵام ڕەوان‌وویژدانیان.

کاتێك کە دەگەنە سەر پردی داوەری (چینوت)[33]

دژیان ڕادەوەستن،

وبۆ هەمیشە دەچنە مۆلێگەی درۆزنان‌و خراپە کاران.))

لەم بەندەدا، باسی کاوی یەکان‌و کەر پەنەکان دەکات، ئەمانە پێشەواو شالیارە درۆزنە خراپەکارەکانن کە دوژمنی سەرسەختی زەردەشتن‌و دەبێژێ:

ئەم دوو دەستەیە یەکیان گرتووەو خەریکی چەواشە کردنی خەڵکن‌و ژیانیان لێتێکدەدەن، بە درۆو بە فێل یو فریو،ڕاستی لە خەڵک چەواشە دەکەن بۆئەوەی ڕێبازی ئاینی ڕاستی نەگرنە بەر.

ئەمانە هەمیشە بەر بەستێك بوون لەسەر ڕێگەی زەردەشتداو لەمپەرێك بوون لەسەر ڕێگەی پەرە سەندنی ئاینی یەکتا پەرستی.

زەردەشت لە کۆتاییدا دەفەرموێت: کاتێك کە ئەم خراپە کارو درۆزنانە لە پردی دووڕیانی چاکەو خراپە نزیك دەبنەوە، ویژدانیان بە جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەیان دەدات، کە دەکەونە نێو بنی چاڵی دۆزەخی‌ویژدان.

هات 46 بەندی 12

((کاتێ کە،

زارڕۆلەو نەوەکانی (فریان تورانی)[34]

ڕوو بکەنە ڕاستی،

وبە پاکی یەوە،

تێبکۆشن بۆ ئاوەدانی‌و پێشخستنی کۆمەڵ،

ئەوسا، مەزدا ئاهورا،

لەژێر سایەی ئەندێشەی پاك،

هەمویان پەكدەخات،

و خۆشیو ڕزگاری یان،

پێ دەبەخشێت.))

تەنیا شتێك كە لەم بەندەدا سەرنج ڕادەكێشێ ئەوەیە، زەردەشت بۆ بڵاوكردنەوەی ئاینی یەكتا پەرستی، هیچ درێغی یەك ناكات، هەوڵو كۆششی خۆی دەدات. لێرەدا دەبێژێ:

كاتێك كە (فریان) ئاینی یەكتا پەرستی پەسەند كردو هاتە سەر ڕێی ڕاستو خۆیو كەسوكاری باوەڕیان بە ڕاستی هێنا. ئەوسا ئاهورا مەزدا بە بیرێكی پاكەوە، ئەمانە هەمویان یەكدەخاو ناكۆكی نێوانیان لا دەبێو بەختەوەریو ڕزگاریان پێدەبەخشێت.

هات 46 بەندی 13

((هەركەسێك یاریدەی زەردەشت ئەسپەنتمان بدات

بۆ ئەنجامدانی كارەكانی، ودڵشادی بكات،

بە دروستكار دەژمێرێت.

مەزدا ئاهورا، ژیانی خاس بەو جۆرە كەسانە دەبەخشێت،

وە لەژێر سایەی ئەندێشەی خاس، (وەهومەن)

دەوروبەری پڕ لە خۆشیو شادی دەبێت،

و هەموو كەس، ئەو بە،

دۆستی خاسی ڕاستی دەناسێ.))

هەر كەسێك، یارمەتی زەردەشت بدات، و هاریكاری لەتەكا بكا بۆ ئەنجامگەیاندنی پەیامە پیرۆزەكەی، و زەردەشت لە خۆی ڕازی بكاتو دڵشادی بكا،ئەو كەسە بەخاوەن باوەڕو

دروست کار دەژمێرێت.ئاهورا مەزدا میهرەبان دەبێ بۆ ی‌و خاسترین جۆری ژیانی پێدەبەخشێت. لەژێر سایەی (وەهومەن)، واتە بیری خاس، ژیانێکی خۆش‌ودەوروبەرێکی پڕ لە خۆشی‌و خۆشەویستی‌و پاکی پێ خەڵات دەکرێت. ئەم جۆرە کەسانە بەدۆستی (ئاشا) یانی، ڕاستی‌و پەیڕەوی یاساوتەکوزی دەژمێرێن

هات 46 بەندی14

(( ئەی زەردەشت،

کـآیە دۆستی ڕاستکرداری تۆو هەواداری ڕاستی؟

وکێ یە،

ئەو کەسەی بە ڕاستی

ناوی خاس‌و سەربەرزی بۆ ئەنجومەنی موغان دەوێت؟

ئەی مەزدا ئاهورا،

بە ڕاستی ئەو کەسە کەی (گوشتاسەبی) جوامێرە.

ئەز، بانگەوازی خەڵک دەکەم‌و پەیامەکەت ڕادەگە یەنم،

بەووتانەی کە لەبیری خاسەوە هەڵێهێنجراوە،

تا ڕێگەی بارەگای تۆ بدۆزمەوە)).

لەم بەندەوە تا بەندی (18) ی ئەم (هات) ە، باسی یارو یاوەران‌و دۆستانی زەردەشت کراوە، وبەهۆی ئەو کارو کۆششانەی ئەنجامیان داوە، یارمەتی زەردەشتیان داوە بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی، ولەم ڕێگەیەدا دووچاری سەختی‌و ئەشکەنجە بون، داوا لە ئاهورا مەزدا دەکا کە بێ بەشیان نەکات لە خەڵاتی ئاهورایی.

لەم بەندەدا، زەردەشت باسی گوشتا سەب شا دەکا کە یارو یاوەری بووە. بە دۆستێکی جوامێرو خاسکردارو پەیڕەوی ڕاستی‌و دروستی دەناسێت، و دەبێژێ کە هەوڵو کۆششێك کە کردویەتی، ڕۆڵێیکی گەورەی هەبووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی یەکتا پەرستی‌و هەروەها هەوڵی داوە کە یارمەتی ئەنجومەنی موغەکان بدات‌و

ناوبانگێکی خاسیان لەنێو خەڵکدا بۆ بەدی بهێنێت.

ئەوەی شایانی باسە ئەم گوشتاسبە لەم ڕێگەیەدا دووچاری شەڕو هەرایەکی یەکجار زۆر بووە، بەتایبەتی لەتەك تۆرانییەکاندا، لەم ڕێگەیەدا فرە لە براو کوڕەکانی گیانیان لە دەست داوەو کوژراون بەڵام ئەم کۆڵی نەداوەو باشترین یاوەری زەردەشت بووە، تا توانی لە ئاکامدا شکست بە لەشکری تورانییەکان بدات.

لە کۆتاییدا، دەبێژێ، هەرکەسێك گوێ ڕایەڵی پەیامی ئاسمانی زەردەشت بێتو بەگوێرەی ئاینی ڕاستی بجولێێتەوە (هەروەك گوشتاسەب)، شیاوی ئەوەیە کە لە بارەگای ئاهورا مەزدا جێنشین بێتو لە ڕۆژی پەسڵاندا ڕۆحی لەنێو بەهەشتدا بێت.

هات 46 بەندی 15

((ئەی ڕۆڵەکانی هیچد سپ ئەسپەنتمان[35]

بە ئێوە دەبێژم،

گوێ بگرن بۆ ئەو شتەی کە بۆ ئێوە خاسترینە،

تا بەو هۆیەوە، داناو نادان لە یەکتر جیا بکەنەوە،

و بە کرداری خاسی خۆتان،

ڕاستی (ئاشا) کە بنچینەی ئاینی ئاهورایە

بە دەست بێنن.))

لێرەدا باسی بنەماڵەی هیچد سپ دەکا، کە باوە گەورەی زەردەشت خۆیەتیو دەبێژێ کە ئامۆژگارییەکی وە هاتان دەکەم کە بتوانن بەو هۆیەوە مرۆی دانا لە نادانو ڕۆشەنبیر لەرەشبین جیا بکەنەوە، جیاوازی لەنێوان ڕاستیو هەوادارەکانی لەتەک درۆو پەیڕەوەکانیدا بزانن.

لە کۆتایی ئەم بەندەدا دەبێژێ،مرۆ، لەبەر ڕۆشنایی کرداری خاس کە لە بیری خاسوتەی خاسەوە دێت، دەتوانێ بگاتە (ئاشا) کە دیاردەی ڕاستیو دروستی یە.

شایانی باس لەم بەندەدا، ئەوەیە کە دەیەوێت بێژێت:

مرۆ، بە بیری خاس دەتوانێت چاکە لە خراپەو دانا لە نادان جیابکاتەوە، ورِێگەی خۆی بدۆزێتەوەو لەژێر سایەی کرداری خاسەوە بگاتە حەقیقەتی ڕاستی (ئاشا).

هات 46 بەندی 16

((ئەی فەرشوشتەر هووگوێ[36]

لەتەک یارانی خۆتدا،

کە ئێمە هەردووکمان داوای،

ڕۆشنایی‌و بەختەوەری هەمیشەییان بۆ دەکەین

برِۆ بۆ،

ئەو شوێنەی کە ڕاستی لەتەك پاکی‌و خۆشەویستیدا هاوجوتن،

و لەوێڕادا، ئەندێشەی خاس‌و توانایی،

حوکم فەرمانی دەکەن،

و شکۆی مەزدا ئاهورا، تیایدا دیارە.))

لەم بەندەدا، زەردەشت داوا لە فەرشوشتەر لە بنەماڵە هووگوێ دەکات کە لەتەك یاران‌و هەوادارەکانیدا بەرەو ڕووناکی‌و ڕاستی‌و پاکی‌و خۆشەویستی برِوات‌و ئامۆژگاری خەڵک بکات کە ڕێی ڕاست بگرنە بەر.

هەروەها دەبێژێ کە ئارەزوو خواستی ئێمە (ئاهورا مەزداوزەردەشت)ئەوەیە کە هەموو گومڕاو پەیڕەوانی ئاینی درۆ یا سروشت پەرستی بەرەو یەکتا پەرستی‌و ڕێگەی ڕاست هیدایەت بکەین، بۆئەوەی لە کۆتاییدا هەموان بگەنە پلەی پوختەیی‌و پاکی‌و سوود لە خەڵاتی ئاهورایی، یانی بەختەوەری‌و ڕزگاری وەربگرن، و جێگەیان بارەگای ئافەریدەگاری دانا بێت، ئەو شوێنەی کە تەنیا

بەهۆی ڕاستی‌و دروستی‌و خۆشەویستی‌و باوەڕو بیری خاس‌و خزمەتکردنی خەڵک، بە دەست دێت.

هات 46 بەندی 17

((ئەی جاماسب هووگوێ،

ئەی هۆشمەندو ژیر

ئەز، ئامۆژگاریم کردون کە کارو کۆشش،

نە بێکاریو تەمەڵی بکەنە پیشەتان.

کەوایە،

بەویژدانێکی بێدارو کارو کۆششەوە،

ستایشی ئەو ئافەریدەگارە داناو بێ هاوتایە بکە،

کە بەهۆی یاسای ڕاستی خۆیەوە،

داناو نادان لە یەکتر جیادەکاتەوە،

و بەهەموو توانایەکییەوە، چاودێری لەم جیهانە دەکات.))

زەردەشت، لەم بەندەدا ڕوو دەکاتە جاماسب کە یەکێ لە وەزیرەکانی گوشتاسەبو لە یارە بە ئەمەکەکانی خۆی بووە، و پێی دەبێژێ:

ئەم حەقیقەتە ڕەچاو بکەو ئاگادار بە کە ئاینی ڕاستی، بریتی یە لە کارو کۆششو هەوڵو تێکۆشانو جموجۆلێ، نە ئاینی بێکاریو تەمەڵیو سوالێکردنو بآ جموجۆلأ. کەوایە پێویستە بەویژدانێکی چاکەوە ئیتاعەتی دەستووری ئاهورا مەزدا بکەین، و بەهۆی کارو کۆششەوە ستایشی بکەین.

ئاهورا مەزدا، بەهۆی ئەو یاسا نەگۆڕو هەمیشەیی یەی، واتە یاسای ڕاستی، داناو نادان لە یەکتر جیا دەکاتەوەو بەهۆی ئەو تەکو زییەی هەر لەسەرەتای جیهاندا بۆی داناوین، چاودێری لەم جیهانە دەکات.

هات 46 بەندی 18

((هەر کەسێك کە پەیڕەویم لێبکات،

ئەز، لەبۆ ئەو کەسە، خاسترینم،

و لەژێر سایەی ئەندێشەی خاس،

مژدەی باشترین شتەکانی پێدەدەم.

بەڵام، ئەو کەسەی کە دژایەتیمان دەکا،

ئێمەش مل ملانێی لەتەکا دەکەین.

ئەی مەزدا، ئەز، بەهۆی ڕاستی یەوە

ویستو ئارەزووی تۆ وەدی دێنم،

ئەو ڕێگەیەی کە هۆش‌و ئەندێشەی من،

هەڵیدەبژێرێت.))

دەتوانین بێژین کە ئەم بەندە تەواوکەرەوەی بەندی سیانزەهەمی هەمان (هات) ە.

لەم بەندەدا، زەردەشت ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دۆست‌و هاوڕێی ئەو مرۆڤە خاسانەیە کە دۆستایەتی دەکەن‌و ڕێگەی ڕاست‌و بیرکردنەوەی خاسیان هەڵبژاردووەو پەیڕەوی لێدەکەن. دوبارە بەهۆی بیری چاکەوە مژدەی ژیانێکی خۆش‌و پڕ لە تەبایی‌وبەختەوەریمان پێدەدات.بەڵام ئەوانەی کە دوژمنایەتی ڕاستی‌و دروستی‌و پاکی دەکەن‌و دژی زەردەشت لە هیچ کردارێکی ناشرین‌و ناڕەوا دەسبەردارنین، زەردەشت سازشیان لەتەکا ناکات‌و مل ملانێیان لەگەڵێ دەکا تا ڕێگەی ڕاستی دەگرنە بەر.

زەردەشت دوپاتی دەکاتەوە کە بەهۆی ڕاستی‌و دروستی یەوە، ویستو ئارەزووی ئاهورا مەزدا بەدی دێنێت، و لەم ڕێبازەدا بەهۆی بیری خاسەوە هەمیشە پێشەنگ دەبێت.

هات 46 بەندی 19

((کەسێك کە بە ڕاستی،

ویستوو ئارەزووی زەردەشت،

که بریتی یه له بناغه دانانی جیهانێکی نوێ،

وەدی دێنێت،

بەهرە له پاداشتی ژیانێکی نەمر دەبێت.

و لەم جیهانە زیندووەدا،

دەگاتە

گشت ئارەزووو خواستەکانی دڵی

ئەی مەزدا،

هەموو ئەم شتانە، تۆ فێرت کردمو ئاشکرات کردووە بۆم.))

لەم بەندەدا، زەردەشت زۆر بە ڕاشکاویو ڕوونییەوە، وبە چەندوشەیەکی فرە سادە، ستراتیژیەتو فەلسەفەی پەیامەکەی دەخاتە ڕوو کە بریتیە لەشۆڕشێکی جیهانی، ورزگارکردنی مرۆڤ لەهەموو ئەو کۆتو زنجیرانەی دەستوپێی بەستۆتەوە. شۆڕشێك دژی کۆنەپەرستیو چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن بڕی لەو کەسانەی خۆیان بەرابەرو پێشەوا دادەنا.

زەردەشت دەبێژی ئەو کەسانەی بەدڵو بەگیانو بەراستی لەپێناوی بناغە دانانی ئەو شۆڕشە تێدەکۆشن، لەراستیدا ڕێبازی زەردەشت دەگرنە بەر، چونکوویستو ئارەزووو هیوای زەردەشت کە بیرێکی چاکو پاکو بەدیدێکی گەشو ژیرانە بیری لێکردۆتەوە، دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی پێشکەتووە کە تاکە تاکی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە راست کردارو راست گوفتارو خاوەنی بیری خاس بن.

## 3- سپەنتمەگات سروودی دوازدەهەم

هات 47 بەندی 1

((ئەی مەزدا ئاهورا،

بە شکۆ مەندیو شالیاریو دلۆڤانی خۆیەوە،

بە کەسێك کە کردارو گوفتاری

بەهۆی ئەندێشەی خاسو باشترین بیر،

و لەسەر بنچینەی ڕاستیدا بێت،

پوختەییو نەمرێتی دەبەخشێ))

ئەم بەندە فرە ئاشکراو ڕوونەو پێویست بەشیکردنەوە ناکات.

هات 47 بەندی 2

((کەسێك کە لەژێر سایەی پاکترین ئەندێشەکاندا،

خاسترین ڕێگە دەپێوێت،

و زمانی، بێژەری ئەندێشەی خاسە،

و دەستەکانی

بۆ کاری پاکیو بێگەردی کراوەیە،

تەنیا یەك بیری هەیە:

مەزدا ئاهورا، ئافەریدەگارو دروستکەرو سەرچاوەی ڕاستی یە.))

کەسێك کە لەژێر سایەی بیری پاكو پیرۆزدا ژیان دەبێتە سەرو ڕێگەی ڕاستی هەڵێبژاردووە، وتەو گوفتاری شیرینو خۆشو دەنگدەرەوەی بیری خاس بێت، هەڵسوکەوتو کارو کرداری لە ڕووی باوەڕێکی پتەو ئەنجام دەداو بە هەردوو دەستی ئیشو کاری خاسو بێگەرد بە ئەنجام دەگەیەنێ، ئەو کەسە، تەنیا بیر لەیەك شت دەکاتەوە، ئەویش ئافەریدەگارە، کە بەسەرچاوەی ڕاستیو دروستی دەزاني.

هات 47 بەندی 3

((ئەی مەزدا،

بە ڕاستی، ئەتۆ ئافەریدەگاری ئەندێشەی خاسیت،

و کاتێك کە خەڵک بە بیری خاسەوە،

پرسو ڕاوێژکاریان کرد.

ئەتو، بۆ ئەوان

ئەم سەر زەمینەو جیهانی پڕ لە شادیت خولێقاند،

و بۆ ئاوەدانیو ڕابەرایەتی،

پاکیو بێگەردیت هێنایە ئارا)).

لەم بەندەدا: دوبارە زەردەشت جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئاهورامەزدا ئەندێشەی خاسی وەدیهێناوە. هەروەها باس لەوە دەکات کە هەر ئەوە کە ئەم جیهانەی بە شێوەیەکی شادیبەخشو خۆشو جوان هێناوەتە ئارا، وبۆئەوەی ئاوەدان بێتو ڕابەرانی دادپەروەرو خاس حوکم فەرمان بن، پاکیو بێگەردیو بێخەوشێتی هێناوەتە ئارا.

هات 47 بەندی 4

((ئەی مەزدا،

درۆزنو خراپە کارانێك کە

ڕوو لە بیری خاس وەردەگێڕن،

تووشی ڕەنجو ئازارو ئەشکەنجە دەبن.

خاسانو ڕاستکردەوەکان، کە ئەم کارە ناکەن، گیرۆدە نابن.

ڕاستکردەوە، هەرچەندە هەژاریش بێتو هێزو تواناشی کەم بێت

لای ڕاستکردەوەکان، بە ڕێزە.

درۆزنو خراپە کار، ئەگەر تواناو بە دەسەڵاتیش بێت،

بی ێبایەخو بێ نرخە.))

زەردەشت لەم بەندەدا دەبێژێ: ئەو کەسانەی کە پشت دەکەنە (سپەنتامینو) یا گەوهەری پاکیو ڕاستیو بیری خاس، و گوێ نادەنە چاکەو ڕاستیو دروستی، لەسەر ڕێبازی خراپەکاری خۆیان بەردەوامن، لە ئاکامدا، ئەو کەسانە دووچاری ڕەنجو ئازارو ئەشکەنجەیویژدان دەبنو پەشیمان دەبنەوە.

بەڵام، دروستکارانو پیاو چاکان، هەرگیز کاری خراپیان لێناوەشێتەوە.

هەروەها دەبێژێ کە پێویستە ڕێز بگیرێت لە مرۆی خاسو پاك کە لە ڕووی ئابووریەوە هەژارو دەستکورتن، ودەبێ یارمەتییان بدرێت. بەڵام درۆزنو خراپە کار هەرچەندە دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارو تواناش بێت، لەبەر ئەوەی لە بواری کۆمەڵایەتیدا، هیچ سودێك بە خەڵک ناگەیەنێت، دەبێ بە چاوی سوکەوە تەماشای بکرێتو بە بێ بایەخیان بزانین. بەواتەیەکی دیکە، دەبێ لەتەک خاسانو پاکاندا دۆستو هاوڕێ بینو لەگەڵێ درۆزنانو خراپەکاراندا نەیار بین، نەهێلین دارایيو پلەو پایەو توناییی مادی خراپە کارێك، لەخشتەمان بەرێتو گومڕامان بکات.

هات 47 بەندی 5

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەتۆ، بەهۆی ئەندێشەی پاك،

مژدەی خاسترین خەڵاتت داوە

بە ڕاستکردەوەکان.

بەڵام، درۆزنو بەد کاران،

هیچ جۆرە بەهرەیەك لە دلۆڤانی تۆ نابەن.

چونکو،درۆزنو بەد کردار،

ئەندێشەو کرداری نادروستو خراپی هەیە.))

زەردەشت، لەم بەندەدا دەبێژێ: مرۆی خاسو دروستکردار، بەهرە لە باشترین خەڵاتێك کە مژدەی پێدراوە لە لایەن ئاهورا مەزداوە، وەردەگرێت. ئەم خەڵاتە، بەهۆی بیری پاکەوە پێی دەگات. بە ڵام خراپە کارو درۆزنان، بی ێبەهرە دەبن لەو خەڵاتو خۆشەویستی یەی

ئاهورامەزدا، بە پێچەوانەوە ئاکامی کردەوە خراپەکانیان، بە شێوەی ڕەنجو دەردە سەرىو ئەشکەنجە دەبێت. لە ڕاستیشدا، ئەو کەسانەی کە پەڵە هەوری چڵکنو ڕەشی خراپە کاری، ئاسمانی شینو ڕۆشەنی دڵیانی تاریكو ڕەش کردووە، و جگە لە خراپەو درۆ، هیچ کارێکی دیکە ناکەن، نابێ چاوەڕوانی خەڵاتی ئاهورایی بن. بە کورتی دەبێ بێژین سزای خراپ بۆ خراپەکارانە، و پاداشتی خاس بۆ خاسکردارانە. خەڵاتی ئاهورایی بۆ کەسێك دەبێت کە پاکو ڕاستگۆو دروستکردارو بیر خاس بێت.

هات 47 بەندی 6

((کەوایە، بەهۆی ئەندێشەی پاك،

و تیشکی ڕووناکی تۆوە:

چارەنووسی هەردوو دەستەی چاکانو خراپان،

ئاشکراو ڕۆشەن دەبێت،

و بە پەرەسەندنو گەشە پێکردنی باوەڕو ڕاستیو پاکی،

عەوداڵانێکی زۆر،

ڕێبازی تۆ هەڵێدەبژێرنو دەیگرنە بەر.))

لێرەدا. زۆر بە ڕاشکاوی ئەوەمان پێ دەبێژێ کە بیری خاسو گەوهەری خاسیو پاکی، لە دیاردەکانی ئاهورا مەزدان، و ئامرازن بۆئەوەی ئادەمیزاد بتوانێت بە هۆیانەوە بەرەو پوختەیی هەنگاو هەڵێبێنێتو پێی بگات، ولە ئاکامدا پاداشتی خۆی وەربگرێت.

لەم بەندەدا، زەردەشت دەفەرموێت، چارەنووسی خاسانو خراپەکاران، ویژدانی پاکو پرشنگی ڕووناکی معنویو ئەندێشەی خاس ڕۆشەنو دیاری دەکات.

لە کۆتاییدا دەبێژێ: تەگەرکو، باوەڕی ڕاستەقینەو ڕاستی کە دوو دیاردەی(ئارمەئیتی)و(ئاشا)ن، لەنێو دڵو دەروونی ئادەمیزادا گەشە بکات، پترو خاستر بەرەو حەقیقەت هەنگاو هەڵێدێنێتو دوور دەکەوێتەوە لە درۆو خراپە.

هەروەها سەرنجی عەوداڵانی حەقیقەت بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە، تەنیا بەهۆی باوەڕی ڕاستەقینەو ڕاستیو دروستی دەتوانرێت ڕێگەی گەیشتنە لای ئاهورا مەزدا بدۆزینەوەو لێی نزیك بینەوە.

**سروودی سیازدەهەم**

هات 48 بەندی 1

((ئەی مەزدا ئاهورا،

لە کاتی پاداشت دانەوەدا،

و ئەوکاتەی کە ڕاستی بەسەر درۆدا سەرکەوێت،

و پەردە لە ڕووی فریوکاری کافرو یاوەرەکانیان

بۆ هەمیشە ڕا دەمالێرێ،

ئەوسا، بەهۆی خەڵاتی تۆ

ستایشتو باوەڕ بە تۆو خۆشەویستی تۆ. پتر دەبێت.))

ئەم بەندە، تەواوکەرەوەی بەندی پێشووی (هات 47) ەو تیایدا زەردەشت دەفەرموێت:

لە ڕۆژی پەسڵاندا، کاتێك کە ئیدی بە تەواوەتی، ڕاستی بەسەر درۆدا سەر دەکەوێت، و پەردە لە ڕووی درۆو دەلەسەی درۆزنو خراپەکاراندا ڕادەماڵێرێت، حەقیقەتی هەموو شتێك ئاشکرا دەبێ، ئەوسا، باوەری خەڵک بە ئاهورا مەزدا زێتر دەبێتو چاکە لە هەموو شوێنێکدا حوکمفەرما دەبێت.

لێرەدا مژدەی ئەوە بە خەڵک دەدرێت کە لە ئاکامدا، ڕاستی بەسەر درۆدا زالێ دەبێت.

لەواقیعدا، ڕۆژی پەسڵان ئەو ڕۆژەیە کە ئەم ڕاستیە دێتە ئارا، ئەو ڕۆژەی کە درۆو جەردەییو دزێتیو ڕژدو ڕقو قینەو چاو چنۆکی لە کۆمەڵگادا بنبڕ دەبێو ڕاستیو دروستیو پاکیو کردەوەی خاسو لە خۆ بوردنو خۆشەویستی جێگیر دەبێت. ئەوسا، نورو تیشکی باوەڕی ڕاستەقینە لەنێو دڵی هەمواندا هەڵدێتو ئاشتیو ئاسایشو پاکدڵیو دلۆڤانی بڵاو دەبێتەوەو هەموو شوێنێك دەگرێتەوە.

ئەم بەندە، زێتر دڵی ئادەمیزاد پڕ لە هیوا دەکات، کە بیری خاس لە ئاکامدا سەردەکەوێتو هەموو خەڵک ڕاستی یان بۆ ئاشکرا دەبێ، و پاشە ڕۆژێکی خۆش چاوەڕێمان دەکات، پێمان

دەبێژێ کە کارو کۆششو هەوڵەکانمان بە فیرِۆ ناچێتوبی ێسوود نامێنێتەوە، و لە ئاکامدا حەق بەسەر ناحەقدا زالێ دەبێت.

هات 48 بەندی 2

((ئەی مەزدا ئاهورا،

پێش ئەوەی ئەندێشەم گرفتاری رِارِایی بێت،

لە زانیاری خۆت ئاگادارو دڵنیام بکە.

ئایا رِاستکردار بەسەر درۆزنو خراپەکاردا سەردەکەوێت؟

بێگومانویستو خواستی تۆ ئەمەیە،

و ئەمەش گەورەترین سەرکەوتنە لە ژیاندا.))

هەرچەندە لە بەندی پێشودا، بە رِاشکاوی مژدەی سەرکەوتنی رِاستی بەسەر درۆدا دراوە، بەڵام دەبینین لەم بەندەدا، زەردەشت بۆئەوەی پەیرِەوەکانی خۆی دڵنیا بکات،رِوو دەکاتە ئاهورا مەزداو هەمان پرسیار دەکاتەوەو داوای وەڵامی لێدەکات بۆئەوەی بە رِاشکاوی وەڵامی بدرێتەوە، بۆیە دەبێژێ کە نیگەرانی پاشە رِۆژەو پێش ئەوەی بیری ئاڵێۆز بێتو دوچاری رِارِایی بێ، ئەم رِاستی یەی بۆ ئاشکرا بکاتو پێی بێژێت ئایا لە ئاکامدا خاسکرداران‌و رِاستگۆیان، بەسەر خراپە کاران‌و درۆزنان سەردەکەون یا نە.

هەرچەندە خۆی دەزانێت کەویستو خواستی ئاهورا مەزدا ئەوەیە کە لە ئاکامدا، رِاستی‌و دروستی سەرکەوتو بێت، بەڵام پێویستی سەرشانی هەموانە کە دژی ئەهریمەن، ململانێ بکەین رِێگە خۆش بکەین بۆ سەرکەوتنی خاسکرداران بەسەر خراپە کاراندا.

هیوای گەیشتنە رِۆژێکی درەخشان، وا لە ئادەمیزاد دەکا هەوڵو کۆشش بدا بۆ پێشخستنی کۆمەڵگا.

هات 48 بەندی 3

((ئەو ئامۆژگارییانەی کە مەزدا ئاهورای ئافەریدەی خاسیەکان،

بەهۆی ڕاستی یەوە (ئاشا)

فێری خەڵکی دانا دەکات،

خاسترین ئامۆژگارین

بەهۆی ئەم ئامۆژگارییانەوەیە کە،

داناو پیاو چاکانو مامۆستایانی عیرفانی

بە بیری پاکو هۆشەوە،

دڵ بەتۆ دەبەستنو دەبنە پەیڕەوت.))

زەردەشت، زۆر بە ئاشکرا لەم بەندەدا کە پەیوەندی بە بەندی پێشوەوە هەیە دەبێژێ، کە خاسترین ئامۆژگارییەکانی ئاهورا مەزدا کە پڕە لە حیکمەتو فەلسەفەو عیرفان، دەبێ بە داناو ڕۆشەنبیرومرۆی پاکو دروست بدرێت بۆئەوەی ئەو ئامۆژگاریو زانیاریانە لە ڕێی ڕاستو دروستداو بۆ خزمەتکردنی خەڵک بەکاربێنن، چونکو ئەگەر ئەم زانیاریانە بکەوێتە دەست مرۆی نایابو بیر خراپ، لەوانەیە بۆ لەناو بردنی خەڵکو کۆمەڵ بەکاری بێنن.

هەروەها دەبێژێ، هەموو ڕۆشەنبیرانو پاکانو مامۆستایانی فەلسەفەو عیرفان، ئاگاداری ئەم جۆرە ئامۆژگارییانەن. لێرەدا دەتوانین بێژین کە سروودەکانی گاتەکان پڕ ِلە حیکمەتو عیرفانو هەروشەو ڕستەیەکی ئەوەندە پڕِ ماناو پوختەن، کە هەر کەسێك ناتوانێت لێی تێبگات.

ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ، ئەوەیە کە دەفەرموێت، دەبێ مرۆی داناو بیر خاس،ئەم ئامۆژگارییانە فێر بن،و نابێ ئەوانەی کە دانان بەڵام باش بیر ناکەنەوە. ئەم ئامۆژگارییانە فێر بن، چونکو بۆ سوودی تایبەتی خۆیانو دژ بە کۆمەڵگا بەکاری دێنن.

لە کۆتایي ئەم بەندەدا دەبێژێ، هەر کەس تەنیا بەهۆی بیری خاسو هۆشەوە دەتوانێت خۆی بە پەیڕەوو موریدی بارەگای ئاهورا مەزدا بزانێت.

لێرەدا دەبینین کە دووبارە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە تەنیا هۆشو ئەندێشە بۆ گەیشتنە لای ئاهورا مەزدا بەس نیە، بەڵکو (ئەندێشەی خاس) و دڵی پاك لەتەك هۆشدا دەتوانن مرۆڤ بەرەو ڕێگەی ڕاست ببێت.

ئەوەی لەم بەندەدا دەستگیرمان دەبێ، ئەوەیە کە، هەرکەس دەتوانێت بەهۆی پەروەردە کردنی ئەندێشەی خاسو هۆشو دڵپاکیوویژدانی پاك یاخود بێژین خۆناسین،نیزیك بێتەوە لە بارەگای ئاهورا مەزدای داناو ژیر.

هات 48 بەندی 4

((ئەی مەزدا،

کەسێك کە ئەندێشەی خاس یا خراپ بێت،

ویژدانو گوفتارو کرداریشی، هەروا دەبێت،

ئەو ڕێگەیەی کە ئەندێشە، بە ئازادی هەڵیدەبژێرێت

باوەڕوویستی ئەو کەسە پەیڕەوی لێدەکات،

و لە ئاکامدا، هۆشی تۆیە کە

چارەنوسیان دیاری دەکاو لە یەکدیان جیا دەکاتەوە.))

لێرەدا دەبێژێ کە، ئەندێشەی ئادەمیزاد ئەگەر خاس یا خراپ بێت، گوفتارو کرداروویژدانوویستی ئەو کەسەش بەرەو خاسی یا خراپی دەڕوات. بێگومان چارەنوسو ئاکامی ئەم جۆرە کەسانە ئاشکراو ڕونە. چونکو چاکەو خراپە دوو شتی جیاوازو دژ بە یەکدین.

کەوایە، بنچینەو پایەی هەر کارێك لەسەر بناغەی ئەندێشە دامەزراوە. ئەگەر ئەندێشە پاکو خاس بێت، بێگومان ئاکامێکی فرەخاسی دەبێت، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەندێشە بەدوخراپ بێت، ئاکامێکی زۆر خراپ چاوەڕێی دەکات.

ئەم ئاکامو چارەنوسە، بەهۆی هۆشی تەواو سەنگی ئاهورا مەزدا دیاری دەکرێت.

هات 48 بەندی 5

((هیوادارین، شالیارانی خاس،

بە کرداری خاسو زانستو پاکی یەوە،

حوکمڕانی ئێمە بن،

نە شالیارانی ستەمکارو بەد ئەندێشە.

پاکو تەمیزی بۆ خەڵک،

هەر لەسەردەمی لەدایکبونەوە، خاسترین خەڵاتی ئاهوراییە.

بۆ ئاوەدانی جیهان دەبی ێ تێبکۆشین،

دەبێ بە ڕاستیو دروستی، خەڵک پەروەردە بکەین،

و بەرەو ڕووناکی بەرین.))

زەردەشت، داوا لە ئاهورا مەزدا دەکات کە، ستەمکارانو خراپەکاران نەتوانن بەسەر خاسانو پیاو چاکان سەرکەون، و هەمیشە سەرکەوتن بۆ مرۆو شالیارانی خاسکردار بێت، بەتایبەتی شالیاران دەبێ بەهۆی هۆشو ئەندێشەی خاسەوە کاربکەنو کرداریان خاس بێت لەتەک خەڵکیدا. زەردەشت دەبێژێ، یەکی لە خاسترین خەڵاتەکانی ئاهورایی بۆ هەموو کەسێك هەر لە کاتی لەدایك بونیەوە، بریتی یە لە پاکی، چونکو، گەر هەموان پاکو تەمیزی ڕەچاو بکەین، هەرگیز گرفتاری نەخۆشیو دەردو ڕەنج نابین. بێگومان، مەبەست لە پاکو تەمیزی لە ئاینی زەردەشتیدا تەنیا پاکێتی لەشوجلو بەرگ نیە، بەڵکو پێویستە، ئاو، خاك،هەواو ئاگریش پیس نەکرێنو بە پاکی ڕابگیرێن، چونکو فرە لە نەخۆشیەکان بەهۆی پیسکردنی ئاوو هەواوە دوچارمان دەبن. کەوایە پێویستە هەر لەسەردەمی منداڵیەوە، خەڵک فێری پاکو تەمیزی ببن بۆئەوەی کە گەورە بون بتوانن پەیڕەوی لەم ئەصڵە بکەن.

لە کۆتایي ئەم بەندەشدا، دیسانەوە زەردەشت بە ئاشکرا ئامۆژگاری خەڵک دەکات کە، بۆ پێشخستنی کۆمەڵو ئاوەدانی جیهان، کاربکەنو تێبکۆشنو تەمەڵیو تەوەزەلی بخەنە لاوە.

هەروەها، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە زەردەشت تەنیا باسی ئاوەدانی مادی نەکردووە، بەڵکو دەفەرموێت، ئادەمیزاد لەتەک ئاوەدانیو پێشخستنی کۆمەڵ لە ڕووی مادیەوە، دەبێ لە بواری ڕاستەوە، دیاردەکانی معنویش پەروەردە بکەنو بەرەو ڕووناکی ڕاستەقینە، هەنگاو هەڵێبنێن.

هات 48 بەندی 6

((بە ڕاستی ئارمەئیتی (زەوی)

پشتو پەنایەکی خاسە بۆمان.

ئارمەئیتی (زەوی)،

دوو خەڵات، توانایی ڕۆحیو خۆ ڕاگرتنمانپێدەبەخشێت.

و مەزدا ئاهورا،

لەسەرەتای بووونداو لەژێر سایەی ڕاستیدا،

گژوگیاو ڕووەکی لەسەر زەوی ڕواندووە.))

لەم بەندەدا، بایەخێکی زۆری بە ئارمەئیتی داوە، ئارمەئیتی دیاردەی خۆشەویستیو باوەڕ بە خوایەو لە پاشاندا کراوە بە چاودێری زەوی. دەبێژێ. باوەڕ بەخواو خۆشەویستی خەڵک یا بەواتایەکی دیکە، بەهرە بردن لە نیشانەو ڕووناکی ئارمەئیتی، لە کاتی تەنگانەو گرفتاریدا، خاسترین پشتو پەناو ئاسودەترین پەناگایە بۆ پەنا بردن بۆی.

بەڵگە نەویستە، کە باوەڕو پەنا بردنە بەر خوا، هێزو توانای ڕوحیو جەستەیی بە مرۆ دەدات، توانايي خۆڕاگرتن بەرامبەر بە هەموو دژوارییەکانی ژیان، پتر دەکات.

لە کۆتاییدا دەربارەی باسی ڕۆڵی ئارمەئیتی لە بواری مادیدا دەکاتو دەبێژێ، لەبەر ئەوەی (ئارمەئیتی)، ئەم ئەمشاسپەندە پاکە چاودێری زەوی دەکات، هەر لەسەرەتای دروستبونی زەوی، ئافەریدەگاری داناو ژێر توانایی ڕواندنی هەمە جۆرە ڕوەکێکی وەك دارو درەختو گژوگیای داوە بە زەوی بۆئەوەی خۆراکی پێویست بۆ خەڵک دابین بکاتو سودی لێوەربگرن.

ئەوەی شایانی باسە لەم دوا دێڕەدا، ئەوەیە کە دەبێژێ ئەم کارە بەگوێرەی حیکمەتێکی ئاهوراییواتە بەگوێرەی یاسای ڕاستی (ئاشا) ئەنجام دراوەو دەدرێت.

کەواتە، دەتوانین بێژین، بەگوێرەی یاسای نە گۆڕی سروشتواتە یاسای ڕاستی (ئاشا)، ئادەمیزاد سوودی مادی لە زەوی وەردەگرێت بۆ بەرهەم هێنانی هەمە جۆرە ئازووقەیەکی پێویست بۆ ژیانی، و لە کاتی سەخڵەتیو تەنگانەدا، بەهۆی باوەڕ بەخوا، واتە لە ڕووی معنوی یەوە، سود لە دیاردەی ئارمەئیتی وەردەگرێتو پەنای بۆ دەبێت.

لەبەر ئەوە دەتوانین بێژین، ئارمەئیتی لەڕوی مادیو معنوی یەوە خاسترینو ئاسودەترین پەنایەکە بۆ ئادەمیزاد.

هات 48 بەندی 7

((ئەی ئەو کەسانەی کە.

ئەویندارى بیرى خاسن،

خۆتان لە ڕِقو قینە دوور بخەنەوە،

و بەرامبەر ستەم خۆتان ڕابگرن.

بۆ پەرە سەندنو بڵاو کردنەوەى ڕاستى،

دڵ بە بیرى خاسو خۆشەویستى ببەستنو

لەتەک پیاو چاکان، هاوکارى بکەن،

تاریگەى گەیشتنە بارەگاى ئاهورامەزدا بدۆزنەوە.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ڕوو دەکاتە ئەو کەسانەى کە خاوەنى بیرى خاسنو ئامۆژگارییان دەکات کە هەرگیز ڕێگە نەدەن ڕقو قینەو تووڕەیى بەسەریاندا زالێ بێت.

ئاشکرایە کە ڕقو قینەو تووڕەیى، یەکێ لە هەرە گەورەترین مەترسیەکانە کە دووچارى ئادەمیزاد دەبن.ئەگەر ئەم دیاردانە بەسەرماندا زالێ بن، هەموو گێتى دەشێوێننو لە ناوى دەبەن، لەبەر ئەمە پێویستە لەسەر هەموان کە کۆنترۆڵى هەستى خۆمان بکەین تا دووچارى ئەم دیاردانە نەبین.

هەروەها دەفەرموێت: بەرامبەر جەورو ستەمو تورەییو دڵڕەقى نە فامانو بەد کرداران، هەروەك کێوێکى سەخت خۆمان ڕابگرین، بە هیچ جۆرێك بیر لەوە نەکەینەوە کە ئێمەش وەك ئەوان ڕەفتار بکەین. بەواتەیەکى دیکە، دەبێ خۆمان بەهێزو پڕ چەکى معنوى بکەینو کۆنترۆڵى ئەندێشەى خۆمان بکەین بۆئەوەى هەرگیز بیر لە ڕقو قینەو تورەیى نەکەینەوە.

هەروەها زەردەشت دەفەرموێ، دل ێبە بیرى خاسو دلۆڤانىو خۆشەویستى یەکتر ببەستن، هەرگیز بیر لە ئازاردانو دڵشکانى خەڵکى نەکەنەوە.

بە پێچەوانەوە هەوڵ بدەین دڵى خۆمان پاکو بێگەرد بکەینەوەو هەموو خەڵکمان خۆش بوێتو بیر لە بەکارهێنانى هێزو چەك نەکەینەوە،

لێرەدا، دوبارە زەردەشت ئامۆژگاریمان دەکاتو دەبێژێ،

مرۆى پاکو ڕاستکردار ئەو کەسەیە پەیوەندییەکى نەپچڕاو لەتەك ڕاستىو دروستیدا دەبەستێو بۆ پەرە سەندنو بڵاو کردنەوەى ڕاستىو دروستىو تەکوزى تێدەکۆشێ.

جوامێرانو خاسان هەمیشە لایەنگری کاری خاسنو خەڵکی بەرەو ڕاستیو دروستیو پاکی ڕێنمایی دەکەن بۆئەوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەرەو ئاوەدانیو پێشکەوتنو ئازادیو ئاسایش بەرەو پێش ببەنو لە ئاکامدا بەهرە لە بەختەوەریو ڕزگاری بەرن.

لە کۆتاییدا دەفەرموێت، هەوادارانی ڕاستیو دروستیو پاکی لە ئاکامدا دەگەنە بارەگای ئاهورامەزدا، واتەویژدانی ئاسودەو بەهەشتی بەرینیان پێ دەبەخشرێت.

هات 48 بەندی 8

((ئەی مەزدا ئاهورا،

هیواو ئارەزووم بەهرە بردن لە هێزی معنوی (وەخشتەرا) تۆیە،

بەڵام،

ئارەزووی بەخشینی خەڵاتو پاداشتی تۆ، بۆ منو هاوڕێ یانم، زێترە.

چەندە ئاواتە خوازم،

کە لە ڕێی ڕاستی خۆتەوە،

خۆت بۆ پەیڕەوەکانت ئاشکرا بکەیت،

تا بە بیری خاسەوە،

تێبکۆشن بۆ پێشخستنی کارەکانیان.))

لەم بەندەدا، زەردەشت دەبێژێ، کە هیواو ئارەزووی هەمو کەسێك ئەوەیە کە بەهرە لە هێزی معنوی (وەخشتەرا) وەربگرێت بۆئەوەی بتوانێت بە خۆشیو بەختەوەری بژی. لێرەدا مەبەست لە (وەخشتەرا) هێزو توانای سەرکەوتن بەسەرویستو ئارەزووە دەروونیەکانی خۆمانە،

هەر کاتێك کەسێك بتوانێت بەسەرویستو ئارەزووە دەرونییەکانی خۆی زالێ بێت، بێگومان لە ژیانیدا بەختەوەرو سەرکەوتو دەبێت، چونکو گیرۆدەی چاو چنۆکی نابێت.

ئەوسا، ئەو جۆرە کەسانە دەتوانن پتر هێزو توانای خۆیان بەکار بێنن بۆ خزمەتکردنی خەڵکو تێبکۆشن بۆ پێشخستنی کۆمەڵو خەڵک بەرەو پوختەیی ڕێنمایی بکەن.

هەروەها لێرەدا، باسی یەکێ لە ئارەزووەکانی خۆی دەکات کە بریتی یە لە بەهرە وەرگرتنی خۆیو هاورِێکانی لە خەڵاتو بەخشیشەکانی ئاهورا مەزدا، کە بریتی یە لە تەندروستیو تەمەن درێژی بە بیری خاسو دڵێکی پاکوویژدانێکی بێدارو هێزو توانا بۆ خزمەتکردنی خەڵک.

هات 48 بەندی 9

((ئەی مەزدا،

چلۆن بزانم کە

تۆ لەسەر بنچینەی ڕاستیدا،

بەسەر هەموانو ئەوانەش کە دەیانەوێ ئازارم پێبگەیەنن،

حوکمڕانی دەکەیت؟

چلۆنایەتیو شێوەی بیرکردنەوەی خاسیشم،

بە دروستی پیشان بدە.

چۆنیەتی بەهرە وەرگرتن لە خەڵاتی خۆتم پێشان بدە،

چونکو سوشیانتو پەیامبەر دەبێ

لە پاداشتی کارەکانیان، ئاگاداربن.))

لەم بەندەدا، وادەردەکەوێت کە زەردەشت دوچاری دوو دڵی بووە لە هێزو توانای ئاهورا مەزدا، وادیارە کە دوژمنایەتی نەیارانو ئازارو ئەشکەنجە ی درۆزنان، خەریکەورەی زەردەشت نزم دەکەنەوە.

بۆیەکا دەفەرموێت: ئەگەر تۆ ئەی مەزدا، شالیاریو حوکمڕانی بەسەر هەمواندا دەکەیت ئاگاداریت لە نیەتی خراپەکارانو ئەوانەی دەیانەوێت ئازارم پێبگەیەنن، کەوایە، ئاگادارم بکە لە نیەتو بڕیارەکانیان.

هەروەها، زەردەشت دەیەوێت ئاگادار بێت لە شێوەو چلۆنایەتی بیرکردنەوەی خاسو خۆشەویستی کە لە دیاردە تایبەتیەکانی (وەهومن) ە، بۆئەوەی بەهۆی بەهرە وەرگرتن لەم

دیاردانە، لە خەڵاتی ئاهورا مەزدا، ئومێدەواربێت. لە کۆتاییدا، باسی ئەوە دەکات کە سوشیانتەکان، واتە ئەو کەسانەی لە خۆ بوردونو هەموو هێزو تواناو بیری خۆیان بۆ خزمەتکردنی خەڵک تەرخان کردووەو دەیکەن، بۆئەوەی ڕزگاریان بکەن لە ستەمو جەورو جەفای درۆزنانو بەد کارانو لە هەموو جۆرە نەزانینو بێدادی (زەردەشت خۆی یەکێکە لەو سوشیانتانە)، دەبێ ئاگادار بن لەو پاداشتەی کە بە خەڵات پێیان دەگات.

هات 48 بەندی 10

((ئەی مەزدا،

کەی خەڵک لە ئایینی تۆ دەگەنو پەرەی پێدەسێنن؟

کەی ئەم ژاراوە شێتکەرە لەنێو دەچێت؟

ئەو شتەی (کەرپەن)، تاوانبارەکان،

خەڵکی پێ فریو دەدەن.

و شالیارە ستەمکارە بیر خراپەکان،

بەهۆی ئەوەوە، حوکمڕانی دەکەن.))

پێش ئەوەی مانای ئەم بەندە لێکبدەینەوە، پێویستە ئەوە ڕونبکەینەوە کە، توێژەرانو ئاوێستا ناسانێك وەك (بارتلومە، گلدنر، مولتن، دگتر تاراپورالا، پورداودو...)، بە شێوەی جۆراو جۆر، ئەم بەندەیان لێکداوەتەوە. بڕێکیانوشەی (ژاراوە شێتکەرە) یان بە گیای (هوم) داناوە کە ئاوەکەی سەر خۆشکەرەوە یە،هەندێکی دیکەیان لەو باوەڕەدان کە زەردەشت هەرگیز باسی ئەم جۆرە شتانەی نەکردووەو ئامۆژگارییەکانی زێتر دەربارەی معنویاتو ئاکارە، و ئەو ژاراوە شێتکەرەوەیەیان بە چاوچنۆکیو درۆ، داناوە. چونکو ئەم دوو دیاردەیە لە هەر شوێنێکدا ڕەخنە بکەن، مرۆڤ دوچاری بەد بەختیو خراپەو کۆمەڵگا گیرۆدەی دوا کەوتن دەکەن.

لەم بەندەدا، زەردەشت چاوەڕێی ئەوە دەکا کەسوشیانتەکانومرۆ خاسەکان بێنە مەیدانو یارمەتی خەڵک بدەنو تێبکۆشن بۆ بڵاو کردنەوەو پەرەسەندنی ئاینی ئاهورایی، واتە، پاکیو ڕاستیو دروستیو یەکتا پەرستیو فیدا کاریو خۆشەویستیو....و خەڵکی لە فریووخراپە ڕزگار بکەن.

لە کۆتاییدا، دەبێژێ کە (کەرپەن) و شالیارە درۆزنو ستەمکارەکان، بەهۆی (هوم) کە ئاوەکەی سەرخۆشکەرەوەیە یاخود بەگوێرەی لێکدانەوەی بڕێ لە زانایان، چاوچنۆکی (تەماح) و

درۆ، خەڵکیان فریو داوەو گومڕایان کردونو سواری سەریان بون

هات 48 بەندی 11

((ئەی مەزدا،

کەی ڕاستی (ئاشا) و پاکی (وەخشتەرا)لەتەک خۆشەویستیو باوەڕ بەخوا،

ووولاتی پڕلە کێلێگەو سەوزەلانی بەرین،

وخانوو بەرەی خاسو ئاوەدان،

دێتە ئارا؟

چ کەسانێك،

ئێمە لە درۆزنانو خراپە کارانی دڵڕەش

ئاسودە دەکەن؟

و چ کەسانێك،

لە زانستو بیری خاس

بەهرە وەردەگرن؟))

زەردەشت، ئاواتە خوازە لە ئاهورا مەزدا کە هەموو خەڵکی ڕووبکەنە ڕاستیو پاکیو خۆشەویستیو باوەڕکردن بە خوای تاکو تەنیا، وبەسەر هەواو هەوەسی دەرونی خۆیاندا زالێ بن، تا بتوانن ژیانێکی پڕ لە خۆشیو کۆمەڵگایەکی ئاوەدان پێکەوە نین.

زەردەشت، دوبارە پرسیارێك دەکاتەوە کە لە (هات 46 بەندی 7) دا بە جۆرێکی دیکە، ئەم پرسیارەی کردبو. لێرەدا دەفەرموێت:

کێ وه یاخود چ شتێك دەتوانێت مرۆ له دەست درۆزنو خراپەکاران ڕزگار بکات، که له کۆتایی ئەم بەنده به شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ، ئاماژه بۆ ئەوەکراوه که تەنیا له ڕێگەی بەهره وەرگرتن له زانستی ڕاستەقینەو بیری خاسەوه، دەتوانرێت ئادەمیزاد ڕزگار بکات له خراپەی خراپەکاران.

هات 48 بەندی 12

((ئەی مەزدا،

سۆشیانتەکانیوولاتان،

کەسانێك دەبن که،

بەهۆی پەیڕەوی له ئەندێشەی خاس،

ئەركو پێویستی سەرشانیان ئەنجام دەدەن.

کرداریان لەسەر بنچینەی ڕاستیو ئامۆژگارییەکانی تۆیه،

و به دروستی، بۆ لەنێو بردنی ڕقو قینه،

دانراون.))

لەم بەندەدا، باسی سۆشیانتەکان یا ڕزگار خوازانی خەڵک دەکاو دەبێژێ، ئەمانه که سانێکن زاناو دانا، وهەموو ئەو ئەرکانەی سەرشانیان له ڕوانگەی هۆشوبیری خاسو دڵێکی بێگەردو پاکەوه دەڕوانن‌و کاری پێدەکەن. هەروەها دەبێژێ که کارو کرداری ئەمانه، لەسەر چاوەی ڕاستیو دروستیو پاکییەوه هەڵێدەقولێێتو هەموو هەڵێسو کەوتیان لەتەک ئامۆژگارییەکانی ئاهورا مەزدادا هاو جوته.

یەکێ لەتایبەتکارییەکانی ئەمانه ئەوەیه که، هەوڵ دەدەن لەنێو خەڵکیدا،خۆشەویستیو ئاشتیو ئاسایش دابین بکەن، و ڕقو قینەو دوژمنایەتی بنبڕ بکەن. ئەمانه مژده هێنەری ئاشتیو خۆشەویستیو ئازادیو شادیو برایەتین بۆ خەڵک.

## سرودی چواردەم

هات 49 بەندی 1

((ئەی مەزدا،

لە مێژە کە (بەندوە)(37)،

لە کرداری نا دروستی خۆی، شادمانە،

مل ملانێم لەتەکا دەکات.

ئەی بەخشەندەی میهرەبان،

یاریدەم بدەو هێزو توانام پێ ببەخشە

تا بە ئەندێشەی پاك،

لە گومڕایی ڕزگاری بکەم.))

لەم بەندەدا، باسی یەکێکی دیکە لە نەیارانی زەردەشت دەکا بە نێوی(بەندوە) کە لە خراپە کاریدا کەمتر لە (کەرپەن) و (کاوی) یەکان نەبووە.

زەردەشت سەرەتا نارەزایی خۆی دەر دەبڕێت لە کارو کرداری بەندوە کە خەریکی فیتنەییو دووڕووییو گومڕاکردنی خەڵکو فریودانیانەو بەم کارانەی زۆر خۆشحاڵیو شادمانەو هەست بە خۆشی دەکات.

زەردەشت، داوا لە ئاهورا مەزدا دەکات کە هێزو توانای پێ ببەخشێت تا بتوانێت ڕێگە لە خراپە کاریەکانی بگرێت، و هەروەها بتوانێت بەهۆی بیری خاسو خۆشەویستی یەوە بیخاتە سەر ڕێی ڕاستو دروست.

لێرەدا زێتر جەخت لەسەر ئەوە کراوە کە زاڵێ بوون بەسەر نەیاراندا، تەنیا بەهۆی چەكو زۆرە مڵیو ئامرازە مادییەکان نیە، بەڵکو بەهێزو توانای معنویو بەهۆی بیری خاسوقسەی نەرمو شیرینو ڕەفتاری گونجاوو دروست دەکرێ خەڵک ڕێنمایی بکرێ بۆ سەر ڕێبازی ڕاستەقینەی ژیان. و دوورەو پەرێز بون لە خراپەکاری.

هات 49 بەندی 2

((ئەی مەزدا،

ئەم (بەندوه) نیگەرانی کردووم،

چونکو(ئاینەکەی) بریتی یه له درۆو فریو،

و دوورکەوتن له ڕاستی.

نه پابەندی پاکی یه

و نه باوەڕی به ڕاوێژو ئامۆژگاریو ئەندێشەی خاسه.))

لەم بەندەدا، زێتر باسی کەسێیەتی (بەندوه) دەکات که کارو کرداری هەموی بریتی یه له درۆو فریو دانی خەڵکو گومڕاکردنیان، بۆیه زەردەشت نیگەرانه، و مەترسی ئەوەی هەیه که ئەم جۆره کەسانه نکۆمەڵگا ئالێوز بکەنو خەڵکی چەواشه بکەنو ڕێی ڕاستیان لێ هەڵه بکەن.

هەروەها دەبێژێ که (بەندوه) هەرگیز دل ێ نابەستێ به (سپەنته ئارمەئیتی) که دیاردەی باوەڕ بەخواو خۆشەویستی یه، و بۆیەکجاریش بێت بیری له ئافەریدەگار نەکردۆتەوه، و به خۆیدا نەهاتۆتەوەو بیری قوڵی نەکردووه تا بزانێت ڕاستی چی یەو چۆن دەتوانێ ببێته مرۆیەکی به کەلێك بۆ کۆمەڵگا. شایانی باسه که دکتۆر تارا پوروالا، لەو باوەڕەدایه کەوشەی (بەندوه)، ناوی کەسێکی تایبەتو دیاری کراو نیه، بەڵکو بریتی یه له مانایەکی گشتیو بۆ هەموو ئەو کەسانه بەکار دێت که خراپه کارو گومڕان

هات 49 بەندی 3

((ئەی مەزدا،

تۆ، به دروستی ئەم باوەڕو ئامۆژگارییەت

بۆ هەموان داناوه که،

ڕاستی سوود بەخشەو درۆ زیانباره.

لەبەر ئەمەیه که،

ئەز، ئاواته خوازی بیری خاسم،

و خۆمو خەڵک لە نزیك بونەوە لە درۆو خراپە دوور دەخەمەوە.))

پێشەکی زەردەشت دەفەرموێت، کە مەزدا بۆ هەموو خەڵکی جیهان بڕیاری داوە، ڕاستی سوود بەخشەو ڕاستگۆیان ڕزگاریان دەبێت، بەڵام درۆ زیان ئاوەرەو درۆزنان جگە لە خراپەو مایە پوچیو ماڵی کاولی هیچی دیکەیان دەست ناکەوێت، و پاشە ڕۆژیشیان پڕ لە ڕەنجو ئەشکەنجەیە.

کەوایە، پێویستە لەسەر خەڵک هەمیشە دڵی خۆیان پاکو بێگەرد بکەنو تێبکۆشن خۆیان لەتەك بیری خاسدا ئاشنا بکەن، دوورەو پەرێز بن لە درۆو بیری خراپو فریودانی یەکتر.

بەواتایەکی دیکە، لە درۆزنان دوور بکەونەوە چونکو نیزیك بوونەوەو دانیشتن لەتەکیاندا، جگە لە زیان هیچی دیکەمان دەست ناکەوێت. ئامۆژگاری زەردەشت ئەوەیە کە هەموو خەڵک خاس بیر بکەنەوەو هەرگیز بیر لە درۆ نەکەنەوەو هەموو پەیوەندییەکی خۆیان لەتەک درۆزناندا بپچڕێننو هاموشۆیان نەکەن.

هات 49 بەندی 4

((ئەو کەسانەی کە

بە بیری خراپو زمانیان،

ڕقو قینەو رژدو چاو چنۆکی پتر دەکەن،

و ڕێگە لەو کەسانە دەگرن کە

کار دەکەنو خەریکی ئاوەدانین،

و بەهۆی کردەوە خراپەکانیان

بیر لە کاری خاس ناکەنەوە.

ئەوانە، کافرو خراپە کارانێکن کە،

هەناوودەروونوویژدانی خەڵک بەرەو درۆو گومڕایی ڕادەپێچن.))

لە بەندی پێشوودا گوتمان کە زەردەشت ئامۆژگاریمان دەکا کە هەموو پەیوەندییەکمان لەتەك درۆزناندا بپچڕێنینو لێیان دوور بکەوینەوە.

لەم بەندەدا، هۆی ئەو ئامۆژگارییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەبێژێ: بیر خراپانو زمان لوسەکان،بە تەوسو توانجەوە خەریکی ئازار گەیاندنن بەو کەسانەی کار دەکەنو ڕێگەی ڕاستیان هەڵبژاردووە هەستی چاوچنۆکیو رژدو ڕقو قینەیان دەبزوێننو ڕێگە لە کارکردنیان دەگرن. هەروەها دەبێژێ ئەم جۆرە کەسانە بە هیچ جۆرێك بیر لەوە ناکەنەوەکە کاری خاس ئەنجام بدەن، بە شێوەیەکی وەها خۆیان گیرۆدەی خراپەکاری کردووەو پابەندی درۆ بوون کەویژدانی خۆیان خنکاندووەو هەموو کارێکی خراپو مەترسییەکیان لێدەوەشێتەوە. کاری ئەم خراپە کارانە، دوژمنایەتیو ڕقو قینەو درۆزنی لە ناو خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە. کە لە پاشاندا، پاشە گەردانیو ڕوڕەشیو بەد بەختی دەهێنێت.

هات 49 بەندی 5

((ئەی مەزدا،

بەڵام کەسێك کە

بە دڵو بەگیان، ویژدانی خۆی

لەتەك بیری خاسدا پەیوەند بدات،

و لە ڕێی پاکیو ڕاستیو داناییدا هەنگاو هەڵبێنێت،

لە ئاکامدا،

جێگەی لەسەر زەمینی نەمراندا (بەهەشت) دەبێت.))

زەردەشت لەم بەندەدا دەفەرموێت: هەر کەسێك بەویستی خۆیو بەدڵو بەگیان، هەوڵ بداتویژدانی خۆی لەتەک بیری خاسدا پەیوەند بدات، واتە هاو ئاهەنگی بکاتو هاواری دەرونی خۆیو ئەندێشە پاکی پێکەوە هاوجوت بنو یەك ڕێباز بگرنە بەر، بێگومان ئەو جۆرە کەسانە بەهرە لە دیاردەی (ئارمەئیتی) کە بریتی یە لە خۆشەویستیو باوەڕ بەخوا، وەردەگرن. ئەوسا هەموو کارو کردەوەیان بەهۆی بیری خاسەوەو لە ڕێگەی ڕاستیو دروستیو پاکی یەوە ئەنجام دەبێت، ولەبەر ئەوەی دیاردەکانی ڕوناکی ئاهورایی لەو کەسەدا کۆ دەبێتەوە، یانی گوێ ڕایەڵی بانگەوازیویژدان دەبێو بە بیرێکی پاکوویژدانێکی بێدارو ڕۆشەنەوە دەربارەی ژیان

دەكۆڵێیتەوەو بیر دەكاتەوە، و بۆ وەدیهێنانو گەیشتنە ئامانجەكانی بە هیچ جۆرێك درێغی لە فیداكاریو خۆ بە ختكردن ناكات، ئەو جۆرە كەسەبەهرە لە خەڵاتی باوەڕو خۆشەویستی وەردەگرێتو لە ئاكامدا جێگەی بەهەشتی بەرین دەبێت.

هات 49 بەندی 6

((ئەی مەزدا ئاهورا،

و ئەی ڕاستی (ئاشا)،

لە بیرو هۆشو حیكمەتی خۆت

ئاگادار بكەم،

تا حەقیقەتم بۆ ئاشكرا بێت

و بە خەڵكی ڕابگەیەنم.))

لەم بەندەدا، ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە كە بەهۆی ڕاستی (ئاشا) و پاكی یەوە، شارەزای بیرو هۆشو حیكمەتی ئافەریدەگار بێتو بتوانێت حەقیقەت لە مەجاز، ڕاستی لە ناڕاست، جیا بكاتەوە بۆئەوەی بتوانێت ئاینی یەزدانی كەلەسەرچاوەی دەرونیەوە هەڵیقوڵاوە، بۆ هەموو خەڵك ئاشكرا بكات، وڕێنماییان بكات.

هات 49 بەندی 7

((ئەی مەزدا ئاهورا،

با خەڵك،

بە بیرێكی خاسەوەو لەڕوی ڕاستییەوە،

گوێ ڕایەڵی پەیامەكەم بن.

ئەتۆش شاهێد بە كە

لەیارو کەسوکارەکانم،

کامیان بەگوێرەی ئەم ئاینە، دەژین،

بۆئەوەی بۆ هاوکارەکانم

ببنە ڕێنمایەکی خاس

پاش ئەوەی لەبەندی پێشوودا، زەردەشت فەرموی کە ئاینێك بۆ خەڵک ئاشکرادەکات کە لەلایەن یەزدانەوە پێی ئیلهام کراوە، لەم بەندەدا، ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە کە خەڵک بەچاوێکی کراوەو بیرێکی خاسو دڵێکی رۆشەن گوێ بۆ کفتەکانی ڕابگرن، وئامۆژگارییەکانی بەکاربێن.

لەپاشان دەبێژێ، ئەی خوای میهرەبان، ئەتۆش شاهیدو گەواەبە جگە لەپەیامو ئامۆژگاریە پیرۆزەکانی تۆو ئەوەی پێم ئیلهام دەبێت، هیچی دیکە بە خەڵک نابێژم.

لێرەدا، دوبارە زەردەشت باسی یارو کەسوکارو هاوکارەکانی دەکاتو دەیەوێت کە یارو کەسوکارەکانی (خۆمانیەکان) ببنە پێشەنگی کاروانی ڕاستیو دروستی بۆ هاوکارەکانیو نمونەیەك بن لەدیاردەی ئاکاری خاس بۆ هەموان.

هات49 بەندی 8

((ئەی مەزدا ئاهورا،

لێت دەخوازم کە،

پوختەییو شادمانێ ڕێگەی ڕاستی،

بە (فەرشوشتەر) ببەخشیت.

هەر ئەم پاداشتەش،

بەهۆی شالیاریو توانایی خۆتەوە (وەخشتەرا) بە یارەکانی دیکەم ببەخشیت،

با، ئێمە بۆ هەمیشە،

خزمەتگوزاری خەڵکو ئەڤینداری تۆبین

لەم بەندەدا، زەردەشت ئارەزووی ئەوەیە کە ئاهورامەزدا، دۆستو پەیڕەوەکانی بەتایبەتی دۆستی بەئەمەکیواتە (فەرشوشتەر)، خەلآت بکات بەوەی کە بەهرە لەبەخشیشی راستی(ئاشا) وەربگرن، یانی، ژیانێکی بێگەردو پڕ لەپاکیو راستییان پآ ببەخشێت.

هەروەها، داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە بەهۆی (وەخشتەرا)وە هێزو توانای ئەوەیان پآ ببەخشێت کە هەمیشە بتوانن خزمەتی خەڵک بکەنو لەم رێگەیەوە ببنە ئەویندارى ئاهورا. بێگومان، هەرکەسێك بتوانێت بەسەرویستو ئارەزووە نابەجێکانی دەرونی زاڵ خۆیدا بێت، وهەموو توانای خۆی بۆ خزمەتکردنی خەڵک بەکاربێنێت، هەموو هەستو بیری لای خوا دەبێتو هەرگیز لەئەندێشەی دەرناچێتو دەبێتە خاسترین دۆستی خوا.

هات 49 بەندی 9

((ئەی (جاماسب)ی دانا،

با،

ڕابەرێك کە بۆ رزگاری خەڵک،

خولقێنراوە،

گوێ بۆ ئەم ئامۆژگارییە شل بکات،

کە، راستگۆ

هەرگیز بیر لەنیزیك بونەوە لەدرۆزن ناکات،

وئەو کەسانەی کەویژدانی پاکو رۆشەنیان هەیە،

خاسترین پاداشتیان پآ دەدرێت،

ولەئاکامدا راستی دەکەنە پیشەیان.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ئامۆژگاری خزمەتگوزانو رابەران دەکاتو داوایان لێدەکات کە گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی شل بکەنو رەفتاری پآ بکەن، بۆئەوەی بتوانن خەڵکی لەو تەنگوچەڵەمانەی ژیان رزگاربکەن. ئەو ئامۆژگارییە بریتیە لەوەی کە پێویستە هەموو کەسێك هەمیشە راستیو راستگۆیی بکەنە دروشمی ژیانی خۆیانو لەدرۆو درۆکردن دوورەو پەرێزبن.

راستگۆ، هەرگیز بیر لەوە نەكاتەوە كە لەتەك درۆزناندا نیزیك بێتەوە، ولَیان دوركەویتەوە.

لەم بەندەدا، یەكێ لەخاسترینوێنەكانی ئاكاریو ئامۆژگاریەكانی زەردەشتمان پێشان دەدات، كە ڕوی دەمی لە(جاماسب)ی حەكیم دەكات (یەكێ لەزاناو داناكانی بارەگای گوشتاسب بووەو زاوای خودی زەردەشتیش بووە)، وپاش ئەوەی ستایشتی راستی دەكاو دژی درۆ دەئاخافێ، دەبێژێ، كەسێك كە خاوەنی باوەڕ بەخوایەو راستیو پاكی پیشەیەتی، لەئاكامدا خاسترین پاداشتی پێدەدرێت كەئەویش بریتیە لەگەیشتنە كۆشكو سەرای ئاهورایی (بەهەشت).

هات 49 بەندی 10

((ئەی مەزدا،

ئەز، رۆحو ئەندێشەی خاسی ڕاستگۆیان،

لەبارەگای تۆ، بەتۆ دەسپێرم،

بۆئەوەی چاودێرییان لێبكەیت.

درود بۆ ئارمەئیتی،

كە دیاردەی پاكیوویستو خواستی دڵە،

وستایشت دەكەم

چونكو شالیارێكی مەزنو نەمری.))

لەم بەندەی پێشوودا، زەردەشت خاسترین پاداشتی بۆ ئەو كەسانە دانا كە خاوەنی باوەڕنو گوێ بۆ بانگەوازیویژدان ڕادەگرنو بەگوێرەی فەرمانو ئامۆژگارییەكانی ئاهورا رەفتار دەكەنو هەمیشە پاكن.

لەم بەندەشدا، دیسانەوە جەخت لەسەر هەمان گوفتاری پێشو دەكاو دەبێژێ، رۆحی راستگۆیانو بیرخاسانو دروستكردارانو هەروەها ئەوانەی بە دیاردەی(ئارمەئیتی) خۆیان ڕازاندۆتەوە، وویستو ئارەزووی دڵیان لەسەرچاوەی ئەم فریشتەیە كە دیاردەی خۆشەویشتیو بێ ڕیایی یە، هەڵێدەقولێێت، نیزیك بە ئاهورامەزداو لەبەهشتی بەرین دەبەنەسەر، هەروەها دەبێژێ كە رۆحی ئەم جۆرە كەسانە بە ئاهورامەزدا دەسپێرم بۆئەوەی چاودێرییان لێبكات.

لەکۆتاییدا دەبێژێ، لەبەر ئەوەی ئاهورامەزدا شالیارێکی مەزن‌و نەمرەو فەرمانڕەوای هەردوو جیهانە، ستایشتی دەکات.

هات 49 بەندی 11

((رۆحو ڕەوانی شالیارانی ستەمکار،

وبەدکردارو بەدگوفتارو بیرخراپ‌و بآویژدان‌و درۆزنان،

لەرووناکییەوە بۆ تاریکی دەگەڕێتەوە.

بەڕاستی ئەمانە،

لەمۆلێگەی درۆدا دەمێننەوە.))

لەم بەندەدا، باسی رۆحو رەوانی شالیارانی ستەمکارو بەدکردارو گوفتارو بیری خراپ‌و بآویژدان(لێرەدا مەبەست لە بآویژدان ئەو کەسانەن کەویژدانی خۆیان خەفەکردووەو گوێیان بۆ بانگەوازی راستەقینەی نەگرتووە)ودرۆزنان دەکات. لەئاکامدا بە راشکاوی دەبێژێ کە سزای ئەمانە گەڕانەوە بۆ مۆلێگەی درۆیە کە بریتیە لەدۆزەخ یاخود ئەشکەنجەی‌ویژدان.

موبد فیروز ئازەرگوشەسب دەبێژێ: (شێوەی گەرانەوە بۆ ئەم جیهانە پڕ لەفریوو ڕیایە یاخود بێژین بۆ ئەم دۆزەخە، تاریك بونی رووناکی دەرونە کە لەحەق‌و راستی دوردەکەوێتەوە. ئەم تاریکبونەی‌ویژدان‌و رۆحو رەوانە کاتێك دەبێ کە مرۆ گوێ بۆ بانگەوازی‌ویژدانی دەرونی نەگرێت‌و بە پێچەوانەی ئەو بانگەوازە رەفتار بکات، وئاوێنەی صاف‌و رۆشەنی دڵی بە ژەنگی رق‌و قینەو چاوچنۆکی‌و رژدو خۆپەرستی‌و خۆ بەزل زانین‌و.. داپۆشێت‌و رەشوتاری بکات، ئەوسا لەهیچ کارێکی نارەواو خراپ درێغی ناکات‌و دەبێتە بیرخراپێکی لاسار، وسزای تەنیا دۆزەخەو بەس، دۆزەخی ئەو کەسانەش، هەر ئەم جیهانی مادیەیە.)

هەروەك لەبەندی پێشوودا گوتمان، رۆحو رەوانی پیاوخاسان‌و پاکان لەپەنای ئاهورامەزداو لەبەهشتی بەرین جێگیر دەبێ یاخود بێژین دەگەرێتەوە بۆ جێگەی ئەسڵی خۆی، بەلآم رۆحو رەوانی خراپەکاران دەگەرێتەوە بۆ دۆزەخ یا مولێگەی درۆو خراپە کە هەمان جیهانی خاکی‌و مادییە، ئەم رۆحە لەسەر زەوی دەمێنێتەوە تا بە تەواوەتی پاك دەبێ‌و قۆناغەکانی پوختەیی دەپێوآو لەهەموو خراپی‌و گوناحەکان پاك دەبێتەوەو شیاوی ئەوە دەبێ کە بگەرێتەوە بۆ شوێنی ئەسڵی خۆی.

هات49 بەندی 12

((ئەی مەزدا ئاهورا،

بەهۆی ڕاستیو ئەندێشەی خاس،

بەو کەسانەی کە ستایشتت دەکەنو

بە زەردەشت،

کە ستایشتگەری تۆیە، چ یارمەتییەکیان دەدەیت؟

ئەز، بە دروستیو بەهۆی سرودەکانمەوە

ستایشتت دەکەم،

وئەو شتەی کە لای تۆ خاسترینە، دەخوازم.)

لەم بەندەشدا، زەردەشت پرسیار لەئاهورامەزدا دەکاو لەپاشاندا خۆی وەڵام دەداتەوە، دەپرسێت، ئایا چ جۆرە یارمەتییەك بەو کەسانە دەدەیت کە لەناخی دڵو دەرونیانەوەو بەراستیو دروستی ستایشتت دەکەنو پەنات بۆ دەبەن؟ وە چۆن بەهرە لەخۆشەویستیو خەڵآتو بەخشیشي تۆ دەبەن؟ هەروەها ئارەزووی ئەوەیە کە خودی خۆشی بەهرە لەو خەڵآتو یارمەتییە ئاهورایییە وەربگرێت. لەپاشاندا، زەردەشت ئارەزوو دەکا کە بەهرە لەخاسترین خەڵآتەکانی ئاهورا بەریتو ستایشتی دەکا.

## سرودی پانزەهەم

هات 50 بەندی 1

((ئەی مەزدا ئاهورا،

لەکاتێکدا کە بەدڵو بەگیان پەنات بۆ دەبەم،

جگە لەراستی (ئاشا)و ئەندێشەی خاسی تۆ (وەهومەن)،

کێ دەتوانێ یاریدەی رۆحو رەوانم بدات؟

وکێ،

پارێزگاری لەمنو یارانم

دەکات؟))

ئەم بەندە پەیوەندییەکی زۆری بەدوا بەندی هات 49 هەیە، لەو بەندەدا باسی یاریدەدانی ئاهورامەزدا بەهۆی (ئاشا)و (وەهومەن) بۆ زەردەشتو هاوەڵێکانی دەکا. لەم بەندەشدا، زەردەشت پرسیاری ئەوە دەکا کە، پاش مردن، کێ یاریدەی رۆحو رەوانی دەدا، هەروەها، لەکاتی سەغڵەتیو گیروگرفتا، چ شتێك دەتوانێ خۆیو هاورێکانی رزگاربکات.

پاشان، خۆی وەڵام دەداتەوەو دەبێژێ کە تەنیا ئەو دوو دیاردەیە، واتە، راستی(ئاشا)و بیری خاس(وەهومەن) دەتوانن ئادەمیزاد لەهەموو گیروگرفتو مەترسیەکانی ژیان رزگاربکەنو یارمەتی بدەن، بە مەرجێك کە بە نیەتێکی پاکو بەدڵو بەگیان داوای یاریدەیان لێبکرێت.

هۆش لەتەك بیری پاکو راستیو دروستی پێکەوە دەتوانن ئادەمیزاد لەهەمو جۆرە مەترسیەکی ژیان رزگاربکەن، وبیگەیەننە پلەی پوختەییو پاکی.

ئەوەی لەم بەندەدا شایانی باسە ئەوەیە کە، رۆحو رەوانی مرۆڤ، پاش مردنی ئەو کەسە، نابێ چاوەڕێی تکاکار بکات بۆ رزگارکردنی، بەڵکو تەنیا خاسیو پاکیو دیاردەکانی دیکەی ئاهورمەزدا دەتوانن ئەو کەسە رزگاربکەنو ببنە پەنای.

هات50 بەندی 2

((ئەی مەزدا،

کەسێك کە هەمیشە تەنیا بیر لەبەرژەوەندی خۆی دەکاتەوە

چلۆن دەتوانێت بۆ ئەم جیهانەی کە (خۆشی)مان پێدەبەخشێت،

ئارەزووی ئاوەدانی بۆ بکاتو خۆشی بوێت؟

پاکانو راستکردەوەکانی پەیڕەوی راستی (ئاشا)

لەشوێنێك کە پڕ لەرووناکی خۆرە،

وجێگەی دانایانە، دەبەنەسەر.))

لەم بەندەدا، سەرەتا زەردەشت باسی ئەم جیهانە دەکاو زۆر گەشبینانە دەڕوانێتە ژیانو دەبێژێ، ئەم جیهانە شادیو خۆشیمان پێدەبەخشێت، دەبێ سود لەو خەڵاتە ئاسمانیە وەربگرین، بە مەرجێك نەبێتە هۆی ئەوەی کەزیانی پێبگەیەنین.

بە پێچەوانەی ئەوانەیوا بیردەکەنەوە کە ئەم ژیانە مان لەسەر زەوی، ژیانێکی کورتەو نابێ فرە دڵی پێ ببەستینو بۆئەوەی لەو دنیا رزگارمان بێت، دەبێواز لەهەموو خۆشییەکانی ئەم جیهانە بینین، زەردەشت ئامۆژگاریمان دەکا کەبەهرە لەخۆشیو جوانییەکانی ئەم جیهانە وەربگرینو لەهەمان کاتدا سوود بە خەڵکی بگەیەنین.

زەردەشت، دوو دڵە لەو کەسانەی کە هەمیشە بیر لەبەرژەوەندی خۆیان دەکەنەوە، وەئەوەندە خۆپەرستن کە بەهیچ جۆرێك بیر لەیارمەتیدانی خەڵک ناکەنەوە.

بۆیە دەپرسێت چلۆن ئەم جۆرە کەسانە دەتوانن خەڵکیان خۆش بوێتو هاوبەشی خۆشیو شادی خۆیانیان بکەنو یارمەتییان بدەن.

لەکۆتاییدا باسی مرۆ پاکەکانو راستکرداران دەکاو دەبێژێ، ئەوانەی کە بەگوێرەی یاسای راستی(ئاشا)و پاکی بژین، لەئاکامدا لەشوێنێك کە پڕە لەرووناکی خۆرو جێگەی مرۆچاکانو دانایانە(بەهەشت)دەژین.

هات 50 بەندی 3

((ئەی مەزدا،

کەوایە، بەحەقیقەت،

ڕاستی (ئاشا) ڕوودەکاتە کەسێك کە

توانایی معنوی(وەخشتەرا)و ئەندێشەی خاس (وەهومەن)

لەژیانیدا، ڕێنماي بێت،

ولەژێر سایەی ئەم خەڵاتانە

جیهانو دەوروبەری خۆی کە پڕە لەدرۆو ڕیا،

ئاوەدان بکاتەوە.))

زەردەشت لەم بەندەدا دەبێژێ، کەسێك کە هێزی معنوی (وەخشتەرا)و ئەندێشەی خاس (وەهومەن) لەژیانیدا ڕێنمایی بکات، دەگاتە سەرچاوەی ڕاستیو دروستی (ئاشا). واتە کەسێك کە بە پەروەردەکردنی دیاردەکانی ئاهورایی(وەخشتەراو وەهومەن) توانیوێتی بەسەر هەواو هەوەسە دەرونییەکانی زاڵ بێتو بەهێزی باوەڕو ئیرادەوە سەرکەوێت بەسەر چاوچنۆکیو ڕژد، وبە بیرێکی پاکو دڵێکی ڕۆشەنەوە بڕوانێتە هەموو شتێكو هەموو کەسێك، هۆشو بیری خاس ڕێنمایەتی لەژیانیدا، ئەم جۆرە کەسانە، بێگومان دەگەنە ڕاستی (ئاشا) کە بریتیە لەسەرچاوەی حەقو بە دیداری ئاهورامەزدا دەگەن.

هەروەها دەبێژێ، کەسێك کە بەو دیاردانەی ئاهورامەزدا بیروکرداروو گوفتاری خۆی برازێنێتەوە، ولەژێرسایەی ئەم خەڵاتانە تێبکۆشێت بۆ ئاوەدانکردنەوەی دەوروبەری خۆیو جیهان، ئەو کەسەش بەهرە لەخەڵاتی ڕاستی (ئاشا)) وەردەگرێت. (ئاشا)، لەلایەکەوە دیاردەی حەقو سەرچاوەی هەموو ڕاستیو پاکی یەکانەو لەلایەکی دیکەشەوە نموونەی یاسای (بوون)و تەکوزی سروشتو بوونە.

خەڵاتی (ئاشا بریتیە لەدابینکردنی ڕۆحو ڕەوانێکی ئاسودە کە بەهۆی زانستو بیرەوە، مرۆ لەخراپەکاری دووردەخاتەوەو بەرەو ڕاستیو پاکیو لەخۆبوردنی دەبێت.

لەم بەندەدا، دوبارە ئاماژە بۆ ئەوەکراوە کە ئەم جیهانە پڕبووە لەدرۆ ڕیا، درۆزنو ستەمکارەکان دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست.

هات50 بەندی 4

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئێستا ئیدی تۆو ڕاستی (ئاشا)و خاسترین ئەندێشەکان (وەهومەن)،

وتوانایی معنوی (وەخشتەرا)، ستایشتت دەکەم،

وگەرەکمە کە لەسەر ڕێبازی ڕاستی بم.

ولەنێو کاخی سرودا (بەهەشت)،

گوێ بۆ ئامۆژگاری ئەویندارانت

ڕابگرم.))

زەردەشت، لەم بەندەدا، پاش ئەوەی ستایشتی ئاهورای بێهاوتا دەکا، ئارەزووی خۆی دەردەبڕێ کە بریتیە لەبەهرە وەرگرتن لە دیاردەکانی ئاهورا(ئاشا، وەهومەنو وەخشتەرا)، واتە بەهرە لەراستیو دروستیو پاکیو بیری خاسو دڵی رۆشەنو هێزوتواناى معنویو زاڵێبون بەسەر هەواو هەوەسدا، وەربگریت، وهیواداره لەسەر ئەم رێبازە بمێنێتەوە، واتە لەسەر رێی راستیو پاکیدا جێگیربێت، وئەو ئامۆژگارییانەی کە بۆی ئیلهام دەبێت، بە بیرێکی پاکەوە گوێ بیستی بێتو بەکاری بهێنێت.

لەبەرئەوەی بەهەشت بەبێرەگای ئاهورامەزدا دانراوە، ودۆستانو ئەویندارانی بە ئەمەکی مەزدا، کەسانێکن کە لەرێی راستیو پاکیدا لەو شوێنە پیرۆزە جێگیر بون، کەوایە گوێ ڕاگرتن لەبانگەوازی ئەم ئەویندارانە، هەر ئەو ئامۆژگاریانەیە کە بە شێوەی ئیلهام دەگاتە گوێی ئادەمیزادو بەرەو رزگاری رێنماییان دەکات.

لەم بەندەدا، ئاماژە بۆ سآ خالأ کراوە:

یەکەم: هەوڵو تێکۆشان بۆ پەروەردەکردنی دیاردەکانی ئاهوراییو ستایشکردنی ئاهورامەزدای داناوژیر.

دووەم: مانەوە لەسەر رێگەی راستیو پاکیو دورە پەرێزی کردن لەلادانو خراپەکاری.

سآیەم: گوێڕایەڵی ئامۆژگاری پیاوچاکانو ئەویندارانی ئاهورامەزدا کە بەشێوەی ئیلهام دەگاتە ناخی دڵودەرونو بیری پاك.

هات50 بەندی 5

((ئەی مەزدا ئاهورا،

وئەی راستی(ئاشا)،

بە میهرەبانییەوە، ڕووبکەنە

بێژەری سرووودە ئاسمانییەکان،

ویاریدەی بدەنو پشتیوانی بن.

تا ئەو بتوانێت رِێنماي خەڵک بێت،

بەرەو رِووناکی.))

لەم بەندەدا، زەردەشت بەشێوەی سێهەمین کەسی غائب قسەدەکاو دەبێژێ، ئەی خوای داناوژیر، سەبارەت بە پەیامنێری خۆتو بێژەری سرووودە ئاسمانییەکان میهرەبان بە، ویارمەتی بدە تا بتوانێت خەڵکی بەرەو رێگەی راستو رووناکی راستەقینە، کە مایەی بەختەوەریو رزگارییە رێنمایی بکات.

ئەوەی لەم بەندەدا زێتر سەرنج رادەکێشآ ئەوەیە کە، لەچەندین بەندی دیکەشدا لەگاتەکان، پلەوپایەی (ئاشا) واتە راستی، لەتەك ئاهورامەزدا، یەکسان بینراونو داوای یارمەتییان لێکراوە, (ئاشا)، کە هەمان دیاردەی راستیو پاکیو یاسای بوونە، برِێ جار بە شێوەی سیفەتی تایبەتی حەقیقەتو راستیو هەندێ جاریش راستەوخۆ بەشێوەی خوا باسکراوە. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ئاهورامەزدا، بەنێوی جۆراوجۆر ناوبراوە، وەك ئافەریدەگاری داناوژیر، راستیو حەقیقەتو...

ئەمە لەئەسلی مەسەلەکە هیچ ناگۆرِێتو نابێ‌وامان لێبکات بیر لەوەبکەینەوە کە فریشتەکان(ئەمشاسپەندان) لەریزی ئاهورامەزدا دابنێینو یاخود بێژین، کە زەردەشت باوەرِی بە بونی چەندین خوا هەبووە.

هات50 بەندی 6

((ئەی مەزدا،

ئەز،

زەردەشتم، ئەویندارى رِاستی (ئاشا)،

بەدەنگێکی بەرز ستایشتت دەکەم،

دەخوازم،

هەمیشە زمانم لەڕێی زانستو بیروهۆشدا ڕەوانبێژبێت،

وبەهۆی بیری خاسەوە،

ئامۆژگاریم بکەیتو ڕێو ڕەوشی ئاکاریم پێشان بدەیت.))

دوابەدوای بەندی پێشو، زەردەشت ئارەزوویەکی دیکەی هەیەو داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە هێزوتوانای ئاخافتنو ڕەوان بێژی بەزمانێکی شیرینی پآ ببەخشێت، وبیرو هۆش هەمیشە لەژیانیدا ڕێنمایی بکات، بۆئەوەی لەرێی بیرو گوفتاری خاس بتوانێت ڕێنمایی خەڵک بکات بەدەستورو فەرمانە ئاکارییەکانو ئەو ئامۆژگاریانەی کە بەهۆی بیری خاس (وەهومەن) پێی ئیلهام دەبێت، وخەڵک بەرەو بەختەوەریو راستیو نەمرێتی ببێت.

لەم بەندەدا، دوبارە زەردەشت خۆی بە ئەویندارى راستی(ئاشا) دەزانێت، واتە هەمیشە بیر لەراستیو دروستیو پاکی دەکاتەوەو لەسەر رێبازی راستیدا هەنگاو هەڵدێنێتو جگە لەراستی، هیچوشەیەك لەزاری نایەتەدەر.

هات50 بەندی 7

((ئەی مەزدا،

ئەز، بەهۆی بزوێنترین سروودەکانمەوە،

وبۆ گەیشتنە ئامانجەکانم،

ستایشتت دەکەمو خۆمت لـآ نیزیك دەکەمەوە،

تا، بەهۆی راستی (ئاشا)و بیری خاسەوە (وەهومەن)،

ڕێنماییمان بکەیتو پالێپشتمان بیت.))

ئەوەی لەم بەندەدا پتر پێویستی بە باسکردنە، ڕێگەی نیزکبونەوەو گەیشتنە بارەگای ئاهورامەزدای داناوژیرە، کە چەندین جار زەردەشت باسی لێکردووە، ویەکـآ لەهەرە گرنگترین ئارەزووو ئامانجەکانیەتی.

لەم ئەندەدا، ڕێگەی گەیشتنە لای خوای بە پەروەردەکردنی دیاردەکانی (ئاشا)و (وەهومەن) داناوە، واتە، خاس بیرکردنو رۆشەن دڵیو خۆشەویستی خەڵکو راستیو دروستیو پاکیو

هەڵسوکەوت بەگوێرەی یاساو تەکوزی (بوون). هەروەها دەبێژێ، پەرستنو ستایشت بە نیەتێکی پاکو باوەرێکی پتەو ڕێنماییەکە بۆ گەیشتنە بارەگای ئاهورامەزدا.

زەردەشت، لەگەڵ ئەو ئارەزووەی کە دەریبرِیوە بۆ نیزیکبونەوەو گەیشتنە لای ئاهورامەزدا، داوای لێدەکات کە یارمەتی بداتو ڕێنمایی بکا بۆ ئەو کارەی کە پێی هەڵێدەستێت کە بریتیە لەگەیاندنی پەیامەکەی بۆ خەڵک بۆئەوەی بتوانێت پتر ئاینی راستیو دروستیو پاکی بڵاوبکاتەوەو خەڵکی بەرەو یەکتاپەرستیو خواناسین رێنمایی بکات.

هات50 بەندی 8

((ئەی مەزدا،

ئەز،

بەو سروودانەی کە لەناخی دڵمەوە هەڵێقولآوە (گاتاکان)،

وبە دوو دەستی کراوە بەرەو ئاسمان،

ڕووت تێدەکەم،

دەخوازم وەك دۆستێکی بە ئەمەك

بەهۆی راستیو پاکیەوە

ستایشتت بکەم،

وبەهۆی بیری خاسەوە،

لێت نیزیك ببمەوە.))

لەم بەندەشدا، هەروەك بەندی پێشوو، بەڵام، بە شێوەیەکی دیکە، زەردەشت ئارەزوو دەکا لەئاهورامەزدا نیزیك بێتەوە.

لەبەندی پێشودا ستایشتو نوێژکردن بە نیەتێکی پاکەوە، یەکێ لەئامرزەکان بوو، بۆ نیزیکبوونەوە لەخوای داناوژیر.

لەم بەندەدا، زەردەشت بە ئاخافتنی سروودەکانی (گاتاکان) بەشێوەی شیعرو بەرزکردنەوەی هەردوو دەستی بەرەو روی ئاسمان، کە نیشانەی بآ فیزیە، دەیەوێت لەخوا نیزیك بێتەوەو داوای ئامۆژگاریو هاریکاری لێدەکات. لەکۆتاییدا دەبێژێ، ئەویندارانی بە ئەمەکی ئاهورامەزدا بەهۆی دوو دیاردەی بیری خاس (وەهومەن)و راستی(ئاشا) دەتوانن لەخوای داناو ژیر نیزیك ببنەوە.

هات50 بەندی 9

((ئەی مەزدا،

بەم سرووده ستایشگەرانە،

ولەرێی ڕاستی،

وبەهۆی ئەو کارانەی کە لەبیری خاسەوە هەڵێقولآوە،

بەرەو لای خۆت دەگەڕێمەوە،

لەتەك ئەوەی کەدەزانم

ویستی خۆم بەسەر چارەنوسمدا زاڵە،

تا ئەوکاتەی بەدوندی ئامانجەکانم دەگەم،

هەروا، داوکاری زانستی خاسم لێت.))

هەمیسانەوە، لەم بەندەدا، بە ئاشکرا پێشانمان دەدا کە زەردەشت چەندە عەودالّی نزیکبونەوەو گەیشتنە لای ئاهەورامەزدایە، دەبێژێ، لەڕێی راستو بەهۆی ئەو کارانەی کە بەبیری خاسەوە ئەنجام دراوە، وهەروەها بەهۆی ئەو سرودانەی کە دەیبێژآ، بەرەو لای ئاهورامەزدا دەگەرێتەوە.

بەڵگە نەویستە، کارێك کە بە ئەندێشەی خاسو لەروی هۆشو زانستەوە ئەنجام بدرێت، ئەو کارە کارێکی خاس دەبێو بەسودی خەڵک تەوا دەبێت. بەهۆی ئەم جۆرە کارو هەڵسوکەوتە خاسانە، هەموو کەس دەخوازێت لەراستیو پاکی نیزیك بێتەوە.

لەکۆتاییدا، زەردەشت، داواو ئارەزووی ئەوەیە کە بەهرە لەزانستو حیکمەتی خوایی وەربگریت، چونکە ئەم زانیاریانە، خەڵک بەرەو مەنزلێگای بەختەوەریو رزگاری دەبێت.

هات50بەندی 10

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەو کارانەی لەرابوردودا ئەنجامم داوە،

وئەو کارانەی لەپاشەرۆژدا ئەنجامی دەدەم،

وئەوەی لەبیری خاسەوە بۆم ئیلهام بووە،

هەروەك تیرۆژی خۆر،

وئاسۆی بەیانیان، لەدیدی تۆوە بەرێزە،

گشت ئەمانە لەرِێی راستیو بۆ ستایشت

وریز گرتنی تۆ بووەوو دەبێت.))

زەردەشت لەم بەندەدا، هیوادارە کە لەکارەکانیدا هیچ جۆرە هەڵەیك نەکات، ئەو کارانەی ئەنجامی داوە یا بە ئەنجامی دەگەیەنێت، رەزامەندی ئاهورامەزدای لەسەربێت. بەواتەیەکی دیکە. گشت کارەکانی خاسو خواپەسەند بێتو لەرِوی هۆشو بیرەوەبێت. لەهەموو کارەکانیدا، خوا رِەچاو بکاتو بەسوودی کۆمەڵگا ئەنجامی بدات.

لەکۆتاییدا، هەلهاتنو ئاوابوونی خۆرو تیرۆژەکەیو هەروەها ئاسۆی بەیانیان، بە نیشانەیەك لەنیشانەکانو شکۆمەندی خوا، داناوە، کە دیاردەکانی سروشتیشبەخۆنوێندیانەوە، خوای داناوژیر بێهاوتا ستایشت دەکەنو کرنۆش بۆ مەزنێتی دەبەن.

هات50 بەندی 11

((ئەی مەزدا،

تا ئەو شوێنەی کە لەژێرسایەی راستیدا،

هێزو توانام هەیە،

ستایشتم کردویتو دەیکەم.

هیوادارم، ئەی ئافەریدەگاری جیهان،

بەهۆی بیری خاسەوە،

یەکەمینو خاسترین ئاواتو خواستی دروستکرداران،

کە ئاوەدانکردنو نۆژەن کردنەوەی جیهانە،

بێنێتەدی.))

لەم بەندەدا، زەردەشت خۆی بە ستایشگەری خوا داناوەو دەبێژێ، تا ئەو شوێنەی هێزو توانای هەیە، خوا دەپەرستێتو ستایشتی دەکاو ڕێبازی ڕاستی بەرنادات و بیر لەئەندێشەی خراپ ناکاتوە.

لەکۆتاییدا، ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە کەویستو ئارەزووی دروستکردارەکان کە بریتیە لەئاوەدانی جیهان، یانی نوێ کردنەوەی جیهان بێنێتەدی، بۆئەوەی هەموو خەڵک بەختەوەرو ڕزگاربن.

بێگومان، خاسترین ئارەزووی دروستکردارەکان، دابین کردنی ئاشتیو برایەتیو یەکسانیو پێشکەوتنی کۆمەڵگایە.

هەروەها لەناوبردنی ڕژدو چاوچنۆکیو ڕقو قینەو توڕەییو هەواو هەوەسی نابەجآوگەندەڵی کە کۆمەڵگا بەرەو براکوژیو هەراو هوریاو شەڕو شۆڕو تاوان دەبێت.

**سروودی شانزەهەم**

4- وەهوخشەتەرگات

هات51 بەندی1

((توانایی معنوی وه خشەترا،

خەلآتی بەنرخی ئاسمانییە،

کە بەهۆی راستییەوە (ئاشا)،

دێتە نێو دڵی گیان بەخشانی رێبازی مەزدا،

وهانیان دەدا کە خاسترین کردار ئەنجام بدەن،

وئەز،

ئێستاو هەمیشەو تەنیا بالأ لەم رێبازەدا تێدەکۆشم.))

لەم بەندەدا، زێتر باسی (وەخشەترا)ی کردووەو دەبێژێ،وەخشەترا یا دیاردەو نیشانەی شالیاری، هێزو توانایەکی ئاهورایی معنویە، ئەگەر لەنێو خۆماندا پەروەردە بکەین، ئەوسا مرۆی فیداکارو گیان بەخشی رێگەی حەقو راستیو دروستی، پتربیر لەخزمەتکردنی خەڵکو یارمەتیدانیان دەکەنەوە، وبەهیچ جۆرێك بیر لەخۆپەرستیو بەرژەوەندی تایبەتی ناکەنەوە.

خشەترا، ئەم دیاردەی کە ئادەمیزاد بەرەو پوختەیی رێنمایی دەکا، ماناو مەفهومێکی یەکجار زۆری هەیە، یەکێ لەو مانایانە بریتیە لەشالیاری بەسەر نەفسی خۆدا، واتە، زاڵبون بەسەر هەواو هەوەسوویستو ئارەزووە خراپەکانی دەروون، مانایەکی دیکەشی بریتیە لەهێزی معنویو بەکارهێنانی ئەم هێزە بۆ خزمەتکردنی خەڵکو یارمەتیدانیان.

لەم بەندەدا، ئەم هێزو تواناییە معنوییەی بە خەلآتێکی ئاهورایی داناوە کە بەهۆی راستیو دروستیەوە دێتە دڵی ئادەمیزادو هانیدەدا کە باشترین کارەکان ئەنجام بدەنو خزمەتی خەڵک بکەن.

گیان بەخشانی رێگەی حەقو راستی، ئەو کەسانەن کە بەسەرویستو ئارەزووی دەرونی خۆیاندا زالێدەبنو هەموو هیواو ئارەزوویەکیان خزمەتکردنی خەڵکە، ئەم جۆرە کەسانە بەهرە لەخەلآتی وەخشەترا دەبەن.

لەکۆتاییدا دەبێژێ، بەهەشت یاخود خاسترین شت بەهۆی کاری خاسەوە دەستمان دەکەوێت. لەبەرئەوەی ئارەزووی هەموو کەس ئەوەیە کە لەو دنیا جێگەی بەهەشت بێت، وئەمەش تەنیا بەهۆی کاری خاسەوە دێتەدی، زەردەشت ئامۆژگاریمان دەکا کە بۆ گەیشتنە ئەم ئارەزووە تێبکۆشینو خۆشی تێدەکۆشێت کە بگاتە ئەو ئامانجە.

هات 51 بەندی2

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەم کردارانەم،

سەرەتا بەتۆو بەراستی(ئاشا)و بەبێوەڕی راستەقینە (ئارمەئیتی) پێشکەش دەکەم

وتۆ،

هێزو توانای معنوی خۆتم پێببەخشە،

وبەهۆی ئەندێشەی خاس (وەهومەن)،

ستایشگەرە بە ئەمەکەکانت، رزگاربکە.))

زەردەشت دەفەرموێ، هەر کارێکی خاس، پێش هەموو شتێك دەبێ بەناوی ئاهورامەزدای داناوژیر ئەنجام بدرێت، وهەمیشە (ئاشا)و (ئارمەئیتی)یشمان لەبەرچاوبێت. مەبەست ئەوەیە کە، هەموو کارێکی خاس دەبێ بەگوێرەی یاسای (بوون)و ئاینی راستیو پاکی بێتو بە باوەڕی راستەقینەو ئەوینەوە ئەنجام بدرێت. بێگومان، ئەو جۆرە کارەو بەو شێوەیە، لەلایەن ئاهورامەزداوە پەسەندەو سوودی کۆمەڵگای تێدایە.

لەکۆتاییدا، زەردەشت داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە، هێزو توانای معنویوویستو خواستی خۆی پآ ببەخشێت بۆئەوەی هیچ کارێك بە پێچەوانەی ئەو خواستانە ئەنجام نەدات. هەروەها دەخوازێت کە ستایشتگەرانی ئاهورامەزداو ئەوانەی هەمیشە ئەویان لەبەرچاوە، بەهۆی بیری خاسەوە رزگار بکات.

پوختەي ئەم بەندە ئەمەمان پآ رادەسپێرآ کە:

یەکەم، هەموو کارێکی خاس پێویستە بەناوی ئاهورامەزداوە ئەنجام بدرێت.

دووەم، هەموو کارێك دەبێ بەگوێرەی یاسای راستی (ئاشا) یەوە بێت.

سێهەم: هەموو کارێك دەبێ بە باوەڕی راستەقینەو خۆشەویستەوە(ئارمەئیتی) ئەنجام بدرێت.

چوارەم: پێویستە خواستوویستی ئافەریدەگار بزانینو ئەنجامی بدەین.

پێنجەم: خواپەرستان، بەهۆی بیری چاكـو هۆشەوە رزگاریان دەبێت.

هات 51 بەندی 3

((ئەی مەزدا ئاهورا،

گویٚ لەستایشتی ئەو کەسانە بگرە کە

بە کرداریان، وهەموو پێکەوە لێت نیزیك بونەتەوەو پەیوەستبون پێت،

وگویٚ ڕِایەڵی ئامۆژگارییەکانتن،

ئەو کەسانەی کە تۆ خۆت،

بەهۆی گوفتاری ڕِاستو بیری خاسەوە،

یەکەمین مامۆستایانیت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت ئەوە رادەگەیەنێت کە پێویستە هەمیشە گویٚ ڕِایەڵی ئەو کەسانە بین کە زانیاری تەواویان دەربارەی (عرفان) هەیەو ئەندێشەو گوفتارو کرداریانوێپێشان دەدات کە دەیانەوێت پەیوەست بن بە ئاهورامەزداوە. بێگومان، کەسێك دەتوانێت لەئەویندارى خۆی نیزیك بێتەوەو پەیوەست بێت پێی، کە بتوانێت نیشانەکانو دیاردەکانی ئاهورایی لەنێو دەروونی خۆیدا پەروەردە بکات، وبگاتە پلەی پوختەییو نەمرێتی، یاخود وەکو عارفەکان دەبێژن بگەنە پلەی (فناو في الله). لەکۆتاییدا دەبێژێ، ئەو کەسانەی کە گەیشتونەتە پلەی عرفانی، ئیلهامیان لەئافەریدەگار وەرگرتووە، ئەم ئیلهامە بۆ ئەو کەسانە دێت کە هەموو پلەکانپەرەسەندن(تكامل)یان پێواوە، ودلو هەناویان بە رووناکی راستەقینەی ئاهورایی ڕِونبۆتەوە.

یەکەمین مامۆستاو ڕِێنما،هەمان بانگهێشتیویژدانو بیری خاسە.

هات 51 بەندی 4

((ئەی مەزدا،

لەکوێیە خۆشەویستی بآ ئەندازەت بۆ ستایشگەرەکانت؟

خەلآتو بەخشینت لەکوێرا دەگاتە ئەویندارە بە ئەمەکەکانت؟

راستیو دروستی (ئاشا) لەکوآ دەستدەکەوێت؟

پاکی(ئارمەئیتی) لەکوێندەرێیە؟

لەکوآ دەتوانرآ خاسترین ئەندێشەکان (وەهومەن) بەدەست بێت؟

سەرچاوەی هێزو توانای شالیاریت لەکوآ وەیە؟))

زەردەشت، لەم بەندەدا بڕی پرسیاری کردووە کە بێگومان خۆی وەڵامی هەموویان دەزانێت. خۆی دەزانێت کە ئافەریدەگار هەروەك باوكێكی میهرەبان ئافەریدەكانی خۆی بآ ئەندازە خۆشدەوێت. هەڵێبەتە، ئەو ئافەریدانەی کە رەفتاریان بەگوێرەی (یاسای بوون)ەولەکارەکانیاندا هۆشو بیری خاس بەکاردێننو خەڵکیان خۆشدەوێت.

هەروەها دەبێژێ کە خەلآتو بەخشینی خوا بۆ کەسێك دەبێت کە ئەویندارى بە ئەمەکی ئافەریدەگار بێـت.

کاتێك کە دەپرسێت، راستیو حەقیقەتو خۆشەویستیو باوەڕ بەخوا لەکوێیە، دەزانێت کە ئەم دیاردە ئاهوراییانە لەدڵو دەرونی هەموو ئەو کەسانە دەبینرێت کە دیاردەکانی(ئاشا)و (سپەنت ئارمەئیتی) پەروەردە دەکەن. هەروەها کاتێك کە دەپرسێت بیری خاس لەکوآ دەست دەکەوآو سەرچاوەی هێزو توانای شالیاری ئاهورا لەکوێیە خۆی دەزانێت، کاتێك کە مێشکی ئادەمیزاد لەهەموو بیرێکی خراپ پاك دەکرێتەوە، ئەوسا ئیدی ئەندێشەی خاس لەمێشکیدا جێگیر دەبێو هۆش دەبێـتە رێنما بۆ گەیشتنە راستیو حەقیقەت هەروەها سەرچاوەی شالیاریو سەروەری ئافەریدەگاریش لەهێزو توانایەکی هەمیشەیی هەڵێدەقوڵێت کە هەر لەسەرەتاوە تاکو پەسلان بەردەوامە.

هات51 بەندی 5

((گشت ئەم پرسیارانە دەپرسم:

ڕابەرێك کە،

دروستکردارو بآ فیزە،

وعەودالّی هۆشو بیری خاسە،

ودادوەرو مامۆستای راستیە،

وتواناو بەخشەندەیە،

چلۆن دەتوانآ بەهۆی راستیەوە هەموو جیهان،

پێش بخاتو ئاوەدانی بکات.))

دوابەدوای پرسیارەکانی بەندی پێشوو، زەردەشت دەبێژێ، ئەم پرسیارانە ڕابەرو پێشەوایەکی دروستکردار دەیکات کە دەیەوێت لەزانیاریو ئامۆژگاریەکانی یەزدانی ئاگاداربێت. بێگومان، ئەم پێشەوایە، جگە لەزەردەشت خۆی کەسی دیکە نییە.

زەردەشت دەیەوێت کە خەڵک ئاگادار بکاتو رێگەی پێشخستنو ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگای جیهانییان پێشانی بدات، ئەو رێگەیەی کە بەگوێرەی (یاسای بوون) وراستیو دروستی بیت. دەیەوێت لەڕوی هۆشو زانیارییەوە، راستیو حەقیقەتی بوون بە خەڵکی ڕابگەیەنێتو لەخەلآتی ئاهورامەزدا ئاگاداریان بکات.

لەم بەندەدا، زەردەشت خۆی بەرابەرو پێشەوای دروستکردارو دادوەرێکی دادپەروەرو توانا دەناسێنێت.

گەرەکێتی خەڵک نهێنی (بوون) بزانآو تێبکۆشن بۆ ئاوەدانکردنەوەی جیهان.

زەردەشت بەم پرسیارانە دەیەوێت زانیاریو هۆشی خەڵک پتر بکات.

ئەوەی شایانە لەم بەندەدا ئەوەیە کە زەردەشت دەبێژێ. مرۆ بۆئەوەی پتر فێری زانیاری بێـ، دەبێ بآ فیزو ئیفادەبێتو لوتبەرز نەبێت.

هات51 بەندی 6

((مەزدا ئاهورا،

بە شالیاری خۆیەوە،

بۆ کەسێك کەویستەکانی ئەو ئەنجام بدات،

خاستر لەخاس دەبەخشێت،

وبۆ کەسێك کە خۆشحاڵی نەکات

ولەرِێی ئاوەدانکردن‌و پێشخستنی جیهان تێنەکۆشێت،

لەئاکامداو لەکۆتایی ژیانیدا،

خراپتر لەخراپی پێدەگەیەنێت.))

لەم بەندەدا، دەفەرموێت، کەسێك کە لەم جیهانەدا تێبکۆشێت‌و هەوڵبدات بۆ ئاوەدانکردنەوەو پێشخستنی کۆمەڵگاو جیهان، وویستو ئارەزووی ئاهورامەزدا بەدی بهێنێت، خەلآتی ئاهورایی پێدەگات، بەلآم ئەگەر کەسێك بە پێچەوانەوە رِەفتار بکات، سزای کرداری خۆی وەردەگرێت.

ئەوەی کە لێرەدا دەبێ بێژین ئەوەیە کە، ویستو ئارەزووی ئاهورامەزدا بریتیە لەبانگهێشتی‌ویژدان کە فەرمان دەدات بۆ ئەنجامدانی کارێك یاخود دوورەپەرێزی لەکارێك. ئەوەی بانگهێشتی‌ویژدان فەرمانی پێدەدات، لەبەرئەوەی‌ویستی دروستی یەزدانیە، کەوایە ئەنجامدانی دەبێتە هۆی بەهرە وەرگرتن لەپاداشتی خاس، وبەپێچەوانەوە ئەنجامنەدانی توشی سزای دەکات.

هات51 بەندی 7

((ئەی مەزدا،

ئەی کە ئەم زەوییەو ئاو رِووەکت ئافراند،

بە پاکترین ئەقڵ‌و هۆشی خۆت

پوختەیی‌و نەمرێتیم پێببەخشە،

وبەهۆی ئەندێشەی خاس

هێزو توانایی جەستەو رۆحی‌و خۆراگرتن

وژیانێکی نوێم پآ خەلآت بکە،

ولەئامرژگارییەکانت بەهرەمەندم بکە.))

پێشەکی لەم بەندەدا، زەردەشت باسی ئاهورامەزدای کردووەو بە ئافەریدەگاری زەوی، ئاوو ڕووەکی داناوە, پاشان ئارەزووی خۆی دەربڕیوە بەوەی کە بەهۆی ئەقڵو هۆشییەوە، بێگەیەنێتە پلەی پوختەییو نەمرێتی پآ ببەخشێتو بەرخورادربێت لەهێزو توانایی جەستەییو رۆحیو خۆراگرتن. لەکۆتاییدا دەیەوێت بەهۆی بیری خاسو دڵکی رۆشەنەوە بەهرە لەئامۆژگارییەکانی مەزدا بەرێت. بێگومان ئەو داخوازیانەی زەردەشت هەیەتی، ئارەزووی هەموو کەسێکە، چونکو، هەر کەسێك بگاتە پلەی پوختەییو نەمرێتی، دەبێتە مرۆیەکی بە تەواومانا، واتە کەسێك کە کۆنترۆڵی دەرونی خۆی بکات، بێگومان هەموو خەڵکی خۆش دەوێتو بەگوێرەی یاسای بوون دەجولێتەوەو رەفتار دەکاو جگە لەراستیو دروستی هیچ رێگەیەکی دیکە هەڵێنابژێرێت. جگە لەمە، زەردەشت داوای هێزو توانای جەستەییو رۆحی دەکا، ئەم دوو هێزو توانایە (جەستەو رۆحی)، هەردوکیان یەکتر تەواو دەکەن، لەئامۆژگاریەکانی زەردەشت داهەرگیز باسی ئەوە نەکراوە بۆ پەروەردەکردنی رۆحو گیانو ئاکار، بە چاوی سوکەوە تەماشای جەستە بکرێتو بایەخی پآ نەدرێت، وەکو بڕی دەبێژنبۆئەوەی رۆحو معنویت بەهێز بکرێت دەبێ جەستە ئازار بدرآ.

هات51 بەندی8

((ئەی مەزدا،

ئێستا،

پەیامەکەت بۆ خەڵکی دانا دەگێرمەوە:

چارەنووسی خراپ بۆ درۆزنو خراپەکارانە،

وبەختەوەری بۆ کەسێکە کە،

پابەندی راستی بێت.

وبێگومان،

بەختەوەریو شادمانی بۆ کەسێکە کە

ئەم پەیامە ئاسمانییە،

بۆ خەڵکی دانا بلآو بکاتەوە.))

لەنێو ئەم بەندەدا، سآ باس ڕەچاوکراوە:

یەکەمیان ئەوەیە کە، پەیامی ئاسمانی دەبێ فێری مرۆی دانا بکرێت.

دووەمیان ئەوەیە کە، بەراشکاوی جەخت لەسەر ئەوە کراوە کە خراپەکارانو درۆزنان دوچاری چارەنوسێکی شومو خراپ دەبنو بەپێچەوانەوە خاسکردارانو پەیرەوانی ڕاستی بەهرە لەپاداشتی خاسو بەختەوەری دەبەن.

سێهەمیان ئەوەیە، زۆر بە ئاشکرا داوا لەخەڵک دەکات کە ئاینی ڕاستیو دروستی بڵاوبکەنەوە، ودەفەرموێت، هەر کەسێك ئەم پەیامە ئاسمانیە بۆ خەڵک بڵاوبکاتەوە، بەختەوەرو شادومان دەبێت.

هات51 بەندی 9

((ئەی مەزدا،

تۆ بەهۆی بلێیسەی ئاگرو ئەزموونی مسی تواوە

هەردوو دەستەی ڕاستکردارو خراپەکار

تاقی دەکەیتەوەو پاداشو سزایان دەدەیت.

ئەم ڕەوشی ژیانەمان پێشان دەدەیت کە،

ئازارو ئەشکەنجە بۆ خراپەکاران،

وخۆشیو شادومانی بۆ چاکانو خاسکردارانە.))

لەم بەندەدا، دوبارە هەروەك بەندی 7 لەهات 32 باسی ئەزمونی بلێسەی ئاگر دەکاتو دەبێژێ، ڕاستکردارانو خراپەکاران بەهۆی بلێیسەی ئاگرەوە تاقی دەکرێنەوە. ئەم ئەزمونە دەرونو تەبیعەتی هەموو کەسێك ڕۆشەندەکاو بەگوێرەی ئەم تاقیکردنەوەیە، پاداشو سزای هەریەك لەو دوو دەستەیە دەدرێت.

بڕێ لەئاوێستا ناسان، وا دەزانن کە ئەم ئەزمونە، هەر ئەو تاقیکردنەوەیە کە لەکۆنەوە لەسەر زەمینی ئێران باوبووە، ولێرەدا نامانەوێت لێ بدۆیینو باسی بکەین. ئەوەی کە دەبێ باسی بکەین ئەوەیە کە هەرگیز لەگاتاکاندا باسی مادیات نەکراوەو مەبەست لەبلێیسەی ئاگرو

تاقیكردنەوەی مسی تواوە، بلێیسەی ئاگری معنوی دڵە. نە ئاگری ڕواڵەتی، لەهەر شوێنێكدا لەگاتاكان، باسی ئاگر كراوە، مەبەست ئاگری معنویە، رووناكی دڵو بلێیسەی ئاگری معنوی هەركەسێك چارەنووسوویژدانی خاس یا خراپی ئەو كەسە ئاشكرا دەكات. ئەمە هەر لەوەدەچآ كە ئەزمونی ئاگرو مسی تواوەی بەسەردا ئەنجام بدرێتو لەئاكامدا پاداشو سزای هەركەس بەگوێرەی كاری خاس یا خراپی ئەو كەسەیە كە ئەنجامی داوە. واتە كە پەیڕەوانی درۆو خراپەو بیر خراپان دوچاری ئازارو ناخۆشیو پەشیمانی دەبن، پەیڕەوانی راستیو خاسی، بەهرە لەخۆشیو شادی دەبەن.

لەم بەندەدا، رێگەو شێوەی تاقیكردنەوەی خاسانو خراپانی پێشان داوە كە هەمان رۆشنایی دڵأو دەرونی بێداروویژدانی رەشو مردوی ئەم دوو دەستەیەیە.

هات51 بەندی 10

((ئەی مەزدا،

كەسێك كە بە پێچەوانەی ئاینی ڕاستی،

لەرێی تێكدانو ئالێۆزكردنی جیهان، كار دەكات،

هەموو گیانی لەدرۆ دروست بووە،

ولەو كەسانەیە كە خراپ بیردەكەنەوەو نەزانن.

ئەز، راستی (ئاشا)

بۆ خۆمو یارەكانم دەخوازم،

تا بێتە لامانو پاداشی خاسمان پآ ببەخشێت.))

زەردەشت لەم بەندەدا، ئەو كەسانەی كە ئاژاوە دەنێنەوەو خەڵک گومڕا دەكەنو هەوڵدەدەن دوریان بخەنەوە لەرێی راستو دروست، بە خراپەكارو نەزان دەزانێت، چونكو مرۆی هۆشمەندو ژیر هەرگیز بەرەو خراپە نارِواتو هەول نادات خەڵک لەرێی راست لابدات.

نەزانینو بآ هۆشی، یەكآ لەو هۆكارنەیە كە ئادەمیزاد بەرەو خراپەكاریو كاری نادروست دەبێت.

لەبەرئەوە، زەردەشت بۆ خۆیو یارەکانی، داوای یارمەتی لەئاشا(راستی) دەکات، وئارەزووی ئەوەیە کە هەموو خەڵک بەهۆی پەیرەوی کردنیان لەیاسای راستی، پاداشتی خاسیان دەستبکەوێت.

شایانی باس ئەوەیە کە، زەردەشت هەموو کارێکی خراپو ناشایست بە ئاکامی نەزانینو بیری کرچو کالیٚ دەزانیٚو تەنیا پەیرەویکردن لەیاسای ڕاستی بە چارەسەری هەموو دەردوو ناخۆشیەکان دەزانێت.

هات51 بەندی11

((ئەی مەزدا،

کێیە ئەو دۆستە بەئەمەکەی یاریدەی زەردەشت ئەسپەنتمان دەدات؟

ئەو دۆستە، کەسێکە کە،

بەدڵو بەگیان لەتەك راستیدا (ئاشا) ڕاوێژدەکا

وپاکو ئەویندارو خواپەرستە

وبەبیری خاسەوە لایەنگری ئەنجومەنی برایەتی موغەکانە.))

لەم بەندەدا، پرسیارێك کە دەبێژیٚ، کێ دەتوانێ دۆستو هاوبیری بەئەمەکی زەردەشت بێت، لەوەڵامدا بڕیٚ لەتایبەتکارییەکانی ئەو کەسە یا ئەو کەسانەی دەتوانن هاوڕێی راستەقینەی زەردەشت بن، باسکراوە، یەکێ لەو دیاردانەی کە دەبیٚ هاوبیری زەردەشت هەیبێت بریتیە لەراستیو پاکی، واتە، کەسێك کە دڵی بەراستی بەستبێتو پەیڕەوی یاسای راستی بێت. دوەمین مەرج بریتیە لەوەی کە ئەو کەسە باوەڕی بەخوا هەبێتو ئەویندار بێت. سێهەمین دیاردە، ئەوەیە کە بەبیرێکی پاکەوە لایەنگری ئەنجومەنی برایەتی موغەکان بێت.

ئەم ئەنجومەنە، لەو کەسانە پێکهاتبوو کە باوەڕی تەواوو پتەویان بە ئامۆژگارییەکانی زەردەشت هەبووو تێدەکۆشان بۆ نویٚ کردنەوەی کۆمەڵگاو پێشخستنو ئاوەدانکردنەوەی.

بەناوبانگترین ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە بریتی بون لەویشتاسەب، فەرشوشتەر، جاماسب وە میدیوماوە.

هات51 بەندی 12

((ئەوانەی فریویان خواردووەو ڕێبازی (کاوی)یان گرتۆتەبەر،

لەژیانیاندا،

ڕەزامەندی زەردەشت ئەسپەنتمان بەدی ناهێنن،

چونکە ئەوانە،

بەختەوەری، تەنیا لەدیدی مادی یەوە دەبینین،

نە لەجۆش‌و خرۆشەکانی معنوی.))

سەرەتا، لەم بەندەدا باسی(کاوی)یەکان دەکا، کە رابەرانی ئاینی سروشت پەرستی بون، دەبێژێ، ئەوانەی پەیڕەوی ئەم (کاوی)یانەن‌و ڕێبازی ئەوانیان گرتۆتەبەر، ودەستورەکانیان کە بریتیە لەخراپەکاری، ئەنجام دەدەن، ئەم جۆرە کەسانە هەرگیز بەختەوەر نابن، هەرچەندە لەوانەیە بەڕواڵەت خۆیان بە بەختیار بزانن، ئەمانە فریویان خواردووەو زەردەشت لەکردارو رەفتاریان بێزارە.

هات51 بەندی 13

((بەم شێوەیە،

خراپەکار، کە لەڕێی راست لایداوە،

وویژدانی خۆی دوچاری خراپە کردووە،

لەسەر پردی چینیوت،

وبەرامبەر بە ئاشکرابوونی کردارەکانی،

رۆحی دوچاری سەرزەنشت دەبێ،

چونکو بەهۆی کردارو گوفتاری خۆیەوە،

لەڕێی راست دورکەوتۆتەوە.))

لەم بەندەدا، دەبێژێ، خراپەکارانو درۆزنان کە لەڕێی راست لایانداوەو زێدەڕەوییان کردووە بەوەی کە خەڵکیشیان چەواشە کردووەو بیریانیان ئالۆزکردووە، بۆئەوەی رێگەی راست نەگرنەبەر. ئەم خراپەکارانە غافلنو لەخۆیان بآ ئاگان کە لەئاکامداو لەرۆژی پەسلاندا، رۆحو گیانیان زمانی سکاڵیان دەکرێتەوەو سەرزەنشتیان دەکەن بەو کردەوەو کارە خراپانەی کە ئەنجامیان داوەو خۆیانو خەڵکیان گومرِا کردووەو دوچاری گرفتارییان کردون.

لەراستیدا، ئەمە گوفتارو کردارو بیری خۆمانە کە دەتوانن رۆحو گیانمان لەسەر پردی چینیوت، واتە لەکاتی داوەریکردنی کردەوەکانمان، شادو خۆشحال بکات یاخود بە پێچەوانەوە غەمبارو نارەحەت بکا.

دەتوانین بێژین کە ئەم بەندە، ئاماژە بۆ ئەو خراپکارو درۆزنانە دەکا کە دوژمنی ئاینی یەکتاپەرستیو راستینو هەوڵدەدەن، بە ئامۆژگارییە خراپەکانیان، بیری خەڵک ئالێۆز بکەنو دوریان بخەنەوە لەزەردەشتو پەیامەکەی. بۆیە زەردەشت ئاگاداریان دەکاتەوەو پێیان دەبێژێ کە لەپاشاندا پەشیمان دەبنەوەو دوچاری مایەپوچی دەبن.

هات51 بەندی14

((کەرپەنەکان،

هەرگیز پەیڕەوی لە

دادو ئایینو ئاوەدانی ناکەن،

ئەوانە بە کردارو ئامۆژگارییە خراپەکانیان

زیان بەوانە دەگەیەنن کە خەریکی ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگان.

بەلآم،

هەر ئەم کردارو ئامۆژگارییە خراپانەیە کە،

لەئاکامدا،

بەرەو مۆلێگەی درۆو خراپە، رایاندەپێچێت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت باسی پێشەوا درۆزنە خراپەکارەکان دەکاتو دەبێژێ، (کەرپەنەکان) هیچ بایەخێك نادەن بە فەرمانو ئامۆژگارییەکانی ئاهورامەزدا. هەوڵو کۆششیان ئەوەیە کە بەهۆی ئامۆژگاریە خراپەکانیانو بە درۆو دەلەسەو فریو، ئەو خەڵکەی کە باوەڕیان هێناوەو خەریکی ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگان، لەڕێیی ڕاست لابدەن، وە زیانیان پێبگەیەننو خراپەو تاوانو جەردەیی لەجیهاندا بلاّوبکەنەوە.

لەکۆتاییدا، ئەم راستیە دەخاتە پێش چاو کە ئاکامی ئەو خراپەکاریانەو ئەو ئامۆژگاریە نادروستانە یەخەی خۆیان دەگرێتەوە، ویژدانو رۆحیان ئەشکەنجە دەبینن‌و بە هیچ کلۆجێك ئاسوودە نابن لەژیانیاندا، ولەپاشاندا دوچاری ئەشکەنجەی روحی دەبنو جێگەیان مولگەی درۆیەو لەتەك خراپەکاراندا دەبن.

هات51 بەندی 15

((ئەو پاداشەی کە،

زەردەشت مژدەی پێداوە بۆ ئەنجومەنی مۆغەکان،

بریتیە لەکاخی سروود (بەهەشت)،

کە هەر لەسەرەتاوە،

مەلێبەندی گەیشتنە لای ئاهورامەزدابوە.

ئەز، مژدەی ئەم پاداشەتان پێدەدەم،

کە بەهۆی بیری خاسو راستییەوە،

بەدەست دێت.))

لەم بەندەدا، زەردەشت پاداشی هاوبیرانو برایانی ئاینو ئەو کەسانەی بۆ بلاّوکردنەوەو پەرەسەندنی پەیامەکەی، یاریدەیان داوە، بە چوونە نێو کاخی سروود یاخود بەهەشتی داناوە.

بەهەشتی بە مەلێبەندی ئاهورامەزدا داناوەو دەبێژێ، دەتوانین بەهۆی بیری خاسو راستییەوە، بچینە ئەو مەلێبەندە، کەوایە، مەرجی ئاسودەییویژدانو رۆحو چونە نێو بەهەشت بریتیە لەخاس بیرکردنەوەو راستی کردنە پیشە، وبەهۆی ئەم دوو دیاردەیەوە، هەموو کەسێك دەتوانێت لەم خەلآتە ئاهورایيە سود وەربگریت.

ئەوەی شایانی باسە، ئەوەیە کە زەردەشت، بەهەشتي بە مەلّیبەندی سروودو ستایشت داناوەو ئەم بەهەشتە لەتەك ئەو بەهەشتە مادییەی کە باسی لێدەکرێت، فرە جیاوازە.

هات51 بەندی 16

((بەهۆی توانایی معنوی ئەنجومەنی موغەکان،

وئەو سروودانەی کە لەئەندێشەی پاکەوە ئیلهام کراوە،

وبەهۆی پەیرەوەییەوە لەڕاستی(ئاشا)،

کەی گوشتاسەب

بەهرە لەپاداشتی زانستی دەروونی وەرگرت،

ئەو زانستەی کە بەهۆیەوە،

مەزدا ئاهورا،

بەرەو بەختەوەری رابەرایەتیمان دەکات.))

دوا بەدوای بەندی پێشوو، کە تیایدا زەردەشت مژدەی پاداشتی ئاهورایی بەهاوبیرانی خۆی دابو، لەم بەندەدا، باسی (گوشتاسەب) دەکات کە یەکێ بووە لەرابەران‌و ئەندامانی ئەنجومەنی موغەکان‌و دەبێژێ، گوشتاسەب یەکێکە لەوانەی کە بەهرە لەو پاداشتە دەبێت کە مژدەی پێدراوە، ئەویش لەبەر دووهۆی سەرەکی، یەکەمیان، چونکو ئەندامی ئەنجومەنی برایەتی موغەکانە، دووهەمیان لەبەرئەوەی خاوەنی بیرێکی خاسەو مرۆیەکی پاکو راستبێژە.

هەروەها دەبێژێ، گوشتاسەب بەهۆی راستی‌و پاکیەوە بەهرەی لەزانیارییەك وەرگرتووە کە زانیاری ئاهوراییەو دەتوانێت ئادەمیزاد بەرەو ڕووناکراستەقینەو بەختەوەری‌و رزگاری رێنمایی بکات، زانستێك کە هاوجوتە لەتەكویژدانی رۆشەن‌و دڵکی بینا. ئەم جۆرە زانسانە دەتوانێت مرۆ بەرەو پوختەیی‌و بەختەوەری رینمایی بکات چونکو، زانستێکی معنویەو سودی کۆمەڵگا ڕەچاو دەکاو کۆششە بۆ ئاوەدانکردنی‌وولآت‌و دورە لەبیری‌وێرانگەرێتی‌و خۆخۆیی.

لەراستیدا، ئەم زانستە بریتیە لەهۆشێکی زاتی‌و دەرونی کە لەتەك هۆشی اکتسابی جیاوازە. ئەم زانستە مرۆ بەرەو رووناکی‌و سەرفرازی‌و پوختەیی رینمایی دەکات.

ئارەزووی زەردەشت ئەوەیە کە هەموو خەڵک، سودبەرن لەهۆشی اکتسابیو زانستی معنوی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگاو گەیشتنە بەختەوەریو رزگاری تەواو.

هات51بەندی 17

((فەرشوشتەر هوگو،

گیانی خۆی کە خۆشەویسترین شتە،

بۆ بلاّوکردنەوەی ئاینی یەکتاپەرستی

بە رەزامەندییەوە،

سپاردووە بە من.

هیوادارم،

مەزدا ئاهورا، ئارەزووەکانی

بۆ گەیشتنە راستی (ئاشا) بێنێتەدی.))

زەردەشت لەم بەندەدا، نزادەکاو داوا لەئاهورامەزدا دەکات کە ئارەزووەکانی فەرشوشتەر بێنێتەدی.

فەرشوشتەر، یەکێك بووە لەرابەرانی ئەنجومەنی برایەتی موغەکان.

ئەم پیاوە دانایە، ئامادەبووە گیانی خۆی بەخت بکات لەرێی بلاّوکردنەوەو پەرەپێدانی ئاینی یەکتاپەرستیو پەیامەکەی زەردەشت.

هات 51 بەندی 18

((جاماسب هوگوی دانا،

کە ئاواتەخوازی رِۆشەنبونەوە بوو،

بەهۆی راستی (ئاشا) یەوە، زانیاری ئاهورایی هەڵبژارد،

وبەهۆی ئەندێشەی پاکەوە،

گەیشتە توانایی معنوی

ئەی مەزدا ئاهورا ئەم زانیارییە

ببەخشە بە هەموو ئەو کەسانەی کە ئەویندارتن.))

لەم بەندەدا، باسی سێهەمین ئەندامی ئەنجومەنی برایەتی موغەکان دەکاو دەبێژێ:

جلماسب هوگو، بۆ گەیشتنە رووناکی حەقیقەت، زانیاری‌و بیرو هۆشی هەڵبژارد، تا بەهۆی راستی‌و پاکی‌و بیری خاسەوە بتوانێت بەهرە لەتوانایی معنوی (وەخشەترا) وەربگریت.

بێگومان، هەرکەس دەتوانێت پاش ئەوەی دیاردەکانی بیری خاس (وەهومەن)و راستی‌و دروستی (ئاشا)، لەخۆیدا پەروەردە بکا، بگاتە (وەخشەترا)، واتە هێزی معنوی، یانی دەتوانآ کۆنترۆڵی نەفسی خۆی بکات.

جاماسب، توانی بە پەروەردەکردنی ئەو دیاردانە، بگاتە پلەیەك کە ببێتە دۆست‌و هاوبیری بە ئەمەکی زەردەشت‌و یەکێك بێت لەخزمەتکارانی ئەنجومەنی برایەتی موغەکان.

لەکۆتایی ئەم بەندەدا، زەردەشت لەئاهورامەزدا دەخوازێت کە ئەم خەڵآتە بەهەموو ئەو کەسانە ببەخشێت کە باوەڕی راستەقینەیان هەیە.

هات51 بەندی 19

((میدیۆماه ئەسپەنتمان

کە بەهۆی زانیاری ئاینییەوە

تێدەکۆشآ بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی معنوی،

باوەری بە پەیامی من هێناوە،

وبەهۆی فێربونی ئاینی مەزداو کردەوەکانی خۆیەوە

لەرِێی نوێ کردنەوەی جیهاندا، تێدەکۆشێت.))

چوارەمین ئەندامی ئەنجومەنی برایەتی موغەکان، (میدیوماه)ی ئامۆزای زەردەشتە، لەم بەندەدا، زەردەشت بە خاسی باسی دەکاو دەبێژێ، میدیوماه کەسێکە کە بە ئاگادارییەکی تەواوەوە لەزانیاری ئاهورایی، هەموو ژیانی خۆی تەرخانکردووە بۆ بلآوکردنەوەو پەرەسەندنی ئاینی راستی، وکۆششێکی بێوچانی کردووە کە بەهۆی خزمەتکردنی خەڵکەوەو بەکردارو رەفتاری خاسی خۆی، پەیامی زەردەشت بە شێوەیەکی خاس بە خەڵک رِابگەیەنێت.

لەمەوبەر باسمان کرد کە (میدیوماه) یەکەمین کەسێك بووە کە باوەری بە زەردەشت هێناو بەدڵو بەگیان هەوڵیداوە بۆ پێشخستنی ئەم پەیامە پیرۆزە.

هات51 بەندی20

((ئێستا،

ئەدیاردەکانی ئاهورامەزدا (ئەمشاسپەندان)،

هەموو پێکەوە

راستی (ئاشا)و بیری خاس (وەهومەن)،

کە بەهۆی فێرکردنی پاکییەوە بەدەست دێت،

پێمان ببەخشن.

درووودتان بۆ دەنێرینو لەمەزدا،

بەختەوەری دەخوازین.))

لەم بەندەدا زەردەشت داوا دەکا لەئەمشاسپەندان کە دیاردەو نیشانەکانی ئاهورامەزدان، کە خەلآتی راستیو پاکیو بیری خاسو دڵوڤانیو باوەرِ بەخوامان پآ ببەخشن.

ئەم خەلآتانە بەهۆی ئامۆژگاریو فێربونی راستیو پاکیو بیری خاسو خۆشەویستیو باوەرِ بەخوا، لەنێو دڵماندا زێتر دەبێت.

لەکۆتاییدا دەبێژێ: ئەی خوای میهرەبان، لەکانگەی دڵمانەوە دەتپەرستینو ستایشتت دەکەینو داواکارین لێت بەهرە لەبەختەوەری هەمیشەیی بەرین.

بێگومان، ئەمە ئارەزووی هەموو کەسێکە کە بگاتە بەختەوەریو شادمانی هەمیشەیی، ئەمەش نایەتەدی مەگەر بەهۆی راستیو دروستیو پاکیو بیری خاسو باوەری راستەقینە بەخوا نەبآ.

هات 51 بەندی 21

((مرۆی پاکو خوا ناس

بەهۆی زانیاریو گوفتارو کرداروویژدانی خۆیەوە،

ڕاستی دەبوژێنێتەوەو پەرەی پێدەسێنێت.

مەزدا ئاهورا، بۆ ئەم جۆرە کەسانە،

بەهۆی ئەندێشەی خاسەوە

توانای معنوی دەبەخشێت.

منیش بۆ ئەو کەسانە داوای پاداشتی خاس دەکەم.))

لەم بەندەدا زەردەشت دەبێژێ،مرۆی خاوەن باوەڕوخوا ناس،لەبەر ئەوەی هەمیشە ئافەریدەگاری لەبەر چاودایە، هەمیشە پاکەو هەرگیز دوای خراپەو خراپەکاری ناکەوێت.ئەم جۆرە کەسانە هەمو گوفتارو کردارو بیروویژدانی خۆیان لە ڕێی ڕاستیودروستیوحەقیقەت بەکار دێنن، وئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی، ڕاستی تەشەنە بکاو بڵاو بێتەوە لەنێو کۆمەڵگادا.هەروەها بەهۆی پەروەردە کردنی بیری خاسو کۆنترۆلێ کردنی خۆیانەوە،بەهرە لە خەڵاتی یەزدانی دەبەن.

ئەم خەڵاتە بریتیە یە لە ئاسودەییویژدانو ئەندێشەو ڕووناکی دڵو هێزی ئیرادەوبەهرە بردن لە خۆشیو بەختەوەری هەمیشەییو نیاز نەبوون بە مەسایلی مادی.

لە کۆتاییدا، داوا لە ئاهورا مەزدا دەکات کە خەڵاتی خۆی بەو جۆرە کەسانە بدات.

هات 51 بەندی22

((مەزدا ئاهورا،

ئەو کەسانە دەناسێت کە لە ڕووی ڕاستیو پاکیەوە،

چ لە ڕابردوودا بێت

و چ ئێستا بێت

کاریواخاس ئەنجام دەدەن کە وەك ستایشتی ئافەریدەگاروایە.

ئەز، ڕێز لەو کەسانە دەگرم،

و ناویان دەبەم،

وبە سڵاوو درووودەوە بەرەو ڕویان دەبمەوە.))

لەم بەندەدا،زەردەشت،هەرکارێك کە بەبێوەرێکی تەواوو بە ڕاستیو پاکی یەوە ئەنجام بدرێت،بەهاوجوتویەکسانی دەزانێت لەتەك پەرستنوستایشتکردنی ئافەریدەگاردا. دەتوانین بێژین ئەم باوەڕە، ئەوە دەگەیەنێت کە ئەنجامدانی کارێکی خاس، جۆرێکە لە پەرستنو ستایشتکردنی خوا.

هەروەها دەبێژێ، ئەو کەسانەی لە ڕابردوووداو یاخود ئێستا ئەرکی سەرشانیان بە خاسی ئەنجام داوەو دەیدەنو خۆیان لە کاری خاس نادزنەوە، پێویستە بە خاسی ناویان لێبەرین، ودەبێ تێبکۆشین ئێمەش چاو لەوان بکەین بۆ هەلێسوڕاندنی ئیشو کاری خاس لە کۆمەڵگادا، ناوو نیشانێك لەم بارەوە بۆ خۆمان بەدەست بێنین.

لەم بەندەدا، ئەوەی کەفرە دەتوانین لٔی فێربین، گرنگی کارکردنە لە ڕوانگەی پەیامی زەردەشتەوە. ئەنجامدانی هەر کارێك بەدیدی ڕاستیو پاکیەوە یەکسانە لەتەك پەرستنی ئافەریدەگارو دەشێ جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە ئەو کەسانەی کاری خاس دەکەن ڕێزیان لێبگیرێت.

## 5- وەهیشتو ئیشی

## سرووودی حەڤدەهەم

هات 53 بەندی1

((خاسترین ئارەزووەکانی زەردەشت ئەسپەتمان

هاتۆتە دی،

چونکو مەزدا ئاهورا،

بۆ هەمیشە، بەهۆی ڕاستییەوە

ژیانێکی خاسی پێ بەخشیوە.

و ئەوانەی کە

بەر هەلێستیان دەکرد،

ئێستا ئیدی، بەگوفتاروکردار، ئاینی ڕاستییان گرتۆتە بەر.))

لەم بەندەدا، باسی سەرکەوتنی زەردەشت دەکات کە لە ئاکامدا توانیویەتی پەیامەکەی کە ڕێنمایی کردنی خەڵکە بەرەو ڕاستیو دروستیو یەکتاپەرستی،بەجۆرێکی خاس بگەیەنێت.پەیامبەر بە ئارەزووەکانی گەیشتووەو بەخۆشیو شادییەوە ژیان دەبێتە سەر، ژیانێکی پڕلە پاکیوخاسی.

موبد فیروز ئازەر گوشەسب دەبێژێ،لەوە دەچێت کە ئەم بەندە یەکێ لە شاگردە هەرە دڵسۆزو بەئەمەکەکانی زەردەشت (جاماسبی دانا) کە جێگری زەردەشت بووە پاش شەهید بوونی مامۆستاکەی،بەماوەیەکی کەم نوسیبێتی.

هات 53 بەندی 2

((وبەم شێوەیە

بە ئەندێشەو گوفتارو کردار،

مەزدا ستایشت بکەن،

وتێیکۆشن بۆ خۆش وەشی،

وکاری خاس هەلێبژێرن.

کەی گوشتاسەبی لایەنگرو دۆستی زەردەشت

وفەرشوشتەری ژیر

ڕێگەی ڕاستو ئاینێکیان هەڵبژاردووە،

کە ئاهورا بۆ سوشیانتی ئاشکرا کردووە.))

لە پێشەکی ئەم بەندەدا،ڕێگەی گەیشتنە ڕەزامەند بوونی ئاهورا مەزدای داناو ژیری بە بەکارهێنانی بیرو گوفتارو کرداری خاس بۆ خێرو خۆشی ئافەریدەکانی ئاهورا مەزدا، داناوەو دەبێژێ،پێویستە هەموو کەسێك تێبکۆشێت تا لەم سێوزەیە،واتە،مێشك،زمان،دەست سوود وەربگرێت بۆ پێشخستنو ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگا.

کەسێك کەبیری خۆی لە ڕێی دروستکردنو ئاوەدانیو ڕزگارکردنی خەڵک لە نەزانینو بێ دەرەتانیو کلێۆڵیو خراپەو تاوان بەکاربێنێت، و بەدەستو زمانی خۆی یاریدەی خەڵک بدات بۆ گەیشتنە پوختەییو پاکی،ئەو کەسە.ڕەزامەندی خوای بەدیهێناوە.

لە کۆتایی ئەم بەندەدا،باسی لایەنگرانو یاوەرانی ئاینی ڕاستیواتە،گوشتا سەبو فرشوشتەر دەکاتو دەبێژێ، دۆستانو هاوبیرانی زەردەشت، ڕێگەیەکیان هەڵبژاردووە کە ئاهورا مەزدا ئیلهامی کردبوو بە سوشیانت (لێرەدا مەبەست لە سوشیانت خودی زەردەشتە).

هات 53 بەندی 3

((ئەی پورو چیستای ئەسپەنتمان هیچدسپ

ئەی جوانکە ترین کیژۆڵەکانی زەردەشت،

مەزدا ئاهورا،

مرۆیەکی بۆ هاوسەرێتی تۆ هەڵبژاردووە کە،

پابەندی بیری خاس،

و پاکیو ڕاستییە.

کەواتە، لەتەك بیری خۆتدا ڕاوێژ بکە،

و به پاکی‌و به زانیارییه‌کی خاسه‌وه ڕه‌فتار بکه.))

 به‌گوێره‌ی داستانه کۆنه‌کانی زه‌رده‌شتیه‌کان، جاماسبی دانا (که له پاشاندا ده‌بێته جێنشینی زه‌رده‌شت) خوازبێنی له پوروچیستای کچی زه‌رده‌شت ده‌کات.

له‌م به‌نده‌دا زه‌رده‌شت له‌ته‌ك ئه‌وه‌ی که جاماسب به پیاوێکی خواپه‌رست‌و ڕاستبێژو بیرخاس‌و پاك ده‌زانێت، به‌ڵام به کیژه‌که‌ی ده‌بێژێ، هه‌رچه‌نده من وه‌ك باوکێك ده‌خوازم که ببیته هاوسه‌ری جاماسب، به‌ڵام ڕه‌زامه‌ندی تۆ مه‌رجه، و ده‌بێ،به بیرێکی خاسه‌وه،قوڵێ تێبفکری،ڕاوێژ له‌ته‌ك هۆشدا بکه.و چاکه‌وخراپه کانی هه‌ڵیسه‌نگێنه، ئه‌وسا بڕیاری خۆت بده.

ئایا ئه‌م خوازبێنی که‌ره په‌سه‌ند ده‌که‌یت یان نا،چونکو ئه‌مه ژیانی تۆیه‌و تۆ له‌ته‌کیا ده‌ژیت

هات 53 به‌ندی 4

((بێگومان،

ئه‌ز، که‌سێك که بۆ هاوکاران‌و بنه‌ماڵه،

به باوك‌و سه‌روه‌ر دانراوه،

هه‌ڵێده‌بژێرم‌و خۆشمده‌وێت.

هیوادارم که،

ڕۆشنایی بیری خاسم پێ بگات،

و له‌نێو پاکاندا، ژنێکی پاکیزه بم.

ومه‌زدا ئاهورا،

بۆ هه‌میشه ئاینی ڕاستیم پێ خه‌ڵات بکات.))

له به‌ندی پێشوودا، باسی ئه‌وه کرا که خوازبێنی بۆ کچی زه‌رده‌شت هاتبوو،زه‌رده‌شت داوا له کچه‌که‌ی ده‌کات که له‌و باره‌وه خاس بیر بکاته‌وه‌و بڕیاری خۆی بدات ئه‌م به‌نده، وه‌ڵامی پورو چیستا ده‌خاته پێش چاو که تیایدا ده‌بێژێ، پاش بیرکردنه‌وه بڕیاری داوه ئه‌و که‌سه (جاماسب) به هاوسه‌ر هه‌ڵێده‌بژێرێت‌و خۆشی ده‌وێت.له پاشاندا، هیواو ئاره‌زووی خۆی ده‌رده‌بڕێت.

كه هاوسەرێكی پاك بێتو شیاوی هاوسەرێتی بێت بۆی،هەروەها ئارەزووی ئەوەیە كه لەلایەن ئاهورا مەزداوە هەمیشه ڕێنمایی بكرێتو خەڵاتی ڕاستی پێببەخشێت.

هات 53 بەندی 5

((ئەم گوفتاره ئاراستەی ئێوە دەكەم

ئەی تازه بوكو زاوایان،

به بیرێكی خاس، گوێ بۆ ئامۆژگاریەكانم ڕابگرن.

و له ڕێگەیویژدانی خۆتان هەڵیسەنگێننو بەكاری بێنن:

هەمیشه به بیری خاسو خۆشەویستی یەوە بژین،

و هەر یەكەتان له ڕاستیدا

پێشبرِكێ له یەكتر بكەن

تا ژیانێكو خێزانێكی خاس پێكەوە بنێن.))

له ڕاستیدا، ئەم بەنده بریتی یه له ئامۆژگاری بۆ تازه بوكو زاواكانو جەختی لەسەر كراوه كه بەووردی گوێی بۆ بگرنو له ژیانیاندا،پەندەكانی بەكاربێنن،پێش هەموو شتێك دەبێ هەمیشه ئەندێشەیان پاك بێتو یەكتریان خۆشبوێت،ئەمجا پێویسته پێشبرِكێی لەیەكتری بكەن بۆ گەیشتنه ڕاستیو پاكیو هەرگیز توخنی درۆوخراپەو ڕێی خراپ نەكەون.

ئاكامی ئەم جۆره ڕەوشه، ژیانێكی پڕ له خۆشیو شادیو بەختەوەرییه.

هات 53 بەندی 6

((ئەی پیاوانو ئەی ژنان،

به دروستی ئەم ڕاستیانه بزانن كه،

لەم جیهانەدا، درۆ تەفره دەره

ڵی دوور بکەونەوەو پەرەی پێمەسێنن.

و ئەمەش بزانن کە

ئەو خۆشی یەی کە بەهۆی خراپیو چەواشە کردنی ڕاستی بەدەست دێت.

مایە پوچی بەدواوەیە.

و ئەو درۆزنو خراپەکارانەی کە ڕاستی لەخەڵک چەواشە دەکەن.

ژیانی معنویو ئاسایشی خۆیان لەناو دەبەن.))

ئەم ئامۆژگارییانەی لەم بەندەدا دەبێژرێ، تەواوکەرەوەی ئامۆژگاریەکانی بەندی پێشووە.

زەردەشت دەبێژێ،ئەی ژنانو پیاوان،هەوڵبدەن گوێ ڕایەڵی ئەم ڕاستیانە بن کە بۆتان دەبێژم.درۆو فریودانی خەڵکو ژیانی مادەپەرستی، بریقەدارەو ڕاڕاییو دوودڵی دەخاتە بیری خەڵکو بەرەو لای خۆیان ڕادەکێشێ،کەوایە، تێبکۆشن خۆتان لەم بیرانە دووربخەنەوە.هەرگیز لە درۆو درۆکردنو خراپەکاری نزيك نەبنەوە.کارێك مەکەن کە بەردی بناغەی کۆشكوتەلاری بەختەوەریتان بریتی بێت لە بەدبەختیو چارە ڕەشکردنی خەڵکی دیکە،چونکو لەئاکامدا ئاهوو ناڵەی هەتیوانو فرمێسکی بێوەژنان یەخەتان دەگرێو جگە لە مایە پووچی هیچی دیکەتان بۆ نامێنێتەوە.

لە کۆتاییدا دەبێژێ،درۆزنو خراپەکاران،کە خەریکی چەواشە کردنی ڕێگەی ڕاستین لە خەڵکو ژنانو پیاوانی ڕاستکردارو ڕاستبێژو پاکان لە ڕێی ڕاست لادەدەن، لە ئاکامدا ژیانی معنویو ئاسودەیی بیروویژدانی خۆیان لەناودەبەنو هەرگیز بەختەوەری ڕاستەقینە بە چاوی خۆیان نابینن.

کەوایە،پێویستە لەسەرمان خۆمان لە مادیات دووربخەینەوەو زێتر بیر لە معنویات بکەینەوە.ئەگەر پەیوەندییەکمان لەتەك درۆو تەفرەو خراپەکاریدا هەیە،زۆر بە گورجی ئەو پەیوەندییە بپچڕێنین،بەختەوەری خۆمان لەسەر حسابی ستەمکردن بە خەڵکو ئازاردانیان بەدی نەهێنین.

هات 53 بەندی 7

((وە پاداشتی ئەنجوومەنی موغەکان

تا ئەو ڕۆژە بۆ ئێوە دەبێت کە

لە ژیانی ژنو مێردایەتی خۆتان،

چ لەکاتی خۆشیو چ لەکاتی تەنگانەدا،

پێکەوە بنو لەتەك یەکدا میهرەبان بن.

بەڵام ئەگەر بیری خراپ بەسەر تانا زالێ بێت،

و لە ڕەوشی ئەنجومەنی موغەکان لابدەن،

دووچاری نوشوستیو پەشیمانی دەبن .))

بەر لەمە،باسی ئەنجومەنی برایەتی موغەکانمان کردو گوتمان کە ئەمانە بریتی بوون لە گروپێك لە بیر خاسان،ئامۆژگاریەکانی زەردەشتیان موبەمو ئەنجام دەداو گوێ ڕایەڵی گوفتارەکانی بون.

لەم بەندەدا،ئامۆژگاریەکانی بەندەکانی 5،6 تەواو دەکاودەبێژێ،تا ئەوکاتەی هەردوو هاوسەر،واتە بوکو زاوا یەکتریان خۆشبوێت، و بۆ یەکتر بەئەمەك بنو بەگوێرەی دەستورەکانی ئەنجومەنی برایەتی موغەکان ڕەفتار بکەن، لەم جیهانەو پەسڵانیشدا بەهرە لە خاسترین پاداشتەکان وەردەگرن، پاداشتی ئەم جیهانە، بریتی یە: لە ژیانێکی بەختەوەرو پڕ لەخۆشیو شادیو خۆشەویستیو پاداشتی پەسلانیش بریتی یە: لە ئاسوودەییویژدانوبیر، یاخود بەهەشتیواده پێدراو.

بەڵام ئەگەر. لەدەستورو ئامۆژگارییەکانی ئەم ڕێبازە لابدەینو گیرۆدەی هەواو هەوەسی مادی بینو تەفرەی خراپەکارانو درۆزنان بخۆینو تووشی گومڕایی بین, ئەوسا دووچاری نوشوستی دەبینو ئاکاممان ڕەنجو ئەشکەنجەو پەشیمانی دەبێت

هات 53 بەندی 8

((لە ئاکامداو بە ئاشکرا،

بەد کاران

فریو دەخۆن، ودەبنە گالێتە جاڕو سەرزەنشت دەکرێن.

بەڵام، لەژێر سایەی شالیاریو ڕِابەرایەتی خاسەوە،

ژنانو پیاوان

لەنێو مالێو شارەکاندا دەگەنە ئاشتیو ئاسایش

و خراپیو فریوەکان، تەفرو تونا دەبن.

وە مەزدا ئاهورا، کەلە مەزنان مەزنترە،

ڕِوو دەکاتە ئێمە.))

لەم بەندەدا،زەردەشت هەمیسان وەك بەندی پێشو ئامۆژگاریمان دەکات،و دەربارەی بەدکارانو درۆزنەکان دەدوێتو دەبێژێ،بەدکارەکان جگە لەوەی کە چارەنوسیان مایە پوچیەو تووشی ڕەنجو ئەشکەنجەیویژدانی دەبن،ئەمانە بەهۆی کرداری نالەباری خۆیان دەبنە گالێتە جاڕی خەڵکو لە هەموو کاتوشوێنێکدا سەرزەنشت دەکرێن، تاوای لێدێت خۆشیان لۆمەی خۆیان دەکەن کە بۆچی ئەم ڕێگە هەڵەو چەواشە یەیان هەلێبژاردووە،خەڵکیان تەفرەداوەو درۆیان لەتەك خۆیانو خەڵکدا کردووە.

زەردەشت دەبێژێ، لە ئاکامدا،بەهۆی ڕابەرایەتی شالیاری خاسو دادوەرو دڵسۆزو بیرخاس،کۆمەڵگا بە ژنوپیاویەوە،لەنێو مالێوخێزاندا.لەگوندو شاردا،بە ئاسوودەییەوە ژیانێکی پڕ لەئاشتیو خۆشی دەبەنەسەر.

هەروەها ئارەزوو دەکا کە درۆو فریوو خراپە کە ئادەمیزاد بەرەو خراپەکاریو تاوان دەبێت. لەهەموو جیهاندا تەفرو تونا بێت تا هەموو خەڵک بەهرە لەخۆشیو خەلاتی ئاهورایی بەرنو ژیانێکی پڕ لەئاشتیو ئاسایشودوور لە شەڕوخوێنڕێژی بەرنەسەر.لەکۆتاییدا هیواو ئارەزووی ئەوەیە کە ئاهورامەزدا ڕِوومان تێبکاتو بێتە لامان.

مەبەستی ئەوەیە کە هەموو لەگشت بوارەکانی ژیاندا ئاهورامەزدا ڕەچاوبکەینو داوای یارمەتیو کۆمەکی لێبکەین،هەروەها دەبێ بەجۆرێك خۆمان لە هەموو خراپییەکان پاك بکەینەوە کە بتوانین لە دەروونی خۆماندا،لەتەك ئاهورامەزدا بگەینە یەك.کاتێك ئافەریدەگار لە ئافەریدەی خۆی نزیك دەبێتەوە کە ئەو کەسە هەموو قۆناغەکانی پوختەییومرۆڤایەتی پێوابێت، بیری پاكو کرداری دروستوگوفتاری ژیرانەبێتوکۆنترۆڵی خۆی بکاتوڕاستیو دروستی بکاتە دروشمی ژیانی،دڵی پڕ لە خۆشەویستی خەڵک بێتوبەگیانومالێ خزمەتیان بکات.

هات 53 بەندی 9

((بیر خراپە بەدکارەکان،

کە بەندەی هەواو هەوەسنو لە ڕاستی بە دوورن،

بێزارن لەپاکانو بە چاوی سووکەوە دەڕواننە هێژاکان

هەرچەندە لەتەك دەرونی خۆشیاندا لەململانێدان،

کێ یە ئەو سەروەرە پاکەی کە،

بە دڵو بەگیانو بەئازادیو بەوشێوەیەی خۆی دەخوازێت،

بەرهەڵێستی ئەم بەدکارانە بکات؟

ئەی مەزدا،

بەهۆی شالیاریو هێزو توانای معنوی تۆیە کە،

پیاو چاکان،ئەوانەی بە دروستی دەژین،

پشتیوانو یاوەری خەڵک بن،

و لەباشترین خەڵاتەکان، بەهرە وەربگرن.))

سەرەتا،لەم بەندەدا باسی بەدکارانو بیرخراپان دەکاودەبێژێ،ئەمانە هەمیشە ڕقو قینەیان هەیە بەرامبەر مرۆی خاس.بەچاوی سوکەوە دەڕواننە هەموو عەگیدو پیاو چاکانو دوژمنایەتی لەتەك ڕاستیو دروستکرداران دەکەن.

هەرچەندە لەنێو دڵو دەروونی خۆشیاندا لەململانێدان، بەڵام چونکو گیرۆدەی هەواو هەوەسن،ئەم جۆرە کەسانە چ ژن بن یا پیاو،گوێ بۆ بانگەوازیویژدانی خۆیان ڕاناگرن.

پاشان دەفەرموێت کێیە یاخود لەکوێیە ئەو سەروەرو داوەرە کە بتوانێت بە هەموو ئازادییەکەوەو بەدڵو بەگیان بەرهەڵێستی ئەم بەدکارانە بکاتو بەرامبەریان ڕابوەستێتو ململانێ یان لەتەکدا بکات.

لە کۆتاییدا دەفەرموێت: تەنیا هێزی معنوی ئاهورایی یە(وەخشەترا)کە دەتوانێت یارمەتی پیاوچاکانوڕێڕەوانی ڕێگەی ڕاستو حەقیقەت بداتوخاسترین خەڵاتەکانیان پێببەخشێت.

هات 54 بەندی 1

((هیوادارم کە،

دۆستایەتیو برایەتی کە ئاواتی هەمومانە،

ڕوومان تێبکات،

ودڵی پیاوانوژنانی زەردەشتی،

شادو خۆشحالێ بکات.

تاهەرکەس،

بەهۆی بیری خاسوویژدانی خۆی،

لەخەلآتی شیاو، بەهرە وەربگرێت

ئەو خەڵاتەی کە مەزدا ئاهورا

بەهۆی ڕاستییەوە

بۆ هەموو ئاواتە خوازێکی داناوە.))

ئەم (هات)ە تەنیا بریتییە لەیەك بەندو تیایدا زەردەشت ئاواتەخوازە کە هەستی برایەتیو دۆستایەتی لە دڵو دەروونو بیری هەموو خواپەرستێك کە بەگوێرەی پەیامی زەردەشت ڕەفتار دەکات،جێگیر بێتودڵی هەموان پڕ لەخۆشەویستنوشادمانی بکاتوڕەزامەندی وەهومەن بەدیبهێنێت.

مەبەست لەشادیو ڕەزامەندی وەهومەن، ئەوەیە کە بیرێکی پاکو ئاسایشو ئارامیویژدان لە هەموماندا بەدی بێت، بەواتەیەکی دیکە، زەردەشت بۆ هەموو پیاوو ژن، ئارەزووی خۆشەویستیو دۆستیو برایەتیو بیری پاك دەکات بۆئەوەی بتوانن بە ئاسودەیی خزمەتی خەڵک بکەنو کۆمەڵگا بەرەو پێشەوە بەرن.

هەروەها دەبێژێ، هەرکەسێ گوێڕایەڵی بانگهێشتیویژدانی خۆی بێت کە زایەڵەیویستو فەرمانی ئاهورامەزدایە، وبتوانێت بەخاسی ئەنجامی بدات، ئەوسا ئاهورامەزدا پاداشتێکی

بەنرخی دەدات،ئەو پاداشتەش بریتییە لە خەڵاتێك كە تەنیا بەهۆی ڕاستیو پاكییەوە بەدەست دێتودەبێ بەگوێرەیویژدان ڕەفتار بكرێت تا بەو پاداشتە بگەین.ئەو خەڵاتە بریتییە لەبیروویژدانێكی ئاسوودە كە گەورەترین پاداشتە بۆ مرۆیەكی بەختەوەر.

بەكورتی،ئوسوڵی ئاكاریوفەلسەفی،لە ڕوانگەی زەردەشتەوە لەو17 هاتو (239) بەندەی گاتاكاندا،كەبە ڕاژەوە باسمان لێكردن بەدی دەكرێن.بژاردەیەك لەو ئامۆژگارییە ئاكاریو فەلسەفیە بەنرخانەی كە زەردەشت لە گاتاكاندا بێژاویەتی، ولەهەموو كاتو شوێنێكدا دەتوانرێت بەكاربهێنرێت، وپەیڕەویكردنیان لە لایەن ئادەمیزادەوە،دەبێتە مایەی بەختەوەریو ڕزگاری بریتین لە:

- یەكتا پەرستیو باوەڕ بەهێزو توانایی ئاهورامەزدای ئافەریدەگارو دانا

- باوەڕ بە دووهێزی هاوالێ دوانەی دژ بەیەك،واتە چاكەو خراپە (سپەنتا مینوو ئەنگرەمینو).

- ململانێی هەمیشەیی دژی هێزی ئەهریمەنیو باوەڕ بەوەی كە لەئاكامدا چاكە بەسەر خراپەو ڕاستی بەسەر درۆو ڕووناكی بەسەر تاریكیدا سەردەكەوێت.

- هەركەس ئازادە بۆ هەڵبژاردنی چاكە یا خراپەو شێوەی ژیانو جۆری ئاینی خۆ

- بەهۆی ئەم ئازادی هەڵبژاردنە، هەركەس بەر پرسیارە بەرامبەر ئەو كارانەی ئەنجامی دەدات،چ خاس بێوچ خراپ.

- باوەڕ بە بەهەشتودۆزەخو پاداشتو سزای خاسانوخراپان.

- كارو كۆششوتێكۆشان لە پێناوی پێشخستنو ئاوەدانكردنەوەی كۆمەڵگا.

- بڕینی هەرشەش قۆناغوپلەكانی ئەمشاسپەندەكان،وپەروەردەكردنی دیاردە معنوی یەكان،بۆ گەیشتنە پلەی پوختەییوبەختەوەریونەمرێتی.

- باوەڕ بەنەمرێتی ڕۆح (گیان).

- هەوڵوكۆشش بە هەستكردن بە دیداری ئاهورامەزداوگەیشتنە لای لە جیهانی دەروونیدا

## 2- (یەشت)ەكان Yasht

یەشت،لەوشەی ئاوێستایی یەشتی وەرگیراوە.بە زمانی پەهلەوی بووەتە یەشت. ئەم وشەیە لە ڕیشەی یەز yaz ەوەیە كە بنچینەكەی لەتەكوشەی یەسنا،یەكێكە.واتە(یەشت)

و(یەسنا)،هەردووکیان لە بنچینەی(یەز)ەوەن کەماناکەی دەبێتە پەرستنو ستایشو نیایش (نوێژ).

یەسنابەشێوەیەکی گشتی لە کاتی پەرستنودوعاونزادا دەخوێنرێتەوە،بەڵام یەشتەکان،تایبەتن بۆ ستایشونیایشونیاز لە ئاهورامەزداو دیاردە سروشتییەکان، واتە ئەمشاسپەندان،ئیزە دەکاتورۆژ،مانگ،ئاگر،ئاوو....ستایشی سیفاتی هەریەك لەمانە کراوەو هەمویان بەدروستکراوی ئاهورامەزدا دانراون.

لەسەرەتادا، یەشتەکان بەشێوەی شیعربوون،بەڵام بەدرێژایی ڕۆژگار بڕێ شتی خراوەتە سەرولەحاڵەتی شیعر چۆتەدەر.توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکان دەربارەی یەشتەکان،وا پیشان دەدەن کە ئەم یەشتانە لەنووسینو گوتنی خودی زەردەشت نین، بەڵکو ئەم سرودانە پاش زەردەشت، لەلایەن قوتابیوهاوڕێ کانیو بڕێ لە مۆغەکانو لەژێر کارتێکردنی هەندێ لە دابونەریتی ئایینە کۆنەکانی ئارییاییەکانی پێش زەردەشت لەکوردستانداواتە لەسەردەمی مادەکان نوسراونەتەوە.هەریەکە لەو خوا جۆراوجۆرانە،بەشێوەیەك تێکەڵێ بەم ئایینە یەکتاپەرستییە بون.

ژمارەی یەشتەکان، سی یەشت بووە، کە بە ئەندازەی سی ڕۆژی هەرمانگێك بووە.لەڕۆژ ژمێری ئێرانی دێریندا،هەر مانگێك بریتی بووە لە سی ڕۆژوهەر ڕۆژێك بە نێوی یەکێ کە ئەمشاسپەندەکانو ئیزەدەکان ناونرابون.

ئێستا ژمارەی یەشتەکان تەنیا 21 یەشتەو هەریەکەیان بەنێوی یەکێ لە ئەمشاسپەندو ئیزەدەکانە.

یەشتەکان،جگە لەوەی ستایشونیایشی ئاهورامەزداوفریشتەکانوئیزەدەکان دەکەن، باسی بڕێ لە داستانوئەفسانە کۆنەکانی باووباپیرانمانی تێدایە. بەشە جۆراو جۆرەکانی یەشتەکان پێی دەبێژرێ (کردە) کەبەمانای (بەش) یا(فصل) دێت. هەرکردەیەك پێکهاتووە لە چەندین (بەند).

شایانی باسە بێژین کە بەگوێرەی گوتنی کتێبی(دینکرد)،ئەم یەشتانە لە پێشاندا بەشێك بون لە چواردەهەمین نەسك لە 21 نەسکەکانی ئاوێستاو پێی بێژراوە(بغان یشت)واتە ستایشی بوغەکان(خواکان)ئەم(21)یەشتە کە ماوەتەوەولەبەر دەستایە، لە ڕووی دێرینێتیو تازەیی یەوە،لەیەکتر جیاوازن.چوار یەشتی یەکەمین،لەوانی دیکە تازەترنوناگەنە پای یەشتەکانی دیکە،بەتایبەتی یەشتی3،2 وە 4 کە بریتین لە(هەفتن یەشت)ی بچوك، ئوردیبەهەشتوخرداد یەشتوناوەڕۆکەکانیشیان زۆر گرنگ نین، دوا دوو یەشتیش (هوم یشتو وەنندیەشت) فرەکورتنوبایەخێکی ئەوتۆیان نییە.

یەشتەکانی دیکەش هەریەکەی بایەخی بەبێسێکی تایبەتی داوە،بۆنموونە لە(ئابان یەشت)و(تشتر یەشت)دا زێتر ڕووداوە سروشتییەکان باسدەکا،ولە(مهریشت)و (فرودین یەشت) دا لە ڕووی خووڕەوشتو لە(زامیاد یەشت) پتر باسی گەورەییو مەزنایەتی خونکارەکانی ئێران زەمین دەکاتو مل ملانێ کردنیان لەتەك تۆرانییەکاندا.

هاشم رچی نووسەری کتێبی (اوستا، سروودهای زرتشت) لەلا-229 دەبێژێ:

(یەشتەکان دابەشدەکرێن بە دووبەشەوە:-

- بەشی یەکەم،ئەو یەشتانەن کە دێرینە ترو ڕەسەنترن.

- بەشی دووهەمیان،ئەو یەشتانەن کەلەسەردەمو دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتدا نووسراونەتەوە.

مەبەست لەم بۆچوونە ئەوەیە یەشتە دێرینەکان بریتین لەو سرودانەی کەلەسەردەمی سەرەتای زەردەشتیو ئاینی ئارییەکانە،ئەو سەردەمەی کە ئارییەکان خەریکی پەرستنوستایشی دیاردەکانی سروشتبون،وبۆ هەریەکە لەو دیاردە سروشتییانە سەرپەرشتێکیان داتاشیبوو دەیانپەرستوسرودیان بۆدەگوتن.ئەودیاردە سروشتی یانەی کە لەو سەردەمەدا دەپەرستران بریتی بون لە: میهر، ئاناهیتا، بەهرام، ئازەر،وات، مانگ، خۆر، زەوی، گیا،فرە وەشی، گئوشی، ئەرت، هوم، تشیتەر، ئاسمان، ئەنیران، وبڕێ ئیزەدی دیکە. هەریەکە لەم ئیزەدانە، یەشت یاسروودوستایشی تایبەتییان هەبووە کە باوەڕپێکراوەکانیان لەکاتی تایبەتداو بەدابو نەریتی تایبەتی، سرودیان بۆ دەخوێندنو داوای یارمەتی یان لێدەکردنو بۆئەم کارە دیاریوخەڵاتیان پێشکەش دەکردن.

زەردەشت،ئەم پەیامبەرە ژیرە،پەرستنی گشت ئەو خوا جۆراوجۆرانەی بەنارەوا زانیوەوپەرستنی تەنیا بە شیاوی ئاهورامەزدای خوای داناوژێرداناوە.

هەروەکو لەمەوبەرگوتمان،زەردەشت تەنانەت بۆ یەکجاریش.باسی ئەو خوایانەی لەسروودەکانی خۆیدا نەکردووە،ئەو خوایانەی کەلە یەشتە دێرینەکاندا ناویان لێبراوە.بەڵام لەسەردەمی پاش زەردەشتدا دوبارەبەهۆی ئەو(کارتێکردنەی) کە باوەڕە کۆنەکان لەنێو خەڵکدا هەیانبوو فەرامۆشیان نەکردبوو،هەروەها ڕاڕایی پیاوە ئاینیە زەردەشتیەکان بووە هۆی ئەوەی ئەو خوا جۆراو جۆرانەی کۆن،بەشێوەی (ئیزەد) بێنەوە نێو ئاینی زەردەشتیو بەشێوەیەك ستایشیان لێبکرێت.بۆ ئەنجامدانی ئەم کاە، سەرەتا دەستیان دایە زێدەکردنی چەند ڕستەیەك یاچەند بەندێك لەسەرەتا یا لەکۆتایی یەشتەکان.بۆ نموومە ئەم ڕستەیەیان خستە سەر سەرەتای (ئابان یەشت)،.

(ئاهورامەزدا وەحی کرد بۆ ئەسپەنتمان زەردەشتو گوتی ئەی زەردەشت بە دەستورو بڕیاری من ستایش بکە ئەم ئەردویور ئاناهیتایەکە.....)بەم شێوەیە بەرەبەرە ئەم جۆرە ڕستەو بەندانە پتروپتر هاتنە نێو یەشتەکانوجێگەی خۆیان کردەوە،ویەشتی نوێ یان پێکهێنا.کەوایە دەتوانین بێژین کە ئەو بۆچونو بیروباوەڕو باسانەی کەلەنێوان یەشتەکاندایە،بەتایبەتی یەشتە تازەکان هیچ فرێکیان بەسەر باوەڕوئامۆژگارییەکانی زەردەشتەوە نییە،بەڵکو پەیوەندی یان بەشێوەی بیرکردنەوەی ئاینی،مێژوویی‌و کێشەکانی ئەو خەڵکە هەیە کە لە پێش زەردەشتدا لەوناوچەیەدا ژیاون.

## بیستو یەك یەشتی ئاوێستا بریتین لە:

**1- ئاهورا مەزد یەشت** (هورموزد یەشت):

یەکەمین یەشتەو بەناوی ئاهورامەزداوە ناونراوە.ناوی یەکەمین ڕۆژی هەموو مانگێکیش هەربەم ناوەوە ناودەبرێت.ئەم یەشتە پێکهاتووە لە33 بەندودەربارەی ئاهورامەزدا دەدوێت،هەفتا ناوو سیفەتی بۆ دانراوە وەك: دانا، داناترین، توانا، تواناترین، بەخشەندە، دروستکەری هەردوو جیهان، پیرۆزترین، میهرەبان، هۆی هەموو هۆیەك، پرشنگدار، و... هتد.

**2- ئەمشاسپەندیەشت** (هەفتەن یەشت):

دووهەمین یەشتە.تایبەتە بە حەوت ئەمشاسپەندەکان

لە ئاوێستای ئێستادا دووهەفتەن یەشت هەیە،یەکێکیان پێی دەبێژرێت هەفتەن یەشتی مەزن کە لە(یەسنا) کان دەژمێرێت،ئەوی دیکەیان پێی دەبێژرێت هەفتن یەشتی چکۆلە کەلە یەشتەکان دەژمێرێت.

ئەم یەشتە پێکهاتووە لە 15بەند،ودەربارەی ستایشی ئاهورامەزدا، ئەمشاسپەندو ئیزەدەکان دەدوێت،هەروەها باسی پاداشوسزای کارەکان لەم جیهانەوجیهانی پاش مردن دەکات.لەم یەشتەدا زۆر بەڕاشکاوی گیانی یەکتا پەرستی لەئاینی زەردەشتیدا دەخاتەڕوو.

**3- ئاشا وەهیشتا یەشت** (ئوردی بەهەشت یەشت):

سێهەمین یەشتە، تایبەتە بە فریشتە ئاشاوە هیشتا. پێکهاتووە لە 19 بەند.

**4- هائورتات یەشت** (خورداد یەشت):

چوارهەمین یەشتە،تایبەتە بە فریشتە هائورتات، پێکهاتووە لە 11 بەند.

تێبینی:ئەم چواریەشتەی کە ناویان لێبرا،لە یەشتە تازەکان دەژمێرێن.

5- ئەردوسیور ئەناهید یەشت (ئابان یەشت):

پێنجەمین یەشتە،یەکێکە لە گرنگترین‌وکۆنترین یەشتەکان‌ودەربارەی ئەریدوسیور ئەناهیتا Aredrisara Anahita.دەدوێت

کە یەکێکە لە ئیزەدەمەزنەکان‌وئیزەدی تایبەتی(ئاوە). پێکهاتووە لە30 بەش‌و (133 بەند).

6-هور خشیئت یەشت (خورشیدیەشت):

شەشەمین یەشتە،پێکهاتووە لە 7 بەند. لەیەشتە تازەکان دەژمێرێت‌ودەربارەی ستایشی خۆردەدوێت.

7- ماونگە یەشت (ماە یەشت):

حەوتەمین یەشتە،پێکهاتووە لە 7 بەند. لەیەشتە کورت‌ونوێ کان دەژمێرێ.

8-تیشتریە یەشت (تیر یەشت):

هەشتەمین یەشتە،تایبەتە بەیەکێ لە ئیزەدە گەورەکان(ئیزەدی باران).

پێکهاتووە لە 62 بەند.لە یەشتە کۆنەکانە.

9- درواسپە یەشت (گۆش یەشت):

نۆهەمین یەشتە،تایبەتە بە ئیزەدی پارێزگەری ئاژەڵە سوودمەندەکان بریتی یە لە 22 بەند، ئەم یەشتە تازەنییەوتائەندازەیەك لە یەشتە دێرینەکان دەژمێرێ.

10-میترا یەشت (مهریەشت):

دەهەمین یەشتە،یەکێکە لە دێرینترین‌و دوورودرێژترین یەشتەکان.

تایبەتە بۆ ئیزەدی میترا Mithra کە لە پێش سەردەمی زەردەشتدا یەکێ بووە لەخوا گەورەکانی نەتەوە هیندوئەوروپیەکان‌ومیللەتانی دیکەی ئاریایی،لە پاشاندا لە ئاینی زەردەشتدا لە ڕیزی ئیزەدەکاندا دانراوە.

میترائیسم،یەکێ لە دێرینترین ئاینەکانە کەلە ئیران زەمین دا بەکوردستانەوەوهەروەها لەزۆر شوێنی دیکەی جیهاندا بڵاوبوبۆوە،جێ پەنجەی ئەم ئاینە، لەفرە لەپرۆسەکانی ئاییني دواییدا

بەتایبەتی لەبواری فەلسەفەو عیرفانوتصوفـو هونەرویژە،دیارە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ. ئەم یەشتە پێکهاتووە لە 146 بەند.

11- سرەئوش یەشت (سروش یەشت):

یانزەهەمین یەشتە.سروش ئیزەدی چاودێری ئاینی خواپەرستییە.

لە ئاوێستادا دووسروش یەشت هەیە،یەکێکیان پێی دەبێژرێ(سروش یەشتی سەرەتای شەو)کە لەڕیزی یەسناکانە(هات 57).دووهەمیان سروش یەشتە،کەلە ڕیزی یەشتەکانەو پێی دەبێژرێت سروش یەشتی هادوخت.پێکهاتووە لە (23) بەند.

12- ڕەشنو یەشت(ڕەشن یەشت):

دوانزەهەمین یەشتە.ڕەشنو ئیزەدی دادو دادگەرییەونەیاری درۆو بێدادیوستەمە. پێکهاتووە لە (28)بەند.

بەگوێرەی نوسینەکانی پەهلەوی،ئەم ئیزەدە لەتەك ئیزەدەکانی میهروسروشی پێکەوە لە ڕۆژی پەسلاندا داوەری ڕۆحەکان دەکەن.

13- فرەوەشی یەشت (فەروەردین یەشت):

سیانزەهەمین یەشتە یەکێ لە دێرینەترینودوورودرێژترین یەشتەکانە.

ئەم یەشتەش،هەروەك مهریەشتوئابان یەشت،برێ زانیاریمان دەربارەی بیروباوەڕی ئارياييەکان پێدەدات.هەروەها نێوی گەورە پیاوانو پیاوچاکانی مێژووی ئەو سەردەمەمان پێڕادەگەیەنێت،تیایدا ستایشی ڕۆحی هەموو چاکان لەژنوپیاوومنداڵێو ئەمشاسپەندو ئیزەدەکان دەکات.

14-ویریپرە غنە (بەهرام یەشت):

چواردەهەمین یەشتە.ئەم ئیزەدە(بەهرام) ئیزەدی سەرکەوتنو پالێپشتی جەنگاوەرانو دڵرانە.پێکهاتوە لە(64) بەند.

15- وەیو یەشت (رام یەشت):

پانزەهەمین یەشتە، لەئاوێستادا پێی دەبێژرێ (ڕامە –ڕامەن) کە ماناکەی دەبێتە ئاشتیو ئاسایش.

16- چیستا یەشت (دین یەشت):

شانزەهەمین یەشتە.لەئاوێستادا پێی دەبێژرێ دەئینا Daenaوبەمانای بیرکردنەوەو ناسینوبیری معنوی یە.

هەرچەندە ئەم یەشتە بەناوی دین یەشتە،بەڵام دەربارەی چیستا Tehista کە ئیزەدی زانیاری یە دەدوێتو پێکهاتووە لە (20) بەند.

17- ئەشی وەنگوهی (ئەرت – ئەرد یەشت):

حەڤدەهەمین یەشتە،یەکێکە لەو ئیزەدانەی کەلە ئاینی زەردەشتدا فرە بایەخی پێدراوە لە ئاوێستادا پێی دەبێژرێ ئاشی Ashi ئەم ئیزەدە،ئیزەدی سامانوخێروخۆشی یە. پێکهاتووە لە (62) بەند.

18- ئەئیریتم خوارنو (ئاشتاد یەشت):

هەژدەهەمین یەشتە.لە ئاوێستادا پێی دەبێژرێت ئارشتات Arshtat بەمانای ڕاستیو دروستیە.پێکهاتووە لە (9) بەند.

19-کوەئینم خوارنو (زامیاد یەشت):

نۆزدەهەمین یەشتە.لەیەشتە کۆنەکان دەژمێردرێت.زامیاد ئیزەدی پاسەوانو سەرپەرشتی زەویە.پێکهاتووە لە(96)بەند،لە ڕابردوودا پێیان دەگووت(کیان یەشت)،چونکو زێتر باسی شاکانی کەیانی دەکاتوجێگەیەکی تایبەتی بۆ کەیانی یەکان داناوە.

لەم یەشتەدا،زێتر باسی(فەڕی کەیانی)[38] دەکات، مەبەست لە (فەڕ) لێرەدا ئەو ڕووناکیو نورو هێزی ئاسمانیەیە کە هەرکاتێك ئەم (فەڕە) لە هەرکەسێکدا بێت،لەسەرکردایەتیو پاڵەوانێتیوپەیامبەریو ڕاستیومرۆڤایەتیوهەموو خاسی یەك،بەهرەمەند دەبێت. لەبەندی 88ـ 96 زامیاد یەشت دەبێژێ:

((پاش ئەوەی (سوشیانس) دەردەکەوێت،هەموو جیهان پڕ لە دادوحیکمەت دەبێت، بەختەوەریوخۆشی ڕوودەکەنە جیهان،بیروکردارو گوفتاری خاس سەردەکەون.هەموو گێتی لە درۆ پاکدەبێتەوە.ودوژمنایەتی بنبڕ دەبێ.ڕاستی بەسەر درۆدا سەردەکەوێت.بیری خراپ بەرامبەر بیری خاس شکست دەخوات،فریشتەکانی خوردادو ئەمرداد بەسەر دێوی برسێتیوتینوێتیدا سەردەکەون،ئەهریمەن دەشکێوڕادەکا.

20- هئوم (هوم یەشت):

بیستەمین یەشتە.لەناو ئاوێستادا بە هوم دەبێژرێت هەئومە haoma هوم ناوی گیایەکە خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەرەوەی لێدروست دەکرێ کەپێی دەبێژرێ(ئەشام هوم).

ئەم خواردنەوەیە هەر لە مێژەوە (واتە پێش سەردەمی زەردەشت)لای ئارییاییەکان پیرۆز بووەو لەکاتی رێو رەسمی ئاینیدا دەیانخواردەوە.زەردەشت لە گاتاکاندا ئەم خواردنەوەیەی قەدەغە کردبوو،بەڵام پاش زەردەشت دیسانەوە ئەم خواردنەوەیە هاتەوە ئارا بەڵام بە ئەندازەیەکی کەمتر دەخورایەوە.

شایانی باسە،تەنیا لەدووبەندی ئەم یەشتە ستایشی هوم کراوە،بەڵام لەکاتی نوسینەوەی ئاوێستادا ئەم یەشتە خراوەتە سەر یەسناولە های (9،10،11) دانراوە بەنێوی هوم یەشت.

21- وەننت (وەنەند یەشت):

بیستویەکەمینودوا یەشتە. وەنەند یا وەنەنت،ناوی هەسارەیەکەوبەمانای (سەرکەوتو)ە.کورتترین یەشتەو پێکهاتووە لە تەنیا یەك بەند.

لێرەداواي بەبێش دەزانم برێ لەو یەشتانە بخەمە بەر چاو:

**<u>هورموزد یەشت</u>**:ئەم یەشتە بەسەردەستەی بیستویەك یەشتەکانی ئاوێستا دەژمێریت.لە ڕاستیدا پێکهاتووە لەنێوو (سیفاتو شایستەییەکانی)ی ئاهورامەزداو بریتییە لە 33 بەند.

سەرەتا،لەم یەشتەدا،زەردەشت پرسیار لە ئاهورامەزدا دەکات کە چ چاکەوپەرستنو کاری خاسیك باشترین پاداشتی دەبێ لە پەسلاندا.

ئاهورامەزدا تاکۆتایی بەندی شەشەم باسی سیفاتو شایستەییەکانی خۆی بۆ زەردەشت دەکات. لەسەرەتای بەندی حەوتەمەوە،دوبارە ئاهورامەزدا باسی بیستویەك ناوی خۆی دەکاتەوە(دوانزەهەمین ئاهورایەو بیستەمینی مەزدایە).لەبەندی نۆهەم تا یانزەهەم دەربارەی کاریگەرێتیوخاسیەتی ناوەکانە.لەبەندی دوانزە تا پانزە ئاهورامەزدا دەربارەی سیوچوار سیفەتی دیکەی خۆی دەدوێ.بەندی بیستەم تا بیستودوهەم بریتی یە لە نزاو نیایشوبەندی بیستوسێهەم بریتییە لە نوێژە بەناوبانگەکەی زەردەشتی یەکان کە پێی دەبێژن (یەتا ئەهو وەئیریو).لەبەندی بیستو چوارەمدا ئاهورامەزدا داوا لە زەردەشت دەکات کە چاودێری لە پەیرەوانی ئاینەکەی بکاتولە نەیاران بیانپارێزێت.لەبەندی بیستو پێنجەمدا دەربارەی ئەمشاسپەندەکان بۆ زەردەشت دەدوێت.بەندی بیستو حەوت باسی سپەندارمەند دەکا.لەبەندی بیستو هەشتدا زەردەشت دەربارەی پاشەڕۆژی مرۆی پاك پرسیار دەکات.بەندەکانی دیکە ستایشی ئەمشاسپەندەکانو ئاهورامەزدایەو دوا بەندیش بە نوێژی (ئەشم وەهو) کۆتایی دێت.

**دەقی ئەم یەشتە بەمجۆرەیە:**

1- زەردەشت لە ئاهورامەزدای پرسی:ئەی ئاهورا،تۆئەی پیرۆزترین بیروهۆشو دروستکەری جیهانی مادی،ئەی دیاردەیوتەی ئاسمانی،چ شتێك تواناتر،چ شتێك سەرکەوتوتر،چ شتێك بلێندترووپایە بەرزترو چ شتێك بۆ ڕۆژی پەسڵان کاریگەرترە؟

2- چ شتێك سەرکەوتوترین،چ شتێك چارەسازترین،چ شتێك زێتر بۆ دژایەتی خراپەکاران (دێوەکان) کارسازترە، لە جیهانی مادیدا چ شتێك پتر کاردەکاتە سەر بیری ئادەمیزاد بۆ باش بیرکردنەوە،لەسەراسەری جیهانی مادیدا چ شتێك خاسترویژدان پاك دەکاتەوە.

3- ئەوسائاهورامەزدا گوتی،ئەی سپەنتمان زەردەشت، بیرکردنەوەووردبوونەوە لەناوی منوئەمشاسپەندەکان،تواناترینوسەرکەوتوترینوپلەبەرزترین مایەی ڕزگاریە لە جیهانی مادیومعنوی دا،ودەبێتە هۆی بەختەوەریو خاس بیرکردنو سەرکەوتن بەسەر خراپەدا.

4- ئەمە سەرکەوتوترینوچارەسازترینە.ئەمە خاسترینە بۆ دژایەتی دێوەکانودرۆزنانو کارسازترینە.ئەمەیە کەلەسەراسەری جیهانی مادیدا کاردەکاتە سەر بیروهۆش. ئەمەیە لەسەراسەری جیهانی مادی خاسترویژدان خاوێن دەکاتەوە.

5- زەردەشت گوتی،ئەی ئاهورامەزدای پاك،ئەو ناوەی خۆتم پێ بێژە کە مەزنترو خاسترو جوانترەولە ڕۆژی پەسڵاندا گرنگترو چارەسازترو باشترە،و بۆ دژایەتی دێوەکانو درۆزنان کارسازترە.

6- بۆئەوەی ئەز بەسەر گشت درۆزنانودێوەکان سەرکەوەو زالێ بم بەسەر هەموو جادووەکانو پەرییەکان تا هیچ کەس نەتوانێت بەسەرما زالێ بێت،نەدێونە ئینسان نەجادوونەپەری.

7-ئەوسا،ئاهورامەزدا گوتی.ئەی زەردەشتی پاك،ئەز سەرچاوەی هەموو زانستو زانیارییەکم،دوهەم،کەسێك کە ئاژەڵومەڕومالاٌت دەبەخشێ،منم،سێهەم، کەسێك کەتوانایە، چوارەم کەسێك کەخاسترین ڕاستییە، پێنجەم، دیاردەی هەموو نیعمەتە پاکەکانم، شەشەم،منم بیروهۆش،حەوتەم،منم ژیر، هەشتەم،منم دانایی نۆهەم،منم دانا.

8- دەهەم، ئەزم پیرۆزی،یانزەهەم،ئەز پیرۆزم،دوانزەهەم،ئاهورام،سیانزەهەم، بەهێزترین، چواردەهەم،منم کە دوژمن زەفەرم پێ نابێت، پانزەهەم، نەبەزم، شانزەهەم، کەسێکم کە پاداشتی هەموانم لە یادە، حەڤدەهەم، چاودێریکەری هەمووانم، هەژدەهەم، دەرمانکەری هەموانم، نۆزدەهەم، ئەز ئافەریدەگارم، بیستەم، منم کەپێم دەبێژرێ مەزدا.

9- ئەی زەردەشت، دەبێ تۆ هەمیشە ستایشی من بکەیت بە پێشکەشکردنی خاسترین (زەور)بۆئەوەی ئەز، ئاهورامەزدا یارمەتیت بدەمو بەدەمتەوە بێم، سروشی پێرۆزیش یارمەتیت دەدا، هەموو سەرپەرشتانی ئاوەکانورِوەکەکانو رِۆحیانەتی چاکانیش دێنە لات بۆ یارمەتیدانت

10- ئەی زەردەشت،گەر دەتەوێ سەرکەویت بەسەر دێوەکانو خراپەکارانو جادوگەرانو پەرییەکانوکاوی یەکانو کەرپەنەکانی ستەمگەرو چەتەو رِێگرە دووپاکانو گومرِێ کەرانی دوو پێو گورگە چوار پێکان.

11-وبەهەڵێکردنی ئاڵای شەکاوەوە بەسەرسوپای نەیاران سەرکەویت،دەبێ هەمیشە ئەم ناوانەم لەسەرویردی زمانت بێتوورەوری پێبکەیت.

12- منم پشتیوان،منم ئافەریدەگارو پارێزگەر،منم مەعریفەتوپیرۆزترین بیرو هۆشو چارەساز،ناوم چارەسازترینە، ناوم پێشەوایە، منم خاسترین پێشەوا، ناوم ئاهورایە، ناوی منە مەزدا، ناوم پاکەو پاکترینم، ناوم زانایەو ناوی منە زاناترین، ئەز بینامو ناوم فرەبینایە، من دوربینمو ناوم زۆر دوربینە.

13- پاسەوان ناوی منە،پالێپشتوپشتوپەنا ناوی منە،دروستکەر ناومە،چاودێر ناوی منە،بەخێوکەر ناوی منە،وەدیهێنەری خاسترین شالیاری ناومە،ناوم شالیاری دادگەرە،داد گەرترین شالیارم ناوە.

14- فریونەدەر ناومە،کەسێك کە فریو ناخوا ناوی منە،کەسێك کە بە تواناوە سەردەکەوێ،ناوی منە، کەسێك کەبەیەك لێدان سەردەکەوێمنم، بەسەر هەموان زالێ دەبێ ناوی منە، دروستکەری هەموان منم،بەخشندەی گشت خۆشییەکانم ناوە، بەخشندەی فرەخۆشی یەکانم ناوە،بەخشندەم ناوە.

15- کەسێك کەبەویستو خواستی خۆی خاسی بکات منم، ئەز کەسێکم کەبەویستی خۆم پاداش دەدەم،مەزنان مەزنترم،ناوم شایانی شالیاری یە،ناوم دانایەوداناترین، ناوی منە، نیگەرانی پاشەرِۆژ منم،ئەمانەیە ناوەکانم.

16- ئەی زەردەشت، لەم جیهانی مادی یەدا،کەسێك لەبۆمن ئەم ناوانە لەژێر لێوەوەو بەئاوازو بەدەنگی بەرز،بەشەوو رۆژ بخوێنێو بیلێیتەوە.

17- کەسێك کە ئەو ناوانە لەکاتی هەڵسان یا لەکاتی نوستندا، لەکاتێکدا کە (کشتی دەبەستێت یا دەیکاتەوە، لەکاتێکدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەرِوات،ویالە کاتی سەفەرکردن لە دەڤەرێکەوە بۆ دەڤەرێکی دیکە،بخوێنێت.

18- ئەو جۆرە کەسانە،نەلە ڕۆژو نەلە شەودا،نەچەقۆ کاریان تێدەکا نەتەورزین، نەتیرونەخەنجەر،نەگورز کە لە لایەن کەسێکەوە کە هەموو گیانی پڕ لەقینودرۆیەو تێی دەگرێ،وبەردی قۆچەقانیش نایگاتێ.

19-وئەم بیست ناوە هەروەك کڵاوزرێی پشت سەرو زرێی سەرسینەوایە بۆ ئەو کەسە کەلە هەموو بەڵاو خراپەی نەیارانوئەهریمەنی ناپاكوگەندەڵێ دەپارێزێت. هەروەك ئەوەی کە هەزار پیاو پارێزگاری لە پیاوێك بکات.

20- کێیە ئەومرۆ داناوسەرکەوتووە کەبە فەرمانی تۆ دەبێ خەڵک لە پەنای خۆیدا ڕابگرێت،پێم بێژە بەهۆی ئیلهامەوە کآیە ئەو کەسەی کراوە بە داوەرو ڕزگارکەری ئەم جیهانە،ئەو داوەرەی کەوا خاوەن بیری پاكو هێزی فەرمانبەرداربیە،ئەو داوەرەی کە لەلایەن خۆتەوە هەڵبێژێراوە،ئەی مەزدا.

21- درودو سڵاوبۆ (فەڕ)ی کەیانی[39]،درودوسڵاو بۆ ئاریاویج، درودوسڵاو بۆ(سەئوك)[40]، درودو سڵاو بۆ ئاوی دائیتا، درودوسڵاو بۆ ئاوی ئەردوسیورناهید، درودو سڵاو بۆ گشت زیندەوەرە پاکەکان.

یەتا ئەهو..... وەکو خاسترینو باشترین سەروەر، زەردەشت باشترین داوەرە، کەسێکە کە بەگوێرەی یاسای پیرۆز، کرداری جیهانی بیری چاك بۆلای مەزدا، وشالیاری، کەوەك پاسەوانی بێچارەو بێدەرامەتان دانراوە، بۆلای ئاهورا هێنا.

ئەشم وەهو......ڕاستی خاسترین نیعمەتەو مایەی بەختەوەری یە کەسێك بەختەوەرە کە باشترین ڕاستی ئارەزوو دەکات.

22- ستایشت دەکەین ئاهوناوەئیریاوئاشاوەهیشتا،خاسترین ئەمشاسپەند،ستایشت دەکەین هێزوتواناییوسەرکەوتنوفەڕ،ستایشت دەکەین ئاهورامەزدای پایە بەرزو شکۆمەند.ئاهورامەزدا لەنێو هەموو زیندەوەراندا،لەنێو ژنانو پیاواندا،ئەو کەسە دەناسێت کە ستایشی دەکەن،وبەهۆی (ئاشا) وە خاسترین پاداشتی پێدەبەخشێت. ئەم جۆرە پیاوانەو ئەم جۆرە ژنانە ستایشت دەکەین.

23- یەتا ئەهو وەئیریو.... وەکو خاسترینو باشترین سەروەر،زەردەشت باشترین داوەرە، کەسێکە کەبەگوێرەی یاسای پیرۆز،کرداری جیهانی بیری چاك بۆلای مەزدا،و شالیاری کەوەك پاسەوانی بێچارەو بێدەرامەتان دانراوە،بۆ لای ئاهورا هێنا.

درودوستایشتوهێزوتوانا دەخوازم بۆ ئاهورای پایە بەرزو شکۆمەند.

ئەشم وەهو...ڕاستی خاسترین نیعمەتەومایەی بەختەوەری یە،کەسێك بەختەوەرەکە باشترین ڕاستی ئارەزوو دەکات.

24-ئەی زەردەشت،دەبێ هەمیشە دۆستویاران لە دوژمنونەیار بپارێزیت.نابێ ڕەوا ببینی کە دۆست بخەیتە مەترسییەوە،ڕێگەمەدە تووشی ئازاروئەرکی گران بن مەهێڵە ئەو خاوەن باوەڕانە کە بۆ ئێمەوفریشتەکان دیاری یاخود کەمترین فدیە دەهێنن،خۆیان تووشی سەغڵەتی بکەن.

25- ئەی زەردەشت،ئەمەیە وەهومەن ئافەریدەی من،ئەمەیە ئۆردیبەهەشت ئافەریدەی من،ئەی زەردەشت،ئەمەیە شەهریوەر ئافەریدەی من، ئەی زەردەشت، ئەمەیە سفەتدارمەند ئافەریدەی من، ئەی زەردەشت ئەمانەن خوردادو مورداد هەردووکیان لە دروستکراوانی منن.پاداشتی ئەو پاکانەی کە دێنە جیهانی هەمیشەیی بەهۆی ئەوانەوە دیاری دەکرێت.

26-... [41]... ئەی زەردەشتی پاك،بەهۆی هێزی ڕۆحیوزانستی منەوە،ژیانی داهاتوو چلۆن دەبێولە کۆتایی ژیاندا دەبێ چلۆن بێت[42]

27- بەهۆی خۆشەویستیوئەوینی پاکەوە (سپەندارمەند)، هەزار دەرمانو دەهەزار چارە دەگاتە پاکانوخاوەن باوەڕەکانوبەهۆی ئەوەوە دوژمنایەتیو دژایەتی نەیاران لەناو دەچێت.بەهۆی ئەوونیرادەی ئاهورا مەزداوە دەردوبەڵیوخراپەی ڕێگرانو چەتەکانوئەوانەی نیزامووڕاستی تێکدەدەن،لەناو دەچێت.دەستیان ببەستنەوەو چەکیان بکەن با هەمیشە لە بەندا بن.

28- ئەی مەزدا،ئایا پەیڕەوانولایەنگرانی ئاینی پاك بەسەر درۆزنانو درۆپەرستان سەردەکەون، پاکدین بەسەر درۆدا زالێ دەبێ، ڕێڕەوانی ڕێگەی ڕاست سەردەکەون بەسەر پەیرەوانی درۆدا.ستایشت دەکەین هێزوتواناییی بیستنی (حاسە السمع) ئاهورامەزدا کەوتەی پیرۆزی بیستێنرا، ستایشت دەکەین هێزو توانای پاراستنی ئاهورامەزدا کەوتەی پیرۆزی پاراست، ستایشت دەکەین زمانی ئاهورامەزدا کەوتەی پیرۆزی بەیانکرد. شەوو ڕۆژ کێوی (ئوشیدەم ئۆشیدەرنە) ستایشت دەکەین.

29- زەردەشت گوتی، بەهۆی ئەمەوە، دەتان کەمە ژێر زەوی یەوە بەهۆی چاودێری سپەندارمەدەوە، جەردەو چەتەکان چالێ دەکرێن.

30- هەزار دەرمانو دەهەزار چارەمان پێبگات.

ڕۆحیانەتی (فرەوەهر)ئەم پیاوەخاسوپاکە کە پێی دەبێژرێت (ئەسموخوانونت)[43] ستایشت دەکەین،لەمەودوا گەرەکمە هەروەك خاوەن بیرو باوەڕێك ڕۆحیانەتی گشت پاکدینان ستایشت بکەم.

ڕۆحیانەتی (فرەوەهر) گائوکرنە[44] (Gaokerena) ی بەتواناو دروستکراوی مەزدا ستایشت دەکەم. گائوکردنەی بەتواناو ئافەریدەی مەزدا ستایشت دەکەم

31- ستایشت دەکەین هێزو توانایی بیستنی ئاهورامەزدا کەوتەی پیرۆزی بیستێنرا ستایشت دەکەین هێزوتوانایی پاراستنی ئاهورامەزدا کەوتەی پیرۆزی بەیانکرد.

کێوی ئۆشیدەم ئۆشیدەرنە شەوو ڕۆژ ستایشت دەکەین.

ئەشم وەهو..... ڕاستی باشترین نیعمەتەو مایەی بەختەوەرییە.

کەسێك بەختەوەرە کە باشترین ئارەزووی ڕاستی بێت.

32- ستایشت دەکەین سفەندارمەندی پیرۆزی کارساز، بۆیە کا ئەو کەسەمان دەوێت کەلە هەموان مەزنترەو ئەو ئاهورامەزدایە بەگەورەو سەروەری خۆمانی دەزانین تا بتوانین ئەهریمەنی بەدکار لەناوبەرین بۆئەوەی ڕقو قینەی چەکی خوێناوی دامرکێنین بۆئەوەی فریشتەکان بلێند بکەینەوە،بۆئەوەی هەسارەی شکۆمەندو ڕۆشەنی (تشتر) بەرزبکەین،بۆئەوەی مرۆڤی پاك بەرز بکەینەوە،بۆئەوەی گشت ئافەریدەکانی بیر پاکو پیرۆز بەرز بکەینەوە.

33-ئەشم وەهو..... ڕاستی باشترین نیعمەتومایەی بەختیاری یە.

کەسێك بەختەوەرەکە باشترین ئارەزووی،ڕاستی بێت.

کەسێك کەستایشتت بکات، تۆ فەڕو ڕۆشنایی،پێ ببەخشە،ماڵیومنداڵی شیاوی پێ ببەخشە، تەمەنی درێژو بەهەشتو ڕووناهی هەمیشەیی پێ ببەخشە،

ئەشم وەهو.....

هەزار دەرمانو دەهەزار چارەی پێ ببەخشە.

ئەشم وەهو....

ئەی مەزدا، بگەرە فریام

## میترا یەشت ((مهر یەشت))

ئەم یەشتە تایبەتە بە میترا(میپرە Mithra) کە یەکێك بووە لەخوا دێرینەکانی نەتەوە ئارییەکان، ولەزۆر شوێنی جیهاندا بلآوبوبۆوە. لەکۆنترین یەشتەکان دەژمێردرێت بەلآم مەخابن ئەمیش بەهۆی بڕی لەنوسەرە زەردەشتیەکان دەستکاری کراوە. مهر (میترا) چەندین مانای هەیە وەك، خۆشەویستی، بەڵێن‌و پەیمان، خۆر. یوستی Yusti پاش لێکۆڵینەوە دەربارەی مانای ئەم وشەیە، بە پەیوەندو نێوانجی لەنێوان تیشك‌و ڕووناکی ئاهورایی لەتەك تیشك‌و ڕووناکی دروستکراو داناوە، بەواتەیەکی دی نێوانجی یە لەنێوان ئافەریدەگارو ئافەریدەدا. شایانی باسە لەگاتاکاندا تەنیا یەکجاروشەی میپرە هاتووە ئەویش نە بەمانای فریشتە بەڵکو بە مانای ئەرکی ئاینی دەربارەی پەیمان شکێنی. دارمستەتر Darmesteter بەمانای خۆشەویستی‌و دۆستایەتی لێکیداوەتەوە.

میترایەشت یادەوەرییەکی خاسی سەردەمی ئاریا کۆنەکانە کە جآ پەنجەی چاکسازی ئاینی زەردەشتی تێدا بەرچاو دەکەوێت.

تیل Tiele، رۆژهەلآتناس‌و زانای هۆلەندی، ئەم یەشتەی یەکاڵ کردووەو ئاسەواری باوەڕی نەتەوە ئارياییەکان‌و چاکسازیەکان‌و تازەکردنەوەکانی لەلایەن ئاینی زەردەشتیەوە دەستنیشان کردووە.

لەنێو ئەم یەشتەدا (میترایەشت) دەتوانین دوو باسی سەرەکی دەستنیشان بکەین‌و پەنجەی بۆ ڕابکێشین، یەکەمیان (ڕاستی)و دووهەمیان (دڵری)یە. میترا هەمیشە ئامادەیەو لەسەر پێیە بۆ یاریدەدانی ڕاستگۆیان، وشکاندن‌و لەناوبردنی درۆزنان‌و پەیمان شکێنان.

لەسەرەتای ئەم یەشتەدا، باسی ئەوە دەکا کە میترا ئافەریدەی ئاهورامەزداو بۆ چاودێری‌و پاراستنی پەیمان‌و بەڵێن لەنێو خەڵکدا دروستکراوە.

کەوایە دەبێتە فریشتەی تیشك‌و رووناکی، وبۆئەوەی هیچ شتێکی لـآ شاراوە نەبێت‌و لەهەموو گێتیدا هەموو راستی‌و درۆیەك‌و پەیمانێك کە دەبەسترێت‌و یا دەشکێنرێت، لای ئاشکرابێت، بۆئەوەی بە خاسی بە ئەرکی سەرشانی هەڵسێت، ئاهورامەزدا هەزار گوێ‌و دە هەزار چاوی پێبەخشیوە (واتە هەموو شتێك دەبیستآو دەبینآ).

میترا، لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیەو هەرکەسێك سکاڵی لا بکات‌و داوای یارمەتی لێبکات هەرچەندە بە دەنگێکی لاوازو نوزەشەوە بێت، گوێی لێەتی‌و بە دەنگیەوە دەچێت.

میترا، فەرمانڕەوایی‌و هێزو توانا دەبەخشێ، بۆیەکا جەنگاوەران‌و چینی گەورە پیاوان، زێتر لەفریشتەکانی دیکە پەنا بۆ ئەم دەبەن.

لەبەندی (13و 95)ی ئەم یەشتە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە میترا فریشتەی تیشك‌و ڕووناکیەو یەهیچ جۆرێك (خۆر) نییە، چونکو تیایاندا دەبێژێ کە میترا لەپێش هەڵیهاتنی خۆر

دەردەکەوێتولەپاش ئاوابونیدا، دەگەڕێت. هەروەها لەبەندی 145 دەبێژێ (هەسارەکانو مانگـو خۆرومیترا شالیاری گشت دەڤەرەکان ستایشت دەکەین.)

## بەشی یەکەم (کردە 1)

بەندی 1:

ئاهورامەزدا بە ئەسپەنتمان زەردەشتی گوت:

ئەی ئەسپەنتمان، هەر ئەوکاتەی کە ئەز میترام (مهر) کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینە، ئافراند، ئەوم لەڕوی شیاوبونی ستایشتو ڕێزەوە لەتەك خۆمدا کە ئاهورامەزدام بە یەکسان ئافراند.

بەندی 2:

ئەی ئەسپەنتمان، بێبەڵێنو پەیمانشکێنی بەدکار، هەمووولآتوێرانو خاپور دەکات. ئەو جۆرە کەسانە بە ئەندازەی سەد کەسن کە بەگوناهی (کەیزە) گیرۆدە دەبنو کردەیان وەك بکوژی مرۆیەکی پاك دینە.

ئەی ئەسپەنتمان، نەکەیت هەرگیز پەیمان بشکێنی، نە پەیمانێك کە لەتەك درۆزنێك بەستبێتو نە پەیمانێك کە لەتەك ڕاستگۆیەکدا بەستبێت، چونکو هەردووکی هەر پەیمانەو نابێ ڵی پاشگەزبیتەوە.

بەندی 3:

میترا (مهر) کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینە، بەو کەسانەی کە درۆی لەتەکا ناکەنو پەیمانشکێن نین، ئەسپی توندەڕەو دەبەخشێ، ئازەری[45] مەزدا ئاهورا ڕێگەی ڕاستو دروست پێشانی ئەو کەسانە دەدات کە درۆ لەتەك میترا ناکەن، فرە وەهری پیرۆزو خاسو بەتوانای پاکەکان، وەچەی تێکۆشەرو دڵرو هۆشیارو خاس بەو کەسانە دەبەخشێت کە درۆ لەتەك میترا نەکەنو پەیمان نەشکێنن.

بەندی 4:

لەبۆ فەڕو تیشکی میترا نزاو ستایشتی دەکەم.

میترا کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینەو چاودێریولآتانی ئارییە، لەم سەر زەوییەدا ئارامیو تەبایی، پیتو بەرەکەت دەهێنێتەدی، چارەسەری دژوارییەکان دەکات، بەختەوەریو سەرکەوتن بۆ خەڵک دەهێنآ، چونکو دڵرەو لەهەموو شوێنێکدایەو شایانی ستایشتو رێز لێگرتنە.

بەندی 5:

ئەو کەسەی کە بەهێزەو لەهەموو شوێنێکدا سەرکەوتووەو هەرگیز فریو نادرێت، ولەسەراسەری جیهانی مادیدا شیاوی ستایشتو نیانیشتە، ئەو، میترا(مهر)یە کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینە.

بەندی 6:

ئەو ئیزەدە بەهێزو توانایە، ئەو بەهێزترین ئافەریدەیە، ئەو میترایە، بە پێشکەشکردنی (زەور) ستایشت دەکەین.

ئەو میترایەی کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینە بە (هوم)ی ئاوێتە بە شیر، بە (بەرسەم)، بەزمانی ئەقل، بەبیرو کردارو گوفتاری پاك ستایشت دەکەین.

بەندی 7:

ستایشتی میترا(مهر) دەکەین کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینە، کەسێك کە ئاگایە لەقسەی راستو بەدروستی ڕایدەگەیەنێت. ڕەوانبێژێك کە خاوەنی هەزار گوێیە، خۆش ئەندامو بالآ بەرزێك کە هەزار چاوی هەیەو لەسەر قوللەیەکی بەرز راوێستاوە، بەهێزو توانایە، دڵرێکە کە هەمیشە پاسگرە(پاسەوانە)و خەو ناچێتە چاوییەوەو چاودێری کرداری خەڵکە.

بەندی 8:

ئەوەی کە سەرکردەکانی هەردوو تاقمە شەڕکەرەکان لەکاتی هێرش کردنە سەر یەکتری، لێی دەپارێنەوەو دیاری بۆ دەهێنن‌و داوای یارمەتی لێدەکەن.

بەندی9:

میترای خاوەن دەشتی پان‌و بەرین لەتەك فریشتەی (با)ی سەرکەوتووو(داموئیش ئوپەمەن) (یەکێکە لەفریشتەکانی هاوکاری میترا) ـ ڕوو دەکەنە ئەو دەستەیەی کە بەدڵی پاکو بیری خاس‌و باوەڕێکی ڕاستەقینەوە نیایش‌و ستایشتیان کردووەو یارمەتییان دەدەن.

## بەشی سێهەم ـ کردە 3

بەندی 10:

لەم بەندەدا، دروست هەمان بەندی 7 دوپات دەبێتەوە.

بەندی 11:

ئەو کەسەی کە، شۆڕە سوارەکان لەسەر زینی ئەسپەکانیانەوە، ستایشتی دەکەن‌و بۆ بەخشینی هێزو توانا بە ئەسپەکانیان‌و لەبۆ تەندروستی خۆیان نیایشتی دەکەن، بۆئەوەی بتوانن لەدوورەوە نەیارەکانیان بناسن‌و بەسەر دوژمنە بیر خراپ‌و دڵپیسەکان سەرکەون، لەبۆ فەڕو تیشکی میترا.. (بەندی 4و5و 6 لێرەدا دوپات دەکرێنەوە).

## بەشی چوارەم ـ کردە 4 ـ

بەندی 12:

**لێرەدا دوبارە بەندی 7 دەخوێنرێتەوە.**

بەندی 13:

یەكەمین ئیزەدێكی مەعنەوییە كە پێش هەڵێهاتنی (خۆر)ی لەناونەچوی تیژئەسپ، لەسەر لوتكەی كێوی (هەرا) ـ واتە كێوی ئەلبورز ـ هەڵێدێت. یەكەمین كەسێك كە بە بەرگی زێرینەوە لەسەر لوتكەی ئەو كێوە هەڵێدێتو دەروانێتەوڵاتو ژیانی هەموو ئارياييەكان.

بەندی 14:

ئەو شوێنانەی كە فەرمانرەوایانی دڵر، سوپایەكی فرەو عەگید ساز دەكەن، كە لەو شوێنانەدا كێوو چیای سەركەشو دەشتو لەوەرگایەكی زۆر بۆ ئاژەڵەكانیان هەیە، ئەو شوێنانەی كە دەریای قولأو بآ بنو رِووبارو چۆمی گەورەو پان كە كەشتی پێایدا دەروات، دەبینرێت.

بەندی 15:

میترای توانا نیگەرانی هەموو سەرزەمینی ئارياييەكانە، نیگەرانە بۆووڵاتانی وەك ئەریزەهی Arezehi، سەوەهی Savahi، فرە دەزەفشوFradazafshu، ڤیدەزەفشو Vidazafshu ڤاوروبەریشتی bareshti – Vauru، ڤاورو جەریشتی Vouru – Djare shtiو خفەنیرەپKhvanirath[46]، ئەو شوێنانەی ئاژەڵكی فرەی تیادایەو بە ئارامی لە لەوەرگاكانیان دەلەوەرێن.

بەندی 16:

ئەو ئیزەدە مەعنەویەی كە (فەر)و شالیاری دەبەخشێت، هەموو دەڤەرەكان دەگەرِێت، ئەو كەسانە سەركەوتوو دەكاتو ئەو پاكدینانەی كە رێگەی ئاینی راستیان گرتۆتەبەر دەگەیەنێتەئامانج كە لەتەك پێشكەشكردنی (زەور) دا ستایشتی بكەن. (لێرەدا بەندی 4و5و6 دوپات دەكرێنەوە).

بەشی پێنجەم ـ كردە 5 ـ

بەندی 17:

ستایشتی میترا(مهر)دەکەین، ئەو کەسەی کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، کەسێك کە ئاگایە لەقسەی راستو بەدروستی رایدەگەیەنێت، ڕەوانبێژێك کە خاوەنی هەزار گوێیە، خۆش ئەندامو بالآبەرزێك کە هەزار چاوی هەیەو لەسەر قووللەیەکی بەرز راوێستاوە، بەهێزو تواناو دڵرێك کە هەمیشە پاسگرە (پاسەوانە)و خەو ناچێتە چاویەوەو چاودێری کرداری خەڵکە. کەسێك کە هیچ کەس، نە گەورەی مالأ، نە گەورەی گوند، نە کوێخاو نە گەورەی ناوچەو نە هیچ شالیارێك ناتوانێتو توانای ئەوەی نییە درۆی لەتەکا بکات.

بەندی 18:

ئەگەرکو کەسێك لەمانە (گەورەی مالأ، گەورەی گوند....) بەناوی میتراوە (مهر) بەڵێنو پەیمان بشکێنیو درۆی بەدەمەوە هەڵبیەستآ یاخود درۆبکات، میترا خۆیو سەر زەویەکەیان سەرزەنشتو کاول دەکات.

بەندی 19:

میترا بە تورِەییو دڵشکاویەوە ڕوو دەکاتە ئەو شوێنەی کە پەیمانشکێنی لَیە.

بەندی 20:

ئەسپی پەیمانشکێنەکان، سواری بە خاوەنەکانیان نادەنو سەرکێشی لێدەکەنو سمکۆل دەکەنو غارناکەن. بەهۆی گوفتاری خراپو ناشیرین کە کاری نەیارانی میترایە، لەکاتی نەبەردا ئەو تیرو ڕمەی دەیگرنە نەیارەکانیان، بەرەو لای خۆیان دەگەرێتەوە.

بەندی 21:

بەهۆی گوفتاری خراپو ناشیرین کە کاری نەیارانی میترایە، ئەگەرکو ئەو تیرو ڕمەشیان بوەشێنرێتو لەشی نەیارەکەشی بپێکێت هیچ زیانێکی پێراناگەیەنێت.

بەهۆی گوفتاری خراپو ناشیرین کە کاری نەیارانی میترایە، ئەو تیرو ڕمەی کە دەیگرێتە نەیارەکەی، (با) هەڵیدەگەڕێنێتەوە بۆخۆی. (بەندی 4و5و6 دوپات دەکرێتەوە.)

بەشی شەشەم ـ کردە 6 ـ

بەندی 22:

سەرەتا بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە....

ئەو کەسەی کە ئەگەر درۆی لەتەکا نەکرێت، مرۆ بە نیازدەکاو لەدژواریەکانو مەترسییەکانی ژیان رزگار دەکات.

بەندی 23:

ئەی میترا (مهر)، کە درۆت لەتەکا نەکرا، بە نیازمان بکە (موحتاجمان مەکە)، تۆ دەتوانی ترسو تۆقێن بخەیتە نێو دڵی مرۆی پەیمانشکێن. تۆ دەتوانی گەر تورەبیت هێزو توانای بازوو ومەچەكو پێو بینایی چاوو هێزی بیستنی گوێی پەیمانشکێنان وەربگریتەوە.

بەندی 24:

کەسێك بەدڵی پاکو بەبیرێکی خاسەوە ستایشتی میترا بکات، ئەو میترایەی کە دەهەزار دیدەوانی هەیەو بەتوانایەو ئاگای لەهەموو شتێکەو فریو نادرێت، لەکارزارو نەبەردا هیچ جۆرە چەکێکی تیژی نەیار کاری تێناکات. (بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێتەوە.)

بەشی حەوتەم ـ کردە 7 ـ

بەندی 25:

(سەرەتا بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)

میترا ستایشت دەکەین، ئەو سەروەرە بە تواناو سەرومالأو سوود بەخشە دەم پاراوەی نیایشتی پەروەردەگار دەکات، ئەو بەهێزو توانایەی کە پلەوپایەیەکی تایبەتی هەیە، وهەموو پەیکەری سەرانسەروتەو گوفتاری پیرۆزی ئیزەدیە، ئەو پاڵەوانە دلڕەی کە بازوو مەچەکەکانی پتەو بەهێزن.

بەندی 26:

ئەو کەسەی کە درۆزنەکان سەرشۆڕ دەکاو لەناویان دەبێ، ئەو کەسەی توڕە دەبێت لەو کەسانەی خۆیان دوچاری خراپەو گوناە دەکەن. کەسێك کە تۆڵە لەپەیمانشکێن دەسێنێت، کەسێك کە ئەگەرکو درۆی لەتەکا نەکرێت، هێزو توانایەکی بآ شومارو تەکوزی بەولآت دەدات، کەسێك کە ئەگەر درۆی لەتەکا نەکرێت، سەرکەوتنێکی گەورەو درەخشان بەولآت دەبەخشێت.

بەندی 27:

کەسێك کە نەیارشکێنەو بی فەڕیان دەکات، نەیاران هەرچەندە بەهێزو توانابن، دەهەزار جار بریندایان دەکا. میترا (مهر) کە دەهەزار دیدەوانی هەیەو بەتواناو ئاگاداری هەموو شتێکە، هەرگیز فریو نادرێت. (بەندەکانی 4، 5، 6، دوپات دەکرێنەوە.)

بەشی هەشتەم ـ کردە 8 ـ

بەندی 28:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

میترا(مهر) کەسێکە کە پارێزگاری لەکۆڵەکەو بنچینەی خێزان دەکا، شکۆو بەرزێتی، نیعمەتو سەروەت دەبەخشێ، خۆشیو شادی دەخاتە نێو ئەندامانی ئەو خێزانانەی کە لێیان ڕازییە، وبە پێچەوانەوە، سەرومالێی نەیارانو خراپەکاران تێکدەدات.

بەندی 29:

ئەی میترا (مهر).

ئەتۆ لەتەك خەڵكوولآتاندا هەم خاسیو هەم خراپ.

ئەی میترا،

ئاشتیو شەڕو هەرا لەنێوولاتاندا لەتۆوەیە!

بەندی 30:

ئەی میترا،

بەهۆی تۆ، تەكوزی لەنێو خێزانو گوندو شاردا دابین دەبێت. لەنێو گوندو خێزاندا، ئافرەتانی جوانو بالآبەرزو خانومان، وەچەی دڵر، ئەسپی تیژڕەوو گەردونەی خاسو خانوی خۆشو پێخەفی نەرمو بۆنخۆش، بۆ پەیرەوانی راستی كە لەكاتی نیایشدا ناوت دەبەن، بەرقەرارە.

بەندی 31:

ئەی میترا (مهر)،

لەكاتی نوێژدا كە ناوی تۆ دەبەین، لەتەك (زەور) دا ستایشتت دەكەین.

ئەی میترای توانا، لەكاتی نوێژدا كە ناوی تۆ دەبەین لەتەك(زەور) دا ستایشتت دەكەین.

ئەی میترا كە فریو نادرێیت! لەكاتی نوێژدا كە ناوی تۆ دەبەین لەتەك (زەور)دا ستایشتت دەكەبن.

بەندی 32:

ئەی میترا (مهر)!

گوێ بۆ ستایشتەكانمان ڕابگرە.

ئەی میترا!

ستایشتەکانمان پەسەند بکە.

ئەی میترا!

وەڵامی تکاکانمان بدەرەوەو نیازەکانمان (پێویستیەکانمان) بەدی بهێنە.

ئەی میترا!

تەماشای پێشکەشیەکانمان (زەور) بکەو لێمان پەسەند بکەو لەم نیایشەدا خۆتمان پێشان بدە.

ئەی میترا!

ئەم نزاو نیایشانەمان لەخەزێنەی لێبوردن کۆبکەو بیخەرە کاخی ستایشت (بەهەشت).

بەندی 33:

بەگوێرەی ئەو پەیمانەی لەنێوان ئێمەو تۆدا بەستراوە، ئارەزووەکانمان بەدی بهێنە. داخوازیمان لێت ئەمەیە کە:

هێزو توانامان پێببەخشە، سەرکەوتومان بکە، خۆشیو شادیو کامەرانی، دادوەری، ناوخاسی، ئارامیویژدان، توانایی ناسین، زانیاری معنوی، سەرکەوتنی ئافەریدەی ئاهورا، سەرکەوتنێك کە لەسەرچاوەی راستیەوە هەڵیقولآبێت، تێگەیشتنیوتەی معنویو پیرۆزمان پێببەخشە.

بەندی 34:

تا بتوانین لەژێر سایەی ئەم نیعمەتانەی پێمان دەبەخشی، دڵرانەو بەخۆشیو شادیەوە بەسەر نەیارانمان زاڵ بین.

تابتوانین دڵرانەو بەخۆشیو شادیەوە سەرکەوین بەسەر رەقیبەکانمان تا بتوانین دڵرانەو بە خۆشیو شادییەوە نەیارانمان ببەزێنین چ ئادەمیزادبێت یا دێو یا جادووکەرو پەریو کاویو کەرپەنە ستەمکارەکان.

## بەشی نۆهەم ـ کردە 9ـ

بەندی 35:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەو کەسەی گوفتار دەکاتە کردار(واتە ئەوەی بەڵێینی پێدەدا بە ئەنجامی دەگەیەنێت)، ئەو کەسەی کە سوپا خڕ دەکاتەوە، ئەوەی کە هەزار جۆرە چالاکی دەنوێنی، ئەو کەسەی شالیارێکی بە تواناو دانایە.

بەندی 36:

ئەو کەسەی کە جەنگ بەرپا دەکا، ئەوەی کە هێزو توانا بە جەنگاوەران دەبەخشێ، ئەو کەسەی کە لەنەبەردا کۆلێنەدەرەو بە ئازایەتییەوە بەرەی نەیار دەشکێنآو هەردوو باڵەکانیان (راستەو چەپ) پەخشوبلاوو پەرێشان دەکات، وهێرش دەبێتە نێو جەرگەی سوپاکەیانو لەرز دەخاتە نێو دڵیانەوە.

بەندی 37:

ئەو کەسێکە کە دەتوانآ نەیاران تووشی پەرێشانیو ترسو لەرز بکات، سەری ئەو کەسانەی کە درۆیان لەتەکدا کردووە لە لەشیان دەپەڕێنآ.

سەری ئەو کەسانەی درۆ لەتەك میترا دەکەن لە لەشیان جیابێتەوە.

بەندی 38:

مۆلێگەو نیشتەجێگاکانیانوێرانو خاپوربێتو کەسی تێدا نەمێنآ، ئەو مۆلێگانەی کە پەیمانشکێنو درۆزنو کوشەندەی پاکدینانی راستەقینە، تیایدا دەژینو پڕە لەترسو هەراس.

ئەو گاگەلەی[47] کە گیرۆدەی پەیمانشکێنان بوونو بەناچاری گەردونەکانیان ڕادەکێشن ئاو لەچاویان دێتەخوار.

بەندی 39:

ئەگەرکو میترا(مهر) کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، تورِەو دلأ رەنجاو بێتو خۆش وەشیان نەکردبێت، ئەوسا ئەو تیرەی کە درۆزنانو پەیمانشکێنان دەیهاوێژن، هەرچەندە بە پەری هەلێۆوشاهێن رِازێنرابێتەوەو لەکەوانێکی یەکجار خاسەوە رِاکێشرابێتو بەتیژی دەرچێت، هەرگیز ناگاتە نیشانەو ناپێکێت.

ئەگەرکو میترا (مهر) کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینە، تورِەو دلأ رِەنجاوبێتو خۆش وەشیان نەکردبێت، رِمە سەرتیژو درێژەکانی دەستەی درۆزنو پەیمانشکێنان، هەرچەندە بەهێزو توانایەکی زۆر هەڵیدابێت، هەرگیز ناگاتە نیشانە.

ئەگەرکو میترا(مهر) کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، تورِەو دلأ رِەنجاوبێت،خۆش وەشیان نەکردبێت، بەردی قۆچەقانەی درۆزنو پەیمانشکێنان، هەرچەندە بە بازوویەکی بەهێزەو هەلێدرابێت، هەرگیز ناگاتە نیشانە.

بەندی 40:

ئەگەرکو میترا (مهر) کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، تورِەو دلْرِەنجاو بێتو خۆش وەشیان نەکردبێت، تیغە خاسەکانی(کێرد، خەنجەرو شمشێر) درۆزنو پەیمانشکێنان کە دەیوەشێنتە سەری خەڵک، ناگاتە نیشانەکانیان.

ئەگەرکو میترا (مهر) کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، تورِەو دلْرِەنجاو بێتو خۆشو وەشیان نەکردبێت، گورزە خاسەکانی درۆزنانو پەیمانشکێنان کە بەهێزو تواناوە دەیوەشێننە سەری خەڵک، هەرگیز کاریگەر نابێو ناگاتە نیشانەکانیان.

بەندی 41:

ئەگەرکو میترا (مهر) کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، تورِەو دلْرِەنجاو بێت، ودلْخۆشیان نەکردبێت، لەبەرەو رِووەوە ترسو هەراس دەخاتە نێو دلْی درۆزنو پەیمانشکێنان، رِەشەن[48] لەپشتەوە، ترسو لەرز دەخاتە نێو دلْیانەوە، (سرووش)[49]ی پاك لەتەك ئیزەدە پاسگرەکاندا، لەهەموو لایەکەوە تەنگیان پی هەلێدەچێنآو بەرەو هەلێدێریان دەبێت.

بەندی 42:

ئەوسا، درۆزنە پەیمانشکێنەکان بە میترا کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە دەبێژن:

ئەی میترا، ئەی خاوەنی دەشتی پانوبەرین!

ئەمانە (رەشەن‌و سرووش) ئەسپە توندرەوەکانمیان رفاند!

ئەمانە هێزو توانای بازومانیان سست کردو بە تیغەکانیان قۆڵأو مەچەکیان بڕین.

بەندی 43:

ئەوسا میترا(مهر) کە خاوەنی دەشتی پانو بەرینە، هەمویانی لەخاکوخوێندا گەوزاند. پەنجا، سەدها، سەد هەزارها، هەزار دەهەزارەها، دەهەزار سەد هەزار، چونکو میترا کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، تورەو دڵڕەنجاوە.

**(بەندی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە).**

## بەشی یانزە ـ کردە 11ـ بەندی 47

(بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)

ئەو ناودارەی ئەگەرکو قەڵیس‌و زویربێت، لەنێو جەنگاوەرانی دوو بەرە (دوو کیشوەریا نەتەوە) کە کەوتونەتە جەنگ لەتەك یەکترداو یەکتر دەکوژن، دژی سوپای نەیارو خوێنمژە ڕادەوەستێت.

بەندی 48:

ئەگەرکو میترا دژی سوپای نەیارو خوێنمژ کە خەریکی جەنگن لەتەك لایەنێکی دیکە، ئەسپ تاو بکات، ئەوسا دەستی پەیمانشکێنان لەپشتەوە دەبەستێت، چاویان کوێردەکا، گوێیان کەڕ

دەکاتو هێزو توانای قاچیان سست دەکا، تاوای لێدێت هیچ کامیان نەتوانن شەڕبکەن. ئەمە چارەنووسی ئەو جەنگاوەرانوولآتانەن کە ڕوو لەمیترای خاوەن دەشتی پانو بەرین وەردەگێڕن.

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێتەوە)

بەشی دوانزەهەم ـ کردە 12ـ

بەندی 49:

(بەندی 7 دووپات دەکرێتەوە)

بەندی 50:

کەسێك کە ئافەریدەگار(ئاهورامەزدا)مەلێبەندێکی بۆ داناوە لەسەر کێوکێکی بەرزو درەخشان کەزنجیرەیەك چیای بآ شومارن، ئەو شوێنە نە شەوی هەیەو نە تاریکی، نە (با) ی ساردی هەیەو نە گەرم، نە نەخۆشی کوشندەو نە چەپەڵی. لەم کێوە (هارایتی) هەرگیز تەمو هەوری نییە.

بەندی 51:

ئەم مەلێبەندە بە فەرمانی ئاهورامەزدا، ئەمشاسپەندەکان لەتەك (خۆر)دا بە بیرێکی پاکەوە دروستیان کرد بۆئەوەی میترا (مهر) بتوانێت لەوێوە چاودێری لەسەرانسەری هەموو جیهانی مادی بکات.

بەندی 52:

ئەگەرکو مرۆیەکی فێلبازی بیر خراپ، کارێك بە پێچەوانەی ڕاستیو پەیمانداری ئەنجام بدات، ئەوسا میترا کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، هەنگاوی بەرز هەڵێدێنآو بەگەردوونەکەیەوە زۆر

بەخێرایی لەتەك (سرووش)ی پاكو بەتواناو (تەریو سەنگ)ی چالاك، دەكەوێتە شەڕ لەتەك ئەو كەسەدا لەهەر شوێنێك بێتو دەیكوژێت.

**(بەندی 4، 5، 6 دوپات دەكرێنەوە)**

**بەشی سیانزەهەم ـ كردە 13ـ**

بەندی 53:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

كەسێك كە هەردوو دەستی بەرەو ئاهورامەزدا بەرزكردۆتەوەو بە بیرێكی پاكەوە دەبێژێ:

بەندی 54:

ئەی ئافەریدەگاری بیرخاس،

ئەز، پشتیوانی هەموو ئافەریدەكانم، پاسگری هەموو ئافەریدەكانم

ئەی ئافەریدەگاری بیرخاس،

بەلآم خەڵك وەك پێویست لەكاتی ستایشتكردنی ئیزەدەكانی دیكە، ستایشتی من ناكەن.

بەندی 55:

ئەگەركو خەڵك لەكاتی ستایشت كردندا، منیش ستایشت بكەن، هەروەكو چلۆن ئیزەدەكانی دیكە ستایشت دەكەن ئەوسا من بەهۆی ئەو ژیانە نەمرو درەخشانەم كە پەیمانم لەتەكا بەستون، خۆمیان پێدەگەیەنمو یاریدەیان دەدەم.

بەندی 56 (لێرەدا بەندی 31 دوپات دەبێتەوە)

بەندی 57 (لێرەدا بەندی 32 دوپات دەبێتەوە)

بەندی 58 (لێرەدا بەندی 33 دوپات دەبێتەوە)

بەندی 59   (لێرەدا بەندەکانی 34، 4، 5، 6 دوپات دەبنەوە).

## بەشی چواردەهەم ـ کردە 14ـ

بەندی60:

(بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)

ئەو کەسەی شیاوی ناو خاسو ستایشتی خاسە. چاوتیژەو هەرگیز فریو نادرێت، چونکو خاوەنی دە هەزار دیدەوانە.

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)

بەشی پازدەهەم ـ کردە 15ـ

بەندی 61:

(بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)

ئەو کەسەی هەمیشە ئامادەیە بۆ یاریدەدانی ئیمانداران.

پاسگری هەمیشە بێدارو هۆشیارو دڵرو زیادکەرەوەی ئاوە.

گوێ ڕاگرەو بە دەم هاواری ئەو کەسانەوە دێت کە داوای کۆمەکو یارمەتی لێدەکەن. لەکاتی پێوستدا، باران دەبێرێنآو گیا دەبوژێنآو هەردو زەوی سەوز دەکات.

ئەوە کە بۆ هەر دەڤەرێك یاسایەك دادەنێت، پسپۆڕەو هەرگیز فریو نادرێتو فرە هۆشمەندە، ئەو ئافەریدەو هەڵێبژاردەی ئافەریدەگارە.

بەندی 62:

ئەوە، کە هەرگیز هێزو توانا بەمرۆی پەیمانشکێن نادات.

ئەوە، کە هەرگیز سەروەرێتیو پاداشتی خاس بە پەیمانشکێن نادات.

بەندی 63:

ئەی میترا (مهر)،

ئەتۆ دەتوانی ترسو هەراس بخەیتە نێو دڵی پەیمانشکێنان،

ئەتۆ دەتوانی لەکاتی تورەبوندا، هێزو توانای بازووو مەچەکو پآو بینایی چاو وهێزی بیستنی گوێی پەیمانشکێنان وەربگریتەوە. نەرِمێکی برِەرو نە تیرێکی لەکەمان دەرچو کار لەکەسێك دەکات کە بەبێ رِیا یاریدەی میترا دەدات.

میترا کە دەهەزار دیدەوانی هەیەو بەهێزو توانایەو ئاگای لەهەموو شتێکەو هەرگیز فریو ناخوات.

**(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەبنەوە)**

بەشی شانزدەهەم ـ کردە 16ـ

بەندی 64:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەو کەسەیە کە بۆ بلآوکردنەوەو گەشەپێکردنی ئاینی رِاستی، لەهەموو شوێنێکدا ئامادەیە، فەرِو تیشکی رِوناکیەکەی بەسەر حەوت دەڤەردا تابانو درەخشانە.

بەندی 65:

ئەو کەسەیە لەنێو چالاکاندا چالاکترینە، لەنێو پەیمانداراندا پەیماندارترینە، لەنێو دڵراندا دڵرترینە، لەنێو بەخشەندەکاندا بەخشەندەترینە. شکۆمەندیو مەزنایەتی دەبەخشێت، وەچەی عەگیدو دلاوەر دەبەخشێ بەخێزانەکان، مەرِو مالآت دەبەخشێو ژیانبەخشە. کەسێکە کە بەختەوەریو نیعمەتی رِاستی دەبەخشێت.

بەندی 66:

کەسێکە کە ئیزەدە پاکەکان لەدەوری یەکتر خڕدەکاتەوەو هەموویان یارو یاوەری ئەون، وەك: ئەرت (ئیزەدی راستیو دروستیو دادگەریتی)، پارەندی (ئیزەدی نیعموتو بەرەکەت)، داموئیش ئوپەمەند(ئیزەدیوتەی پیرۆزو نزاکردنو تەندروستی)، فەڕی کەیانیو فرەوەهری پاکدینەکان، ئەو ئەو کەسەیە کە کۆمەڵی خواپەرستو پاکدینەکان بەدەوری یەکتر کۆدەکاتەوە.

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)

## بەشی حەڤدەهەم ـ کردە 17ـ

بەندی 67:

## (بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەوەی کە بەگەردونە (کالیسکە) توندوتیژڕەوە جوانەکەی کە بە شێوەیەکی معنوی دروستکراوە لەدەڤەری (ئەریزەهی) بەرەو دەڤەری خنرس (خوەنیرەپ) دەکشآ، ئەوەی کە لەهێزی زەمانو فەڕ کە ئافەریدەی مەزدانو هێزی سەرکەوتن کە ئافەریدەی ئاهورایە، بەرخوردارە.

بەندی 68:

گەردونەی میترا لەلایەن(ئەرت)ی پلەبەرزەوە ڕادەکێشرێت. ئاینی مەزدا ڕێگەی ئامادەو خۆش کردووە تا ئیزەدی میترا بە تیشکی رۆشناییە معنویو درەخشانو پاکو هۆشیارەکەی کە سێبەری نییە، لەتەك گەردونەکەیدا بەخاسی رێگە ببرێت. ئەسپەکانی میترا لەئاسمانی بەرینو بی بڕینەوە لەهەوادا غاربکەن.

(داموئیش ئوپەمەن) رێگەی بۆ خۆش دەکات. ترسو لەرز دەکەوێتە دڵی هەموو دێوەکان (مەبەست پەیمانشکێنەکانە)و خۆیان دەشارنەوە. درۆزنەکانی (وەرینە)(ناوچەی گێلان) دەکەونە پەلەقاژآ.

بەندی 69:

نەکا خۆمان تووشی شەڕو ململانآ لەتەك میترا (مهر) تورە بکەین. میترا کە دەتوانآ هەزار پلان لەدژمان بەکاربهێنێت، میترا کە خاوەنی دە هەزار دیدەوانە، ئەو میترا بەتوانایەی کە ئاگای لەهەموو شتێکەو فریو نادرێت. (بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرینەوە)

بەشی هەژدەهەم ـ کردە 18ـ

## (بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەوەی کە ئیزەدی (وەرترغنە = بەهرام) {کە نوێنەری سەرکەوتنو زاڵ بونە بەسەر دوژمناندا} کە ئافەریدەی ئاهورایەو هەروەك بڕەکێکی دانتیژ کە بەرگری لەخۆی بکات، دەکەوێتە پێشییەوە، بڕەکێك[50] بە چنگی تیژەوە، بڕەکێك کە بە چەپۆکێك بەرامبەرەکەی لەخاکو خوێندا دەگەوزێنآ، کاتێك کە تورە دەبێ کەس ناتوانآ لّی نیزیك بێتەوە، بڕەکێکی بەهێز بە دەموچاوێکی خالێخالآوی، پێی پۆلآیینو ئەعصابو چنگو کلكو چەناگەی پۆلآیین.

بەندی 71:

ئەوەی کە لەهێرشدا بۆ سەر دوژمن، پێش میترا دەکەوێت، بە عەگیدیو تورەبونێکی پاڵەوانانە، دوژمن لەخاکوخوێندا دەگەوزێنآ، هێشتا گومانی هەیە کە نەوەکو دوژمنەکەی نەکوشتبی، دووبارە لّی دەداتەوەو مێشکی سەریو بڕبڕەی پشتی دەشکێنآ.

بەندی 72:

ئەوسا جەستەی پەیمانشکێن پارچە پارچە دەکاو مێشكو ئێسقانو خوێنی بەسەر زەویدا پەخشو بلآو دەکات.

## (بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرینەوە).

## بەشی نۆزدەهەم ـ کردە 19ـ

بەندی 73:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

کەسێك کە بەدڵو بەگیانو بەبیرێکی پاكو ڕۆحێکی شادەوە هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرزرکردووەو دەبێژێ:

ئەی ئاهورامەزدا، ئەی سپەنتەمینو(بیری خاس)، ئەی ئافەریدەی جیهانی خاکی (مادی)و ئەی پاك.

بەندی 74:

(بەندی 55 دوپات دەبێتەوە)

بەندی 75:

(لێرەدا پەیرەوانی میترا بەسروودەوە دەبێژن):

ئێمە گەرەکمانەو دەمانەوێت کە سەرزەوییەکانت بپارێزینو لەژێر چاودێری تۆدابین. نامانەوێت لەماڵأو منداڵأو گوندو شاروولآتو دەڤەرەکانی تۆ جیاببینەوە. بۆئەوەی تۆ (میترا) بەبێزوی بەهێزو تواناتەوە، ئێمە لەنەیاران بپارێزیتو پاسگرمان بیت.

بەندی 76:

ئەتۆی، پاش ستایشتو نزاکانمان بۆت، داواکارییەکانمان بە ئەنجام دەگەیەنیت، ونەیارانمانو خراپەکاران تەفرو تونا دەکەیت. ئەتۆ بکوژی مرۆی پاك لەناو دەبەیت. ئەتۆ خاوەنی ئەسپی جوانو گەردوونەی جوانو خاسیت.

بەندی 77:

ئەی میترا:

ئێمە داوای یاریدەت لێدەکەین: کە بەدەنگمانەوە بێیت تا(زەور)ێکی فرەو خاست پێشکەش بکەین، بەهۆی ئەم پێشکەشییانەمانەوەو لەژێر سایەی تیشکی ڕووناکییەکانت پەناگایەکی خاس بیت بۆمان، تا لەجێگەیەکی دڵنیاو ئاسودەدا بەخۆشی بەرینە سەر.

بەندی 78:

ئەتۆی کەوڵاتو نیشتەجێگاکان دەپارێزی بە مەرجێك کە ئەوان ئەتۆ کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینیت بەخاسی ناوبەرن، ئەتۆی کەوڵاتو نیشتەجێگاکانی نەیاران خاپور دەکەیت.

ئەز، لێرەدا داوای یارمەتیت لێدەکەم، ئەی میترای بەهێزتوانا، لەهەموو شوێنێکدا سەرکەوتویتو شیاوی ستایشتو نزایتو سەروەری شکۆمەندیت.

## (بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)

بەشی بیستەم ـ کردە 20ـ

بەندی 79:

## (بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)

ئەو کەسەی لەلایەن(رەشەن)ەوە نیشتەجێیەکی پێدرا، ئەو کەسەی کە (رەشەن) بۆئەوەی هەمیشە هاوماڵو هاودەمی بێت، کردییە هاوماڵی خۆی.

بەندی 80:

ئەی میترا(مهر)! ئەتۆ پاسگری خێزانو خێڵی، ئەتۆ چاودێری لەو کەسە دەکەیت کە درۆناکات. ئەتۆ پاسەوانی نەژادو پشتیوانی ئەو کەسانەی کە لەدرۆ بەدورن.

ئەز، لەژێر سایەی سەروەرێکی وەك تۆ، خاسترین هاودەمو هاوماڵی ئافەریدەی ئاهورا وەدەست دێنم. لەبەردەم داوەری ئاهورادا، دەستەی بآ بەڵێنانو پەیمانشکێنان لەبەرامبەریدا سەرشۆڕو شەرمەزار دەبن:

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێتەوە)

## بەشی بیستویەکەم ـ کردە 21ـ

بەندی 81:

بەندەکانی 7و 79 دوپات دەکرینەوە)

بەندی 81:

ئەو کەسەی کە ئاهورامەزدا هەزار جۆرە چالاکی پێبەخشیوە، ودەهەزار چاوی بۆ بینین پێداوە. بەهۆی هێزو توانای ئەم چالاکیانەو ئەم چاوانەیە کە دەتوانێت هەموو ئەو کەسانە ببینێت کە پەیمانشکێنی بکەن. بەهۆی هێزو توانای ئەم چالاکیانەو ئەم چاوانەیە کە میترا (مهر) هەرگیز فریو نادرێت. ئەو کەسەی کە دەهەزار دیدەوانی هەیە.

**(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)**

## بەشی بیستو دوهەم ـ کردە 22

بەندی 83:

**(بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)**

ئەو کەسەی کە، شالیاریوڵات لەکاتی پێویستیداو بەراستی دەستی نیازی، بۆ بەرزدەکاتەوەو داوای هاریکاری لێدەکات.

ئەو کەسەی کە سەرۆکی خێڵاً لەکاتی پێویستیداو بەڕاستی دەستی نیازی بۆ بەرز دەکاتەوەو داوای هاریکاری لێدەکات.

بەندی 84:

ئەو کەسەی کە کوێخای گوند لەکاتی پێویستیداو بەڕاستی دەستی نیازی بۆ بەرزدەکاتەوەو داوای هاریکاری لێدەکات. ئەو کەسەی کە گەورەی مالأ لەکاتی پێویستیداو بەڕاستی دەستی نیازی بۆ بەرزدەکاتەوەو داوای هاریکاری لێدەکات.

لەهەرکاتێكو شوێنێکدا کە دووکەس بەلێێنو پەیمانێك ببەستن، دەستیان بەرزدەکەنەوەو ناوی دەبەن.

لەهەر شوێنکدا مافي مافخوراوێك زەوت بکرێت، دەستی بەرز دەکاتەوەو داوای یارمەتی لەمیترا دەکات.

بەندی 85:

به بەرزبونەوەی نالەو گلەیی گلەمەندێك، دەنگی لەهەموو جیهاندا دەزرنگێتەوەو هەر حەوت دەڤەر دەوروژێنآو دەگاتە گوێی میترا.

بەندی 86:

هەروەها، هەرکاتێك ئاژەلێك لەڕان بەجآ بمێنآ یاخود بڕفێنرێت، دەنگی نالەی کە داوای یارمەتی دەکات، دەگاتە میترا.

بەندی 87:

ئەو کەسەی کە میترا(مهر)ی خاوەنی دەشتی پانوبەرین، لێی ڕازییە، بەگورجی بەدەنگیەوە دەگاتو یارمەتی دەدات. بەلآم ئەو کەسەی کە میترای خاوەنی دەشتی پانوبەرین لێی ناڕازیو زویرە، مالأو گوندو شاروولآتیوێران دەکاو شالیاری لێدەسێنێتەوە.

**(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)**

بەشی بیستو سێهەم ـ کردە 23ـ بەندی 88:

**(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)**

(هوم) کە هێزوتوانا دەبەخشێو دەرمانسازە، ئەو فەرمانڕەوا شۆخو شەنگەی کە دووچاوی زەردی زێرینی هەیەو لەسەر قوڵەی (هۆگەر) کە بڵێندترین دوندی کێوی(هەرەئیتی)یە(هەرە بەرزە = ئەلبورز) (بەرسەم)و(زەور)ووتەی بێخەوش، وەك پێشکەشی بۆ میترا هاورد.

بەندی 89:

ئەوە کە(مەبەست هومە)، ئاهورامەزدای پاك لەڕیزی (زەوت)[51]ی داناوە، تا بەدەنگی بەرز (یەسنا)بچڕێنآو ستایشتی میترا بکات. ئەو، هەروەك (زەوت)ە کەزۆر بەچالاکیەوە ستایشتی کردو بەدەنگی بەرز یەسنای چراندو ئاهورامەزداو ئەمشاسپەندەکانی ستایشت کرد، ودەنگی خۆی گەیاندە ڕوناهی جیهانی سەرو ئەو دەنگوئاوازە هەموو جیهانی گرتەوەو بەهەر حەوت دەڤەرەکەدا بلآوبۆوە.

بەندی 90:

ئەو کەسەی هەروەك یەکەمین(هاوەنەن)[52]، کە شیلەی (هوم)ی گرتۆتەوە کە هەروەك هەسارەی درەخشانە، ولەسەر کێوی(هەرەئیتی) پێشکەشی کرد. ئاهورامەزدا، ئافەرینو دەستخۆشی کرد لەو شیلە جوانە، ئەمشاسپەندەکانیش دەستخۆشیان کرد، (خۆر)یش لەدوورەوە مژدەی ستایشتی پێدا.

بەندی 91:

سڵاو و ڕێز بۆتۆ ئەی میترا(مهر)، ئەی خاوەنی دەشتی پانوبەرین، ئەی میترا، ئەی خاوەنی هەزار گوێو دە هەزار چاو بۆ بیستنو دیتن، تۆیت شیاوی ستایشت لەنێو دڵو ماڵی خەڵکیدا. خۆزگەم بەو کەسەی کە بەڕاستیو بەدڵەوە ستایشت دەکا:

دارو بەرسەمو شیرو(هاوەن) بەدەستەوە وڵاخدەگرێ[53]، بەدەستی خاوێنو پاك، بەهاوەنی پاکو شۆراو، بە بەرسەمێك[54] کە لەتنیشت (هوم)ی ئامادەکراو دانراوە، لەتەك سروودی ئەهونە وەئیریە.

بەندی 92:

ئاهورامەزدای پاكو وەهومەنو ئوردیبەهەشتو شەهریوەرو سپەندارمەدو خردارو ئەمرداد، ئەم ئاینەیان بەراستو دروست دانا، ئاهورامەزدای بیرخاس، سەروەرێتی معنویو مادی خەڵكی سپاردە دەست میترا (مهر) بۆئەوەی لەهەردوو جیهاندا پالپشتو پاسگری خەڵک بێت، ولەنێو هەموو ئافەریدەكاندا مرۆ بە خاسترین دروستكراو بناسێنێت.

بەندی 93:

ئەی میترا(مهر)ی خاوەنی دەشتی پانوبەرین، لەهەردوو جیهاندا دالێدەمان بدە، لەژیانی جیهانی مادیو جیهانی مەعنەویدا. لەزیانی درۆزنانو بەدكاران، لەدێوی رِكو كینەو تورەیی، لەدەستەو تاقمی لەشكری درۆزنان كە ئالآی خوێناوی یان بەرز كردۆتەوە، لەهێرشی رِكو كینە لەتەكویزاتو (خوای مەرگـو هاوكاری دێوی رِكو كینە) بەرپایدەكەن.

بەندی 94:

ئەی میترا(مهر)ی خاوەنی دەشتی پانوبەرین، هێزو توانا بە ئەسپەكانمان بدە، وتەندروستیو لەش ساغیمان پێببەخشە، توانای ئەوەمان پآ بدە كە لەدوورەوە نەیارەكانمان بناسین، ودژیان بەرگری لەخۆمان بكەین. بەدكردارانو خراپەكارانو درۆزنەكان لەناو بەرین.

(بەندەكانی 4، 5، 6 دوپات دەكرێنەوە)

## بەشی بیستوچوارهەم ـ كردە 24-

بەندی 95:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

میترا(مهر) پاش ئەوەی خۆر ئاوادەبێت، هەڵێدێتو لەئاسمانەوە دەرِوانێتە سەر زەوی، وهەرچیەك لەنێوان زەویو ئاسماندایە، چاودێرییان لێدەكات.

بەندی 96:

گورزێکی بەدەستەوەیە کە سەد تێغو سەد گرێی پێوەیەو هەموی لەزێڕی نایابە، چەکێکە کە دارای سەرکەوتنو خۆڕاگرتنەو فرە بەهێزە.

بەندی 97:

ئەهریمەنی ستەمکارو تاوانبار، لەترسدا دەکەوێتە لەرزەو هەراسان دەبێ، دێوی ڕِکو کینەو تورِەیی بەدکردار تەڵەکەباز، لەبەرامبەریدا دەکەوێتە دڵە لەرزە، (بوش یاستە)ی قۆڵأ درێژی بەدکار(دێوی خەوی قورسو ئەهریمەنییە)، لەبەرامبەریدا دەکەوێتە لەرز، وگشت درۆزنانو دێوە بەچاو نەبینراوەکان لەبەرامبەریدا دەکەونە ترسو هەراسان دەبن.

بەندی 98:

نەکا، ئێمە خۆمان گیرۆدەی ململانێی میترای تورِە بکەین کە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە.

ئەی میترای خاوەنی دەشتی پانوبەرین: نەکا لێمان زویرو تورِە بیتو گورزمان تێبگریت: ئەتۆ، کە لەبەهێزترینو چالاکترینو توندوتیژترینو سەرکەوتوترین ئیزەدەکانی کە لەسەر ڕِوی ئەم زەویە دەردەکەون.

میترا خاوەنی دەشتی پانوبەرینە:

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرینەوە)

## بەشی بیستوپێنجهەم ـ کردە 25ـ

بەندی 99:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەو کەسەی کە هەموو درۆزنانو دێوە نەیارەکان لەبەرامبەریدا پەرێشانو هەراسان دەبن. ئەو سەروەرەیوڵآت، میترا، خاوەنی دەشتی پانوبەرین، لەلای ڕاستی ئەم زەوییە خڕو پانوبەرینە، وەك شۆڕە سوارێك دەردەکەوێت.

بەندی 100:

(سروش)ی خاسو پیرۆز لەلای ڕاستییەوەو لەلای چەپییەوە(ڕەشەن)ی دڵرو باڵآبەرز، بەسواری ئەسپەوە غار دەکەن. لەهەموو لایەکیانەوە، فریشتەو ئیزەدەکانی ئاو وگیاکانو(فرەوەهری) چاکانو پیاوخاسان دەورەیان داوە.

بەندی 101:

میترای دڵرو شکۆمەند، خاسترین چەکەمەنی، تیری تیژ کە بەپەڕی هەڵێو ڕازاونەتەوە، بەسەر هاوکارەکانی دابەشدەکات.

هەرکە میتراو هاورێکانی بەغار دەگەنە ناوچەی پەیمانشکێنەکان، بەگورز دەکەونە گیانیانو پەلاماریان دەدەن، ترسو هەراس دەخەنە نێو دڵیانەوە، نەیارانو درۆزنانو ئەسپەکانیان خەلتانی خوێن دەکەن.

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)

## بەشی بیستو شەشەم ـ کردە 26ـ

بەندی 102:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەو سوراچاکەی کە سواری ئەسپێکی سپییە، ڕمێکی درێژی سەرتیژو تیروکەوانی بەدەستەوەیە، ئەو پاڵەوانە دڵرو چالاکە.

بەندی 103:

کەسێك کە ئاهورا هەڵبیژاردووە بۆ پاسگریو پاسەوانیو بەختەوەری خەڵک. ئەو کەسەی پاسگرو دیدەوانو پاسەوانی بەختەوەری هەموو خەڵکە. ئەو کەسەی کە هەرگیز خەو ناچێتە چاویو هەمیشە چاودێری ئافەریدەکانی مەزدا دەکات.

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)

## بەشی بیستو حەوتەم ـ کردە 27-

بەندی 104:

(بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)

ئەو کەسەی کە بەمەچەكو بازوە بەهێزو درێژەکانییەوە، پەیمانشکێنان بەسزای کرداریان دەگەیەنێتووردوخاشیان دەکات، ئەگەرچی لەرۆژهەلآتی هیندستان یا لەرۆژئاوی جیهان، یا لەسەر رۆخی رووباری (رەنگهە) یا لەنێو ناخی زەویدابن.

بەندی 105:

هەروەها میترا بە مەچەكو بازووە درێژەکانییەوە، ئەو لادەرانەی کە لەرِێی رِاست لایانداوەو ئەو دڵرِەشانەی کە لای خۆیانەوەوا بیردەکەنەوە کە: میترا گوفتارە درۆکانیانو کردارە ناشیرینەکانیان نابیستآو نابینآ، گرفتار دەکاو سزایان دەدات.

بەندی 106:

ئەز، لەدەروونی خۆمداوابیردەکەمەوە:

لەهەموو جیهاندا کەسێك نیە بتوانێت بە ئەندازەی بیری خاسی میترای معنوی، خراپ بیربکاتەوە. لەهەموو جیهاندا کەسێك نییە بتوانێت بە ئەندازەی گوفتاری خاسی میترای معنوی، وتەی خراپی هەبێت. لەهەموو جیهاندا کەسێك نییە کە بتوانێت بەئەندازەی کرداری خاسی میترای معنوی، کرداری خراپ بنوێنآ.

بەندی 107:

لەهەموو جیهاندا کەسێك نییە بە ئەندازەی میترای معنوی بەهرەمەندبێت لەهۆشی سرووشتی خواپێداو. لەهەموو جیهاندا کەسێك نییە بە ئەندازەی میترای معنوی گوێ سوك، هێزو توانای بیستنی هەبێت. هەرکەسێك درۆبکات، میترا دەبینێتو هەنگاو هەڵێدێنێت. میترای توانا، بەرەو پێش دەرواتو بەچاوودیدی ڕۆشەنو جوانی خۆیەوە دەڕوانێتە ئەم سەر تائەو سەری جیهان:

بەندی 108:

ـ چ کەسێك ستایشتم دەکا؟

ـ کـآیە کە درۆ دەکات؟

ـ چ کەسێك بەخاسی ناوم دەبێو ستایشتم دەکات؟

ـ کـآیە ئەو کەسەی کە بەخراپە ناوم دەبێت؟

ـ دەبێ بە کێهامەزنایەتیو شکۆمەندیو تەندروستی ببەخشم؟ ئەز، توانای ئەنجامدانی ئەم کارەم هەیە.

ـ دەبێ بە کـآ تواناییو دارایيو ئاسایش ببەخشم؟ ئەز توانای ئەنجامدانی ئەم کارەم هەیە.

ـ دەبێ بۆ کـآ نەوەو وەچەی شایستە پەروەردەبکەم؟

بەندی 109:

دەبێ بۆکـآ ـ بآ ئەوەی خۆی بیری لێکردبێتەوە ـ شالیارێکی تواناو چەکوجبەخانەو لەشکرێکی زۆر ببەخشم؟

شالیاری پاتشایەکی بەتوانا کە نەیارەکانی سەرکوت بکات،

پاتشایەکی دڵرو سەرکوتوو نەبەز، هەرکە تورەبێتو فەرمان دەربکات، فەرمانەکەی یەکسەر ئەنجام بدرێتو بەم شێوەیە رۆحو رەوانی ماندوی میترا ئارام بکاتو کەیفخۆشی بکات.

بەندی 110:

ـ دەبێ کاَ گیرودەی نەخۆشیو مردن بکەم؟

ـ دەبێ کاَ گرفتاری ئەشکەنجەی هەژاریو نەبوون بکەم؟ ئەز، توانای ئەنجامدانی ئەم کارەم هەیە.

ـ نەوەو وەچەی کێها دەبێ دوچاری مەرگ بکەم؟

بەندی 111:

ــ لەکام کەس ـ باَ ئەوەی خۆی بیری لێکردبێتەوە ــ دەبێ شالیاری تواناو چەکو جبەخانەو لەشکرێکی زۆر وەربگرمەوە؟

ــ شالیاري پاتشایەکی توانا کە نەیارەکانی سەرکوت بکات، پاشایەکی سەرکەوتو ودڵرو نەبەز، هەرکە تورەبێتو فەرمان دەربکات، فەرمانەکەی یەکسەر ئەنجام بدرێت، وبەم شێوەیە رۆحو رەوانی شادی میترا غەمگین بکات.

(ئیدی لێرەدا پرسیارەکانی میترا کۆتایی دێت)

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەبنەوە)

بەشی بیستو هەشتەم ـ کردە 28ـ

بەندی 112:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەو کەسەی قەڵخانی زیویو زرێبزێرینی لەبەردایەو بەخێرایی گالیسکەکەی لێدەخورِاو گەردوخۆل دەکات. ئەو سەروەرە بەهێزو تواناو دڵرو پاڵەوانە.

ئەو رێگایانەی کە میترا دەیپێوا بۆ دیدارو سەردان لەو دەڤەرانەی کە راستبێژانو خاوەن پەیمانەکانی تێدایە، رۆشەنو رووناکەو دەشتی پانوبەرین دەوری داوەو مرۆڤـو ئاژەڵ بەئازدایو خۆشییەوە تیایدا دەژین.

بەندی 113:

میتراو ئاهورا، ئەو دوو نەمرانە، هەمیشە دەگەنە فریای بێدەسەڵاتو بێدەرامەتان. میترا، بەخێرایی‌و بە گالیسکەکەیەوە دەگاتە سەر ئەو کەسانەی بە بآ دڵی‌و فریوەوە (زەور)یان پێشکەش کردووە، هەموویان دەکوژآو لەناویان دەبێت.

بەندی 114:

(بەندەکانی (94، 4، 5، 6 دوپات دەکرینەوە).

بەشی بیستو نۆهەم ـ کردە 29-

بەندی 115:

(بەندی 7 دوپات دەبیتەوە)

ئەی میترا، ئەی خاوەنی دەشتی پانوبەرین، تۆ ئەی سەروەرێك کە پەیوەندیت هەیە لەتەك گەورەی ماڵو گەورەو کوێخای گوندو گەورەی ناوچەو شالیارەکانو (زەرتشتوم) (بەمانای گەورەترین پێشەوای ئاینی زەردەشتی یا موبدموبدان).

بەندی 116:

نرخو بایەخی بەڵێنو پەیمان لەنێوان دوو هاوسەر، بیستە. لەنێوان دوو هاوکار سییە، لەنێوان دووکەس لەخێزانێکدا (خزمو کەسوکار) چلە، لەنێوان دوو دراوسآ پەنجایە، لەنێوان دوو پێشەوای ئاینی شەستە، لەنێوان مامۆستاو قوتابی هەفتایە، لەنێوان زاواو خەزور هەشتایە، لەنێوان دوو برادا نەوەدە.

بەندی 117:

نرخو بایەخی بەڵێینو پەیمان لەنێوان دایکو باوکو زارۆڵەکاندا سەدە، ولەنێوان دووولآتدا (یا دوو هاوولآتی یا دوو نەتەوە) هەزارەو لەنێوان پەیرەوانی ئاینی خواپەرستی (مەزداپەرستی) دەهەزارە.

میترا (مهر) ئەم جۆرە سەرکەوتنانەی هەیەو دەیبینێت.

بەندی 118:

تا ئەوکاتەی کە (خۆر) لەسەر لوتکەی بلندی کێوی(هەرائیتی) هەڵێبێتو ئاوابێت، بەو ستایشتانەی ئەنجامم داوەو بە ئەنجامی دەگەیەنم، خۆم لەبارەگای میترا (مهر) نیزیك دەکەمەوە.

ئەی سپیتمان!

بەم شێوەیەو بۆ خۆشحاڵ نەبوونی ئەهریمەنی بەدکردار، ئەز بەهۆی ستایشتێك کە کردومەو دەیکەم، دەمەوێت لەبارەگای میترا نیزیك ببمەوە.

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرینەوە)

## بەشی سیهەم ـ کردە 30ـ بەندی 119:

(بەندی 7 دوپات دەکرینەوە)

ئەی سپیتمان!

ستایشتی میترا (مهر)بکە (بانگهێشتی ئاهورامەزدایە)، بە پەیرەوەکانت ڕابسپێرە کە ئاژەڵیووردو درشتو پەلەوەرانی شاپەڕداری پێشکەش بکەن.

بەندی 120:

چونکو، میترا (مهر) پاسەوانو یاوەری هەموو مەزدا پەرستانە. (هەوم)ی پێشکەشکراو دەبێ (زەوت) پێکەشی بارەگای میترای بکات.

مرۆی خاوەن باوەڕ دەتوانێت لە(زەور)ێك كە بەشێوەی ئاینی دروستكراوە، بخواتەوە، ئەو كارانە ئەنجام بدات كە میترای خاوەن، دەشتی پانوبەرین كە مرۆی پاكدین ستایشتی دەكات، كەیفخۆش بێتو رۆحی شادو ئارام بێت.

بەندی 121:

زەردەشت لەئاهورامەزدای پرسی:

چلۆن مرۆی پاكدین دەبێ (زەور)ێك كە بەشێوەو دەستوری ئاینی دروستكراوە، بەكاربهێنێتو بیخواتەوە، وكارێك بكات كە میترای خاوەنی دەشتی پانوبەرین(كە مرۆی پاكدین ستایشتی دەكات) كەیفخۆش بێتو رۆحی شادو ئارام بێت؟

بەندی 122:

ئەوسا ئاهورامەزدا گوتی:

پێویستە بۆ ماوەی سآ شەوو رۆژ لەشی خۆیان بشۆنو خاوێنی بكەن، وبۆ پاككردنەوەی گوناهەكانیان سآ قامچی (تازیانە)لەخۆیان بدەن.

لەبۆ ستایشتكردنی میترا (مهر) كە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە، دەبێ دوو شەوو رۆژ لەشی خۆیان بشۆنو خاوێنی بكەنو بۆ پاككردنەوەی گوناهەكانیان بیست قامچی لەخۆیان بدەن. كەسێك كە شیاوی خوێندنەوەی سروودی (ستوەت یەسنا)و (ڤیسپرد) نەبێت، نابی بۆ ستایشتو نیانیشی میترای خاوەنی دەشتی پانو بەرین (زەور) بخواتەوە.

(بەندەكانی 4، 5، 6 دوپات دەكرینەوە)

## بەشی سیویەك ـ كردە 31ـ

بەندی 123:

(بەندی 7 دوپات دەكرێتەوە)

ئەو کەسەی کە ئاهورامەزا لە (گرزەمان)[55]ی درەخشاندا ستایشتی کرد.

بەندی 124:

قۆڵأو بازوی میترای(مهر) خاوەنی دەشتی پانوبەرین کە بۆ چاودێریو پاسەوانی پاکدینەکان کراوەیە، لەگرزەمانی درەخشانەوە دێتەخوار. میترا، ئەو کەسەی کە گالیسکەیەکی یەکجار جوانی هەیە کە بەهەمە جۆرە خشلأو زێرِ رِازاوەتەوە.

بەندی 125:

چوار ئەسپی سپی ئەم گالیسکەیە رِادەکێشن، خواردنو خواردنەوەی ئەم ئەسپانە لەئاخورِو ئاوخۆرەی معنوییەوەیە. سمەکانی پێشەوەیان لەزێرِو سمەکانی دواوەیان لەزیون. لغاوێكو ئاوخۆرِییەکی جوان ئەسپەکانی پێکەوە بەستووە.

بەندی 126:

لەلای رِاستی میتراوە، (رەشەن)ی داوەری پاك ــ ئەو کەسەی کە خاسترین پشتیوانە ـ بەسەر ئەسپەوە غاردەکا، ولەلای چەپیەوە چیستا (چیستی) ــ ئیزەدی رێگەوبانو بیناییو چاوتیژیو زانستەو بە مانای مادیو معنوییەوە ــ ی دروستکردارو (ئۆپمەن) غاردەکەن.

بەندی 127:

(داموئیش ئۆپمەن)ی دڵرو سوارچاک، هەروەك برەکێکی دان تیژ کە بەرگری لەخۆی بکات دەکەوێـە پێشەوە، برِەکێك بە چنگی تیژەوە، برِەکێك کە بە چەپۆکێك بەرامبەرەکەی لەخاکو خوێندا دەگەوزێنآ. کاتێك کە تورِەدەبێ، کەس ناتوانآ لٚی نیزیك بیتەوە.

برِەکێکی بەهێزو دەموچاوێکی خالێخالآوی، برِەکێکی دڵرو چالاك. لەپشت سەریەوە (میترا)و(ئازەر)و (فەرِ)ی کەیانی بەسەر ئەسپەوە غاردەکەن.

بەندی 128:

لەنێو گالیسکەکەی خاوەنی دەشتی پانوبەرین، هەزار کەمانی خۆشدەستی تێدایە. تیری ئەم کەمانانە بەهۆی هێزی بیرکردنەوەو هۆشەوە، بەخێراییەکی لەئەندازە بەدەر، بەرەو سەرو لەشی دێوەکان دەهاوێژرێت.

بەندی 129:

لەنێو گالیسکەکەی میترای خاوەن دەشتی پانوبەرین، هەزار تیر کە بە پەڕی هەڵێو ڕازاونەتەوە، فرەیەك لەم تیرانە لەئاستی دروستکراون. ئەم تیرانە بەهۆی هێزی بیرکردنەوەو هۆشەوە بەخێراییەکی لەئەندازە بەدەر بەرەو سەرو لەشی دێوەکان دەهاوێژرێن.

بەندی 130:

لەنێو گالیسکەکەی میترای خاوەنی دەشتی پانوبەرین، هەزار ڕمی تیژی خۆشدەست هەیە کە بەهۆی هێزی بیرکردنەوەو هۆشەوە، بەخێراییەکی لەئەندازە بەدەر بەرەو سەرو لەشی دێوەکان دەهاوێژرێن. لەنێو گالیسکەکەی میترای خاوەن دەشتی پانوبەرین، هەزار تەورزینی دوو تێغەی پۆلایی خۆشدەوست هەیە کە بەهۆی هێزی بیرکرنەوەو هۆشەوە، بەخێراییەکی لەئەندازە بەدەر بەرەو لەشی دێوەکان دەهاوێژرێن.

بەندی 131:

لەنێو گالیسکەکەی میترای خاوەن دەشتی پانوبەرین، هەزار خەنجەری دوو سەرەی خۆشدەست هەیە کە بەهۆی هێزی بیرکردنەوەو هۆشەوە، بەخێراییەکی لەئەندازەبەدەر بەرەو لەشی دێوەکان دەهاوێژرێن. لەنێو گالیسکەکەی میترای خاوەن دەشتی پانوبەرین، هەزار گورزی ئاسنی خۆشدەست هەیە کە بەهۆی هێزی بیرکردنەوەو هۆشەوە، بەخێراییەکی لەئەندازە بەدەر بەرەو سەرو لەشی دێوەکان دەهاوێژرێن.

بەندی 132:

لەنێو گالیسکەکەی میترای خاوەنی دەشتی پانوبەرین، گورزێکی جوانی خۆشدەست هەیە کە سەد تێغەو سەد گرێی هەیە، میترا ئەم گورزە دەگرێتە نەیارە درۆزنەکانو دەیانکوژێت. ئەم

گورزە زەرد ڕەنگەو لەزێر دروستکراوە، بەهێزترین چەکەمە نییە کە بەهۆی هێزی بیرکردنەوەو هۆشەوە بەرەو سەرو لەشی دێوەکان دەهاوێژرێت.

بەندی 133:

میترای (مهر) خاوەن دەشتی پانوبەرین پاش ئەوەی بەو چەکانە، هەموو دێوەکان دەکوژێتو پەیمانشکێنەکان تەفروتونا دەکات، ئەوسا بەسەر ئاسمانی دەڤەری (ئەریزەهی)و (سەوەهی) تێدەپەڕێتو بەسەر ئاسمانی (فرە دەزەفشو) و(ڤێدەزەفشو)و بەسەر ئاسمانی (ڤاوروبەریشتی)و (ڤاوروجەریشتی)و بەسەر ئاسمانی دەڤەری درەخشانی (خنرس) تێدەپەڕێت. (واتە بەسەر ئاسمانی هەر حەوت دەڤەرەکەی کە لەژێر چاودێرێتیدایە دەگەریت)

بەندی 134:

بەڕاستی ئەهریمەنی بەدکردار دەکەوێتە ترسو لەرزو هەراسان دەبێت. بەڕاستی دێوی تورەییو تەڵەکەبازو بیرخراپ دەکەوێتە ترسو لەرزو هەراسان دەبێت،

بەڕاستی (بوش یاستە)ی قۆلأ درێژی بەدکار دەکەوێتە ترسو لەرزو هەراسان دەبێت.

بەڕاستی گشت دێوە بە چاو نەبینراوەکانو درۆپەرستان دەکەونە ترسو لەرزو هەراسان دەبن.

بەندی 135:

(بەندەکانی 98، 4، 5، 6 دوپات دەبنەوە)

## بەشی سیو دووهەم ــ کردە 32ــ

بەندی 136:

(بەندی 7 دوپات دەبێتەوە)

ئەسپی سپی کالیسکەی میترا ڕادەکێشن، ئەو کالیسکەیەی کە بەهۆی چەرخی زێڕینەوە دەچەرخێنو (زەور)ی پێشکەشی دەگەیەننە مەڵبەندی ئاسمانییەوە.

بەندی 137:

ئاهورامەزدا بە زەردەشتی گوت:

خۆزگەم بەو پیاوە ئاینییەی (مەبەست زەوتە کە یەکێکە لەموبدەکان کە لەنێو ئاتەشگادا لەکاتی نیایشدا مەراسیمە مەزهەبیەکان ئەنجام دەدات) کە بەدروستی ستایشتی میترا دەکات، میترا یەکراست دەچێتە نێو ماڵی ئەو کەسەو ئارەزووەکانی بەدی دێنێت.

بەندی 138:

ئاهورامەزدا دەربارەی ئەو کەسەی (زەوت)ێکی نا ئاگا هەڵێدەبژێرێت بۆ ئەنجامدانی مەراسیم، بە زەردەشت دەبێژێ:

ـ ئەی زەردەشتی پاك، خۆزگەم بەو کەسە نەبێت کە ئەم کارە دەکات.

بەندی 139:

ئەو کەسەی بەچاوی سوکەوە بڕوانێتە مەزداو ئەمشاسپەندەکانو میترای (مهر) خاوەنی دەشتی پانوبەرینو (دات)[56] و (رەشەن)[57] و (ئەرشتاد)، ئاهورامەزداو ئەمشاسپەندەکانو میترای خاوەنی دەشتی پانوبەرین کەیفخۆش ناکەنو بە ئارەزووەکانیان ناگەن.

(بەندەکانی 4، 5، 6، دوپات دەکرێتەوە)

بەشی سیو سێهەم ـ کردە 33ـ

بەندی 140:

(بەندی 7 دوپات دەکرێتەوە)

ئەی سپیتمان!

ئەز، ستایشتی میترا (مهر) دەکەم، ئەو کەسەی کە یەکەمین ئافەریدەی خاس‌و دڵری معنوییە، ئەو کەسەی فرە میهرەبان‌و بێهاوتایە، ئەو دلاوەرەی کە پلەو پایەیەکی بەرزو بەنرخی هەیە، ئەو پاڵەوانە جەنگاوەرە ستایشت دەکەم.

بەندی 141:

ئەو کەسێکە کە هەمیشە خاسترین‌و بەهێزترین چەکی خۆشدەستی پێیە. هەرگیز فریو نادرێت، بەهێزترین‌و دڵرترینی دڵرانە، داناترین دانایانە. ئەو سەرکەوتووەی کە (فەڕ)ی ئیزەدی هەیە، ئەو کە هەزار گوێ‌و دەهەزار چاوو دەهەزار زێرەڤانی هەیە. ئەو میترای (مهر) بەهێزو توانای دانا فریو نەدراوە.

(بەندەکانی 4، 5، 6 دوپات دەکرێنەوە)

بەشی سی‌و چوارهەم ــ کردە 34 ــ

بەندی 142:

(بەندی 7 دوبارە دەبێتەوە)

میترا، ئەو ئیزەدە خاس کردارەی کە ئەو هەموو شتە جۆراوجۆرانەی کە بیری خاس لەبووندا (سپەنتەمینو) ئافراندوویەتی، سەر لەبەیانیان زوو، لەتەك دەرکەوتنی خۆیدا، پێشانی دەداو ئاشکرای دەکات‌و پەردەی لەسەر هەڵێدەماڵی.

بەندی 143:

سیماو روخساری هەروەك هەسارەی (تیشتەر) دەدرەوشێتەوە.

ئەی سپیتمان!

کالیسکەکەی میترا، لەلایەن جوانترین ئافەریدەکانم کە هەرگیز لەڕێی ڕاست لانادەن، دەچەرخێنن.

ئەز، ئەو كاليسكەيە ستايشت دەكەم كە سپەنتەمينو ئافراندی، ئەو كاليسكە معنوييەی كە بەزێوەری هەسارەكان ڕازاوەتەوە.

بەشی سیو پێنجهەم ـ كردە 35ـ

بەندی 144:

(بەندی 7 دوپات دەكرينەوە)

ستايشت دەكەين ئەو ميترايەی كە لەدەوروبەریولآتدايە، ستايشت دەكەين ئەو ميترايەی لەنێوولآتدايە، ئەو ميترايەی لەنێوولآتدايە ستايشت دەكەين، ئەو ميترايەی كە لەسەروولآتدايە ستايشت دەكەين، ستايشت دەكەين ئەو ميترايەی لەپشتو لەپێشولآتدايە.

(واتە لەهەرچوار لایولآتدايە)

بەندی 145:

ميتراو ئاهورای مەزنو نەمرو پيرۆز ستايشت دەكەين، هەسارەكانو مانگو خۆرو ميترا كە سەروەری هەمووولاتە، لەبەرامبەر (بەرسەم) دا ستايشت دەكەين.

(بەندەكانی 4، 5، 6 دوپات دەبيتەوە)

بەندی 146:

سڵاو دەنێرين بۆ ميترای خاوەن دەشتی پانوبەرينو بۆ (رام) بەخشەندەی زەویو زاری بە پيتو بەرەكەت.

ئەشم وەهو ـ ڕاستی باشترين نيعمەتو مايەی بەختياريیە. كەسێك بەختەوەرە كە باشترين ئارەزووی، ڕاستی بێت.

كەسێك كە ستايشتت بكات، تۆ فەڕو ڕۆشنايی، تەندروستی، ژيانو سەركەوتنو دارايیو خۆشی پێببەخشە، مالأو منداڵی شياوی پێببەخشە، تەمەنی درێژو بەهەشتو ڕووناهی هەميشەيی پێببەخشە، ئەشم وەهو.

## 3 ـ ڤیسپەرد Visparad

بەشێکی دیکەیە لەکتێبی ئاوێستا، ئەم بەشە لەڕوی شێوەی نووسینو دارشتنو بابەتەوە فرە لە(یەسنا)وە نیزیکە، وپێکهاتووە لەسروودی کورت دەربارەی ستایشتی هەموو ئافەریدە خاسو پاکەکان.

ڤیسپەرد لەئاوێستاداوشەیەکە لەدوو بەش پێکهاتووە:

ڤیسپە Vispaو رەتەڤو Ratav (رەد Rad) بەشی یەکەمی بە مانای (هەموو، گشت)ە، بەشی دوهەمی (رەتەڤۆ Ratavo) یاخود (رەتو Ratu) کە بووە بە(رەد Rad) بەمانای مەزنو گەورەو سەرەوەرە یاخود بەمانای پێشەوای معنویە. ماناکەی بەسەریەکەوە دەبێتە (هەموو گەورەو سەروەرەکان). هەڵبژاردنی ئەم ناوە بۆ بەشێك لەکتێبی ئاوێستا دەگەرێتەوە سەر بابەتی ئەم بەشە کە هەروەکو گوتمان بریتیە لەستایشتو ئافەرینکردنی هەموو ئافەریدە خاسەکانی ئاهورامەزدا.

لەئاوێستادا چەند جارێك ئەم دووشەیەی (ئاهو Ahuو رەتو Ratu) پێکەوە هاتون. ئاهو بەمانای گەورەو مەزنو سەروەرو فەرمانرەوایە، یاخود بێژین پێشەوای جیهانیە، کەوایە لەراستیدا لەڕوی زەمینەی بیری ڕامیاری ـ ئاینی، لەئاوێستادا ئەم دووشەیە کارابیەکی یەکجار بەر فراوانی هەیەو مانای جۆراوجۆر دەگەیەنێت. دەورانێك لەفەرمانرەوایەتی یا شێوەیەك لەجۆری حوکمرانی دادەرێژآ کە فەرمانرەوایەتی لەجیهانی مادیدا لەتەك پێشەوایەتیو رابەرایەتی ئاینی، هەردوکیان دەبوایە بەدەست یەك کەسەوەبێت. واتە، پاتشا یا سەرۆكو فەرمانرەوای رامیاری خێڵیك یا کۆمەڵگایەك لەهەمان کاتدا پێشەوای رۆحانی ئەو کۆمەڵگایەش بووە. لەئاوێستادا، برِی جار دەبینین کە ئەم دوو (عنوێنە) هەم بۆ ئاهورامەزدا هاتووەو هەم بۆ زەردەشت. لەیەسنا هات 27 بەندی 1 دەبینین کە ئاهورامەزدا هەم (ئاهو)و هەم (رەتو)ە، واتە ئاهورامەزدا تەنیا ئەوە نییە کە خەڵک بیری لێدەکەنەوە، واتە تەنیا لەڕوی رۆحانیەتو نێرەری پەیامی ئاینی نییە، بەڵکو رێنمایی کۆمەڵگاو خەڵکو هەموو مرۆڤایەتیش دەکات لەشێوەی ڕامیاریو فەرمانرەوایەتییەوە کەوایە، لەڕوی هەر ئەم راستییەوەیە کە پەیامبەرەکەشی هەم (ئاهو). وهەم (رەتو)ەوکۆمەڵگا لەدیدی روحانیەتو معنویەتو لەشێوەی رامیاری ـ کۆمەلآیەتیش رابەری دەکات.

لەیەسنا 27/1و فەروەردین یەشت بەندەکانی 91و 152، ئاهورامەزدا بە زەردەشت دەبێژیّ: (تۆ لەبۆ خەڵکی ئەم جیهانە هەم ئاهوبەو هەم رەتو).

{هاشم رچي) لەکتێبی (اوستا، سرودهای زردشت)ل 27 دەبێژێ: (ئەوەی کە سەرنج ڕادەکێشآ ئەوەیە کە لەکاتێکدا ئەم دوو عنوێنە، پێکەوە دێن،وشەی (ئاهو) لەپێش(رەتو) دایە. دەتوانین بێژین کە ئەم پێش‌و پاشکەوتنە روداوێکی هەرەمەکی‌و لەگۆترە نییە، چونکو لەدیدو باوەڕی زەردەشت، رۆحانیەت‌و پاکی‌و خاسی‌و ئایینداری، پەیرەویکردنە لەراستی (ئاشا)، واتە تەکوزی‌و رێکوپێکییە بە مانای فراوانییەوە، دەبێتە هۆی رێکوپێکی‌و تەکوزی لەکۆمەڵگا، دادپەروەرێتی، پارێزگاری‌و داکۆکی لەمافی تاك‌و کۆمەڵگاو لەناوبردنی دیکتاتۆریەت‌و خۆپەرستی‌و چەوساندنەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا بریتیە لەعیبادەت. کاتێك زەردەشت لەکاتی نزاکردندا، ڕوو لەئاهورامەزدا دەکا دەبێژێ:

(ئەی مەزدا، گشت ئەو کارو کردارە خاسانەی ئەنجامم داوەو ئەو هەوڵو کۆششانەی گەیشتونەتە ئەنجام. هەروەك عیبادەت پێشکەشی دەکەم. ئەمە خۆی لەخۆیدا مانای ئەو بۆچونانەی باسمان کرد دەسەلمێنێت}

شایانی باسە لێرەدا بێژین کە لەڤسیپەرد دا، هەموو ئافەریدەکانی ئاهورامەزدا، پیرۆزی‌و سەروەرییەکی تایبەتی خۆیان هەیە. هەر ماکێکی پاك‌و بەکەڵێك، هەر گیاو گولێێکی بۆنخۆش‌و جوان‌و بە کەڵێك، هەر گیاوگولێێکی سودمەند، هەر تۆوێکی خۆراکی، هەر سەر زەوی‌و دەڤەرێکی فراوان یا بچوك کە ژینگەی مرۆی خاس بێت، هەر دەریاو ڕوبارو کێوێك، هەریەك لەو هەسارانەی کە بە شێوەیەك ئاسەواریان لەژیانی ئادەمیزادا هەیە، هەروتەیەکی خاس، هەر جۆرە پەرستنێك کە لەکانگەو ناخی دەرونەوەو بەراستی بێت‌و هەر.... ئەمانە هەمویان ستایشت دەکرێن.

لەئاینی مەزدا پەرستیدا، هەموو شتێکی سوودمەندو بەکەڵێك کە ژیانبەخش بێت، شایانی ستایشتە. شایانی باسە کە لەڤیسپرد دا بۆ هەریەك لەم ماکانە لەنێو خۆیاندا سەروەرێك یاخود لەهەموان پیرۆزتر دەستنیشان کراوە. بۆ نموونە، سەروەری هەموو گیا سودمەندەکان، گیای (هوم)ە، (کشتی) یا ئەو پشتوێنەی زەردەشتییەکان لەپشتیان دەبەستن، سەروەری هەموو جلوبەرگەکانە، رووباری دائی تی لەهەموو روبارەکان پیرۆزترە، کێوی هۆکەر hokar سەروەری هەموو کێوەکانە، گەنم سەروەری هەموو دانەوێڵەکانە.

لەراستیدا ئەگەر بە چاوێکی بینایییەوەو بەوورەی لەڤسیپەرد بکۆڵینەوە، دەبینین لەهەموو دیاردەیەکی سروشتیدا، لەووردە تا درشت، هێزو توانای ئافەریدەگار وەبەرچاو دەکەوێت.

ستایشت‌و ئافەرینی هەریەك لەم ماکانە، سروشت وەك ئاو، ئاگر، خاك، با، گیاو.... لەراستیدا ستایشت‌و پەرستنی ئافەریدەگار دەگەیەنێت.

ڤیسپەرد، بە تەنیایی کتێبێکی سەربەخۆ نەبووە، بەڵکو بریتی بووە لەپاشکۆی یەسنا (جاکسۆن دەبێژێ: بریتی بووە لە زیادە خستنەسەر بەشی یەسناو نیزیکە 7/1ی یەسنابووە).

لەرێو رەسمی ئاینیدا، کەمجار ڤسپەرد بە تەنیایی دەخوێندرێتەوە زۆربەی جار لەتەك یەسنادا پێکەوە دەخوێندرێنەوە. تەنیا لەکاتی شەش جێژنی ساڵندا ڤسپەرد بە تەنیایی دەخوێندرا. تێکرا ڤسپەرد پێکهاتووە لە 22 تا 27 بەش.

مەخابن، مەودای ئەوەم نییە لەم کتێبەدا یەکە یەکە باسی ئەو بەشانەی ڤسپەرد بکەم. ئەگەر بۆم رەخسا لەپاشەرۆژدا هەموو ئەم بەشانەی ڤسپەرد وەردەگێرِمو بە جیا لەکتێبێکی سەربەخۆدا بە چاپی دەگەیەنم. ئێستا کوناَ کورتەو پوختەیەك لەم بەشانە دەخەمە بەرچاوی ئێوەی ئازیز.

بەشی یەکەمی ڤسپەرد پیکهاتووە لە9 بەند، سەرەتا دەبێژێ:

مژدەی ستایشت دەدەم بۆ سەروەرانی مینۆکی(معنوی)و سەروەرانی جیهانی (مادی). مژدەی ستایشتی سەروەرانی زیندەورانی ئاوی، سەروەرانی زیندەوەرانی ژێرزەمین، سەروەرانی پەلەوەرانو هەموو ئاژەڵو گشت پاکانو خاسان دەدەم.

ئەوسا باسی شەش جێژنو خۆشی دەکاو وەك سەروەرباسیان دەکات، ستایشتی جیهانێك کراوە کە لەبزاڤتنو پێشکەوتندایە، ژنانو پیاوانی پاك، کێوە جوانو سودبەخشەکان، ئیزەدەکانو ئەمشاسپەندان، وتەی خۆش بەیانی ئیزەدەیو سەرزەمینە پاکەکانو لەئەنجامدا ئاهورامەزدا کە هەموو شتێکی خاس لەوەوەیە وەك سەروەر کە دەبی ستایشت بکرێن، ناویان لێبراوە.

بەشی دووهەم، نیوەی ئەم بەندە بریتیە لەدوپاتکردنەوەی بەندەکانی یەکودووی بەشی یەکەم. ستایشتی هەموو ئەو سەروەرانە کراوە کە زەردەشت لەلایەن ئاهورامەزداوە راسپێراوە کە ستایشت بکرێن. ئاهورامەزدا کە مەزنترین سەروەری مینۆکیە، چاکەی تەوا سەنگە، ژنانو پیاوانی خاوەن باوەرِو بیروکردارو گوفتاری خاسن ستایشت کراوە، ئاناهیتا کە سەروەری پاکییە ستایشت کراوە.

لەبەشی سێهەمدا باسی حەوت پلەوپایەی پیاوە ئاینیەکانو سآ چین یاگروپی خەڵک دەکات. ئەم بەشە پێکهاتووە لەشەش بەند تیایدا باسی تایبتمەندییەکانی مەزداییەکی خاس چ پیاو و چ ژن دەکاتو دەبێژێ: هەر یەکێك لەمەزداپەرستان، سەروەرێکە بۆخۆی بە مەرجێك کە خاوەنی سیفاتو ئاکاری راستو دروست بێت

لەبەشی چوراهەمدا، ستایشتی پاداشتی راستی، توانایيو زانیاریو زانستو تەندروستی، کراوەو هەریەکێك لەمانە بەهۆی ئیزەدی تایبەتی خۆیەوە ستایشتی لێکراوە، ستایشتی دیاردەکانی سروشتی کراوەو لەپاشاندا ستایشتی ئاهورامەزداو سروش کراوە.

لەبەشی پێنجەمدا، بە ستایشتی ئەمشاسپەندانو گشت سوشیانتەکان دەستی پێکردووەو دانی بەراستيو دروستی ئاینی مەزدایی داناوەو بە ستایشتی سەروەرانی ساڵو مانگو رۆژ کۆتایی بەم بەشە هاتووە.

بەشی شەشەم، ئەم بەشە بریتیە لەتەنیا یەك بەندو تیایدا ستایشتی ئاهورامەزداو ئەمشاسپەندەكان دەكات.

بەشی حەوتەم، بریتیە لەپێنج بەندی پڕ مانا. دەتوانین بە کلیلی قوفلی ناسینی چۆنیەتی بیروبۆچونی ئەو خەڵكانەی دابنێین كە لەسەدەكانی نیزیك بەدەورانی ئاوێستادا دەژیان، واتە لەسەردەمێكدا دەژیان كە فرە لەسەردەمی ژیانی خودی زەردەشت دوور نەبووە. ئەم پێنج بەندە بریتین لە:

بەندی 1:

ستایشتیووتاری دروست دەكەین. سروشتی پاك ستایشت دەكەین. (ئەشی)ی پاك (فریشتەی تواناو پاداشتە) ستایشت دەكەین. (نریوسنگ) (فریشتەی پەیامهێنەری ئاهورامەزدا = جبرئیل لەئیسلامدا) ستایشت دەكەین ئاشتی پیرۆز ستایشت دەكەین. خەڵكی لەڕآ لانەدەرو راستكردار ستایشت دەكەین. فرەوەهری پاكدینان ستایشت دەكەین. پردی چینیوت ستایشت دەكەین. (گرزەمان)ی ئاهورامەزدا ستایشت دەكەین. ستایشتی بەهەشت دەكەین كە تیشكو روناكی هەموو خۆشیەكان دەبەخشێت.

بەندی 2:

ستایشتی خاسترین ئەو رێگایانە دەكەین كە بەرەو بەهەشت دەروا. ستایشتی (ئرشتاد) (فریشتەی راستیو دروستی) دەكەین كە هەموو جیهان پەروەردە دەكاتو سودی پێ>ەبەخشێت. ئاینی مەزداپەرستی ستایشت دەكەین. رەشەن كە راستترین ئافەریدەكانە ستایشت دەكەین. میترا (مهر) كە خاوەنی دەشتی پانوبەرینە ستایشت دەكەین. (پارەندی)چالاك (فریشتەی چاودێری داراییە) ستایشت دەكەین.

بەندی 3:

پاڵەوانێتیو عەگیدی پیاوانە ستایشت دەكەین كە فراوانیو گوشاری بە مرۆڤ دەبەخشێت، كە هۆش زیاد دەكات، كە توندوتیژیو دڵرترینی دڵرەكانە، كە هەروەك بەهرەیەكی یەزدانی دەگاتە مرۆو لەتەنگوچەڵەمە رزگاریان دەكات. ستایشتی (خەو)ی یەزدانی دەكەین كە خەلآتی مەزدایەو مایەی شادومانی مرۆو هەموو زیندەورانە

بەندی 4:

ستایشتی ئەو ئافەریدە پاكانە دەكەین كە لەپێش ئاسمان، ئاو، زەوی، گژوگیاو زیندەوەرانی خاس دروستكراون[58]

دەریای(فراخ کەرت) ستایشت دەکەین. (با)ی ئافەریدەی مەزدا ستایشت دەکەین. ئاسمانی درەخشان کە لەپێش بوونی ئەم جیهانەدا خولقێنراوە ستایشت دەکەین.

بەندی 5

ئازەری کوڕی ئاهورامەزدا[59] کە سەروەری پاکیە، ستایشت دەکەین. (زەور) و(کشتی)و (بەرسەم)ی پاك، سەروەری پاکی ستایشت دەکەین. ستایشتی (ئەبەم نەپات[60]) دەکەین. (نریوسنگ) ستایشت دەکەین.

(داموئیش ئۆپەمەن)ی دڵر ستایشت دەکەین. رۆحی مردوەکان ستایشت دەکەین. فرەوەهری پاکدینان ستایشت دەکەین.

ئاهورامەزدا، سەروەری مەزن ستایشت دەکەین، ئەوەی کە لەپاکیدا سەروەرو لەسەرو هەمواندایە.

گشت سردووەکانی ئاینی زەردەشتی ستایشت دەکەین. هەموو ئەو کردەوانەی ئەنجام بونو ئەنجام دەبێت ستایشت دەکەین.

گەر بەووردی سەرنج لەو پێنج بەندەی سەرەوە بدەین، دەبینین کە ئەو ڕاهێنانو ئامۆژگاریە ئاینییانە رێگەیەك بەرەو ژیانێکی خۆشو خوازراو دەکەنەوە، وئارەزوو ستایشتو داواکاری ئەو جۆرە شتانە دەکرێت کە ژیانی ئەم جیهانە بە پاکیو خاسیو دروستیو دوور لەدەروێشیو سەختیو نەبوونی، بە ئامانج بگەیەنێت.

مەزداپەرستەکان، ئەو جۆرە نیعمەتو فەرانە بە جەختنکردنو پێداگرتن لەخوا ناخوازن. ئەوەی ئەوان داوای دەکەن لەسروشتدا هەیە، کەسێك دەتوانێت بەهرەیان لێبەرێت کە بەئەندازەی هیمەتو کارو کۆششییەوە خۆی پێوە ماندوو بکات. واتە ئەم جۆرە داخوازیانە بەگریانو پاڕانەوەو دوعاو نزا نایەتەدی.

بەشی 8

بریتیە لەدوو بەند. لەم دوو بەندەدا دەیەوێت بیگەیەنێت کە هەر ژنو پیاوێکی خاس، بەهۆی دروستیو خاسی رێبازی (ئاشا) گرتنەبەر، دەبێتە ئیزەدێك بۆ خۆی، واتە شیاوی ستایشت کردنەو لەریزی ئەمشاسپەندانو ئیزەدانو سەروەران دەژمێرێن.

بەشی 9

بریتیە لە7 بەند.

دەربارەی ستایشتو کارتێکدرنی خاسیو جەخت لەسەر ئەنجامدانی ریۆ رەسمی دروستو ئامادەکردنی گیای سودبەخشی(هوم) دەدەوێت. ولەپاشاندا درودو سڵاو بۆ ئەمشاسپەندانو ئیزەدەکانو ماکە خاسەکانی سروشتو سرودە ئاینیەکان نێردراوە.

بەشی 10

لەم بەشەدا ستایشتی هەر حەوت دەڤەر، ئامرازەکانی ئەنجامدانی ڕێورِەسمی ئاینیو فرەوەشی پاکدینانو سرودی ئەهونەوەئیرە کراوە.

بەشی 11

درێژترین بەشی ڤیسپەردەو بریتیە لە21 بەند.

لەم بەشەدا، بەقوڵی مانای پەیوەندی نێوان ئاینو سروشت، بەردەوامبونی (بوون)و هەروەها بوونی خوا لەسروشتداو ستایشت کردنو سروود چڕاندنو ئافەرینکردنو پیرۆزی هەر جۆرە جوانییەكو ماکە سودبەخشەکانو دیاردە خاسەکان کە لەراستیدا بریتین لەستایشتو پەرستنی خوا، بە شێوەیەکی یەکجار جوانو ڕەوان باسکراوە، لەم بەشەدا بە شێوەیەکی جوانو ڕەوانو سادە باسی چۆنیەتی بەدیهێنانی ریۆ رەسمی ستایشت دەکات.

بەشی 12

لەڕوی بابەتو ماناوە بریتیە لەتەواوکەرەوەی بەشی پێشو لەتەك ریۆ رەسمی ئامادەکردنی (هومو پەراهوم)، راستیەکان، چاکەکان، دروستیەکانو پەرستن بەدلو بەگیانو بەراستی، ستایشت کراوە

بەشی 13

بریتیە لە3 بەند

بەستایشتی ئاهورامەزدا دەستی پێکردوە، ستایشتی زەردەشتو فرە وەهرەکەیو ئەمشاسپەندەکانو فرەوەهرەکەیو ئەمشاسپەندەکانو فرەوەهری بە توانای پیاوخسانو سرودە تایبەتییەکانی ئاوێستای کردووە.

بەشی 14

بەشێکی کورتەو تیایدا ستایشتی سرودە ئاینیەکان کراوەو باسی شێوەی دروستی خوێندنەوەیانی کردووە.

بەشی 15

ئەم بەشە پتر باس لەئوسولی بنچینەیی میللی ـ ئاینی ناوچەکە دەکات، کە بەشێوەیەکی گشتی زەردەشت بایەخێکی زۆری پێداوە.

بەڕاشکاوی دەتوانین بێژین کە لەڕوانگەی زەردەشتەوە، ئایین بریتی بووە لەئامرازێك بۆ دابینکردنی ژیانێکی کارا کە تیایدا بنەمای ستایشتو پەرستن بریتی بووە لەکارو کۆشش.

جەختی زەردەشتو پەیرەوەکانی لەسەر کارو کۆشش کردنو دابینکردنی ژیانێکی خۆشو بەختەوەرو پڕ لەئاسایش لەژێرسایەی راستیو دروستیو یاسا(ئاشا)و بیری خاس(وەهومەن) کە دەبێتە هۆی بەدیهێنانی هێزو توانایەکی دروست (خشەترا)و تەندروستیو نەمرێتی (ئەمرتات)و زێدەبوونی پیتو بەرەکەتو نیعمەت(هەورتات) فرە ئاشکراو رۆشەن بوو. ئەوەندەی جەختی لەسەر ئەمانە بوو باسی ئەو پەرستنو ستایشتە سەرو سروشتیانەی نەدەکردو کەمتر بەلایدا دەچوو.

لەم بەشەدا، هەروەها باسی دیدو بۆچونی زەردەشت دەکات دەربارەی چۆنیەتی ژیانو سوود وەرگرتن لەخۆشییەکانی، ژیان بردنەسەر بەشادیو خۆشیو دروستی، سوود وەرگرتن لەدەسترەنجی خۆ بۆ چێژوەرگرتن لەخۆشییەکانی ژیان، ئەمانە هەمووی سوپاسکردنی ئاهورامەزدایە. بە پێچەوانەوە، گۆشەگیریو ریازەتو دەروێشیو ڕوو وەرگێڕان لەخۆشییەکانی ژیان، کفرە بە نیعمەتەکانی ئاهورامەزداو هەنگاو هەڵێهێنانە بەسەر رێگەی ئەهریمەنی.

پارچەیەك لەم بەشە دەبێژێ:

(لەم سەرزەمینەدا، پێویستە کشتوکاڵ بە شێوەیەکی دروست ئەنجام بدرێت بۆئەوەی زەوی بکێڵێرآو بەرهەمی خاس وەدەست بێت. ئەی مەزداپەرستانی زەردەشتی، بەشێوەیەکی هۆشمەندانە دەستو پێی خۆتان بەکاربێنن بۆئەوەی زەوی بکێڵێنو بەکرداری خاسو بەدروستی کاربکەن، نە بەنادروستیو لەرێگەی خراپەوە. با بەم کردەوەمان ستایشتی ئاهورامەزدا بکەین کە توانایەو شیاوی ستایشتە...)

بەشی 16

بریتیە لەچوار بەندو دوپاتکردنەوەی ستایشتی زەردەشتو سروودەکانە.

بەشی 17 یەك بەندەو ستایشتی یەسنای (هفت هات)ە.

بەشی 18

لەسآ بەند پێکهاتووە. باسی سرودو نزاکان دەکات.

بەشی 19

دەربارەی ستایشتی بڕێ لەسرودەکانی گاتاو ستایشتی ئاهورامەزداو زەردەشتو بڕی لەبنەماکانی سروشت دەدوێت.

بەشی 20

لەم بەشەدا ستایشتی بڕی لەسرودەکانی گاتەکانو نزاکان کراوەو هەروەها دوپاتکردنەوەی ستایشتی بنەماکانی سروشتو فره وەهری هەموو خاسەکانە.

## 4- ڤەندیداد Vendidad

ڤەندیداد، یاخود (ڤەی ـ دەئو ـ داته vi – daeva – data) یەکێکه لەپێنج بەشەکانی ئاوێستا.

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد، ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان بریتي بوو لەبیستویەك نەسك Nask. ڤەندیداد نۆزدەهەمین نەسك لەو بیستویەك نەسکەبووە. شایانی باسه ئەم نەسکه تەنیا نەسکێکه که تائێستا بی دەسکاریو به تەواوەتی وەك خۆی ماوەتەوە.

ڤەندیداد، به مانای (یاسای دژی دێوە)، لێرەدا مەبەست لەدێو هەموو شتێکی خراپە.

گەر بمانەوێت ئەم بەشه لەئاوێستا لەتەك بەشەکانی دیکەیدا (واته یەسنا، یەشتەکان، ڤیسبەرد، ئاوێستای بچوك) بەراورد بکەین، هیچ جۆره هاوئاهەنگی یەك لەنێوانیاندا نابینین، بەڵکو به پێچەوانەوە جۆره نامۆییەکی بابەتی لەنێوانیاندا وەبەرچاو دەکەوێت.

بابەتەکانی ئەم کتێبه له 22 بەش (فەرگەرد) پێکهاتووە، بریتین لەئەحکامو شەرایعي سەردەمی مۆغه مادەکانی پێش زەردەشت. به کورتی دەتوانین بێژین ئەم بەشه لەئاوێستا ڕەسەن نییە، وبەهیچ شێوەیەك لەتەك فەلسەفەو حیکمەتی زەردەشت ناگونجێت، وچەواشەکردنی بیروباوەڕی ڕەسەنی زەردەشته که لەسەردەمی ساسانییەکاندا نوسراوەو تێکەڵ بەم ئاینه بووە. بێگومان بڕێ لەئادابو رسومی زەردەشتتیشی تێدا هەیە.

باسەکانی بیستو دووبەشی ڤەندیداد بەمجۆرەیە:

بەشی یەکەم: دەربارەی ئافراندنو پێکهاتنی جیهانە. لەم بەشەدا باسی دەڤەرەکانی سەرگۆی زەوی دەکات کە ئاهورامەزدا ئافراندوویەتی، هەروەها باسی ئەو نەخۆشیو دەردو ئازارانەی کە ئەنگرەمینو بەسەر زەویدا بلاّوی کردۆتەوە، دەدوێت.

بەشی دوهەم:

دەربارەی ئەفسانەی (جەم)و زێدەبوونی حەشامات لەسەر ڕوی زەوی لەو سەردەمەدا دەدوێت. هەروەها باسی ئەو سەرما سەختو سۆڵەو لافاوە ترسناکەو لەناوچونی زیندەوەران دەکا.

بەشی سێهەم:

دەربارەی خۆشیو ناخۆشییەکانی جیهان دەدواو باسی کشتوکاڵو پێنج جێگەی پڕ لەئاسایشو خۆشیو پێنج جێگەی سەختو ناخۆشی دەکات. هەروەها باسی ئەو کارو کردارانە دەکا کە خۆشیو بەختەوەری بۆ زەویو خەڵک دەسازێنن.

بەشی چوارەم:

باس لەئەحکامو شەرایعو یاسای جەزاییو بڕی یاسای دیکە دەربارەی بەڵێنو پەیمانو بڕیارە کۆمەلآیەتیو تەندروستیەکانی تاکو کۆمەڵ دەکات هەروەها باسی پێویستبونی خوێندنو بلاّوکردنەوەی خوێندەوارییو هاوسەرخواستنو زاوزآ دەکات.

بەشی پێنجەهەم تاکو بەشی دەهەم:

باسی پاکوخاوێنیو چۆنیەتی شۆردنو خۆپاککردنو پاك ڕاگرتنی زەویو ئاوو.. دەکات. زۆر بەووردی باسی سآ چینە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگای سەردەمی ساسانییەکان دەکات، کە بریتین لەپێشەوایانی ئاینی، ئەرتەشیەکانو چینی جوتیاران، لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لەو سەردەمەدا هێشتا چینی کرێکارو پیشەسازەکان بە مانایواتە پێك نەهاتبو. هەروەها باسی زانستی پزیشکیو پزیشکی ئاژەڵ دەکاتو بە ئەرکی سەرشانی خەڵک دەزانیت کە لەم بوارانەدازانیاری پەیدا بکەن. باسی بڕێکی زۆر لە نەخۆشییەکانی ئەو سەردەمە کراوەو ڕێگەی پێشگیریو چارەسەرکردنیانی خستۆتە ڕوو. باس لەهەندێ لەو گوناهانە کراوە کە فرە جەختیان لەسەرکراوەو بە خراپو گوناهی گەورە ناوی بردووە.

لەبەشی دەهەمدا باسی بڕی لەسرودەکانی گاتەکان دەکات کە دەبی دوو یاسآ یاچوارجار بۆ دورخستنەوەی دێوەکان بخوێنرینەوە.

بەشی یانزەهەم:

دەربارەی خوێندنەوەی هەندێ لەسرووودەکانی گاتەکان دەدوێت کە بۆ پاککردنەوە بەکاردێن.

بەشی دوانزەهەم:

دەربارەی پرسە دانانی خزمانی مردووو پاککردنەوەی ئەو شوێنەی کە مردووەکەی تێدا مردووە دەکات.

بەشی سیانزەهەم:

باسی هەڵسوکەوتی ئادەمیزاد لەتەك (سەگ)دا وەك گیاندارێکی پاك دەکات. هەروەها دەربارەی ڕێزگرتن لەهەموو گیاندارێکی بە کەلێك دەکات.

بەشی چواردەهەم:

دەربارەی کەفارەدان لەبۆ کوشتنی (سەگی ئاوی) دەکات کە زیندەوەرێکی بەکەلێکەو سوودمەندە.

بەشی پانزەهەم:

دەربارەی خاس رەفتارکردن لەتەك سەگدا بەتایبەتی دەڵە سەگ دەکاتو بەتایبەتیش لەکاتی جوتبوندا.

بەشی شانزەهەم:

دەربارەی چۆنیەتی رەفتارکردن لەتەك ئافرەتدا لەکاتی بێنوێژیدا دەکات.

بەشی حەڤدەهەم:

دەربارەی شێوەی کورتکردنەوەی موو نینۆك دەکات.

بەشی هەژدەهەم:

دەربارەی بڕی باسی جۆراوجۆر دەکات وەك (موبد)ی شایستەو (موبد)ی، بآ کەلێكو ناشایست، مامۆستای خاسو مامۆستای بآ فەڕو بآ باوەڕ کە خراپەکاری بڵآودەکاتەوە. هەروەها دەربارەی کەڵەشێر دەدوێت کە بەیانیان زوو لەنێومالێدا دەقوقێنآو خەڵک لەخەو هەلێدەستێنآو باسی پیرۆزی ئەم باڵێندەیە دەکات.

هەروەها باسی (موبد)ی ئازەربان دەکات کە خەریکی گەشکردنەوەی ئاگری پیرۆزە.

بەشی نۆزدەهەم:

دەربارەی ئامرازەکانی قوربانی کردن دەدوێتو ئەو نزاووێردانەی کە لەکاتی قوربانیکردندا دەخوێنرێنەوە بۆ دوورخستنەوەی رۆحی شەڕ. هەروەها دەربارەی رۆحو چارەنوسیەوە دەدوێت لەکاتێکدا کە لەشی بەرەو نەمان دەچێت. هەروەها باسی حەوت دەڤەری سەر روی زەوی دەکاو ناوی بڕی لەو دیوانە دەبێت کە نەیارو دژی ئەمشاسپەندەکانن.

بەشی 20 تا 22:

دەربارەی ڕەوشەکانی پزیشکی دەکات بەتایبەتی شێوەی نزا دەرمانی

لەبەشی بیستدا ناوی بڕی لەنەخۆشیەکانی ئەو سەردەمە دەکاو شێوەی چارەسەرکردنیان باسدەکات.

| | |
|---|---|
| 1- تفنو: | پەتا |
| 2- سارس تیە: | مەلاریا |
| 3- ئەژیواکە: | مارپێوەدان |
| 4- سارنە: | سەرئێشە |
| 5- ئەستەئیریە: | رۆماتیسم |
| 6- مهرکە: | تاعون |
| 7- داژو: | سوتان |
| 8- پیسە: | گەڕی |
| 9- پامەن: | کەچەڵی |
| 10- وزمنو ئەستە: | نەرمی ئێسقان |

بەشی بیستو دوهەم:

باسی 99999 جۆر نەخۆشی کە بەهۆی ئەهریمەنەوە دێتەدی دەکاتو باسی چارەسەرکردنیان دەکات.

## 5 ــ خوردەی ئاوێستا (ئاوێستای چکۆڵە) یا (وردەئاوێستا)

خوردەی ئاوێستا بەزمانی پەهلەوی خورتەك ئاوستاك xortek avestakواتە ئاوێستای چکۆلە یان پێگووتووە، وبەشێکە لەکتێبی ئاوێستا. لەراستیدا ئەم بەشە، بەشێکی سەربەخۆو جیاواز نییە کە شتێکی وەهای تێدابێت لەبەشەکانی دیکەی ئاوێستادا نەبن. بەڵکو ناوەرۆکی ئەم کتێبە بریتیە لەزنجیرەیەك لەدوعاو نزاو بڕی نوێژو ستایشت کە دانراون بۆئەوەی پەیرەوانی ئاینی زەردەشتی لەکاتەکانی شەوو رۆژ بەتایبەتی ئەو رۆژە پیرۆزانەی مانگو جەژنە ئاینییەکانی ساڵو بۆ ئەو بۆنە گرنگانە وەك رۆژی ڕێو رەسمی ژێرکراس(سدرە) لەبەرکردنو پشتوێن(کشتی) بەستنو زەماوەندو پرسەو... بەکاری بهێنن.

ئاوێستای چکۆلە، بەدرێژایی رۆژگار دوچاری دەستێوەردانو گۆڕین بووە، هەر نوسەرێك بەبیروبۆچوونی خۆیەوە شتی خستۆتە سەر یا لێ لابردووە. بەم شێوەیە پڕبووە لەئەفسانەو بڕی دوعاو نزاو نیانیش کە فرِی بەسەر ئاینو باوەڕی زەردەشتو گاتاکاندا نییە.

دکتور حسینوحیدی لەکتێبی (خردە اوستا) ل 6 دەبێژێ:

(ئاوێستای چکۆلە سیپارەیە کەبەزمانی ئاوێستایی، وهەروەك ئاوێنەیەکە بیروباوەڕو ئەندێشەکانو ئاینەکانی خەڵک لەئێرانی دێریندا عکس دەکاتەوە. بەشێك لەم سیپارەیە کە بانگهێشتی خەڵکە بۆ راستیو پاکیو دروستیو کارو کۆششو جەژنو شادمانیو خۆشیو بیری خاسو گوفتاری خاسو کرداری خاسو هاوکاریو خۆشەویستیو دۆستایەتیو ئاشتیو دروستکردن، بریتین لەو باوەڕانەی لەگاتاکانو ئامۆژگارییەکانی زەردەشتان. بەشەکانی دیکەی ئاوێستای چکۆلە بیروباوەڕو ئەندێشەو ئاینەکانی پێش زەردەشتو رۆژگارانێك باسدەکات کە ئێرانییەکان رێزیان لەنیشانە جۆراوجۆرەکانی بوونو سروشت دەگرت. لەئاوێستای چکۆلەدا، ئەم ئەندێشەو بیروباوەڕو ئاینانە لەتەك ئەندێشەو ئامۆژگاریەکانی زەردەشتدا ئاوێتە بووە. لەم دیدەوە گەر بمانەوێت دادوەرییەکی ڕاستو دروست دەربارەی ئاوێستای چکۆلە بکەین، دەبێ هەمیشە (گاتا)کان ڕەچاوبکەینو ئاوێستای چکۆلە لەتەك گاتاکاندا بەراوورد بکەین، ئەوسا تەنیا ئەو بەشانەی کە هاوئاهەنگن لەتەك ئامۆژگاریەکانی گاتاکاندا بەهاوردەی زەردەشتو ئاینی زەردەشتی دابنێین.)

بەبیروبۆچوونی زەردەشتیەکان، ئاوێستای چکۆلە لەلایەن ئازەرپاد کوڕی مهراسپند، کۆکراوەتەوە. ئەم ئازەرپادە یەکێك بووە لەبەناوبانگترین گەورە موبدەکانی سەردەمی

ساسانیەکانو لەسەردەمی شاپووری دوهەمدا (310 ــ 379م)، ئەم بەشەی ئاوێستای نووسیوەتەوە.

شایانی باسە، ئەم ئازەرپادە، زۆر هەوڵی داوە کە بیروباوەڕی مۆغە مادەکان تێکەڵ بە ئاینی زەردەشتی بکات، بۆئەوەی دوبارە ئەو بیروباوەڕانە لەژێر پەردەی ئاینی زەردەشتیدا زیندوو بکاتەوە.

## پوختەی باسەکانی ئاوێستای چکۆڵە

ئاوێستای چکۆلە کە لەلایەن خوالێخۆشبوو پورداود وەرگێردراوەتە سەر زمانی فارسی، بریتیە لەهەشت بەش. زۆربەی زۆری ئەو ستایشتو نزاو نیایشە بەناوبانگانەی ئاینی زەردەشتی کە هەمیشەوێردی زمانی پەیرەوانی ئەم ئاینە بووە، لەم کتێبەدا دەبینرێت.

ئەم هەشت بەشە بریتین لە:ــ

1ــ دوو نزا یا نوێژی کورت بەنێوی (ئاشم وەهو...)و (یەتائاهو...)

ئاوێستای چکۆلە بەدوو نزای بەناوبانگ دەست پێدەکات، واتە بە (ئاشم وەهو....)و (یەتائاهو....).

ئەم دوو نزایە، لای زەردەشتیەکان زۆر پیرۆزنو لەهەموو نوێژو ستایشتو دوعاکاندا دووپات دەکرێنەوەو لەسەر زمانی هەموو زەردەشتیەکدایە. ئەم دوونزایەو ماناکانیان بریتین لە:

ئاشم وەهوو هیشتم ئاستی

ئوشتا ئاستی ئوشتا ئاهمائي

هیت ئاشایيو هیشتایی ئاشم

واتە:

ڕاستی خاسترین چاکەیەو مایەی بەختیاریە، کەسێك بەختەوەرە کە ڕاست بێتو خوازیاری باشترین ڕاستی بێت.

یەتائاهو وەئیریو ئاتارەئوش ئاشان چیت هەچا وەنگهئوش دەزدا مەننگهو شیە ئاتنەئام ئانگهئوش مەزدایی خشتر مەچا ئاهورایی ئایم دریگو بیوەدەدەتواستارم.

واتە:

هەر بەو شێوەیەی کە سەرداری جیهان (ئاهو) بەهێزو توانایە، بەهەمان ئەندازە سەرداری ئاینیش (رەتو، رەد) (لێرەدا مەبەست زەردەشتە) لەبۆ پاکیو راستیو زاڵ بون بەسەر ئارەزووی دەروونی خۆیدا، بەهێزو توانایە. خەلآتی بیری خاس(وەهومەن) لەبۆ کەسێکە کە بەگوێرەی خواستوویستی مەزدا رِەفتار بکات. فەرمانرِەوایی ئاهورایی تایبەتە بە کەسێك کە یارمەتی بێچارەو هەژاران بدات.

دکتور حسین وەحیدی لەکتێبی (خردەاوستا)، یەتائاهوی بەم شێوەیە لێکداوەتەوە:

(ئەو یاسایەی کە بەسەر جیهانی بووندا فەرماندەدات، ژیانو سرووشتی خەڵکیشی لەژێر رِکێفدایە. بیری خاس تایبەتی کەسێکە کە گوێرِایەڵیو پەیرِەوی یاسای بوون بکات، وتوانایی رِاستەقینە لەبۆ کەسێکە کە بتوانێت بەسەرویستو خواستە ناسرووشتیەکانی خۆیدا زاڵ بێت)

2- رێو رەسمی ژێرکراس(سدرە) لەبەرکردنو پشتوین(کشتی) بەستن:

رێو رەسمی ئاینی چۆنیەتی ژێرکراس(سدرە) لەبەرکردنو پشتوێن(کشتی) بەستن، یەکێ لەنزاکانە کە لەکاتی لەبەرکردنی ژێرکراس(سدرە)و لەکاتی بەستنو کردنەوەی پشتوێنی تایبەتی لەئاینی زەردەشتیدا کەپێی دەبێژن کشتی یا کستی، دەبێ بخوێنرێتەوە.

(ئەی هورمز، ئەی سەروەری دانا. بە بیری خاس، گوفتاری خاس، کرداری خاس، لەهەموو گوناهێك کە کردومە، پەشیمانم. لەهەر بیرێکی خراپ، وتەیەکی خراپو کردارێکی خراپ کە لەم جیهانەدا بیرم لێکردووە یا گوتومە یا کردومەو یالێم وەشاوەو یاخود لەدەروونمدا بووە. لەهەموو ئەمانە چ مادی بێتو چ معنوی، پەشیمانمو تۆبە دەکەم. برِوخآ بیری خراپ (3جار دوپات دەکرێتەوە). بروخآو نابود بێت ئەندێشەی گوناه بیری خراپ.

لەتەك هەموو خراپەکارانو درۆزنانو جادوکەران لەنێو دۆزەخی تاریکدا سەرنگون بنو هیچ کارێکیان بەخۆشی نەچێتەسەر.

سەرکەوتووبێت هەر کارێکی خاس کە بەویستو خواستی ئاهورامەزداو سیو سآ ئەمشاسپەندەکان ئەنجام دەبێت. هەموو کارەکان بەگوێرەی ئاینی پاکی هورمز بێت. هورمزی دادگەرو مەزنو شکۆمەندو درەخشانو خاس، سەرکەوتووبێت.

بۆ کەیفـو وەشی ئاهورامەزدا، بەهەموو توانامانەوە سەرشۆڕیو سەرنخونی ئەهریمەن دەخوازین. خاسترینویستمان ئەوەیە کە ڕاستو دروستو پاك بین. لەبەرئەمە ڕاستیو دروستی ستایشت دەکەین(ئاشم وەهو... یەتا ئاهو..... 2 جار). ئاینی یەکتاپەرستی هەلێدەبژێرمو باوەڕم پێیەتی. ئەو ئاینەی کە زەردەشت هاوردویەتی ستایشت دەکەمو باوەڕم بە بیری خاسوووتاری خاسو کرداری خاسە. ستایشت دەکەمو باوەڕم بە یەکتاپەرستیە کە دژی شەڕو خوێن ڕشتنەو ستایشتی ئاشتیو تەباییو لەخۆبوردنو پاکی دەکات.

باوەڕم بەوەیە کە ئاینی یەکتاپەرستی زەردەشتی، مەزنترو خاسترە لەهەموو ئەو ئاینانەی کەبونو هەنو دەبن.

ئەز، ئاهورا بە ئافەریدەی هەموو شتێکی خاس دەزانم، ئەمە پەیمانی منە لەتەك ئەم ئاینی ئاهوراییە.

یاریدەم بدە ئەی ئاهورا(3جار).

ستایشت دەکەین هێزو تواناییو سەرکەوتن کە ئافەریدەی ئاهورایەو بەهۆیانەوە نەیاران دەشکێنین. هاوبیرو یاوەری هەموو مرۆڤێکی پاك بینو دووربین لەگوناەو گوناهکاران، لەتەك ئەوانەی پشتوێن(کشتی)یان بەستووەو بە خاسانی حەوت دەڤەری سەر روی زەوی یەکسان بینو ڕێبازی پەیرەوانی بە ئەمەکی زەردەشتو هەموو پاکان بگرینەبەر.

ئەی هورمز، ئەی خواوەند، با لەسەر پردی چینیوت بەشادومانیو ئاسودەیی بپەڕێینەوە، وبگەینە ئەو جێگەیەی مرۆڤە پاکەکان تیایدا نیشتەجآ دەبن. سەرکەوتوو بێت ئاینی پاکو پیرۆزی یەکتاپەرستی (3جار دوپات دەبێتەوە).

3- سروش باژ:

بریتیە لەنوێژێکی کورت، وهەروەك زۆربەی زۆری نزاکانی دیکە بە زمانی پازەند لەڕێوڕەسمە ئاینییەکاندا دەخوێنرێتەوە. ئەم نزایە لەبەرەبەیاندا دەخوێنرێتەوە وەك سوپاس بۆ سرووشی فریشتە پاش رزگاربوون لەتاریکی شەو، چونکو سرووش دژی تاریکاییە.

نزای سروش باژ:

(بە کەیف وەشی ئاهورامەزدا، دان بەوەدا دەنێم کە مەزداپەرستێکی زەردەشتیم. دوژمنی خراپیەکانو پەیڕەوی ئاینی ئاهوراییم. هاوەنی(شەبەق) پاك بە ستایشتو نیایش کەیف وەش دەکەم. ستایشتی سرووشی پاك دەکەم، کە بەهێزو توانایەو چەکی بریتیە لەوتە پیرۆزەکانی ئاهورای ئافەریدەگار.

وەڵامم بدەنەوە ئەی خواپەرستان کە توانایی سرووش چلۆنە.

وەڵامت دەدەینەوە ـ ئەی عەودالّی ڕاستی ـ هەر بەو شێوەیە توانایە کە خواپەرستێکی پاك بەگوێرەی پاکیو دروستیەکەیەوە بەهێزو توانایە.

ئێستا ئیدی ئەی مەزدا، جگە لەنیایشو ناوی تۆ، جگە لەرۆشنایی ڕێبازی تۆ، کـآیە ئەو کەسەی کە لەدرۆو درۆزنان پارێزگاریم لێدەکات؟ ئەی ئاهورا، ئاگادرم بکە، کـآیە ئەو کەسەی هەلێبژاردەی تۆیەو رزگارمان دەکات لەخراپەکاران. ئەرآ، ئەی ئاهورا ئاگادارم بکە. بیری خاسو کامەرانی بۆ دەخوازم.

ئیدی ئەی مەزدا، خواستەکەم بەدیبهێنە، دۆستیو خۆشەویستیو راستیمان پێببەخشە. درۆو درۆزن، خراپەو خراپەپەرستمان لـآ وەدوربکە، نابوودو لەناویان بەرەو تەفرو تونایان بکە،راستیو دروستیو پاکی سەرکەوتوبکە.

ستایشتوسڵاو بۆ سرووش، کە پاکەو بەهێزو توانایەو چەکیوتەی پاکو پیرۆزی ئاهورای ئافەریدەگارە. ئێستا ئیدی ئەی ئاهورامەزدا، داواکارم بۆ ئەوانەی کە لەسەر ڕێبازی تۆدان:ـ

فەڕو مەزنایەتی، تەندروستیو شادومانی، بەختەوەریو خۆڕاگری، زارۆڵەو نەوەی دڵرو پاڵەوانو ناودار، تەمەنی درێژ، پلەوپایەی بەرزو بەنرخ.

ستایشت دەکەم ئەی ئاهورا، وئەم ئاسمانە بەرینەو زەویە پانوپۆرەو هەموو ئافەریدە خاسەکانت.)

4ـ هوشبام:

نوێژێکە کە لەشەبەقدا دەخوێنرێت. ئەم نوێژە لەبەشە جۆراوجۆرەکانی ئاوێستادا بەتایبەتی لەیەسناکاندا وەرگیراوە.وشەی هوشبام بە مانای (شەبەق) دێتو بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکو رۆحی مرۆڤ پاش مردن لەشەبەقی رۆژی چوارهەمدا بەرەو جیهانی مەعنەوی دەڕوات.

ئەمەش دەقی نزای هوشبامە:ـ

(ئەی مەزدا، لەکاتێکدا توشم بە توشی نەیاران بکەوێت، جگە لەتۆ کـآ دەتوانآ پەناو چاودێرم بێت؟

ئەی ئاهورا، بە پەروەردەکردنی ئاگری دەرونە کە ئاسایشو ئاسودەییویژدان دێتە ئارا.

ئەی ئاهورا، ڕێنماییم بکە، چونکو جگە لەتۆ هیچ ڕێنماو چاودێرێکم نییە.

ئامۆژگاریم بکە، کێن ئەو کەسانەی نەیارانت دەشکێنن‌و پەناگای یارانتن، تا ئاگام لەبوونیان بێت کە بێگومان گەورە پیاوان‌و داناکانن.

ئەی مەزدا، با ئیزەدی سرووش یاریدەی ئەو کەسانە بدات کە خاسن‌و تۆ لێیان ڕازیت.

سڵاوو درودت لێبێت ئەی شەبەق(هوشبام)، ئەو ئاهورامەزدایەی سەروەرو مەزنان مەزنترە هەڵێدەبژێرین. بە هەموو هێزو تواناوە بۆ لەناوبردنی ئەنگرەمینوی خراپەکارو دێوی پڕ چەکی خوێنین، وهەموو درۆزنەکان دەجەنگم. مەزن‌و ڕێزداری دەزانم ئاهورامەزدای داناو زانا، ئەمشاسپەندەکان‌و ئەو هەسارە پرشنگدارە(هەسارەی تیشتەر)و گشت مرۆڤێکی پاکدین‌و ڕاستکردارو هەموو ئافەریدەکانی بیری پیرۆزو خاس(سپەنتامینو).

سەرکەوتن‌و پێشکەوتن دەخوازم بۆ هەموو ئەو ئافەریدە خاسانەی بوون‌و هەن‌و دەبن.

ئاشی Ashi (ئیزەدی بەخشینی سەروەت‌و بەرەکەت‌و پارێزەری لاوان‌و کیژان) بە پایە بەرزو شکۆمەندو مەزن دەزانم کە چارەسازەو سەرکەوتن دەبەخشێ‌و خراپەو خراپەکاران لەناو دەبێت بۆئەوەی کە خاسترین پاداشمان وەدەست بکەوێت. ستایشت دەکەین‌وکەیف وەش دەکەین ئەمشاسپەندەکان تا ئاسایش‌و تەبایی‌و بەرەکەت ببەخشن بەم خاوو خێزانەو پشتیوانی ئافەریدەی خاس بن‌و بیری خراپە لەناوبەرن.

ئەی ڕاستی، ئەز، ئاهورامەزدا دەپەرستم‌و ستایشتی دەکەم کە خێرخوازی هەموو ئافەریدەکانە.

ئەی مەزدا ئاهورا، با بەویستو ئیرادەو توانای خۆت فەرمانڕەوایی گشت ئافەریدە خاسەکان بیت، پلەوپایە بە مرۆڤی خاس بدەیت، وهێزو توانا لەناپاکان وەربگریتەوەو ریسوایان بکەیت.

ئەز کە زەردەشتم، تێدەکۆشم کە هەموو خەڵک بخەمەسەر ڕێی ڕاست‌و ئاینی ئاهورایی کە بەگوێرەی ئەم ئاینە بیربکەنەوەو کردارو ڕەفتاربکەن. تا ئەو شوێنەی کە سرووشت‌و ڕەوانمان پاکو بێگەرد بێت‌و لەخاسترین جێگەدا بژین‌و بگەینە کاخی نەمری(بەهەشت)و لەتەك (ئاشا) دا یەکبین).

5- پێنج نیایش (نوێژ)

نیایش لەزمانی پەهلەویدا مانای نزاو دوعاو ئافەرینە.

ئێستا پتر مانای نوێژ دەگەیەنێت. پێنج نیایش لەئاوێستای چکۆلەبەرچاو دەکەوێت کە بریتین لە:

ــ نیایشی خۆر: زۆربەی زۆری ئەم نیایشە لە(خورشیدیشت) وەرگیراوە. ئەم نیایشە هەموو رۆژێك سآ جار دەخوێنرێتەوە(بەیانی، نیوەڕۆ، عەسر)

ـ نیایشی مهر(میترا)

فرە لەم نیایشە لە(مهریشت) وەرگیراوە، ئەمیش رۆژی سێجار(بەیانی، نیوەڕۆ، عەسر)، پاش نیایشی خۆر دەخوێنرێتەوە.

نیایشی مانگ:

مانگی سێجار دەخوێنرێتەوە. سەرەتا کاتێك کە مانگ کەوانەیە(هلال)، دوهەم جار کە مانگ(چواردەیە) سێهەم جاریش کاتێکە کە دوبارە بەرەو کزی دەروات.

ـ نیایشی ئەردەویسور ئەناهید:

سەرچاوەی معنوی هەموو ئاوەکانی جیهانە، ئەم نیایشە لەبەندەکانی سەرەتای(ئابان یەشت) وەرگیراوە. ئەم نزایە لەگوێ چەمەکانو روبارەکانو لەرۆژی دەهەمی هەموو مانگێك دەخوێنرێتەوە.

ـ نیایشی ئاگری پیرۆز (بەهرام + وەهرام):

لەهەر پێنجوادەدا بەهۆی موبدەکانەوە لەنێو ئاتەشگاکاندا دەخوێنرێتەوە. زۆربەی زۆری ئەم نیایشە لەیەسنا هات 62 وەرگیراوە.

6ـ پێنج کاتی شەوو رۆژ:

لەئاینی زەردەشتیدا، شەوو رۆژ بە پێنج کات دابەشکراوە:

هاوەنگاە (بەرەبەیان)، رەپیتوینگاە (نیورۆ)، ئەزیرینگاە (لەسآ کاتژمێر پاش نیورۆوە دەست پێدەکات تاوەکو هەسارە لەئاسماندا هەڵێدێتو بەرچاو دەکەوێت)، ئەویسروتریمگاە (لەدەرکەوتنی یەکەمین هەسارە لەئاسماندا تاوەکو نیوەشەو)،

ئەشهینگاە(لەنیوەشەوەوە تاوەکو هەسارە بەرچاو ناکەوێت)

شایانی باسە، لەبەر ئەوەی لەزستاناندا رۆژ کورتە، شەوورۆژ بەچوارکات دابەشدەکرێتو رەپیتوینگاە لادەبرێت. بۆ هەریەك لەم کاتێنە نزاو نوێژێکی تایبەتی هەیە.

7– دوو سی(30) رۆژە(سی(30) رۆژەی مەزنو سی(30) رۆژەی چکۆلە):

لەئاینی زەردەشتیدا، هەرسی ڕوێژەی مانگ بەنێوی یەکێك لەئەمشاسپەندەکان یا ئیزەدەکان ناو نراوە. سی(30) رۆژەی چکۆلە تەنیا ناوی ئەمشاسپەندەکان، ئیزەدەکانو یاریدەدەرەکانیان براوە، بەلآم لەسی(30) رۆژەی مەزن، جگە لەناوبردینان، سیفاتی تایبەتی یان بۆ دانراوە. نزاکان زێتر لەرۆژی سیهەمی(30) شەش مانگەو دوانزە مانگەی پاش مردنی کەسێك دەخوێنرێتەوە. کەوایە ئەم نزایانە بۆ رۆحی مردووەکانن.

8– ئافەرینگان:

زنجیرەیەکە لەنوێژی زەردەشتییەکان کە هەموو سالێك بەبۆنەی جەژنو بیرەوەرییەکانی دیکە دەخوێنرێتەوە. گرنگترین ئافەرنیگان بریتین لەئافەرینگانی دهمان، ئافەرینگانی گاتا، ئافەرینگانی گهنبار[61]، ئافەرینگانی رپیتوین.

ئافەرینگان بە مانای درودو سلاو وئافەرینە بۆ گیانی مردوانو دوعاو نزا بۆ زیندووەکانە. ئافەرینگان دهمان بە مانای دوعاو نزای چاکانو پاکانەو لەیەسنای 60 بەندی 2 تا 8 وەرگیراوە، ولەرۆژانی چوارهەمو دەهەمو سیهەم (30)و سەری سالی کۆچی دوایی کەسێك دەخوێنرێتەوە. ئافەرینگانی گاتا، نوێژێکە کە لەو پێنج رۆژەی پێی دەبێژن(خمسه مسترقه) وبۆ کەیف وەشی فرەوەهری رۆحی مردوەکان دەخوێنرێتەوە. ئافەرینگانی گهنبار نوێژێکە کە لەهەر پێنج رۆژی شەش جەژنەکانی سالدا دەخوێنرێتەوە، بەواتەیەکی دیکە لەرۆژانی یانزە تا پانزەی مانگی (گولآن) و رۆژانی یانزە تا پانزەی مانگی پوشپەڕو رۆژانی بیستو شەشەم تا سێهەمی مانگی خەرمانانو رۆژانی بیستو شەشەم تا سێهەمی مانگی ڕەزبەرو رۆژانی شانزەهەم تا بیستەمین رۆژی بەفرانبارو رۆژانی سآ سەدو شەست تا سێسەدو شەستو پێنجی کۆتایی سال. ئافەرینگانی رەپیتوبن، نوێژێکە تایبەت بە هاوینە گەورەیەو بۆ کەیف وەشی رەپیتوین (فریشتەی هاوین) دەخوێنرآ.

## با بڕێ لەو زانیارییە پێویستانەی ئاینی زەردەشتی، بیزانین.

**1– ئاگرو** هۆی ڕووکردنە ڕووناکی لای زەردەشتییەکان

ئارییەکان، پێش ئەوەی بەرەو ئەم دەڤەرە کۆچ بکەن، لەشوێنێکدا دەژیان کە فرە ساردو سەهۆلێبەندان بووە (بەگوێرەی نووسینەکانی (ڤەندیداد)، ئەو شوێنە، لەسالدا دە مانگی ساردو سڕو سەهۆلێبەندان بووەو بە تەنیا دوو مانگی هەوا مامناوەندی بووە). لەبەر ئەوە،

تیرۆژو خۆرو ئاگر، بەلایانەوە گەلـآ سوودمەند بووەو ڕێزێکی تایبەتییان بۆ داناوە، چونکو بآ ئەم تیرۆژە ئاگرە، ژیانیان فرە چەتونو سەخت بووە، بە ڕادیەك لەو ژینگە ساردو سرِەداوایان بیردەکردەوە کە بەهەشت دەبێ شوێنێکی گەرموگوڕو ڕووناك بێت کە هەمیشە تیرۆژی خۆرو ئاگری تێدابێت. بە پێچەوانەوە، دۆزەخیان بە شوێنێك دەزانی کە ساردو سرِو تاریك بێت. کەوایە، دەتوانین بێژین، هەر لەرۆژگارانی دێرینەوە، ئاگر لای ئارياییەکان هەروەکو بنەماکانی دیکەی سرووشت (ئاو، با، خاك) پاكو بەپیرۆز ژمێراوە، وبە یەکێك لە دروستکراوەکانی ئاهورامەزداو بەدیاردەی گەورەییو مەزنایەتی ئەو دانراوە. لەبەر ئەمەیە کە بەرِێزەوە تەماشای ئاگر کراوەو هەمیشە لەشوێنی پەرستگاکانیان، ئاگریان کردۆتەوەو برِی دارو گژوگیای بۆنخۆشیان تێکەڵ کردووە (وەك داری عودو سەندەل) بۆئەوەی بۆنو بەرامەی خۆش لەنێو ئاتەشکەدەکانیان بلآوبکاتەوە. کەوایە، هەروەکوو گوتمان، هەر لەرۆژگارانی دێرینەوە ئاگر لای مرۆڤ بایەخێکی تایبەتی هەبووە، هەر ئەم بایەخە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئاگر ببێتە نیشانەی ئاینی زەردەشت. دەتوانین بێژین هۆیەکی دیکەش کە زەردەشت ئاگری هەلبژاردووە بە نیشانەی ئاینەکەی ئەوەیە کە فەلسەفەی ئاینی زەردەشت، فەلسەفەیەکی سروشتییەو هەموو شتێکی لەسروشت وەرگرتووەو سوودی لەژینگەوە وەرگرتووە بۆ سەلماندنی باوەرِەکەی. ئاگری بەسەرچاوەی هەموو ژیان داناوە. لەم بارەوە، دکتور حسینوحیدی لەکتێبی (دین پایەزرتشتی)ل ـ 55، دەبێژێ:(... لەرِوانگەیەکی دیکەوە، ئاگر لەئاینی زەردەشتیدا پیرۆزە چونکو، ئاگر گەرمو رووناکە، ئەمەوادەگەیەنێت کە هەر زەردشتییەك پێویستە لەسەری هەروەکو ئاگر ژینگەی خۆی بە گەرمیو ڕووناکی ڕابگرێتو هەمیشە لەتەك تاریکیو دڵتەنگی ململانێی بکات. کلێپەی ئاگر هەمیشە بەرەو سەرەوە دەچێتو هەرگیز بەرەوخوار دانانەوێت، تەنانەت ئەگەر بەهۆی (با) یاخود هەروزەیەکی دیکە بەرەو خوار بکشێت، دوبارە هەلێدەستێتەوەو بەرەو سەرەوە دەکشآ. ئەمە ئەوەمان پێدەبێژێت کە هەر زەردەشتییەك دەبێ سەربەرزو سەرفراز بآو هەرگیز سەردانەوێنآ. ئاگر هۆکارێکە بۆ لەناوبردنی هەموو بوونێکی زیانبەخش، وپاککەرەوەی ژینگەیە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە زەردەشتییەکان نابێت هەرگیز رێگە بدەن خراپەو پیسیو چەپەڵی بێتە نێو ژیانیان. لەپریسکی ئاگر، دەتوانرێت ئاگرێکی گەورە بکرێتەوە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە بیرێکی پاکو ڕووناکی بچوك دەتوانێت گەشە بکاتو بلآوبێتەوە. دەبێ هەموو زەردەشتییەك وەك ئەو پریسکی ئاگرە بێتو بیرە خاسەکانی بلآوبکاتەوەو گەشەی پێبدات. ئاگر، هۆکارێکە بۆ ئاسانکردنی ژیان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زەردەشتییەکان دەبێ وەك ئاگر سوود بەخش بن بۆ کۆمەڵگاو ژیانی ئادەمیزاد ئاسانو پرِ لەئاشتیو ئاسایشو تەبایی بکەن.)

لێرەدا، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە، پیرۆزی ئاگر تەنیا لای ئارییەکان نەبووە، بەڵکو هەر لەمێژەوە زۆر لە میللەتانی جیهان (رِەش، سپیـ زەردو سوورو لەهەر پێنج قارِەکە) ئاگریان بە بنەمایەکی پیرۆز داناوە. بۆوێنە: رِۆمەکان لەشاری Alba Longa، پەرستشگایەکیان هەبووە بەناوی FederaLAltar کە ئاگرێکی تێدابووەو هەمیشە داگیرسابوە. هەروەها لە شاری رۆمدا جآنزرگەیەکی گەورەبەناویوستا Vesta بەسەر گردێکەوە بووە

بەناویPaLatina HiLL کە بریتی بووە لەجآ نزرگەی خوای ئاگر کە یەکێك لەگەورەترین خواکانی ئەوکاتە بووەو تیایدا ئاگری پیرۆز هەمیشە رۆشەن بووەو رۆمیەکان ئەم ئاگرەیان بە نیشانەی سەربەستی رِۆم دەزانیو باوەرِیانوێبووە کە کلێپەی ئەو ئاگرە پیرۆزە نیشانەی بوونی خواو سەربەستیو بوونیوولآتەکەیانە. یۆنانییەکان لەشاری ئۆلەمپیادا جآ نزرگەیەکیان هەبووە بەناوی ALterof Pan کە ئاگرێکی پیرۆزی تێدابووە هەمیشە کلێپەی دەهات، هەروەها لەشاری DoLos جآنزرگەیەکی دیکەیان هەبووە کە لەوێشرِا ئاگرێکی هەمیشە رۆشەن هەبووە.

ژەرمەنەکان بەرامبەر خواکەیان کە ناوی Thorبووە، هەمیشە چرایەکیان دادەگیرسان. ئیسلآوەکان، بۆ رێزگرتن لەخوای خۆیان Perunو پروسییەکان بۆ خواکەیان Perkin، ئاگری پیرۆزیان هەبووەو هەمیشە رۆشەن بووە. لیتوانییەکان لەشاریویلنا WiLna، ئاگرێکی پیرۆزیان هەبووە کە پێیان گوتووەZinooz کە ئەمیش هەمیشە رۆشەن بووە. لەشاری کیلدار Kildare لەئێرلەندەدا جآنزرگەیەك بووە کە بە پیرۆزیان داناوەو ئاگری پیرۆزی تێدابووە کە هەمیشە داگیرساوە.

لەنێو (بنی ئیسرائیل)دا، ئاگری پیرۆز هەمیشە لەشوێنی قوربانییەکانیاندا داگیرسابوو. هۆزی ئیروکوای Iroquoi لەپێست سوورەکانی ئەمریکادا رێزی تایبەتیان لەئاگر دەنا، هەروەها لەویلایەتی میسی سپی دا هۆزێکی گەورە لە پێست سوورەکانی ئەمریکا هەبوو کە ناویان ناشیز Natchiz بووە کە ئەمانیش ئاگری پیرۆزیان لەنێو پەرستشگاکانیان بووە.

ئێستاش لەنێو برِی لە میللەتانی جیهاندا، هەن کە رِێزی تایبەتی لەئاگر دەگرن. لەنێو فەلەو موسلێمانەکانیشدا، کەموزۆر رێز لەئاگرو رِووناکی دەگیری.

مەخابن، برِی لەنووسەرانی ئیسلامیو بێگانە، نەریتی رِووکردنە ئاگر لای زەردەشتییەکانو بە پیرۆز دانانیان کردۆتە تۆمەتێك کە گوێیا زەردەشتییەکان باوەرِیان بە خوایەکی تاکوتەنیا نییە، بەڵکو ئاگرپەرستن. دەبێ بێژین ئەم جۆرە تۆمەتە یا لەرِوی رِکوکینەوەیە، یاخود بەهۆی نەزانینو نەبوونی زانیاری راستەقینەو تێنەگەیشتنی ئوسولأو بنچینەکانی ئەم ئاینە پیرۆزەیە.

## جۆرەکانی ئاگر

ووشەی ئاگر، لەسەردەمی پێشنیدا پێی دەبێژرێ ئاتەر Atar یا ئاترەش Atrash، کە لەپاشاندا بوو بە ئازەر یا ئاتەشو بەزمانی پەهلەوی ئاتور Atur وئاتەخش Atakhshو بە کوردی پێی دەبێژین: ئاگر، ئاور، ئاتەر، ئایەر.

لەیەسنای 17 بەندی 11 باسی پێنج جۆر ئاگر کراوە کە درودو سڵاو بۆ هەریەکەیان بەجیا نێردراوە. ئەم پێنج جۆر ئاگرە بریتین لە:

1ـ ئاگری بەرزی سەوەنگ Berezi Saveng

2ـ ئاگری ڤۆهوفریان Vohu Faryan

3ـ ئاگری ئوروازەشت Orvazesht

4ـ ئاگریوازەزشت Vazesht

5ـ ئاگری سپی نەشت Spinesht

لەراژەی پەهلەوی دا، هەریەك لەم پێنج جۆر ئاگرە، مانای تایبەتی خۆیان هەیە: ئاگری (بەرزی سەوەنگ)، بەمانای سوودبەخشی مەزنە، کە لەسەر ڕوی زەویدایەو لەئاتەشکە دەکانو کورەی وەجاغی ماڵاندا چاودێری لێدەکرێت. ئێستا ئەم جۆرە ئاگرە بە ئاگری (بەهرام) بەناوبانگە.

ئاگری (ڤۆهوفریان)، ئاگرێکە کە لەهەناوو دەرونی مرۆڤـو زیندەوەراندایە، یاخود بێژین ئەم ئاگرە بریتیە لەگەرمایی غەریزی کە مایەی ڕاگرتنی ژیانە.

ئاگری (ئوروازەشت)، ئاگرێکە لەنێو دەرونی گژوگیاو درەختەکاندایەو مایەی نەشونماو تەڕو تازەییانە.

ئاگری (وازەشت)، بریتیە لەو ئاگرەی کە لەهەموو گریدەکانی هەورو بروسکەدایەو دەبێتە هۆی لەنێوبردنیووشکەسێڵی (چونکو لەکاتی هەورەبروسکە پەیدادەبیٚو پاش ئەوە باران دەبێرێت.)

ئاگری سپی نەشت، ئەو ئاگرەیە کە لەبارەگای ئاهورامەزدا رۆشەنەو ئاگرێکی معنویو دەرونییە.

ئەم پێنج جۆرە ئاگرە بریتین لەئاگری معنوی کە خوا لەدڵو دەرونی ئافەریدەکانی خۆی بەشێوەی کاتی یا (ئەمانەت) دایناون.

جگە لەم پێنج جۆر ئاگرە، ئاگرێکی دیکەش هەیە کە بریتیە لەئاگری ئاسایی کە بەهۆی دارو سوتەمەنییەوە دەسوتێت کە تەنیا لایەنی مادیو فیزیایی هەیەو هیچی دیکە، وە دەتوانێت بەهۆی ئەو ڕووناکییەی کە لێوەی پەیدادەبێ، بمانگەیەنێتە ڕووناکی هەمیشەییو نەمری ئاهورایی.

## گرنگترینو بەناوبانگترین ئاتەشکەدەکان

لەسەردەمی رابوردوووداوزۆر لەمێژەوە، لەم ناوچەیەدا، لەهەر شوێنێك کۆمەڵێك خەڵکی لێبوبێت لەو شوێنەدا ئاتەشکەدەیان دروستکردووە. ئەم ئاتەشکەدانە، جگە لەوەی جێی نزرگەو دوعاو پاڕانەوە لەبارەگای خوا بووە، سودیان بۆ جآبەجآ کردنی بڕی ئیشوکاری دیکەش لێوەرگرتووە، وەك جێگەی کۆبونەوەی خەڵک بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان.

لەسەردەمی ساسانییەکاندا سآ ئاتەشکەدەی گەورەو گرنگ هەبووە:

1ـ ئاتەشکەدەی ئازەرگوشەسب، ئەم ئاتەشکەدەیە لەشاری (شیز) نیزیك بەورمێ (نیزیك بەشاری تیکاب لەهەوشاری رۆژهەلآتکوردستان)بووە. ئەم ئاتەشکەدەیە تایبەت بە شاکانو سەردارانی سوپای ساسانییەکان بووەو گرنگترینیان بووە. (شا)و فەرماندەو ئەفسەرەکانی، پێش ئەوەی بەرەو گۆڕەپانی شەڕ وەرێکەون، دەچونە ئەوآو داوایان لەئاهورامەزدا دەکرد کە سەرکەوتویان بکات لەشەڕدا. پاش سەرکەوتن دووبارە دەچونەوە ئەوێرا بۆ سوپاسو ستایشکردن. بەگوێرەی داستانەکانی زەرەشتیەکان، لەو ئاتەشکەیەدا، کتێبخانەیەکی یەکجار گەورەی تێدابووە کە پێیان گووتووە (گەنجی شابیگان) یاخود (گەنجی شیزیگانShizigan)و ئەسکەندری مەقدونی هەموی لەناوبرد.

2ـ ئاتەشکەدەی ئازەربەرزین مهر:

لەشاری ریوندی خۆراسان بووە، وتایبەت بە چینی کرێکارانو پیشەسازان بووە. گوێیە ئەم ئاگرە هەر ئەو ئاگرە بووە کە زەردەشت لەنێو دەستیا ڕایگرتبوو بآ ئەوەی دەستی بسوتێت.

3ـ ئاتەشکەدەی ئازەرفەرەنبوغ، لەشاری (کاریان)ی ناوچەی فارس بووەو تایبەت بە پیاوە ئاینییەکانو موبدەکان بووە.

حسن پیرنیا لەکتێبی (ایران باستان) ل 401 دەربارەی چینی پیاوە ئاینییەکان دەبێژێ:

((ئاتەشکەدەکان لەسەردەمی ساسانییەکاندا بەم شێوەیە بوون:

1- هەر خێزانێك بۆخۆی ئاگردانێکی تایبەتییان هەبووە، گەورەی خێزان دەبوایە چاودێری لەئاگرەکە بکات کە نەکوژێتەوە.

2- هەموو گوندێك ئاگرێکی هەبووە کە پێی دەبێژرێ (ئازەران)و هەمیشە دوو (مۆغ) دادەنرا بۆ چاودێری کردنی.

3- هەر دەڤەرێك ئاگرێکی بۆخۆی هەبووە کە پێی دەبێژرێ (بەهرام) و چەند مۆغێکیان بۆ دادەنا بۆ چاودێری کردنی.

4- لەسەرروو هەموو ئەمانە، سآ ئاتەشکەدەی گەورە لەسەر زەمینی ئێراندا هەبووە کە جێی ڕێز بووەو پیرۆزییەکی تایبەتییان هەبووە.

یەکەمیان ئازەرفەرەنبوغ کە لەکاریان (ناوچەی فارس بووە)و تایبەت بوو بۆ پیاوە ئاینییەکان، دوهەمیان ئازەرگوشەسب بووە کە لە(شیز) (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) ـ کوردستان ـ بووەو تایبەت بووە بۆ پادشاو فەرماندەو ئەفسەرەکان بووە. پاتشاکان پاش ئەوەی دەبوونە پاتشا لەهەر شوێنێك بونایە بە پآ دەچوونە ئەوێرا. سێهەم ئازەربەرزین مهر لە(ریوند)ی خۆراسان کە تایبەت بووە بە چینی کرێکارو پیشەسازان.))

## قیبلەی زەردەشتیەکان:

هەریەك لەپەیامبەرە گەورەکان، شوێنێکی دیاریکراویان بۆ پەیڕەوانی خۆیان داناوە کە لەکاتی پەرستنی ئافەریدەگاردا ڕووی تێبکەنو ڕازونیازی خۆیانیانی لەتەکا ڕاوێژبکەن، بەو شوێنە دەبێژرێ (قیبلە). قیبلەی موسولمانات (ماڵی خوا) واتە کەعبەیە کە دەکەوێتە نێو شاری (مەککە) لەعەرەبستانی سعوودی، قیبلەی جولەکەکان بیت المقدس قدس یا ئۆرشەلیمە، وفەلەکانیش لەکاتی نوێژو نیایش دا ڕوودەکەنە خاچ یاوێنەو هەیکەلی مەسیح یاخود حەزرەتی مەریەم.

بەلآم قیبلەی زەردەشتیەکان، بریتییە لەهەموو نورو ڕووناکییەك بەهەر شێوەیەك بێت، بلێیسەو نوری ئاگر بێت یاخود مۆمێکی داگیرساو یا ڕووناکی خۆرو هەرچی شتێکی ڕۆشەن بێـت. جێگەیەکی تایبەتیو یا لایەکی دیاریکراوی بۆ دانەنراوە

لە (ئۆردی بەهەشت یەشت) هاتووە دەبێژێ:

((ئاهورامەزدا فەرموی: ئەی زەردەشت ئەسپەنتمان، لەکاتی نوێژکردنو پەرستنو ستایشی مندا، ئەگەر ڕووناکییە خروسکیە گەورەکان دیارنەبون کە ڕویان تێبکەیت، ئەوا بەرەو ڕووی ئاگر بوێستە کە ئوردی بەهەشت پاسەوانییەتی.))

لەهەفتن یەشت دا هاتووە کە زەردەشتیەکان لەکاتێکدا بەرەو ڕووی روناکی ئاگر دەوێستنو نوێژدەکەن، ئەم ئایەتانە دەخوێننەوە:

((ئەی خوای داهێنەرو داناو بێهاوتا، ئێمە بەرامبەر ئەم قیبلەیە خەریکی نوێژکردنو پەرستنی تۆینو سوپاسی خۆمان دەردەبڕینو دەبێژین کە قەرزاری هەموو ئەو بەخشەندەییانەی تۆین کە پێت بەخشیوین، وبەهۆی بیروو تەو کرداری خاسەوە داواکاری گەیشتنە لاتین.))

((ئەی خوای داهێنەرو داناو بێهاوتا، لەبەرئەوەی کەوا هەردوو جیهان بە ئارەزوووویستی تۆ هاتۆتە ئاراو تۆ دروستکەریانیو هەرچی خۆشی هەیە بۆ ئێمەت رەخساندووە، کەواتە ئەی ئاهورامەزدا گوێڕایەڵی تۆمو باوەڕم بەوەیە کەوا تۆ وەدیهێنەری گشت ئەمانەیتو ستایشتت دەکەمو نوێژت بۆ دەکەمو خۆم بە قەرزارو سوپاسگوزاری تۆ دەزانم.))

((ئەی خوای داهێنەرو داناو بێهاوتاو بەخشندەی گشت شتێك، کە لەبەرچاوی ڕواڵەت بین دا نادیاری، ئەم ئاگرەی (روناکییە) کەوابەرامبەریوێستاوین، بەنورو ڕوناکی دروستکەری تۆی دەزانینو بە قیبلەی خۆمانی دادەنێینو بەهۆی ئەم روناکییەوە کە گردیلەیەکە لەرووناکییەکانی تۆ، دەمانەوێت خۆمان بگەیەنینە روناکی راستەقینەی تۆ، ئەی خوای داهێنەرو دانای بێهاوتا، با بەویژدانی پاك بگەینە خزمەتت.))

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە زەردەشت هەمیشە خۆرو مانگو زەویو ئاگرو... هتد بە دروستکراوی خوای گەورەو تواناو دانای داناوە. جا، دەبێ بێژین، کەسێك ئاوا بە ئاشکراو بە شێوەیەکی زانستیو بەڵگەی راستو دروست بیسەلمێنی کەوا ئاگر یەکێکە لەو بنەمایانەی کە خوا دروستی کردووە بۆئەوەی مرۆڤ سوودی لێوەربگرێت، چلۆن دێت ئەم بنەمایە دەپەرستێتو داهێنەرەکەی (کە دەزانێت کێیە) واز لێدەهێنآو ناپەرستێت.

سەرچاوەی هەموو روناکییەك ئاگرە، وئەگەر ئاگر نەبێت هەرگیز ئەو ڕوناکیانە نایەنە کایە، چونکو هەموو نورێك لەڕوکەشا ڕوناکییەو لەناوەڕۆکدا ئاگرە.وشەی (نور) کە ئارەبییەو بەمانای رووناکیە، لەووشەی (نار)ەوە هاتووە کە مانای ئاگرە، بۆیە زەردەشتییەکان، ئاگر بە ناوەرۆکی روناکی دادەنێینو هەمیشە لەپەرستنشگاکانیاندا ئاگر هەیە، لەبەرئەوەی سەرچاوەی هەموو ڕوناکییەکە.

لەکاتێکدا، کە ستایشتگەری ئاهورامەزدا، لەبەرامبەر ڕوناکی بلێسەی ئاگر، خۆر، چرا، مۆم، مانگو هەسارەو هەر روناکییەکی دیکە، ڕادەوێستآو خەریکی نیایشی ئاهورامەزدایە، هەر ئەوکاتە خۆی دەزانێت کە ئاهورامەزدا هیچ پێویستییەکی بەو نوێژە نییە، بەڵکو ئەمە خودی ئەو کەسە خۆیەتی کە پێویستی بەم ستایشتکردنەی ئاهورامەزدا هەیە، بۆئەوەی بەم هۆیەوە دڵو دەرونو هەناوی خۆی پاکوشادمان بکات، وهێزی ئەوەی پێبدات کە باڵەفرآ بکاو بەرەو لای روناکی ئاهورایی بفرێتو دڵو دەرونی خۆی بەرووناهی ئاهورایی رۆشەن بکات.

ئەگەرکو زەدەشت لەگاتاکاندا سوپاسی بەخشەندەگی ئاهورامەزدا دەکات، ئەمە بۆ دڵخۆشکردنی خۆیەتی نە چاوەروانکردنی پاداشت لەئاهورامەزدا، وە بۆ ئەوەش نییە کە سوود لەو بەخششە دەبێت، چونکو بەخششەکانی ئاهورامەزدا بآ هیچ چاوەڕوانییەك، بۆ هەموانە. کەوایە ئەو ستایشەی کە زەردەشت لەگاتاکاندا بەرامبەر بەرووناکیو روناهی ئاهورایی بەجێی دەهێنآ، نە لەڕوی ترسو لەرزەوەیەو نەبۆ وەرگرتنی پاداشتە، زەردەشت لەڕوی ئەوینێکی پاکو دۆستانەوە نوێژدەکاو ستایشتی ئاهورامەزدا بەجآ دەهێنآ، بەم شێوەیە بو کە زەردەشت نوێژو ستایشتکردنی بە کارێکی معنوی داناوە. نوێژ لای زەردەشت شێوەیەکی دەرونییە. هەروەها، ئەگەرکو زەردەشتیەکان ئاگر بە قیبلەی خۆیان دەزانن‌و لەکاتی نوێژو ستایشت‌و ڕازو نیازکردنی لەتەك ئاهورامەزداوە ڕوو دەکەنە هەر ڕووناکییەك، تەنیا بۆ ئەو مەبەستەیە کە زێتر خۆیان لەئاهورامەزدا نیزیك بکەنەوە کە دروستکەری هەموو جیهانەو سەرچاوەی گشت روناهیەکانەواتە (نور الانوێر)ە.

بەلای زەردەشتیەکانەوە، ئاهورامەزدا، جێگەو خانویەکی تایبەتی‌و دیاریکراوی نییە. لەهەموو شوێنێکدا هەیەو چاودێرە.

هەر خواپەرستێك، یا هەرکەسێك کە باوەڕی بە ئاینێکی تایبەتی هەبێت، لەهەر نەتەوەیك بێت، ڕەش بێت یا سپی، زەرد بێت یاسوور ڕەنگ، بەپێویستندەزانێت کە لەشوێنێکی خەلێوەتو چۆلێدا، دوور لەگشت دەردەسەری‌و گێرمەو کێشمەی ژیان‌و دەوروبەری، ماوەیەك لەتەك خوای خۆیدا خەریکی رازو نیازبێت‌و سوپاسی ئەو شتانەی کە پێی داوە بکات، هەرچەندە خوا لەهەموو شوێنێك‌و گشت کاتێکدا ئامادەیەو ئاگاداری هەڵسوکەوتمانەو گوێی لەدەنگمانە، ئێمەش پتر لەشوێنی بێدەنگو خەلێوەتا لەنێو قوڵایی دەرونماندا هەست بە بوونی دەکەین، بەڵام خاستروایە کە ئەم ڕێوڕەسمە لەشوێنێکی خەلێوەت‌و خۆش‌و جواندا ئەنجام بدرێت. بۆیە پەیڕەوانی هەر ئاین‌و ئاینزایەك جێگەیەکی تایبەتی یان بۆ خۆیان هەلێبژاردووە کە تیایدا لەتەك ئەوینی خۆیان رازونیاز بکەن. هەروەك چلۆن جولەکەکان کەنێسە، فەلەکان کلیساو موسلمانەکان مزگەوتیان هەلێبژاردووە، زەردەشتیەکانیش ئاتەشکەدە یا (هورمزگان) یان هەلێبژاردووە.

موبد دکتور جهانگیر ئوشیدەری لەکتێبی (نور، آتش، آتشکدە دەرآئین زردشت) لە لاپەڕە 17، لەم بارەیەوە دەبێژێ:

((زەردەشتیەکان، بۆ پەرستنی خوا، جێگایەکیان بەناوی (دەرمهر) یا (ئاتەشکەدە) یا (ئادریان) هەیە، کوردەکان لەمێژەوە (هورمزگان)یان هەبووە. لەوانەیەوشەی (ماڵی خوا) واتە (بیت الله)، هەر لەموشە کوردییەی (هورمزگان) کە دەبێتە ماڵی هورمز یا خوا وەرگیرابێت.

لێرەدا شایانی باسە بێژین کە هەریەکآ لەو ئاتەشکەدانە (دەرمهر)، جگە لەوەی کە جآ نزرگەی خەڵک بون‌و تیایدا نیایشی خوایان دەکرد. بریتیش بون لەکۆمەڵگەیەك کە تیایدا، لەبوارەکانی کۆمەلآیەتی، ئاینی، فەرهەنگی، داوەری، پەروەردەو فێرکردن‌و ڕۆلأو نەخشی تایبەتییان

هەبووە، وەزۆر جاریش خەزێنەی دەوڵەتیو زێرو زێوەرو دارایی دەوڵەتیان تێدا دادەنا، هەروەها شوێنی بەرپاکردنی جێژنو خۆشی بووە وەك جەژنی نەورۆزو تیایدا هەمە جۆرە كـاَ بەرکـاَ یەکیان ئەنجام دەدا وەك ئەسپ سواریو...

لەبەرئەوەی ئاگر دیاردەی پاکیو لەناوبەری پیسیو ناپاکییە، زەردەشتیەکان لەکاتێکدا کە بۆ نوێژو ستایشتی ئاهورامەزدا بەرامبەری رادەوێستن، هەوڵدەدەن گشت ناپاکیو پیسی لەشو دەرونیان خاوێن بکەنو هەروەك ئەو ئاگرە پیرۆزە بە لەشێکی پاکو رۆحێکی خاوێنو بێخەوش، بۆ پەرستنی خوای گەورە ئامادەبن.

زەردەشتییەکان لەو باوەڕەدان کە: کاتێك دەروانینە روناکییەك، پێویستەویژدانی خۆمان ئاراستەی رووناکی معنوی بکەین کە بریتیە لەڕووناکی تەواوسەنگی خوای گەورەو میهرەبان، یاخود بە مانایەکی دیکە پێویستە ئەم دوو ڕووناکییە بکەینە یەك بۆئەوەی بگەینە ڕاستترینو بەرزترین رووناکی، ئەم دوو رووناکیەی کە پێویستە یەکیان بخەین بریتین لەرووناکی معنوی خۆمان لەتەك ئەو رووناکییە مادییەی کەوا هەستی پێدەکەینو دەبینین. رووناکی معنوی هەموو مرۆڤێك بریتیە لەخاوێن کردنی بوونی خۆی بە رووناکی بیروکردارو گوفتاری خاس، یاخود بێژین بریتیە لەرووناکیویژدانو ئەقلو بیرو رووناکیو تیشکی خۆشەویستی راستەقینە، ئەم رووناکی معنوییە هەستی پێدەکەین بەلاَم ناتوانین بەچاو ببینین، بەمانایەکی دیکە ئەو کەسەی کەوا خاوەنی ئەم جۆرە سیفەتو خەسڵەتانەیە دەتوانێت بەهۆی کردارییەوە هەست بەم ڕووناکییانە بکات، بەلاَم ناتوانێت بەچاو بیبینێت، بۆ نمونە کەسێك کە خاوەنیویژدانی پاكو رووناك بێت، هەمیشە هەستی پێدەکات بەلاَم هەرگیز ناتوانێت بەچاو ئەمویژدانە پاکو رووناکە ببینێت. مرۆڤی دڵپاكو پاك کردار هەمیشە حەز بەوە دەکا کە لەرووناکیدا بێت، ودڵتەنگ دەبێ بەتاریکی، بۆیە لەکاتی تاریکیدا هەمیشە هەولأ دەدا زێتر بە ئامرازی جۆراوجۆر ئەو شوێنە رۆشەن بکاتەوە. بە پێچەوانەی ئەمەوە، بەدکارانو پیاوخراپان هەمیشە یاخود زۆربەی زۆری کات کاری خراپە لەتاریکیدا ئەنجام دەدەن. بۆ نمونە: ئەگەر دزێك بچێت بۆ دزیکردن، هەمیشە کاتی تاریکی هەڵێدەبژێرێتو ئەگەر لەپڕ لەکاتی دزی کردنا، چرایەك یا رووناکییەك دابگیرسێت، هەراسان دەبێو لەترساندا ڕادەکا، چونکو لەرووناکی دەترسێتو دەزانێت لەرووناکیدا کارە پڕ نەنگەکەی ئاشکرادەبێت.

یەکێکی دیکە لەو هۆیانەی کە زەردەشتیەکان لەکاتی نوێژکردنو پەرستنی خوادا، ڕوودەکەنە ئاگر یا رووناکی ئەوەیە کە، لەو باوەڕەدان کە شوێنو لایەکی تایبەتی بۆ خوای مەزن نییە، بۆیە ڕوودەکەنە رووناکی چونکو رۆشنایی یا ئاگر (لا)و تەرەفی نییەو هەر تیشکێك کە رووناك کەرەوە بێت، دوورو نیزیك، رۆژهەلاَتو رۆژئاوا، سەرو ژێر هەمووی رووناك دەکاتەوە.

ئێستا بابزانین لەم بارەوە، لەکتێبە ئاسمانییەکانی دیکە چلۆن باسی خوای داناو توانا کراوە:

لەقورئاندا، لەسورەی نور ئایەتی 35 دەفەرمویت:

((الله نور السموات والأرض مثل نوره كمشكوة فيها مصباح المصباح في زجاجة الزجاجة كأنها كوكب دري يوقد من شجرة مباركة زيتونه لا شرقيه ولا غربيه يكاد زيتها يضء ولو لم تمسه نار نور على نور يهدي الله لنوره من يشاء ويضرب الله الامثال للناس والله بكل شيء عليم)).

مامۆستا هەژار، لەوەرگیرانی ئەم ئایەتە لەقورئانی پیرۆز دەبێژێ:

(خوا رووناکی ئاسمانەکانو زەمینە. ڕووناکی ئەو وەك تاقێکە چرای تێدا هەلێکرابآ، چراکە لەجامێکدا بآ، جامەکە وەك ئەستێرەیەك تروسکەی بآو ماکی چرا لەزەیتونێکی ممبارەك دەس کەوتبآ کە دارەکەی نە هەمیشە بەرەو رۆژەو نە هەمیشە لەنزارە، تۆ ئێژی، رۆنی چراکە ـ بەبێ ئاگرتخۆن کەوتن ـ تیشك دەدا: روناکی لەبان روناکی. خودا هەرکەسێ حەزبکا روناکی خۆی نیشان دەدا. خودا بۆ مەردم نەزیلان دێنێتەوە. خوا بە هەموو شت دەزانێ.

هەروەها لەسورە (بقرە) ئایەتی 55 دەفەرموێ:

((وإذ قلتم ياموسى لن نؤمن لك حتى نرى الله جهرة فاخذتكم الصاعقة وانتم تنظرون))

واتە: ((ئەوساش کە بەموساتان گوت: ئێمە بڕوات پآ ناهێنین تا ئاشکرا خوا نەبینین، کە هەر لەبەرچاوی خۆتان بروسکەتان بەسەردا هات ـ (قورئانی پیررۆز ـ وەرگیرانی مامۆستا هەژار)

هەروەها پەیامبەری ئیسلام محمد (د. خ) دەفەرموێ:

((ان الله انزل ثلاث بركات: الماء والنار والشاة))

لەتەورات دا گەشتی خروج بەشی سێهەم ئایەتی 1 تا 5 دەبێژێ:

((موسا ئاژەڵەکانی خەزوری خۆی (یەترون Yatrun) کە کاهنی مدیان بوو، دەلەوەڕاندو ڕانەکەی بەرەو ئەولای دەشتەکەوەو بۆلای حوریب Hoorib کە (جبل الله) بوو هاورد.

فریشتەی خوا، لەنێو بلێیسەی ئاگرێك لەناو دەوەنێکدا پەیدابوو، وموسا ڕوانی ئەو دەوەنە گڕی لێهەلێدوستآ بەلآم ناسووتآ. موسا گوتی ئێستا با بچمە ئەولاوە بزانم ئەو دەوەنە بۆچی ناسووتێت. خوا دیتی کە نیازی ئەوەیە بچێتە ئەو لای دەوەنەکەوە. لەنێو دەوەندەکەدا فەرموی: ئەموسا، موسا گوتی (لبيك)، گوتی نیزیك مەبەرەوەو نەعلەکانت لەپآ دەرێنە چونکو ئەم شوێنەی تیایداوێستاوی شوێنێکی پیرۆزەو ئەمن خوای تۆم)

هەروەها لەتەورات گەشتی تپنیە بەشی چوارهەم دەبێژێ:

((ئەمەت پێشاندرا بۆئەوەی بزانیت کە یەهوە خوای تۆیەو جگە لەئەو هیچ خوایەکی دیکە نییە. لەئاسمانەوە دەنگی خۆی گەیاندەگوێتووتەکانیت لەنێو بلێیسەی ئاگرەوە بیست))

لەئینجیل دا(پەیامی یەکەمی ژان ـ بەشی یەکەم، ئایەتی پێنجەم)دەڵێت:

((ئەمە پەیامێکە کە لەئەومان بیستووەو دەیگێرینەوە کەوا خوا نورو رووناکییەو تاریکی تیادا وەدی ناکرێت))

لەئینجیلي مەتی بەشی سێهەم دەبێژێ:

((یەحیای تەعمیدکەر بە جوولەکەکانی گوت: ئەز ئێوە بەهۆی ئاوی پیرۆزەوە تەعمید دەکەم، بەڵام کەسێك پاش من دێت (مەبەست عیسایە)، ئێوە بەهۆی (روح القدس)و ئاگر تەعمید دەکات)).

ئەمانە چەپکەیەك لەو بەڵێگانە بوون لەباخچەی گولێزاری ئاینە ئاسمانییەکاندا کە پیرۆزیو پاکێتی ئاگر رِوندەکەنەوە. گشت ئەم بەڵێگانە، خوای گەورەو داناو توانا بەشێوەی رووناکی، نور یا ئاگر باسدەکات. خوا خۆی لەشێوەی نور پیشاندا، دەنگی لەنێو بلێیسەی ئاگرەوە دەبیسترآ، لەشێوەی هەورە بروسکە خۆی دەنوێنآ..

لەکۆتایی ئەم باسەدا، باوەرِی برِی لەنووسەرە بێگانەکان لەم بارەوە دەهێنمەوە:

پرۆفیسۆر ماکس مولر Pro. Max Muller لەکتێبی Physical Religion) دەبێژێ:

((زەردەشتیەکان ئاگریان نەدەپەرست، بەڵکو تەنآ خوای تاکوتەنیایان دەپەرست. ئەگەر گەرەکمان بێت بە ئاگرپەرستیان دابنێین، دەتوانین ئەم ناوە لەهیندۆکانو تەنانەت لەجولەکەکان بنێین چونکو ئەوانیش هەروەك زەردەشتیەکان رێز لەئاگرو رووناکی دەگرن.))

دکتور جیمز هوب لەکتێبی (گەنجینەی مۆغەکان) ل 146 دەبێژێ:

((بەهەرحال هەڵەیکی گەورەیە کە رێز لێگرتنی زەردەشتیەکان بۆ ئاگر بە پەرستن دابنێین، ئەگەرکو مەبەست ئەوەبێت کە ئەوانە ئاگر بەخوا دەزانن، ئەم جۆرە قسانە فرە هەڵەیەو راست نییە.))

پرۆفیسۆر تاهیر رچوی، مامۆستای زانکۆی کەلکەتە لە ل ــ 178 کتێبی (پارسیان اهل کتاب اند) دەبێژێ:

((هیوادارم هاو ئاینییەکانم لێم ببورن کە بەمجۆرەی خوارەوە بێپەردە قسە دەکەمو بەرِاشکاوی دەبێژم، بەچاوی خۆمان دەبینین کە ئەم شێوە کارە (رێزلێگرتن لەئاگر) لەنێو ئێمەی موسلێمانیش

هەیە، ئەگەر کەسێك کە موسوڵمان نییەو لەئیسلام نەگەیشتووە، تەماشا بکات کە حاجیەکانی ماڵی خوا لەکاتی زیارەتکردنی کەعبەدا (حجر الاسود) ماچ دەکەنو کە دەگەنەلایەوە دەست دەکەن بە دوعاخوێندنو زیارەتکردنی، کاتێك کە ئەمە ببینن، ئێمە بە (بەرد پەرست) بدەنە قەلەم. بەلآم هیچ گومانی تێدانییە کە ئێمە بەردپەرست نین، بەڵکو بە پیرۆزی دەزانینو تەنیا رێزی لێدەگرین. زەردەشتیەکانیش هەر بەم شێوەیەن، ئەوانیش هەرگیز ئاگر ناپەرستن، بەڵکو رێزی لێدەگرن.))

ئەحمەد ئەمین لەکتێبی (فجر الاسلام. ل 102) سەبارەت بە ئاینی زەردەشتی دەبێژێ: (...وعلّم ان الماء والهواء والنار والتراب عناصر طاهرة يجب ان لاتجنس، وكان من مظاهر هذا تقديس النار واتخاذها رمزاً، وتحريم تجنيس الماء الجاري، وتحريم دفن الموتى في الارض، ونحو ذلك).

بێگومان دەبی ئەو راستیە تاڵەش باس بکەین کەزۆربەی ئاینە ئاسمانیەکانو ئەو باوەڕانەش کە مرۆڤ وەك قوتابخانەیەك دایاننناوە، پاش مردنی پەیامبەرەکە یا خاوەن باوەڕەکە، گیرۆدەی زۆر گیرمەوکێشە بووە، وراستی باوەڕەکان ئاوەژوو بۆتەوەو ئەوەندە شتی سەیرو سەمەرەیان خستۆتە سەرو یا لًیان کەمکردۆتەوە کە ئەسڵی باوەرەکە بە تەواەتی گۆڕاوە.

ئاگر لەئاینی زەردەشتیش هەروەکو زۆر شتی دیکەی ئەم ئاینە پیرۆزە دووچاری ئەم بەلآیە بووە. ئەو ئاگرەی کە نیشانەی زانستو ناسینی خواو رێگەیەك بەرەو عیرفانو پاکیو دروستی ئەوینی ئاهورامەزدا بووە، لەسەردەمی ساسانییەکاندا بەهۆی کرداری هەندێ لەمۆغو موبدەکان کە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانو گەیشتن بە پلەو پایەو دارایيو ڕیاکارانە کەوتنە ئاوەژوو کردنی ڕاستیو چەواشەکردنی فەلسەفەی ڕووکردنە ئاگر بەڕادەیەك کە تائێستاش ئەوانەی بە شێوەیەکی ڕووکەشی دەراوننە ئەم ئاینەوادەزانن کە ئەمانە ئاگرپەرستن.

## 2ـ فرەوەهرFravahr

ئادەمیزادو هەموو گیاندارێك لەدوو بەشی مادیو مەعنەوی پێکهاتووە، بەواتەیەکی دیکە ئەوەی کە بوونی ئادەمیزاد پێکدەهێنێت بریتیە لەدوو بەشی جیهانی سروشتیو سەرو سروشتی (فیزیکیو میتافیزیکی)، کە هەنۆکە پێی دەبێژرێ لەشو گیان.

بەگوێرەی بیروباوەری ئاوێستایی، هەروەکو لەفەروەردین یەشتدا بەشی 31 بەندی 149و 155 باسکراوە هەناوی ئادەمیزاد پێکهاتووە لە پێنجوزە، ئەم پێنجووزەیە هەریەکە بۆخۆی رۆلێێکی گرنگو تایبەتی لەژیانی ئادەمیزاد دا هەیە، وبریتین لە:

1ـ ئەهو Ahu (ئانگهو Anghu)

بریتیە لەووزەی بزاڤ (جولآنەوە)و گەرمایی خۆڕسکی (غەریزی) ژیانو پێی دەبێژرێت (گیان). ئەم گیانە، لەتەك رۆحو رەواندا جیاوازە. هەر لەو کاتەوە کە (نگفە) لەمنداڵداندا(رحم) بەستراو لەش شێوەی بەخۆوە گرت، (ئەهو) هاوجوت لەتەکیا دێتە ئاراوە. لەتەك نەشونمای لەشدا، گیانیش هەر بەو شێوەیە وزەو توانای زێتر دەبێت تا ئەوکاتەی لەش لەبزاڤ دەکەوێتو بەواتەیەکی دیکە دەمرێت، ئەوسا (ئەهو)ش نامێنێت. کەوایە گیان پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەتەك لەشدا هەیە، لەتەکیا دێتە ئاراو لە مردنیدا ئەمیش نامێنێت.

2ـ دەئنا Daena

هەر ئەووشەیەیە کە ئیمرِۆ کە بە(دین) واتە ئایین ناوی لێدەبرێت. دەئنا لەئاوێستادا بەواتەی (ویژدان)ەو بریتیە لەووزەیەکی خودایی کە ئافەریدەگار بە شێوەیەکی بارمتە (ودیعە) لەبونێتی هەموو کەسێکدا دایناوە. ئەمووزەیە، لەژیانی هەموو مرۆڤێکدا هەڵێدەستێت بە رِێنمایی کردنیو رێگەی راستو دروست پێشان دەداو هاندەدا بۆ پەیرەوی کردنی لێ، هەروەها رێگەی هەڵەو چەوتیش بەهەموو زیانکارییەکانییەوە پێشان دەداو هەوڵدەدات کە لێ وەدوور کەوینەوە.

3ـ بەئوزە Baodha

بریتیە لەووزەی هەستو تێگەیشتنو بلیمەتی، ئەمووزەیە لە هەرکەسێکدا، هەمیشە دەبێ سەرپەرشتی هۆشو بیر بکات تا گیرۆدەی هەڵە نەبێتو لەرِێی راست لانەدات.

ئەمووزەیەش هەروەك (گیان) لەتەك پێکهاتنی لەشدا دێتە ئارا، بەلآم وەك گیان لەتەك لەناوچونی لەشدا لەناو ناچێت.

بەڵکو پاش مردن ئەم دەمێنێو لەگەڵ رەواندا (رۆح) دەگاتە سەر پردی چینیوت.

4ـ ئورڤەن Urvan. رەوان یا (رۆح)

بریتیە لە رەوان (رۆح)ی هەموو زیندەوەرێك.

هەروەك چلۆن (بەئوزە) سەرپەرشتی برِی لەووزەکان دەکات، ئۆرڤەنیش سەرپەرشتیووزەکانی دیکەی لەئەستۆدایە. رِەوان دواووزەیە لەنێو ئادەمیزادا کە بەویستی تەواوسەنگی خۆیو زانیارییەکی تەواوەوە دەربارەی چاکەو خراپە، چارەنووسی مرۆڤ بەگوێرەی کارو کردارییەوە دەستنیشان دەکات. ئیرادەو هێزو توانای تەواوەتی ئەوەی هەیە کە رێگەی رِاست یا چەوت هەڵبێژێرێت. گەر رێبازی رِاست بگرێتەبەر، ئەوە پاداشتی خاسیەکەی وەردەگرێتو دەچێتە بەهەشت، بە پێچەوانەوە گەر رێگەی هەڵەو چەوت هەڵبێژێرێت، جێگەی دەبێتە دۆزەخ.

## 5- فرەوەهر Fravahr

پێنجەمینووزە لەووزانەی هەناوی مرۆڤ پێکدەهێنن لەئاوێستادا پێی دەبێژرێ فرەوەشی Fravaşi و لەپەهلەویدا پێی دەبێژن فرەوەهر. Fravahr . لەفەرهەنگی زەردەشتیدا، جیهان هەمیشە لەحاڵەتی جولآنەوەو بزاڤو پێشکەوتندایە، ئەم جولآنەوەو پێشکەوتنە لەبووندا جۆراوجۆرە، وەك بزوتنی فیزیایی، کیمیایی، میکانیکي (آلی)، دەورانی، گەوهەریو رۆحی، هەموو ئەمانە پێکەوە لەفەرهەنگی زەردەشتیدا بەشێوەی فەلسەفەیەکی جیاواز باسی لێکراوەو پێی دەبێژرێ فرەوەهر، بەگوێرەی ئەم فەلسەفەیە، لەنێو جیهانی بووناداو لەزاتی هەموو بوونێکداووزەیەك هەیە کە دەبێتەهۆی پێشکەوتنو گۆران. هەروەها بەگوێرەی ئەم فەلسەفەیە خودی ئاهورامەزداش کە ئافەریدەگاری هەموو بوونێکە، فرەوەهرێکی تایبەت بەخودی خۆی هەیە کە سەرچاوەی هەموو فرەوەهرەکانە.

ووشەی فرەوەهر یا فرەوەش،وشەیەکی ئاوێستاییەو پێکهاتووە لە دوو بەش: فرە Fra بەمانای (پێش)، وەهر یاوەشی بەمانای (زیادکردن) یا (بردن) کە ماناکەی بەسەریەکەوە دەبێتە رۆژ بەرۆژ زێتر پێشکەوتن یاخود بۆ پێشەوەچون، بڕی لەزانایان دەبێژن بریتیە لە وزەی پێشکەوتنو گەشەکردنو پەرەسەندن (تگور) لەنێو ئادەمیزاد دا، یاخودووزەی پێشخەری جیهانی بوونە. بڕێکی دیکە دەبێژن فرەوەهر بەمانای (دالێدەدان) یان (پالێپشتی کردن)ـە.

هەرکەسێك کە لەدایك دەبێ، هەر بوونێك کە دێتە ئارا، ئەمووزە ئاهوراییو گردیلەیە کە بەشێکە لەتیشكو ڕووناکی هەمیشەیی یەزدان، دەچێتە ناخی دەروونییەوە، لەکاتی مردندا ئەمووزەیە دەگەرێتەوە بۆ جێگەی خۆی کە بریتیە لەبارەگای ئاهورامەزدا.

دەتوانین بێژین کە لەژیانی ئادەمیزاد دا، فرەوەهر بەنرخترین بەشی بوونێتی چونکو ئەم بەشە گردیلەیەکە لەبوونی بآ بڕینەوەی ئاهورامەزدا کە بۆ ڕێنمایی رۆحو رێبەرێتی کردنی بەرەو پوختەییو بێخەوشی بەشێوەی بارمەتە لەدەرونی ئادەمیزاد دا داینا‌وە، ولەپاش مردندا، بەهەمان شێوە بە پاکیو دروستی دەگەرێتەوە بۆلای خۆی(بۆلای ئاهورامەزدا). لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕی ئەویش ئەوەیە ئایا رەوان یا (رۆح) لەتەك فرەوەهردا یەکێکن یاخود دوو وزەی جیاوازن؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە تەنیا دەتوانین بێژین کە لەئاوێستادا بڕێ جار هەردووکیان یەکن، و لەهەندێ شوێنی دیکەدا دوو وزەی جیاوازنو هەر یەکەیان بەشێکن لەو پێنجووزەیەی هەناوی ئادەمیزاد.

بەشی یەکەمی (بندهش) فەقەرەی هەشت سەبارەت بە جیهانی (فرەوەشی) دەبێژێ:

(پێش ئافراندنی ئادەمیزادو هاتنەدی جیهانی مادی، ئاهورامەزدا جیهانی معنوی یا جیهانی فرەوەشییەکانی لەئاسماندا ئافراند. ولەڕوی شێوەی معنوی فرەوەشییەکان، هەموو گیتی بەگشت

ئەو شتانەی تیایدایە دروست کرد. دوا فرەوەهرو پوختەترینیان کە هاتە سەر زەوی، ئادەمیزاد بوو.))

لەبەر رۆشنایی ئەو داستانە ئاینییەی کە باسی لێدەکەین دەتوانین بێژین فرەوەهر بریتیە لە بەشێك لە تیشکی ئاهورایی، گردیلەی معنوی یا شێوەی ئاسمانیو ئاهورایی هەموو شتێك. کورتەی داستانی جیهانی فرەوەشی بەم شێوەیەیە:

(پێش ئەوەی ئەم جیهانی مادیەو هەموو ئەو شتانەی تیایدایە بێتە ئافراندن، جیهان بۆ ماوەی سآ هەزار ساڵ بە شێوەی فرەوەش یا معنوی بووە. ئاهورامەزدا لەڕووناکییەکی تەواوسەنگو خاسیو بێخەوشیدا بووە. لەجیهانی سەرودا رووناکییەکی تەواوسەنگ بووەو لەخوارەوە تاریکاییەکی شەوەزەنگ بووە. سەرەتا، ئاهورامەزدا دەستی کردووە بە ئافراندنی جیهانی معنوی، لەو جیهانەدا، مادەو هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە مادەوە هەیە، لەئارادا نەبون. هەرچییەك هەبووە بریتی بووە لەشێوەی رۆحانیەت یا معنویەتی هەموو بوونەوەرەکانی پاشەرۆژ. ئەو شێوازانەش گشتی بریتی بون لەرۆحو ئەندێشەو هیچی دیکە. جیهانی مەعنەوی بۆ ماوەی سآ هەزار ساڵ هەر بەم شێوەیە بەردەوام بووە. ئەوسا، ئاهورامەزدا ئیرادەی کرد تا جیهانی مادی بێنێتە ئارا، پاشان دەستی کرد بە گفتوگۆ لەتەك فرەوەهرەکانی ئادەمیزادو گشت بونەوەرە خاسەکان لەرووەكو ئاژەڵو هەموو ئەوانەی فرەوەهریان هەبووەو لٌی پرسین ئایا حەز بەوە دەکەن لەم شێوازە بێنەدەرو چوارچێوەی مادی بەخۆوەبگرنو بچنە جیهانی خاکیو بۆئەوەی بەسەر تاریکیو ئەهریمەن سەربکەونو لەوێرادا بژین؟ ئەوانەی کە دەیانزانیو ئاگاداربون کە دەرئەنجام سەرکەوتن بۆ ئەوان دەبێت، ڕەزامەندی خۆیان دەربڕیً. ئاهورامەزدا دەستی کرد بە گۆڕینی شێوازەی معنوی بۆ مادی. بۆیەکا لەسەرەتادا شێوەو شێوازەی هەموو شتێك لەشێوەی معنوی لەجیهانی سەرووددا بووەو ئەوەی کە چۆتە نێو قالێبی مادی لەڕوی ئەو شێوە ئەصڵیەدا بووە.)

لەم داستانە ئەوەمان بۆ رۆشەن دەبێت کە هەموو بوونەوەرەکان (گیاندارو بێگیان) ئەم شێوازە معنویەیان هەیەو ئەمووزە معنویە کە بریتیە لە(رۆح) دەچێتە نێو قالبی لەشەوەو بەم شێوەیە هەر بوونەوەرێك لەدووبەش پێك دێت، یەکەمیان بریتیە لە(رۆح) یاووزەی یەزدانیو دوهەمیان بریتیە لە (لەش) کە بەدرێژایي رۆژگار شێوەی دەگۆڕآو لەئاکامدا لەناودەچآ.

بەم شێوەیەو بەگوێرەی ئەم فەلسەفەیە، هەرکەسێك لەبوونی خۆیدا خاوەنی بەشێك لەفرەوەهری یەزدانیە کە پێویستە لەسەری بە پاکیو بێخەوشی ڕابگیرێتو بەهۆی بیرو کاروکرداری باشەوە لەژیانی مادی رێگە نەدا تێکەڵ بە هەڵەو خراپەو خراپیەکانی مادی ببێتو بەبێ خەوشی لەکاتی بەسەرهاتنی ژیانی مادی دا بگەرێتەوە بۆ لای سەرچاوەی ئەصلی خۆی لەئاسماندا.

هەرچەندە فرەوەهرووزەیەکی معنویو دەرونی ئادەمیزادەو چوارچێوەیەکی مادی نییە، بەلآم هەر لەمێژەوە ئارياییەکان (بەلایەنی کەمەوە پتر لەسآ هەزارساڵ لەمەوبەر)، شێوەیەکی پڕ

لەڕازو ڕەمزیان بۆ داتاشیوە. ئەم شێوەیە لەزۆر لەخشتە نووسراوەکانو تاشە بەردە هەڵێکەنراوەکانی سەردەمی مادەکانو هەخامەنشیەکاندا هەڵێکەندراوە، نموونەیەکی ئەم شێوەیە لەباشوری کوردستاندا لەشاری سلێمانی لەسەر ڕێگەی چەمی ڕێزاندا لەقەس قەلان بەدی دەکرێت، وئەم شێوەیە کۆنترە لەشێوەی فرەوەهرەکانی پرسپولیس (تخت جمشید)ی سەردەمی هەخامەنشیەکان.

مەخابن بڕێ لەمێژوونووسەکان ئەم شێوەیە بە شێوەی ئاهورامەزداي دادەنێن، بەلام لەراستیدا ئەم شێوەیە بریتیە لەسومبولێك یا نیشانەیەك بۆ ئاینی زەردەشتی، چونکو زەردەشتیەکان باوەڕیان بەوە هەبووە کە ئاهورامەزدا مادە نییەو ناتوانن شێوەیەك یاوێنەیەکی تایبەتیو دیاری کراوی بۆ دیاری بکەن.

لەم بارەوە مێژوونووسی بەنێوبانگی یۆنانی هیرودت کە لەساڵی 480 پ. ز خۆی سەردانی ناوچەی ئێرانی کردووە، دەربارەی ئەو شتانەی بەچاوی خۆی دێویێتی دەبێژی:

(.. ئەمانە... واتە ئێرانیەکان ـ بە باشو دروستی نازانن کە پەرستشتگاو شوێنی قوربانیو هەیکەل بۆ خوا دروست بکەنو بەکارێکی ناشایستی دەزانن..)

لێرەدا پێویستە بێژین کە زانای بلیمەتو ناودار، رۆستەم. جی. کاما، یەکەمین کەسێك بووە کە ئەم شێوەیەی بەسومبولی فرەوەهر ناسان. هۆی دانانی ئەم شێوەیەش ئەوەیە کە هەمیشە ڕۆلأو ئەرکی فرەوەهر لەبەر چاوان بێت.

**<u>شێوەی فرەوەهرو رەمزەکانی:</u>**

ئەم شێوەیە پێکهاتووە لەحەوت بەش یاخود بێژین لەحەوت رەمز پێکهاتووە:

**رەمزی یەکەم**: (نمونەو نوێنەری مرۆڤی پوختە)

شێوەی فرەوەهر، لەسەریەوە تا کەمەر بە شێوەی پیرەمێردێکی بەساڵچوی دنیا دیدەیە، کە داناییو پوختەییو ئەزمونی لێدەردەکەوێت کە پەیوەندی بە پوختەیی رۆحو رەوانییەتی. ئەم پیرەمێردە نوێنەری مرۆڤی پوختەو بآ کەمایەسییە لەم شێوەیەدا.

**رەمزی دوهەم**: (نزا)

با بروانینە شێوەکەی فرەوەهر، دەبینین دەستی ڕاستی پیرەمێردەکە بەرەو پێشەوە راکێشراوەو بەری دەستی بەرەو ژوور کراوەتەوە، هەروەکو ئێستا چلۆن لەکاتی نزاکردندا دەستمان بەرەو

ئاسمان رادەكێشین، وەهایە. ئەم دەست درێژكردنە بەرەو ئاسمان ئەوە دەگەیەنێت كە بۆ پەیوەندی لەتەك ئاهورامەزداو نزاكردن، پێویستمان بە تكاكەر نییە. هەروەها وەكو گوتمان فرەوەهرەكان لەجیهانی سەرودا دێنە نێو قالبی لەشو پاش مردن دەگەڕێنەوە بۆ هەمان جێگا، كەوایە دەست بەرەو ژوور رادەكێشرێت چونكو مرۆڤ لەلایەن ئافەریدەگارەوە بە خاسیو دروستی دروستكراوەو دەبێ بە دەستی پڕ لەكرداری خاس بەرەو لای ئافەریدەگار بگەڕێنەوە.

## رەمزی سێهەم: (پەیمان)

بەدەستی چەپی پیرەمێردەكەی شێوەی فرەوەهر بازنەیەك دەبینرێت كە نمونەو نوێنەری بەڵێنو پەیمانی ئادەمیزادە لەتەك ئاهورامەزدا، ئەم پەیمانەی كە رۆحی هەموو بوونەوەرێك لەتەك ئافەریدەگاردا بەستویەتی.

رەمزی چوارهەم: (بیری خاس، وتەی خاس، كرداری خاس)

لەشێوەی فرەوەهردا، چاومان بە دووباڵی كراوە دەكەوێت كە لەحاڵەتی فڕیندان. مانای ئەوەیە كە ئادەمیزاد پێویستە هەمیشە بەرەو بەرزێتی بڕوا، وببینینی ئەم باڵانە ئەوەمان بیردەخاتەوە كە فرەوەهر هەمیشە ئادەمیزاد بەرەو بەرزیو بڵێندی ڕێنمایی دەكات. پەڕی هەر باڵەیان لەسآ چین پێكهاتووە، كە ماناكەی دەبێتە ئەوەی فرەوەهری ئادەمیزاد لەتەك باڵی بیرووتەو كرداری خاس بەرەو مەڵێبەندی ئەصلی خۆی دەگەڕێتەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە كە مرۆڤ بۆ گەیشتن بە پلەوپایەی بەرزی ژیان دەبێ لەئەندێشە، كردارووتەی خاس بەهرە وەربگرێت.

**رەمزی پێنجهەم**:(زەروان یا رۆژگاری بآ پایان)

بازنەیەك لەشێوەی فرەوەرهردا بەرچاو دەكەوێت كە ئەوە دەگەیەنێت رۆژگار بآ پایانەو ئادەمیزاد لەنێویدا (واتە لەنێو رۆژگاردا) وەك ئەو بازنەیەوایە، لەهەر شوێنێكدا دەست پآ بكات دەگەڕێتەوە بۆ سەر هەمان شوێن.

**رەمزی شەشەم**: (دوو گەوهەری هاوالأ دوانەی دژ بە یەك)

دوو ڕست كە بەبێزنەكەی دەوری كەمەری شێوەی فرەوەهردا شۆڕبونەتەوە، نیشانەی ئەو دوو وزەیە یا گەوهەرە دەرونییەیە كە سەرچاوەكەی لەبیری ئادەمیزاد خۆیەوە هەڵێقولآوە، واتە سپەنتامینوو ئەنگرەمینو.

**رەمزی حەوتەم**: (بیری خراپ، وتەی خراپو كرداری خراپ)

لەخوار کەمەری شێوەکەی فرەوەهردا، کلکێك وەك داوێن بەدی دەکرێت کە لەسآ چین پێکهاتووەو بەرەو خوار شۆڕبۆتەوە. ئەمە بە پێچەوانەی باڵەکانە کە بەرەو ژوور دەروا، ئەم سآ چینە بریتین لەبیرو کرداروووتەی خراپ، کە دەبنە هۆی ئەوەی ئادەمیزاد بەرەو هەڵێدێرو نوشوستی بڕوات. کەواتە پێویستە لەسەرمان هەمیشە بیروکرداروووتەی خراپ بخەینە ژێر پێوەو لەخۆمانی دوور بخەینەوە.

## 3- سدرەوکشتی (ژێرکراسو پشتوێنی تایبەتی):

لەئاینی زەردەشتیدا، هەموو کوڕو کچێك کە تەمەنیان دەگاتە حەوت ساڵی تا دەگەنە پانزە ساڵی، پێویستە لەسەریان کە ژێرکراسو پشتوێنی تایبەتی کە پێی دەبێژن سدرەوکشتی لەبەربکەنو ببیەستن.

### سدرە (ژێرکراس):

بریتییە لەژێرکراسێکی سپی سادەو پانوپۆڕو بآ یەخەو قۆلأ کورت. درێژییەکەی دەگاتە سەر ئەژنۆو لەکەتان یا لۆکە دروستکراوە. ئەم ژێرکراسە، پێکهاتووە لەنۆ (9) پارچە کە پێکەوە دەدروێن، ولەنێوەڕاستەکەیدا درزێکی تێدایە کە تاوەکو ژوروی سنگەوەیە. لەکۆتایی قڵیشەکەدا گیرفان یا کیسەیەکی چکۆلآنەی تێدایە کە پێی دەبێژری کیسەی پاداش. ئەم کیسەیە نیشانەی گەنجینەی بیری خاس، وتەی خاسو کرداری خاسە.

لەئاوێستادا بە سدرە دەبێژن (وەسترە) یا (وەهومنو وەسترە) کە ماناکەی دەبێتە کراسی بیری خاس، ولەکتێبە ئاینییەکان کە بەزمانی پەهلەوی نووسراونەتەوە پێی دەبێژری (شپیك)، بە زاراوەی لۆری لەزمانی کوردیدا پێی دەبێژن (سێتەرە یا سیترە)و لەدەڤەری هەورامان پێی دەبێژن (شالأ).

سپێتی ئەم ژێرکراسە نیشانەی ئەوەیە کە پێویستە هەمیشە کراسی پاکیو دروستی لەبەربکرێتو دەروونو ڕواڵەتی خۆمان بەرەو ڕوی خوا ڕاستو پاك، هەروەك سپێتی ئەو ژێرکراسە، بە بێگەردی ڕابگرین.

شایانی باسە ئەو ژێرکراسە دەبێ ڕاستەوخۆ لەتەك لەشدا تەماسی هەبێت، ونابێ بەسەر بەرگی دیکەدا بپۆشرێت.

**کشتی** Koshti (پشتوێن):

بریتییە لە پشتوێنێکی باریكو درێژ، پێکهاتووە لەحەفتاودوو تالأ بەن کە لەخوری سپی مەڕ کە بەدەستی ژنی موبدێکەوە هۆنرابێتەوە. ژمارەی حەفتاودوو تالأ بەن نیشانەی حەفتاودوو بەشی (یەسنا)یە کە لەمەوبەر باسمان لێکردووە. ئەم حەفتاو دوو بەنە دەبێتە شەش بەش هەر بەشێکیش لەدوانزە تالأ پێکهاتووە. ژمارەی دوانزە ئاماژەیە بۆ دوانزە مانگی ساڵ، وژمارەی شەش دەگەرێتەوە بۆ شەش جەژنی گەورەی زەردەشتییەکان کە پێی دەبێژن گاهنبار کە لەشوێنی خۆیدا باسمان کردووە. کشتی، بریتییە لە پشتوێنی ئیتاعەت کە دەبێ هەمیشە کەمەری بەندایەتیمان بۆ خوا ببەستین، وبۆیە لەخوری مەڕ دروست دەبێت، کە دەبێ وەك مەڕ بآ ئازارو بآ گوناە بین.

زەردەشتییەکان ئەم پشتوێنە تایبەتییە بەسآ خول بە پشتیانەوە دەبەستن، ئەم سآ خولە نیشانەی بیری خاس، وتەی خاسو کرداری خاسە کە دەبێ دەوروبەری هەموو مرۆڤێکی خاس بگرێتەوە. لەکاتی بەستنی پشتوێنەکەدا دەبێ چوار گرێی لێببەسترێت، دوانی لەپشتەوەو دوانی لەبەرەوە. ئەم چوار گرێیە نیشانەی چوار بنەما پیرۆزەکەیە کە بریتین لە ئاگر، ئاو، خاكو با.

لەبەرئەوەی هەموو (بوون) لەم چوار بنەمایە پێکەوە هاتۆتە کایە، ئێمە ئافەریدەگاری ئەم چوار بنەمایە دەپەرستینو رێزی لێدەگرین.

لەگرێی یەکەمدا، لەناخی دڵەوەو بە بیرێکی خاسەوە دەبێژرێ کە خوا یەکە،

لەگرێی دوهەمدا، دەبێ بێگومانو دڵنیابین لەوەی کە ئاینی خواپەرستی بێگەردو راستو دروستە، لەسێهەمین گرێدا، دەبێ باوەڕمان بەوە بێت کە زەردەشت پەیامبەری خوایە، ولەچوارهەمین گرێدا بڕیار بدرآ تا توانا لە لەشدایە کاری خاس ئەنجام بدرێتو هەرگیز لەئاینی خواپەرستی هەڵێنەگەڕێینەوەو دوربین لەخراپەو خراپەکاری.

شایانی باسە، کاتێك پشتوێنەکە دەبەسترێتو گرێکانی لێدەدرێت، لەشی مرۆڤ (هەردوو ڕەگەزی نێرومآ) بەدوو بەش دابەشدەکرێت، بەشی سەروی پشتوێن،و بەشی خوارووی. مێشك لەبەشی سەرەوەی لەشە، لەبەرئەوە بەشی سەرەوەی لەش (مێشك) بیردەکاتەوەو بڕیار دەدا بۆ بەشی خوارەوە کە بریتیە لە (هەواو هەوەس).

دەشآ لێرەدا ئەوە بگوترێت کە ئێستاش لەناوچەی بادینان (بهدینان)ی باشوری کوردستان لەبڕی لەدەڤەرەکانی رۆژهەڵآتو باکوری کوردستان شێوەی پشتوێن بەستن هەر بەم شێوەیە ماوەتەوە.

هەروەکو گوتمان (کشتی) بریتییە لە پشتوێنێکی سپیو باریكو درێژ، وهەردوو سەرەکەی گرێی لێدەدرێت. درێژی ئەم پشتوێنە نیشانەی ئەوەیە کە هەرچەندە ئەم ژیانەمان لەسەر ڕوی زەوی درێژخایەن بێتو تەمەنیشمان زۆر بێت، لەئەنجامدا ڕۆژآ لەڕۆژان کۆتایی پێدێت.

گرێکانیش نیشانەی تەواوبونوکۆتایبژیانی سەر ڕووی زەوییە. شایانی باسە لەکاتی بەستنی پشتوێن (کشتی) ئەم نیایشو نزایە دەخوێنرێتەوە:

((بەبیرێکی خاس، وتەی خاسو کرداری خاسەوە، پەشیمانی خۆم دەردەبڕم لەهەموو ئەو هەڵەو گوناهانەی کە بەبیرووتەو کرادرو بە رۆحو لەش کردومە، ئەو گوناهانەی چی مادی بێتو چی معنوی، پەشیمانم لەگشت ئەو گوناهانەی کە بیرم لێکردووەو یاخود گوتومە یا پێی هەڵساومو گوێم بۆ ڕاگرتووەو فەرمانم پێداوە، لەهەمووی پەشیمانمو تۆبە دەکەم. سەرنگون بێت ئەهریمەن (سآ جار دوپات دەکرێتەوە)، بروخآ بیری خراپ لەتەك هەموو خراپەکارانو درۆزنانو جادوکەران. هەموو ئەمانە لەچاڵی دۆزەخی تاریکدا سەرەو نوخون بنو هیچ ئاواتو ئارەزویەکیان نەیەتەدی. سەرکەوتوبێت هەموو کارو کارێکی خاس کەویستو ئارەزووی ئاهورامەزداو ئەمشاسپەندانی تیادا ئەنجام دەبێت.))

خۆش وەشکردنی ئاهورامەزداو سەرشۆڕکردنی ئەهریمەن بەهۆی بیر لەخاس کارکردنو ئەنجامدانی، مایەی بەختەوەرییە.

ئاینی خواپەرستی (مەزد یەسنا) هەڵێدەبژێرم کە زەردەشت هاوردوویەتیو پابەندی ئەم باوەڕەم. ستایشتی بیری خاس، وتەی خاسو کرداری خاس دەکەم. ستایشی ئاینی خاسی خواپەرستی کە دژی شەڕو خوێن ڕشتنەو دۆستی ئاشتیو تەباییو لەخۆبوردنو پاکییە، لەگشت ئاینەکانی ئێستاو پاشەرۆژ خاسترو مەزنترو پاکترە. لەبەر رۆشنایی ئەم ئاینە، ئاهورامەزدا بە ئافەریدەی هەموو بوون دەزانم.

بگەرە فریادم ئەی ئاهورامەزدا (سآ جار دوپات دەکرێتەوە).

دەبێ ئەم ڕاستییە بخەینە بەرچاو کە لەبەرکردنو بەستنی ژێرکراسو پشتوێن لەتەمەنی حەوت تاپانزە ساڵیدا کارێکی یەکجار زۆر دەکاتە سەر رۆحو رەوانی ئەو منداڵەی کە بۆ یەکەمین جار لەو تەمەنەدا بەم کارە هەڵێدەستێت، ووای لێدەکات کە هەمیشە بیری خاس، وتەی خاسو کرداری خاسی لەیاد بێتو جگە لە رێگەی راستیو دروستی هیج ڕێیەکی دیکە نەگرێتەبەرو هەمیشە خزمەتگوزاری خەڵک بێت.

دووبارە شایانی باسە کە لەشەو رۆژێکدا، پێویستە لەسەر هەموو زەردەشتیەك کە چەند جارێك (کشتی) بکاتەوەو دوبارە بیبەستێتەوەو رێو رەسمی ئاینی بەجێبێنێتو سوپاسی ئاهورامەزداو نەفرین لەئەهریمەن بکات. کردنەوەو بەستنی کشتی لەم کاتێنەدا دەبێت:

یەکەم، یەکسەر پاش لەخەو هەڵسان، دوهەم، پاش دەست بەئاو گەیاندن، سێهەم، پێش نوێژکردن، چوارهەم، لەکاتی خۆشۆردن، پێنجەم، پێش نانخواردن.

لەکاتی بەستنی پشتوێن، ئەگەر سەر لەبەیانی بێت پێویستە ڕووبکرێتە خۆر هەلآت، پاش نیوەڕۆ ڕوودەکرێتە خۆرئاوا، لەکاتی شەودا ڕوودەکرێتە چرا یا هەر رووناکییەك یا ڕوو لەمانگ دەکرێت.

## 4ـ پاداشتو سزا:

## بەهەشتو دۆزەخ، لەم جیهانەو پاش مەرگ

بەگوێرەی بیروباوەڕی زەردەشت، ئاهورامەزدای خوای گیانو ئەقل ئەم (بوون)ـەی لەسەر بنچینەی یاساو تەکوزییەکی (نیزامێکی) نەگۆڕ ئافراندووە کە زەردەشت پێی دەبێژی (ئاشا) یا (راستی).

ئەم تەکوزییە نەگۆڕە کە بووەو هەیەو هەتاهەتایە دەمێنآ، دەتوانین پێی بێژین (تەکوزی بوون)، وبریتیە لەویستو ئارەزووی خوا. بەواتەیەکی دیکە (یاسا یا تەکوزی راستی) لەتایبەتکارییەکانی زاتی ئاهورامەزدایە، وهەر ئەو تەکوزیەیە کە هەموو (بوون) لەسەر بنچینەو کۆڵەکەی ئەودا دارێژراوەو دروستو راگیر بووەو دەچەرخآ.

لەبەندی 7 یەسنا 31 دەبێژێ:

((ئەو، تەنیا داناو ژیرێکە کە لەرووناهی خۆیەوە، گشت جیهانی بوونی رووناك کردۆتەوە. بەهۆی ئەقلو ژیرێتی خۆیەوە، (یاسای راستی)ئافراند، وبەگوێرەی ئەم یاسایە هەمیشە پالپشتی بیری خاسە. ئەی خوای ئەقلو هۆش، هێزی بیرکردنەوەمان زێتربکە))

بەگوێرەی یاسای راستی، ئادەمیزاد لەتەك توانایی هێزی بیرکردنەوەدا ئافەریدە بووە. هەر ئەم تایبەتکارییەیە کە لەگیاندارەکانی دیکەی جیادەکاتەوەو بە باشترینیان دەژمێردرێت. بەواتەیەکی دیکە دەتوانین بێژین ئەگەر ئەم هێزی بیرکردنەوەو ئەقلە لەئادەمیزاد بسەنرێتەوە، بە مانای ئەوەیە مرۆڤایەتی لێسەنرابێتەوە. ئەوسا ئیدی ئادەمیزاد تەنیا شێوەی ئادەمیزادو ناوی ئادەمیزادی بۆ دەمێنێتەوە، دەنا هەڵسوکەوتو رەفتارو تایبەتکارییەکانی هەروەك ئاژەڵەکانی دیکە دەبێت کەهەموی بە شێوەی غەریزیو تۆبزییەوە دەبن. ئەوسا ئادەمیزاد تەنیا لەچوارچێوەی ململانآ لەپێناوی مانو بونیدا دەتوانآ ژیان بەرێتە سەر.

پێوانەی ئادەمیزادبونی هەرکەسێك، بریتیە لەبیرو ئەقڵی ئەوکەسە، وئادەمیزاد بەگوێرەی یاسای ئافراندن کە بریتیە لەویستی خوا، لەتەك ئەم تونایە تایبەتییە ئافەریدە بووە.

((ئەی مەزدا، بەراستی ئەتۆ وەدیهێنەری بیرو ئەقڵو ژیریتیت. تۆ ئەم جیهانەت بۆ ئەو کەسانەی کە بیری گەشو خاسیان هەیە، ئارامو شادی ئافەرین ئافراندووە.)) یەسنا 47 بەندی 3.

بێگومان، هێزو توانای بیرکردنەوە، توانای هەڵبژاردن وەدی دێنێت. بەگوێرەی یاسای راستی (ئاشا)، کەویستی خوایە، ئادەمیزاد بە شێوەیەك خولقێنراوە کە بتوانێت بیربکاتەوەو هەڵبژێرێت. بتوانێت ئازادانە بیربکاتەوەو هەڵبژێرێت. واتە ئادەمیزاد ئازادە کە باش یا خراپ بیربکاتەوە، خاس یا بەد هەڵبژێرێت. ئەم ئازادی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنە، بەگوێرەی یاسای نەگۆڕی ڕاستی یەکێك لە تایبەتکارییەکانی ئافراندنی ئادەمیزادە. لەم روەوە نەرێتی (نفی) ئازادی بیرکردنەوەو هەڵبژاردن، بە مانای نەرێتی مرۆڤایەتی ئادەمیزادە.

(بۆم ئاشکرا بوو وتێگەیشتم کە بیری پوختەو پێگەیشتو لەتۆوەیە، تۆی ئەو ئەقڵو هۆشەی جیهانی ئافراند، ئەی خوای ئەقڵو گیان، ئەم دیاردەیەش لەتۆوەیە کە ئازادیت بەخشیوە بە خەڵکیو رێگەت پێداون کە ئەگەر گەرەکیان بێت رێگەی راستی هەڵبژێرنو یاخود بچنە سەر ڕێی چەوتو ناراست)) یەسنا 31 بەندی 9.

ئەمە راستییەکی بەڵگەنەویستو بآ چەندو چۆنە کە ئازادیو هەڵبژاردن، بەرپرسێتیشی بەدوادا دێت، ئەگەرکووانەبێت پاداشو سزا هەردوکیان بێماناو دژی دادگەرێتی دەبن.

ئەو یاسایەی کە ئادەمیزادی بەهێزو توانای بیرکردنەوەو هەڵبژاردندا ئافراندووەو ئازادی ئەوەی پێبەخشیوە کە چلۆن گەرەکێتی وەها بیربکاتەوەو هەڵبژێرێت، بێگومان بەرپرسیارێتی چۆنیەتی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنەکەیشی دەگەرێنێتەوە بۆ ئە کەسە خۆی. بەواتەیەکی دیکە، یاسای دژەکردار بە شێکە لەیاسای راستی کە دەربارەی باش یا خراپ بیرکردنەوەی ئادەمیزادو خاس یا خراپ هەڵبژاردنییەوە بە تەواوەتی راستو دروستە.

لەو ڕووەوە کەوتەو کرداری ئادەمیزاد لەجۆرو چۆنیەتی بیرکردنەوەی دێتەدی، هەڵسوکەوتی ئادەمیزادیش بەگوێرەی جۆری بیرکردنەوەو هەڵبژاردنەکەیەوە دەتوانی خاس یاخراپ، رێك یا نارێك، دروست یا نادروست بێت. بەگوێرەی یاسای دژەکردار، دەگەرێتەوە بۆ ئەو کەسە خۆی، وئەوە کە چارەنووسی دیاری دەکات.

چارەنووس، بەو شێوەیەی کە لەئاینەکانی دیکە باسی لێدەکرێت، لەلایەن زەردەشتەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە. ئەگەر مەبەست لەچارەنووسی ئادەمیزاد چۆنیەتی پاشەرۆژی ئەوکەسە بێتو بەم شێوەیە رەچاوی بکەین، لەو روانگەیەوە، هەرکەسێك چارەنوسی خۆی بەهۆی بیروکرداروەتەی خۆیەوە دەخولقێنآ. بە شێوەیەکی فرە سادە دەتوانین بێژین کە چارەنووسی هەرکەسێك بەدەست خۆیەتی.

لەیەسنا 31 بەندی 20 دەبێژێ:

(هەرکەسێك کە راستیو پاکی هەڵبیژێرێت بەختەوەر دەبێتو دەگاتە ڕووناهی. کەسێك کەبە ڕێی چەوتدا بڕوات، دووچاری تاریکیو ژیانێکی پڕ لەپەشیمانیو رەنجەرۆیی دەبێت. لەڕاستیدا، ئەو کەسەویژدانو هەڵسوکەوتی خۆی دەیگەیەنێتە ئەو چارەنووسە)

ئاماژەمان بەوەکرد بەگوێرەی یاسای راستی (ئاشا)، ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئادەمیزاد لەم جیهانەدا دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، بەواتەیەکی دی، لەم جیهانەدا، بەهەشت یا دۆزەخی بۆ دروست دەکات، یانی بەهەشت یا دۆزەخ هەڵێگەڕانەوەی سروشتی هەڵسوکەوتی ئەو کەسە خۆیەتی. بیرووتەو کرداری خاس، شادیو ئارامی بەویژدانو رۆحی ئادەمیزاد دەبەخشێت، وبە پێچەوانەوە، بیرووتەو کرداری خراپ، پەرێشانیو خەمو خەفەت بەدیاری دەبێ بۆویژدانو رۆحی ئادەمیزاد.

کەوایە، لەروانگەی بیری زەردەشتەوە، خوا بەهەشتو دۆزەخی بۆ پاداش یا سزای رۆحی ئادەمیزاد لەجیهانی دوای مەرگ دروست نەکردووە. بەڵکو بەهەشت یا دۆزەخ. دژەکرداری سروشتی رەفتارو هەڵسوکەوتی ئادەمیزاد خۆیەتی. دژەکردارآ کە هەر لەم جیهانەدا بۆ خۆی دەگەڕێتەوەو کار دەکاتە سەرویژدانو رۆحی، وخاسترین ئارامیو شادومانی (بەهەشت) یاخود خراپترین حاڵەتی دەرونی (دۆزەخ) ی بۆ وەدی دەهێنێت. بەکورتیو زۆر سادە دوبارە دەبێژینو دوپاتی دەکەینەوە کە ئاهورامەزدای داناوژیر، بەهەشت یا دۆزەخی بۆ ئادەمیزاد بە شێوەیەکی مادی نەئافراندووە، بەڵکو ئەمە ئادەمیزاد خۆیەتی کە بەدەستی خۆیو بۆخۆی دروستی دەکات.

لەبەندی 4 یەسنا 30 دەبێژێ:

(کاتێك کە ئەم دوو گەوهەرە هاوال دوانە دژ بەیەکە، لەنێو (بیر)دا گەیشتنە یەکدی، بونو نەبونیان ئافراند، خاسترین بوونو ژیان بۆ ئەو کەسانە دەبێت کە پەیرەوی لەڕاستی دەکەن. وئەوانەی کەوا پەیرەوی لەدرۆ دەکەن دوچارو گرفتاری خراپترین حاڵەتی رەوانی دەبن. ئەم یاسایە تا دوا کاتی ژیانو بوون بەردەوام دەبێت).

فرە لەتوێژەران پالێپشتی ئەم بیرۆکەیە دەکەن، ولەو باوەرەدان کە لەئاینی زەردەشتیدا، بەهەشتو دۆزەخ تەنیا شتێکی دەرونیو رۆحین. بڕی دەبێژن کە جگە لەپاداشی رۆحیو دەرونی، لەپەیامی زەردەشتدا ئاماژە بۆ ژیانی پاش مەرگیش کراوە، وباسی رۆژی لێپرسینەوەش کراوە، ودەبێژن کە ئاینەکانی دیکەی پاش ئەم ئاینە هەمویان رۆژی پەسلانیان لەئاینی زەردشتیەوە وەرگرتووە.

لەنێو گاتاکاندا بۆ بەهەشتو دۆزەخ بڕی ناووسیفاتی جۆراوجۆری بۆ دانراوە کە بریتین لە:

1ـ گرودمانه Garo- demana

گر = سرود

دمان یا مان = مالأ، سەرا، خانوو

گرودمانە دەبێتە سەرای ئاوازو سروود

2ـ مان گئیر man- gaire

بەمانای بلێندترین سەرا

(رۆحو رەوانی خۆم لەبلێندترین سەرای بیری خاس جێگیر دەکەم، بەئاگایی لەو پاداشەی کە مەزدائاهورا بریاری داوە بیدات بۆ ئەو کارانەی کردومانە، تا ئەو شوێنەی دەتوانمو توانام هەبێت خەڵکی فێری ئەوە دەکەم کە لەرِێی رِاستیدا تێبکۆشین)یەسنا 28 بەندی 4.

3ـونگهئوش دمانه یاونگهئوش دمانه منتگهو

Vangheush demana manangho

بەمانای (سەرای بیری خاس)

(ئەوسا کە درۆ شکست دەخواو لەنێودەچآ، ئەوانەی خاوەنی ناوی خاسن، وەها هەست بە ئارەزووی دڵی خۆیان دەکەن لەسەرای بیری خاسو پاکی مەزداو راستیدا) بەندی 10 یەسنا 30

4ـ وەهیشتم مەنو Vahishtem manu

بەمانای (خاسترین بیر)ه یاخودویژدانی ئاسودەیە.

5ـ دروج دەمانە drujo demana

بەمانای (سەرای درۆ) کە بریتیە لەدۆزەخو دەرون رِەشی.

6ـ ئەچیشتەم دمانە مننگهو Achishtem demana manangho

بەمانای (سەرای خراپترین بیر)

7ـ ئەچیشتەم مەنو Achishtem manu

بەمانای خراپترین بیر، خراپترین حاڵەتی رۆحی، ئەشکەنجەیویژدان.

ئەگەر بێتو خاس سەرنج بدەینە ئەووشانەی سەرەوە، دەبینین کە گشتیان پەیوەندییان بە بیرو ئەندێشەوە هەیە، هەروەها هەموویان لەنێو دەروندانو جێگەیەکی مادیو تایبەتییان نییە.

لەیەسنا 31 بەندی 14 تا 20دا، زەردەشت پرسیار لەئاهورامەزدا دەکا کە ئایا سزای درۆزنانو لایەنگرانیانو پاداشتی پەیرەوانی راستیو ئەوانەی کە بۆ ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵگاو پێشکەوتنو پەرەسەندنی یارمەتی دەدەن چییە؟

لەکۆتاییدا لەبەندی 20دا بەم شێوەیە وەڵامی دەدرێتەوە:

(ئەو کەسەی بەرەو ژیانێکی پاكو دروست بڕوات، لەپاشاندا رووناکی، جێگەو مەڵێبەندێتی، بەڵام بەدکارانو درۆزنان ماوەیەکی یەکجار زۆر بە پەشیمانیو سەرگەردانیو شیوەن، لەتاریکیدا دەبەنەسەر. بەراستی بەدکارانویژدانیان بەرەو کرداری خۆیان رادەپێچن).

لێرەدا زۆر بەراشکاوی ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە سەرای خراپەکاران ئەشکەنجەی ویژدانیو بآ قەرارو دلأ رِەشی یانە، وپاداشی پیاوچاکان مەڵێبەندی رووناکییە، کە هەمان بەهەشتی بیری خاسە، رستەی بەدکارانویژدانیان بەرەو کرداری خۆیان رادەپێچن، مانای ئەوەیە کە کرداری خراپیانویژدانیان ئەشکەنجە دەدات، بڕی دەبێژن کە لەپەسلانداویژدانی ئادەمیزاد بەرەو بەهەشت یا دۆزەخ دەچێت، (لەپاشاندا بە دورودرێژی باسی لێدەکەین).

بەگوێرەی باوەڕی زەردەشت، ئەو هەڵسوکەوتانەی دەبنە هۆی بەهەشتیبونی ئادەمیزاد، ئاکامی ژێرێتیو داناییو ئاگایی ئادەمیزادە بە یاساکانی فەرمانڕەوایی بوون، بە پێچەوانەوە، دوچاربون بە دۆزەخ لەئاکامی گەوجێتیو نەزانینو بآ ئاگایی ئادەمیزادە، هەروەها فراوان کردنو زێدەکردنی زانیاریو بیری ئادەمیزاد بە تێکرایی، بەگوێرەی یاسای راستی (ئاشا)، شتێکی ئاساییو سروشتیو بەردەوامە، کەوایە، بەرە بەرە بە زیدەبونو فراوانبونی زانیاریو تێگەشتنی مرۆڤ، بیرووتەو کرداری، لەرێبازی هاوئاهەنگبون لەتەك یاسای راستی دا بەرەو خاسی دەروات، وبەم شێوەیە باری قورسی دۆزەخ بەسەر پشتی رەوانی ئادەمیزاد سوکتر دەبێت، وشادی خۆشیوڕووناکی بەهەشت زێتر دەبێت.

لەم هەڵسوکەوتەدا، ئەرکی سەرشانی مرۆڤ ئەوەیە زێتر هەوڵو کۆشش بدات کە لەم کێشەیەدا زانیاری خۆی پتر بکاو زۆر بەخێرایی، نەزانین لەنێو بەرێت بۆئەوەی باری دۆزەخ سوکترو کەمترو خۆشی بەهەشت زێتر بێت.

بێگومان مرۆڤ دەتوانآ بەهۆی هەوڵو کۆششی بآوچانی خۆیەوە، زانیاریو هۆشی خۆی زێتر بکات، هاورآ لەتەك ئەمەدا، دەتوانآ ئاگایانەو بەویستی خۆیواز لەخراپییەکانو ناراستیەکان بهێنێت.

بەم شێوەیە، زەردەشت لەلایەکەوە مرۆڤ بەهۆی ئەو هێزو تواناى بیرکردنەوەی کە هەیەتی، وایدادەنآ کە چارەنووسی خۆی ـ چاك یاخراپ ـ بەدەست خۆیەتی، لەلایەکی دیکەوە، دڵنیای دەکات بەوەی کە دەتوانآ خۆی خۆی خاستر بکات. هەروەها هیواداری دەکات کە هەموو کەس دەتوانآ بەهۆی بیرو ئەقلی خۆیەوەو هەروەها کۆششو ماندونەبون لەرِێی پترکردنی زانیاری خۆیەوەو لەسەر بنچینەی هەمان ئازادیو هەڵبژاردن کە لەبونیدا رِەچاوکراوە بۆی، چارەنوسی خۆی لەخراپە بۆ خاسی بگۆرِێتو رۆحی خۆی لەدۆزەخەوە رِاگوێزێتە نێو بەهەشت، بەواتەیەکی دی، ئادەمیزاد هەروەکو چلۆن توانای ئەوەی هەیە دۆزەخ یا بەهەشت بۆخۆی بخولقێنآ، توانای ئەگەری کەمکردنەوەی دۆزەخو زیادکردنی بەهەشتیشی هەیە. لەبەر ئەمە، دۆزەخ بۆ ئادەمیزاد لەروانگەی بیری زەردەشتەوە هەمیشەیی نییە، بەڵکو کەمێك درێژخایەنە، لەبەندی 11 یەسنا 30 دەبێژێ:

(خەڵکینە، هەرکاتێك لەیاسای (خۆشیو رِەنج) کە خوای ژیرو دانا ئافراندویەتی تێبگەنو بزانن کە لەئاکامدا رەنجی درێژخایان سزای درۆزنانو بەدکارانە، خۆشیو بەختەوەری هەمیشەیی پاداشتی پەیرەوانی راستی دەبێت، ئەوسا بێگومان بەهەڵبژاردنی راستی دەگەنە بەختەوەری).

لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە گۆرِآ، ئایا لەروانگەی جیهانبینی زەردەشتەوە، پاش ئەوەی رۆحی ئادەمیزاد لە لەشی جیا دەبێتەوە، لەو بەهەشت یادۆزەخەی کە تووشی بووە رزگاری دەبێت، یاخود ئەم (خۆشی)یە یا (خراپترین حالەتە) هەتاهەتایە هەروا بۆ رۆح دەمێنێتەوە؟ زەردەشت لەنێو گاتاکاندا بەرِاشکاوی ئاماژەیەکی رِوونو رۆشەنو راستەوخۆی بۆ ئەم مەسەلەیە نەکردووە.

لێرەشدا دوبارە زەردەشت نەچۆتە نێو باسی جیهانی پاش مردنو ئەو شتانەی کە لەتەك هەستی ئادەمیزاد دا پەیوەندییان نییە.

زەردەشت، بیر لەم ژیانە دەکاتەوە کە چلۆن ئادەمیزاد بتوانێ خاستر تیایدا بژیو سوود لەخۆشیەکانی وەربگرێتو بەرەو پوختەییو بێخەوشێتی برِوات. بەلآم ئەوەی شایانی باس بێت ئەوەیە کە ئەگەر بەوردی سەرنج لە وشەکانی زەردەشت بدەینو بچینە نێو قوڵایی برِی لەپەیامەکانی، دەتوانین هەندێ شتمان وەدەست بکەوێت، بۆنمونە:

1ـ لەسروودی 11 یەسنا 30، هەروەکو لەمەوبەر باسمان لێکرد، دۆزەخ بە درێژخایەن، نە هەمیشەیی باسدەکات.

2ـ لەسروودی 11 یەسنا 46 دا، بۆ پەیرەوانی درۆ، دۆزەخی بە هەمیشەیی داناوە.

3ـ لەسروودی حەوتەم لەیەسنای 45، نەمرێتی بەهەشتی بۆ پەیرەوانی رێگەی راستو دۆزەخی هەمیەشیی بۆ خراپەکاران ناساندووە.

ئێستا ئیدی، بە لێوردبوونەوەو چونە نێو قوڵایی دەریای پەیامەکەی زەردەشتو ڕەچاوکردنی ئامانجو ئارمانەکانی ـ کە بریتین لەچاکسازی بیرو کرداری ئادەمیزادو پێشخستنو ئاوەدانی ژیان لەم جیهانەدا ـ دەتوانین بێژین کە:

خاسترین یاخراپترین حاڵەتێك کە ڕۆحی ئادەمیزاد لەم جیهانەدا تووشو دوچاری دەبێت، پاش مردنو لەناوچونی لەشیش، هەر بارە بەسەر ڕۆحو ڕەوانی ئەو کەسە، بەم شێوەیە، بەهەشت یا دۆزەخ کە بەهۆی بیروکرداری مرۆڤ خۆی هاتۆتە دی، لەتەکیا لەم جیهانەدا بەرەو جیهانی دیکە دەڕوات.

کەوایە، دوبارە ئەمە ئادەمیزاد خۆیەتی کە دەبێ تا هێزو توانای هەیە هەوڵوکۆششی خۆی لەژیاندا بەکاربهێنێت بۆئەوەی ئەو دۆزەخەی، لەژیاندا باری سەرویژدانی بووە بەرەبەرە کەمبکاتەوە تا لێی ڕزگار دەبێو بەهەشت بکاتە جآ نشین، بۆئەوەی لەژیانی جیهانەکەی دیکە ڕەوانی لەبەر ڕۆشنایی ئەو بەهەشتە دەرونیە، ئارامیو شادمانی هەمیشەیی وەدەست بکەوێت.

دیدی زەردەشت لەبارەی درێژخایاندنی دۆزەخ بۆ ئادەمیزاد، پەیوەندی بە ژیانی ئەم جیهانەوەیە، مانای ئەوەیە کە ئادەمیزاد تا ئەو ڕۆژەی زیندووە، دەرفەتی ئەوەی هەیە کە بەگۆڕینی هەڵسوکەوتو ڕەفتاری خۆی، بەرەو خاسێتیو ڕاستی بڕوات، لەدۆزەخی دەرونی خۆی ـ هەرچەندە درێژخایەنیش بێت ـ کەمبکاتەوەو لەهەمیشە بوونی ڕزگاری بکات.

بەگوێرەی ئەوەی تائێستا دەربارەی بەهەشتو دۆزەخ لەروانگەی زەردەشتەوە باسی لێکرا، دەتوانین زۆر بەکورتی دەربارەی ئەم باسە بێژین:

مرۆڤ، هاوجوت لەتەك هێزو توانای بیرکردنەوەدا ئافەریدە بووە، وبەگوێرەی یاسای ڕاستی (ئاشا) کە یاسای بوونوویستی خوایە، ئازادە لەچۆنیەتی بیرکردنەوەو هەڵبژاردندا. ئەم ئازادی هەڵبژاردنەی بەرپرسیاري دەکات بەرامبەر جۆری هەڵبژاردنەکەی، هەروەکو چلۆن دژە کرداری ڕەفتارو هەڵسوکەوتی هەر بەو شێوەیەی هەیەتی بۆخۆی دەگەڕێتەوە، وئەم یاسای گەرانەوەش بەشێکە لەیاسای نەگۆڕی (ڕاستی) کە ژێرخانو فەرمانڕەوایی ئەم (بوونە)یە، کەوایە لەم ڕوانگەیەوە، بەهەشت (یاخود باشترین حاڵەتی دەرونی)و دۆزەخ (یاخراپترین حاڵەتی دەرونی) خوا بۆ ئادەمیزادی نەخولێقاندووە، بەڵکو ئەمە ئادەمیزاد خۆیەتی کە بۆ خۆی دەخولقێنآ، وئەمە لەراستیدا دژەکرداری سروشتیو منتیقی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی خودی ئادەمیزادەو بآ هیچ کەموکوڕییەك بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. کەوایە، ئادەمیزاد ئەم تواناییەی هەیە کە لەکاتی ژیانیدا لەم جیهانەدا بەهۆی دوورەوپەرێزی کردن لەخراپەو ناڕاستی، وبەرەو خاسیو ڕاستیو دروستی هەنگاو هەڵبهێنان، لەدۆزەخی دەروونی خۆی کەمبکاتەوەو بەهەشتی ژیانی خۆی زێتر بکات.

بەم شێوەیە، رۆحو رەوانیش پاش ئەوەی لە لەش جیادەبێتـەوەو رزگاری بوو لەتاریکیو ئازارەکانی دۆزەخ، وتێروپڕ لەرووناهی ئارامبەخشی بەهەشت، نەمرانە رزگاری بێت.

باوەڕ بە نەمرێتی رۆحو ژیانی پاش مردن لەنێو ئاینە جۆراوجۆرەکاندا هەر لەمێژەوە تا ئیمرِۆ جێگەی باسو گفتوگۆبووە. لەئاینی خواپەرستی زەردەشتیدا (پێش دەستکاریکردنو تێکەڵوبونی ئەفسانەو باوەڕە دیانیەکانی دیکە)و هەروەهاوتە ڕەسەنەکانی خودی زەردەشت، زۆر کەم باسی تەوەرەکانی سەرو سرووشتی (ماوراو الگبیعە) کراوە. ئەگەر تەنیا لەروانگەی گاتاکاندا بڕوانینە ئەم ئاینە، دەبینین زۆربەی زۆری ئامۆژگارییەکانی دەربارەی چلۆنایەتی چەرخاندنی ژیانی ئەم جیهانەیەو چی بکەین کە خاس بژین. بۆ ئەم کارەش زێتر بایەخ بە ئاکارەکانی ژیان دراوە، وئەو سآ بنچینە بەناوبانگەی کە ئاینی خواپەرستی (زەردەشتی) لەسەر بونیاد نراوە، وسەرجەم لەهەموو جیهاندا ناوو ناوبانگێکی تایبەتی هەیەو جێگەی خۆی کردۆتەوە کە بریتین لەبیری چاک، وتەی چاکـو کرداری چاک، سیفاتو رەوشتی ئەهریمەنیش دروست دژی ئەم سآ بنچینەیەیەواتە بیری خراپ، وتەی خراپو کرداری خراپ. زەردەشت هەمیشە خەڵکی هانداوە لەم دوو رێگەیە، رێگەی چاکە هەڵبژێرن، بۆئەوەی لەم جیهانەدا پاداشتی مادیو لەجیهانی پاش مردن پاداشتی معنوی وەربگرن.

دەربارەی پاداشتی مادی ئەم جیهانە، بەهۆی کاروکۆشش لەرێگەی راستودروست، مرۆڤ پاداشتی خۆی وەردەگرێتو ژیانێکی بەختەوەرو پڕ لەخۆشیو ئاسایشی پێدەگات.

بە پێچەوانەوە، تەمەڵیو تەوەزەلی دەبێتە هۆی داباربنی خەمو خەفەتو ناخۆشیو دەردەسەری بەسەر ژیانی ئادەمیزاد دا(کە ئەمەویستو ئارەزووی ئەهریمەنە).

لەگاتاکاندا، باسی هیچ شتێك بەراشکاوی دەربارەی رۆحو چۆنیەتی جیابونەوەی لەلەشی ئادەمیزاد نەکراوە. بەلآم دەربارەی هەڵیسەنگاندنی باوەڕی مرۆڤ بە بوونی کردگاری تاکوتەنیا، باسی سآ جۆر یا دەستە[62] دەکات، وهەروەها دەربارەی سآ جێگە یا پلە قسەکراوە کە دەتوانین ئەو سآ جێگەیە بە بەهەشتو دۆزەخو بەرزەخ دابنێین. لەیەسنا هات 28 بەندی 11 دەبێژێ:

(.. لەم روەوە ئەی مەزدا بەهۆی ئەقڵەوە تێم بگەیەنە کە ژیانی داهاتوو(پاش مەرگ) چلۆن دەبێت؟).

لەزۆر جێگەی گاتاکاندا، بەگوێرەی شێوەی تەفسیرو هەندێ هۆی دیکە بڕی جار دەتوانرێت بەهەشتو دۆزەخو کارکردنەسەر هەستی مرۆڤ دەربارەی خۆشیو ئەشکەنجە بەدیاردەیەکیویژدانی بژمێرێت.

واته، هەرکەسێك کاری چاکە بکات، ویژدانی ئەوەندە ئاسودەو ئارام دەبێت، هەست بەخۆشی بەهەشتی دەکا، وبەپێچەوانەوە مرۆڤێك کە کاری خراپو ناشایست بکات، ئەوەندەویژدانی نارەحەت دەبێت، کەوا دەزانێ لەئاگری دۆزەخدایە.

هەروەکو لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد، لەنێو گشت ئاینە ئاسمانیەکانو باوەڕو مەکتەبەکانی دروستبووی دەستی مرۆڤ، پاش ماوەیەك (کەم یا زۆر) گۆڕینو زیادە خستەسەرو کەمکردنەوە لەئەسڵی فەلسەفی ئەو باوەڕانە ڕوو دەدات. ئاینو بیرو باوەڕو فەلسەفەی زەردەشتیش لەم مەسەلەیە جیاو بآ بەش نییە. پاش ئەو هەموو کارەساتانەی بەسەر ئەم ئاینەو پەیرەوانیدا هاتووە، بەتایبەت هێرشی ئەسکەندەرو عەرەبەکان بۆ سەر ناوچەکەو سوتاندنی زۆربەی زۆری کتێبەکانو دەربەدەرکردنو ڕەشکوژی پەیرەوانی زەردەشت، دیارە کە گۆڕانکارییەکی زۆر بەسەر بنچینە فەلسەفیەکانی ئەم ئاینە پیرۆزە دا هاتووە، بەتایبەتی دەربارەی ژیانی پاش مەرگ، هەندێ لەهۆکارەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ خودی پیاوە بەناو ئاینیەکانی سەردەمی دوای زەردەشت خۆی.

لێرەدا بەپێویستدەزانم زۆر بەکورتی باسی چارەنووسی رۆحو رۆژی پاش مەرگو پەسلان بکەم. پوختەی ئەوەی خراوەتە پاڵ. ئاوێستاو لەیەشتەکانو بڕێ لەنوسینەکانی پەهلەوی باسکراوە دەبێژێ:

.. پاش مردنی ئادەمیزاد تا سآ رۆژ رۆح لەلەشی جیانابێتەوە، لەرۆژی سێهەمدا، ئیدی رۆح لەلەشی مردووەکە جیادەبێتەوەو بۆ گەیشتنە پاداشت یا سزای کرداری خۆی، بەرەو پردی چینوەت دەروات.

لەکتێبی ڤەندیداد، بەشی 19، بەندی 24ـ 27 دەبێژێ:

(ئەی دروستکەری جیهان، چارەنووسی ئەو کارە خاسانەی کە کەسێك لەجیهانی مادیدا بۆ رۆحی خۆی کردویەتی، پاش مردن بۆکوێ دەچێ لەکوێرا خڕ دەبنەوە؟

ئاهورامەزدا دەفەرموێ: پاش ئەوەی ئادەمیزاد دەمرێ، ئەگەر گوناهبار بوبێت، لەپاش سێهەمین شەوداو لەبەرەبەیاندا، فریشتەی میهر دێتە سەر کێوێکی درەخشانو تیرۆژی خۆر هەلێدێت:

ئەی زەردەشت، دێوێك کە ناوی (ڤیزەرەش)ە Vizares، رۆحی ئەو کەسە گوناهبارە دەبەستێتەوەو لەتەك خۆیدا دەیباتە سەر پردی چینیوەت، لەوێرا هەر کارێکی لەجیهانی مادی دا کردووە، لێپرسینەوەیەکی تەواوی لێدەکرێت.

هەر لەوێرا کاروکرداری خاس خۆی لەشێوەی کیژۆڵەیەکی فرەجوانو نەرمونیان، خۆش ئەندامو باڵآبەرز، ژیرو دانا بەناوی نائیریکا Nairika دەنوێنآو خۆی دەردەخات.

ڕۆحی مرۆڤە خاسەکان لەکێوی ئەلبورزەوە تێدەپەڕێناو لەسەر پردی چینیوەت دەگوزەرآو دەیانگەنێتە جێگەی دیاری کراویان. ئا لەم کاتەدا، فریشتە وەهومەن لەبارەگای ڕووناهییەوە هەڵێدەستێت‌و دەبێژێ:

ئەی پیاوخاس، چلۆن لەجیهانی کاتی (مادی)یەوە بەرەو ئەم جیهانی هەمیشەیی‌و نەمرە هاتیت؟ ڕۆحی مرۆخاسەکان بەخۆشی‌و شادییەوە دەگەنە خزمەت ئاهورامەزداو فریشتەکانی‌و دەچنە نێو بەهەشت‌و تێکەڵ بە پیاوخاسانی دیکە دەبن).

لێرەدا ئەوەی شایانی باسەو دەبی ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە کە ئەم گۆڕانکارییانە دەربارەی بەهەشت‌و دۆزەخ چلۆنوێ بە ئاسانی تێکەڵ بەم ئاینە بووە؟ چونکو لەسەردەمی زەردەشت‌و پیرەوە نیزیکەکانی لەم بارەیەوە، هەرکام لەچاکەو خراپە کە ئادەمیزاد دەیکا، پاداشت‌و سزاکەی بەهۆی‌ویژدانی ئەو کەسەوە پێی دەگاتەوە.

لەبیستەمین نەسکی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان کە بەنێوی (هادوخت نەسك)ە وەیە، دەربارەی چارەنووسی ڕۆح هەروەکو لەسەرەوە باسمان کرد دوپات کراوەتەوە. ئەم نەسکە کراوە بە سێ بەشەوە، بەشی یەکەمی دەربارەی سوودی هەندێ لەوێردونزا دەدوێت، بەشی دوهەمی‌ویژدانی پیاوخاسان‌و چارەنووسیان پێشان دەدات‌و بەشی سێهەم ویژدانی خراپەکاران‌و گوناهباران پیشان دەدا.

لەم نەسکەدا لەبەشی دوهەمدا دەبێژێ:

(زەردەشت لەئاهورامەزدا دەپرسێت، کاتێك پیاوخاسێك لەم جیهانە وەدەردەچێت، ئەو شەوە ڕۆحی لەکوێرا دەگیرسێتەوەو پشوو دەدات؟

وەڵامی دەدرێتەوە کە ئەو شەوە ڕۆح لەنیزیك لەش دەمێنێتەوەو یەکآ لەخۆشترین‌و شادترین شەوانی تا ئەوسا دەبێت‌و بەسەر سەری لەشەوە دەست دەکا بە نزاونیایش کردن‌و داوای لێبوردنی بۆ دەکات، زەردەشت دەربارەی شەوی دوهەم‌و سێهەم هەمان پرسیار دەکاتەوە. هەمان وەڵامی پرسیاری شەوی یەکەم دەبیستێت. بەم شێوەیە، ڕۆح بۆ ماوەی سآ شەو ڕۆێژ نیزیك لەجەستەی خاوەنەکەی دەمێنێتەوە.

پاش تێپەڕبونی سێهەمین شەو، بەرەبەیانی ڕۆژی چوارهەم شەماڵێکی فێنکی بۆن خۆش لەباشورەوە هەڵێدەکاو ڕۆح دەخاتە خۆشی‌و شادییەوە، چونکو ئەو بۆنەی بەسەریا دێت. هەرگیز تا ئەوکاتە، بۆنی‌وای نەکردبوو، پاش ئەوەی ئەو بۆنە بەسەریا دێت، ویژدانی لەشێوەی کیژۆڵەیەکی یەکجار جوان.

بالآبەرز، دەموچاو سپی، سینەپڕو بەشەرمو حەیای پانزە ساڵنە، خۆی پێشان دەدات. کیژۆڵەیەك بەئەندازەیەك جوان کە هەرچی جوانیو خاسی هەیە تیایدا کۆبۆتەوە. رۆحی پیاوچاکەکە لێی دەپرسێت:

ئەی جوانترین کیژۆڵە، تۆ کێیت؟

کیژۆڵە ناسکەکە لەوەڵامدا دەبێژێ:

ئەی پیاوخاسیوتە خاسی کردار خاس، ئەزویژدانی تۆم، ئەتۆ کارێکت کرد کە من بەم شێوەیە جوانو سەربەرزبم، لەجیهاندا، لەکاتی ژیانتا، کاتێك کە خەڵکی دیکە خەریکی خراپەکاری بون، ئەتۆ رێگەی خاسیت گرتەبەرو بەهۆی کردارو هەڵسوکەوتی شایستەتەوە، منت کە جوان بووم جوانترکرد. پاشان ئەو کیژۆڵە جوانە، یاخودویژدانی پیاو خاسەکە، رۆحی ئەو پیاوە خاسە بەختەوەرە دەگەیەنێتە یەکەمین مەنزلێگا کە بیری خاسە، پاشان دەیباتە دوهەمین مەنزلێگا کەوتەی خاسە، سێهەمین مەنزلێگا مەلێبەندی کرداری خاسە. ئەوسا رۆحی پیاوە خاسەکە لەتەكویژدانیدا یەکدەبنو دەچنە نێو بەهەشت یا دەبنە رووناکی هەمیشەیی).

لەبەشی سێهەمی ئەم نەسکەدا، هەموو ئەم رووداوانە دوپات دەبنەوە، بەلآم بە پێچەوانەوە، بۆ خراپەکارانو بەم شێوەیە کە سآ شەوی یەکەم، رۆحی خراپەکار دوچاری ئەشکەنجەو نارەحەتییەکی یەکجار زۆر دەبێ، وپاشان بەرەبەیانی رۆژی چوارهەم، ویژدانی لەشێوەی پیرەژنێکی یەکجار ناحەزو ناشیرین خۆی دەنوێنآو رۆحەکە بە سآ قۆناغی دۆزەخ تێپەڕ دەکات (بیری خراپوتەی خراپو کرداری خراپ)و لەکۆتاییدا لەبۆشاییەکی تاریکی بآ پایان بەرەلآی دەکات.

بیری چاك، وتەی چاكو کرداری چاك، ئەم سآ بنچینە بنەرەتییە ئاکاریەی کە کۆڵەکەی ئاینی زەردەشتین، بریتین لەسآ قۆناغی تکاملی ئاکاری مرۆڤ، کە هەرکات کەسێك پەیرەوی لەیەکێکیان بکات، بآ هیچ چەندو چۆنێك پەیرەوی لەدوانەکەی دیکە دەکات. بێگومان ئەگەر بەووردی بڕوانینە هەموو لایەنەکانی ژیان، دەبینین گشت بنچینەکانی ئوسولی ئاکاری بەشێوەی کردار لەجیهاندا، لەم سآ بنچینە یا ئەسڵە خولآسە دەبێت. هەرکەسێك ئەم سآ ئەسڵە پاکە بەدروستی ئەنجام بداتو باوەڕی پآ بێت، لەهەموو بوارەکانی ژیاندا سەرکەوتو دەبێ، ئەگەر هەموو بەم کارە هەلێسن، کۆمەڵگایەکی پڕ لەئاشتیو ئاسایشو هێمنایەتیو میهرەبانیو تەبایی مان دەبێت. ئەوسایە کە دەگەینە ژیانێکی پڕ لەخۆشیو کامەرانی مادی لەم جیهانەداو لەروی معنوی یەوە بۆ هەمیشەویژدانێکی ئاسوودەو بآ دەدەسەریمان دەست دەکەوێت. ئا لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە چلۆن زەردەشت زۆر ژیرانە توانیویێتی ئەو سآ پلەیەی بەهەشتو دۆزەخو بەرزەخ، وەستایانەو دانایانە ببەستێتەوە بەم بنچینە ئاکارییەوە. بەلآم لەنووسینەکانی زەردەشتیەکان کە لەپاش زەردەشت نووسراونەتەوە، باس لەوەکراوە کە یەکەمین مەنزلێگا لەنێو هەسارەکاندایە، ودوهەمین مەنزلێگا لەدەوروبەری(مانگ)دایەو سێهەمیشیان لەبەرزترین

دوندی رووناکایەتیدایە. لەباسی ئەم داستانەدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مرۆڤ پاش ئەوەی لەم سآ قۆناغە ئاکاریە تێپەڕدەبێت، ئەوسا دەگاتە جێگەی بێخەوشی مرۆڤایەتیو بارەگای (نور الانوێر)و دەگاتە پلەی خواوەندێتی. هەرچەندە لەوتەو ئامۆژگارییە ڕەسەنەکانی خودی زەردەشت ئەوەندەمان بۆ نەماوەتەوە، بەلآم هەر لەئەمەی کە لەبەر دەستدایەو بەخاسی پارێزراوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەوڵو کۆششی ئەوە بووە کە رەسەنێتی مرۆڤو پلەوپایەی بپارێزێتو ڕێزی لـآ بگیرێت. هەوڵی داوە کە خەڵک بەهۆی هێزی بیرکردنەوەو توانایی خۆیان، ڕێگەی راستیو دروستی ژیانیان هەلێبژێرن.

ئەوەی کە بۆمان ئاشکراو روونە، ئەوەیە کە زەردەشت باوەڕی پتەوی بە نەمرێتی رۆح هەبووە. ژیانی پاش مەرگی بە تەواوکەرەوەی ژیانی مادی ئەم جیهانە داناوە. هەرکەسێك ژیانی لەم دنیایەدا بەدروستیو خاسیو پاکی بردبێتەسەر، لەو دنیاش (لەجیهانی نەمرێتی) هەر بەو شێوەیە ژیان دەبێتە سەر، وپاداشتی هەلێبژاردنی ژیانی راستیو دروستی ئەم دنیا وەردەگرێت. بەپێچەوانەوە، ئەوانەی کە لەم دنیا مادەپەرستو پەیرەوی ڕێگەی درۆو خراپە بون، لەژیانی پاش مەرگیش هەر بەو شێوەیە دەبنو سزای کرداری خۆیان وەردەگرن، وجگە لەرەنجو ئەشکەنجەی رۆحیو پەشیمانی، هیچیان دەستگیرنابێت. ئەوسا دەزانن کە دوچاری سزای کرداری خۆیان بونو بەس.

پوختەی ئەم باسە:

پتر لەسآ هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر، زەردەشت دەربارەی خێروشەڕ، چاکەو خراپە، باوەڕو بآ باوەڕی، پاکیو ناپاکی، بەختەوەریو بەدبەختی، هەروەها ئازادی هەلێبژاردنوویستو خواستی ئادەمیزاد، بەرنامەیەکی وەهای دارِشتووە کە تائێستا مرۆڤ لەم سەردەمەشدا هێشتا نەیتوانیوە بگاتە ئەو بەرنامەیەو دایڕێژآ.

بە باوەڕی زەردەشت، کاتێك مرۆیەکی راستو پاك دینوویژدان، لەڕوی هۆشیاریو بەهۆی ژێرێتی یەوە توانی دانای گەورەی ئافەریدەگار بناسێت، وبەئازادیو بەویستی خۆی ڕێگەی راستی هەلێبژاردو پەیرەوی لێکرد، ئەوسا ئیدی دەگاتە سیفاتی کەمالیەی خواو دەتوانآ بەکردار ببێتە دیارگەی ئەوسآ بنچینە رەسەنەی پەیامی زەردەشت (بیرووتەو کرداری خاس). ئا لەم حاڵەتەدایە کە ئادەمیزاد دەگاتە دوندی ژیانێکی پڕ لەئاسایشو ئارامیو تەباییو بەهەشتی ڕاستەقینەی بۆ ئامادە دەبێتو دەرِەخسێت.

لەم بەهەشتەدا نە جێگەی کەشیشو مەلاو کاهن دەبێتەوە، ونەدەبێتە لانەی رابەرو سەرۆكو سولتانو.. ئەو بەهەشتە مەلێبەندی مرۆڤی ئازادو رزگارە، ئازاد لەحوکمڕانو زۆرەملـەیی دەرەکیو رزگار لەبیری خراپی نێو دەرون. مرۆڤ بەو شێوەیەی کە دەبی ببێت نە بەو شێوەیەی کە هەیە. بێگومان ئەم رێبازە فرە چەتونو درێژخیانە. فرە لەپیاوچاکان بیریان لەمەکردۆتەوەو هەوڵیان داوە بۆ چەسپاندنی کۆمەڵگایەك کە ئەم راستیانەی تێدا رەچاوبکرێت،

بەلاّم نە لەكاتی زەردەشتداو نە تا هەنۆكەش، ئادەمیزدا نەیتوانیوە بە تێكرِایی بگاتە ئەم ئامانجە. دەتوانین بێژین تا مرۆڤ بەتاكو كۆرِو كۆمەڵەوە، یاخود بەلایەنی كەمەوە بێژین زۆربەی زۆری خەڵك ئەم رێبازە نەگرنەبەرو خۆیان لەتەك یاسای راستیو نیزامی ئافراندن هاوئاهەنگ نەكەن، وخۆپەرستیو تاك رِەوی نەخەنە لاوە، كۆمەڵگا ناگاتە رۆخی دەریای ئارام، وئاسایشو خۆشیو بەختەوەری بەچاو نابینێت.

بەهەشتو دۆزەخێك، كە زەردەشت باسی دەكات، بەهیچ جۆرێك لەتەك ئەو بەهەشتو دۆزەخەی كە لەئاینە ئاسمانییەكانی دیكە باسی لێكراوە چونیەك نییە، ئەم بەهەشتو دۆزەخەی زەردەشت، شێوەیەكی تایبەتی نییەو لەروی مادیەوە بەهیچ جۆرێك لەگاتاكاندا باسی لێنەكراوە، نە پەیوەندی بە كاتەوە هەیەو نە بە جێگە. واتە نە جێگەیەكی تایبەتی هەیەو نە كاتێكی تایبەتیو سەردەمێكی دیاری كراو.

لەزۆر لەسروودەكانی زەردەشت بەراشكاوی ئاماژە بۆ ئەوە كراوە كە بەهەشتو دۆزەخ، هەر لەم جیهانەدایە، لەبیروویژدانی ئادەمیزاد دایەو سزاو پاداشتیش هەر لەژیانی ئادەمیزاد دایە، وئاكامی بیروكرداررووتەی خودی ئادەمیزادە كە بۆی دەگەرێتەوە.

زۆربەی زۆری توێژەران لەو باوەرِەدان كە بەهەشتو دۆزەخی گاتاكان شتێكی دەرونیو مەعنەوییە، بەلاّم برِێ جار لەنێو گاتاكاندا ئاماژە بۆ ئەوە كراوەو یاخود بۆچونیەوای تێدا دەبینین كە ئاماژە بۆ ژیانی پاش مردن دەكات.

دەربارەی باسی پردی چینیوەت، هەرچەندە دەتوانین بێژین كە لەبەرئەوەیماناكەی دەبێتە پردی دادوەری كردن، دەتوانین بێژین كە مەبەستی هەر لەم جیهانەدایە، بەلاّم هەرچۆنێك بێت باسێكی ژیانی پاش مردنیش دەگرێتەوە.

كەوایە دەتوانین بلێیین، ئاینی زەردەشت باسی ژیانی پاش مردنیشی كردووە، بەلاّم نە چۆتە نێووردەكارییەكانیەوە.

## 5- هاوسەر خواستن لەئاینی زەردەشتیدا

باشترین نیشانە بۆ پێشكەوتنو شارستانییەتی كۆمەڵگایەكو میللەتێك دەتوانین بە بەراوردكردنی پایەی ژن لەناو ئەو كۆمەڵگایەدا بناسین. هەر كۆمەڵگایەك كە رێز لەئافرەت نەگرآ، وژن بەكەمو بەچاوێكی سوكەوە تەماشا بكاتو لەمافی تایبەتی بآ بەشیان بكەن، بێگومان ئەو كۆمەڵگایە دواكەوتوو نەزانە. كۆمەڵگایەك كە هەست بە پایەو شوێنی گرنگی تایبەتی ئافرەت نەكا، رۆحی رِەسەنیو چاكە لەناو ئەو كۆمەڵگایەدا نییە.

دەتوانم بێژم کە ڕێزگرتن لەئافرەت، وبەشداریکردنیان لەمافە کۆمەڵایەتییەکان، باشترین نمونەیە بۆ ناسینی کۆمەڵگاو میللەتانی پێشکەوتوو جیاکردنەوەیان لەکۆمەڵگایەکی دواکەوتوو. کۆمەڵگای کوردەورای، ئەم ڕەوشەی ڕێزگرتن لەئافرەت لەباوو باپیرانی بۆ ماوەتەوە، ولەمێژەوە چ لەناو شارەکانو چ لەناو گوندەکانو لەنێو کۆچەرەکاندا هەموو بەچاوی ڕێزەوە ڕوانیویانەتە ئافرەت. ئەگەر تەماشای مێژووی نەتەوەکەمان بکەین، زۆر نمونەی سەرنج ڕاکێشەر دەبینین کە تیایدا ئافرەت چ ڕۆڵێکی بالای هەبووە لەژیانی کۆمەلآیەتیو ڕامیاریو تەنانەت ئیشوکاری جەنگیشدا. ئەم ڕەوشتە بەرزە، هەروەکو گوتمان لەباپیرانمان بۆمان ماوەتەوە، وزەردەشت زۆر زۆر جەختی لەسەر ئەم باسە کردووە، پێش هەزاران ساڵ لەمەوبەر لەکتێبی پیرۆزی ئاوێستا پلەو پایەیەکی تایبەتی بۆ ئافرەت داناوەو بە بەشێکی گرنگی لەکۆمەڵگادا داناوەو لەهەموو مافێکی کۆمەلآیەتی تەنانەت لەڕێو ڕەسمی ئاینیش دا، شان بەشانی پیاو بووە.

لەئاوێستادا ستایشتی پاکدامەنیو پاکیزەیی ئافرەت کراوە. لەگاتاکاندا، یەکآ لەئامانجە سەرەکیەکانی پێکهێنانی خێزان لەسەر بنچینەی خۆشەویستییەکی پاکو ڕێز لەیەکگرتنی ژنو پیاو داناوە. کە یەکێك لەنوێژەکانی زەردەشتیەکان ستایشتی ئەو ئافرەتە پاکانەی کردووە کە ڕێگەی ڕاستیو دروستی یان گرتۆتەبەر، وئەو ئافرەتانەی کە لەتەك هاوسەرەکانیان بە ئەمەکنو فیداکارنو فەرمانەکانیان جآبەجآ دەکەن.

لەئاینی زەردەشتیدا، هاوسەرخواستن بە مەبەستی پێکهێنانی خێزانو بەرپاکردنی ژیانێکی خۆشو پڕ لەشادیو کامەرانیو زاوزآ کردن، بە شێوەیەکی وەها لەسەر بنەمایەکی ڕاستیو دروستو بەهێز لەبەر چاوگیرابو کە خۆی لەخۆیدا دەبێتە دەستەبەری (زامنی) بەردەوامبونی ژیانی هاوبەشیو خۆشەویستی لەنێوان ژنو مێرد هەتاهەتایە.

زەردەشت لەگاتاکاندا (یەسنا هات 53 بەندی 5) ئامۆژگاری ئەو کیژۆڵەو کوڕانە دەکات کە پێکەوە پەیمانی هاوسەریتی یان بەستووەو پێیان دەبێژێ:

(ئەم گوفتارانە ئاراستەی ئێوە دەکەم

ئەی تازە بوكو زاوایان،

بە بیرێکت خاس، گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانم ڕابگرن

ولەڕێگەیویژدانی خۆتان هەڵیسەنگێننو بەکاری بێنن:

هەمیشە بە بیری خاسو خۆشەویستییەوە بژین،

وهەریەكەتان لەراستیدا

پێشبرِكیی لەیەكتری بكەن

تا ژیانێكو خێزانێكی خاس پێكەوە بنێن)

لەئاینی زەردەشتیدا، بۆئەوەی تەكوزی لەئیشوكاری جیهاندا بەردەوام بێتو جڵەو لەبآ رەوشتیو بەرەلآیی بگیرێت، جەخت لەسەر هاوسەرخواستن كراوە، وژیانی تەنیاییو گۆشەگیریو پێكنەهێنانی خێزان، بەكارێكی خراپو ناپەسەند باسی لێكراوە.

لەڤەندیداد، بەشی چوارهەم، بەندی 47، ئاهورامەزدا دەبێژێ:

(ئەی ئەسپەنتمان زەردەشت، ئەز، هەمیشە پیاوی ژندار لەپیاوی بآ ژن، وپیاوی خانەدار لە پیاوی بآ خانومانن بەخاستر دەزانم).

هەروەها لەبەندی 44 دەبێژێ (ئەركی سەرشانی هەموو كەسێكە كە برای ئاینی خۆی هانبداتو رێنمایی بكاتو یارمەتی بدات بۆ ژان هێنانو بەرپاكردنی ژیانی هاوسەرێتی)

هاوسەر خواستن، لەئاینی زەردەشتیدا، بەجوانترینو باشترین شێوە چارەسەریەتیو رێگەو رێنمایی بۆ رەچاوكراوە. تەوەری ژن هێنانو شووكردنو چۆنیەتی پەیوەندی كردنی ژنو پیاو بۆپێكهێنانی خێزانێكی بەختەوەرو پاك كە بنچینەی كۆمەڵگایەكی دروستو پاكە، وە دەربارەی تەندروستی جەستەو رەوانی كچو كورِ پێش ئەوەی ئەم پەیوەندیە پیرۆزەیان دەست پێبكات، بەدوورو درێژی باس كردوەو بەرنامەی بۆ دارێژراوە، وهەروەها دەربارەی چۆنیەتیو كێو كێ دەبێ بەیەكەوە هاوسەربن باس كردوە.

ژنو پیاوی زەردەشتی، لە ژیانیاندا تەنیا دەتوانن یەك هاوسەر بۆخۆیان هەڵبژێرن، وە هیچ ژنو پیاوێك تا لەژیاندان، بۆیان نیەو ناتوانن بەگوێرەی ئاینی زەردەشتی لەیەك هاوسەر زێتر هەڵبژێرن، بەڵام پاش مردنی یەكێكیان، ئەوەی دیكەیان پاش تێپەر بوونی ساڵێك بەسەر مردنی هاوسەرەكەی دەتوانێت ژن بهێنێ یا شو بكات. جیابونەوەی ژنو پیاو لەیەكدی، واتە رەهایی، لە ئاینی زەردەشتیدا نییەو قەدەغەیە، مەگەر ئەوەی لەیەكآ لەدوو هاوسەرەكە (ژن یا پیاو)، كارێكی ناشایستی رەوشتی دەركەوێت، ئەوسا بەگوێرەی دادوەریتی پیاوە ئاینییەكانو گەورە پیاوان لە یەكدی جیا دەكرێنەوە. ئەوەی شایەنی باسە، ئەم جیابونەوەیە (رەهایی) زۆر ئاسان نییە، وهەندێ كۆسپو بە رنامەی سەخت لەبەردەم ئەم كارە دانراوە، كە بەراستی بۆتە كارێكی چەتون بۆیان.

یەکێ لەو کۆسپانە ئەوەیە کە ناوی ئەو ژنو پیاوە کە لەیەکدی جیا دەبنەوە لەناو کۆمەڵگای زەردەشتییەکاندا وەها بە بەدناوی بڵاودەکەنەوە، کە هەردوو لایان ئەوەندە شەرمەزاربن، ڕوی ڕوانینە هاو ئاینی یەکانی خۆیان نابێت.

لە ئاینی خواپەرستی زەردەشتیدا، تەمەنی هاوسەر خواستن بۆ کوڕ پانزە ساڵانو بۆ کچ چواردە ساڵان رەچاو کراوە. دەربارەی هاوسەر خواستن لەتەک بێگانە (واتە زەردەشتی نەبێت) و مەسەلەی رێکەوتنی خوێنی ژنو پیاو، تا ئەندازەیەك ڕێو شوێنی بۆ دیاری کراوە، بەڵام‌وا بەبێش دەزانرێ کەهەر کەسێك لەتەک هاونەژادو لەنێو نەتەوەی خۆیداو هاوئاینی خۆی هاوسەر هەڵبژێرێتو تا ئەو شوێنەی دەتوانێ هاوسەر لەنێو بێگانەدا هەڵنەبژێرێت. چونکوو ئەو پەیوەندی رۆحیو باوەرو کەلوپورو....... ئەگەر سست بێتو یا هەر نەمێنێت، لە پاشاندا دوچاری گرفتو مەترسییان دەکات.

لە ئاینی زەردەشتیدا جووت بون (نکاح) لەتەك ئەم خزمانەدا قەدەغەیە: باوك، دایك، خوشك، برا، پورزا، دایەن، برازا، خوشکەزا، پور (خوشکی دایکو باوکی) نەنك (دایکو باوك)، ژنی باپیر، باوەژن، کوڕەزا، کچەزا، ژنی کوڕ، خەسوی کچ، خەسوی کوڕ، دایەگەورەی ژنی کوڕ، خوشکی باوکی ژن، خوشکی دایکی ژن، براژنی باوك، براژنی دایك، ژنی برازاو خوشکە زا، مێردی برازاو خوشکە زا، هاوشیرە.

## شێوەو جۆری مارەکردنو هاوسەر خواستن:

لای زەردەشتیەکان مارەکردنو ژن خواستن پێنج جۆرە:

1- پاتشا ژنی:

ئەم شێوە مارەکردنە بریتي یە لەوەی کە کوڕو کچ بۆ یەکەمین جار وە بەرەزامەندی دایکو بابی هەردوولاو دل وەشی یان، ژن بهێننو شووبکەن. بەمجۆرە ژنانە دەبێژن پاتشا ژن

2- ئەیوك ژنی:

ئەیوك بە مانای (کچی تاقانەی بێ برا) یە، واتا پیاوێك بیەوێت تاقانە کچی خێزانێك بخوازێت. لەبەر ئەوەی کچ ناتوانێت پاش مردنی باوکی ماڵێو مولێکی باوکی بۆ خێزانێکی دیکە ببێت، بۆئەوەی ئەو داراییە هەر لەنێو خێزانەکەدا بمێنێتەوە، پێویستە کە پاش ئەوەی شوی کرد، یەکەمین کوڕی خۆی بەناوی باوکی خۆیەوە (واتە باوکی کچەکە کە دبێتە باپیری منداڵەکە) ناو نووس بکات، بەم شێوەیە هەموو دارایی باوکی کچەکە بۆ منداڵەکەی دەبێت بەمجۆرە ژنانە دەبێژرێت ئەیوك ژن.

شایەنی باسە ئەم جۆرە هاوسەرخواستنە لە رۆژگاری دوور باو بووە، ئێستا لەبەر ئەوەی بێ ئاگایان توشی بەدگومانی بونوواياندەزانی كە باوك كچی خۆی مارەكردووەو ئەو منداڵەی كچەكە لە باوكێتی، لەبەر ئەمە، ئەم رەوشە ئیدی بەكار نایەت.

-3 كولفەت ژنی (چاكرژنی):

ئەم جۆرە مارەكردنە بۆ بێوە ژن یان بێوە پیاو دەبێت كە دەیانەوێت پاش مردن یا رەهایی هاوسەری یەكەمیان، دووبارە هاوسەرێكی دیكە هەڵبژێرن. لەبەر ئەوەی لە ئاینی زەردەشتدا، یەكەمین هاوسەر لەم دنیاو لەو دنیاش هەر بۆ یەكتر دەبن، و شاو شاژنی یەكترن، كەوایە هاوسەری دوهەم، پلەو پایەی كولفەتی هەیە بەرامبەر هاوسەری یەكەم. هەروەها ئەگەر پیاوێك كە ژنەكەی منداڵی نابێت، و گەرەكی بێت بۆ منداڵ بون ژنێكی دیكە بخوازێت، یاخود پاتشا ژن توشی نەخۆشی شەپڵە (ئیفلیجی) یا شێتی بێت وە نەتوانێت بە ئەركی سەر شانی بەرێوەبردنی ناو ماڵێ وەك كە بانویەك هەڵسێت، ئەوە ژنی دوهەم لەبەرامبەر ژنەكەی یەكەمی پلەی كولفەت ژنی هەیە، واتە وەك كولفەتی ژنەكەی یەكەمی دەبێت.

-4 خودسر ژنی:

ئەم جۆرە مارەبرینە بریتی یە لەوەی كە كوڕو كچێكی بالغ، پێش ئەوەی بگەنە تەمەنی بیستو یەك ساڵی، گەرەكیان بێت بآ رەزامەندی دایكو بابیان، پێكەوە بژین لەم حالەتەدا (موبد) بۆی هەیەو دەتوانێ مارەیان ببڕێت،بەڵام تا ئەوكاتەی رەزامەندی دایكو بابیان وەرنەگرن، لە هەموو میراتو دارایی یەك بآ بەری دەبن (كیژان لە تەمەنی شانزە ساڵیداو كوڕان لە تەمەنی هەژدەساڵیدا دەتوانن بەرەزامەندی دایكو بابیان هاوسەر بخوازن).

-5 سەتەر ژنی (ستر زنی):

كاتێك كوڕێك، پاش ئەوەی دەگاتە تەمەنی بالغیو پێش ئەوەی ژن بهێنێت، بمرێت، دایكو بابی یا هەر كەسێك لە خزمەكانی، پێویستە لەسەریان كە كچێك بە ناویەوە مارە بكەنو بیدەن بە شو (دەتوانێت ئەو كچە حوشكی كوڕە مردوەكە بێت). یەكەمین كوڕێك كە لەو كچە دەبێت بەناوی كوڕە مردووەكەوە ناودەنرێت. هەرچی داراییوماڵیومولكی كوڕە مردوەكە هەیە، بۆ ئەو كوڕە دەبێت. ئەم جۆرە رەوشە. هەروەكو ئەیوك ژنی، خەڵكی نائاگا دوچاری دڵڕەشی دەكاوادەزانن كە ئەو كچە كە خوشكی كوڕە مردوەكەیە. شوی كردوو بە برای خۆی. لەبەر ئەمە ئەم رەوشی ژن هێنانەش ئێستا ئیدی لەنێو زەردەشتیەكاندا باوی نەماوە وە ئەنجام نادرێت.

## ئەنجومەنی مارەبڕین:

ئەنجومەنی مارەبڕین: بە مەبەستی پەیوەندی نێوان بوکو زاوا پێکهاتووە. لە (موبد) و حەوت کەسی دیکە کە شاهێدی خۆیان لە دەفتەری تایبەتی دەنووسن. سەرەتا (موبد) مەراسمی مارەبڕین ئەنجام دەدات، وە گوێ لە ڕەزامەندی هەردوولا، واتە بوکو زاوا دەگرێ. پاشان دەست دەکات بە ئامۆژگاری هەردوو بوکو زاواو دەبێژێ:

(ئێستا چەند ئامۆژگارییەکی پێویست هەیە پێتان رادەگەینم، گوێ رایەڵی بنو لە ژیانی خۆتاندا بەکاری بهێنن بۆئەوەی ئاهورامەزدا خۆش وەش بکەنو خۆشتان بەختەوەر بن:

یەکەم، ستایشی هورمزی (ئاهورامەزدای) دادگەر بکەنو بیپەرستن، چونکو لە دادپەروەرێتی خۆی ئێمەی بآ بەش نەکردووە، بۆیە پێویستە لەسەرتان هەر پێنج فەرزەی نوێژ ئەنجام بدەن.

دوهەم: بێگومانبن لە پەیامبەرێتی زەردەشتی پاکو مەزن، وە پابەندی ئاینی خاسی خواپەرستی بن، وهەمیشە ڕێبازی پاکیو راستی بگرنە بەر، ولەم جیهانەدا بە بیرووتەو کرداری خاس بژین.

سێهەم: کەمتەرخەمی مەکەن لەنزاکردن بۆشادی ڕەوانی مردوەکانو یارمەتی بێدەرامەتان.

چوارهەم: بیرەوەری یادی کۆچی دوایی دایکو باوکو باپیرو دایە گەورەکان لەیاد مەکەنو نوێژی تایبەتیان بۆ بخوێنن.

پێنجهەم: هەرگیز بآ (سدرەوکشتی) مەبن، و منداڵەکانتان لەکاتی خۆیدا سدرەوکشتی بپۆشنو ببەستن.

شەشهەم: رێز لەدایکو باوكو مامۆستاکانتان بگرن. خۆش وەشی ئاهورامەزدا لە خۆش وەشی ئەم سیانەیە.

حەوتهەم: یەکێ لەم ئیزەدانە (مهر، ئەشتاد، ورهرام)[63] " هەڵبژێرن، ولەو رۆژەدا ستایشی ئاهورامەزدا بکەن. ئەو ئیزەدەی هەڵێتانبژاردووە چاودێرتان دەبێ وە لەهەموو گوناهو کاری خراپ دەتانپارێزێت. ئێستا ئەو ئیزەدەی هەڵێتانبژاردووە ناوی بەرن.

هەشتهەم: پێویستە لە ژیانتانا، ڕینمایەکی داناو تێگەیشتو هەڵبژێرن، بۆئەوەی لەهەموو کارەکانتانا راوێژی لەتەکابکەنو گوێ ڕایەڵی ئامۆژگاریەکانی بن، چونکە زانست بەرفراوانەو هیچ کارێك بآ ڕێنمایی مرۆڤی دانا بەخاسی ئەنجام نادرێت. ئێستا ناوی ئەو کەسەی هەڵێتانبژاردووە ببەن (زاوا دەبێ هەر لەو ئەنجومەنەدا پیاوێکی داناو خاسکردار هەڵبژێرێتو ناوی ببێت).

نۆهەم: یاسای ئاهورامەزدای تواناو دانا، کە مرۆڤی بەهێزو توانای داناییو گوفتار لە هەموو ئافەریدەکانی دیکەی جیهان، مەزنترو بەرزتر ئافراند، خۆشەویستی خەڵکە. کەوایە هەرگیز حەلێك مەرەنجێنن‌و ئازار مەدەن نە بەبیرو نە بە گوفتارو نە بە کردار. (موبد) ە کە درێژە بە ئامۆژگارییەکانی دەداو دەبێژێ:

ئەگەرکو رێبوارێك لەرێوەگەیشت، جێگەو خواردنی بۆ دابین بکەن. پیاوچاکان لە برسێتی‌و تێنوێتی‌و سەرماو گەرما رزگار بکەن. لەتەك بێدەسەڵاتان‌و ژێردەستەکانتاندا مێهرەبان بن. رێز لەگەورە پیاوان بگرن. رێگەو یاسای ئەمشاسپەندەکان کەسیفاتی ئاهورامەزدان بگرنە بەر بۆئەوەی لێتان کەیف وەش بێت.

رێگەو یاسای ئەمشا سپەند وەهومەن، ئاشتی‌و بیری خاسە کینەدارو شەر خواز مەبن. بیرخاس‌و چاك پیشە بن. خراپە مەکەن‌و هاورێتی بەدکاران مەکەن. زانیاریتان فرە بکەن لەبیری خراپ وە دوربن‌و گەشە بە فەرهەنگتان بدەن. لەتەك هاورآ یان‌و دۆستاندا نەرم‌و خۆشبین‌و بآ فیزبن. لەتەك ناحەزان‌و نەیاراندا سنگ فراوان بن بەخاسی لەتەك ئاژەڵە سودمەندەکان رەفتار بکەن، وە بآ ئەندازەو لەتوانا بەدەر کاریان لێ مەکێشن. رێگەو یاسای ئەمشاسپەند ئوردی بەهەشت، راستی‌و پاکي یە. هەمیشە دەرون‌و رواڵەتتان بە پاکی‌و خاوێنی رابگرن. دوربن لە ناپاکی‌و چەپەڵی. رێبازی یاسای (ئاشا) بگرنە بەر، چونکە لە هەموو جیهاندا یەك رێگە هەیە، ئەویش پاکی‌و راستی یە. خاس بیر بکەنەوە، خاس بێژن‌و خاس کاربکەن.

لەتەك یەکتردا یەك زمان‌و یەك دڵ بن. دورەپەرێزبن لە درۆو سوێندخواردن‌و جادووکردن. رێزلەئاگر بگرن کە نیشانەی پاکی یە.

رێگەو یاسای ئەمشاسپەند شەهریوەر، توانایی‌و کاری ئازادە. هەمیشە لە پێشکەوتن‌و سەرکەوتندابن‌و لەم رێگەیەدا تێبکۆشن. گوێ رایەڵی سەرۆك‌و گەورە پیاوانی دادپەروەر بن‌و رێزیان لێبگرن. لەرێگەی کرداری خاس‌و حەڵاڵەوە سەرمایە پێکەوە بنێن. خاس کارو کۆشش بکەن. دوربن لەتەمەڵی‌و دەست درێژکردن‌و سوالێکەری. چروك‌و رژد مەبن. رێگەو یاسای ئەمشاسپەند سپەندارمزد، مێهرەبانی‌و بآ فیزی یە. لەژیاندا بێ فیزو ئازادە بن، لەتەك یەکتردا مێهرەبان‌و دڵوڤان بن. لەخۆرازی‌و لوت بەرز مەبن. خۆش باوەڕو خۆش بین بن.بەچاوی سوك مەڕواننە کەسوکارە بێدەرامەتەکانتان، ولەوەی کەهەتانە یارمەتییان بدەن. خەستەخانەو قوتابخانەو جێگە خزمەتگوزاریەکانی دیکە دروست بکەن، هەروەك زەوی دەست بڵاوو سودبەخش بن. زەوی ئاوەدان بکەن‌و بەپاکو خاوێنی ڕاییگرن. کون‌و کەلەبەرو لانەی جانەوەرە زیانکارەکان‌وێران بکەن، پیسایی‌و لاشە لەژێر زەویدا مەشارنەوە.

رێگاو یاسای ئەمشاسپەند خورداد، خۆشی‌و ئاوەدانی یە. هەناوی خۆتان خورەم‌و لەشتان پاك بێت چونکو پاکی لەش پاکی رۆح‌و ڕەوانە. غەمناك‌و سپڵە مەبن. بەچاوی روشەن‌و پاکەوە

تەماشای جیهان بکەن. شادبن‌ولەبیری ئاوەدان کردنەوەدا بن. ئاو کەمایەی ئاوەدانی‌و خۆشی یە، هەمیشە بە پاکی ڕاییگرن‌و پیسی‌و لاشەی تێفرێ مەدەن. کارێزو کانیاو هەڵێکەنن زەوی‌وشك ئاوەدان بکەن. رێگاو یاسای ئەمشاسپەند ئەمرداد، تەندروستی‌و تەمەن درێژی یە.

پارێزگاری لەشتان بکەن‌و دروست‌و توانا ڕاییگرن. دوربکەونەوە لەنەخۆشی‌و چەپەڵی. جلو بەرگ‌و ناومالێتان هەمیشە پاکو خاوێن بێت. زۆنگاوو ئاوی مەنگ‌وشك بکەنەوەو لەجێگایدا تۆو دارو دەرەخت بچێنن. نەمام مەبڕنەوە. میوەی پێنەگەیشتو مەچننەوە. پەرەستاری لە نەخۆش‌و دەردە داران بکەن‌و دەرمانیان بدەنآ.

پاش ئەم ئامۆژگاریانە، بوکو زاوا دەستی پەیوەندی‌و هاوسەریەتی دەخەنە نێو دەستی یەکترو بەدەوری ئاگردا دەسوڕێنەوەو دابونەریتەکانی دیکە ئەنجام دەدەن.

## ئەوخاڵانەی دەبنە هۆی ڕەهایی (طلاق):

لە ئاینی زەرەدەشتیدا،ڕەهایی،واتە جیابونەوەی ژن‌و مێرد لە یەکتری (تەلاق) ئاسان‌و ئازاد نیە، لەبەر ئەوە هیچ جوێرە مارەییەك لە ئارادا نییە. بەڵام بڕێ هوێ دێتە ئاراوە کە ناچار ژن یا پیاو داوای رەهایی لە هاوسەرەکەی دەکات. ئەو خاڵانە بریتین لە:

1- یەکێ لە دوو لایەنەکە(ژن یا مێرد)شێت بێت، بەمەرجێك لایەنی دوهەم لە کاتی مارە بریندا بەمەی نەزانیبێت. هەر کاتێك لایەنە ساغەکە بیەوێت، دەتوانی داوای رەهایی بکات.بەڵام ئەگەر دوای مارەبڕین‌و گوێستنەوە،یەکێکیان شێت بوو،ئەوسا لایەنی دوهەم بۆی نییەو ناتوانێ داوای ڕەهایی بکات.

2- لە کاتیکدا کە پیاوەکە بۆماوەی سێ سال بژێوی ژنەکەی نەدات، ژنەکە دەتوانێ داوای رەهایی بکات.

3- لەکاتێکدا کە پیاوەکە، پیاوەتی نەبێت، ژن دەتوانێ داوای ڕەهایی بکات.

4- هەرکاتێك بسەلمێنرێت کەژن خیانەتی جنسی لەمێردەکەی کردووە، پیاوەکە دەتوانێ داوای ڕەهایی بکات. هەروەها ئەگەر سەلمێنرا کە پیاوەکە خیانەتی لەژنەکەی کردووە، ئەوسا ژنەکەی دەتوانآ داوای جیابونەوە بکات.

5- هەرکاتێك پیاو ئازاری ژنەکەی بدات‌و ژیانی ژن لەمەترسیدا دابێت، دەتوانآ داوای ڕەهایی بکات.

6- ئەگەر ژن بآ فەرمانی مێردەکەی بکاتو گوێڕایەڵی نەبێتو هەڵسوکەوتو ڕەفتاری جێی مەترسی بێت، مێردەکەی دەتوانێت داوای ڕەهایی بکات.

7- ئەگەر پیاوەکە ژنێکی دیکەی هەبێتو لەکاتی مارەکردندا باسی نەکردبێت وە یاخود ژنەکە مێردی دیکەی هەبوبێتو باسی نەکردبێت، لەم کاتەدا مارەی دوهەم هەڵێدەوەشێتەوە.

8- ئەگەر ژن یان پیاو، هەرکامێکیان دەست لەئاینی زەردەشتی هەڵێبگرن، ڕەهایی ئەنجام دەبێت.

لێرەدا بڕێ لەو ئامۆژگارییانەی گەورە پیاوانی زەردەشتی دەربارەی ژن گووتویانە، دەخەمە بەر چاو:

(ڕێز لە ژنان بگرن، ستەمیان لێ مەکەن، ژیان بۆژنو منداڵێ ئاسانو هەموار بکەن، ئەگەر ژنێك بخەیتە گریان دواجار ڕۆژگار دەتخاتە گریان، لەتەك ژندا پەیمان شکێن مەبە بوێ ئەوەی پەیمانت نەشکێنرێت، ئابرووی ژن مەبە تا ڕوێژگار بێ ئابڕوت نەکا، هێلانەی ژن تێك مەدە تا هێلانەتوێران نەبێت، ئازاری ژن مەدە تا ڕوێژگار ئازارت پێ نەگەیەنێت، ئەی پیاو ڕەفتارت لەتەك ژندا بە خاسیو نەرمی بێت بەڵام کوێیلەو ژێردەستەی ژن مەبە بۆئەوەی سوكو روسوا نەبیت، ئەی ژن لەتەك پیاودا لەهەموو بوارەکانی ژیاندا ڕێکبکەوە بەڵام مەبە بە کولێفەتی پیاوو بوکە شوشەی دەستی، ئەی ژن خۆت بناسەو نرخی خۆت بزانە وە هەرگیز نەبیتە بەردەی پارەو پولێو گەوهەرو شکۆو خۆنوێندنو خۆدەرخستن، نرخی بوونە دایك وە بەڕێوەبردنی خێزان بۆتۆ دوندی هەموو بەهاکانە، ژن سەرچاوەی خۆشیو شادیو بونیادی ژیانە، ئەو پیاوەی هاوسەری خۆی خویش دەوێت خواو ژیانو جوانی خۆشوویستوە، ئەو کەسەی بەتەنیای دەژی گوناهکارێکە کەتەنیا گوناهەکەی بە هاوژین خواستن پاك دەبێتەوە، مەزنترینو بەرزترین کار لەژیاندا پەیوەندی ژنو مێردایەتیە، ژیانی ژنو مێردایەتی ئەگەر لەسەر بنچینەی ماددیواتە بۆ پارەو پولو پلەو پایە بێت پاشەڕۆژی خاسی نابێت، پایەو بنچینەی ژنو مێردایەتی تەنیا دەبێ بۆ مەبەستی پێکهێنانی خێزانو خۆشەویستی بێت، زێتر لەجەستەی ژن دڵو دەروونو ڕۆحیتان مەبەست بێتو ڕێزی لێ بگرن، دژی بێ بەندوباریو بەرەڵایي بن، ڕێز لەژنی دووگیان بگرن وەئازاری پێ مەکەیەنن.

## 6- نوێژو ڕۆژو لەئاینی زەردەشتیدا:

لەئاینی زەردەشتیدا، هەر زەردەشتییەك پێویستە لەسەری لەنێوان شەوو رۆژێکدا پێنج جار نوێژ بۆ ئاهورامەزدا بکات.

سەرەتای هەموو نوێژێك بەم شێوەیە دەست پێدەكات (ئاهورامەزدا ئافەریدەگاری بێهاوتا ستایش دەكەم)، پاشان نوێژكەر. دەستدەكات بە تۆبەكردن لەو كارانەی كە دژ بەئامۆژگارییەكانی زەردەشتن. كورتەی مانای نوێژی زەردەشتییەكان بەم شێوەیەیە:

(ئەی ئافەریدگاری تواناو بێهاوتا، پەشیمانم لەگشت بیرووتارو كردارە ناپەسەندەكانم. پەشیمانم لەهەموو ئەوگوناهانەی كەبەدەستی ئەنقەستو یا لەڕوی نەزانینەوە كردومە. داوای لێبوردنت لێدەكەم. نیاز مەندمو داوای بیری خاس، وتەی خاسو كرداری خاست لێدەكەم بۆ پاشەڕۆژ. هیوادارم ئیدی عەودالّی خراپەكاری نەبم، بۆئەوەی لەژیانی داهاتودا لەتەك پیاوچاكانو خاساندا تێكەلێ بم.)

وێڕای ئەوەی خاسترین ستایشو پەرستنی ئاهوڕامەزدا لای هەر زەردەشتییەك ئەوەیە كە بە بیرووتەو كرداری خاس، ئاهوڕامەزدا خۆش وەش بكەن. بەڵام بۆئەوەی فرەتر سوپاسی ئاهوڕامەزدا بكەن بۆ ئەو بەخشینانەی كە پێی داون، لەشەوو رۆژێكدا، هەروەكو ئاماژەمان بۆ كرد، پێنج جار ڕێو رسمی ئاینی بەجێدێننو نوێژدەكەن،

یەكەم جار لەكاتی خۆرهەڵاتن تا نیوەرۆ كە پێی دەبێژن گاە هاوەن.

دوهەهەم جار لەكاتی نیوەرۆ وەتاكو كاتژمێری سآ ی پاش نیوەرۆو پێی دەبێژن گاە رەپیتون.

سێهەم جار لە كاتژمێری سآ ی پاش نیوەرۆ تا خۆر ئاوابونو پێی دەبێژن گاە ئوزیرن.

چوارهەم جار لەكاتی خۆر ئاوابونەوە تا نیوەشەو وە پێی دەبێژن گاە ئەئیوی سروترم.

پێنجهەم جار لە نیوەشەوەوە تاوەكو خۆرهەڵاتن وە پێی دەبێژن گاە ئەشەهن. هەروەكو ئاماژەمان پێدا، ئەنجامدانی ئەم پێنجوادە نوێژە بۆ هەموو زەردەشتییەك پێویستە، بەڵام ئێستا تەنیا (موبد) ە كان بەم ئەركە هەڵێدەستنو زۆربەی زۆری زەردەشتییەكان تەنیا نیایشووێردی سەرلەبەیانیان دەخوێنن.

هەر زەردەشتیەك پێش ئەوەی دەست بكات بەنوێژو ستایشی ئاهورامەزدا، پێویستە پێویستییەكانی نوێژ كردن بزانێت وە ئەنجامی بدات. ئەم پێویستیانە بریتین لە:

1- پاكوتەمیزبونی لەش

2- لەبەركردنی سدرەو بەستنی كشتی

3- پاكوتەمیزی جلوبەرگ

4- شتنی دەستو دەموچاو

5- خاوێنی جێگەی نوێژ کردن

6- ڕووکردنە ڕوگە (قیبلە)

## ڕوگەی زەردەشتییەکان:

لەکاتی نوێژکردندا، هەموو زەردەشتییەك دەبێ بیری خۆیان پاك بکەنەوە لە هەموو مادیاتێكودەست بەسینە ڕوو بکەنە قیبلە، قیبلەی زەردەشتییەکان ڕووناهیو نورە. لەبەر ئەوەی ناتوانرێت جێگەی یان لایەکی تایبەتی بۆ خوا کە دروستکەری گشت گیتی یە، دابنرێت، وئاشکرایە کە هەموو ڕووناهیەکان لەسەرچاوە ڕوناکیە هەمیشەییەکانی ئاهورامەزدا هەڵدەقوڵێت، بۆیەکا زەردەشت فەرمویەتی کە لە کاتی نوێژکردنو پەرستنی خوای تاكو تەنیا، ڕوبکرێتە رووناکی بۆئەوەی تیشکی رووناکی دەرون لەتەك رووناکی بەچاوبینراودا کە بریتی یە لە تیرۆژو تریفەی مانگو هەموو رووناکییەکانی دیکە وەك ئاگر، چرا.....، یەکبگرنو بگەنە رووناکی راستەقینە کە دەبێتە ڕێنمای بیری خاسی مرۆڤ بۆ گەیشتنە گەورەییو دادپەروەرێتیو خۆشەویستی داوەری یەکتا.

## ڕۆژوو گرتن:

زەردەشتییەکان لەسەرەتای مانگی خاکە لێوە (نەورۆز)، رۆژوویەکیان هەیە پێی دەبێژن (رۆژووی رپتون)، ئەم ڕۆژووە لەیەکەمین رۆژی خاکە لێوە تاپێنجەمین رۆژە، وە جەژنەکە دەکەوێتە رۆژی سێهەم وە پێی دەبێژن (ئوردی بەهەشت روز). رپتون بەمانای (گەرمایە) و هەروەها ناوی فریشتەی گەرماشە. لەبەر ئەوەی مانگی خاکە لێوە سەرەتای داهاتنی گەرمای بەهارو هاوینە، بۆیە ئەم رۆژو جەژنە بەبۆنەی داهاتنی گەرمایە کە لە رۆژ ژمێری کۆندا پێی دەبێژن هاوینە گەورە (لەسەرەتای خاکەلێوەوە تا کۆتایی ڕەزبەر). لەم جەژنەدا، زەردەشتییەکان بەتایبەتی موبدەکان، لە نیوەرۆ تا سێ کاتژمێر پاش نیوەرۆ، لە ئاتەشگا خرِدەبنەوە دەست دەکەن بەخوێندنەوەی (خورشید نیایش) و (مهر نیایش) و (گاە رپیتون) و (یەشت رپتون). لەم رۆژەدا پێویستە لە هەموو کارێك کە بۆنی گوناەو خراپی لێدێت دورەوپەرێزبن. ئەمە رۆژوی زەردەشتییەکانە. کە بەهیچ جۆرێك باسی دورەوپەرێزی لە خواردنو خواردنەوەی تێدا بە دی ناکرێت، بەڵکو دوری لەهەموو جۆرە گوناەو خراپەیە. لە (بندهش) بەندی 83 دەبێژێ، پێویستە خۆمان لە رۆژوو گرتن بپارێزین چونکە لە ئاینی ئێمەدا بە هیچ جۆرێك ڕەوانییەکە رۆژێکی تەواو هیچ نەخورێتو نەخورێتەوە، چونکە ئەم کارە بە

گوناه دەژمێرێت. رۆژووی ئێمە ئەوەیە کە بە چاوو زمانو گوێچکەو دەستو پآو گشت هەستو نەستمان بە رۆژو بین، و بەبیرووتەو کردار هیچ جۆرە گوناهێك نەکەین.

شایەنی باسە کە لە مانگدا چوار رۆژخواردنی گۆشتی ئاژەڵی حەلالێ گۆشت نارەوا و قەدەغەیە، ئەم کارە تەنیا لەبەر پەیرەوی کردن لە تەندروستی یەو بەس. ئەم چوار رۆژە بریتین لە رۆژانی:وەهمەن، ماە، گوشو رام، کە بەناوی چوار فریشتەی چاودێری ئاژەڵی سودمەندن.

## 7ـ ئاشتیو ئاسایش:

ئەزمونەکانی ژیانو ئەو شتانەی کە لەبەر چاون دەیسەلمێنن کەوا ئاشتی پڕشنگێکە لەپڕشنگەکانی بیری پاكوویژدانی رۆشەنو رووناك. لە ئاوێستادا بەشێوەیەکی زۆر شاعیرانە باسی ئاشتیو ئاسایش لەنێو خێزانو کۆمەڵگاو جیهاندا دەکات، وەهەمیشە ئاشتی بەهاوبەشی بیری چاك دادەنێت، وفەرمان دەدات کەوا پێویستە هەمیشە هەوڵ بدرێت بۆ بەدیهێنانی ئاشتی هەمیشەییو دورخستنەوەی بوغزو رقو کینە. لێرەدا پێویستە ئەوە بێژین کە ئاشتی لە ڕوانگەی پەیامبەرو شۆرشگێری بەرزی کورد، خۆبەدەستدانو پەسەندکردنی ژێردەستی نییە. ئاشتی لە دیدی زەردەشت، کاتێك دێتەدی کەبەسەر ئەهریمەنی خراپەو دوژمنانو نەیارانی خواو خاكو نەتەوە سەرکەوین. کاتێك ئاشتی ڕەوایە کە هەموو نەتەوەیەك یەکسان بژیو خراپەو خراپەکاران لەناو بچن.

زەردەشت فەرمویەتی کە مرۆڤ نابێت بچێتە ژێرباری جەورو ستەمو پێویستە هەمیشە بە چەكو هەموو توانایەکیەوە بەرگری لە مافی ڕەوای خۆی بکات، بەرگری لە نیشتمانو هاوولاتیانی بە ئەرکێکی ئاینیو مرۆڤایەتی داناوە.

ئیمرۆ، لەم ڕووەوە، قوتابیانی بیری نەتەوایەتی لەکوردستاندا، ڕێبازی باپیرە گەورەی خۆیان گرتۆتە بەر، وە دەربارەی ئاشتی دەبێژن:

(ئاشتی لای ئێمە ژێر دەستی نیە

ژیانی دیلی، سەربەستی نیـــە

کاتێ کوردستان گەیشت بەهیـوا

بەسەربەرزی تێیدا هەڵێکرا ئـاڵا

ئەوساکە ئاشتی پێـمان ڕەوایـــە

بۆ کوردایەتی: کاڵای بالایـــە

لەڕاستیدا ئاشتی لەپیرۆزترینو بەرزترین ئاواتەکانی هەموو کوردێکی بەشەرەفە کە خاوەنی بیرو باوەری کوردایەتی راستەقینە بآ. بەڵام بەسەر بەرزیەوە، نەك بەسەر شۆری. چونکە هیچ کاتێ نەبووە مەررو گورگ لەیەك کانیو بەیەکەوە ئاو بخۆنەوە، یان زۆردارو زۆر لێ کراو قۆلێ بکەن بەقۆڵی یەکدا. هیچ کاتێکیش پیاوی بەشەرەف ئاشتی ناوآ بەدیلی، و ئاشتیش بەرپا نابێ هەتا هەموو گەلانی جیهان، وردو درشتیان، پێشکەوتووو پاشکەوتوویان بەتەواوی ئازادو سەربەخۆ نەبنو بۆ ئامانجی بەرزو پیرۆزیان هەوڵ نەدەن دوور لەچەوساندنەوەو مادده پەرستی. بۆیە پێویستە لووتی زۆرداران بشکێنرێو سەریان پآ دابنوێنرآ. دیارە ئەوەش بەخۆ بەهێزکردنو چاکە بەلادا کردنو دەسەلآتپەیداکردنو شوێن کەوتنی بیرو باوەڕی راستو بێخەوش ئەبێ. بیرو باوەڕێك کە بۆ بەرزیو گەشەپێدانو پێشخستنی نەتەوە هەوڵ بدات بآ ئەوەی بەقەد موویەك لەسنووری مرۆڤایەتی دەربچآ. بیرو باوەڕێك کە گیانی یەکسانیو دادپەروەری بڵاو بکاتەوە بآ دروستکردنی دووبەرکیو ناکۆکی. بیرو باوەڕێك کە ئەوەندە نەمر بآ، هەتا بآ پالێ بەخەڵکەوە بنآو بۆ پێشەوە بیباو نەیەلێ موتەکەی نائومێدی سواری کولەی سنگی بآو پشتی سارد بکاتەوە. بیرو باوەڕێك کە تەنیا لەسەر بنچینەی مادده پەرستی، یان خەیالێ خوازی رووت دانەمەزرابآ. بەڵکو چاکەو باشەی هەردوو لای لەیەك بوتەدا تواندبێتەوەو کردبیەتی بە بناغەی خۆی.

ئەبێ بەهێزببین بۆئەوەی ئاشتی

ببێ بەکاڵا بۆ کوردایەتـــــــــــــــی

ئەبێ تەقەلای بێوچان بدەیـن

ئاشتی خەڵاتی کوردستان بکەین

کاتێ میللەتان ئەژین وەك بـــــرا

هەریەك بە هیواو ئامانجی بگا))[64]

لە یەسنا 12ـــــ12 دا دەبێژێ:

(ستایشی ئاینی خوا پەرستی دەکەم، ئەو ئاینەی لایەنگری چەك داماڵینەو دژی جەنگـو خوێن رێژیە).

لە یەسنا 60 ـــــ 5 دەبێژێ:

(........ ئاشتیو سەلامەتی لەم خێزانەدا بەرقەرار بێت)

لەسروش یەشت دەڵێ:

(ئێمە ئاشتیو ئاسایش ستایش دەکەین کەوا جەنگو ناخۆشی لەناو بەرێت).

لە دین یەشت، فەقەرەی 3 دەبێژێ:

(ئاشتی ببێتە بەشی ئێمە تاکو هەموو ڕێگاکان بەرەو شوێنی خاس بگات، کێوەکان ببنە ڕێڕەوی چاکانو لە بێشەکاندا بە باشی بتوانین تێپەر بینو لە رووبارەکان بە خۆشی کەشتیوانی بکەین.......)

هەروەها هەمیشە ستایشی فەرمانرەواي چاک کراوە، فەرمانڕەوایەك کە مەبەستی بە دیهێنانی ئاشتیو ئاسایش بێت بۆ کۆمەڵگا. بۆیە لە (دین یەشت) فەقەرەی 19 دەبێژێ:

(سەرۆكو گەورەیوولاتێك کە ئاشتیو ئاسایشی هاوولاتیانی لا مەبەستە، ستایش دەکرێت).

## 8- گوناه لەروانگەی زەردەشتەوە:

زەردەشت ئارەزوی گەیشتنە دوندی ئاکار لە کۆمەڵگادا بە بەرزترینو گرنگترین ئارەزووو ئامانجەکانی ژیان دەژمێرێت. بە ڕاشکاوی بە خەڵک رادەگەیەنێ کە تەنیا بیرو کردارو گوفتاری خاس دەتوانآ وەڵامی پێداویستەکانی ئاکاری بێت، و ژیان بەرزو بەنرخ بکات.

زەردەشت، بە ئاشکراکردنی ئەم راستییە کە سەختترینو دژوارترین سزای بەدکارانو خراپەکاران بریتی یە لە نائارامیو بآ ئۆقرەییویژدان، پێشانی داوە تاچ ئەندازەیەك چۆتە ناخی دڵو مێشكو هەناوو رۆحی مرۆڤ وە لە نهێنییەکانی گەیشتووە، چونگە دەزانێت کە خراپترینو سەختترین سزایەك کە بەسەر کەسێکدا بێت بریتی یە لە نائارامی رۆحو ڕەوان. لەم ئاینەدا، پێوانەی بایەخو نرخی ئادەمیزاد بە ململانآ کردنە لەتەک خراپە، بۆیە زەردەشت تێکۆشاوە ئاینو بیرو باوەڕی خۆی لەسەر بنچینەو ئوسولی ئاکاری دابمەزرێنێت.

یەکآ لەو خراپیانە کە مرۆڤ گیرۆدە دەکاو بەرەو هەڵێدێری دەبێت بریتییە لەگوناەو گوناهکردن.

گوناه بریتییە لەهەر شتێك کە تیشکی ڕووناکی مرۆڤ ئالوودەو پیس دەکات، وبەرەو خراپەی دەبێت. گوناه دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لەخێرو خۆشیو شادیو چاکە. هەرچەندە گوناه هەیەو بوونێکیواقعییە، بەڵام مانای ئەوە نییە کە ناتوانرێت لێ دووربکەوینەوە، چونکو

مانای‌واته‌ی گوناه له‌ئاینی زه‌رده‌شتیدا له‌ته‌ك ماناكه‌ی له‌ئاینی مه‌سیحییه‌ت‌و ئاینه‌كانی دیكه جیاوازه. ئه‌وان ده‌بێژن كه گوناه بریتییه له‌هێزێكی شه‌ڕخواز كه له‌هه‌ناوی ئاده‌میزاد دا هه‌یه‌و هه‌میشه مرۆڤ به‌ره‌و گومڕایی‌و خراپه ڕاده‌كێشآ. به‌لآم زه‌رده‌شت ده‌بێژێ كه هێزوویستو خواستی ئاده‌میزاد به‌هێزتره له‌وه‌سوه‌سه‌كانی گوناه، ومرۆڤ ده‌توانآ به‌ویستو خواستی خۆی، له‌هه‌موو گوناهێك دووربكه‌وێته‌وه، یاخود په‌یڕه‌وی لێبكات. واته به‌خته‌وه‌ری‌و به‌دبه‌ختی‌و ته‌نانه‌ت گوناه كردن‌و دووركه‌وتنه لٚی له چوارچێوه‌ی ویستوخواستی خۆمانه. مرۆڤ به‌هۆی ئازادی هه‌لێبژاردن‌وویستو خواستی خۆیه‌وه، ده‌توانآ ژیانی خۆی پڕ له‌خۆشی‌و شادی وه یاخه‌م‌و په‌ژاره بكات.

هه‌ر كه‌سێك گه‌ر ڕه‌وشی دژایه‌تی له‌ته‌ك گوناهدا بگرێته‌به‌ر، به‌خته‌وه‌ر ده‌بی‌و ئه‌گه‌ر له‌ته‌ك خراپه‌دا ململانآ نه‌كاو خۆی تووشی شه‌ڕو هه‌را بكات، ئه‌وا گیرۆده‌ی به‌دبه‌ختی‌و ناخۆشی ده‌بێت.

له‌ڕوانگه‌و دیدی ئاوێستاو په‌رتوكه ئاینییه‌كانی زه‌رده‌شتیه‌كاندا، گوناهه گه‌وره‌كان بریتین له:

په‌یمانشكێنی، درۆو درۆزنی، خۆپه‌رستی، چاوچنۆكی‌و به‌خیلی، بێدادی، خۆ به‌زل زانین‌و لوتبه‌رزی، جادوگه‌رێتی، دزێتی، ڕق‌وكینه، توڕه‌یی، سوكێتی، بت په‌رستی، سووخواردن، جاسوسی، قسه‌هه‌لێبه‌ستن، به‌ره‌لآیی ئاكاری، سته‌مكردن به ئاژه‌لٚأ، سوالێكدرن‌و ده‌ست پانكردنه‌وه، ته‌مه‌لٚی، بآ ڕه‌وشتی، فره ژن هێنان، خۆكوشتن، كوشتنی خه‌لٚك، گریان‌و شین‌و شه‌پۆڕ بۆ مردوو، ته‌ماح، زینا، نێربازی، منداڵێ له‌بار بردن، خیانه‌ت، خاوه‌وه‌رگرتن، بێ باوه‌ڕی، زولێم‌و سته‌م، گه‌نده‌لٚی، رێزنه‌گرتنی دایك‌و باوك.

## 9- زه‌ندو پازه‌ند

پاش هێرشي ئه‌سكه‌نده‌ري مه‌قدۆني،وه ئه‌و رووداوه دلٚته‌زێنانه‌ي به‌سه‌ر ئاوێستادا هات،وه به درێژایي رۆژگار، ئه‌و زمانه‌ي كه ئاوێستاي بێ بێژرابوو نوسرابۆوه كه زماني ماده‌كانوێته زماني كوردي كۆن بوو وه‌ك زمانێكي‌ووتووێژ، هێدي هێدي له ناو چووه‌و ته‌نیا وه‌ك زمانێكي ئاییني ئه‌ویش به شێوه‌یه‌كي زۆركه‌م مابۆوه.

له‌به‌ر ئه‌وه‌ي تێگه‌یشتني ئاوێستا بۆ خه‌لٚك‌و ته‌نانه‌ت بۆ پیاوه ئایینیه‌كانیش سه‌خت‌و دژوار بوو، بۆیه له‌ژێر هه‌ر دێڕێكي ئاوێستا، به شێوه‌یه‌كي ئازاد ڕاڤه‌و لێكدانه‌وه‌و وه‌رگێراني بۆ سه‌ر زماني په‌هله‌وي ده‌نوسرایه‌وه.

ئه‌م ڕاڤه‌و وه‌رگێرانه‌وه‌یه پێی ده‌بێژرێ (زه‌ند).

کەواتە زەند بریتییە لە وەرگێران یا ڕاڤەي ئاوێستا. لەسەردەمي ئەشکانییەکاندا، ڕاڤەي ئاوێستا بە زماني پەهلەويو زاراوەي ئەشکاني بووە. لەسەردەمي ساسانییەکاندا بە زماني پەهلەويو زاراوەي ساساني بووە.

ئەمە بۆتە هۆي ئەوەي بەرە بەرە ئەو زمانەي کە ئاوێستاي پێنوسرابوو، واتە زماني کوردي کۆن، لە یاد بچێتو پاش ماوەیەك تەنیا پیاوە ئاینییەکان دەیانتواني لێتێبگەن.

ئەم گۆرانکارییە لە زمانو زاراوەو نووسینا بووە هۆي ئەوەی خەڵک ئیدي بە خاسيو دروستي نەتوانن لە ناوەرۆکي پەیامەکەي زەردەشت بگەن، کە بریتي بوو لە بیستویەك نەسك ئاوێستاي ڕەسەن.

گەر بە دیدێکي زانستانە بڕوانینە ئاوێستا دەبینین هەریەکێ لە بەندەکاني دوو جۆرە بۆ چوونو لێکدانەوەو تێگەیشتني هەیە، یەکێکیان تێگەیشتنێکي ڕواڵەتيو ئەوەی دیکەیان بۆ چوونێکي دەرونییە.

لەم دیدەوە زەند یاخود ڕاڤەو لێکدانەوەي ئاوێستا بە دوو بەش دابەشدەکرێت. زەندي گەورەو زەندي گچکە.

زەندي گەورەواتە ڕاڤەو لێکدانەوەيواقعي ئاوێستا کە تایبەتە بۆ چیني عارفانو ڕۆشەنبیران، و زەندي گچگە بریتیە لە لێکدانەوەي ڕواڵەتي کە تایبەتە بۆ خەڵکي ڕەشۆکو ڕواڵەتبین.

هەریەکێ لەو بەندانەو لە ناخي هەروشەیەك لەوشەکانو هەر ڕستەیەك لە ڕستەکاندا ماناوواتایەکی قولێتري تیدایە کە تەنیا رۆشنبیرانو عارفەکان دەتوانن لێتێبگەنو هەستي پێبکەن.

<u>بۆ نمونە:</u>

کاتێ کە ئەمشاسپەند وەهومەن (بەهمەن) بە زەردەشت دەبێژي چاوت بقونجێنە تا بتبەمە خزمەت ئاهورامەزدا، خەلکي ڕەشۆك وەهومەن وەك ئادەمیزادێك دێننە بەر چاوي خۆیانو چاوقونجاندني زەردەشت هەروەك شتێکي ئاسایي بە چاو داخستني مرۆڤێك دەبینن، و چوونە خزمەت ئاهورامەزداش بە شیوازو شتێکي ماددي دەبینن. لە کاتێکا لاي عارفـو رۆشەنبیران، وەهومەن وەكووزەیەکي ئەقلو بیرو هزرو قونجاندني چاو بە چاو پۆشین لە هەموو شتێکي ماددیو رووکردنە معنویاتو ئاهورامەزداش بەسەرچاوەي رەهاوڕاستتیەکي تەواو سەنگ دەبینن‌و هەژماردەکەن.

هەروەها، لە زۆر جێگەدا لە ئاوێستادا کە ئاماژە بەسەربرِيني ئاژەڵو قوربانيكردن دەكات، مەبەستي كوشتنو زاڵيبونە بەسەر هەواو هەوەسي نەفسانيو شەهوەتي ئاژەڵي نێوئادەميزادە بۆ گەيشتنە ڕاستيو دروستي معنوي.

ئەم تێنەگەيشتنە لە ناوەرۆكو مانا ڕاستييەكەي ئاوێستا، بووە هۆي ئەوەي ڕاڕاييو دوو دڵی بكەوێتە نێو پەيڕەواني ئاينيەكەو هەر يەكە بە جۆرێكو بە بۆچووني خۆي سرووودەكانيان لێكدەدايەوە.

هەروەكو لەمەوبەر باسمانكرد، لەسەردەمي شاپووري دووهەمداو بە بڕياري ئەو، ئەنجومەنێكيان پيكهێنا بەسەرۆكايەتي ئازەرباد كوڕي مهر اسپندو لێكدانەوەيەكي نوێيان بۆ ئاوێستا دانا.

ووشەي زەند لە يەسنا هات 57 بەندي 8 بەشێوەي ئازەئين تي Azainti هاتووەو بەماناي ڕاڤە، لێكدانەوەو وەرگێران يا گوزارشە.

ئازەئين تي لە بنچينەي زان zan ي ئاوێستاييەوە وەرگيراوە كەهەمان (زانين)ی كورديە.ئەو زەندە ياخود ڕاڤەو وەرگێڕانەی ئاوێستا كە بە پەهلەوي دەنوسرايەوە، ئەميش پاش ماوەيەكو برِێ جار بە سەختيو دژواري ماناكەي بۆ خەڵك ڕوون دەبۆوە، چونكووشەي (ئارامي) و (سامي) فرە تێكەڵو بە زماني پەهلەوي بوو بوو، لەبەر ئەوە بۆ سادەكردنو زێتر ڕوونكردنەوەي زەند، ئەووشانەيان لێ لابردووشەي فارسييان خستە جێگەي.ئەم گۆرِينو ڕاڤە تازەيەي زەند پێي دەبێژرێ (پازەند) كە لە دوو بەش پێكهاتووە.

پەئي تي Paiti بە ماناي (دژ) و ە(خاوەن) وە (دوبارە) يە ئازەئين تي Azainti بە ماناي ڕاڤەو لێكدانەوەو وەرگێرانە.

كەوايە پازەند كورتكراوەي (پات زەند) ەوبەماناي دوپاتكردنەوەي ڕاڤە لێكدانەوەي زەند ئاوێستايە.وشەي دوپاتكردنەوەي كوردي لە (پات) وەرگيراوە.

ئەوەی تا ئێستا بۆمان ڕوونو ئاشكرابووە ئەوەيە كە، زەندو پازەند هەردوكيان بريتين لە ڕاڤەو لێكدانەوەي ئاوێستا، واتە نە خودي ئاوێستانو نە كتێبێكي جياوازن.

## 10- مەجوس (مەگوش، مۆغ)

لەهيچ يەكێ لە پەرتوكە پيرۆزە ئاسمانييەكاني ساميیەكان، واتە (تەورات، ئينجيل، قورئان) بە ڕاشكاوي باسي ئاوێستا نەكراوە.

هەركاتێك گەرەكيان بوبێت باسي ئاييني زەردەشتی بكەن، بەووشەی مەجوس ناويان بردوون. بڕێ لە نووسەرە ئيسلامييەكان لەو باوەڕەدا بوون كە مەبەست لە مەجوس هەمان خۆرپەرستەكان بووە.

نووسەري كتێبي (گفتاري درباره دينكرد)، محمد جواد مشكور لە لاپەرەي 130 كتێبەكەيدا دەبێژێ:

(.... گەلێ دەبێژن كە ئەم وشەيەوشەيەكي ئێرانييەو لە مەگوش Magush وەرگێراوەو لە فارسي كۆندا مەگوش يا موگو mogu بووە، و لە ئاوێستادا ئەم وشەيە مەغو maghou يا moghuو لەنێو كاتێكاندا چەندين جار بەشێوەي مەگ (ماگا) maga بەكار هاتووە [ يەسنا 29 هات 11، يەسنا 46 هات 14، يەسنا 11و 16و يەسناي 53 هات 7 ]، و لە زماني پەهلەويدا مەگوي يا مۆگ mugو لەزماني فارسي نوێدا بۆتە موغ.

هەروەها ئەم وشەيە بەعبري بۆتە مەگ magو بە سرياني بۆتە مەگوش Magusho كە بە ماناي موبدي زەردەشتو مەجوسيو ئاگرپەرستو ساحيرو جادوگەر لێكدراوەتەوە.

هەروەها دەتوانين بێژين كەوشەي مەجوس لە قورئاندا لەموشە سريانييە (مەگوشا) وەرگيرابێت. مەجوس لە زماني سانسكرێت بە ماگها magha بە كاردێتو بەماناي پاداشتو پێشكەشي يە، و لە ريگـودا بە ماناي سەروەتووزەو جۆرێك لە گولێ لێكدراوەتەوە.

لە زوربەي زۆري زمانە ئەوروپاييەكان بە شێوەي ماژ mage دەرهاتووەووشەي ماژيك كە بە ماناي سيحروجادو دێت هەر لەموشەيە وەرگيراوە، جونكو مۆغەكان شارەزاييەكي يەكجار زۆريان لە زانستەكاني ئەستێرەناسينوپزيشكيو.... هەبووە بۆيەواياندەزاني كە ئەمانە جادو كەرنو سيحر دەكەن.

هيرودت، مەجوسي بە شەشەمين خێڵي مادەكان داناوە.

هەروەها ا.م. دياكونوف لەكتێبي (تاريخ ماد)، گۆڕيني بۆ فارسي لە لايەن كەريم كشاورز لە لاپەرە 346 دەبێژێ:

(تا ئەو شوێنەي ئاگادارم، تا ئێستا ئەم تەوەرە سەرنجێكي تەواوەتي پێنەدراوە كە لەسەر تاشەبەردە نووساوەكاني بێستون، داريوشي يەكەموشەي (مۆغەكان)ي بەماناي توێژێك يا كەسانێكي خاوەنكار باس نەكردووە، بەڵكو بە ماناي نەتەوە ياخود خێڵ باسي لێكردون).

لە كتێبي (الألفاف الدخيله في اللغه العربيه) نووسيني قەشە گوبيا العنيس الحلبي اللبناني، چاپي ميسر ساڵي 1932 لاپەرە 68 دەبێژێ:

مەجوس لە زماني ئاراميدا بۆتە مەجوشاو بە يۆناني magosو بەلاتيني magusو بەعبري بۆتە مەج – رب مەج rab mag (مەج ماجوشەيەكي ئاشورييەو بە ماناي مەزنو گەورەيە).

لە قاموسي (كتاب مقدس) كە بريتييە لە ڕاڤەو لێكدانەوەيوشەو ناوەكاني نێو تەوراتو ئينجيل، سەبارەت بە مەجوس دەبێژێ:

(مەجوسوشەيەكي كلداني يا (مادي) يە كە مەبەستي پياوە ئايينييەكانە كە پلەو پايەيان لەنێو كۆمەڵگادا لەنێوان فەرمانڕەواو خەڵكدايە، وە بە خزمەتگوزارەكاني ئايني زەردەشتييان دەگوت مەجوس. ئەمانە بە هۆي جلوبەرگي تايبەتي خۆيانو گۆشەگيري، ناوبانگيان دەركردبوو، وە يەكێ لە ئەركەكاني سەرشانيان ئەوە بوو كە هەميشە لە ئاتەشكەدەكاني هورموزدا چاودێرييان لە ئاگردەكردو مل ملانێيان لەتەک خراپيەكاني ئەهريمەن دەكرد، وەئەمانە فرە زاناو دانا بوونو خەڵكيان فێري فەلسەفەو ماتماتيكو زانياري هەسارەكانو زانستەكاني ئەو سەردەمە دەكردو لەتەك پاتشاكاندا دەچوونە گۆڕەپاني شەرو نەبەردەكان.)

لە ئينجيلي (مەتي)دا باسي چەند مەجوسييەك دەكا كە لە كاتي لەدايكبووني حەزرەتي عيسا بە ڕێنمايي هەسارەيەك دەچنە (بيت لحم) بۆ زيارەتي.

بەپێويستی دەزانم لێرەدا كورتەيەك سەبارەت بە رۆڵی مۆغەكان لەسەردەمي دەوڵەتي ماد باسبكەم.

پاش ئەوەی مادەكا لە سەدەي حەوتەمي پ.زو پاش ڕوخاندني دەوڵەتي ئاشور، هێزو توانايەكي زۆريان لە ناوچەكەدا پەيداكرد، ئەركي سەرشاني مۆغەكان كە تيرەيەكي گەورەي مادەكان بوون بريتي بوو لە ئەنجامداني ڕێورەسمي ئاييني.

زۆري نەخاياند، فارسەكان بەڕابەرايەتي كورش (كە دايكي كورد بووو ناوي ماندانا كچي ئاستياگ دوا ئيمپراتۆري مادەكان بوو) لە ساڵي 550 پ.زو لە چەند شەڕێكي خوێناويدا كە سێ ساڵي خاياندو بەهۆي خيانەتي هەندێ لەسەركردە سەربازييەكانی ماد، دەوڵەتي مادي ڕوخاندو دەوڵەتي هەخامەنشي دامەزراند.

هەر چەندە لەسەرەتادا فارسەكان پاش ئەوەي فەرمانڕەوايەتي ڕامياريو ئايينييان زەوت كرد، نەرمونيانييان بەرامبەر مادەكان ئەنجامدا، وەلێ پاشان لەسەردەمي كەمبو جيەي دووەهەم كوري كورش (522 – 527 پ.ز)، بارودۆخي ژياني مادەكان رۆژ بە رۆژ بەرەو خراپي دەرۆشتوخەڵك بێزار بوبوون.

زۆري نەخاياند كە هەميسانەوە مۆغەكان لە هەموو لايەكدا ئاگري شۆرشو ياخيبونيان خۆشدەكرد.

لەبەرئەوەي مۆغەکان لەبواري ئاينيدا توانايەکي زۆريان هەبوو، توانييان دڵی خەڵک بۆلایخۆیان ڕابکێشنەوە، بەم هۆيەوە سەرەتا سەرکەوتنيان بەدەستهێناو خۆيان ئامادەکرد بۆ شۆرشێکي راميارى ـ ئاينيىو گەڕانەوەي فەرمانڕەوايەتي بۆ مادەکان.

ململانێی ئاینی – نەتەوايەتي بە ڕابەرايەتي مۆغەکان بەردەوام بوو تا لەسەردەمي پاتشايەتي کەمبوجیە کوري کورش مۆغێکي کورد (ماد) بە ناوي گۆماتا بزوتنەوەيەکي ڕاميارى – ئاینی لە مانگي نەورۆزي ساڵي 522 پ.ز، و لەنێو دەرباري هەخامەنشي يەکانەوە، دەستپێکرد بۆ گەڕانەوەي دەسەڵاتو فەرمانڕەوايەتي مادەکان.

لەو ماوەيەدا، بڕێ کاري چاکسازي کۆمەلآيەتيو ئیداريو ئابووري بە سوودي خەڵک ئەنجامدرا.

ئەم سەرکەوتنە زۆري نەخایاند (7 مانگ)، لە ئەنجامدا بە هۆي داریوشي هەخامەنشي دوبارە دەسەلآت کەوتەوە دەست هەخامەنەنشییەکانو گۆماتا کوژرا، و کومەلێکوژییەکي دڕندانە دژي مۆغەکان دەستپێکرد.

بە درێژایي رۆژگار، مادەکانو فارسەکان هێدي هێدي دوژمنایەتي نێوان خۆيان فەرامۆشکرد، و مۆغەکان کە لە ڕابووردودا تەنیا پێشەوايەتي ئاینی مادەکانیان دەکرد، بوو نەپێشەواي ئاینی زەردەشتي لەنێو مادەکانو فارسەکان، و بەم هۆيەوە پێگەو پلەو پايەيەکي گەورەتريان دەستکەوتو لە بارەگاي پاتشاکانی هەخامەنشي ڕێزيان لێدەگيراو بوونە خاوەني پێگەي بلێند.

پاش هێرشي ئەسکەندەري مەکدونيو ڕوخاندني ئیمپراتوريەتي هەخامەنشيو ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەي بەسەر ئاینی زەردەشتيو پەرتوکەکانیان هات، هەمیسان لەسەردەمي ساسانییەکان، مۆغەکان دەسەلآتي ئایينيان گرتەوە دەست، و ئاینی زەردەشتي بۆوە بە ئاینی فەرميوولآت.

لێرەدا بۆ چوونی ا.م دياکونوف دەخەمە بەرچاو کە لە کتێبي (تاريخ ماد) لاپەرە 349 دەبێژێ:

(لەوە دەچێ مۆغەکان خێڵێك بووبن کە ئامۆژگارییەکاني زەردەشت، لە پێش خەڵکي دیکە، لەنێو ئەواندا بلآوبۆتەوە (بێ گوێدانە ئەوەي ئەو ئایینە لەکوێدا هاتۆتە ئارا).

پاشان ئەم مۆغانە ئەنجومەنێکي ئاینی – سیاسیان پێکهێناوە.ئەترەوان (چاودێري ئاگر) نازناوێکي فەرمي بووە کە کاهینەکاني خێڵي مۆغەکان بۆ خۆيانيان هەلێبژارد بوو.

خەڵکي دەڤەرەکاني دیکە زانيارييەکيان دەربارەي ئەو خێڵە بچوکە نەبووە، وەيا ئەگەر بووبێتيان زانيارييەکي زۆر کەم بووە.

خەڵكي دەوروبەريان تەنيا لەتەک کاهینەکاني ئەو خێڵە ئیشوکاريان هەبووە. هەر کارهینێك کە پەيرەوي ئامۆژگاريو پەيامەکەي زەردەشت بووە، مۆغ بووە، بەڵام مەرج نەبووە هەموو مۆغێك کاهین بوبێت.

بەم شێوەيە مۆغ بووەوشەيەك هاوسەنگ لەتەک کاهیني زەردەشتي).

## 11- پێشەوایانی ئاینی زەردەشتی:

يەکەمین پێشەوا لە ئايني زەردەشتيدا پێي دەبێژرێت (دەستور)، دەستور بە ماناي پێشەوا و دانايە وە گەورەترين پێشەواي ئايني شارێك ياوولآتێکە.

دەستور، ڕاوێژکاري پاتشا يا فەرمانڕەواي ناوچەکەيە.

دەستور دەشێ لە ڕوي گوفتارو بيرکردنەوەو زانياري ئايينيو هوشياريدا لە هەمووان بەرزتربێت، و دەبێ لە بيرکردنەوەو گوفتارو کرداردا وە لە ڕوي خواناسيدا پلەي لە هەمووان بەرزتربێت.

پاش دەستور، ئەوەي لەژێر فەرماني دەستور دايە پێي دەبێژرێ (موبد)،

موبد بە ماناي داناو گەورەي مۆغەکانە.ئەم وشەيە سەرەتا (مغ پت) ببوەبەماناي گەورەي مۆغەکان. لە زماني پەهلەويدا (پت) بەماناي سەرۆكو گەورە بووە، و بۆتە (بد).

ووشەکە بەسەريەکەوە بۆتە (مغبد) و پاشان بۆتە (موبد). پێويستە (موبد) گشت زانيارييەکاني ئاييني زەردەشتي بزانێتو لە بيرو کردارو گوفتاردا ڕاستوپاك بێت، کارەکاني بۆخوا ئەنجام بدات نە بۆ مەبەستی تايبەتيومادی .

## جیاوازی نێوان (موبد) وە (هربد):

لە ئاوێستادا هەردووکيان يەك مانايان هەيە، بەڵآم جياوازييەکەيان لە وەدايە کە لەبەر ئەوەی کەسێك کە هەموو ئاوێستا جگە لە ڤەنديداد بزانێت، و بيروکردارو گوفتاري خۆي بەرامبەر ئايني يەکتاپەرستی ڕاستو پاکو بێ خەوش بێت، وە بيەوێتو خوازياري گەيشتنە پلەي (موبد)ي بێت، لەتەک ئەم تايبەتمەندييانەي پێي دەبێژرێ (هيربد).

بەلآم كاتێك كە (ڤەنديداد) و هەموو ياساكاني ئاييني يەكتاپەرستی بە تەواوەتی بزانيتو زانيارييەكي تەواي هەبێت لێيان، ئەوجا دەبێتە (موبد).

دەتوانين بێژين: هيربد بەماناي مامۆستايەو موبد بەماناي پاسەواني فەرمانەكاني خواو دەستورەكاني ئايني يە.

يەكێكي ديكە لە پلەوپايەكاني پێشەوايەتي، پلەي (زەرەتشتروتمە)يە

Zarathushti u termah كە بەماناي (وەك زەردەشت) يا (زەردەشت مانند)ە.

هەروەكو باسمانكرد پلەي (دەستور) لەسەرو (موبد) و (هيربد) ە وەيە، و (زەرەتشتروتمە) پلەو پێگەي لەسەرو هەموو ئەمانەدا بووە، وە نازناوێك بووە كە دراوە بەو كەسانەي كەلە بواري بيروكردارو گوفتاردا بە ئەندازەيەك پاكو بێخەوش بووە كە نزيك بۆتەوە لە تايبەتمەندييەكاني زەردەشت. ئەم پلەيە ئيدي ئێستا لە ئايني زەردەشتيدا نەماوە.

## زەردەشتو شۆڕشی كۆمەڵايەتیو ئابووری

كۆمەڵگايەك كە ئارەزووو هيواي زەردەشت بوو، كۆمەڵگايەكە كە بە ڕەوشێكو شێوازێكي زانستييانە بە رنامەرێژي بۆ بكرێت. كۆڵەكەي ديوەخاني ئەم كۆمەڵگايە، كاروكۆششي بێووچانو دروستە. بێكاريو تەمەڵیو تەوەزەليو گۆشەگيريو دەروێشي بە هيچ جۆرێك پەسەند نەبوو وە ڕێگەي پێنەدەدرا.

زەردەشت، لە ڕوي ئيلاهياتو ميتافيزيك، باوەڕي بە خوايەكي تاكو تەنيا هەبوو بە ناوي ئاهورامەزدا، و لە ڕوي فەلسەفييەوە باوەڕي بە بووني دوو هێزي سالبو موجەب ياخود چاكو خراپ هەبوو كە پێي دەگوتن سپەنتامينو (بيري خاس) و ئەنگرەمينو (بيري خراپ) كە هەميشە لە ململانيدان دژي يەكتر، بەلآم ئازادي تەواوي بۆ ئادەميزاد بە ڕەوا داناوە بۆ هەلێبژاردني ڕێگەي ژياني خۆي.

زەردەشت، هەميشە تێكۆشاوەو هاني ئەوەيداوە كە پرسي ڕامياري لە ئايين جيابكاتەوە.

پەيامي زەردەشت، پەيامي ئازاديخوازي، دادو هيوايە، پەيامي ڕزگارييە لە داوي نەخوێنەواريو ئەفسانەو قوربانيو ڕێو ڕەسمو تەشريفاتي قورسو بێجێي ئاييني، و دژي ئيتاعەتي كوێر كوێرانەيەو داوا لە خەڵك دەكات بەووردي لەتەك هزري خۆياندا ڕاوێژ بكەنو بەبيرێكي ڕووناكو چاكەوە ڕێگەي ڕاستو دروستي ژياني خۆيان بدۆزنەوە كە ئەويش هيچ ڕێگەيەك نييە جگە لە ڕاستيو دروستي.

هەزاران ساڵ لەمەوبەر، لەگەڵێ دەرکەوتني ئەم پەیامبەرە مەزنو شۆڕشگێرە، چەرخێکي نوێ پەیدابوو لە گۆڕانو گۆڕینو پێشکەوتني ڕەوشي کۆمەڵایەتي. زەردەشت، مانایەکي تازەو دروستي بۆوشەي ئایین هێناوە کە دەڵێت بریتي یە لەویژدانو نەفسي دەروون. دەبێژێ کە ئایین تەنیا بریتي نییە لە پەرستني خوایەك‌و بەس، بەڵکو هۆیەکە بۆ خۆناسینو پەیوەندییەکە لەنێوان ئادەمیزادو ئافەریدەگار بە هۆي بیرکردنو تێفکرین.

زەردەشت دەبێژێ، جیهانو هەرچییەکي تێدایە لە پرشنگي حیکمەتي ئاهورامەزداي مەزنەوە ئافەریدە بووە، بۆیە ژیان لە دیدي زەردەشتەوە بریتییە لە ڕووناکيووپرشنگ، و ژین بریتییە لە ناسیني مەعنەویات‌و هوشیارکردنەوەو زیندوکردنەوەي پرشنگي ڕووناکي ئاهورایي لە دەرووني ئادەمیزاد.

پرشنگي مەعنەوییەت لە گیاني هەموو کەسێکدا دەدرەوشێتەوەو ڕووناککەرەوەي بیرو هەست‌وپاکيو میهرەبانيو خۆشەویستییە.

پەیدابوونو دەرکەوتني مەعنەوییەت هەروەکو ژیان کارێکي سرووشتییە، مرۆیەکي ڕۆشەنبیر هەرگیز ناتوانێت بەبێ ئەقڵو بووني لوێژیك (منتیق) وهیواو ئارەزویەکي تایبەت، بژي.

مەبەستي ڕاستي ژیانو کاروکۆششي مرۆڤ تەنیا لە ڕێگەي پەیوەندیکردني لەتەکویژدانو دەروندا پەیدا دەبێت. بۆ پەروەردەکردني ئەم مەعنەوییەتە دەشێ هێزي بیرکردنەوە بەهێز بکەین، ناتوانین تەکوزيو ڕێکوپێکي ڕۆحيو مەعنەوییەت بە هیچ جۆرێك بە تۆپزي بەدەست بێنین، بەڵکو کەسێیەتي ئەو کەسەو پرشنگي خودي خوێی دەبێ ڕەوشت‌و مەعنەوییەت دەربخات، بەماناي ئەوەیە کەوا ڕەوشت‌و کردارو هەڵسوکەوتي هەموو کەسێك بە دەست خۆیەتي.

هەموو کەسێك دەشێ پێش هەموو شتێك خۆیبناسێت‌و ئەم خۆناسینە کارێکي دەرونییەو زەردەشت لە ئامۆژگارییەکانیدا زۆر بە سادەییو ڕاشکاوي بەیانیکردووە.

مرۆڤ کاتێك دەتوانێت خۆي بناسێت کە بەهۆي بیرکردنەوە وە، و لە ڕوي قەناعەتەوە باوەڕي بەبووني خواي تاکو تەنیا هەبێت، جونکە کاتێك کە ئەو باوەڕي هەبوو، ئەوجا دەتوانێت دەربارەي ژیانو چۆنیەتي ئافراندنو هەڵیسوڕاندني هەموو کە شکەڵآنەکان زانیاري تەواو پەیدا بکات‌و ئەوسا خۆشي بناسێت، و بەهۆي ئەم خۆناسینەوە دوور دەکەوێتەوە لە هەموو کاروبیرێکي خراپ، و بەهۆي گشت ئەم زانیاریانەوە تەکاملي ڕۆحي پەیدا دەکات‌و بەرەوپێشەوە دەروات.

لە ڕاستیدا، بەهۆي ئەم هەموو کاروکاردانەوانەدا لە ئەزمونەکاني ژیانیدا بۆي ڕووندەبێتەوە کە هێزێکي نادیار ئاگاداري هەموو هەڵسوکەوتەکانێتي.

لێرەدا دەبینین کە هەموو مرۆڤێك شۆڕشێکي کۆمەڵایەتي لە دەروني خۆیدا بەرپادەکاتو دوور دەکەوێتەوە لە گەندەڵیو خۆپەرستیو تاوانو خوێن ڕێژيو......

لە ئامۆژگارییەکاني زەردەشت، ئەوەمان بۆ ئاشکرادەبێ کە مەبەست لە ئافراندني ئادەمیزادو هۆي ژیان ئەوەیە کەوا هەموو کەسێك بەشداربێت لە ئاوەدانکردني جیهانو بەختیاري خەڵک، و بەهۆي بیروکردارو گوفتاري خاسەوە بگاتە دوندي پوختەییو بەختیاريو نەمري.

هەروەکو ئاماژەمان پێکرد، یەکەمین هۆ بۆ ئەم مەبەستە ئەوەیە کە خۆمان بناسین.

زەردەشت دەبێژێ، ئەو ڕۆحەي کەوا لە جەستەي هەموو کەسێکدایە لە سەنتەري ڕاستییەکەوە هاتووەو پرشنگێکي پیرۆزو نەمرە کە لە جیهاني ڕۆحەکانەوە هاتووەو لە جەستەي مرۆڤدا جێگیر بووە، و ئەم جیهانە ماددییە نیشانەیەکە لە جیهاني رۆحانيو بارەگاي هەمیشەیي ئاهورامەزدا.

بە پێچەوانەي برێ لە ئاینە ئاسمانییە سامییەکان، پەیامي زەردەشت، ڕوو لە ژیانێکي پڕ لە خۆشيو بەختەوەريو دارایي وەرناچەرخێنێت.

زەردەشت، ژیاني ماددي بە پوچ نازانێتو هەمیشە داواي لە پەیرەواني خۆيو هەموو خەڵک کردووە سوود لە خۆشيو جواني سروشت وەربگرن، و دەبێژێ لەبەر ئەوەي ئادەمیزاد خاوەني جەستەو ڕۆحە، پێویستە لە خۆشيوشاديو جواني مادديومەعنەوي بەهرە وەربگرێت، هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە دژي گۆشەگیريو دوور کەوتنەوە لە خەڵکە، و دژي ژیاني دەوارنشینیە، بۆیە دەتوانم بێژم زەردەشت کەسێکە کەوا ڕێگاي راستي پێشان خەڵک داوە بۆ دابینکردني ژیانێکي پڕ لە بەختیاري لە جیهانداوگەیشتنە بەختەوەري ڕاستەقینە لە جیهاني مەعنەویدا.

لە دیدي زەردەشت، ژیان پڕ لە خۆشيو پیرۆزییەکانە بۆ مرۆڤ، و خەڵاتێکی یەزدانییە، نابێ خۆماني لێبێبەش بکەین.

هەژاريو دەستکورتيو بێدەرامەتيو تەمەڵی کاري ئەهریمەنییە، نابێت بە بیانوو هیواي وەرگرتني پاداشت لە رۆژي پەسلآندا چاو لە خۆشییەکاني ئەم جیهانە بپۆشین.

بێگومان، پەرێشانيو دەستکورتيو هەژاري لەم جیهانەدا نابێتە هۆي سەرمایەو ئابرو بۆ رۆژي پەسلآن.

بە پێچەوانەوە، لە جیهاني داهاتودا پاداشتي چاکە بە کەسێك دەدرێت کە لەژێر سایەي کاروکۆششدا زەوي ئاوەدان کردبێتو خەڵکي شادو بەختەوەر کردبێتو خەنداني کردبنو کاروکرداي خاسي لە پاش خۆي بەجێهێشتبێ.

زەردەشت، وەك بودا بيرناكاتەوەو بەخەڵك نابێژێ كە:

(ڕزگاري هەر كەسێك بە لە ناوچونيەتيو دەبێ دەستبەر داربين لە هەموو خۆشييەكي ماددي‌و گۆشەگيربين‌و خەريكي رياچت بين)، بەڵكو بە پێچەوانەوە دەبێژێ ئادەميزاد بۆ ژيانێكي كۆمەلآيەتي‌و پوختەيي‌و بێ كەمايەسي‌و خاس دروستكراوە، و ژيان بريتييە لە ململانييەكي هەميشەيي لەنێوان چاكەو خراپەو ئێمە پێويستە هەميشە پشتيواني چاكەو ڕاستي بين‌و دژي خراپەكاري بين.

ئەم ئامۆژكارييانەي زەردەشت جياوازييەكي زۆري هەيە لەتەك ئامۆژگارييەكاني ئەو كەسانەي پێيانوێيە ئادەميزاد ژياني بە گوناهێكي گەورە دەستپێكردووەو مرۆڤ گوناهبارەو ژياني هەر لەسەرەتاي ئافراندندا لەكە دارە، و تەنيا بەهۆي رياچت‌و كوشتني هەموو ئارەزووە دەرونيەكاني خۆي‌و خۆڕاگرتن بەرامبەر ناخۆشي‌و ئازارو ئەشكەنجەي جەستەيي‌و ڕۆحي‌و هەڵبژاردني رێگەي دەروێشي دەتوانێت بەختياري ڕاستەقينەي ئەو دنيا دابين بكات.

لێرەدا هەندێ لەو دياردانەي كە لە شۆڕشە مەزنەكەي زەردەشت لە كۆمەڵگادا بەرچاو دەكەوێت دەخەمە بەر ديدي خوێنەواران كە لە ڕاستيدا (مشتێك نموونەي خەروارێكە):

# ڕاستی

لەبەر ڕۆشنايي پەيامي زەردەشت‌ووتەكان‌و ئامۆژگارييەكاني، يەكەمين‌وگرنگترين سيفەتي ئاهورامەزدا بريتيە لە ڕاستي‌و دروستي كە پێي دەبێژرێ (ئاشا وەهيشتا).

لە زۆر شوێني گاتاكاندا زەردەشت ئەم هەقيقەتەي چەندين جار دووپاتكردۆتەوە كە ئايني يەكتاپەرستی لەسەر بنچينەي ڕاستي‌و دروستي بونيادنراوە. لە يەسنا هات 49 بەندي 3 دەبێژێ:

"ئەی مەزدا،

تۆ، بەدروستي ئەم باوەڕو ئامۆژگارييەت

بۆ هەموان داناوە كە،

ڕاستي سوود بەخشەو درۆ زيانبارە.

لەبەر ئەمەيە كە،

ئەز، ئاواتە خوازي بيري خاسم،

و خۆمو خەڵک لە نزيکبونەوە لە درۆو خراپە دوور دەخەمەوە. "

لە زۆر شوێني ديکەي گاتاکاندا ناوي ئاهورامەزدا لەتەکوشەي (ڕاستي)دا پێکەوە هاتووە.

پيتاگۆرس، فەيلەسەفي يۆناني وە مولتون دەبێژن:

" لەبەر رۆشنايي ئايني زەردەشت، خواو ڕاستي يەکێکن "

لە يەسنا، هات 28 بەندي 5 دەبێژێ:

"....

ئەي دياردەي ڕاستيو پاکي (ئاشا)،

کەي بە ديدارت شاد دەبم؟ "

هەروەها لە يەسنا هات 29 بەندي 7 دەبێژێت:

" ئەم ئاخافتنە پيرۆزە کەشاديو بەختەوەري دەهێنێ،

لە لايەن ئاهورايەکە

ويستو خواستي لەتەک ڕاستيدا (ئاشا)، هاوئاهەنگە).

زەردەشت، هەميشە دژي درۆو درۆزنانبووە، درۆي بە گەورەترين مەترسي ژيانو دەردەکاني کۆمەڵگا هەژمارکردووە.

لە (ئوردیبەهەشت يەشت) لە بەندى (17)دا دەبێژێ:

(درۆ دەبێ پوچەڵ بکرێتو نەمينێت، لە جيهاني مادديدا پێويستە ڕاستي بەسەر درۆدا زاڵ بێت).

ڕاستي، پرشنگێکي يەزدانييە لە ناو دەروني هەموو مرۆڤێکداو لەويژداني هەمواندا پێگەي تايبەتي خۆي هەيە.

داناو دروستكردار ئەو كەسەيە كە هەوڵو كۆشش بدا كە ئەم ڕاستییەي لە دەروون دايە بەكاربهێنێتو ڕێگايەك وە شێوازێك بوێ ئە م پرشنگە پر لەڕووناكییەي نێودەرون بدۆزێتەوە بۆ ئەوەي بتوانێت لە دەرونو بووني خۆيەوە، پرشنگي ڕووناكییەكەي، ژینگەوجیهان ڕۆشەن بكات.

ڕاستيو ڕاستگۆيي، هیواو ئارەزووي زەردەشت بووەو تێكۆشاوە بۆ پەرەسەندنو بلاّوكردنەوەي ڕاستيو دروستي لە كۆمەڵگاداو دەبێژێ:

باشترین بەختياري، ڕاستییە، بەختیار ئەو كەسەیە كە خوازیارى باشترین ڕاستي بێت.

هەروەها دەبێژێ، يەك رێگا لە جيهاندا هەیە ئەويش ڕێگاي ڕاستییە.

لە يەسنا هات 35 بەندي 8 دەبێژێ:

(بە هۆي ڕاستيو دروستییەوە هەموو كەسێك دەتوانێت بەختەوەري هەردوو جیهان بەدەستبهێنێت).

لە ئاوێستاو هەموو پەرتوكە ئايینيكاني زەردەشتیدا باسي خراپەي درۆو درۆزنان كراوە، درۆ بە يەكەمین هۆي هەمەجۆرە گوناهێك هەژماركراوە، ودرۆزن بە هاورێو هاودەمي ئەهریمەن دانراوەو لەبەر چاوي خەڵكدا، بێ كەلێكووبێ ئابڕووە، و لەو دیناش مايە پوچو شەرمەزارە.

# پەیمان

زەردەشت، بايەخو گرنگییەكي زۆري داوە بە پەیمان، هەمیشە خەڵكي هانداوە كە كاتێك پەیمان دەدەن، دەبێ بەجێیبهێنن، تەنانەت ئەگەر ئەو پەیمانە لەتەک مرۆیەكي خراپەكاریش بێت.

داوا دەكات كە هەرگیز لە ژیاندا پەیمان نەشكێنین، چونكە ئەو كەسەي پەیمان دەشكێنێ دەبێتە هاورێي درۆزن. پەیمانشكێني لە ئاوێستادا بە بەشێك لە درۆ هەژماركراوە.

لە ئاوێستادا، میترا (مهر) بەفریشتەي پەیمان دانراوە.

لە (مهریشت بەندى 2) دەبێژێ:

(ئەي زەردەشت، پەيمانشكێنێك دەتوانێ سەرجەم كیشوەرێك یا دەڤەرێكوێرانو خاپور بكات، ئەي ئەسپیتمان، تۆ نابێت هەرگیز پەیمان بشكێني ئەگەر چي ئەو پەیمانە لەتەك درۆزنێكیشدا بەسترابێت. دەبێ هەوڵبدەیت پەیمانەكەت بەجێبێني، چونكە پەیمانبەستن لەتەك ڕاستگۆو درۆزندا، هەردوو ڕاستو پیرۆزەو پێویستە ئەنجامبدرێت).

لە یەسنا 61 بەندي 3 دەبێژێ:

(ئێمە دژي ئەو كەسانەین كە پەیماني خۆیان دەشكێننو وەفاي پێناكەن).

ویل دورانت، لە كتێبە بەناوبانگەكەي خۆیدا (مێژووي شارستانییەت) بەرگي یەكەم لاپەرە 426 ي وەرگێراوي فارسییەكەي دەبێژێ:

(لەبەر ئەوەي پەیرەواني ئایني زەردەشت، ئەم جیهانەیان بە گۆڕەپاني ململانێ نێوان هێزي چاكەوخراپە دەزاني، بەم شێوە بیركردنەوەیان، بیریان لە بزوێنەرێكي بەهێزو توانا، یاخود هێزێكي میتافیزیك دەكردەوە كە ئادەمیزاد هانبدات كاري چاكە بكەنو لە پاشاندا پاداشتي چاكەشیان بداتەوە..... بەم شێوە بیركردنەوەیە یاسایەكي ڕەوشتي زۆر سادەو جوان هاتە ئاراوە كە پاڵي نابوو بەم ڕاستییەكە (تەنیا ئەو كەسە خاسە كە هەرشتێكي بۆ خۆي بە باش نەزاني، بۆ خەڵكیش بە باش نەزانیت)

## بە گوێرەي دەستوري ئاوێستا ئەركي سەرشاني ئادەمیزاد سێ شتە:

- یەكەمیان ئەوەیە كە نەیارەكەي بكاتە يارو دۆست.

- دووهەمیان مرۆڤي ناپاكو خراپ بكاتە پاكو خاس.

- سێهەمیشیان ئەوەیە كە مرۆڤي نەزانو نەخوێنەوار بكاتە داناو زانا.

هەروەها دەبێژێ، شاكانیش كە پەیرەوي ئەم ئاینە بوون، ئاكاري بەرزو جوانیان هەبووە، بۆ نموونە سەبارەت بە یۆنانییەكان كە زۆر پەیمان شكێن بوون، ئەمان پابەندي پەیمان بوونو هەرگیز پەیمانیان نەدەشكاندو شانازییان بەوە دەكرد كە ئەگەر پەیمانێكیان دابێت هەرگیز لێی پاشگەز نەبونەتەوە. شتێكي دیكە كەسەرنجي نووسەري ڕاكێشاوە ئەوەیە كە لە مێژووي مادو پارس كە زەردەشتی بوون هەرگیز دیاردەي جاشێتي نەبووەو نەچونەتە ریزي دوژمن دژي میللەتي خۆیان.

## پاكیو پاكدامەنی

له ئاوێستادا گرنگییەكي تایبەتي دراوه به پاك ڕاگرتني جەسته، و به یەكێك له گرنگترین ئەركەكاني سەرشاني هەموو مرۆڤي داناوه، و خراوەته ڕیزي سیفاتي بەرزي وەك ڕاستيو دروستي، و به نیشانەي پێشكەوتني كۆمەڵگادانراوه.

له گاتاكاندا دەبێژێ:

(لەیەكەمین چركەي ژیاني ئادەمیزاد، پاكو تەمیزيو خاوێنيو چاودێري لەش ئەركي سەرشاني هەموو كەسێكه. لەبەر ئەوەي هەموو كەسێك له جەستەو ڕۆح پێكهاتووه، پێویسته لەسەرمان ئاگاداري هەردوكیان بكەین.

به چاودێريو خاوین ڕاگرتني جەسته، تەندروستیمان باش دەبێت. كاتێك تەندروستیمان باش بوو، وورەو مەعنەویاتمان بەرز دەبێتو بەچاوێكي ڕوونو گەشەوه دەڕوانینه جیهان، بەڵام به پێچەوانەوه هەرگیز مرۆڤێكي نەخۆش ناتوانێت به چاوێكي گەشەوه تەماشاي ژیان بكاتو لێیووردبێتەوه. بۆیه هەمیشه ڕۆحیشیان له ناخۆشیدادەبێت).

زەردەشت، گرنگيو بایەخێكي تەواوي داوه به پاكدامەني مرۆڤ له كۆمەڵگادا، بەتایبەتي هاني پاكیزەیي ئافرەتاني داوه كه بەهۆي بیرو كردارو گوفتاري خاسەوه كێبەركێیەكي ئاكاریانه لەتەك پیاواندا بكەن.

## ئازادي هەڵبژاردن

یەكێ له هەرەگرنگترینو بایەخدارترین دیاردەكاني پەیامي زەردەشت، كه گشت توێژەرانو ئاوێستاناسان یەكدەنگن لەسەري، بریتییه له ئازاديو توانایي مرۆڤ بۆ هەڵبژاردني ڕێگەي ژیانو چارەنووسي خۆي.

لەنێو گاتاكاندا بەڕاشكاوي باس لەوه كراوه كه مرۆڤ به ئازادي ئافەریده بووه، و تەنیا خودي خۆیەتي كه ڕێگەو چارەنووسي خۆي هەڵدەبژێرێت.

زەردەشت پاش ئەوەي پەیامەكەي ئاشكراو بلآودەكاتەوه، جەخت لەسەر ئەوه دەكات كه ئادەمیزاد دەبێ به ئازاديو بەویستو هۆشي خۆي ڕێگەي ژیاني هەڵبژێرێت.

ئەم بیره لەنێوگاتاكاندا زۆر بەڕاشكاوي ئاماژەي بۆكراوه. له یەسنا هات 30 بەندي 3 دەبێژێ:

......"

مرۆي ژيروودانا، ڕاستيو دروستي هەڵێدەبژێرێتو

نەزانو بێهۆش، خراپە هەڵێدەبژێرێت. "

هرتسفلد، لەو باوەڕەدايە كە زەردەشت نەتەنيا لە بواري كۆمەڵايەتي، ئازادي هەڵبژاردني بە مرۆڤ داوە، بەڵكو تەنانەت باوەڕي بەوە هەيە كە بۆ باوەڕ هێنان بە خواو چوێنيەتي پەرستنونزاكردنيش دەبێ مرۆڤ بە بيرو هۆشي خۆي بگاتە ئەو ڕاستييە لە يەسنا، هات 30 بەندي 5 دەبێژێ:

ئەوكەسەي بە كاروكرداري ڕاستو دروستو باشي خۆي ئاهوراخۆشنود دەكات، مەزدا هەڵێدەبژێرێت.

ئالتهايم، باوەڕيوايە كە زەردەشت ئەم باسەي زۆر بە ڕاشكاويو ڕاستەوخۆ ڕونكردۆتەوە كە ئەركي سەرشاني هەموو كەسێك ئەوەيە كە دژي درۆو خراپە، ململانێ بكات بۆئەوەی بگاتە ڕاستيو دروستي. لەم ڕێبازەدا پشتو پەناي هەركەسێك تەنيا خۆيەتيو بەس، و دەبێ باوەڕي بە هۆشو هزري خۆي هەبێت، واتە كەسوكارو بنەماڵەو پەيوەندييەكاني دي كە خۆيان بە تكاكار لەنێوان خەڵكو خوا دادەنين (ئافەريدەو ئافەريدەگار)، هيچ سوودێكيان بۆ ئادەميزاد نييە.

اشپيگلوويندیشمان دەبێژن:

ئەو ڕۆشناييەي لە تەوێڵی ئايني زەردەشتدا دەدرەوشێتەوە بريتييە لەوەي كە هەركەسێك سەرنجي گاتاكان بداتو بيانخوێنێتەوە، تێدەگات كە ئەم ئاينە بەهۆي باوەڕ بووني بە (ئازادي هەڵبژاردن) و باوەري بەبيرووتەو كرداري خاس، گرنگترين دەستگاو ڕێكخراوەي لە مێشكي هەموو كەسێكدا دامەزراندووە.

گێگر، ئازادي هەڵبژاردن بە يەكێك لە گرنگترين بنچينەكانی ئايني زەردەشت دەزانێت.

ويل دورانت، باوەڕيوايە، ئەم بۆ چوونەي زەردەشت سەبارەت بە ئازادي هەڵبژاردن، شكۆو مەزنايەتييەكي وەها زۆر بە ژياني ئاسايي دەبەخشێ كە لە هەموو شێوەي بيركردنەوەكاني ديكە بەرزترو بايەخدارترە.

ئەم شێوازي بيركردنەوەيە مرۆڤ لەوە ڕزگار دەكات كە وەك كرمێكي بێ دەسەڵاتو ياخود مەكينەيەكي خۆكاري ميكانيكي يا موێرەی شەترەنج تێی بڕوانرێت، بەڵكو ئادەميزاد

لە ململانێي نێو ئەم جیهانەدا بەشدارەو ئازادي هەڵبژاردنو رێکخستني هەیە، چونکو ئاهورامەزدا خواستي ئەوە بوو کە ئادەمیزاد رِەسەن بێت.

زهنر، دەبێژێ: ئایني زەردەشت بە تەواو ماناوە باوەرِي بە ئیرادەي ئازادە، هەر کەس زوو یا درەنگ دەگاتە ئەو رِاستییەي کە دەبێ لەنێوان رِاستيو درۆدا یەکێکیان هەڵبژێرێت.

زەردەشت لە یەسنا، هات 30 بەندي 2 جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە لەنێوان دوو دیاردەي رِاستيو درۆدا، هەرکەس دەبێ خۆي بە ئارەزووي خۆي یەکێکیان هەڵبژێرێتو دەبێژێ:

" کەوایە،

گوێرایەڵی خاسترینوتەکان بن،

وبە بیرێکي رِۆشەنەوە هەڵیسەنگێنن،

وهەر یەکە لە ئێوە بۆخۆي

لەم دوو رِێبازە، یەکێکیان هەڵبژێرن،

پێش ئەوەي رِووداوي مەزن رِوو بدات

هەر یەکەتان بە دروستي ئاگاداربن،

لەم پەیامە تێبگەنوبلآوي بکەنەوە. "

هەروەها لە یەسنا، هات 31 بەندي 2 دەبێژێ:

" لەبەر ئەوەي بە هۆي دوو دڵیو رِارِاییەوە

هەڵبژاردني رِێگەي رِاستو دروست، ئاشکراو رِۆشەن نییە،

ئەز، وەك رِابەرو مامۆستا یەك

کە هەڵبژاردەي مەز دایە،

بۆ رِێنمایي ئێوە نێردراوم،

که هەردوو دەستە فێر بکەم

چلێون لەژێر سایەي ئاینی ڕاستیدا، بژین. "

هەروەها لە هات 43 بەندي 16، دیسانەوە زەردەشت جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە " ئەي ئاهۆرامەزدا، زەردەشت لە بۆ خۆي ئەو گەوهەرەي کە هي تۆیە، هەڵیبژارد...... "

لە هات 51 بەندي 8 دەبێژێ:

(جاماسپ، بەهۆي بیري خاسي خۆیەوە، ئاینی ڕاستي هەڵێدەبژێرێت.........)

هات 31 بەندي 11 دەبێژێ:

" ئەي مەزدا،

هەر لەو ساتەوەو لەسەرەتاوە کە

بە بیرو هۆشي خۆتەوە،

ژیانوویژدانو هۆشت بۆ دروستکردین،

و گیانت کردە نێو لەشمان،

و توانایي گفتوگۆو کارکردنت پێبەخشین،

هەر لەو کاتەوەویستت کە ئێمە بەشێوەیەکي ئازاد،

باوەڕو ڕێو ڕەوشي ئاینی خۆمان هەڵبژێرین. "

جلال الدین ئاشتیاني لەم بارەوە دەبێژێ:

(ئيدي لەمە ڕۆشەنتر، ناتوانرێت لە 3500 ساڵ لە مەوبەرەوە دەربارەي ئازاديو هەڵبژاردني ئادەميزاد قسەبكرێت.)

## مافی مرۆڤ

مافي مرِۆڤ، دەستەواژەيەكي ياساييو رِاميارييە لەم چەرخەي ئێمەدا.

لەنێو ئاينە پيرۆزەكاندا ئەم دەستەواژەيە بەشێوەيەكي رِاشكاوانە بەرچاو ناكەوێت. بەلآم ئەرزشو بەهاكاني ئاكاريو دادي كۆمەلآيەتي كە ناوەرِۆكي مافي مرِۆڤ پێكدەهێنن، كەم تا زۆرێك بە شێوەيەكي رِاشكاوانە يا بە هێماكردن لە زۆربەي زۆري ئايينو ئايينزاكاندا بەرچاو دەكەون.

لە ديدي ناوەرِۆكي مافي مرِۆڤ، ئايني زەردەشتي لەنێو گشت ئايينەكاني ديكەدا، لە لوتكەي هەموويانە، وە هۆي ئەمەش دەگەرِێتەوە بۆ دوو بونيادي باوەرِ كە بريتين لە:

يەكەميان ئەوەيە كە ئاهورامەزدا سەرچاوەي هەموو چاكييەكانەو خراپە لە قەلەمرِەويدا نييە.

دووهەميان ئەوەيە كە مرۆ وەك هاوكاري ئاهورامەزدا،دەشێ لە كاروكردارەكانيدا لًی فێربێتو وەك ئەو رِەفتار بكات.

لەنێو ئايني ئيسلامدا مرِۆڤ (عبد الله) يەواتە بەندەي خوايە.

لە ئايني مەسيحي دا مرِۆڤ كورِي خوايە، بەلآم لە ئايني زەردەشتيدا مرِۆڤ هاوكاري ئاهورامەزدايە.

هەموو كاروكردارێكي ناپەسەند لە گاتاكاندا، ئەوانەن كە هەرِەشە لە مافي مرِۆڤ دەكەن، تورِە بوونو رِقوكينە، درۆكردنو بێدادي، گەندەڵی بە هەموو شێوەكاني، پالێپشتي كردن لە فەرمانرِەواي ستەمگەر، ژێر پێ خستني ياساو جياوازيخستن لەنێو خەڵكدا، و....... لە گاتاكاندا بەهەموو جۆرو شێوەيەك،بەنارِەواو ناشايست هەژمار كراوە.

سەبارەت بە ئازادي مافي مرِۆڤ لە بيركردنەوەو هەڵبژاردن، بەتايبەتي هەڵبژاردني چۆنيەتي ژيان بردنەسەرو هەڵبژاردني ئايين، بۆچووني گاتاكانمان باسكرد، وەئێستا برِێ نموونەي ديكە دەربارەي باوەرِ بە مافي مرِۆڤ دێنمە بەرچاو.

باوەڕ بە یەکساني نێوان ژنو پیاو لە پەیامي زەردەشتیدا زۆر بە ڕاشکاويو بێ پەردە ئاماژەي بۆ کراوە.

لە هەر شوێنێکدا زەردەشت بانگهێشتي بۆ خەڵکي کردبێت بۆ گوێرایەڵی لە پەیامەکەي، ئاماژەي بۆ ژنو پیاو وەك یەك کردووە.

هەروەها دەربارەي هەڵبژاردني هاوسەر، ژنوپیاوي وەك یەك بەرپرسیارکردووەو ئامۆژگاري کوڕو کچاني کردووە کە پێش ئەوەي هاوسەرگیري بکەنو پەیماني ژنمێري ببەستن، دەبێ لەتەک بیرو هزري خۆیاندا ڕاوێژ بکەنو بەئەقڵو دڵو گیانەوە هاوسەر بۆ خۆیان هەڵبژێرن، لە هیچ شوێنێکي گاتاکانداوشەي بەردە یا کۆیلە وەك توێژیکي کۆمەلآیەتي بەکار نەهاتووەو ئەمەش ماناي ئەوەیە کە ئەم ئاینەو بە تایبەتي زەردەشت خۆي باوەڕي بە توێژێك بە ناو کۆیلە نەبووەو هەموو خەڵکي بە چاوي یەکسانو ئازاد بینیوە.

بەلآم ئەگەر بڕوانینە ئاینەکاني دیکە دەبینین هەموویان باسي کۆیلەو کۆیلایەتي دەکەنو هەموویان داواي ئازاد کردني بەردە دەکەن، بەلآم هیچ یەکێکیان کۆیلایەتییان حەرام نەکردووەو زۆربەیان یاساي تایبەتییان بۆ بەردەداري داناوە.

لە پەیامي زەردەشتیدا، هەموو مرۆڤ لەبەرامبەر یاسادا یەکسانن، وهیچ کەسێك لە هەر پلەوپایەو پێگەیەکدا بێت لەسەرو یاساوە نییە.

لە گاتاکاندا بەڕاشکاويو بێ هیچ پێچوپەنایەك دەبێژێ کە نابێ مرۆي خاس پەیڕەوي لە فەرمانڕەواي ستەمکارو گەندەڵيو بێدادو درۆزن بکەن.

پرۆفیسۆر جون هینلز لە کتێبي The Theory and Practics of Human Rights paper presented to Fourth world a ,in Zoroastrianism Zoroastrian، congress، Bom boy، 1985. دەبێژێ: ئەشێ ئاینی زەردەشت بە یەکەمین ئاینێك هەژمار بکرێت کە داکۆکی لە مافي مرێۆڤ کردووە.

کورش کە دامەزرێنەري دەوڵەتي هەخامەنشي بوو، وە زەردەشتی بوو، هەر ناوچەووولآتێکي داگیر بکردایە، سەبارەت بە دیلەکان مافي مرۆڤي ڕەچاو دەکرد.

بە گوێرەي نووسیني سەر تاشە بەردەکان، هەقدەستي کارکردنیاني بە تەواوەتيو بێ هیچ کەموو کوڕییەك پێدەدان، وە خەڵکي ئەو شوێنانەي داگیري دەکردن، ئازادي تەواوي پێدەدان بۆ پەرستني بتە خواکانیان.

باشترین بەڵگە بۆ ڕەچاوکردني مافي مرۆڤ لەو سەردەمەدا ئەم جارنامەیەیە کە لە ساڵي 546 پ.ز لە لایەن کورشەوە بە بۆنەي تاج خستنە سەریەوە بلآوکراوەتەوە.

دەقي جارنامەكە دەبێژێ:

## دەقي جارِنامەي كورش

ئێستا كەبەياريدەي مەزدا تاجي پاشايەتي ئێران‌و بابل‌ووولآتاني هەر چوار دەوروبەرم ناوەتەسەر، رِايدەگەيەنم كە تا ئەو رِۆژەي زيندووم‌و مەزدا پاشايەتيم رِادەگرێ‌و بەردەوامە، رِێز لە ئايين‌و ئاييزاي هەموو ئەو خەڵكانە دەگرم كە ئەز پاشايانم‌و نا هێڵێم فەرمانرِەواو نێراوەكانم‌و گشت ئەوانەي فەرمانبەردارمن ئايين‌و ئاييزاي ئەو خەڵكانەو هيدي رِەچاو نەكەن، وبە چاوي سووكەوە تەماشايان بكەن.

ئەز، تا ئەو رِۆژەي زيندووم رِێگە نادەم هيچكەس بە بێگاري‌و تۆپزي كار لە خەڵك بكێشێتەوەو بێ كرێ‌و هەقدەست كاريان پێبكات.

ئەز، ئيمرِۆ رِايدەگەيەنم هەموو كەسێك ئازادە بە خواستي خۆي هەر ئايينێك هەڵبژێرێت وە پەيرەوي لێبكات، وهەر شوێنێك دڵی دەيخوازێت تيايدا بژي، بۆ خۆي هەڵبژێرێت. بەلآم بەمەرجێك لەوێرِادا دارايي هيچكەس بە زۆروستەم زەوت نەكات، وهەر پيشەيەك كە پێي خۆشە هەڵبژێرێت، وسامان‌و دارايي خۆي بەهەر شێوەيەك كە خۆي گەرەكێتي بيچەرخێنێت بەمەرجێك كە زيان بە كەس نەگەيەنێت.

ئەز، تائەو رِۆژەي بە ياريدەي مەزدا پاشايەتي دەكەم، رِێگە نادەم ژنان‌و پياوان وەك بەردە بفرۆشرێن.

فەرمانرِەواكان‌و ئەوانەي ئەز دايانده‌مەزرێنم دەبێ رِێ لە كرِين‌و فرۆشتني ژنان‌وپياوان بگرن، و رەوشي بەردەداري لە جيهاندا دەبێ بنبرِبكرێت.

(بەبۆنەي تاج خستنە سەري كورش لە ساڵي 546 پ.ز)

## كارو كۆشش

هەوڵوتێكۆشان لە پێناوي كاري چاك، يەكێكە لە پێويستيەكاني سەرشاني هەموو زەردەشتييەك، ئاشكرايە كە زۆربەي كردارە خراپەكان بە هۆي بێ كارييەوە دەوەشێتەوە.

یەکێ لە تایبەتمەندییەکاني ژیان لە دیدي یاساي ڕاستیدا (ئاشا)، تێکۆشانو کارکردني هەمیشەییە لە پێناوي پێشکەوتنو ئاوەدانيو گەیشتنە پوختەیي، تەمەڵيو تەوەزەلي کارێکي ئەهریمەنییە.

لە هەموو کاروکردارەکانماندا دەشێ دڵو دەرونو بیرو هزرمان دوور بخەینەوە لە دوژمنایەتيو درۆو توڕەبوون، وە پەرەبدەین بە ڕاستيو دڵۆڤانيوگەشەي پێبدەین.

گاتەکان ئامۆژگاریماندەکەن کە خاسگەلەکان هەموو دەبێ یەکبگرن، و کەسانێك بە ڕابەرایەتي هەڵبژێرن کە ڕاستگۆو دانابنو هەنگاو هەڵبێنن‌و کاربکەن بۆ نوێژە نکردنەوەي کۆمەڵگاو هەموو جیهان.

پەیامي زەردەشت دژي تەرکە دنیاو گۆشەگیرییە، هاوسەر نەخواستن بە کارێکي ناپەسەند هەژمار دەکرێت، لە پەیامي زەردەشتیدا، هەرگیز نابێ ئایني ڕاستيودروستي پەنهان بکرێتو بشارێتەوە تەنانەت ئەگەر ئەم نەشاردنەوەیە بێتە هۆي مەترسي لەسەر ژیاني ئەوکەسە.

ململانێي ئاکاري سەرەتا دەبێ لەنێو دەروني ئادەمیزاد خۆیەوە دەستپێبکات، پاش ئەوەی بەسەر خراپ بیرکردنەوەي نەفسي خۆماندا زاڵبوین، ئەوسا دەبێ دەستبکەین بە ڕێنمایي کردني خەڵک، واتە دەبێ ئەوە ڕەچاو بکەین کە چاککردني خۆمان پێش چاککردني کۆمەڵگایە.

گاتاکان ئامۆژگاریمان دەکەن کە پێویستە مرۆڤ کاري خاسو دروست تەنیا لەبەر خاسي ئەنجامبدات نەك لە پێناوي وەرگرتني پاداشت، ڕاستيو چاکە خۆي لە خۆیدا پاداشتي خاس بۆ مرۆڤ دابین دەکات.

زەردەشت ستایشي لە هەموو خۆشي یەکاني ژیان دەکردو دەیگوت دەبێ چێژ لە خۆشییەکان بگرینو هەوڵ بدەین بەسەر ناخۆشییەکاندا زاڵ بینو دەبێ بەرهەمي ئیشو کاروکۆششي خۆمان بخۆینو نابێ هێچ کەسێك بە تەمەڵيو بێکاري بژي.

لە ڤەندیداد دەبێژێ:

ئەز، بەرەنگاري دێوي تەمەڵی دەوەستم کە دەیەوێت بەهۆي بێکاريو تەمەڵی ڕەنجەڕۆمان بکات.

هەروەها لە ڤیسپرد دەبێژێ:

(ئەي خواپەرستی زەردەشتي، دەستوپێو هۆشوعەقڵی خۆت بەکار بهێنە بۆ بەدیهێناني ئەرکەکاني سەرشانت بەرامبەر خەڵک لە کاتي پێویستیدا، وەلە هەموو کارێکي خراپ خۆت

دوور بخەرەوە، وەهەمیشە بۆ بەدیهێنانی کاری چاکو دەستگرتنی ئەوانەی پێویستییان بە یارمەتیت هەیە، هەوڵو کۆشش بدە).

کەوایە، دەتوانین بێژین، پەیامی زەردەشت ئاینی کاروکۆششەو ئەرکی سەرشانی هەموو زەردەشتییەکە (وەك تاك) هەوڵ بدات لە رێگەی کارکردن بە بیرێکی خاسەوەو دوور لە تەمەڵی بۆ پێشخستنی کۆمەڵگاو گەشەپێدانی.

لە یەسنا هات 24 بەندی 14 دەبێژێ:

(ئەرێ ئەی مەزدا، باکەسێك لەم جیهانەدا بەهرە لە پاداشتە بەنرخەکانت ببێت کە خەریکی کاروکۆششەو مەڕومالآتو بەرزەووڵاخ بەخێو دەکات ....)

## ژینگە پاراستن

زەردەشتیەکان گرنگییەکی تەواو سەنگ دەدەن بە ڕاگرتنی پاکوتەمیزی (پاکژی) ئاو، خاك، هەواو ئاگر، واتە ئەم چوار هێمانەی کە بنەمای بە دیهاتنی بوونەوەرانن.

لەم بارەوە یۆنانییەکان زۆر باسیانکردووە. هیرودتو زەینەفۆن باس لەوە دەکەنو دەبێژن:

ئێرانییەکان هیچ شتێکی پیس ناخەنە نێو ئاوەوەو پارێزگاری لە خاكو زەوی دەکەنوناهێڵێن پیس بێت.

لە ئاینی زەردەشتیدا گشت ئەوشتانەی کە ئاهورامەزدا بە مرۆڤی بەخشیوە، پاکو خاوێنن.

جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئاینی زەردەشتیو ئاینەکانی دیکە کە ماددەو جەستە بە کاری ئەهریمەنی دەزانن، زەردەشتییەکان جەستەو ماددەش بە بەخششو خەلآتێکی ئاهورایی دەزانو شایانی پارێزگایکردنن.

ئەرکی سەرشانی ئادەمیزادە کە ماددە لە ڕێگەی خراپدا بەکار نەهێنن، فەرهەنگی پەیامی زەردەشت، فەرهەنگی شادیو خۆشییە، زەردەشت دەبێژێ کە ئافەریدەگار ئەم جیهانە پڕ لە خۆشیو شادییەی بە هەموو جوانییەکانی ئافراندووە بۆ ئەوەی بەهرەی لێوەربگرینو خۆشی لێببینین، لەبەر ئەمە پێویستە بیپارێزینو بەهایەکی تایبەتی بۆ توخمەکانی سروشتی دابنێین، ئەم بەهایە دانپێنانە بە مەزنایەتی ئافەریدەگارو سوپاسە بۆ خەلآتو بەخشیشەکانی.

هەروەكو لە باسي ئەمشاسپەندەكاندا ئاماژەمان پێدا، بۆ پاراستني توخمەكانی سروشتيوژينگەو پێشگیري كردن لە پيسبونو لەناوچونيان، زەردەشتييەكان (پاش مردني زەردەشت) بۆ هەريەكێ لە توخمەكانی سروشتي، ئەمشاسپەندێكيان دانا بۆ پارێزگاري لێكردنيان بوێ ئەوەی لەم رِێگەيەوە بتوانن پارێزگاری لەو توخمانە بكەن.

هەروەها شێوەي ناشتني مردووەكانيان يەكێكە لەو باسانەي كە زەردەشتييەكان چەندە بايەخيان بە پاراستني ژينگە داوە (لە باسي دەخمەدا زياتر لەم بارەوە دەدوێين).

لە ساڵي 1973 دا لە كونفراسێكدا دەربارەي (ميتراليزم) كە لەشاري شيرازي ئێراندا گيرا، Dhalla. H. لە رِاپۆرتێكدا دەبێژێ:

ئايني زەردەشتي بە يەكەمين ئايين هەژمار دەكرێت كە هەوڵی پاراستني ژينگەي بە شێوەيەكي كرداري داوە.

## كشتو كێڵو پەروەردەی ئاژەڵ:

ديار دەيەكی ديكە لە شوێرِشە كوێمەڵايەتیو ئابوورييەكانی زەردەشت،شوێرِشی كشتوكێڵە.

بێگومان هەموو دەزانين لە دێر زەمانەوە تا ئيستا كشتو كێڵو پەروەردەی ئاژەڵ رێوێلێكی بەرجەستەو باڵای هەبووەو هەيە بوێ پێشخستنی كومەڵێگا، هەروەها دەزانين بوێ هەڵێسورِاندنی ئەو ئيشوكارانەی بە دەست ئادەميزاد وەبەردێت، پێويستی بەجەستەيەكی بە تواناو بيرێكی پاك هەيە.

هيج كەسێك ناتوانێت خاوەنی ئەم هێزە بێت ئەگەر خواردنی تەندروست نەخوات، ئەم خواردنەش زوربەی زۆری بريتين لەبەرهەمەكانی كشتوكێل (ئاژەڵیو رِووەكی)

زەردەشتی ژيرو دانا هەزارەها ساڵ لە مەوبەر، هەستی بەم پرسو بابەتە كردووە، و بوێيە هەميشە خەڵكی هانداوە كە نيشتەجێ بنو دەست لەكوێچەرێتی هەڵێبگرنو خەريكی كشتوكێڵیو پەروەردەی ئاژەڵ بن، قوربانيكردنی ئاژەڵی لە بوێنە ئاينيەكاندا قەدەغە كرد بوێ ئەوەی بەهوێی ئەو قوربانييە بە كوێمەڵەی ئاژەڵ چيدی قرِ نەكەوێتە نێويانو ئەو سامانە لە ناو نەچێت، وە پەروەردە كردنيان زێتر سوود لەبەرهەمەكانيان وەربگيرێت.

زەردەشت، رووناكیو هەموو شتێكی چاكو باشی ستايشت كردووە، و كشتوكێڵیو پەروەردەكردنی ئاژەڵی سوودمەندی لەسەرو ئەم ئيشە چاكانە هەژمار كردووە، وە هەميشە

دژی خراپەو ناپاكی بووەو دوژمنی بیابانی ڕووتو زەویو دەشتی بەڕەڵا بووە وە حەزی لە ئاوەدانیو كشتوكێلیّ كردووە.

لێرە دا برِیّ لەو نموونانە دەهێنمە بەر چاو كە پشتراِسكەرەوەی ئەم شتانەن:

زەردەشت لە ئاهورامەزدا دەپرسێت:

((ئەی ئافەریدەگاری جیهانی ماددی،ئەی پاكترین پاكان، چوارەمین كەسێك كە زەوی بەراِدە بەدەر دەبوژێنێتەوە كێیە؟))

ئاهورامەزدا لە وەڵامدا دەفەرمویت:

((ئەو كەسەی كە لە هەموان زێتر گەنم بچێنیّو زیاترین سەوزە برِوێینیو زێترین درەختو نەمامی بەردار برِوێنیّ. كەسێك كە زەوی دێموووشك ئاو بداتو زەوی زوێنگاووشك بكاتەوەو كشتی بكات)) (ڤەندیداد_ بەشی سیهەم بەندی 23)

زەردەشت دەبێژیّ:

((چەندە بەد بەختو بێكەسە ئەو زەوییەی ماوەیەكی زۆرە بیّ(توێو) وە توێو وەشێنەو چاوەرێی جوتیارێكی چالاك دەكات هەروەك كیژوێڵەیەكی جوان كە ماوەیەكی زۆر بیّ منداڵیّ ماوەو چاوەرِێی هاوسەرێكی خاسە)) ڤەندیداد- بەشی سێهەم – بەندی 24

هەروەها، زەردەشت پرسیار دەكاو دەبێژیّ:

((ئەی ئافەریدەی جیهان، ئەو شوێنەی زەوی كە شادمانترین شوێنە لەكوێیە؟))

وەڵام دەدرێتەوە:

((ئەو شوێنەیە كەوا ئاژەڵی سوودمەندو رِانێكی زۆری تێدا بێت وە روێژ بە روێژ زێتر بێت))

ڤەندیداد-بەشی سیهەم-بەندی 5-

ئێستا ئیدی ئەوەمان بو یّ ئاشكراو ڕووندەبێت كە زەردەشت گرنكیو بایەخێكی زۆری داوە بە كشتوكێلیّو پەروەردەكردنی ئاژەڵی سوودمەند بوێیە دووبارە پرسیار دەكات:

((ئەی ئافەریدەی جیهان، پێنجەمین شوێنیك لەسەر گوێی زەوی كەوا زۆر شادمانە كێیە؟))

وەڵام دەدرێتەوە:

((ئەو شوێنەی کە ئاژەڵو ڕانی پتر بێتو ئەندازەیەکی زۆر پەینی تێدابێت))

ڤەندیداد- بەشی سێهەم- بەندی 6

هەروەها ئاهورامەزدا دەبێژی:

((ئەی زەردەشت سپەنتمان، کەسێك بە دەستی چەپو ڕاست زەوی دەکێڵی، لە ئاکامدا زەوی بە چەپو ڕاست بەرهەمی فراوانی بۆ بەرهەم دەهێنێ، هەروەکو دڵدارێك کە لەتەک دولبەری خۆیدا منداڵێکی زۆر دروستبکەن، هەروەها زەوی بۆ ئەو کەسە بەرهەم وەبەر دێنێت.))

ڤەندیداد – بەشی سێهەم – بەندی 25-29

زەردەشت هەمیشە ئامۆژگاری خەڵکی کردووەو پێی ڕاگەیاندوون کەسێك کە خەریکی کشتوکێڵیو پەروەردەی ئاژەڵی سوودمەند نەبێت، دوو چاری پاشەگەردانی دەبێتو لە ئاکامدا دەکەوێتە گە دایيو سواڵێکردن بۆ پارچە نانێكو لەنێو خەڵکدا ڕیسواو سەرگەردان دەبێت.

## پەڕاوێزەکان

1 - لە کتێبی (قاموس قرأن) نووسینی سید علی اکبر قرشی،بەرگی3،4 _ل 88، دەربارەوشەی (رس) لە سورە (ق) و (فرقان) دەبێژی:

(وادەردەکەوێت کەناوی جێگەو شوێنێك بێت کە نەتەوەیەك تیایدا جێگر بوبن).

لە نهج البلاغە خوتبەی 180 علی کوڕی ئەبو تالیب دەبێژی (أین اصحاب مدائن الرس الذین قتلوا النبیین)، لەموتەیەداوا دەردەکەوێت کە چەندین شار هەبوبێت بە نێوی رس کە خەڵکی ئەو شارانە پەیامبەرەکانیان کوشتووە......

لەوە دەچێت کە مەبەست لە (رس)، رووباری ئاراسی ئێستا بێت کە دەکەوێتە باکوری ئازەربایجانو درێژایی 800 کیلو مەتر، و سەرچاوەکەی لە کێوەکانی ئەرز رومی تورکیایەو پاش ئەوەی بە دەشتی موغان تێدەپەرێت، و لەتەك ڕووباری (کورا) یەکدەگرنو دەرژێنە نێو دەریای خەزەرەوە. لە بەشێك لە دەورو بەری ئەم ڕووبارە گەورەیەدا، شارستانیەتێکی مەزن هەبووە کە ئێستا نەماوە، وە شارەکانی (رس) کە لە نهج البلاغە باسیان لێکراوە، بریتین لەو شارستانیەتو شارە دێرینانەی ئەو سەردەمە.

هەروەها محمد عبده لە شیکردنەوەی ئەو خوتبەیەی نهج البلاغە دەبێژێ کە مەبەست لە (رس)، ڕووباری ئاراسە

صافی، لە ڕاڤەی قورئاندا دەبێژێ:

((رس) ڕووبارێکە لە ناوچەی ئازەربایجاندایە) شایانی باسە، بێژین، لەوانەیە مەبەست لە (مجوس) کە لە ئایەی (17) ی سورەی حەج هاتووە، هەمان اصحاب الرس بێت، و یا خود (مجوس) نەوەی ئەوان بن.

2 ـ ئارياييەكان، ئەو خێڵە کوێچەریانەن کە لەمێژەوە لە چەندین قوێناغدا، لە باکوری ئەوروپا یا باشوری روسیاوە کوێچیان کردووە. بە گەیشتنیان بوێ دەڤەری ئێران ویج دەستەیەکیان بەرەو هندستان ڕوێیشتون، وەبەشێکیان لەناوچەی هەراتو خوێراسان نیشتەجێ بوون، وەدەستەیەکیشیان لە ڕێگەی (هشترخان) و (کریمە) بەرەو کوردستانو ئازەربایجان کوێچیان کردووە.

زمانو فەرهەنگو برێ تایبەتکاری هاوبەشی دیکەش لەنێو ئەو خێڵانەدا هەبووە، تەنانەت ئەو ئارياييانەی کە لە ڕێگەی (ئاسیای چکوێلە) وە بەرەو یوێنانو ئەوروپا کوێچیان کردووە، ئەوانیش هەر بەم شێوەیە بون.

خێڵە ئارياييەكان کە بەرەو دەڤەری ئێران ویج هاتون لەتەك دانیشتووە ڕەسەنەکانی ناوچەکەدا تێکەڵاو بوون.یەکێ لەو خێڵانە (ماد) ە کان بوون کە لە دەوروبەری 2000 پ.ز بەرەو ناوچەی کوردستان کوێچیان کردووە .

شایانی باسە، ئەوانەی بەرەو هیندو ئێران کوێچیان کردووە، خۆیان بە ئاریایی دەناسێنن.

کوێنترین نوسراو کە دەربارەی ئارياييەكان نوسراوە، کتێبی ریگویدایە rig veda لە هیندستانو کتێبی ئافێستای زەردەشتە. لە هەردوو کتێبەکەداوشەی ئاریا بەمانای ڕەسەنو میواندار لێکدراوەتەوە.

لە ئافێستادا، خاکی ئارياييەكان بە ئاریا ناموایجا arya naum vaeja وە یا ئارانوژ (ئێرانویج) ناوبڕیوە. لە تەوراتدا، ئارياييەكان لە نەوەی یافپ کوڕی نوح لە قەڵەم دراوە.

دکتور عبد العڤیم رەزایی لە کتێبی (تاریخ دە هزار سالە ایران)

بەرگی یەکەم. ل 180 دەبێژی:

((فەرەیدون هەموو ئەو ناوچانەی لەژێر دەستیا بوون بەسەر سێ کوڕەکەی خویدا دابەشکرد. دەڤەری ئێرانیدا بە یەکێك لە کوڕەکانی کە ناوی ئیرەج بوو. هەر لەو کاتەوە ئەم دەڤەرە بە ئاریاویج یا ئارین‌ویج یا ئارینوێج ناو دەبرێو بەمانای سەر زەمینی ئێرانییەکانە .

پارسەکان‌و مادەکان خۆیان لە ڕەچەڵەکـو نەژادی ئەمانە دەزانن))

م.اورنگ، نووسەری کتێبی (بررسی یسنا – هات 9 لاپەرە 106) دەبێژی: یەکەمین جار کە زەردەشت ستایشی ئاهورامەزدا دەکات لە دەڤەری ئێران ویج بووە، وە سەبارەت بەم ناوە دەبێژی:

(ووشەی ئافێستایی (ئەئیرینوێجە) یا (ئەئیریەنەواجەنگە) کە بە پەهلەویو فارسی بوێتە (ئیران‌ویج)، (ئاریاویج)، (ئاریاویژ) پێکهاتووە لە دوو بەش، بەشی یەکەم (ئەئیریەنە) لە (ئەئیریە) وەرگیراوە بە مانای (پاك نەژاد)، (نەژادی ڕەسەن‌و مەزن)،(بەڕێز)، (ئازاد). وە ئێستا بوێتە (ئاریا)

بەشی دووهەمی (واجە) یا (واجەنگە) بەمانای (مایە) وە (توخم) وە (دانەو نەژاد) وە (بنجو بناوانە). تێکراوشەکە بە مانای (توخمی ڕێزدار)، (نەژادی ڕەسەن)، (نەژاد ئازاد)، (پاك بونیاد) وە (توخمی شیاو)ە. نووسەر دەبێژی: بەگوێرەی نووسینەکانی ئاوێستا (ئاریاویج) لە دەوروبەری ڕووباری (دائیتی)یە کە زۆر بە پیروێزی ناوی لێبراوە، و زۆربەی زۆری لێکوێڵە رەوەکان ئەم رووبارە بە رووباری (ئاراس)ی دەزانن، و نووسینە کوێنەکان بە زمانی پەهلەوی زۆر بەڕاشکاوانە(ئێران ویج) بە دەڤەری ئاتەرپادەگان دەزانن‌و شوێنی لەدایکبونی زەردەشتیش هەر بەو شوێنە دەزانن، وەگرنگترین بەڵگەی نووسراو لەم بارەوە کتێبی (بوندهش)ە کە لە بەشی 29 بەندی 12 دەبێژی ئێران ویج لە دەڤەری ئاتەر پادەکانە. هەروەها لە بەشی 32 بەندی 3 دەبێژێ: کاتێك زەردەشت پەیامەکەی ڕاگەیاند،سەرەتا لە ئێران ویج ستایشی ئاهورامەزدای کردو (میدیوماه)ی ئاموێزای پەیڕەوی لە ئاینەکەی کرد. هەروەها دەربارەی رووباری (دەرەجە)ش کە باوکی زەردەشت لە کەنار ئەو رووبارەدا ژیاوە لە کتیبی (ڤەندیداد) بەشی 19 بەندی 4 دەبێژێ ماڵی پوروشەسب باوکی زەردەشت لەسەر بەرزاییەك لە کەنار رووباری دەرەجە بووە. لە بەشی 20 بەندی 32 هەمان کتیب (بوندهش) دەبێژی رووباری (دەرەجە)لە دەڤەری (ئیران‌ویج)ە. تێکراو پوختەی ئەم باسە ئەوەمان بوێ ڕوون‌و ئاشکرا دەکات کە دەڤەری ئیران‌ویجو رووباری (دائیتی) و ڕووباری (دەرەجە)، هەر سێکیان لە یەك ناوچەدا بوون‌و ئەو ناوچەیەشی کوردستانە، و باوکی زەردەشتیش‌و خودی لەوێڕادا ژیاون.

زاناکان سەبارەت بە کاتو مێژووو ڕێڕەوی ئەم کوێچە بە 1800-2000 ساڵ پ.ز دەزانن‌و هەندێکیان بە 4000-5000 پ.ز دەزانن. هوێی کوێچی ئاریاییەکان دەگەڕێتەوە بوێ ئەوەی کە لەسەرەتای هەزارەی دوهەمی پ.ز، خێڵە ئاریاییەکان لە خواروی ڕوسیا لە ناوچەی دەریای

ئارالێ تا وەکو رووباری وەلێگای خوارووو سەرو قەوقاس بە شێوەیەکی جیاجیاو بڵاو لە یەکتردە ژیان.

هەر لەو کاتەوە بەهۆیی داهاتنی سەرماو سەهوێڵێبەندانو کەمبوونەوەی لە وەرِگاو... کوێچ دەست پێدەکات. هەر وەکو ئاماژەمان پێکرد (ماد)ە کان بەرەو کوردستانی ئێستا کوێچیان کردو تێکەڵ بە دانیشتووە رِەسەنەکانی ناوچەکە بوون کە بوێ ئەو سەردەمە خاوەنی شارستانیەتێکی باش بوون، بوێیە زوتر لەکوێچەرەکانی دیکە یەکیان گرتووەو شارو دەوڵەتیان پێکناوە.

3 ـ تیشتەر: ئەستێرەی تیشتەر، تیشکدەر، هەمان هەسارەی گەلاوێژە.

4 ـ ماد: وشەی ماد هەر لە مێژەوە بەم شێوانەی خوارەوە باسی لێکراوە:

لە ئاوێستا بە نێوی مرۆ _marou

لەسەر خشتەی نووسراوەکانی هەخامەنشییەکاندا مادا _mada

بە زمانی ئەرمەنی مار _mar

بە زمانی پارتییەکان مات _ mat

لە کارنامەی ئەر دەشێری بابەکان مادیك _ madik

لەسەردەمی ساسانییەکاندا مای _ may

لەسەردەمی ئیسلامدا ماه،ماژ، ماد _

بە زمانی ئیلامی ماتابە _ matabe

بە زمانی عبری کۆن مادای _ maday

بە زمانی ئاسوری ماتای matayو ئامادی amady _

بە زمانی یۆنانی کۆن مدی، مد made _mady

هەروەها سەرزەمینی ماد لە ئاوێستادا (ڤەندیداد بەشی یەکەم – بەندی 6) بەم شێوەیە باسکراوە:

(ئەز کە ئاهورامەزدام، لە خاسترین شوێنو جێگاکاندا، سێهەمین کیشوەرم دروست کردکە (مرۆ)یەو خەڵکەکەی دڵرو ئازاو پیروێزن. لەوێرادا ئەهریمەنی خوێنرێژ دژایەتی خەڵکەکەی

کردو خراپەی بڵاوکردەوە. هێرۆدت، مێژوونوسی بەناوبانگی یۆنان، ناوی شەش خێڵ یا تایفەی هێناوە کە دەبێژێ

مادەکان لەم شەش خێلەسەرەکییە پێکهاتبوون:

1. بوسی یەکان Bousia

2. پارتکن Paretakenoi

3.ستروخات Strukhat

4. ئیری زانتو Air Zantos

5. بودی Boudioi

6. ماگوی، ماژ، ماکوش، مۆغ، Magoi

کە ئەمەی دواییان لە ناوچەی کوردستاندا ژیاون، سەبارەت بە مۆغەکان لە پاشاندا زانیاری زێتر دەخەمە بەرچاو.

ا.م. دیاکونوف لە کتیبی (تاریخ ماد) ل_ 1 دەبێژێ

(... لەسەردەمی زۆر دێریندا، دەوڵەتی مادو پێش ئەویش دەوڵەتیماننا، دوو دەوڵەتی فرە مەزنو شکۆیان پێکهێنا بوو.

دەوڵەتی ماد لەتەک ئەوەی کە زۆری نەخایاند (727 _549 پ.ز) بەڵام ئەرکێکی مێژوویی گرنگی لەسەرشان بوو. مادەکان توانییان ئەو کۆتو زنجیرەی کە ئاشوورییەکان کردبویانە گەردەنی میللەتانی هەموو ناوچەی رۆژ ئاوای ئاسیا بپچرێنن‌و خەڵکەکە لەو زۆرو ستەمی ئاشوورییەکان رزگار بکەن.مادەکان هێرێشی سەکاییەکانیان ڕاگرت‌و زۆر لەو خێل‌و میللەتانەی کە بەشێوەیەکی زۆر دواکەوتو دەژیان، خستە نێو بازنەی شارستانیەتی ئەو سەردەمەو فەرمانبەرداری یاسای دەوڵەتی کردن.

لە ڕاستیدا ئەو ئامۆژگاری‌و پێگەیاندنانەی کە لە پاشاندا بووە کۆڵەکەو ژێر خانی پەیام‌و ئاینی زەردەشت، وە ڕۆلێکی گرنگی هەبوو لە پێشخستن‌و تکاملی بیرو هزری هەموو خەڵکی ئەو سەردەمە، لەسەرچاوەی قەڵەمڕەوی دەڤەری پاشایەتی ماد هەڵێقوڵاو پەرەی سەند.

زۆربەی زۆری سەرزەمینی ماد لە دەڤەرێکدا بوو کە کەوتبووە باشووری ڕوباری ئاراس)

هیرودت دەبێژێ:

یەکەمین فەرمانڕەوای مادەکان کە شاری ئە کباتانی (هەمەدانی) بونیاتنا وە بەردی بناغەی دەوڵەتی مادی دامەزراند ناوی دیاکو (دیوك Deiokes) بووە وە 53 ساڵ فەرما ڕەوایەتی کردووە(ئەم دەوڵەتە پێکهاتبوو لە یەکگرتنی 15 خێڵی سەرەکی ناوچەکە). پاش ئەو کورەکەی بەناوی فرەوەرتیشPhraortes ماوەی 22 ساڵ فەرمان رەوایەتی کردووەو پارسەکان (فارسەکان) و نەتەوەو خێڵەکانی دیکەی ئاسیای خستۆتە ژێر رکێفی دەوڵەتەکەیەوە، و دژی ئاشورییەکان کەوتۆتە شەڕ بەڵام سەرنەکەوتووەو شکستی خواردووە. کەیئوخسار (هوخشترە) کوری فەرەوەرتیش سەر لە نوێ سوپایەکی گەورەی پیکەوەناوەو ماوەی 40 ساڵ فەرمانڕەوایەتی کردووە. ویستی شاری نەینەوای پایتەختی ئاشورییەکان بگرێت بەڵام شکستی خوارد چونکە سوپای سەکاییەکان یارمەتی ئاشورییەکانیان داوو لەو جەنگەدا رزگاریان کردن.

کەیئوخسار سەکاییەکانی بەزاندو پاشان لەتەک بابلییەکاندا لە ساڵی 612 پ.ز دەوڵەتی ئاشورییەکانیان بە یەکجاری لە ناوبرد، پاش کەیئوخسار، کوڕەکەیواتە ئاستیاگ (ئیشتوویگو)بوێتە فەرمانرەواو ماوەی 35 ساڵ حوکمڕانی کردووە. دواجار لە ساڵ 549 – 550 پ.ز بەهۆی خیانەتی برێ لە سەرکردەکانی سوپای ماد بەتایبەتی (هەرپاگە) کە لەتەک کورشی فارسیدا رێك کەوتنو دەوڵەتی ماد شکستی هێنا. بە بۆچوونی هیرودت مادەکان ماوەی 128 ساڵ فەرمانڕەوایەتیان کردووە.

بەڵام بە بۆچونێکی دیکە ماوەی 174 ساڵ فەرمان ڕەوایەتییان کردووەو بەم شێوەیە بووە:

دیاکو 727 – 675 پ.ز / 52 ساڵ

فرەوەرتش 674 – 653 پ.ز / 21 ساڵ

مادەکانو سەکاییەکان 652 – 625 پ.ز / 27 ساڵ

کەیئوخسار 624 – 585 پ.ز /39 ساڵ

ئاستیاك 584 – 549 پ.ز / 35 ساڵ

------- کۆی گشت 174 ساڵ

5 ـ دوغدو: بە مانای شیردۆش (بێریڤان)ە، دوغدو لە گوندی (لەج، رەج) لە (شاروێران)ی مەهاباد لەدایك بووە.ئەم (لەج)ە لەکوێندا بە زمانی ئاوێستایی (رەگا) بووە.

دەبێژن گۆڕی دوغدو لە گوندی (ئەمبی، ئەمبە) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نزیك شاری ورمێ یە.

6 ـ زەردەشت: هەندێ لە مێژوونوسان دەبێژن زەردەشت سەرەتا ناوی (سپەنتمان) بووە کە بە مانای سپی ترینە وە پاش ئەوەی لەلایەن ئاهورامەزداوە بە پەیامبەری هەڵبێژیرا، نێوی (زەردەشت)ی لە خۆی ناوە کە ماناکەی دەبێتە (ڕوناکی زێڕین).

7 ـ گات: یاخود گاپ، گرنگترین بەشی ئاوێستایە کە لەوتەکانی زەردەشت خۆیەتی، لە پاشاندا لە باسی ئاوێستادا بە دورو درێژی باسی لێدەکەین.

8 ـ کەیان: کەیانییەکان، خونکارانێك بوون کە لە ڕۆژهەڵاتی ئیرانو خۆراسانی ئێستا فەرمانڕەوا بوون. هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان لەو باوەڕەدان کە لەبەر ئەوەی یۆنانییەکان بە هیچ جۆرێك باسی ئەم کەیانییانەیان نەکردووە، دەبێ ئەمانە ئەفسانە بوبنو لە مێژوودا نەبوبن. بەڵام ئیمرۆ دەتوانین بێژین کە کەیانییەکان هەبوون وە لە ئاڤێستدا نێویان لێبراوە.

نووسەرە ئیسلامییەکان دەربارەیان زۆر شتیان نووسیوە. بەناوبانگترین خونکارانی کەیانی بریتیبوون لە: کەی قوباد – کەی کاووس – سیاوەش – کەی خوسرەو – لوهراسەب /ویشتاسەب یا گوشتاسەب - ئەسفەندیار – زەریر. خوالێخۆشبوو ئایەتواللە مەردوخی کوردستانی لە کتێی (برجستگان جیهان) ل -119 دەربارەی کەیانییەکان دەبێژێ:

(دامەزراندنی دەوڵەتی کەیانییەکان بەم شێوەیە بووە: پاش مردنی گەرشاسەب کە دوا خونکاری پێشدادییەکان بووە، ناوچەکە تووشی نوشوستیو بەرەڵاییەکی ترسناك بووە.

سەرەك هۆزەکانی زابولستانو کابولستان، کەی قوبادی کورد، کە سەرەك هۆزی (بوز) بووە، لەبەر ئەوەی پیاوێکی ژیرو دادپەرەوەرو لێهاتوو بووە، هەڵێدەبژێرن بۆ خونکاری. لە ساڵی (1475)ی پێش کۆچی (هجرت)، لەسەر کورسی خونکاریتی دادەنیشێت . ئەفراسیاوی پێشدادی کە لە ناوچەی تۆران بووە خۆی بە جێگرو جێنشینی گەرشاسەب داناوە، ووتویەتی بەگوێرەی نەریتی (وراپت)، ئەو دەبێ ببێتە خونکار. لەبەر ئەوە دژی ئەو هەڵبژاردنە ڕاوێستاوەو شەری نێوان ئیرانو تۆران ئیدی هەر لەوێوە دەست پێدەکات. ڕۆستەمی زالێ لەم شەرانەدا نێو بانگی دەرکردووە. ڕەچەڵەکی ئەفراسیاو دەگاتەوە سەر جەمشیدی پێشدادی بەم شێوەیەی خوارەوە:

ئەفراسیاو کوری پەشەنگ کوری زادشەم کوری تور کوری فەرەیدون کوری ئابتین کوری جەمشیدی پێشدادی . بەڵام ڕەچەڵەکی کەی قوباد کە یۆنانییەکان پێی دەبێژن (ئارباسی کورد)، دەگاتەوە سەر کوردۆ کوری مادای بەم شێوەیە:

کەی قوباد کوڕی زاك کوڕی نورگان کوڕی سوسان کوڕی ئارمین کوڕی ئارجان کوڕی ئارشین کوڕی ئاروین کوڕی ئارجان کوڕی مانیشاد کوڕیتوژگان کوڕی نورگان کوڕی سوسار کوڕی کوردۆ کوڕی مادای کوڕی یابپ کوڕی نوح.

لە فەسڵی 31 (بندهش) ڕەچەڵەکی کەیانییەکان بەم شێوەیەیە /




*هەئوس رەوە: لە ئاوێستادا بە مانای (خۆشناو) یا (ناوخاس)ە، پاشای دەڤەری خونیرەس (خونیرپ) بووە.

9 ـ دینكرد: ئەم كتێبە یەكێكە لە گەورەترین‌و بەناوبانگترین ڕاڤەكانی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەكان كە گۆراوەتە سەر زمانی پەهلەوی. ئەو راڤانەی كە لەم كتێبە دا دەربارەی ئاینی زەردەشتی‌و مانالێدانەوەی ئاوێستا كراوە، بۆتە سەرچاوە بۆ زوربەی زۆری ئەو كتێب‌و نوسینانەی كە لە پاشاندا بە زمانی پەهلەوی نوسراونەتەوە. ئەوەی لە شێوەی نووسینی كتێبی دینكرد وە بەرچاو دەكەوێت‌وا پێشاندەدا كە ئەم كتێبە لەسەردەمێكی دیاری كراوو بە دەست تاكەیەك كە سەوە نەنوسراوە، بەڵكو لەسەردەمی جیاواز وە بە دەست چەندین زانای زەردەشتی كە هاوچەرخی یەكتریش نەبوون نوسراوەتەوە.

بەگوێرەی داستانی زەردەشتیەكان ئەم كتێبە بۆ یەكەمین جار لەسەردەمی گوشتاسەب شای كەیانی‌و بە دەستی یەكێ لە قوتابییەكانی خودی زەردەشت نووسراوە.

ئەم كتێبە لەسەردەمی ئەسكەندەری مەقدونیدا لە كتێبخانەی (دژنپشك) سووتێنراوە. لەسەردەمی ساسانییەكاندا بەهۆی (تەنسەر)ەوە كە یەكێ لە گەورەترین زاناكانی ئەو سەردەمە بووە، دەستكراوە بە كۆكردنەوەی ئەو نووسینانەی (دینكرد) كە پەرشو بڵاوو هەرەیەكە لە شوێنێكدا بووە. لەسەردەمی مەئمونی عەباسی (198 – 218) هجری ئەمجارەیان لەلایەن ئازەرفەرنبوغ كوڕی فەروخزاد دووبارە كۆكرایەوە، و پاشان لەلایەن ئازەر بوود كوڕی هەمەد تەواو كراو بە شێوازی كتێب دەرهات. ئەم ئازەربوود كوڕی هەمەدە كە پێشەوایەكی زەردەشتیەكان بووە دەبێژێ: (ئەز كە پێشەواي ئاینی مەزداپەرستم بە یارمەتی خوا دەستم كرد بە كۆكردنەوەی هەموو ئەو ئاسەوارانەی بە شێوەی پەرشو بڵاوەوە لە هەر لایەك بو بێت كۆمكردنەوەو كارم لەسەر كردن‌و توانیم كتێبێك بنووسمەوە.)

10 ـ پلینوس، مێژوونوسی بەناوبانگ، پالێپشتی ئەم رووداوەیەو دەبێژێ زەردەشت تەنێ كەسێك بووە كە لە كاتی لەدایكبووندا پێكەنیوە،

11 ـ خوالێخوشبوو پورداود كە یەكێك بووە لە مەزنترین ئاوێستاناسانی ئێران دەبێژێ:

شیز یا (گنجك) لە ڕۆژهەڵاتی گۆڵی‌ورمێ بووە، و ئیمرۆ پێی دەبێژن (تخت سلیمان). لەم شارەدا ئاتەشكەدەی ئازەرگوشەسبی لێبووە. ئەم ئاتەشكەدەیە، یەكێ لە سێ ئاتەشكەدە هەرە گرنگ‌و پیرۆزەكانی كۆن بووە. ئەم ئاتەشكەدەیە شوێن نزرگەی خونكاران‌و سەردارانی ئەو سەردەمە بووە، و پایەیەكی بەرزو تایبەتی هەبووە.

گەنجینەو سامانێكی یەكجار زۆری تێدا حەشار درابوو، بۆ یەكا پێیان گوتووە (گنجك).

(پیوفانس)، مێژوونوسی یۆنانی (750 – 817م) لە مەڕ سامانی گنجك دەبێژێ:

پەرستشگایەكی گەورە بووە، گەنجینەیەكی گەورەی هەبووە هەر وەك گەنجینەی كرزوس (Kroisos)ی شای لیدی‌وابووە. هراكلیوس، بە سوپایەكی 120 هەزار یەوە هێرشی بردۆتە

سەر ئەم شارە پیرۆزە لەسەردەمی شایەتی خەسرەو پەروێزو ئاتەشکەدەی ئازەر گوشەسبیو‌ێرانو تالآن کردووە.

بۆئەوەی خوێنەری هێژا پتر دەربارەی شیز یا تەختی سلیمان شارەزایی پەیدا بکەن، وای بە باش دەزانم کورتەیەك دەربارەی ئەو شارە باس بکەم:

تەختی سلێمان، شوێنەوارێکە لە ناوچەی هەوشار کە ئیمرۆ لە رووی جوغرافییەوە بەشێکە لە ئازەربایجانی رۆژهەئاوا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لەلای باکوری رۆژئاواوە لکاوە بە شاری مەراغەوورمێ، وە لەلای باشوری ڕۆژهەڵات بە (خەمسەی زەنجان)،وە لەلای رۆژئاواوە بە بەشێك لە پارێزگای کوردستانو لەلای خوارەوە بە شاری (سنە)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستانو ناوچەی (گەروس)ی بیجار. تەختی سلیمان 150 کلیۆمەترێك لە شاری ورمێ وە دوورە. ئەم شارە لە پالێ کیوی (بەلقیس) بەسەر تەپۆلێکەیەکەوەیە کە نزیکەی 15 مەترێك لە زەوییەکانی دەوروبەری بەرز ترە. شورەیەکی بە دەورەوەیە کە دوو دەروازەی هەیە، یەکێکیان ڕِوەو باشورەو ئەوی دیکەیان ڕوو بە باکورە. لە ناوەراستی شورەکەدا گۆلێکی بازنەیی وەبەرچاو دەکەوێت کە بازنەکەی نزیکەی 100 مەتر دەبێتو قوڵاییەکەی 47 مەترە.

لەنێو شورەکەدا، شوێنەواری چەندین تەلارو باڵاخانەی ڕووخاو وەبەرچاو دەکەوێت، ئەم شوێنەوارانەوا پێشاندەدەن کە کاتی خۆی ئەم ناوچەیە ئاوەدان بووەو تەلارەکانی فرە شکومەندو گەورە بووە. تەپۆلێکەیەك لە بەشی دەرەوەی باکوری قەڵاکە بەرچاو دەکەوێت کە بە ئاتەشکەدە ناسراوە. لە رۆخی رۆژئاوای زرێبارەکە، ئاسەواری چەندین خانوو کۆشکی تایبەتی بەرچاو دەکەوێت کە لەوە دەچێ لە کاتی ئاوەدانی ناوچەکە، فرە شکۆمەندو کۆشکی شایەتی بو بێت. لە نزیك تەختی سلێماندا، چالێیکی فرە قولێ هەیە پێی دەبێژن زیندانی دێو.

12 - ڕِوباری دائی تی: یەکێ لەگەورەترینو گرنگترین سەرچاوەکانی رووبارێکە بە نێوی (شهرچائی)، کە لە زنجیرە چیاکانی زاگروسدایەو دەکەوێتە سەر سنووری نێوان ئێرانو تورکیە، لە 50 کلیۆمەتری باشوری ڕۆژهەڵاتی شاری ورمێ یە.

لە نەخشەی (سازمان جوغرافیای ایران) بە نێوی دائیوتاپ (دائی تی اب) تۆمار کراوە،

13 - بەگوێرەی بۆچوونی برێ لە نووسەرانی زەردەشتی، نووسەری کتێبی (زراتشت نامە)، بهرام پژدو نەبووە، بەڵکو ئەم تەنیا هەڵساوە بە لەبەر نووسینەوەی ئەو کتێبە. نووسەری ئەو کتێبە کەسیك بووە بە نێوی کەی کاووس پور کەی خەسرەو پور دارا.

14 - خوالێخشبوو عمادالدین دولتشاهی، لە کتێبی (جغرافیای غرب ایران یا کوههای ناشناختە اوستا) ل – 150 دەبێژێ:

ئەم وشەیە بە مانای شوێنێکە کەئاودرِ بێتو ناوی کێوێکە لە شاری سنەی کوردستان، و ئەم شارە (سنە) لە دامێنی ئەو چیایەدا بونیادنراوە، بەرزایی ئاویدەر (ئاویەر) 2000 مەترەو لەسەر لوتکەکەیدا کانیاوێکی لیّ هەڵدەقوڵێتو هەروەها لەبەرزاییەکانی دیکەی ئەم کێوەدا چەند کانیاوێکی ساردو شیرینی دیکەی لێهەلێدەقوڵێ. هەر بەم بۆنەیەوە یە کە پێی دەبێژن ئاویەر، واتە شوێنێك کە ئاوی لێهەلێدەقوڵێ.

15 ـ گەوهەر، جەوهەر، مانای زات، هەوێن، بنیات، بوونو رِاستی هەر شتێکە.

16 ـ گرەهما: یەکێ لە نەیارە سەرسەختەکانی زەردەشت بووە.

کەرپەن: پیاوی ئاینی خۆرپەرستیو لە نەیارانی زەردەشت بوونو لە ئاوێستادا بە گومرا باسکراوەو دەبێژێ کە ئەمانە کەسگەلێکن کە گوێیان هەیە بەڵام نابیستن.

17 ـ کاوی، کەوی، کەی: لەسەردەمی زەردەشتدا، کەوی یەکان فەرماندەی خێڵو هۆز بوونو لە هەمانکاتدا سەرۆکی ئاینی ئەو تیرەو هۆزەش بوون.

کەوایە کەوی یەکان سەرۆکی خێڵو گەورەی پیاوە ئاینییەکانی ئەو سەردەمە بوون. بەرەبەرە کەوی یەکان دەسەڵاتیان پتر بوو، وە بونە دەسەڵاتداری یەکەمواتە حاکم یا پاتشا، وەك کاوی قوباد (کەی قوباد) و کاوی خەسرەو (کەي خەسرەو). وادەچێت کەوشەی (کاکە) کە لە زمانی کوردی سەردەمدا بۆ رێز لێنان بە کار دەهێنرێت لەوشەی (کەی) ئاوێستایی وەرگیرا بێت.

18 ـ هوم: گیایەك بووە لەو سەردەمەدا لە ناوچە شاخاوییەکانی ئێران بەتایبەتی لە ناوچەی کوردستاندا بووە.ئەم گیایە لەو سەردەمەدا بێ باوەرِەکان رێزێکی تایبەتیان لێدەگرت.(ئاو) یا شیلەی ئەم گیایەیان دەخواردەوەو پێی مەست دەبوون، وە داوای یارمەتیو هاریکارییان لێدەکردو قوربانییان پێشکەش دەکرد.

دکتور عبد العظیم رچائي لە کتێبی (تاریخ تمدنو فرهنگ ایران) ل – 185-187 دەبێژێ: ئەم گیایە لە ئاوێستادا پێیی دەبێژرێ هەئوما وە بە زمانی سانسکرێت سوماو لە فارسیدا (هوم)ە . لەسەردەمی فرە دێریندا لە ناوچەی ئێران بەهۆی پیرۆزی ئەم گیایەوە ئێزەدێکیان بۆدیاری کرد بوو بەنێوی ئێزدەی هەئوما کە ئەرکی پاسەوانی بووە لەم گیایە. بەگوێرەی داستانە کۆنەکانوێ دەردەکەوێت کە پزیشکێك بە نێوی هەئوما ئەم گیایەی دۆزیوەتەوەو ناساندویەتی.لە یەسنای 10 بەندی 11 شوێنەوارو ژینگەی ئەم گیایە لەکۆنەوە بەشیك لەکێوەکانی هندوکش (لە رِۆژهەڵاتی کوردستان)و ناوچەی رِۆژهەڵاتی کێوی ئەلبورز (هەرەبەرزە) بووە. ئێستا ئەم گیایە پتر لە ئەفغانستانو تەبەتو کشمیرو دامێنی هندوکش دەروێت. بەشیلەی ئەم گیایە دەبێژن پراهومو سیفەتی نەمرێتی پێدراوە. دروستکردنی ئەم شیلەیە لەگیاي هوم بەهۆی برِێ رِێو رەسمی تایبەتییەوە لەلایەن شەش کەس لە پیاوە ئاینییەکانەوە ئەنجامدەدرێت. رەنگی شیلەکە

قاوەیی یەو تامی لەنێودەمدا تفتە. حەکیم مۆمن لە کتێبی (تحفه المؤمنين) دەبێژێ: هومی مەجوسەکان گیایەکە پێکهاتووە لە لاسکێکی باریكو ڕەق، گوڵەکەی زەردیکی مەیلەو تۆخەو هەروەك گوڵی یا سەمەنوێیەو گەڵاکانی فرە وردنو لە تیرەی ئەرخەوانی زەردە. لقی وشکبووەوەی ئەم گیایە بەبێ گەڵاو پڕە لە گرێ، هەروەك لقی ڕەز(ترێ) وەهایەو بەهۆی ئەستووریو ڕەنگییەوە لە (کا)ی گەنم دەچێت.

19 ـ بڕوانە کتێبی: زرتشت، مزدیسناو حکومت – نووسین جلال الدین اشتیانی ل – 160

20 - بۆ زێتر شارەزایی وەرگرتن لەم بارەوە، بڕواننە ئەم سورەتانە لە قورئانی پیرۆز:

سورەی ئیبراهیم ئایەتی 4

سورەی ئەنعام ئایەتەکانی 25 – 59-104-107-112-125

سورەی رەعد ئایەتەکانی 13-26-27

سورەی ئەعراف ئایەتی 155

سورەی فاطر ئایتەکانی 8-11-28

سورەی نحل ئایەتی 9

سورەی سوجدە ئایەتی 13

سورەی یوسف ئایەتی 110

سورەی بقرە ئایەتەکانی 70-102-255-269-272

سورەی کهف ئایەتی 57

سورەی یونس ئایەتەکانی 99-100

سورەی جاشیە ئایەتی 33

سورەی مائیدە ئایەتی 18

سورەی أسراو ئایەتەکانی 16-17-18-21-30

سورەی حج ئایەتەکانی 16-18

سورەی عەنکەبوت ئایەتی 62

سورەی رۆم ئایەتەکانی 4- 37

سورەی سبأ ئایەتەکانی 30-39

سورەی نور ئایەتەکانی 21- 38 – 46

سورەی زخرف ئایەتی 32

سورەی ئەحزاب ئایەتی 36

سورەی تغابن ئایەتی 11

سورەی نمل ئایەتی 74

سورەی قمر ئایەتی 52

سورەی لوقمان ئایەتی 34

سورەی حدید ئایەتی 22

سورەی نجم ئایەتی 39

سورەی آل عومران ئایەتەکانی 26 -74-129-145-154

21 - بروانن کتێبی (کتاب مقدس – عهد عتیق – چاپی 1981، فارسي)

کتاب حزقیال نبی بابەسوم ئایەتی 4-6

کتاب ارمیا باب 19 ئایەتی 1-19

سفر خروج باب 11 ئایەتی 2

صحیفه یشوع باب 6 ئایەتی 2-25

صحیفه یشوع باب 8 ئایەتی 22-25

صحیفه یشوع باب 10 ئایەتی 12-13

کتاب حزقیال نبی باب 4

کتاب دوم پادشاهان (الملوك الپانی) باب 18

سفر پیدایش (سفر التکوین) باب 8 ئایەتی 20 – 22

سفر پیدایش (سفر التکوین) باب 11 ئایەتی 1-9

سفر پیدایش باب 19

کتاب حزقیال باب 22

کتاب اشعیا نبی باب 3 ئایەتی 16 – 24

سفر پیدایش باب 18 ئایەتی 1-11

سفر پیدایش باب 32 ئایەتی 31

سفر خروج باب 4 ئایەتی 24

کتیبی صموئیل دوم باب 22 ئایەتی 8-18

کتیبي حزقیال نبی باب 1 ئایەتی 26-28

کتیبي باب 43 ئایەتی 4-7

کتیبي اشعیا نبی باب 6 ئایەتی 1-5

کتیبي پادشا هان اول باب 8 ئایەتی 62-63

سفر خروج باب 25 ئایەتی 2-5

سفر اول صموئیل باب 26 ئایەتی 19

سفر لاویان باب 1 ئایەتی 1-17

سفر لاویان باب 8 ئایەتی 23-29

سفر لاویان باب 7 ئایەتی 29-33

مزمور 89 ئایەتی 5-6

22 ـ کە یژە: جۆرە گوناهێك بووە کە لەو سەردەمەدا لە ڕیزی دزێتیو جەردەیەتیو جادوگەرێتیو پەیمان شکێنی بووە، واتە گوناهێکی گەورە بووە.

23 ـ خاوەنی دەشتی پانو بەرین، سیفەتێکە کە هەمیشە بۆ میترا (میهر) بە کار دێت، چونکە میترا ئیزەدی دوستایەتیو پەیمانو ڕاستیو تیشكو ڕووناکییە، وە سەرانسەری ڕووی زەویو دەشتی پانو بەرین جێگەو گۆرەپانی تێکۆشانیەتی. هەمو شتێك دەبینێو ئاگادارێتی.

24 ـ باپیری ئەردەشێر بە نێوی ساسان لەخێڵی چوپانان (شبانکارە – شوان کارە)ی کورد بووو دایکی بابەك کچی یەکێ لەسەرەك هۆزەکانی بازرنگی کورد بووەو لە ناوچەی کوردنشینی فارس پەروەردە بوون، (رەشید یاسەمی کتێبی – کردو پیوستگی نژادی او – ل 171).

هەروەها لە کتێبی (تاریخ الرسلو الملوك، نوسینی گبری – ج2، ل 817) دەبێژێ:

(کاتێك ئەردەشێر بانگەوازی پاشایەتی کرد، لەلایەن ئەردەوامی پێنجەم کە دواشای ئەشکانییەکان بووە، نامەیەکی بۆ دەچێت کە تیایدا دەبێژێ:

(أنك قد عدوت گورکو اجتلبت حتفك ايها الكردى المربى في خيام الاكراد، من أژن لك في التاج الژي لبسته...)

25 ـ ئەو ڕوداوانەی لەو کتێبەدا (الفهرست) باسی لێکراوە دەبێژێ:

(ئەسکەندەری پاتشای یۆنان، کە لە یەکێك لە شارەکانی رۆم کە پێیی دەبێژرێت مەقدونیە، هێرشی کردوەتە سەر ئێران. دارای کوڕی دارا کە پاتشای ئەوسای ئێران بوو، کوشتو دەستی بەسەرووڵاتەکەیدا گرت . شارو کۆشكو تەلارە مەزنەکانیوێرانو خاپور کرد. برێکی زۆر لەو شتانەی کە دەربارەی زانستەکانی ئەو سەردەمە بووو لەسەر بەردو چێو هەڵێکەندرابوونو هەندێکی بەسەر دیواری کۆشکەکاندا هەڵێکەندرابوون لە ناو برد.

پاشان فەرمانی دەرکرد هەموو ئەو کتێبانەی کە لەلایەن پاتشاکان لە کتێبخانەکان (دیوانەکان) و گەنجینەکانی شاری (ئەستەخر) پارێزرابوون، لە پێشاندا بێگۆرنە سەر زمانی یۆنانیو قبگیو پاشان هەمووی بسوتێنن. بەڵام ئەو نووسینانەی دەربارەی زانستی پزیشکیو ئەستێرە ناسیو سروشت بوون

وە یۆنانییەکان پێویستیان پێبوو، لەتەک ئەو هەموو زێرو دەستکەوتانەی دەستیان کەتبوو، ڕەوانەی یۆنانی کرد. بەڵام لەگەڵێ ئەوەشدا هێشتا برێ لەو نووسراوانەی کە کاتی خۆی زەردەشتو جاماسبو پاتشکانی ئەو سەردەمە نارد بویانەووڵاتی چینو هندستان مابوون،

چونکە زەردەشتو جاماسب خەڵکیان ئاگادار کردبووو پێشبینیان کرد بوو کە کەسێك بەناوی ئەسکەندەر هێرش دەکاتە سەروولاتەکەیانو داگیری دەکاو نووسراوەکانیان دەسووتێنێ. لەبەر ئەوە برێ لەو نووسراوانەیان ڕەوانەی ئەو ناوچانە کرد بوو.

26 ـ دەخمە: (شاری خامۆشان)/ بریتی یە لە ساختمانێك کە لەسەر کێوێك یا بەرزاییەك دوور لە شار دروست دەکرا. جەستەی مردوو یان دەخستە نێو ساختمانەکە لەسەر بەردێك یا تەختێکی ئاسن. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا (یەکدو دەمژمێر) باڵێندە لاشخۆرەکان هەموو گۆشتو ناوسکی مردووکەیان دەخواردو تەنیا ئێسکەکانی دەمایەوە. ئەمە لە راستیدا کارێکی سروشتییە،

چونکە لە سروشتدا هەموو ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان، ئاژەڵی دیکە ڕاو دەکەنو گۆشتی ئاژەڵی مردوو دەخۆن، واتە لاشەو جەستەی ئاژەڵ دەبێتە خۆراك بۆ ئاژەڵە گوێشتخۆرەکانی دیکە، و بەم هۆیەوە پێشگیری لە پیسبوونی ژینگە دەکرێت.

پاش ئەوەی گوشتی جەستەی مردووەکە لەلایەن لاشخۆرەکان خورا، چاودێرەکانی دەخمە ئێسکەکان کۆدە کەنەوەو رۆیدەکەنە نێو چاڵێك کە لەنێوە ڕاستی دەخمە کەدایەو قسلێو گۆگردی پێدا دەکەن بۆئەوەی بسوتێتو ببێتە خۆڵەمیش، وە لە پاشاندا بەهۆی ئاوی بارانەوە دەچێتە نێو چوار چاڵی دیکە کە لە چواردەورەی چاڵەسەرەکییەکەیە. بنو بەدەنەی چاڵەسەرەکییەکە بە بەردو چیمەنتو داپۆشراوە بۆئەوەی تا ئەوکاتەی ئێسکەکان هێشتا بەهۆی قسلێو گۆگردەکانەوە نەڕزیونو پاکنە بونەتەوە، میکرۆبەکان تەشەنە نەکەن.

دواجار، پاش ئەوەی ئێسکەکان بوونە خۆڵەمێشو پاکیزە بوون، بەهۆی بارانەوە دەشۆرێنو دەچنە نێو چاڵەکانو پاش ئەوە بەهۆی تێپەربوون بە چەندین دەستگای پاڵاوتنەوە دەچنە نێو ناخی زەوی.

27 ـ مەبەست لەم ئاخافتنە پیرۆزە (سروودی پیرۆز)، سروودی (ئەهونەر)ە کە لە ڕوانگەی زەردەشتییەکانەوە کۆنترینو گرنگترینو پیرۆزترینو پاکترینوتەو فەرمانی ئاسمانییە کە لەلایەن ئاهورامەزداوە ئیلهام بووە. پەیرەوی لەم سرووەدە، بەختەوەریو خۆشی ئادەمیزادو پێشکەوتنی جیهانو بارودۆخی ژیانی خەڵک خاستر دەکات.

لەم سرووەدە پیرۆزەدا سێ جۆر ئامۆژگاری وە بەرچاو دەکەوێت:

یەکەم: پەروەردەی دیاردەو نیشانەکانی راستیو دروستیو پاکی، وە دورەپەرێزی لە خراپە.

دووهەم: هەر کارێك ئەنجام دەبێت، پێویستە لە ناخی دڵەوەو بەناوی ئاهورامەزداوە ئەنجام بدرێت. ئەو کەسەی بە کارێك هەڵیدەستێت نابێ تەنیا بەرژەوەندی خۆی رەچاو بکات، بەڵکو

بەرژەوەندی کۆمەڵگای زێتر مەبەست بێت. لەم رووەوە دەتوانێ لە بەخشینو خەڵاتی (وەهومەن) یانی بیری خاسوویژدانی ڕووناكو هۆشی خواپێداو سوود وەربگرێت.

سێهەم: خزمەتکردنی خەڵکو یارمەتیدانی بێدەرامەتان.

ئەم سێ نیشانانە لە هەر کاتێکدا خاس پەروەردەبکرێن،جیهان دەبێتە باخچەی گوڵان.

28 ـ ئەنجومەنی مۆغەکان: یا کۆمەڵەی برایەتی، پێکهاتبوو لە ژیرترینو زاناترین یارانی زەردەشت کە باوەری تەواوو پتەویان بە ئامۆژگارییەکانی زەردەشت هەبوو.

ئەمانە لەژێر رابەرایەتیو سەرپەرشتی زەردەشت کۆبونەوە، و تێدەکۆشان بۆ چاکسازیو نۆژەنکردنەوەی کۆمەڵگاو بڵاوکردنەوەی ئاینی یەکتاپەرستیو ڕاهێنانەکانی زەردەشت.

ئەندامە هەرە بەناوبانگەکانیان کە لەنێو ئاوێستادا ناویان هاتووەو ئامەژەیان بۆ کراوەو درووددوسڵاویان لێکراوە بریتین لە:

ویشتاسەب (گوشتاسەب)، فەرشوشتەر، جاماسبو میدیوماە.

ئەم ئەنجومەنە، لە پاشاندا نێوی بوو بەمغستان یا مهستان.

29 ـ 17 ـ کاوی، کەوی، کەی/ ئەزموونی ئاگرین: لەپێش سەردەمی زەردەشتەوە، لە ئێران زەمین باوبووە بۆ سەلماندنی بێ تاوانیو بێ گوناهی کەسێك کە بەشتێك تاوانبار کرا بێ، برێ ڕەوشی جۆراوجۆر بە کار هێنراوە. یەکێ لەو ڕەوشانە بریتی بووە لە ئەزموونی ئاگرین. ئەو ئەزموونە بەم شێوەیە بووە کە ئاگرێکی زۆریان خۆشدەکردەوە، وە ئەوکەسەی تاوانبار کرا بوو دەبوو بۆ سەلماندنی بێتاوانی خۆی، بە نێو ئەو ئاگرەدا تێپەربوایە . ئەگەر هیچی لێنەهاتایە، مانای ئەوە بوو کە بێ تاوانەو ڕزگاری دەبوو.

رەوشێکی دیکە ئەوە بوو کە مسی تواوەیان دەکردە سەر سنگی ئەو کەسەی کە بە تاونێك تاوانبار کرابوو، ئەگەر هیچی لێنەهاتایە، بێ گوناهی خۆی دەسەلماند.

30 ـ سوشیانت (سوشیانس): ئەو کەسانەن کە ڕەفتارو کرداریان هاو جووت لەتەک ئاینی ئاهورایی یە، راستگۆ، دروستکردار وە پاکن. جیهان لە خراپەو ناپاکیو گەندەڵی خاوێن دەکەنەوە، تێدەکۆشن بۆ ئاوەدانیو پێشکەوتنو خۆشبەختی جیهانو خەڵک.

بەهۆی بیرو کرداروتەی خاس، سوود بە کۆمەڵگا دەگەیەننو جگە لە خێرو خۆشیو ئاسایشی خەڵک، هیچ ئارەزوویەکی دیکەیان نییە.

سوشیانتەکان، چ ئەوانەی تا ئێستا هاتوونو ڕۆشتونو چ ئەوانەی لە پاشەڕۆژدا لەدایك دەبن، گشتیان نیشانەی تایبەتی پێشەوایەتییان هەیە کە خەڵک بەرەو ڕاستیو پاکیو بەختەوەری ڕابەرایەتی دەکەن.

زەردەشت خۆی بە یەکێك لەو سوشیانتانە دەژمێرێت. هەموو ئەو پەیامبەرو بیرمەندانە کە بیری خۆیان بۆ پێشخستنو خزمەتکردنی مرۆڤ تەرخان کردووە هیچ ئارەزوویەکیان نەبووە جگە لە ڕابەرایەتی جەماوەر بەرەو ڕاستیو پاکیو دروستیو برایەتیو ڕزگاری، ئەمانە گشتیان دەتوانین پێیان بێژین سوشیانت. ژمارەیەکی زۆر لەم سوشیانتانە لە ڕابردوودا بوونو لە پاشە ڕۆژیشدا دێنە ئارا..

سوشیانت بەواتەیەکی گشتی مانای (ڕزگار کەر) دەبەخشێت. شایانی باسە کە سوشیانت یا سوشیانس لەنێو گشت ئایینە فەرمییەکان باسکراوە، پەیڕەوانی هەریەکێ لە ئاینەکان چاوەڕێی کەسێکن کەوادە دراوە بێتو هەموو جیهان پڕبکات لە دادو دادگەرێتی. بودایی یەکان نزیکەی شەش هەزار ساڵە چاوەڕێن کە بودا بێتەوەو هەموو جیهان پڕ لە داد بکات.

جولەکەکان باوەریان بەوەیە کە (ئیلیاد) لەتەک گێژەلۆکەدا چۆتە ئاسمانو ڕۆژێك لە ئاسمانەوە دێتەوە خوارو هەموو جیهان پڕ دەکات لە داد.

کریستیانییەکان باوەریان بەوەیەو چاوەڕێ دەکەن، عیسای مەسیح لە ئاسمان بێتەوە خوارەوەو ماوەی هەزار ساڵ پاتشایەتی هەموو جیهان بکاتو ئاسایشو تەبایی بگەڕێنێتەوە. لەنێو موسوڵمانانیشدا، شیعە دوانزە ئیمامییەکان باوەریان بەوەیە کە مەهدی کوڕی حەسەنی عەسکەری کە لە چاو بزربووە، ڕۆژێك دەگەڕێتەوەو هەموو جیهان پڕ دەکات لە دادو دادگەرێتی.

بەڵام لە پەیامی زەردەشتدا، سوشیانس کەسێکی تایبەتو دیاری کراو نییە کە لە کاتێکی دیاری کراودا بێتو لە وەچەی زەردەشت بێت، بەڵکو هەر کەسێك کە بەگوێرەی ئایینی ئاهورامەزدا ڕەفتار بکاتو دۆستو براو باوکی هەمووان بێتو چاودێریو بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنماییان بکات، ئەو کەسە سوشیانتە.

31 - (دە) هەستو هێزی دەرو دەروونی: بریتین لە پێنج هەستی بینایی (باصرە)، چێشتن (ژائقە)، بیستن (سامعە)، بۆن کردن (شامە)، هەستکردن (لامسە) لەتەک پێنج هێزی، توانایی (قوە)،داهێنان (اختراع)، خێرابوون (سرعە)،تێگەیشتن (فهمو ادراك)، پێشبینی کردن (تنبۆات)

32 - ئو سیخش: یەکێك بووە لە پێشەوا درۆزنەکانو نەیارێکی سەر سەختی زەردەشت بووە.

33 ـپردی چینوەت: لە گاتاکاندا چەندین جار باسی پردی چینوەت ( CH invat peretu) کراوە کە دەتوانین لەبەراورد کردندا ئەم پردەو پردی سیرات (صراط) چونیەك بزانین.چینوەت بە مانای دادوەری کردنە، کەواتە پردی چینوەت بە مانای پرد یا رێگەی دادوەرییە، لە یەسنا هات 46 بەندی 11 دەبێژێ:

(رۆحوویژدانیان کاتێك لە پردی چینوەت نزیك دەبنەوە، دەکەونە ترس‌و لەرز...)

بەگوێرەی داستانەکانی پاش زەردەشت (داستانەکانی پەهلەوی) ئەم پردە، رێگەیەکە کە رۆح پیایدا تێپەردەبێ. کاتێك کە روحیانەتی خاسگەلان دەیگەنێ، پانوپۆر دەبێت‌و زۆر بە ئاسانی بەسەریان تێپەر دەبن‌و دەگەنە بەهەشت. بەڵام هەر کە خراپەکاران دەیگەنێ لە موو بار یکترو لە تێغ تێژتر دەبێت‌و ناتوانن رێگەکە ببرن‌و دەکەونە بنی دۆزەخ.

هەروەها، بەگوێرەی نووسینەکانی پەهلەوی لەجیهانی پاش مردن ئەوانەی لەتەک رۆحدا دادوەری دەکەن‌و لێیان دەپرسنەوە، بریتین لە ئیزەدی میترا (میهر) ئیزەدی سروش‌و ئیزدەی رەشەن.

بەڵام علي اكبر جعفری لە کتێبی پیام زرتشت، چاپی سیهەم، ل – 102 دەبێژێ:

(...ناوی ئەم پردە –چنوت پەرتو یا پردی جیاکردنەوەیە. ئێستا با بزانین زەردەشت کە داهێنەری ئەم وشەیەیە، سەبارەت بەمە چی دەبێژێ:

((ئەی مەزدا ئاهورا،

ئەز، بە دروستی دەبێژم،

هەر کەسێك، چ پیاو چ ژن،

ئەو شتەی کە تۆ بە خاسی دەزانیت بۆ ژیان، ئەنجام بدات،

لەژێر سایەی ئەندێشەی خاس،

بەهرە وەربگرێت لە پاداشتی راستی‌و توانا یی معنوی‌و خزمەتکردنی خەڵک ئەز، ئەو جۆرە کەسانە

رێنمایی دەکەم کە ستایشتت بکەن‌و لەسەر پردی دوو ریانی چاکەو خراپە (پردی چینوت)

رێنماییان دەکەم.)) یەسنا، هات 46 بەندی 10

هەروەها لە یەسنا هات 46 بەندی 11 دەبێژێ:

((کاوی یەکانو کەرپەنەکان، یەکیان گرتووە،

لەتەک پیاوەکانیاندا،

بە کردەوە ناشیرینیەکانیانەوە،

ژیانی خەڵک ئالێۆزو پەرێشان دەکەن.

بەڵام، ڕەوانوویژدانیان،

کاتێك کەدەگەنە سەر پردی دادوەری (چینوێت)،

دژیان ڕادەوێستن،

وەبۆ هەمیشە دەچنە موێڵێگەی درۆیزنانو خراپە کاران.))

هەروەها لە یەسنا،هات 51بەندی13 دەبێژێ:

((بەم شێوەیە،

خراپەکار،کەلەرێی ڕاست لای داوە،

وەویژدانی خۆیی دوچاری خراپە کردوە،

لەسەر پردی چینوت،

وەبەرامبەر بە ئاشکرابونی کردارەکانی،

ڕۆیحی دووچاری سەرزەنشت دەبێ،

چونکو بە هۆیی کردارو گوفتاری خۆیەوە،

لە ڕێی ڕاست دورکەوتوەتەوە.))

کەوایە دەبینین تەنیا ڕاست کاران لەئەوانەی دیکە جیا دەبنەوەو لەم پردە تێپەڕدەبن، وەدرۆیزنەکانو خراپەکاران لەرز دەکەوێتە جەستەیان وەلەڕاستیدا ئەم پردە بوێ ئەوان نیە.لەم سێ بەندەدا کە زەردەشت باس لە پردی چینوت دەکات، بەهیچ جوێرێك باس لە پاناییو باریکی

وەکەوتنە نێو دوێزەخ یان چونە نێو بەهەشت،ناکات. ئە م پردە معنوییە تەنیا حسابی ڕاست کاران لە درۆیزنان جیادەکاتەوەو هیچی دیکە. ئاشکرایە ئەم جیاکردنەوەش هە ر لەم جیهانەدا ڕوو دەدات. ئەو کەسەی ڕاست کارە، ڕزگاری دەبێتو دەگاتە پلە ی نەمرێتی، وە ئەوەی کە درۆیزنەو خراپە کارە، لە موێلێگەی درۆو خراپیدا دەمێنێتەوەو بە هویی‌ویژدانی خۆیەوە توشی کوێرەوەریو ڕەنج کێشان دەبێتو دەمێنێتەوە تائەوکاتەی ئەویش پاك دەبێتەوەو ڕزگاری دەبێت وە نەمرێتی، ئەویش دەگەیەنێتە سەرای ئەندێشەی خاس.

ئەم پردە، پردێکی زاراوەییە وەهیچ بونێکی مادی نیە. زەردەشت مەبەستی لەم زاراوەیە ئەوە بووە کەمانای ئەو جیاکردنەوەی نێوان خەڵکی ڕاست کارو درۆیزنەکان هەیە، دەرببڕێت. درۆیزنەکانو خراپەکاران، لەتاریکیدا دەتلێنەوە، بەڵام ڕاست کاران، لەمانە جیادەبنەوەو ڕێگەی ڕوێشنای بێ پایان دەگرنە بەر.)

34 ـ تۆرانییەکان لە تیرەکانی ئێرانی بوون. بەشێکیان ئاینی زرەدەشتییان پەسەند کردبووو ڕێی ڕاستیان گرتبوو بەر. بڕێکیان دژایەتییان لەتەک زەردەشت کردبوو.

فریان، لەو کەسانە بوو کە باوەری بە زەردەشت هێنابووو ڕێی راستی گرتبوە بەر.

35 ـ هیچدسپ ئەسپەنتمان: یا هەئیچەس ئەسپا، باوە گەورەی زەردەشت بووە.

36 ـ فەرشوشتەر هووگوێ: یەکێك بووە لە کەسە هەرە نزیکەکانی زەردەشت، و برای جاماسپ بووەو هەردووکیان وەزیری گوشتاسەب شا، بوون.

37 ـ بەندووە: لە نەیارانی زەردەشت بووە

38 ـ زەور: لە ئاوێستا دا پێی دەبێژری Zaothra، و بریتییە لە ئاو یا شیر یا هەر شلەیەکی دیکە کە لە کاتی بە کارهێنانیدا بۆ ڕێو ڕەسمی ئاینی وە پیرۆز کردنییەوە لەلایەن موبدەکانەوە، دوای خویندنەوەی نزاو دوعا چەند دلۆپێك دەدرێت بە نوێژکەران.

39 ـ فەڕی کەیانی: ووزەیەکی معنوی یە کە شیاوی ستایشو ڕێز لێگرتن بووە، و دروستکراوی ئاهورامەزدایە. بەگوێرەی ئەو پلەو پایە معنوییەی هەیەتی، لەسەرو هەموو ئافەریدەکان دەژمێرێتو بەشێکی جیا نەبووە لە ئاهورامەندا.

ئاهورامەزدا، لە پاشاندا ئەو کەسانەی کە شیاوبوون ئەم دیاردە معنویو سەرو سروشتییەی پێبەخشێت تا بتوانن لە جیهانی مادیدا مایەی خزمەتگوزاریو کاری خاسو شیاو بن.

هەروەها ئەموو زەیە دەدرێ بە هەموو ئەمشاسپەندو ئیزەدو شالیارو گەورە پیاوانو پاڵەوانانو خاسگەلانو رێنمایانی ئادەمیزادو بەهۆی ئەمەوەیە کە هەر کەسێك ئەم فەرەی پێببەخشرێت، سەرکەوتوو بەختەوەر دەبێت.

40 - سەئوك Saoka: فریشتەیەکەو پارێزگەری تەندروستیو خۆشیو پێشکەوتنو پەروەردەیە.

41 - چەند رستەیەك لە دەقی نامەکە بزر بووەو ماناکەی نادیارە.

42 - ئەم دوو رستەیە لە گاتاکاندا (یەسنا 28 بەندی 11و یەسنای 30 بەندی 4) وەرگیراوە.

43 - ئەسموخوانونت: ناوی یەکێکە لەوانەی کە زۆر زوو پەیروەی لە ئاینی یەکتاپەرستی کردووەو لە فەروەردێن یەشت ناوی لێبراوە.

44 - گائو کرنە: ناوی درەختێکی پیرۆزە.

45 - لە ئاوێستادا، ئاتەر atar، فریشتەی پاسەوانی ئاگرە، هۆی ئەوەی کە لە کاتی ناوهێنانیدا دەیلکێنن بە مەزدا ئاهورا ئەوەیە کە زێتر بایەخ بە ئاگر بدرێت، هەروەها کاتێك دەبێژن کە ئازەر کوڕی ئاهورامەزدایە، لەڕوی مەجازیدایەو بۆئەوەی بایەخی زێتری پێبدرێت دەڵێن کوری ئاهورامەزدایە، دەنا زەردەشتییەکان وەك یۆنانییەکان بیر ناکەنەوە کە خواکان لەنێو خۆیاندا خێزان پێکدێنن.

46 - لە ئاوێستادا، چەند جارێك باسی حەوت دەڤەر (حەوت هەرێم یاکیشوەر) کراوە. ئەم حەوت دەڤەرە بریتین لە:

ئەریزەهی: سەرزەمێنێك یاووڵاتێك بووە لە رۆژئاوادا

سەوەهی: سەرزەمێنێك یاووڵاتێك بووە لە ڕۆژهەڵات

فرەدەزەفشو: سەرزەمێنێك یاووڵاتێك بووە لە باشوری ڕۆژهەڵات

ڤیدەزەفشو: سەرزەمێنێك یاووڵاتێك بووە لە باشوری رۆژ ئاوادا

ڤاورو بەریشتی: سەرزەمێنێك یاووڵاتێك بووە لە باکوری رۆژئاوادا

ڤاورو جەریشتی: سەرزەمێنێك یاووڵاتێك بووە لە باکوری ڕۆژهەڵات

خوەنیرەپ (خونیرەس، خنرس): سەرزەمێنێك یاووڵاتێك بووە لە ناوەڕاستی سەرزەمینی ئارياييەكانە.

كە دەكاتە ناوچەی كوردستان.

47 - مەبەستی ئەوەیە كە تەنانەت ئەو ئاژەڵانەی (گاگەل) كە پەیمانشكێن‌و درۆزنەكان دەستیان بەسەردا گرتوون‌و دزیویانن‌و بە گەردونەكانیانەوە بەستویانەتەوە، لەبەر ئەوەی بێدەسەڵاتن‌و ناچارن خزمەتی ئەم جۆرە كەسانە بكەن، دەگرین‌و دەناڵێنن.

48 - رەشەن:یەكێ لە ئیزەدەكان هاوكاری میترایە

49 - سروش: یەكێكی دیكە لە ئیزەدەكانی هاوكاری میترایە.

50 - برەك:بە مانای بەرازی نێرە، لە مێژەوە لەم ناوچانە دا بە نیشانەی هێزو توانا دانراوە.

51 - زەوت: یەكێكە لە موبدەكانی زەردەشتی كە لەنێو ئاتەشكەدەكاندا لە كاتی نیایش‌و نزادا، لەتەك ئامادەكردنی (زەور) رێ‌و رەسمە ئاینییەكان ئەنجام دەدات.

52 - هاوەنەن: گەورەترین پێشەوابووە كە ئەركی دروستكردنی (هوم)ی بەسەرەوە بوو. شایانی باسە كە وشەی (هاوەن) لە (هاوەنەن) وەرگیراوە كە تیایدا شیلەی گیای (هوم) دەگیرایەوە.

53 - لەم بەندەدا باسی برێ پێداویست دەكات كە لە كاتی ئەنجامدانی رێ‌و رەسمی ئاینی دا بە كاردەهێنرا، دار بۆ سوتاندن لە ئاگرداندا، شیر بۆ ئاوێتە كردن لەتەك (زەور)دا، هاوەن بۆ كوتاندن‌و ئاولێگرتنی (هوم).

54 - بەرسەم Barsam: لە ئاوێستادا پێی دەبێژێ Baresman، ناوی لقێكی باریكە كە لە كاتی بە جێ هینانی نیایشتەكاندا،دەیانگرتە دەستیان‌و بۆ بە كارهێنانیان رێ‌و رەسمێكی تایبەتییان بە كار دەهێنا.بۆ زێتر ئاگایی لە (بەرسەم) بڕواننە باسی ئیزدەی ئازەر (ئاگر)

55 - گرەزمان Garzamen، گروسمان، گروشمان، گرئاسمان یا سەرای سروود: گەورەترین مەلبەندی معنوی ئاهورامەزدایە، و جێگەی تیشك‌و رووناكی هەمیشەییە. لە ئاینی ئیسلامدا (عرش)ی پێدەوترێت.

56 - دات: فریشتەی نوێنەری یاساو دادوەرییە.

57 ـ ئەرشتاد: فریشتەی راستیو دروستییە.

58 ـ مەبەست لە ئیزدەکان، ئەمشاسپەندەکانو فرەوەهرەکانە کە لە پێش ئافراندنی ئەم جیهانە خولێقاون.

59 ـ ئازەر: لە ئاوێستادا ئاتەر atar یا ئازەر فریشتەی پاسەوانی ئاگرە. هۆی ئەوەی کە لە کاتی ناو هێنانیدا دەیلکێنن بە مەزدائاهورا ئەوەیەکە زێتر بایەخ بە ئاگر بدرێت. هەروەها کاتێك دەبێژن ئازەر کوڕی ئاهورامەزدایە، لە ڕووی مەجازی دایەو بۆئەوەی بایەخی زێتری پێبدرێت دەڵێن کوری ئاهورامەزادیە، دەنا زەردەشتییەکان وەك یۆنانییەکان بیر ناکەنەوە کە خواکانیان لەنێو خۆیاندا خێزان پێکبێنن.

60 ـ ئەپەم نەبات: یەکێکە لە فریشتەکانی پاسەوانی ئاوو یاریدەدەری ئاناهیتایە.

61 ـ گهنبار: داستانی ئافراندن لای نەتەوە ئارياييەکان،هەر وەك لای جولەکەکانو ئاینە سامییەکانی دیکە تا رادەیەك وەك یەكوایە. لە ئاینی زەردەشتیدا باس لەوە دەکرێت کە جیهانو هەموو گیتی لەلایەن ئاهورامەزداوە بە شەش قۆناغ دروستکراوە. وەلێ ئاهورامەزدا وەك یەهوەی جولەکەکانو خوای ئاینە سامییەکان بە پەلە ئەم کارەی ئەنجام نەداوە کە لە شەش رۆژ بەسەریەکەوە کاری ئافراندنی ئەنجام دابێت، و لە رۆژی حەوتەمدا شەکەتو ماندوو بوبێتو پشووی دابێت، بەڵکو ئاهورامەزدا ئەم ئافراندنەی بە شەش قۆناغو لە ماوەی ساڵێکدا ئەنجامداوە. ئەم شەش قۆناغەی ئافراندنی جیهان بە زمانی پەهلەوی پێی دەبێژرێت (گاسنبار) و بە فارسی (گاهنبار) یا (گهنبار)، و بریتییە لە بەشێك کە وەرگیراوە لە (هادخت نەسك) واتە بیستەمین پەرتوکی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان.

لە رۆژگارانی دێریندا، و تا هەنۆکەش لە کاتی داهاتنی هەریەك لەم رۆژانەدا، زەردەشتیەکان جەژنیان دەگرتو بە خۆشیو شادی یەوە پێشکەشییان پێشکەشبە موبدەکانو پێشەوا ئاینییەکانی دیکە دەکرد. یاخود دەیانبەخشی بە هەژارانو دەستکورتەکان. گهنبار، بریتییە لە شەش جەژنی گەورە کە هەریەکە لەم جەژنانە نیشانەیە بۆ وەدیهاتنی یەکێ لە ئافەریدەکانی ئاهورامەزدا.

بەرپاکردنی ئەم جەژنانە سوپاسە بۆ ئاهورامەزدا بۆ ئەو بەخشینانەی بە مرۆڤی داوە. شایانی باسە،، بۆ هەر یەکێ لەم جەژنانە سروودو نیایشو رێو رەسمی ئاینی تایبەتییان هەبووە. هەر یەك لەم جەژنانە ماوەی پێنج رۆژی خایاندووە، و ناوی ئەم جەژنانە بەم چەشنەبووە:

1. مئیز یوئی زرمی کە بە پەهلەوی دەبێژرێ میدیوزرم:

بە مانای ناوەراستی وەرزی بەهارە. لە چلو پێنجەمین (45) رۆژی ساڵدا بووە، واتە لە رۆژی پانزەهەمی گوڵانەوە دەست پێی دەکاتو پێنج رۆژ دەخایانێ. لەم قۆناغەدا ئاسمان دروستکراوە.

2. مئیزبوئی شم، بە پەهلەوی دەبێـە میدیوشەم:

بە مانای ناوەراستی وەرزی هاوینەو کاتی درەوکردنەو لە سەدو پێنجەمین (105) رۆژی ساڵدایە، واتە لە 15 ی پوشپەر. لەم قۆناغەدا ئاو دروستکراوە.

3. پئی تیش هەي، بە پەهلەوی دەبێتە پەتیەشەهیم:

بە مانای پێگەیشتنی دانەی گەنمە، و کاتی خەرمانانەو لە سەدوو هەشتاهەمین (180) رِوێژی ساڵدایە، واتە لە سیهەمین (30) رۆژی مانگی خەرمانانە. لەم قۆناغەدا زەوی دروستکراوە.

4. ئایا سەریم:

بە مانای گەرانەوەی رِانو گاگەلە لە لەوەرِگاکانی هاوینو کاتی جوتبوونی مەرِە. لە دووسەدودەهەمي (210) رۆژی ساڵدایە، واتە سیهەمین (30) رۆژی مانگی رِەزبەرە. لەم قۆناغەدا گژوگیا دروستکراوە.

5.. مئیز یائیری (میدیوریم): بە مانای ناوەراستی زستانو سەرمایە، و لە دوسەدو نەوەمین (290) رۆژی ساڵدایە، واتە لە رۆژی بیستەمی مانگی بەفرانبارە. لەم قۆناغەدا ئاژەڵەکان دروستکراون.

6. هەمسی پت مەئیزی (هەمەسپەتمەدەم):

بە مانای وەك یەکبوونی شەوو رۆژە. ئەم جەژنە لە سێ سەدوشەستو پێنجەمین (365) رۆژی ساڵدایە لەم قۆناغەدا ئادەمیزاد ئافرینراوە.

62 ـ ئەم سێ دەستەیە بریتین لەو کەسانەی کارو کرداریان خاسە، کەسانێك کە خراپەکارنو کەسانێکی دیکە کە کارو کرداریان بەگوێرەی خاسیو خراپی چونیەکەو ئەمانە لەبەرزەخدا دەبن.

بەرزەخ لە ئاوێستادا بە میسوانە Mis vanaو بە زمانی پەهلەوی هەمیستەکان Hamestakan ناوبراوە.

لە یەسنا هات 48 بەندی 4 دەبێژێ:

(.. ئەو کەسەی کە برێ جار بیری چاکـو هەندێ جار بیری خراپی هەیە، کەسێك کەویژدانی خۆی بەهۆی کرداروونە دەخاتە ژێر رکێفی ئارەزوو هەوەسەکانییەوە، ئەو جۆرە کەسانە بەگوێرەی دەستوورو فەرمانی تۆوە لە رۆژی پاش مەرگدا بە تەنیایی دەمێنێتەوە).

63 - ئەم سێ رۆژە ناوی سێ رۆژ لە مانگە کە هەریەکە بەناوی یەکێك لە ئیزەدەکان یافریشتەکانە. زاوا دەبێ یەکێ لەم سێ رۆژانە واتە یەکێ لەو ئیزەدانە هەڵبژێرێتو بەتایبەتی لەو رۆژەدا هەردووکیان (بوکو زاوا) نوێژو نزای تایبەتی بۆ بکەن.

64 - بڕواننە ل 12-16 نامێلکەی کوردایەتی نووسینی کامل ژیر، پێشەکی د. جەمال نەبەز.

-----------

**کرپنو کەوی**:

پاش کوچکردنی ئاریاییەکان بۆ ناوچەی ئیران، ژیانی خۆیان بە مەرو مالات بەخێو کردن دەگوزەراند وە ناچاربوون بوێ دەست بەسەرگرتنی لە وەرگای خاس هەر تیرەیەك بەگوێرەی هێزو توانای خۆیان دەست بەسەر باشترین ناوچەکاندا بگرن.

بەرە بەرە هۆکارەکانی سروشتی وەك ئاو، هەوا، زەوی.. بونە هۆی ئەوەی کە ناچاریان بکەن لەسەر زەوییەکەدا نیشتەجێ بنوو خەریکی کشتوکاڵیو دروستکردنی خانو بن،

هەرگرۆو تیرەیەك بۆ خۆی کەسێکیان هەڵیبژارد کە فەرمان رەواییان بکاتو نیویان نا(کوی) یا کاوی Kavi بەرە بەرە دەسەڵاتی ئەم (کوي) یانە زیتر دەبووو ئەمە دەبوە هۆی ناکوکیو قڕەو هەڵلا لەنێوان تیرەکاندا.

ژیانی کۆچەریتیو پاشان بە خێوەکردنی مەڕو ماڵاتو نیاز بە لەوەرگای سەوزو خاس، خەڵکی بەرەو تێفکرین لە سروشت دەبردوو وایدەکرد کەزیتر بیر بکەنەوە کە کێو چیو چلون ئەم رووداوە سورشتییانە دینە ئارا.. بۆیە بوێ هەریەك لەم دیاردانە هێزیك یا خوایەکیان داتاشیو ئەم خوایانەیان بە دوو بەش دابەشی کردبوو، بەشێکیان ئەو هێزانە یا خوایانەبوون کە بۆ خۆشیو شادی خەڵک تێدەکۆشان، خۆشیو کامرەوایی خەڵک بریتی بوو لەوەی کە زەوی بەپیتو بەرەکەتی خاسیان هەبیت لەبەر ئەوە بارانی پێویست، تیرۆژ (تیشکی خۆر)، گەرمای بە ئەندازە، جا بوێ هەریەك لە مانە خوایەکی خاسیان دروست کرد. لەتەک ئەمانە دا هەمیشەووشکە ساڵی، بێ ئاوی، تاریکی، سەرمای زۆریشی هەبوو کەوایان دەزانی ئەمانە دەستکردی خوایانی خراپەن کە خەریکنخراپەووێرانکردنن، ئارەزوو ئاواتیان بڵاوکردنەوەی برسیتی، نەخۆشیو مردنە بو خەڵک. بۆیە لەم خوایانە دەترسان بەڵام قوربانیو دوعاو نیایشیان بو نەدەکردن بەڵکو هەمیشە نیایشان بو خوا خاسەکان دەکردو قوربانیان پێشکەش دەکردن

بۆئەوەی رازیان بکەن‌و دڵیان خوێشبکەن‌و خۆیان (واتە خوا خاسەکان) کارێکی‌وابکەن خوا خراپەکان لە خەڵکی‌و دور بخەنەوە. ئەم ئاینە ئەوەندە سادە بو کە پێویستیان بە رابەرو پیشەوای ئاینی نەبوو، هەر گەورەیەکی مال بۆ خۆی‌و خۆی‌و خێزانەکەی ئەو دابونەریتانەیان بە جێ دەهێنا. بەرە بەرە ئەنجامدانی رێ‌و رەسمی ئاینی سەخت‌و سەختر دەبو تاوایلێهات کە کەسانێکی تایبەتی بەم کارە هەلێدەسان‌و پییان دەبێژرێ (کرپن Karpan). ئەم کرپنانە رۆژ بە رۆژ هێزو توانایان زێتر دەبوو بە جورێك بەسەر کومەلێگادا خۆیان سەپاندو ترسی خواکانیان خستە دڵی خەڵکیەوەو بەناوی دیاری‌و قوربانی بۆ بارەگای خوا خەڵکیان دەروتانەوەووای لێهاتبو هەست‌و هەناوی خەڵکیان لە چنگی خۆیان گیردابووو هەرچییەکیان گەرەکبوایە ئەنجامیان دەدا. هەر چی باوەر بەخوا جۆراجۆرەکان زێتر دەبوو، پتر ترس دەچووە دڵی خەڵکەوەو کرپنەکان کلێپەی ئاگری ئەم ترسەیان زیتر خۆش دەکردو بەم هۆیەوە هێزو توانایان چەندین‌و چەندین بەرانبەر دەبوو چونکە ترس‌و دواکەوتن‌و نەزانینی خەڵک دەبووە مایەی دەرامەدو دەسەلاتێتی ئەم کرپنانە کە خۆیان بوبونە چینێکی جیاواز لەنێو کۆمەڵگادا.

باری کۆمەلایەتی ئەو سەردەمە بەو جۆرە بوو. ئیدی خەڵکی وەرس بو بوون‌و لەتەک هەموو ترس‌و دواکەوتنیاندا بەلام هەستیان بەوە دەکرد کە پێویستیان بە رابەرێکی بیر خاس هەیە کە بتوانێت رێگەی راستیان پیشان بدات... زەردەشت ئەو کەسە بوو..